# کۆچ

## ١٨ - ١٩

کۆچ بەرەو مەعریفە

وەرزە گۆڤارێکی رووناکبیرییە
گرنگی بە بواری لێکۆڵینەوە دەدات


**خاوەنی ئیمتیاز**

**عەلی عەبدوڵڵا کاکە ئەحمەد**

**سەرنووسەر**

**حەبیب محەمەد دەروێش**



٠٧٧٠١٥٨٢٧٣٨ — ٠٧٥٠١١٩٩٦٩١

habeblawyer@yahoo.com
govarikoch@yahoo.com



**دیزاینی ناوەڕۆک**

**حیکمەت مەعروف / ئالین دیزاین**

**دیزاینی بەرگ**

**هەرێم عوسمان**

**نرخ: ٤٠٠٠ دینار**

**بۆ خوێندنەوەی سەرجەم ژمارەکانی گۆڤاری کۆچ، سەردانی ماڵپەڕی کۆچ بکە:**
www.govarikoch.com

**سەرنج:**

**هەموو ئەو بابەتانەی لەم گۆڤارەدا بڵاودەبنەوە بۆچوونی نووسەرەکانیان دەردەخەن.**

**بۆ ئەو بەڕێزانەی دەیانەوێت بابە تمان بۆ بنێرن،**

**تکایە رەچاوی ئەم خاڵانەی خوارەوە بکەن:**

١. بابەتەکان ئەگەر دەستنووس بوون، با لەسەر لاپەڕەی (A4) بێت و لەسەر یەك دیوی بە خەتێکی جوان بنووسرێت.

٢. پەراوێزەکان لە کۆتایی بابەتەکەوە بنووسرێن.

٣. سەرچاوەکان لە کاتی پێویستدا دیاری بکرێن.

٤. ئەگەر تایپکراو بوو لە رێگەی سیدی و فلاش میمۆری، یان رێگەی ئیمایلانەوە بۆمان بنێرن.

goavrikoch@yahoo.com , arsalantofiq@yahoo.com
salam_80jornalist@yahoo.com

٥. لە کاتی تایپکردندا تکایە بۆ زمانی کوردی فۆنتی (Ali_K_Sharif) و بۆ زمانی عەرەبی (Ali_A_Sharif) بەکاربهێنن.

٦. بابەتی وەرگێڕان، دەبێت دەقە وەرگێڕدراوە ئەسڵییەکەی لەگەڵ بێت.

– – –

## ئاگاداری:

**خوێنەرانی خۆشەویستی گۆڤارەکەمان ئاگادار دەکەینەوە کە فایلی ژمارەی ئایندە لەسەر (کێشەی کورد و ئیشکالییەتی ئاشتی لە تورکیا) یە و دەتوانن بە بابەتەکانیان گۆڤارەکەمان دەوڵەمەند بکەن.**

## سوپاس و پێزانین

به ناوی ( گۆڤاری کۆچ )ەوە سوپاس و پێزانینمان هەیە بۆ هەردوو برای بەڕێزمان لە دەستەی نووسەران بەڕێزان ( سەلام عەبدولکەریم و ئەرسەلان تۆفیق ) کە ماوەیەك وەك دەستەی نووسەرانی گۆڤارەکەمان کاریانکردووە و ئێستا کۆتایی بە کارەکانیان هاتووە، هیوای بەردەوامی و سەرکەوتنیان بۆ دەخوازین.


تابلۆی هونەرمەند عەلی لەتیف

## ناوەرۆك



— — —

# گەڕانەوەی بارزانی و بەرپابوونی شۆڕشی ١٤ ی تەمووزی ١٩٥٨ لە خانەقین و ناوچەی بنکورە

## لەبەر رۆشنایی یاداشت و دەستنووسەکانی مەلا عەزیزی شاوازدا

ئەحمەد باوەڕ (*)

سەرهەڵدان و بەرپابوونی، شۆرشی ١٤ی تەمووزی ساڵی ١٩٥٨ بووە مایەی ئـەوەی کۆتـایی بـە فەرمانڕەوایـەتی پاشـایەتی (١٩٢١ - ١٩٥٨) لـە عێراقـدا بهێـنێ و سیستەمێکی، کۆماری نوێ، بـە سـەرۆکایەتی عەبدولکـەریم قاسـم (١٩١٤- ١٩٦٣) و ئەفسەرانی سووپا بێتەکایەوە. هەرلەگەڵ دەسەڵات گرتنـە دەسـتیدا قاسـم کەوتەئـەوەی، کۆمەڵێك، هەنگاوی جۆربەجۆر بنێ لە بواری ریفۆرم و دەسەڵاتدا و لەهەمانکاتـدا، خـۆی لـەو گـروپ و، رێکخـراوە سیاسـیانەش نزیـك بکاتـەوە کـە پێـشتر دژی پاشـایەتی و فەرمانڕەوایەتی پاشایەتی کاریاندەکرد و چالاکی جۆربەجۆریان هەبوو، لەگۆڕەپانی سیاسـی عێراقدا، یەکەم هەنگاوێکیش کە دەسەڵاتی نوێ لە بواری یاسایی و دەستوریدا کاریبۆکرد، ئەویش پێکهێنانی ئەنجومەنێکی سەروەری (سیادە) بوو، بە سـەرۆکایەتی کەسـایەتییەکی سەربازی سونە مەزهەب کە ئەویش لیوا محەمەد نەجیب روبێعـی و هەریـەك لـە محەمـەد مەهدی کوبەی شیعە و خالید عەبدولباسیت نەقشبەندی کوردی بامەڕنی سـەر بـە قـەزای ئامێدی بوون.

جگەلەوەش لەو حکومەتە نوێیەدا کە عەبدلکەریم قاسم خـۆی سـەرۆکایەتیدەکرد، دوو کەسایەتی کوردی وەك: باباعەلی کوڕی شێخ مەحمودی (١٩١٢ - ١٩٩٦) بۆ وەزیـری هاتوچۆ و کار و محەمەد ساڵح مەحمودی بۆ وەزیری تەندروستی بەشدارییپێکرد، هەروەها لەو

*) زانكۆی گەرمیان، كۆلێژی پەروەردە.

دەستوورە کاتییەشدا کە بەسەر یەکەوە لە (٣٠) ماددەی تەواو و (٤) دەروازە پێکهاتبوو. بەجۆرێ لە دەروازەی سێیەمیدا و بەتەواوی دانی بەوەدانابوو کە: (عەرەب و کورد لەم ولاتەدا هاوبەشن)و مافەکانیشیان لە چوارچێوەی خاکی عێراقدا پاریزراودەبێ. بەجۆرێ هەر لەگەڵ راگەیاندنی شۆڕشدا کوردەکانی ئەوکاتەی شاری بەغدا: (بەبیستنی هەواڵی جمهووریەت و شۆڕش ئەمانیش راپەڕین و شیعارێکی گەورەیان نووسی (الشعب الكردي يؤيد الجمهورية العراقية) بەم شیعارەوە و بەشی زۆریان بە بەرگی کوردییەوە بە شەقامەکاندا دەگەڕان و هاواریاندەکرد: ( بژی سوپا و گەل، بژی پێشەوای عەرەب سەرۆك جەمال عەبدولناسر، بژی پێشەوای کورد جەنەراڵ مستەفا بارزانی، بژی برایەتی کورد و عەرەب) بڕانە: هیوا (گۆڤار)، ژمارە(١) تەمموزی ١٩٥٨،ل ٩٩، هەروەها لە زۆربەی شار و شارۆچکە ئاوەدانەکانی ئەوکاتەی باشووری کوردستانی وەك: سلێمانی، کەرکوك، هەولێر، دهۆك، زاخۆ، خانەقین، هەڵەبجە، رانیە، قەلادزە، کفری، کۆیە و شوێنانیتریشەوە کۆمەلانی خەڵك هاتنەسەر شەقامەکان و خۆشنودی و پشتگیری خۆیان بۆ شۆڕش وسیستەمی نوێ و گۆڕانکاری نوێ دووپاتدەکردەوە و هاوکات: (پارتی دیموکراتی کوردستان)یش لەوکاتەوە و لەڕێگای سکرتێرەکەیەوە واتە ئیبراهیم ئەحمەد (١٩١٤ - ٢٠٠٠) کە لەو دەمانەدا لە شاری کەرکوك بوو بروسکەیەکی پیرۆزبایی بۆ شۆڕش و سەرکردایەتی شۆڕش نارد و پشتگیری حیزبەکەی بۆ دووپاتکردەوە، بەجۆرێك، وایبۆلێکدایەوە کە سەرهەڵدانی کۆماری نوێ دەروازەی سەردەمێکی تازەیە لە بونیادنانی پەیوەندییەکانی نێوان کورد و عەرەبدا بەرەو پیشکەوتنی زیاتر. دوابەدوای ئەمە و لە ١٦ی تەمموز و تێپەڕبوونی (٢) دوو رۆژ بەسەر سەرکەوتنی شۆڕشدا (پارتی دیموکراتی کوردستان) داوای لە کۆمەلانی خەڵکی کوردستان کرد کە وەك ئەرکێکی مێژوویی و بۆ بەدیهێنانی داواکارییەکانی نەتەوەی کورد پشتگیری لە شۆڕش بکەن، بەچەند رۆژێ دوای ئەمەش هەر پارتی دیموکراتی کوردستان شاندێکی گەورەی جەماوەری لە زۆربەی شار و ناوچەکانی کوردستانەوە گەیاندە شاری بەغدا بەمەبەستی پیرۆزباییکردن لە شۆڕش و سەرکردایەتییەکەی، بەجۆرێك، گەورەترین شاندی جەماوەریی لە کوردستانەوە ئەوەیان بوو کە لەڕێکەوتی ٢٧ی تەمووزی ساڵی ١٩٥٨دا گەیشتە شاری بەغدا و لەلایەن سەرکردایەتی شۆڕشەوە پێشوازی لەو جەماوەرە




گەورەیە کرا و هەر لەو رۆژەدا مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەدی سکرتێری پارتی سەرۆکایەتیدەکرد و تیایدا وتارێکی گرنگی خوێندووەتەوە و پەیوەندییەکانی نێوان عەرەب و کوردی لەمێژەوە تیارِوونکردەوە. لەگەڵ ئەوەشدا عەبدولکەریم قاسم لەماوەی قسەکردنیدا لەگەڵ شاندی کوردی و جەماوەری کوردستاندا جەختی لەسەر ئەوەکردووەتەوە کە گیانی برایەتی لەنێوان عەرەب و کوردا پارێزگاری لێبکرێ و هەوڵ بۆئەوەش بدرێ کە رێبەری شۆڕشی کورد مەلا مستەفا بارزانی ( ١٩٠٣ - ١٩٧٩) کە لەدەرئەنجامی شۆڕشی ساڵی (١٩٤٣ - ١٩٤٥)و هەرەسهێنانی کۆماری کوردستان (مەهاباد)و لە ساڵی ١٩٤٧ەوە پەنابەردبووەبەر یەکێتی سۆڤێت دووبارە لەگەڵ هەموو یاوەرەکانیدا بگەڕێنەوە عێراق و کوردستان.

هەرچەندە هەنگاوگەلێکی لەمجۆرەش نارەزاییەکی گەورەی لێکەوتەوە بەتایبەتی لەنێوەندی کاربەدەستان و عەرەبە شۆڤێنێکانی ئەوکاتەدا بەتایبەتی کەسێکی وەك عەبدولسەلام محەمەد عارف (١٩٢١-١٣/٥/ ١٩٦٦) کە یەکێك بوو لەوانەی زۆر سەرسەختانە مامەڵەی لەگەڵ ئەو دۆسیەیەدا دەکرد. ئەوەبوو عەبدولکەریم قاسم لەسەر داوای خەڵکی کوردستان رازیبوو و لە ٢٧ تەمووزی ١٩٥٨ەوە لێبوردنێکی تایبەتی بۆ بارزانییەکان و بەتایبەتی مەلا مستەفای بارزانی دەرکرد بەمەبەستی گەڕانەوەیان بۆ وڵات ئەوەبوو بارزانی لەسەر ئەم بنەمایە و لەگەڵ هەردوو هاوەڵێدا کە بریتیبوونلە: میرحاج ئەحمەد و ئەسعەد خۆشەویَ لە ٢١ ئابی هەمانساڵەوە، لە مۆسکۆ وە بەرەو وڵاتی رۆمانیا بەرێکەوتن و لەلایەن سەرۆکی ئەو وڵاتەوە پێشوازیلێکرا و پاشان لە شاری (بوخارست)ی پایتەختی هەنگاریاوە و لەرێگای باڵوێزخانەی (کۆماری عەرەبی یەکگرتوو)ەوە بروسکەیەکی بۆ سەرۆك قاسم لێدا و پیرۆزبایی سەرکەوتنی شۆڕشەکەی لێکرد. دواتر

لەوێشەوە هاتە شاری (پراغ)ی پایتەختی وڵاتی چیکۆسلۆفاکیا و لەلایەن (ئەنتونی فۆتن)ی سەرۆکیەوە پێشوازیلێکرا دواتر هەر لێرەشەوە داوای لە قاسم کرد کە ڕێگەی گەڕانەوەی بۆ فەراهەمبکا. وەك ئەوەی سەرۆکی عێراق لە ٢ی ئەیلولەوە وەلامی بروسکە و داواکارییەکەی بارزانی دایەوە و بڕیاری ئەوەشیدا کە هەموو ئاسانکارییەك بکا بۆ گەڕانەوەی بۆئەو مەبەستەو بە پیرەوەچوونی بارزانی کەسایەتییەکی وەك ئیبراهیم ئەحمەد چوار پاساپۆرتی عێراقی لە وەزیری ناوخۆی عێراق وەرگرت و بە هاوەڵی و ئەندامێتی هەریەك لە نوری ئەحمەد تەها، عوبێدوللا بارزانی و شێخ سادق بارزانی سەردانی وڵاتی چیکسلۆفاکیایان کرد و لەگەڵ بارزانی و هاوەڵانیدا دوای ئەوەی کە سەردانی وڵاتی میسر و جەمال عەبدولناسریان کرد لەوێوە گەڕانەوە وڵات و لە ٦ تشرینی یەکەمی ١٩٥٨دا گەیشتنەوە شاری بەغدا بەجۆرێك لەڕێوڕەسمی گەڕانەوەیدا لە فرۆکەخانەی نێودەوڵەتی (موسەننا) لەلایەن هەزاران هاوڵاتی کورد و عەرەبەوە پێشوازییەکی گەرمیلێکرا و وەك میوانێك لە ئوتێلی (سەمیر ئەمیس)ی ئەوکاتەی شاری بەغدا دابەزی و بەڕادەیەکی بەرچاو پێشوازی لە کۆمەڵانی خەڵك و میوانەکانی دەکرد بەجۆریك لە ناوچەکانی کوردستانیشەوەو بەتایبەتی لە شار و شارۆچکە ئاوەدانەکانی ئەوکاتەی وەك: هەولێر، سلێمانی، کەرکوك، ناوچەی بادینان و هەروەها شارۆچکەکانی ئەودەمانەی وەك: کفری و خانەقینیشەوە هەمانڕەوت گیرایەبەر و تەنانەت گوند و دێهاتە ئاوەدانەکانی ئەو دەمانەشی گرتەوە بۆ نموونە لە ناوچەیەکی وەك (بنکورە)ی ئەوکاتەوە کە سەر بە شاری خانەقین بووە چوونەتە پێشوازی مەلا مستەفای بارزانی و سەرکردەی کوردانەوە.. لەمبارەیەوەو وەك لە یاداشتە دەسنووسە رۆژانەییەکانی کەسایەتی ناسراوی ناوچەی (بنکورە) مەلا عەزیزی شاوازدا هاتووە و زۆر بەوردییەوە رووداوە رۆژانەییەکانی ئەوکاتەی نووسیوەتەوە.

وەك دەبینی لەگەڵ بەرپابوونی شۆڕشدا و لە ١٤ تەمووزی ساڵی ١٩٥٨دا بەشێوازێکی سادە و بێئەوەی هیچ وردەکارییەکیدی بنووسێتەوە نووسیویە: (عێراق ئینقلابیکرد و عەبدولئیلا کوژرا)، هەواڵێکی لەم بابەتە و شێوازی تۆمارکردنی لە ناوچەیەکی دوورەدەستی ئەوتۆدا کە لەو رۆژگارەدا تەنانەت قەڵەم و کاغەزیشی زۆر بەکەمی تیادەستکەوتووە و لەو سەروبەندەدا تەنها دوو ساڵ بوو قوتابخانەی سەرەتایی

تیاکرابوەوە، سەرەڕای ئەوەش سەرچاوەیەکی ڕاگەیاندنی وەك رادیۆ لە چەند ماڵێکی یەکجار کەم و دەوڵەمەنددا نەبێ دەستنەکەوتوە. جابۆیە بۆ رۆژی دواتر و بۆ زانینی هەواڵی زیاتر سەبارەت بە ڕووداوەکانی شۆڕش وەك لەیادداشتەکانیدا هاتووە خەڵکی (گوندی سەوزبلاخ) کە یەکێك بووە لە گوندە ئاوەدانەکانی ئەو رۆژگارە بەبەراورد لەگەڵ گوندەکانیتری ناوچەکەدا، بەزۆری کەسایەتییە ناسراوەکانی لە دەوری ئەو رادیۆیە کۆبوونەتەوە کە لە ماڵی شێخ نەجیمی کوڕی شێخ مستەفای تاڵەبانیدا هەبووە.

لە رۆژی ١٥ ی تەمووزدا و بەهەمانشێوە وایتۆمارکردووە کە: (ئەمڕۆ مامۆستا سەید نیزامەدین و غەریبەی غەزال هاتن بۆلای رادیۆ بۆ هەواڵی تازە لەلای ماڵی نەجیم خەبەریدا کە وا نوری سەعید کوژراوە).

لێرە بەدواوە دەبینی زۆر بەتاسوقەوە کەوتوونەتە ئەوەی هەواڵی زیاتری ڕووداوەکان بزانن و ئەو رادیۆیانەشی کە سەرچاوەی گەیشتنی هەواڵەکانی رۆژانە بووە بۆئەوان بەردەوام پێویستی بە شەحن یان پاتری نوێ بووە بۆیە بۆئەو مەبەستە و تاقیبکردنی هەواڵەکان خەڵکیان ناردووەتە شاری خانەقین یان ئەوانەیان راسپاردوە کە هاتووچۆی شاریان کردووە. وەك ئەوەی گرنگترین تۆماری رۆژانەی ئەو لە رۆژی ١٧ تەمووزدا ئەوە بووە کە نووسیویە: (ئەمڕۆ ئەحمەد زەریفە - کە خەڵکی گوندەکەیان بووە - باتری بۆمانهێنا بۆ رادیۆ). جگەلە هەموو ئەوانەش لەم رۆژانە بەدواوە و وەك هەموو ناوچەکانیتری کوردستان کۆمەڵانی خەڵك دەروازەیەکی نوێ و قۆناغێکی نوێ لە ژیانی رۆژانەیدا دەستیپێکردووە ئەوەش بۆخۆی ئەوجۆرە ئازادییە بووە کە لێرە بەدواوە باڵی بەسەر کۆمەڵانی خەڵکی عێراقدا کێشاوە و هەمان رەنگدانەوەش ئەم ناوچەیەی گرتووەتەوە بۆ نموونە کەسێکی وەك مەلا شەریفی زەنگەنەی هاوڕێی مەلا عەزیزی شاواز کە پێشتر چالاکوانێکی ناو (حیزبی هیوا) بووە و نازناوی (پەیوەند)ی بووە لە ریزەکانی حیزبدا، والێکردوە کە بچێتە شاری خانەقین و وێنەی مەلا مستەفای بارزانی کە پێشتر قەدەغە بووە دووبارە لەسەری بشواتەوە و بەناو خەڵکدا بڵاویبکاتەوە.

لەمبارەیەشەوە ئەوەتا لە رۆژی ٢٣ تەمووزدا دەنوسێ: (ئەمڕۆ شریف چوو بۆ شار و وێنەی مەلا مستەفای بارزانی برد لەسەری تەبعبکاتەوە). لە رۆژی دواتر و واتە لە ٢٤

تەمموزدا وایتۆمارکردووە کە کەسێکی وەك مامۆستا عەبدولسادە کە لە سالأنی پێشتردا مامۆستای قوتابخانەی گوندەکەیان بووە نامەیەکی لەگەڵ وێنەیەکدا بۆ دەنێرێ کە وێنەی سەرۆکی تازەی عێراق عەبدولکەریم قاسم و جەمال عەبدولناسری سەرۆکی ئەوکاتەی میسری لەگەڵدابووە وەك لەبەشێکیدا هاتوە: (کاغەزی عەبدولسادەم بۆهات وێنەی پاڵەوانی مەزن عەبدولکەریم قاسم و جەمال عەبدولناسری لەگەڵ بوو).. کەچی لێرە بەدواوە وەك چۆن لەهەموو ناوچە و شارەکانی کوردستان و عێراقەوە شاندی جۆربەجۆر سەردانی شاری بەغدا دەکەن و بەمەبەستی پیرۆزباییکردن دەچنە سەردانیکردنی بەرپرسانی ئەودەمانە و هەروەها پاشماوەکانی سیستەمی پاشایەتی وەك: (کۆشکی پاشایەتی و کۆشکی ریحاب، بەلاّم وەکتر بەزۆری ئەو سەردانانەی کە لە ناوچە کورنشینەکان و شارە ئاوەدانەکانی ئەو دەمانەوە رێکدەخران بەرادەیەکی زۆر رێکخستنەکانی (پارتی) لەپشتەوەبوون وەك ئەوەی لە شارێکی ئاوەدانی وەك خانەقینی ئەودەمانە و ناوچەی (بنکورە)شەوە بەهەمانشێوە لەوانەبوون کە رێکخستنەکانی حیزبێکی سیاسی وەك پارتی دینامیکییەت و رێکخەریبوون لەلایەکیدیشەوە گەلێك کەسایەتی ژیر و هوشیاریش لەوانەبوون کە هەر بە خۆیان هەموو ئەو گۆڕانکارییانەی ولاّت وایلێکردن کە بەپیری ئەو بارودۆخەوە بچن و بروسکەی پیرۆزبایی و بەڵێن و وەفاداری خۆیانی بۆ دووپاتبکەنەوە (بروانە: هیوا، ژمارەی پێشوو،ل١٠٣ - ١٠٤).

جگەلەوەش لەمبارەیەشەوە و لە ٢٥ تەمووزی هەمانساڵەوە باسیلەوەکردووە: (ئەمرۆ چووم بۆ خانەقین بریاروابوو زوو بچم بۆ بەغا. کەچی کردمیانە هاورێی مەلا عارف بۆ ئەوەی پێکەوەبچین. ئەوەبوو دواتر نانی نیوەڕۆم لە ماڵی مەلا عارف خوارد و سەعات سێ سواری ئۆتۆمبیل بووین بۆ بەغدا، لە سەعات شەش گەیشتینە جێ و بۆ مەغریب لە ئوتێل (رشید جدید) یەکمانگرتەوە - مەبەستی ئەو شاندەیە کە لە کوردستانەوە چوو بوون - لە (ئوتێل رشید) خەوتین شەوی بە (٥٠٠ فلس)، بەلاّم بۆ رۆژی دواتر و واتە ٢٦ ی تەمووز ئەوەمان بۆدەگێڕێتەوە کە: (ئەمرۆ وەعدی ئەوەمان هەیە بچین بۆ لای (رئیس وزەرا) دواتر من و مەلا عارف لای (ئوتێل شهرزاد) چاوەڕێمانکرد وتیان قەراردراوە بۆ بەیانی رۆژی یەك شەممە). پێش ئەوەی بچنەسەر مەوعید و لە رۆژی دواتردا سەردانێکی

کۆشکی ریحابی بنەماڵەی شاهانە و لەناوچوو دەکەن و ئەوسا لەگەڵ شاندەکەدا کۆدەبنەوە چونکە بەخۆی لە یادداشتی رۆژی ٢٧ تەمووزدا ئەوەمان بۆ دەخاتەڕوو کە رۆژی یەك شەممە: (چووینە قەسر ریحاب و چەند سەعاتێ خەریکبووین، دوایی هاتینەوە بۆ ئوتێل (ترۆ کادیرۆ) وەفد هەمووی حازربوو لە سەعات یەك کەوتینەڕێ بۆلای وەزارەتی دیفاع کە چووین ئیبراهیم ئەحمەد یەك سەعات خوتبەیدا) بەجۆرێ مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد لە چوارچێوەی وتارەکەیدا کە لەم شوێنەدا بۆ شاندی کوردستانی داوە و هەروەك مامۆستا مستەفا نەریمان (١٩٢٥ - ١٩٩٥/٥/٢٧)یش کە لە شارێکی وەك کفری ئەو رۆژگارەوە ئامادەی هەمان رێوڕەسم بووە و لە (بیرەوەرییەکان)ی خۆیدا، بەتەواوی هۆی پێکهێنان و داوای وەفدەکەی شیکردووەتەوە (بڕوانە: نەریمان، ل ١٥٢) هەروەها لەم ماوەیەدا کەسایەتیەکی وەك ئیبراهیم ئەحمەد کە سکرتێری (پارتی دیموکراتی کوردستان) بوە و لە درێژەی و تارەکەیدا کە گەورەترین شاند و جەماوەری کوردستان تیایدا ئامادەبوون بە زۆری و بۆجارێکیدی باسی لە برایەتی نێوان کورد و عەرەب کردووەتەوە، هەر لە سالآنی سەرهەڵدانی ئایینی پیرۆزی ئیسلامەوە تا رۆژی گەیشتبووە ئەو گۆڕانکارییەی کە لەو رۆژ و سەروبەندەدا هاتبووەکایەوە، بەلاّم لە رۆژانی دواتردا مامۆستا مەلا عەزیز بەهەمانتەرز لە یادداشتەکانیدا لەسەر چۆنێتی رووداوەکان دواوە و باسی چۆنێتی گەڕانەوە و رێوڕەسمی گەڕانەوەی کردووە تا ئەوکاتەی گەیشتووەتەوە رۆژی ٢٩ تەمووز و لە یاداشتی رۆژانەی ئەمڕۆیدا تەنها یەك بەیت شیعری نووسیوەتەوە و زۆریش پێدەچێ هی خۆی بووبێ:

**کاکە تۆ مەگری کورد لە غەم دەرچوو**
**کاتێکت زانی وەکو شیر هەڵچوو**

بەلاّم لە ٧ ئابی ١٩٥٨ بەدواوە کە دەکاتە رۆژی پێنج شەممە بەهەمانشێوە ئەو رووداوانەی تۆمارکردووە کە پەیوەندییان بە شۆڕشی تەمووز و گۆڕانکارییەکانییەوە هەیە لەوانە چۆنێتی دەستاودەستکردنی وێنەی عەبدولکەریم قاسم لەناوخەڵکدا تادەگاتە ئەوەی لە ١٨ ئەیلولی ١٩٥٨دا دەنووسێ: (عەبدولکەریم قاسم بەیانی تەنفیزی تەقسیم ئەرازی

کرد) کەچی لێرە بەدواوە یادداشتەکانی ڕۆژانەی بۆئەوە تەرخانکردووە کە کەسایەتییەکی وەك مەلا مستەفای بارزانی چۆن لەلایەن حکومەتی تازەدامەزراوی عێراقەوە بڕیاری ئەوەی بۆ دەردەچێ کە بگەڕێتەوە عێراق و بەتایبەتی لە ١٩٥٨/١٠/٦ەوە کە بارزانی دوای ئەوەی سەردانی شاری (براغ)و (قاهیرە)ی ولاتی میسر دەکا و لەوێوە دەگاتەوە بەغدا و چۆن لەلایەن جەماوەرێکی گەورەی عێراقەوە بە کورد و عەرەبەوە سەرەڕای حیزبە سیاسییەکانی ئەوودەمانە لە (فڕۆکەخانەی موسەنا) پێشوازیلێدەکرێ کەسێکی وەك ئەمیش لە یاداشتەکانی خۆیدا نووسیویە: (ئەمڕۆ مەلا مستەفا ی بارزانی داخلی بەغدا بوو) هاوکات لە ڕۆژانی دواتردا زۆر بەتاسەوە دەچێتە شاری خانەقین و دەکەوێتە هەواڵپرسینی بارزانی: (چوومە خانەقین بۆ هەواڵپرسینی مەلا مستەفای بارزانی) تەنانەت لەو ڕۆژانەشدا کە کۆمەلانی خەڵك لە ناوچە جۆربەجۆرەکانی کوردستانەوە چوونەتە پێشوازی بارزانی ئەمیش بۆخۆی دەنووسێ کەوا لەگەڵ کۆمەڵێك لەهاوکارانیدا لەوانە مەلا شەریفی زەنگەنە و مامۆستایان محەممەد سەعید و کەمال ئەفەندی: (سە عات دوازدە لە خانەقینەوە کەوتینەڕێ بۆ بەغدا بۆ پێشوازی مەلا مستەفای بارزانی سەعات چوار و نیو چووینە (ئوتێل سەمیر ئەمیس) پاش هوتافات و خیتاب خۆرئاوابوو. دوایی چووین بۆ شارع ئەمین. شەو لە (فندق فەرەح کەوکەب) خەوتین.

ئەوەشی کە زیاتر پەیوەندی بە هەواڵەکانی شۆڕشی ١٤ی تەمووز و ناوچەی (بنکورە)ەوە بێ و لە یاداشتەکانی مەلا عەزیزی شاواز واتە (زیرەك)دا تۆمارکرابێ لە ٨ی مانگی تشرینی هەمانساڵدا ئەوەی بۆ باسکردووین کەوا: (ئەمڕۆ ڕەشەبایەکی توند و ساردی هات.. هەموو خەڵکی (سەوزبلاغ) لە (تازەدێ) دەعوەتبووین. مەولودی جمهورییەت بوو) واتە خەڵکی ئەو ناوچەیە یادەوەری خۆیان بۆ سەردەمی نوێ بەوشێوەیە بەڕێکردووە.

•••

# خالیدی کوڕی وەلید و پەیوەندی بە کورد دەوە

م. عەلی



## شێواندنی مێژووی کورد

لە دێرزەمانەوە مێژووی کورد دەشێوێنرێ چ لەلایەن نەیارانی کورد یان لەلایەن کورد خۆیەوە، ئەمەش بە ئەنقەست بووبێ یان لەبێئاگاییەوە، هەرکامێکیان بێ هەر لە خزمەتی ئەو پرۆسەی شێواندنەدابووە.. لەم بوارەدا بە دوو شێواز کارکراوە:

- خەڵکانێك لە عەرەب هەن کە کورد دەبەنەوەسەر رەچەڵەکی عەرەب .. لەمبارەوە د. ئەحمەد ئەلخەلیل زنجیرەی گێڕانەوەی تایبەتی بە رەچەڵەکی کورد دەباتەوەسەر ئیبن کەلبی و ئەبویەقزان.. دواتریش مەسعودی و هیتریش، ئەمانە لەکۆندا.. لە تازەشدا عەباس عەزاوی، یونس ئەحمەد ئەلسامەڕائی و هیتریش، بەلاّم خەڵکانێکیتریش لە عەرەب لەگەڵ ئەوەدا نەبوون کورد بچێتەوەسەر عەرەب وەکو: ئیبن خەلدون، مەقریزی، تەبەری، ئیبن ئەسیر، ئالوسی.. هتد.

دیارە مێژوونووسە عەرەبە شۆفینییەکان بەئەنقەست کاریان لەسەر شێواندنی مێژووی کورد کردووە کە هەریەکەیان بنەچە و رەچەڵەکی کورد دەبەنەوەسەر لایەك کە زۆرتر دووریدەخاتەوە لە رەچەڵەکی رەسەنی خۆی!.. ئەوان جارێك بە کورد دەڵێن نەوەی شەیتان و جارێك کورد لە دەربازبووەکانی دەستی ئەژدەهاك و بارێکیش لە تایفەی جنۆکەکانی سلێمانە.. هەندێك نووسەر ئەمە بۆ هۆکاری ئایینی، سیاسی، ئابووری، کۆمەلاّیەتی دەگەڕێننەوە.

میرزا شوکروڵڵای سەنەندجی لە لاپەڕە (١٠٠)ی کتێبی (تحفه ناصری..) دەنووسێ: (بەجۆرێك بەشێ لە نووسەران و لێکۆڵەران هەوڵیانداوە بە بەڵگەی بێبناغە کوردەکان نەك بەشێکی پاکنەژادی ئێرانییە بەڵکو کە خۆی لە بناغەی ئێرانییەتە، بە هۆزەکانی توورانی (تورك) یا سامی (عەرەب) یا کلدانییانی کۆن بناسێنن..).

نووسەرە عەرەبە شۆڤێنییەکان هەرگیز بڕواناکەن نەتەوەیەك بەناوی کوردەوە هەبێ، زۆر بە شانازییەوە زۆربەی هۆزە کوردەکان دەگەڕێننەوەسەر رەچەڵەکی عەرەب، وەکو ئەم هۆزانە: داودە، حەیدەری، جەباری، نەقشبەندی، بەرزنجی، بریفکانی، تاڵەبانی، کاکەیی، کاکەسووری، باشووری، جاف، زەنگنە، گەردی، بڵباس، بزێنی، خەیلانی، زراری، مزووری، سورچی، زەهاوی، خشناو، بابان، ئەیوبی.

هەندێ لەو نووسەرانە هەندێ لەو هۆزانە بە عەرەبی رەسەن دەزانن و لەکوردستاندا نیشتەجێبوون و بوونەتە کورد وەکو:ساڵەیی، هەرکی، باجەلان، دزەیی، یەزیدیی.

– ئەوەی جێگەی نیگەرانییە، خەڵکی کورد خۆیان بانگەشە بۆ گەڕانەوەسەر رەچەڵەکی عەرەب دەکەن.. بەپێی هەندێ سەرچاوە ئەم گەڕانەوەی کوردە بۆسەر رەچەڵەکی عەرەب بۆ سەدەی هەشتەمی زایینی دەگەڕێتەوە و لەو کوردانەی لەکۆندا ئەمەیان کردووە: حسێن کوڕی داود بەشنەوی، موعیزەدین ئیسماعیل کوڕی تەغتەکین پاشای ئەیوبی، ئیبن خەلەکان، محەممەد ئەفەندی کوردی، ئەبولفیدا ئیسماعیل پاشای ئەیوبی، دینەوەری، ئیبراهیم فەسیح حەیدەری، مامۆستا مەلا عەبدولکەریم مودەڕیس و هەندێکیتر.

دەمێکیشە لەکوردستاندا کورد خۆی دەستەمۆی ئەو بانگەشە و بیرە کۆنەپەرستییانە دەکات کە رەسەنی خۆی بباتەوەسەر یەکێك لە پیاوچاکانی عەرەب و لەم پێناوەشدا سەجەرە دروستکردن تائێستاش هەر باوە، هەرکەسێك بیەوێ بەئاسانی بۆی دروستدەکرێ، بەڵام نازانن ئەمە بەدیوەکەیتریدا بەشێکە لە سیاسەتی بەعەرەبکردن کە هەر لە کۆنەوە هەیە و پەیوەندی بە ناوەڕۆکی ئایینییەوە نییە، ئەگەرچی لەژێر چەتری ئایین و بانگەشەی ئایینیدا دەکرێ.

ئەو خانەدانە ئایینییانە یان کەسایەتییە ئایینییە عەرەبییانە زۆرن کە کورد دەبرێنەوەسەریان، یەکێك لەوانەش کەسایەتی خالیدی کوڕی وەلیدە کە خەڵکێکی زۆری لە تیرە و بنەماڵە و کەسایەتی کورد پێوەی پەیوەستن.

**ناوبانگی خالید لای کورد**

خالیدی کوڕی وەلید وەکو چۆن لای عەرەب و ئیسلام بە ئازایەتی ناوبانگی دەرکردووە و تەنانەت پێغەمبەری ئیسلام نازناوی شمشێری هەڵکێشراوی خوای لێدەنێ.. لای کوردیش بە پاڵەوان و کەسێکی گەورە و ئازا ناوبانگی دەرکردووە و خەڵکانێکی زۆر منداڵەکانیان بەناوی ئەوەوە ناوناوە، جگەلەوەی کە خەڵکان و بنەماڵە و تیرەکانیش هەروەکو ئاماژەپێیدرا خۆیان دەبەنەوەسەر ئەو.. تەنانەت لە شیعری کوردیدا ئازایەتی ئەو رەنگیداوەتەوە، هەروەکو شێخ رەزا لە وەسفی شێخ حەمیدی تاڵەبانیدا دەڵێ:

**حـــەیدەری کـەڕاڕە یاخود خالیدی ئیبنی وەلید**

**رۆستەمێکە رۆژی دەعوا بەینو بەینەڵلا حەمید**

**رەچەڵەکی خالید**

**لەسەری باوکەوە:**

هەموو سەرچاوە عەرەبی و ئیسلامییەکان رەچەڵەکی خالید لە سەری باوکیەوە ئاوا باسدەکەن: خالید کوڕی وەلید کوڕی موغەیرە کوڕی عەبدوڵلا کوڕی عومەر کوڕی مەخزوم کوڕی یەقزە کوڕی کیلاب کوڕی مەڕە کوڕی کەعب کوڕی لوئەی کوڕی غالیب کوڕی فەهر کوڕی مالیك کوڕی نەزر کوڕی کینانە کوڕی خەزیمە کوڕی مودریکە کوڕی ئەلیاس کوڕی مەزر کوڕی نزار کوڕی مەعد کوڕی عەدنان.. رەچەڵەکی خالید دەگاتەوە حەوتەم باپیری پێغەمبەر.

باوکی خالید، وەلید کوڕی موغەیرە، مامی ئوم سەلەمەی ژنی پێغەمبەر، گەورەی بەنی مەخزوم و دیارترین خانەدانەکانی قورەیش بووە، زۆر دەوڵەمەند و خاوەن پایەبوو، دارای زەویوزار و باخاتێکی زۆربووە، دەڵێن تەنانەت رێگەی نەدەدا جگەلەو کەس ئاگربکاتەوە بۆ ناندانی خەڵکیی بەتایبەتی لە وەرزی حەج و عوکازدا. وەلید باسی لە سورەتی (المدثر)ی قورئاندا هاتووە:

(ذَرْنِي وَمَنْ خَلَقْتُ وَحِيدًا، وَجَعَلْتُ لَهُ مَالًا مَّمْدُودًا، وَبَنِينَ شُهُودًا، وَمَهَّدتُّ لَهُ تَمْهِيدًا، ثُمَّ يَطْمَعُ أَنْ أَزِيدَ، كَلَّا إِنَّهُ كَانَ لِآيَاتِنَا عَنِيدًا، سَأُرْهِقُهُ صَعُودًا، إِنَّهُ فَكَّرَ وَقَدَّرَ، فَقُتِلَ كَيْفَ قَدَّرَ، ثُمَّ قُتِلَ كَيْفَ قَدَّرَ، ثُمَّ نَظَرَ، ثُمَّ عَبَسَ وَبَسَرَ، ثُمَّ أَدْبَرَ وَاسْتَكْبَرَ، فَقَالَ إِنْ هَذَا إِلَّا سِحْرٌ يُؤْثَرُ، إِنْ هَذَا إِلَّا قَوْلُ الْبَشَرِ، سَأُصْلِيهِ سَقَرَ، وَمَا أَدْرَاكَ مَا سَقَرُ، لَا تُبْقِي وَلَا تَذَرُ، لَوَّاحَةٌ لِّلْبَشَرِ، عَلَيْهَا تِسْعَةَ عَشَرَ.)

خالید سەر بە هۆزی بەنی مەخزومە کە یەکێکە لە تیرەکانی قورەیش و خێزانەکەی خالید پێگەیەکی دیاری لەناو بەنی مەخزومدا هەبووە.. ئەبوئومەییەی مامی بە دانایی ناسراوبووە، هیشامی مامیشی یەکێك لە خانەدان و ناودارەکانی قورەیش بووە.

خالید شەش برای بەم ناوانە هەبووە: ئەلعاس، ئەبوقەیس، عەبدشەمس، عەمارە، هیشام، ئەلوەلید.. دوو خوشکیشی بەم ناوانە هەبووە: فاتیمە و فازینە.

خالید لە خێزانێکی خۆشگوزەراندا پێگەیشتووە و فێری سوارچاکی بووە، هەر لە سەرەتاوە چابووك و بەدەستوبردبووە و توانیویەتی شوێنی خۆی لە گۆڕەپانی شەڕ و پێکادانەکاندا بکاتەوە.

**لە سەری دایکەوە:**

دایکی عەسماء کچی ئەلحاریسی کوڕی حەزن کوڕی بەجیر کوڕی هەزم کوڕی رووەیبە کوڕی عەبدوڵلا کوڕی هیلال کوڕی عامر کوڕی سەعسەعە کوڕی معاوییە کوڕی بەکر کوڕی هەوازن کوڕی مەنسور کوڕی عەکرمە کوڕی خەسفە کوڕی قەیسی عەیلان کوڕی مەزر کوڕی نزار کوڕی مەعد کوڕی عەدنان.. ناسراو بە لوبابەی بچووك.. هەندێك کەس دەڵێن لوبابەی گەورە.. لوبابە خوشکی مەیمون کچی ئەلحاریسی ژنی پێغەمبەرە.. کەواتە لەسەری دایکیشیەوە هەر دەچێتەوەسەر رەچەڵەکی پێغەمبەر.

**لەدایکبوونی:**

قسەی جیاواز لەسەر ساڵی لەدایکبوونی دەکرێ.. هەندێ سەرچاوە دەڵێن خالید ساڵی ٥٩٢ لە مەککە لەدایکبووە، هەندێکیش دەڵێن ساڵی ٥٨١ لەدایکبووە..
جیاوازییەکە ئەوەندە زۆر نییە و کۆکیشن لەسەر ئەوەی کە لە مەککەدا لەدایکبووە.

**پێش ئیسلامبوونی:**

خالیدش وەکو زۆربەی کوڕانی قورەیش دژی ئیسلام بوو، رقی لە پێغەمبەر بوو..یەکێك لەو جەنگاوەرانە بوو کە لە هەموو شەڕەکانی ناموسڵمانەکان بەرامبەر بە موسڵمانەکان دەیانکرد.




خالید رۆڵی گرنگی هەبوو لە سەرکەوتنی ناموسڵمانەکان لە شەڕی ئوحوددا کاتێ کە لە پشتەوە دزەی بۆ موسڵمانەکان کرد و بەسەریانا سەرکەوتن، هەروەها رۆڵی دیاری هەبوو لە شەڕەکانی خەندەق و حودەیبییە.

**ئیسلامبوونی:**

سەرچاوەکان بەتایبەتی تەبەری لە مێژووەکەیدا ب٢ ل١٤٥ دەڵێ کە خالید لە مانگی سەفەری ساڵی هەشتەمی کۆچی - ٦٢٩ی زایینی واتە شەش مانگ پێش گرتنی مەککە و نزیکەی دوو مانگ پێش شەڕی موئتە ئیسلام بووە.

وەلیدی برای خالید پێش خالید ئیسلامبووە، دیارە پێغەمبەر پێخۆشبووە کە خالید ئیسلام ببێ، بۆیە لە کاتی عومرەدا بە وەلیدی وتووە: ئەگەر خالید بێتەلامان ئەوا پێشیدەخەین.. وەلیدیش ئاگاداری خالید دەکاتەوە و بۆ ئەمەش هانیدەدات.. دەڵێن ئەمە بووەتە هۆی ئیسلامبوونی خالید.

دیارە ئەمەش موسڵمانەکانی دڵخۆشکرد و لەهەمانکاتدا نیگەرانی ناموسڵمانەکانی لێکەوتەوە.. یەکەم ناکۆکییەکیش لەنێوان خالید و ناموسڵمانەکاندا دەرکەوت کاتێ پێغەمبەر سریەی ئومەرای بۆ موئتە نارد تا تۆڵە لە بکوژانی حاریسی کوڕی عەمیر بکەنەوە و لەسەر ئەو هێزە زەیدی کوڕی حاریسە و جەعفەری کوڕی ئەبوتالیب و عەبدوڵڵای کوڕی رەواحەی دانا و ئەو سیانە لە شەڕەکەدا کوژران و خالید بە فەرماندەی ئەو هێزە دانرا و پارسەنگی شەڕەکەی بەلای موسڵمانەکاندا شکانەوە و ئازایەتی زۆری نواند تا ئەو رادەیەی نۆ شمشێر لەدەستیدا شکان.. پێغەمبەر هەواڵی سەرکەوتنی خالیدی پێگەیشت و وتی: خوایە ئەو شمشێرێکە لە شمشێرەکانی تۆ.. بەمەش لەو رۆژەوە خالید بە شمشێری خوا ناوبرا.

**دوای ئیسلامبوونی:**

نووسەر جیهاد عەلاونە لە بابەتێکیدا (لەبارەی خالیدی کوڕی وەلیدەوە) دەڵێ: "ئەگەر خالید کوڕی وەلید لەدایکنەبوایە ئەوا ئیسلام لەسەر رووی زەوی نەدەبوو، ئەو ئیسلامی بلاّوکردەوە و لەپێناویدا شەڕی لەگەڵ فارس و رۆمدا کرد..".

خالید دوای ئیسلامبوونی زۆر دڵسۆزانە هەڵوێستی خۆی دەنواند بۆ شەڕکردن لەپێناوی ئیسلامدا.. ئەو یەکێك لەو چوار فەرماندەیەی سوپای ئیسلام بوو بۆ رزگارکردنی مەککە، خالید یەکەم کەس سەرکەوتنی بەدەستهێنا و موسڵمانان چوونەناو مەککەوە.. دوای رزگارکردنی مەککە پێغەمبەر ناردیەسەر تیرەی نەخلە بۆ تێکشکاندنی عەزای گەورەترین بتەکانی قورەیش.. پاشان ناردیەسەر بەنی جوزەیمە، بەلاّم خالید خەڵکێکی زۆری لێکوشتن.. هەندێك دەڵێن خالید گومانی لە ئیسلامبوونەکەیان هەبووە، بەلاّم هیتر دەڵێن گوایە کاتی خۆی ئەم هۆزە مامێکی خالیدیان کوشتووە و ئەمەی لە تۆڵەی ئەوەدا کردووە.. کاتێ هەواڵ دەگاتە پێغەمبەر توورەدەبێ، بەلاّم سزاینادات و بگرە فەرماندەیی چەندین سریەی پێدەسپێرێ و پێشەنگی سوپای موسڵمانان دەکات وەکو شەڕی حونەین و تائیف و دەومەتولجەندەل و هیتریش. لەدوای مردنی پێغەمبەر، خالید بەشداری لە شەڕی هەڵگەڕاوەکاندا کرد و رۆڵی بەرچاوی بۆ لێدانیان و گەڕاندنەوەی زۆریان بۆ سەر ئیسلامەتی بینی.. هەروەکو مەحمود شاکر لە کتێبی (التاریخ الاسلامی) ب٣ ل٦٩دا هاتووە: "ئەبوبەکر (١١)ی لیوای بۆ شەڕی هەڵگەڕاوەکان لە هەموو ناوچەکانی دوورگەی عەرەبیدا پێکەوەنا..) یەکێك لەوانە خالیدی کوڕی وەلید بوو کە ناردی بۆ سەر تولەیحەی بەنی خوەیلدی ئەسەدی، کە لە ئەو تەواوبوو دەچێتەسەر مالیکی کوڕی نوەیرەی یەربوعی تەمیمی لە بیتاح. لەم شەڕانەدا مالیکی کوڕی نووەیرەی کوشت کە دوای مردنی پێغەمبەر زەکاتدانی قەدەغەکردبوو.. کاتێ کە گلەیی هاتەسەر، ژنەکەی لە خۆی مارەکرد، هەرچەندە هەندێك دەڵێن ژنەکەی جوان بووە و مێردەکەی کوشتووە تا مارەیبکات، کاتێك عومەر بوو بە خەلیفە لە تۆڵەی ئەمەدا یەکسەر خالیدی لە فەرماندەیی سوپا لابرد. دوای ئەمە چووەسەر هێزەکەی موسەیلیمە و لەشەڕێکدا کوشتی کە ژمارەیەکی زۆریش لە موسڵمانانی تێداکوژرا بەتایبەتی ئەوانی قورئانیان لەبەربوو.

دوای کۆتاییهاتنی هەڵگەڕاوەکان، خەلیفە ئەبوبەکر، خالیدی نارده عێراق و توانی بەسەر فارسەکاندا لە ئەبلە و مەزار و وەلجە و ئەلیس سەرکەوێ و بەرەو حیرە و ئەنبار پێشڕەویبکات و

بیانگرێت ودواتریش روویکردە عەین تەمر و دەومەتولجەندەل و ئەوانیشی گـرت و دەسـەلاتـی بەسەر حەسید و خەنافس و مەسیخدا سەپاند تادەگاتە فیراز و ئەرزولسەواد لەنێـوان دیجـلـە و فوراتدا. دوای سەرکەوتنەکانی لەعێراقدا ئەبوبەکر بۆ پشتیوانیکردنی سوپای مـوسـلـمـانـان و رووبەڕووبوونەوەی رۆم رەوانەی ولاتی شامی کرد.. لەڕێگەی بیابانی سەماوەوە بە سوپایـەکـەوە بەڕێکەوت لە ماوەی پێنج شەودا گەیشتە ولاتی شام، لەوێ بینی چەند سوپایەك لەیـەرمـوکـدا هەیە، پێشنیاریکرد یەك سوپا هەبێ، فەرماندەکان هەڵیانبژارد بۆ رێکخستـنـی سـوپـاکـە و دابەشکردنەوەی پێش شەڕی یەرموك.. لەوکاتانەدا ئەبوبەکر مرد و عومەری کوڕی خەتاب بـووە خەلیفە و یەکسەر نووسراوێکی نارد بۆ ئەبوعوبەیدەی جەڕاح ببێتە فەرماندەی سوپاکە و خالیـد دووربخرێتەوە، بەلام ئەبوعوبەیدە نامەکەی شاردەوە تا شەڕەکە کۆتاییهات.

**ژن و منالّ:**

مێژوونووسان قسەی جیاواز لەسەر ژن و منالّی خالید دەکەن کـە دەکـرێ بـە چـاوی گومانەوە بڕوانرێتە ئەو زانیارییانە.. هەیە دەڵێت کەوا هەرگیز ژنی نەهێناوە، هەیە دەڵێت ژنـی هێناوە و نەوەی نەبووە، هەشە دەڵێت ژنی هێناوە نەك یەك ژن بەڵکو چەندین ژنی هـێـنـاوە و نەوەشی لێیانهەبووە.

تەبەری لە مێژووەکەیدا باسی بەشداریکردنی خالید لە شەڕەکانی پێش ئیسلامـبـوون و دوای ئیسلامبوون و ناردنی بۆ عێراق و شام و زۆر شتیتریش دەکات، بەلام بە هیچ شـێـوەیـەك باسی ژن و ژنهێنانی ناکات کە تەبەری باسی ژنهێنانی عومەر و عەلی و خەڵکانیتریش دەکات.. کەچی هەندێك سەرچاوە باسی چەندین ژنی خالد دەکەن لەوانە:

- کەبشەی کچی هەوزەی کوڕی ئەبوعەمر، سلێمانی کوڕی خالیدی بووە.
- ئوم تەمیمی سەقەفییە، عەبدوڵلای کوڕی خالیدی بووە.
- کچێکی ئەنەسی کوڕی مودریکی خەسعەمی، عەبدولڕەحمان و موهاجیر و عەبدوڵلای گەورەی کوڕانی خالیدی بووە.
- ئوم سەلەمە هیند کچی سوهێل کوڕی موغەیرە کە ئامۆزای خۆی بووە.
- کچێکی مەجاعەی کوڕی مەرارە لە بەنی حەنیفە.
- لەیلای ژنی مالیکی کوڕی نوەیرەی بەنی تەمیم دوای کوشتنی مالیك مارەیکرد.

سایتی ویکیپیدیا لەبارەی خێزانەکەی خالیدی کوڕی وەلیددا نووسیویەتی: "بەوردی نازانرێ چەند منالّی هەبووە، بەلاّم دەوترێ چل لە منالّەکانی خالید لە تاعونی عەمواسدا سالّی ١٧ یان ١٨ی کۆچی مردوون، سێ لەو منالاّنەی مابوونی دەناسرێنەوە: سلێمان، موهاجیر، عەبدولڕەحمان".

سەرچاوە مێژووییەکان ئاماژە بە تاعوونی عەمواس دەکەن کە لە سالّی ١٨ی کۆچیدا روویداوە و خەلّکێکی زۆری کوشتووە، هەروەکو تەبەری لە لاپەڕە (٤٨٧)ی بەرگی دووی مێژووەکەیدا باسی ئەم تاعوونە دەکات کە تێیدا "ئەبوعوبەیدەی جەڕاح، مەعازی کوڕی جەبەل، یەزید کوڕی ئەبوسوفیان، حاریسی کوڕی هیشام، سوهەیلی کوڕی عەمرو، عوتبەی کوڕی سوهەیل.. مردن"، هەروەکو لە لاپەڕە (٥٠٩)دا دەلّێ: (لەم تاعوونەی عەمواسدا بیست و پێنج هەزار کەس مردن).

ئیبن ئەسیریش لە لاپەڕە (١٧٠)ی کتێبی (الکامل فی التاریخ)دا لەبارەی تاعوونی عەمواسەوە باسی ئەوە دەکات کە لە سالّی ١٨دا روویداوە و تێیدا ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەڕاح، مەعازی کوڕی جەبەل، یەزیدی کوڕی ئبوسوفیان، حاریسی کوڕی هیشام، سوهەیلی کوڕی عەمرو، عوتبەی کوڕی سوهەیل، عامری کوڕی غەیلانی سەقەفی.. مردوون. دیارە کە هەندێک سەرچاوە باس لە مردنی کەسەکانی خالید دەکەن لەم پەتای تاعوونەدا تێداچوون و نەماون.

هەندێك سەرچاوەیتر دەلّێن کەوا خالید پێنج کوڕی هەبووە: سلێمان، عەبدوللاّی گەورە، عەبدوللاّی بچووك، موهاجیر، عەبدولڕەحمان.

لە وتاری (چەند لایەنێك لە ژیانی کەسێتی خالیدی کوڕی وەلید)ی (د. عەبدولعەزیز بن ئیبراهیم ئەلعومەری)دا هاتووە: "زوبێری وایبۆچووە کە منالّەکانی خالید هەموویان تیاچوون و کەسیان نەماوە، کۆمەلّێك لە بەنوموغەیرە لە غەیری زوریەتی خالید بوونەتە میراتگریان، هەرچەندە هەندێك لە مێژوونووسان هەندێك لە هۆز و تیرەکان دەگەڕێننەوەسەر خالیدی کوڕی وەلید، لەگەلّ ئەوەشدا هەندێ لە لێکۆلّەران پشتیوانی نەمانی زوریەتی خالید دەکەن".

هەندێك سەرچاوەش دەلّێن دوای مردنی خالید خانووەکەی بە میراتی درایە ئەیوب کوڕی سەلەمەی ئامۆزای، بەپێی ئەو بنەواشەیەی کە دەلّێت میرات بۆ ئامۆزا نابێت مەگەر لە باری نەبوونی زوریەتدا. وەکو لەسەرچاوەکاندا هاتووە زۆر لە زانایانی رەگەز دەلّێن خالید کەسی لەدوا نەماوەتەوە، وەکو: موسعەبی زوبێری لە کتێبی (نسب القریش)و زوبێری کوڕی بەکار لە

کتێبی (النسب)و ئیبن قودامەی مەقدیسی لە کتێبی (التبیین فی انساب القرشیین)و ئیبن فەزلولڵای عومەری لە کتێبی (مسالك الابصار فی ممالك الامصار) ئەمانە هەموویان کۆکن لەسەر نەمانی زۆرییەتی خالید.. ئیتر ئەو خۆبردنەوەسەر خالیدە لەکوێوە هات؟.

**سەرەتای هاتنی ئیسلام بۆ کوردستان**

کەمال بورقای لە لاپەڕ "١٢٦ – ١٢٧"ی کتێبی (کورد و کوردستان)دا دەڵێ:

(لە ساڵی ٦٣٣ ی زایینی عەرەبەکان هێرشیان بۆ داگیرکردنی ناوچەکانی سەربە ئێران و عێراق دەستپێکرد، یەکەم شەڕی گەورەی عەرەبەکان لەگەڵ ساسانییەکان ساڵی ٦٣٧ی زایینی لە لێوارەکانی چۆمی دیجلەی ناوچەی قادسییە کرا.. ئێرانی شکستیانخوارد و پاشای ساسانی بەناوی یەزدگوردی سێهەم پەنای بۆ وڵاتی میدیا برد.. پاشاکانی ئێرانی هەرکات تووشی وەزعێکی دژوار هاتوون پەنایان بۆ میدیا بردووە کە ڕەنگە لەبەر چڕ و شاخاویبوون و گەلی بەهێزی نیشتەجێ، پەناگایەکی جێمتمانە بووبێت.

لەشکری عەرەب رووی لەهاتنەناو ئێران کرد، هەر ئەوساڵە، عەرەبەکان شاری حلوان یا حەلەوانیان داگیرکرد کە لە زنجیرە چیاکانی زاگرۆس شوێنی تێکەڵبوونەوەی ڕێگای موسڵ و کرماشان هەڵکەوتبوو، مێژوناسی عەرەب بەناوی ئەلیاقوبی باسدەکات کە کورد و فارس و عەرەب لەو دەڤەرە لە سەدەی نۆهەمدا ژیاون (عەرەبەکان دوای داگیرکردنی ئەوشارە لێینیشتەجێبوون).

سوپای عەرەب بەرەو باکوور درێژەی بەپێشەوەچوون دا، رووخ و لێوارەکانی چۆمی دیجلەی گرتەپێش، تەواوی قەلا و سەنگەری کوردەکانی لە دوو لێواری چۆمەکە داگیرکرد، ئەو ناوچەیە بەشێکی شاری مێژوویی ئادیابەنەی کوردستانی ئیمرۆکەی عێراقی پێکدەهێنا.

دووهەمین هێرشی گەورەی عەرەبەکان دژی کورد و گەلانیتری ئێران لە ساڵی ٦٤٠ی زایینی لە ناوچەی نەهاوەندی میدیا کرا، ئەو هێرشە نەخشێکی چارەنووسسازی لە داهاتووی ئەو گەلانەدا گێڕا..).

**قسەی جیاواز لەمەڕ هاتنی سوپای ئیسلام بۆ کوردستان هەیە:**

هەیە دەڵێ کە سوپای ئیسلام بەشێوەی ئاشتییانە هاتووەتە کوردستانەوە و شەڕی

نەکردووە و خەڵکەکە دەستی خۆبەدەستەوەدانی بەرزکردووەتەوە.. هەشە دەڵێ کەوا سوپای ئیسلام بە شەڕ و کوشتار و ئابلۆقە و شمشێرەوە هاتووە، هەروەکو بروسك بۆتانی لە بابەتێکیدا لە ئینتەرنێتدا بلاوکراوەتەوە باسیدەکات: (دەبێ هاشم کوڕی ئەبی وەقاسی برای سەعد لە حەلوانی کورددا و دواتر لە کرماشانی کورددا کە عەرەب کردیانە قرمیسین چیبکات؟ دەبێ لەشکری حوزەیفەی یەمانی لە نەهاوەندی کورددا چیبکات؟ ئەی لەشکری ئەبوموسای ئەشعەری لە سیروانی کورددا چیدەکرد؟ ئەی لەشکری عەزرەی کوڕی قەیس لە شارەزووری کورددا چیدەکرد؟ ئەی لەشکری عیازی کوڕی غەنەم لە سروج و رەها و ئامەد و فارقین لە باکووری کوردستاندا چیدەکرد؟).

کە تەماشای کتێبە مێژووییەکانی مێژوونووسانی وەکو: بلازەری، واقیدی، تەبەری، مەسعودی، یەعقوبی، ئیبن ئەسیر.. هتد، دەکەین، دەبینین ناوی کۆمەڵێك فەرماندەی عەرەبی - ئیسلامی دێنن کە فەرماندەی سوپای عەرەبی - ئیسلامی بوون، بۆ داگیرکردنی شار و ناوچە کوردنشینەکان هاتوون، وەکو:

قەعقاع کوڕی عەمرو، سەعد کوڕی وەقاس، عیاز کوڕی غەنەم، سوهەیل کوڕی عودەی، عەبدوڵلا کوڕی عەتبان، عەقبە کوڕی وەلید، حەبیب کوڕی موسلیمەی ئەلفەهری، عەزرەی کوڕی قەیس، عەتبە کوڕی فەرقەد، عروە کوڕی زەیدی ئەلتائی، ئیمام حەسەن، عەبدوڵلا کوڕی عومەر، ئەبوعوبەیدەی ئەنساری، حوزەیفەی یەمانی، قەسەم کوڕی عەباس کوڕی عەبدولموتەلیب، هاشم کوڕی وەقاس، ئەبوموسای ئەشعەری.. دیارە ئەمەش بەپێی بەرنامەی داڕێژراوی ئیسلام کراوە کە لەسەر سێ بنەما بووە: یان ئیسلامبوون یان سەرانەدان یان شەڕ.

هەروەکو لە کتێبی مێژووی مەردۆخ لاپەڕە "١٢٩-١٣٠"دا هاتووە: (لە ساڵی ١٨ کۆچی بە فەرمانی خەلیفەی دووەم و لەژێر سەرکردایەتی ئیمام حەسەن و عەبدوڵلای کوڕی عومەر و ئەبوعوبەیدەی ئەنساری و چەند کەسێکیدیکە لە سەردارانی ئیسلام، سوپای ئیسلام بەرەو ئێران بەڕێدەکەوێت، لە عێراقی عەرەب گوزەردەکەن، لە ناوچەی کرماشان ئیمام حەسەن و حوزەیفەی یەمانی و قەسەم کوڕی عەباسی کوڕی عەبدولموتەلیب لەگەڵ سوپایەکی چەند هەزار کەسی پێکهاتوو لە سوارە و پیادە بۆ گرتنی هەمەدان، رەی و مازندەران هەوڵەکانیان دەستپێدەکەن.. عەبدوڵلای کوڕی عومەر و ئەبوعوبەیدەی ئەنساریش لەگەڵ پێنج هەزار سوار بەرەو شارەزوور بەڕێدەکەون، شەوانە لە رووباری سیروان دەپەڕنەوە و بەرەبەیانی لەبەرامبەر

سوپای کوردان که بۆ بەرگریکردن ریزیانبەستبوو، ریزدەبەستن.. لە هێرشی یەکەم ئەبوعوبەیدەی ئەنساری دەکوژرێ، لە هێرشی دووەم و سێیەم – جەنگەکە سێ رۆژ درێژەیکێشاوە – سوپای ئیسلام سەرکەوتن بەدەستدێنێت و دەشتەکە بە خوێنی کوردەکان رەنگیندەکەن و گوندەکان وێران و ئاتەشکەدەکان دەڕووخێنن.. ژنان و کچان ئەسیر و تالانییەکان کۆدەکەنەوە و دەیبەن، پاشماوەی دانیشتوان بە باوەڕهێنان بە ئیسلام رزگاریاندەبێت.. عەبدوڵلا کوڕی عومەر چەند مانگێك لەو ناوچەیە دەمێنێتەوە، لەجیاتی ئاتەشکەدەکان مزگەوت و پەرستگا ئیسلامییەکان دروستدەکات و یاسا و رێساکانی ئیسلام لەو ناوچەیە بلاودەکاتەوە، دواتر رێگای پاوە دەگرێتەبەر، لەوێ کوشتاری بەکۆمەڵی کوردان دەستپێدەکات، ژن و کچەکان ئەسیر و تالانییەکان بە سەربازەکان دەبڕێت.. عەبدوڵلای کوڕی عومەر سوپاسالاری ئیسلام، لەو ناوچەیە مزگەوتێکی گەورە دروستدەکات و یەکێك لە کوڕەکانی مەعازی کوڕی جەبەل لەگەڵ دەستەیەك لە عەرەبەکان لەو ناوچەیە بەجێدێڵێت. مەعازی کوڕی جەبەل و عەرەبەکانی هاوڕێی دەست بەسەر ژن و کچی کوردە کوژراوەکاندا دەگرن و دەیانکەنە هاوسەر و کەنیزی خۆیان و چەند منالێیان لەوان دەبێت.. لەئێستادا دانیشتوانی پاوە و گوندەکانی دەوروبەری، رەچەڵەکی خۆیان بۆ مەعازی کوڕی جەبەل و عەرەبەکانی هاوڕێی دەگەڕێننەوە.

عەبدوڵلای کوڕی عومەر، لە ماوەیەکی کەمدا، دەست بەسەر کوردستاندا دەگرێ، هەموو ئاتەشکەدەکان وێران و مزگەوتەکان بنیاتدەنێت و یاسا و رێساکانی ئیسلام بلاودەکاتەوە..).

ئەمە بەڵگەیەکی راشکاوە کە سوپای ئیسلام رووبەڕووی شەڕی بەرگری خەڵکی کوردستان بوونەتەوە.. بەڵگەش هەموو سەرچاوەکان باسی شەهیدبوونی ئەبوعوبەیدەی ئەنساری لە شارەزووردا دەکەن.. ئەگەر شەڕنەبووە بۆ شەهیدبووە؟ ئەگەرچی گوماندەکەم لە هاتنی عەبدوڵلای کوڕی عومەر و دروستکردنی مزگەوت بەو دەمودەستە لەکوردستاندا!

### شەڕی جەلەولا و داگیرکردنی کرماشان و شارەزوور

یەکەم ناوچەیەکی کوردنشین کە رووبەڕووی شەڕبووەتەوە ناوچەی جەلەولا بووە.. هەروەکو لە (مێژووی تەبەری) ج٢، لاپەڕە "٤٧٢"دا هاتووە: (داگیرکردنی جەلەولا لە سەرەتای زیلقەعدەی ساڵی شازدەهەمدا بوو، لەنێوان داگیرکردنی جەلەولا و مەدائیندا نۆ مانگ هەبوو).

له کتێبی (تەجاریبوئومەم)ی ئیبن مەسکەوییه ج١، لاپەڕە "٢٢٥ -٢٢٦"دا لەبارەی شەڕی جەلەولاوە دەنووسێ: (لەورۆژانەدا سەد هەزار یان زیاتریان لێکوژرا، لاشەی کوژراوەکان ئەو ناوەی لە بەردەم و دواوە داپۆشیوە، بۆیە بە "رووداوی جەلەولا" ناونراوە. خەڵکی لە جەلەولادا دابەشکران هەروەکو لەشارەکانیترشدا دابەشکران، دەوترێت: بەسەر سی هەزار هەزاردا دابەشکران و پێنجیەکی ئەمە شەش هەزار هەزار بوو، ژنە دیلەکانیش دابەشکران و لە موسڵمانەکان منالیان بوو..).

محەممەد ئەمین زەکی لە لاپەڕە "١٠٣ -١٠٤"ی کتێبی (کورد و کوردستان)دا دەنووسێ: (تاریخ دەڵێ، حەزرەتی "سەعد بن وەقاس" لەدوای فەتحی "مەداین" لەژێر قوماندای "هاشم بن عەتبە"دا و لە تاریخی ١٦ی هیجریدا "مارتی ٦٣٧ی میلادی" ئۆردوویەکی ناردەسەر "جەلەولا"، چونکە بەقایای ئۆردووی فورس لەوێ گردبووبووەوە و "یەزدەجرد"یش لە "حەلوان" بوو، ئۆردووی ئیسلام لەپاش شەڕێکی موناسب فورسیان دەرپەڕاند و حەزرەتی "قەعقاع" شوێنیان کەوت و "حەلوان"ی زەوتکرد.. سەیر ئەوەیە مێژوونووسێکی کورد وشەی حەزرەت بەکاردێنێ بۆ "قەعقاع" کەچی ئەم وشەی حەزرەتە لای عەرەبەکان خۆیان ئەوەندە بەکارنایەت. هەروەها لە لاپەڕە "١٠٤"دا دەنووسێ: (لەدوای فەتحی "تکریت"و لە ساڵی ١٨ی هیجریدا حەزرەتی "سەعد بن وەقاس" لە قوماندای "عیاز بن غەنەم"دا بە ئەمری حەزرەتی عومەر "رەزییەڵلاهو عەنهو" بۆ فەتحی "جزیرە" سێ قۆڵی رێکخست:

- قۆڵی ئەوەڵ: لەژێر قوماندای "سوهەیل بن عودەی"دابوو، روویکردە "ریققە"
- قۆڵی دووەم: لە ئیدارەی "عەبدوڵلا بن عەتبان"دابوو، روویکردە "نەسیبین"
- قۆڵی سێیەم: لە قوماندای "عەقبە بن ئەلوەلید"دا روویکردە "جزیرە".

ئینجا لە لاپەڕە "١٢٥"دا دەنووسێ: (حەزرەتی عیاز، حەبیب بن موسلیمە ئەلفەهری)ی لەگەڵ قوەتێکدا لە کوردستانەوە ناردەسەر مەلاتییە و زەوتیکرد.. لە ساڵی "٢١"ی هیجریدا ئەوەڵەن "عومەر عەزرە بن قەیس" لە "حەلوان"ەوە روویکردە "شارەزوور"، ویستی فەتحیبکات، بەلام بۆی نەهات.. لەدواییدا "عەتبە بن فەرقەد" لەگەڵ قوەتێکی موناسیبدا دیسان روویکردە "شارەزوور"و لەدوای شەڕێکی قورس زەوتیکرد و لەم شەڕەدا کورد گەلێ زاییعاتی بوو و ئۆردووی زۆری لێشەهیدبوو.. "ئەلکامیل").

دیاره مێژوونووس محەممەد ئەمین زەکی ئەمەی لە کتێبی ئەلکامیلەوە هێناوەتەوە و هەمانشتیش ئەلتەبەری دەیڵێتەوە.. لە لاپەڕە "٤٧٠"ی ج٢ی "مێژووی ئەلتەبەری"دا باسی ئەوە دەکات کە "هاشم" داوای لە "قەعقاع بن عەمرو" کرد، شوێنیانبکەویٚ، شوێنیانکەوت تاگەیشتە خانەقین کە "یەزدەجرد" تێکشکا، لە حەلوانەوە بەرەو ئەلجیبال ڕۆیشت.

د. حیسامەدین عەلی نەقشبەندی لە لاپەڕە (١٧٤)ی کتێبی (شارەزوور و لوڕستانی باکوور لە سەدەکانی ناوەڕاستدا) دەنووسێ: "تێبینیدەکرێت شارەزوور لەگەڵ فەتحکردنی (سامغان و داراباد) فەتحکراوە و دوای فەتحکردنیشی خرایەسەر موسڵ تا لەکۆتایی خەلافەتی (ئەلڕەشید)دا لێیجیابووەوە.. شارەزوور بەرەنگارییەکی بەهێزی فەتحی ئیسلامی کرد بەجۆرێك (عوروە کوڕی قەیسی ئەلبەجلی) کە لەلایەن (جەریر کوڕی عەبدوڵلاٚ)ەوە کرابوو بەجێنشینی حەلوان لە ڕۆژگاری (عومەری کوڕی خەتاب)دا هەوڵی فەتحکردنی شارەکەی دا، بەلاٚم نەیتوانی و (عوتبە کوڕی فەرقەد ئەسولەمی) دوای ئەوەی تکریتی فەتحکرد هاتە فریای و چەندین شەڕی خوێناوی لە دەوروبەری شارەزوور روویدا و خەڵکێکی زۆر لە کوردەکان تیایدا کوژران و زۆریش لە موسڵمانەکان شەهیدبوون لەکاتی کوشتاردا).

### ئایا خالیدی کوڕی وەلید هاتووەتە کوردستان؟

هەموو سەرچاوە گەورە و گرنگەکانی مێژووی ئیسلام و عەرەب و مێژوونووسەکانی وەکو: بلازەری، تەبەری، ئیبن ئەسیر، قودامە کوڕی جەعفەر.. باسی شەڕەکانی قادسییە، جەلەولا، حەلوان، شارەزوور دەکەن و ناوی فەرماندەکانی ئەو شەڕانەیان نووسیوە، بەلاٚم بە هیچ جۆرێ ناوی خالیدی کوڕی وەلیدیان نەهێناوە.. ئەوان لە گێڕانەوە مێژووییەکانیاندا باسی ئەوە دەکەن کە خالید هاتووەتە خوارووی عێراق و لەوێوە بەرەو شام چووە، تەنانەت باسی ئەوە دەکەن کە خالید ڕەها و سومەیسات و حەڕان و نوسەیبین و ئامەدی نەگرتووە و لەلایەن فەرماندەکانیترەوە داگیرکراوە کە لە چوارچێوەی دەسەلاٚتی خالیددا بوون.. بە هیچ شێوەیەك ئاماژەیەك نییە کە خالید هاتبێتە ناوچەکانی جەلەولا، خانەقین، حەلوان، شارەزوور، هەولێر، سنجار.

لەوانەیە تەنیا سەرچاوەیەك کە زۆر باوەڕپێێناکرێ کتێبی (لە ولاٚتگیری ڕەشەخاکی عێراق)ە کە لە زمانی واقیدییەوە دەگێڕێتەوە، باسی هاتنی خالیدی کوڕی وەلید بە چوار هەزار

سوارەوە بۆ کوردستان لەسەر بڕیاری خەلیفە عومەر، دەکات، لە لاپەڕە (٣١)دا دەنووسێ: (جا عومەر لە وەرامی نامەکەدا پیرۆزبایی سەرکەوتنی لێکردن و فەرمانیدانێ کە لەسەر نەبەرد و خەبات لەڕێی بلاوکردنەوەی ئیسلام بەردەوامبن، چوار هەزار سوار بخەنە ژێر فەرماندەیی خالید و دەستەیە لەو یارانەی سەرانی ئیسلام لەگەڵی بن: زوبێر کوڕی عەوام، فەزڵ کوڕی عەباس، میقداد کوڕی ئەسوەد، عەبدولڕەحمان کوڕی ئەبوبەکر، عەبدوڵلا کوڕی عومەر و زەراری کوڕی ئەزوەر، ئەمانە بەرەو شارەزوور و دێهاتەکانی چیا بکەونەڕێ).

**ئەوەی لەم قسەیە ئیراد دەگیرێ ئەوەیە کە:**

- نەبیستراوە ئەبوعوبەیدە نامەی بۆ خەلیفە عومەر نووسیبێ تا خەلیفە عومەر بڕیاربدات خالید بڕواتە هەرێمی چیا، بەڵکو ئەوەی دەزانرێ کاتێ عومەر بووە خەلیفە یەکسەر خالیدی لە سەرلەشکری شام لادا.

- ئەم کەسانەش: زوبێر، فەزڵ، میقداد، عەبدولڕەحمان، عەبدوڵلا، زەرار.. بەپێی سەرچاوەکان هیچیان نەهاتوونەتە کوردستان.

مەحمود شاکر لە کتێبی (التاريخ الاسلامى)دا باسی ئەوە دەکات کە خەلیفە عومەر نامەی بۆ ئەبوعوبەیدە نووسی کە ئەو هێزانەی لە عێراقەوە لەگەڵ خالید کوڕی وەلیددا بوون بنێرێتەوە بۆ عێراق.. ئەبوعوبەیدەش دوای داگیرکردنی دیمەشق بە فەرماندەیی هاشمی کوڕی عەتبەی کوڕی ئەبووەقاسدا ناردنیەوە، ئەو هێزانە لە شەڕەکانی ئەلنەماریق و ئەلجیسر و ئەلبوەیب و ئەلقادسییە و جەلەولا و مەدائین و حەلوان و تکریت و موسڵ و ماسەبزان و ئەهواز سەرکەوتن.. لەم شەڕانەدا خالید بەشدارنەبوو، بەڵکو لە شامدا مایەوە.

لە لاپەڕە (٢٠)ی کتێبی (ولآتگێری ڕەشەخاکی عێراق)دا هاتووە: (.. خالید لە موسڵەوە هاتووە بەرەو هەولێر و لەوێوە بەرەو هەرمووت و لەوێوە بەرەو میرزا ڕۆستەم و لەوێوە بەرەو مەرگە و پشدەر و هەرێمی سویسنی و شوربە و ربەت، ئینجا چوون بەرەو سابلاغ ز لەوێوە بۆ ئورمیە و هەروا بۆ بانە و هەموو ولآتی ئازەربایجان کە هەموویان بە ئاشتی و بێشەڕ خرانەژێر دەستی موسڵمانان.. پاشان خالید بەسەر سماقولیدا گەڕاوەتەوە و لەو دۆڵەدا کە ئەمڕۆ پێیدەڵێن دۆڵی ئەسحابان سەت و پەنجا کەس لە هێزی موسڵمانان دەکوژرێ.. خالید درێژە بە شەر دەدا، پاشان بەرەو موسڵ دەگەڕێتەوە لەوێوە چووە بەرەو حیمس.. ئەوەبوو پاشان هەر لەوێ مرد).

ئەم قسەیەی واعیزی پشت بەو سەرچاوەیە دەبەستێ کە گوایە هی واقیدییە و دەستنووسە و ئەو کردوویەتی بە فارسی.. لە هیچ سەرچاوەیەکی ئیسلامی - عەرەبیدا ئەم هاتنەی عومەر بۆ ئەو ناوچانەی کە ئاماژەپێیداوە کە کوردستانە پشتڕاستناکرێتەوە و جێگەی گومانە، گومانەکەش لەوەدێت کە لە هیچ سەرچاوەیەکدا باسی ئەو دەستنووسەی واقیدی نەکراوە کە گەیوەتە دەست مەلا سەمەدی مەرگەیی؟! مەلا جەمیلی رۆژبەیانیش لە پەراوێزی (٢)ی لاپەڕە (٢٣- ٢٤)ی هەمان کتێبدا ئەوە رەتدەکاتەوە کە خالید هاتبێتە کوردستان.

## خۆبردنەوەسەر خانەدانە ئایینییەکان

هەر لە کۆنەوە کار لەسەر ئەوە کراوە کە ناسنامەی کورد بشوێنرێ و لە رەچەڵەك و بنەچەی خۆی دووربخرێتەوە و هەر تیرە و هۆز و بنەماڵە و تەنانەت کەسایەتییەك بدرێتەپاڵ یەکێك لە خانەدانە ئایینییەکان کە رەهەندێکی ئایینی و پیرۆزییان هەیە.. ئەوانە نکۆڵی لە کوردبوونی خۆیان ناکەن، بەڵام لەهەمانکاتدا سوورن لەسەر ئەو خۆبردنەسەرەی خانەدانە ئایینییەکان کە لە مەسەلەی نەتەوایەتیدا غەیرە کوردن یا عەرەبن.. ئەمە لەناوەڕۆکدا لە خزمەتی مەسەلەی نەتەوایەتی کورددا نییە، بەڵکو لەوانەیە مەبەستی شاراوەی هەبێ کە سڕینەوەی هەستی کوردایەتی و خامۆشکردنی کوانووی نەتەوایەتی و لەدواییشدا توانەوەیە لە بۆتەی رەگەزی نەتەوەی سەردەستدا کە عەرەبە. لەم بوارەدا هەوڵەکانی دینەوەری و مامۆستای مودەڕیس و عەباس عەزاوی و یونس ئەحمەد ئەلسامەڕائی و.. هتد، لەبەرچاون.. خەڵکانی کورد خۆیشیان ویستوویانە لەژێر کاریگەرێتی بانگەشەی ئایینیدا بۆ پیرۆزی و خۆبەگەورەزانینی خۆیان لەبەرامبەر خەڵکی رەشۆکیدا ئەو پیرۆزییەیان بەربکەوێ بەوەی بچنەوەسەر ئەو خانەدانانەی عەرەب کە سەروەری ئایینییان هەبووە.

بۆیە دەبینین بنەماڵەیەکی زۆر لەکوردستاندا ئیدیعای ئەوە دەکەن و سەجەرەی جۆراوجۆریان وەکو بەڵگە بۆ چەسپاندنی ئەو مەبەستەیان دروستکردووە، ئینجا ئەو بنەماڵە و کەسایەتییانەی خۆیان گەڕاندووەتەوەسەر یەکێك لە خانەدانە ئایینییەکان زۆر و زەوەندن، هەروەکو مارتین ڤان برۆنسەن لە لاپەڕە "١٠٩"ی ب٢ی کتێبی "ئاغا و شێخ و دەوڵەت" (چونکە کەسانێکی زۆر لەنێو کورددا هەن کە بنەچەی خۆیان دەبەنەوەسەر محەممەد و خۆیان بە سەیید یاخود بە سادات لەقەڵەمدەدەن..).

واسیلی نیکیتین له لاپه‌ڕه "٦٢٠"ی کتێبی "کورد و کوردستان" ده‌نووسێ: (له سوله‌یمانی بنه‌ماڵه‌ی کاك ئه‌حمه‌دی شێخ پێیانوایه تایفه‌یان ده‌چێته‌وه‌سه‌ر "قه‌بیله‌ی قوره‌یش" زۆر به‌ناوبانگن).

مارتین ڤان برۆنسه که له لاپه‌ڕه "١١١" ب٢ی کتێبی "ئاغا و شێخ و ده‌وڵه‌ت"دا ده‌نووسێ: (زۆربه‌ی سه‌ره‌کهۆزه مه‌زنه‌کانی کورد، بانگه‌شه‌ی چوونه‌وه‌سه‌ر یه‌کێك له‌م خانه‌دانانه ده‌که‌ن:

١. عومه‌ری- وه‌چه‌ی دووه‌م خه‌لیفه‌ی ئیسلام عومه‌ری کوڕی خه‌تاب "بۆ نمونه خانه‌واده‌ی گڕاوی"

٢. خالیدی- وه‌چه‌ی خالید کوڕی وه‌لید "کوڕی ئه‌لموغه‌یره ئه‌لمه‌خزومی" که یه‌کێك بووه له سه‌ردارانی مه‌زنی ئیسلام و محه‌مه‌د خۆی نێوی "شمشێری خودا"ی لێناوه.. میره‌کانی بۆتان شانازییان به‌و ڕه‌چه‌ڵه‌که‌یانه‌وه کردووه و ئه‌و بانگه‌شه‌یه‌یان له‌شه‌ره‌فنامه‌دا تۆمارکردووه).

میر شه‌ره‌فخان له لاپه‌ڕه "٣١١"ی شه‌ره‌فنامه‌دا ڕه‌چه‌ڵه‌کی فه‌رمانڕه‌وایانی ته‌رجیل ده‌گه‌یه‌نێته‌وه‌سه‌ر ئیمام حسێنی کوڕی عه‌لی.

به‌پێی کتێبی "القبائل والبیوتات الهاشمیه فی العراق" دانانی یونس ئه‌حمه‌د ئه‌لسامه‌ڕائی، هه‌موو سه‌ییده‌کانی به‌رزنجه که له ئاکرێ یان له سلێمانی یان له هه‌ولێر یان له چه‌مچه‌ماڵ یان له قادرکه‌ره‌م بن هه‌موویان ده‌چنه‌وه‌سه‌ر ئیمام موسای کازم، هه‌روه‌ها سه‌ییده‌کانی بێخاڵ که ده‌چنه‌وه‌سه‌ر شێخ عه‌بدولقادری گه‌یلانی که ئه‌ویش ده‌چێته‌وه‌سه‌ر حه‌سه‌نی موسه‌نای کوڕی حه‌سه‌نی کوڕی عه‌لی کوڕی ئه‌بوتالیب، هه‌روه‌ها ئاماژه به ڕه‌چه‌ڵه‌کی شێخه‌کانی بیاره ده‌کات که له ساداتی حسێنین و له هۆزی نعێمی عه‌له‌وین، هه‌روه‌ها شێخانی بریفکانیش ده‌چنه‌وه‌سه‌ر ساداتی حسێنی عه‌له‌وی، دیسانه‌وه سه‌ییده‌کانی جه‌باری ده‌گه‌ڕێنێته‌وه‌سه‌ر ساداتی حسێنی و نه‌قشبه‌ندییه‌کانی هه‌ولێریش ده‌باته‌وه‌سه‌ر ساداتی حسێنی، هه‌روه‌ها سه‌ییده‌کانی که‌رکوکیش له ساداتی حسێنین وه‌کو: که‌سنه‌زانییه‌کان، سه‌ییده‌کانی خانه‌قا، سه‌ییده‌کانی کانیچنار، هه‌روه‌ها شێخانی تاڵه‌بانیش ده‌باته‌وه‌سه‌ر ساداتی ڕه‌سه‌نی عه‌له‌وی، هه‌روه‌ها سه‌ییده‌کانی داوده‌ش ده‌باته‌وه‌سه‌رساداتی عه‌له‌وی، نه‌ك هه‌رئه‌مه به‌ڵکو هۆزی داوده‌ش ده‌کاته عه‌ره‌ب.

مامۆستا مودەڕیسیش لە کتێبەکانی (بنەماڵەی زانیاران)و (علماؤنا في خدمة العلم والادب)دا ئاماژە بەوە دەکات کە شێخەکانی نزارە سەییدی حسێنین، شێخەکانی کاکۆ زەکەرییا سەییدی حەسەنین، هەروەها بنەماڵەی سەیید سەمەدی سەرگەڵوویی سەییدی حسێنین، سەییدەکانی قەرەداغ سەییدی حسێنین.. بەکوردییەکەی هەرچی شێخ و سەییدی کوردستانە یان حەسەنی یان حسێنین.

ئەمەش لەگەڵ قسەیەکی یونس ئەحمەد ئەلسامەرائی کە لە لاپەڕە "١٤٩"ی کتێبی "القبائل والبیوتات الهاشمیه فی العراق"دا هاتووە یەکدەگرێتەوە کە دەڵێ: (لێرەدا بۆ هەموو کەسێکی بەویژدان دەردەکەوێ کە زۆربەی کەسایەتییە دیارەکان لە ناوچە کوردییەکاندا بەبێ ناکۆکی عەرەبن).

یان هەندێ لەوانە دەگەڕێننەوە سەر بنەچەی عەرەبی، هەروەکو لە لاپەڕە "٢٩٩"ی شەرەفنامەدا لەبارەی فەرمانڕەوایانی زەرقیدا هاتووە کە (سەر رەسەنی بنەماڵەی زەرقییەکانیان دیوەتەوە و دەریانخستووە کە عارەبە و شامی بووە..)، هەروەها لە باسی فەرمانڕەوایانی سلێمانیدا میر شەرەفحان رەچەڵەکیان دەگەڕێنێتەوە بۆ سەر مەروانی حیماری پاشای ئەمەوی کە مەروان کوڕی محەممەد کوڕی حەکەم کوڕی ئەبولعاس کوڕی ئومەییە کوڕی عەبدشەمس کوڕی عەبدولمەنافە.. یان لە باسی فەرمانڕەوایانی دونبولیدا لە لاپەڕە "٣٩٥"ی شەرەفنامەدا هاتووە: (میرەکانی هۆزی دونبولی باپیری زوویان عارەبی شام بووە و هێندێکیش دەڵێن لەبنەچینەدا خەڵکی جزیرەن و کەوتوونەتە ئازربایجانەوە و هەمووش لایانوایە ناوی عیسا بووە..)، یان میر شەرەفخان لە لاپەڕە "٣٣٦"ی شەرەفنامەدا لە باسی فەرمانڕەوایانی سۆراندا دەڵێ: (کە زنجیرەی بنەچەکەی خانەدانی سۆران دەگاتە کەلۆس ناوێك کە عەرەبی بەغدا بووە..)، یان هەژار لە لاپەڕە بیست و شەشی پێشەکی شەرەفنامەدا دەڵێ: (هۆزی سوێدییەکان کە گوایە باپیرە گەورەی خوالێخۆشبوویان کۆیلەیەکی رەشی مەدینەنشین بووە!).

دەبێ کێ بمێنێتەوە جگەلە بنەماڵەی میر شەرەفخان خۆی کە عەرەب نەبووبێ؟ هەروەکو هەژار لە لاپەڕە بیست و شەش و بیست و حەوتی پێشەکی شەرەفنامەدا دەڵێ: (لە سەرتاسەری شەرەفنامە بڕوانی – جگەلە شەرەفخان و دووسێ بنەماڵەی خزمیان نەبێ- کە خۆیان داوەتەپاڵ ساسانی و بەرمەکیان- هەموو میرە کوردێك عارەبێکی بە ئارەزووی خۆی هەڵبژاردووە و رەگەز و بنچینەی خۆی پێهەڵپەساردووە).

کەچی میر شەرەفخان گومان لە بنەچەی ئەو فەرمانڕەوایانە دەکات کە خۆیان دەبەنەوەسەر عەرەب کە دەڵێ: خوا دەزانێ.. ئەمە نیشانەی ئەوەیە کە لەڕاستی و دروستی ئەو زانیارییانە دڵنیانییە.

لەڕووی زانستییەوە زۆری ئەم خۆبردنەوەسەر عەرەب و خانەدانە ئایینییەکان ڕێیتێناچێ و تەنیا بۆ خۆپیرۆزکردن بووە و زۆر لەڕاستییەوە دوورن، هەروەکو هەژاری موکریانی لەمبارەیەوە لە پێشەکی شەرەفنامەدا دەڵێ: (تەکیانداوە بە تەکی عارەبی بنچینەپاك و خانەدان و جوانچاك و بە هەزار درۆ و دەهۆ، سەرەتای کەوناراکیان بە یەکێك لەوانەوە لکاندووە..).

**خۆبردنەوەسەر خالید**

بەهۆی بلاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام لە ناوچە کوردنشینەکاندا خەڵکی سەربە سوپای ئیسلام کە عەرەب بوون دوای جێبەجێکردنی کارە سەربازییەکانیان لەوانەیە هەندێکیان لەو ناوچانەدا مابێتنەوە و لە ڕێگەی ژن و ژنخوازییەوە تێکەڵ بە کۆمەڵی کوردەواری بووبن، لەوانەشە بووبنە بەشێك لە کورد و نەگەڕابنەوە ناوچەکانی زێدی یەکەمی خۆیان یان وەکو باسدەکرێ هەندێ هۆزی عەرەب هەلیان بۆ ڕەخسابێ لە ناوچە کوردنشینەکاندا نیشتەجێبووبن هەروەکو لە سەرچاوە مێژووییەکاندا ئاماژەی پێدەدرێ لە هەرێمی جزیرە زۆرترین ژمارەی عەرەبی موسڵمان نیشتەجێبووبن، هەروەها لە شاری موسڵ و ناوچەکانی دەوروبەری کە پێش ئیسلام هیچ شوێنەوارێکی عەرەبی تیابەدیناکرێ.

یونس شێخ ئیبراهیم ئەلسامەڕائی لە کتێبی (القبائل العراقیە)و عەباس عەزاوی لە کتێبی (عشائر العراق)دا باسی ئەم تیرە و هۆزانە کوردانە دەکەن کە لە نەوەی خالیدی کوڕی وەلیدن: زەهاوی، پشدەری، بڵباس، بابانی، خۆشناوی، گەردی و هیتر، بەلآم ئەمانە هیچ بەڵگەیەکی چەسپێنەریان بەدەستەوە نییە بۆ سەلماندنی بۆچوونەکانیان، تەنانەت ئەو کوردانەشی لەم تیرە و هۆزانە گەر هەبن بۆ خۆبردنەوەسەر وەچەیەکی عەرەبی جگەلە گێڕانەوەی دەمادەم ناتوانن پشت بە هیچ سەرچاوەیەك ببەستن یان بەڵگەیەکیان هەبێت.

یەکێك لەوانەی کە بنەچەی هەندێ تیرە و بنەماڵەی کوردی دەدرێتەپاڵ خالیدی کوڕی وەلیدە.. لە لاپەڕە "١٧١"ی ب٢ی کتێبی (شەرەفنامە)دا لە باسی فەرمانڕەوایانی جزیرەدا ئاوا دەنووسێ: (لە وتاری هێژا و بایدار و بەنرخ و سەنگینی باوەڕپێکراوانەوە و لە ڕووپەڕە نووسراوی

ڕەنگینی کۆنە پیاوانەوە وامان بۆدەرکەوتووە کە زنجیرەی بنەچەکەی فەرمانڕەوایانی جزیرە سەری ئەوسەری بە خالیدی کوڕی وەلیدی هەواڵی پێغەمبەرەوە گیرە.. یەکەم سەروەرێکی کە لەسەر تەختی فەرمانڕەوایی جزیرە ڕۆنیشتووە ناوی سولەیمانی کوڕی خالید بووە..).

بەپێی (شەرەفنامە) سلێمان کوڕی خالید سێ کوڕی هەبووە: حاجی بەدر، میر عەبدولعەزیز، میر ئەبداڵ.. دیارە مەبەست لە فەرمانڕەوایانی جزیرە هەروەکو میر شەرەفخان باسیدەکات هۆزی (بوختی) (بۆتی)"یە.

ئەمین زەکی بەگیش لە لاپەڕە ١٠٩ی کتێبی (خولاسەیەکی تاریخی کورد و کوردستان)دا دەنووسێ: (لەدوای حکومەتی زەنگی لە جزیرەی ئیبن عومەردا حکومەتی کوردی (عەزیزان) پەیدابوو، ریوایەتوایە کە ئەم خانەدانە نەتەوەی حەزرەتی خالیدی بن وەلید بوون)، بەلاّم مەلا جەمیلی ڕۆژبەیانی لە (ڕاستکردنەوەی چەند هەڵەیەکی مێژوویی) لەهەمان کتێبدا بە گەڕانەوە بۆ سەرچاوەکانی وەکو (اسد الغابة في معرفة الصحابة)ی ئیبنولئەسیر و (نهایە الارب)ی قەلقەشەندی، ئەوە ڕەتدەکاتەوە کە هیچ وەچەیەکی خالیدی کوڕی وەلید نەماوە. لە خوراسانیش سلێمانییەکان خۆیان بە نەوەی خالیدی کوڕی وەلید دەزانن!

هەژاریش لە پێشەکی شەرەفنامەدا ئاماژە بەو هۆزانە دەکا کە خۆیان دەبەنەوەسەر عەرەب، بۆ نموونە لە لاپەڕە بیست و شەشدا دەڵێ: (خاڵتی هۆزێکی لەمێژینەی کوردن و زۆربەیان ئێستاش یەزیدین، میری بۆتان - کە بەشوورەیی زانیوە سەر بەوان بێ - فەرموویە: نەوەی خالیدی کوڕی وەلید بووم. بەداخەوە نەشیزانیوە کە خالیدی کوڕی وەلید هیچ زاروزیچی لێنەکەوتووەتەوە..).

بەلای مامۆستا مەلا جەمیلی ڕۆژبەیانییەوە ئەو هۆزەی کە خۆیان بردووەتەوەسەر خالیدی کوڕی وەلید، پاشماوەی خالدی (هالّدی یان کالّدی) بن کە لە باپیرانی کەونارای کورد بوون، بەوەشدا دەردەکەوێ کە هەتا ئەم دواییانەش هەر لەسەر ئایینی یەزیدی (یەزدانی) مابوون.. وێشدەچێ سەرۆکهۆزێکی پێشوویان ناوی خالید بووبێ، خالیدی کوڕی وەلیدیان پێئازابووە و لایانوابووە ئەگەر بڵێن سەر بەوبن دەبنە نەجیمزادە..).

میر شەرەفخان نەك هەر بۆتانییەکان دەباتەوە سەر خالیدی کوڕی وەلید، بەڵکو لە لاپەڕە "٢٨٠"ی شەرەفنامەدا ئاوا باسی فەرمانڕەوایانی کلیس دەکات: (با ئەوانەی ڕێپێبەری سەروبەری بەرەی باشی هاشمیانن و ناسینەوەی وەچ بەری لکوپۆی گەش و زۆپی شەنگەداری بژ و

چڕ و پەرێشانی قورەیشیانن، باش بیزانن کە ئەوانەی لەسەر کلیس حوکمڕانن، پێیانـنـوایـە لـە ریشاژۆی فرزەندانی ئیمام هەباس - خوالێیخۆشبیٚ- رووانەوە و بنجی خۆیان سەربـەو تـیرە و زنجیرەیە حەساودەکەن..). دیارە میر شەرەفخان لەم قسەیە بەگومانە و لەهەمان لاپەڕەدا دەڵـیٚ: (هێندێك کەسیش - کە باشتر لێیدەزانن - لایانوایە کە ئەوانە دەگەڵ بەرەی بنەماڵـەی مـاڵـە میرانی هەکاری و ئامێدیدا ئامۆزان و بەڵگەی راستیشیان ئەمەیە کە دەپێشدا سـیٚ بـرابـوون: شەمسەدین، بەهادین، مونتەشا.. هەکارییەکان کە لە - شەمس- ناوی شەمۆیان لـێـنـراوە و ئامێدییەکان لەبەر ناوی بەهادین بوونە بهدین و فەرمانڕەوایانی کلیس - کە تۆرەمەی مونتەشـا بوون- بەناوی مەند ناونران..).

لە لاپەڕە (٩٨)ی کتێبی (هۆز و تیرە و تایفەکانی کورد لە کوردستانی ئەردەلاٚن)ی میرزا شوکروڵلاٚ سەنەندجی "فەخرولکیتاب"دا هاتووە: (قوبادی.. لە وەچەی کاکەجان ناوێکن کە خۆی بە تۆرەمەی خالیدی کوڕی وەلید دەزانی و بە دوورەپەرێزی و لەخواترسی ناویدەرکردووە و گوایـە لە ئەسڵی عەرەبەوە هاتووە، هۆزەکە تۆرەمەی قوباد ناوێکن کە عەسکەری کاکەجانی نـاوبـراو بووە و بەهۆی ئەوەوە بە قوبادی ناسراون..). دیارە نووسەری کتێبی (دەربەندیخان لـەمـێـژوودا) پشتی بەهەمان سەرچاوەی سەرەوە بەستووە کە لە لاپەڕە (١٩٤)دا دەنـووسـیٚ: (.. هـەنـدێـك بۆچوون پێیانوایە کە ئەم تیرەیە لەبنەڕەتدا عەرەب بن کە دوواتر هاتوونەتە خاکی کـوردسـتـان سیفاتی کوردەوارییان وەرگرتووە..).

کەچی بەپێی ئەوەی لە کتێبی "ایلات و طوایف کرمانشاهـان"ی محەممەد عەلی سوڵتانـی لە باسی تایفەی (قوبادی)دا هاتووە، ئەمانە کە دەچنەوەسەر سەیید ئەحمەد بەگ، رەچـەڵـەکـی خۆیان بۆ خانەوادەی پێغەمبەر و ساداتی حسێنی دەگەڕێننەوە و خاوەن تەکیە و خانەقا بـوون و سەربە تەریقەتی خەڵوەتییە ئیرشادیانکردووە و خاوەنی تەپڵ و ئالاٚ و خەلیفە بوون.

هەرچەندە جیاوازی لەم دوو قسەیەدا هەیە کە یەکێکیان دەیگەڕێنێتەوە بۆسەر ساداتـی حسێنی و ئەویتریشیان بۆسەر خالیدی کوڕی وەلید کە بە رای من هەردووکیان راست نییە.

عەلی ئەکبەر وەقائیع نیگار کوردستانی لە کتێبی (حدیقە ناصریە) لە لاپـەڕە ٣٠٩- ٣١٠ لە باسی بنەماڵەی مشایەخی مەردۆخیدا ئاماژە بەوەدەکات لە نەوەی خـالـیـدی کـوڕی وەلیدن، ئەگەرچی ئایەتوڵلاٚی مەردۆخ لەمێژووەکەیدا زنجیرەی رەچەڵەکی خـۆی دەبـاتـەوەسـەر حەسەنی کوڕی عەلی کوڕی ئەبوتالیب.

ئەم هەموو قسانە لەوەوە سەرچاوەدەگرێ کە بەهۆی کاریگەرێتی ئاینی و خۆبردنەوەسەر بنەماڵە و خانەدانە ئاینییەکان بووە تا لە پیرۆزییەکانیان بەرخورداربن، ئەگینا بە هیچ شێوەیەك لە دووتوێی تەنیا یەك سەرچاوەی ئیسلامی - عەرەبیشدا نەهاتووە کە خالیدی کوڕی وەلید هاتبێتە کوردستان و تەنانەت ئەوەشی دەگوترێ گوایە فەرمانڕەوایانی جزیرە دەگەیەنەوەسەر سلێمانی کوڕی خالیدی کوڕی وەلید زۆر جێگەی باوەڕ نییە و لەدوا وێستگەشدا ئەمانە هەمووی بۆ شێواندنی مێژووی کوردە!

**مردنی خالید و گێڕانەوە جیاجیاکان**

وەکو زۆربەی مێژوونووسان باسیدەکەن خالیدی کوڕی وەلید ساڵی بیست و یەکی کۆچی (کە دەکاتە ٦٤٢) کۆچیدواییکردووە.. لەبارەی شوێنی مردنەکەشیەوە رای جیاواز هەیە.. لە کتێبی (تاریخ الیعقوبی) ب٢ ل١٠٨دا هاتووە: عومەر، خالیدی لەسەر رەها و حەڕان و ریققە و تەلموزن و ئامەد دانا، ساڵێك تیامایەوە، داوای وازهێنانیکرد، لێیقبوڵکرد، بەرەو مەدینە هات، چەند رۆژێك تیایامایەوە، دوای ئەوە خالید لە مەدینەدا مرد.. لەهەمان سەرچاوە ل١٠٩دا هاتووە: واقیدی دەڵێ خالیدی کوڕی وەلید لە حیمس مرد..

تەنیا یەك سەرچاوە ئاماژە بەوە دەکات کە گوایە لە مەدینە مردبێ کە پێدەچێ راست نەبێ، بەڵام واقیدی دەگێڕێتەوە: عومەری کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی رەیاح، لە خالیدی کوڕی رەیاح گێڕایەوە کەوا لە سەعلەبەی کوڕی ئەبی مالیکی بیستووە، دەڵێ: عومەرم لە قیباء بینی، کۆمەڵێك حاجیش لە شامەوە هاتن، وتی: ئێوە کێن؟ وتیان: ئێمە یەمەنین و لە حیمس بەزیبووین، ئەو رۆژەی لەوێ کەوتینەرێ خالید مرد.

لەمەوە دەردەکەوێ کە خەلیفە عومەر لە مەدینە بووە و ئەو کاروانییە یەمەنییە هەواڵی مردنەکەی خالیدیان داوەتێ.. ئیتر چۆن دەبێ لە مەدینەدا مردبێ وەکو هەندێ وادەڵێن.

کەواتە لەوەدەچێ ئەو قسەیە راستتربێ کە دەڵێ خالید لە حیمس مردووە و لەو مزگەوتەدا نێژراوە کە بەناوی خالیدەوە دروستکراوە و بووەتە مەزارگایەك خەڵکیی دەچنە سەردانی.

کەچی هەندێك وایبۆدەچن کە ئەو گۆڕەی خالید لە حیمس هی خالیدی کوڕی وەلید نەبێ، بەڵکو گۆڕی خالیدی کوڕی یەزیدی کوڕی مەعاویە بێ و لە خەڵکی تێکچووە.. تەنانەت

ئیبن فەزلولڵای عومەری لە کتێبی (مسالك الابصار)دا دەڵێ: "دەڵێن گۆڕی خالیدی کوڕی وەلید لە دەرەوەی حیمسە بەو سۆنگەیەی کەوا عومەری کوڕی خەتاب خالیدی لە حیمس لابرد و بەرەو مەدینەی ناردەوە".

بەپێی گێڕانەوەکەی ئیبن فەزلولڵاش بێ ئەوا گۆڕی خالیدی کوڕی وەلید ئەگەر لەناو حیمسدا نەبێ ئەوا لە دەرەوەی حیمسە.

**گۆڕی خالید لە شارەزوور**

لە کۆنەوە بایەخ بەچوونەسەر گۆڕی پیاوچاکان دراەوە، بەشێك لە خەڵکیی بۆ مفەڕکی و چاکبوونەوە لە نەخۆشی سەردانیانکردوون، لەوانەیە ئەمە بەشێك بێ لە باوەڕی ئەفسانەیی میللی.. زۆرجار خاوەنی ئەو گۆڕانە ناناسرێنەوە یان بەناوی کەسێکەوە دەناسرێتەوە کە لەبنەڕەتدا هی ئەو نییە، بەلاّم خەڵکەکە وازناهێنن و بەردەوام خۆیانی پێوەدەبەستن.

بۆیە لە زۆر شوێنی ولاّتانی ئیسلامیدا ئەو جۆرە گۆڕانە هەن کە ناتوانرێ بەتەواوی لێیان دڵنیابین وەکو: گۆڕی نوح پێغەمبەر، گۆڕی ئیبراهیم پێغەمبەر، گۆڕی هود پێغەمبەر، گۆڕی یونس پێغەمبەر.. هتد، هەروەها گۆڕی زۆر لە ئەسحابەکان کە لە زۆر شوێن دووبارەدەبنەوە، وەکو: گۆڕی عەلی کوڕی ئەبوتالیب کە دەڵێن لە کوفە نێژراوە و کەچی ئێستا گۆڕی لە نەجەفە، گۆڕی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر کە دەڵێن لە جزیرەیە و کەچی ئەو لە مەککە مردووە و هەر لەوێش نێژراوە، گۆڕی حسێنی کوڕی عەلی کە لە چەندین شوێن هەیە، سەرەکەی لە قاهیرەیە و دەشڵێن لە مەدینە لەپاڵ گۆڕی حەسەنی برایدا نێژراوە، بەلاّم لاشەکەی لە کەربەلایە، گۆڕی ئومکەلسومی کچی پێغەمبەر کە دەڵێن لە شامە، کەچی ئەو لە ژیانی پێغەمبەردا لە مەدینە مردووە، هەروەها لەسەر گۆڕی خالیدی کوڕی وەلید قسەی زۆر دەکرێ، بەلاّم زۆربەی سەرچاوە عەرەبی و ئیسلامییەکان جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە خالیدی کوڕی وەلید لە شاری حیمسی ولاّتی شام کۆچیدواییکردووە و هەر لەوێ نێژراوە و دواتر مزگەوتێك بەناویەوە دروستدەکەن کە گۆڕەکەیشی تێدایە، کەچی هەروەکو وترا هەندێك دەڵێن کەوا لە مەدینە مردووە، بەلاّم لەمەدینەدا نە گۆڕەکەی دیارە و نە مزگەوتیش بەناویەوە دروستکراوە!

ئەوەی سەرنجڕاکێشێ ئەوەیە کە لەکوردستانیشدا خالیدی کوڕی وەلید گۆڕی هەبێ کە هەرگیز خالید نەگەیشتووەتە کوردستان و هیچ سەرچاوەیەکیش ئاماژەی بەوە نەکردووە.. کەچی

له دەمەتەقێیەکدا (لاله سەرحەدی خەلیفه یونس) باسی ئەوەیکرد کەوا گۆڕی خالیدی کوڕی وەلید له دۆڵێکدایه لەنێوان هەردوو دێی دسکەره و سێتەلانی خواروو لەشوێنێکدا پێیدەڵێن (داری خالد) کاتی خۆی دارێك بەسەر گۆڕەکەوە بووە، خەڵکیی بڕیویانەتەوە و نەماوە، بەلام شوێنەواری گۆڕێك هەیە که بەردێکی زۆری بەدەورداییه و خەڵکیی شوێنەواردزیش هەوڵیانداوە هەڵیبکەنن وادیاره شتێکیان چنگنەکەوتبێ.

لەبارەی مردنی خالید و ناشتنی لەم گۆڕەدا، لاله سەرحەد له زمانی حەمەی مارفی نەمەڵی دەگێڕتەوە: کاتێ سوپای موسڵمانان له شەڕی هەورامان و خورماڵ دەگەڕێنەوە و دەگەنەسەر ئاوی تانجەرۆ، لەئاستی زێڕنجۆ دەیانەوێ بپەڕنەوە، بەلام ئاوەکە زۆر ساردەبێ.. خالید داوا له پیرێژنێك دەکات بیکاتە کۆڵەوە و بیپەڕێنێتەوە.. پیرێژنەکه دەیکاتە کۆڵەوە، له ناوەڕاستی ئاوەکەدا پیرێژنەکه کوڕەکەی دەکەوێتە بیر که لەلایەن سوپاکەی خالیدەوە کوژراوە، بەهێواشی ئەو کێردەی که شاردبوویەوە دەکا بە ورگی خالیددا و یەکالایدەکاتەوە و دەیکوژێ.. دوایی تەرمەکەی دەگوێزرێتەوە بۆ ئەو دۆڵەی نێوان دسکەره و سێتەلانی خواروو لەو شوێنەی پێیدەوترێ (داری خالد).

لەڕاستیدا ئەمە له ئەفسانەیەك زیاتر هیچیتر نییه و ناوەڕۆکەکەی بە نارێکی رێکخراوە.. جارێ بەپێی سەرچاوەکان خالید نەهاتووەتە شارەزوور و هەورامان، ئینجا بۆ بگەڕێتەوە بۆ سەر ئاوی تانجەرۆ؟ ئەی بۆ بە کۆڵی پیرێژنێك بپەڕێتەوە؟ که نە ئیسلام رێگەدەدات پیاوێك سواری کۆڵی ژنێك بێت تادەگاتە پیرێژنێك؟ ئایا ئەو سوپایه ولاخیان پێنەبووە تا بپەڕنەوە؟ ناشکرێ بڕوا بەوەبکرێ خالیدی فەرماندە ولاخی پێنەبووبێ لەو هەموو ولاخە رەسەنە عەرەبییە یان ولاخە تالانکراوەی کوردستان؟ ئینجا بۆ بیبەنە ئەو دۆڵە نادیاره و لەوێ بینێژن؟ جگەلەوە لەوەدەچێ ئەو گۆڕە هی سەردەمی کۆنتر بێ و هی ئیسلام نەبێ.. دەبێ شوێنەوارناسان بچنەسەری و لێکۆڵینەوەی لەسەربکەن.

## کۆتایی

دوای هەڵدانەوەی ئەو هەموو لاپەڕانەی مێژووی عەرەبی- ئیسلامی کە باسی زۆری لەسەر خالید تێدایە، دەردەکەوێ کە خالید بەهیچ شێوەیەك نەهاتووەتە کوردستان و پەیوەندی بە شەڕەکانی ولاتی کوردەوارییەوە نەبووە و حوکمڕانی ناوچە کوردنشینەکانی نەکردووە.. کەسێك

نەهاتبێتە کوردستانەوە و لە ولاتی شام بووبێ و هەر لەوێش مردبێ و هەموو سەرچاوە عەرەبییە - ئیسلامییەکانیش ئەوە دووپاتدەکەنەوە و لە سەرچاوەکانی خۆیاندا تۆماریانکردووە ئیتر چۆن دەبێ گۆری لەکوردستاندا هەبێ تەنانەت بڕواش ناکرێ نەوەی لەکوردستاندا هەبووبێ و هیچ سەرچاوەیەك ئاماژە بەوەناکات کە کەسێکی خالید هاتبێتە کوردستانەوە تا ئەو هەموو بنەماڵە و تیرە و خەڵکانە خۆیان ببەنەوەسەری، تەنانەت رەگەزناسە عەرەبەکان گومان لەوەدەکەن کە هەندێ تیرەی عەرەبی کە خۆیان دەبەنەوەسەر خالید راستی تیادابێ. ئەمە نە مێژوو سەلماندوویەتی و نە لۆجیکیش ئەوە جێگیردەکات جگەلەوەی ئەمە وەکو ئەفسانە لەناو خەڵکیدا بلاوبووەتەوە و لەگەڵ رۆژگاردا لەناو لاپەڕەکانی مێژووشدا جێگەی خۆی کردووەتەوە تەنانەت هەندێ مێژوونووس بۆ کەمکردنەوەی کەسایەتی کورد هەموو زانا و دانا و خەڵکە دیارەکەی کورد دەبەنەوەسەر رەچەڵەکی غەیرە کورد بەتایبەتی عەرەب، چونکە بەهۆی ئایینی ئیسلامەوە بنەماڵەی فەرمانڕەوا بەتایبەتی پیرۆزییەکیان دراوەتێ.. ئیتر لەو سۆنگەیەوە هەرکەسێك سەر بەوان بێ بەچاوی رێزەوە تەماشایکراوە و بگرە بووەتە مایەی شانازیش بۆیان و بگرە بەوەش خۆیان لە خەڵکیتر جیادەکەنەوە.

•••

## سەرچاوەکان


- کوردستان لەبەردەم فتوحاتی ئیسلامیدا/ حەسەن حەمە کەریم مەحمود
- فەتحی ناوچە کوردییەکان/ حەسەن حەمە کەریم مەحمود
- ولاتگیری رەشەخاکی عێراق/ مەلا جەمیل رۆژبەیانی
- ئاغا و شێخ و دەوڵەت/ مارتین ڤان برونەسن/ ب٢
- الفتوح وبلدانها/ بلاذری
- تاريخ الكرد في الحضارة الاسلامية/ د. احمد الخليل
- کورد و کوردستان/ د. زرار سدیق تۆفیق
- صورة الكرد في مصادر التراث الاسلامی/ د. احمد الخليل
- شەرەفنامە
- ولاتەکەت بناسە

Meshkat.net - Scf-k.a7alarab.net - Bnikhaled.com - D1g.com -I7ur.com - S-maj.net -

- جگەلە هەندێ سەرچاوە کە لەناو بابەتەکەدا ناویان هاتووە.

# هاوئاهەنگی نێوان فەلسەفە و ئایین

## بەو سیفەتەی دەرچەیەکە بۆ قەیرانی سیاسی مۆدێرنیتە

## لای لڤیو شتراوس

ن: محەممەد ئەلمیسباحی

و: بیلال ئیسماعیل حەمە

**- (بۆ مانەوەی هەر دامەزراوەیەکی ئایینی یان حکومەتێکی نەتەوەیی بۆ ماوەیەکی درێژ، پێویستە هەمیشە بگەڕێینەوە بۆ سەرەتاکەی.) ماکیاڤیللی**

**- (سەردەمە زێڕینەکان ئەو سەردەمانەن کە توانای بیرکردنەوە و دەربڕین تێیدا پەیوەستنابن بەهیچ فیکرەیەکەوە.) شتراوس**

**- (لەسەر فەیلەسوف پێویستە ببێتە مێژوونوسێکی باش ئەگەر بیەوێت بە فەیلەسوفی بمێنێتەوە.) هنریش مایر**

**پێشەکی:**

گەڕانەوە بۆ ترادشنەڵی فەلسەفەی کلاسیکی لەگونجانیدا لەگەڵ ترادشنەڵی ئایینی سەدەکانی ناوەڕاست بۆ تێگەشتن و هەڵسەنگاندن و چارەسەرکردنی قەیرانی مۆدێرنیتە ناونیشانی پرۆژەیەکی لیو شتراوسە (Leo Strauss ١٨٩٩ - ١٩٧٣)، ئەمەش لەپەیوەندییەکی دیالێکتیکی گۆڕاو لەنێوان بەردەوامبوون و رووبەڕوبوونەوەدا، لەنێوان مۆدێرنیتە و پێشمۆدێرنیتەدا. ئەم هەڵوێستەی وەك کاردانەوەیەتی لە دژی هەیمەنەی ئیشکالییەتی "کۆتاییەکان" بەسەر سەردەمی نوێوە: کۆتایی مرۆڤ، کۆتایی عەقڵ، کۆتایی رەوشت، کۆتایی ماف، کۆتایی ئاین، کۆتایی مێژوو.. هتد، هەموو ئەم کۆتاییانە کە لە رەوتێکی نیهلیزمی (عەدەمی) رەگداکوتاوەوە سەرچاوەدەگرن، ئاستی ئەو قەیرانە فیکری و رۆحییەمان بۆ دەردەخەن کە رۆژئاوا لەمڕۆدا پێوەیگیرۆدەیە.

لەبەردەم قەیرانێکی ئاوادا شتراوس هیچ هەڵبژاردنێکیدیکەی نییە جگەلەوە نەبێت بچێتەپاڵ رەخنەگرەکانیی، بەڵام لە روانگەی خۆی و بەشێوازی تایبەتی خۆی. هەمووانی سەرسامکرد بەو وتەیەی کە مۆدێرنیتە خۆی هۆکاری قەیرانی مۆدێرنیتەیە.(١) ئەمەش ئەوەیە ئاماژەیبۆدەکات کە چارەسەرکردنی قەیرانی مۆدێرنیتە تەنها بە دژەکەی دەکرێت، واتە گەڕان بەدوای وێنەیەك لەڕابردوودا کە هاوتای مۆدێرنیتە بێت، نەك بە قوڵبوونەوە لە رەگوریشەی مۆدێرنیتە خۆیدا بۆئەوەی وایلێبکرێت بەرەو پێشەوەبچێت،(٢) بەڵام مەبەستیی لەڕابردوو چییە؟ ئەو رابردووەی مەبەستێتی ئەوەیە کە بە گرژی و پەشێوی نێوان "قودس و ئەسینا" تەعبیریلێدەکات، واتە هەردوو جەمسەرە دژەکەی نێوان ئایین و فەلسەفە کە رۆحی شارستانێتی رۆژئاوا پێکدەهێنێت. بەگوێرەی ئەوە کارەکە پەیوەندیدارە بە ململانێیەکی کارلێکراوی نێوان دوو سەردەم، زەمەنی سروش و زەمەنی فەلسەفە، لەنێوان زەمەنی ئاسمانی و (خوایی) زەمەنی سروشتی – عەقڵیی. بەڵام مۆدێرنیتە لە تێڕوانینی خۆیەوە لە سێ رەهەند پێکدێت کە بریتینلە: فەلسەفەی سیاسی کلاسیکی، فەلسەفەی سیاسی نوێ و پاشان شەریعەتی ئایینی. جگەلەوەی ئەو تووشی سەرسوڕمانماندەکات بەگەڕاندنەوەی هۆکاری قەیرانی سیاسی نوێ بۆئەوەی کە مۆدێرنیتە رەهەندی یەکەمی (فەلسەفەی سیاسی کلاسیکی) لەبیرکردووە، نەك رەهەندی سێیەمی کە لایەنگرانی پێیانوایە، ئەوانیش کۆنسێرڤاتیڤە نوێیەکانی ئەمریکان.(٣) ئەگەر بابەتەکە بەمجۆرەبێت، واتە شتراوس قەیرانی مۆدێرنە بەپلەی یەکەم نەگەڕێنێتەوە بۆ لەبیرکردنی شەریعە، بەڵکو بۆ لەبیرکردنی فەلسەفەی بگەڕێنێتەوە، ئەی بۆچی جەخت لەسەر ئەوەدەکاتەوە کە پشێوی نێوان قودس و ئەسینا بزوێنەری سەرەکی شارستانێتی رۆژئاوایە و یەکێکە لە چارەسەرە بنەڕەتییەکانی کە پێشنیازیدەکات بۆ چارەسەرکردنی قەیرانی مۆدێرنە؟ لەپرسیارکردندا دووتر لەوە دەڕۆین و دەپرسین: دەلالەتی پێکەوەگرێدانی قەیرانی سیاسی مۆدێرنیتە بە دوو لایەنەوە چییە، ئەگەر لە بنەڕەتدا ناکۆك نەبن لەگەڵ سیاسەتدا، بەلایەنی کەمەوە بەوەجیادەکرێنەوە کە پێشوازی لە سیاسەت ناکەن، ئەوانیش فەلسەفە و ئایینن؟ ئەگەر خۆمان تەسلیمکرد بەتوانای چارەسەر بەدژەکە، ئایا چارەسەرییەکەی بۆ قەیرانی سیاسی مۆدێرنە وەستاوە لەسەر زاڵکردنی لایەنی ئایین بەسەر فەلسەفەدا، یان بەپێچەوانەوە، ئەسینا پێشبخرێت بەسەر قودسدا؟ بەدەربڕینێکی رەمزی ئایا شتراوس وادادەنێت کە هەردوو مومارەسەکە، ئایینی و فەلسەفی، ئینتمایان هەیە بۆ جیهانی ئەشکەوت، جیهانی سیاسەت و مێژوو، یان زۆر بەوردی

خۆیان پاراستوه لەنغرۆبوون لەپێکدادانە سیاسییەکاندا کە بووەتە هۆی فەسادکردنی پاکێتی تەقوا و بیرکردنەوەی قوڵی فەلسەفی پێکەوە؟

ئەم پرسیارانە نەخشەرێگای بەرەو ئامانجەکەمان بۆ دەکێشێ لەم توێژینەوەیەدا، پاش ئەوەی بەخێرایی تایبەتمەندی ئەو پەیوەندییە جەدەلییە دەخەینەڕوو لەنێوان فەلسەفە و ئاییندا، دواتر باسی ئەو پەیوەندییە تەنگژاوییەی نێوان سیاسەت و فەلسەفە دەکەین لەسەرەتادا و پاشان پەیوەندی سیاسەت بە ئایینەوە لە دیدی لیوشتراوسەوە، بەوردبوونەوە لەمیانی ئەوەوە بۆئەوەی فەلسەفە بکرێت بە بوارێکی هاوبەش کە رێگەدەدات بەو بەیەکگەیشتنە گەورەیەی نێوان کەسی ئایینی و سیاسی.

### یەکەم: بە چ واتایەک فەلسەفە بە دوژمنێکی - هاوبەشی ئایین و سیاسەت دادەنرێت

شتراوس فەلسەفەی بەمەترسی دادەنا بۆسەر ئایین و سیاسەت پێکەوە، ئەمەش وایلێکرد گومانێکی دژیەکی بخاتەنێوان ئەسینا و قودسەوە یان لەنێوان سیاسەت و لاهوتەوە (سیولۆجیا)، بەلێکدانەوەی ئەو، ئەوە فەلسەفەیە تەحەکومدەکات بە بابەتە سیاسییەکانەوە،[٤] ئەمەش دەلالەتە بۆئەوەی کە لەڕاستیدا فەلسەفە بەهێزترین رکابەری ئایینە لەململانێکردنیدا بۆ تەحەکومکردنی بەسەر فەزای سیاسیدا. ئەم دژیەکییەش دەمانگەیەنێتە ئەوەی کە شتراوس بە سیفەتی ئیمانی نەیڕوانیوەتە ئایین، بەڵکو بە سیستمێکی دادەنێت کە دەوڵەت و ژیانی مەدەنی خەڵکی رێکدەخات.

ئەوە راستە کە گوتاری هەریەك لە ئایین و فەلسەفە لە رەگوڕیشەوە جیاوازە. لەبەرئەوەی گوتاری وەحی گوتاری فەرماندان و بڕیاردانە، گوتاری گەواهیدان و گێڕانەوەیە، گوتارێکە پێویستی بەلێکدانەوەیە، ئەگەرچی لە سنووری ئیمانیشدا بێت، لەکاتێکدا گوتاری فەلسەفە گوتاری گومان و ئەنجامگیرییە، خاوەنەکەی دەگاتە مەعریفەیەکی بەڵگەدار و هەمیشە شیاوی پێداچوونەوە و پرسیار و گومانکردنە.[٥] هەرچەندە ئەم جیاوازییە رێگرنییەلەبەیەکگەیشتنی هەردوو گوتاری ئایینی و فەلسەفی لەچەندین بۆنە و بواردا: چونکە لەلایەکەوە ئایین هاوبەشە لەگەڵ فەلسەفەدا لە توێژینەوە و بەدواداگەڕانی دادپەروەری و خۆشبەختی مرۆیی: لەلایەکیدیکەوە زۆرجار فەلسەفە بەتایبەتی لە ئاستە باڵاکانیدا پەنادەبات بۆ سەلماندنی

خوداوەند وەك پرەنسیپی یەکەم و کۆتا بۆ کەون و دەسەبەری مۆدێلی ماف و دادپەروەری و مۆراڵ، هەروەك ئەوەی لای (ئەفلاتون و ئەرستۆ و ئیبن روشد) بەدیدەکرێت، هاوتەریبی ئەوەش، زۆرجار ئایین پەنادەباتەبەر فەلسەفە بۆ خواستنی ئامرازە کاریگەرەکانی بەمەبەستی بەرگریکردن لە گریمانەکانی و نەهێشتن و لادانی جیاوازی و دژیەکی وتەکانی و روونکردنەوەی نادیاری و شاراوەیی دەقەکانی، کاتێك فەلسەفە دەبێتە خاوەنی دیدگایەکی ئایینی خواوەند لە بەزرترین ئاستدا دادەنێت، ئەمەش لەپێناوی گونجانیدا دەکات بۆئەوەی بە لۆگۆسی فەلسەفی بێتە قسەکردن.[٦] سەرەڕای ئەوە شەریعەت هەرگیز ئەوە پەسەندناکات کە فەلسەفە بخزێنێتەنێو ئاستەبالاکانی میتافیزیقی و سیستمە مەعریفیەکەیەوە یان رێگەبدات بە فەیلەسوفەکان بەشێوەیەکی بەڵگەنەویستانە هەستن بە رۆڵی لێکدانەوە و بەرگریلێکردنی، جگەلەوەی بەهۆی ئەوەوە کە باوەڕیوایە (لەسەر زمانی هەندێك لەوانەی بەناویەوە دەدوێن وەك (فارابی و ئیبن مەیمون و ئیبن روشد) کە فەلسەفە و شەریعە هەردووکیان تەماشای هەمان بابەت دەکەن و یەك ئامانجیشیان مەبەستە، ئەگەرچی بە دوو زمانی جیاوازیش بدوێن، بەڵام دەکرێت بۆئەم "پەیوەندییە" لەنێوان فەلسەفە و شەریعەدا لایەنی سلبیشی هەبێت، لەبەرئەوەی ئایین دەبێت بەجۆرێ لە مشتومڕ و دەمەقاڵە کە نەفسە پاکەکان ئەوانەی لێوانلێون لە ئیمان لێیهەڵدێن، ئەوکاتەش فەلسەفە تەنها دەبێت بە خزمەتکاری ئایین، بۆئەوەی لەکۆتاییدا ببێتە هۆی لەبیرکردنی. لەباشترین حاڵدا پەیوەندی لەنێوان فەلسەفە و شەریعەدا بەتایبەتی ئەگەر ئەو پەیوەندییە پتەو و بەهێزبێت، دەبێتە هۆی دوو بەرابەرکردنی بەربەستەکانی بەردەم مومارەسەکردنی فەلسەفەی ماف. پاش ئەوەی فەلسەفە تەنها رووبەڕووی "بەربەستە سروشتییەکان" دەبێتەوە بۆ دەرچوون لە ئەشکەوتەکە، واتە بەربەستی رزگاربوون لە بیروبۆچوونە سیاسییەکان و بڕیارە پێشوەختەکان و بیروڕا سادە و ساکار و ناتەواوەکان کە ئەفسانەی ئەشکەوتی ئەفلاتونی بەبەربەست و تاریکی هێمای بۆدەکات، پاش پەیوەندیکردنی فەلسەفە بە ئایینەوە رووبەڕوی "ئاستەنگە مێژووییەکان" دەبێتەوە، واتە ئاستەنگی رزگاربوون لە بیروباوەڕی "ئەشکەوتی لاهوتی" کە لەسەروو "یەکەم ئەشکەوتی سروشتییەوە" دەبینرێت.[٧]

لەلایەکیدیکەوە، لەبەرئەوەی فەلسەفە سنووری نییەلە ئازادی پرسیارکردندا، لەبەرئەوە هیچ دوودڵ نییە تەنانەت لەدانانی بیروڕای خەڵکی سەبارەت بە خواوەند لە جێگەی پرسیاردا، مەبەست لەوەش بە عەقڵانیکردنی تێڕوانین و رەئیەکانیانەوە بۆی. ئەوەش زانراوە هەروەك ئەوەی

ئەفلاتون دەڵێت: "کاتێك بیروبۆچوونی خەڵکی سەبارەت بە خواوەند دەگوڕدرێ، ئەوە دەبێت یاساکانیش بگۆڕدرێن"(٨)، ئەوەش واتای وایە کە فەلسەفە لەمیانی ئایینەوە دەبێتە مەترسی بۆسەر سیاسەت، واتە مەترسییە بۆسەر هەردووکیان پێکەوە. رەنگە ئەم پێکداچوون و تێکەڵییە بێت لە وجود و چارەنوس لەنێوان سیاسەت و ئاییندا وایکردوە لە شاری ئەسینا حکومی مردن بدات بەسەر سوکراتی فەیلەسوفدا، ئەو حوکمەی کە "ڕووداوێکی مێژوویی دامەزراوی فەلسەفەی سیاسی" پێکهێنا لە دیدگای شتراوسەوە.(٩)

**دووەم: سیاسەت و فەلسەفە یان ئەشکەوت و نوور**

هەر لەسەرەتادا شتراوس چاوخشاندنی بە "فەلسەفەی سیاسیدا" لە دوو بەرەوە هەڵبژارد، بەرەی رەخنەگرتن لە مۆدێرنیتە و بەرەی رەخنەگرتن لە "رەخنەگرتن لە مۆدێرنیتە". پرۆژە فیکرییەکەی خۆی بۆ فەلسەفە دانا لە کودەتایەکی کردەیی بەرچاو کە گۆڕاویەتی بۆ "فەلسەفەی سیاسی"، ئەم کودەتا کردەییە کە ئەرستۆ لە سەردەمە کۆنەکاندا ئەنجامیدابوو، بەشێوەیەکی ریشەیی بەئاراستەی ماکیاڤیللیدا رۆیشت ( Niccolo Macchiavelli ١٤٦٩ ــ ١٥٢٧) لە سەردەمی نوێدا. ئەم زەمینەسازییە کودەتاییەلە فەلسەفەی تیۆرییەوە بۆ فەلسەفەی کردەیی ئەوەیە کە بووە بەپرسیار لای شتراوس ئەویش "فەلسەفەی سیاسی چییە؟"، نەك "میتافیزیقا چییە؟" هەروەك بەهەمانجۆریشە لای هایدگەر (١٩٧٦ - Marti Heidegger١٨٨٩) ئەمەش ئاماژەیە بۆئەوەی کە هاوڵاتی، یان "وجودی سیاسی" مەبەستپێی مرۆڤە، ئەمەش مەبەستی شتراوسە، نەك وجودی ئەنتۆلۆجی، کە پەرۆشە بۆ دڵەڕاوکێکەی و نوقمبووە لە کۆتاییە خودییەکەیدا.(١٠) ئەم پرسیارەشی دەکەوێتە جێگەی رەخنەگرتنێکی دوو لایەنەی لە مۆدێرنیتە و لە مۆدێرنیتەوە بۆ رەخنەگرتن لە خودی خۆی:

١. مەودای ناکۆکی نێوان سیاسەت و فەلسەفە یان سیاسەت بەو سیفەتەی مەرجێکە و ئامانجێکە بۆ پراکتیزەکردنی فەلسەفی: وەك وتمان ناکۆکی نێوان سیاسەت و فەلسەفە یان نێوان شار و ژیری، خاڵی دەستپێکردنی شتراوسە لە لێکۆڵینەوەی قەیرانی سیاسی مۆدیرنە، بەدرێژایی مێژووی فەلسەفە. شتراوس دوو خوازراوی بۆ ئەفلاتون بەکارهێناوە کە پێکەوە لە گفتوگۆکەی کۆماردا هاتوون، بۆ باسکردن و وێناکێشانی ئەم ناکۆکییە، ئەوانیش "ئەشکەوتی تاریك - ناهۆشیاری"ە کە هاوڵاتیانی کۆتوبەندکراو بە بیروبۆچوونی تێدایە کە بریتییەلە سیاسەت و نور-

هۆشیاری که ئاماژەپێدەکات بە فەلسەفەیەکی باڵا بەسەر سیاسەتدا، ئەم نورە کە لەڕووناکییەکەیەوە راستییە رەها و ئازادەکان لە کۆتوبەندی بیروڕا و گومان و باوەڕەکان دەخاتەڕوو. مەبەست لە دەرخستنی ئەم ناکۆکییەلەمیانی ئەو دوو خوازراوە ئاماژەبۆکراوە (ئەشکەوت و نور – هۆشیاری و ناهۆشیاری) جەختکردنەوەیە لەسەر پێویستی بەدواداچوونی شار (دەوڵەت)، بە هاونیشتمانی و بەرپرسەکانیەوە، بۆ فەیلەسوفان و بەرتەسککردنەوەی ئازادیان لەتێفیکرینیاندا، بەبانگەشەی ترساندنیان بە "بیروبۆچوونەکان"ی شار و بیروباوەڕەکانی و سەرکەوتن بەسەریدا بەڕووی مەعریفەدا.(١١)

لەڕاستیدا، فەلسەفە کەوا دەردەکەوێ، سوکرات بەباشترین شێوە نواندنی بۆکردووە و وەك ئەوەوایە کە هیچ کارێکیتری نەبووبێت جگەلە تووڕەکردنی هاوڵاتیان و پیاوانی دەوڵەت بەپرسیارە ئیحراجکەرەکانی کە تێیدا داوایلێدەکردن چاوبخشێننەوە بە سەرجەم دابونەریت و بەها وبیروباوەڕ و ئەفسانەکانیان و شێوازی هەڵسوکەوت و جۆری رێکخستنە سیاسییەکەیان و تێڕوانینە کەونییەکانیان. هەرکات بارودۆخەکە ئاڵۆزتربوایە فەیلەسوفەکان هەڵدەستان بەخستنەڕووی پرسیارەکانیان بەبێ هیچ خۆپارێزیەك یان خۆئامادەکردنێك بۆ رازیبوون بەو وەڵامەی لەلایەن بەرپرسانەوە لێیاندەکرا، ئەمەش سیفەتێکی مەترسیداری دەدایە پرسیارەکانیان لەبەرئەوەی قایلنەدەبوون بە روودانی حاڵەتێك لە سەرلێشێوان لەو کەسانەی قسەیان لەگەڵ دەکەن، بەڵکو گاڵتەیان پێدەکەن.(١٢) سوکرات پرسیارکردن لە هاوڵاتیان و دانانیان لە بەرەیەکی دژدا و رۆڵی لۆژیکی بەو ئەرکە فەلسەفی – سیاسییە دادەنێت کە واتا دەبەخشێتە ژیان لەسەر شێوازێکی فەلسەفی و ئەمەشە وایکردووە ئامانجی فەلسەفە دژی ئامانجی سیاسەت بێت: لەبەرئەوەی ئەگەر ئەرکەکانی سیاسەت پاراستنی رەئییەکان و بیروباوەڕەکان و دامەزراوەکان بێت، چونکە ئەم سیستمەیە کە بەردەوامی شار دەسەبەردەکات لەنێو ململانێیەکی رێپێدراو لە چوارچێوەی یاساکان و پرەنسیپە پەسەندکراوەکانەوە لەلایەن هەمووانەوە، بەڵام فەلسەفە بەپێچەوانەی ئەمەوە دەردەکەوێت و وەك ئەوەیە کاربکات بۆ لادانی ئەو سیستمە بەهاندان بۆ گومانکردن لە رەگوڕیشەی ئامادەسازی بۆ پێشکەشکردنی ئەلتەرناتیڤەکانی.

دەبینین شتراوس لە شرۆڤەکانییەوە لەسەر کۆماری ئەفلاتون دەگاتە ئەو دەرەنجامەی کە رێککەوتن لەنێوان فەلسەفە و دەسەڵاتی سیاسی کارێکی گرانە بەمەبەستی راپەڕاندن و بەڕێوەبردنی کاروباری شار، لەبەرئەوەی لە زیاتر لەئاستێکدا بە دوو لای دژبەیەکدا

هەنگاودەنێن. لە لایەنی ئەبستمۆلۆجیەوە فەلسەفە جیادەکرێتەوە لەبەرئەوەی فەلسەفە مەعریفەیە یاخود خۆشویستنی مەعریفەیە، لەکاتێکدا سیاسەت بەرەوپێشەوەناچێت یان بەوردی تێناکۆشێت بۆئەوەی ببێتە زانیارییەکی زانستی و بەوە پێناسەی خۆی دەکات کە کارامە و خاوەن لێهاتوویەکی زانستییەلە سەرکردایەتیکردن و بەڕێوەبردندا.[١٣] لەڕووی چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ هەمووواندا، فەلسەفە وادەردەکەوێ کە لە بوونی هەمووان دەکۆڵێتەوە لەکاتێکدا سیاسەت هەوڵدەدات بۆ ئەوەی ببێتە فەرمانڕەوای هەمووان.[١٤] لەڕووی ئەو ئامانجەی کە دەیەوێت، تێبینیدەکەین لەکاتێکدا فەلسەفە دەیەوێت بگاتە حیکمەت یان بەلایەنیکەمەوە لەڕێی خۆشەویستییەوە لێینزیکببێتەوە، سیاسەت دەخوازێت بگاتە دەسەڵات وەك هۆکارێك بۆ بەدیهێنانی خۆشبەختی. هۆکاری چوارەمیش هەیە وەلادەنرێت بەبێ بەدیهێنانی ڕێککەوتنێك لەنێوان فەلسەفە و سیاسەتدا بەمەبەستی بنیاتنانی شارێکی هاوبەش لەنێوانیاندا، هەروەها توانای بوونی شارێکی دادپەروەر لەسەر ئەم ڕێککەوتنە ناوەستێ، لەبەرئەوەی فەیلەسوفەکان سوودیان نییە، بەڵکو ڕەنگە ببنە مایەی زیانیش بۆ سیاسی، بەتایبەتی ئەوەی لەسیاسەتدا سوودبەخش و گونجاوە لەفەلسەفەدا سوودبەخش و گونجاونییە و بەپێچەوانەشەوە ڕاستە.

لەگەڵ ئەوەشدا، ئەفلاتون و لێکۆڵەرەوەکانی وایبۆدەچن کە سیاسەت لەچەند لایەنێکەوە مەرجە بۆ فەلسەفە. لەنێویاندا ئەگەربێتو "شارەزایی سیاسی" لەنێو ئەشکەوتەکەدا ئاماژەبێت بۆ توانای جیاکاری لەنێو تاریکیدا، واتە جیاکاری لەنێوان ڕەئیەکان و گومانەکان و جیاکردنەوەی بیروباوەڕە دروستەکان لە نادروستەکان، ئەوکاتە ئەم جیاکارییە سەرەتایەکی پێویستدەبێت بۆ تێپەڕاندن لە ڕەئییە گشتییەکانەوە بۆ مەعریفەی فەلسەفیی. ڕێگا بۆ دەرککردنی حەقیقەت (فەلسەفە) جیاکارییەلەنێوان ڕەئییەکان (شارەزایی سیاسی)، لەبەرئەوە تێڕوانینی هۆشیار جیانابێتەوە لە تێڕوانینی ناهۆشیار، واتە مومارەسەکردنی فەلسەفە جیانییەلە مومارەسەکردنی سیاسەت. لەلایەکیدیکەوە ڕێگەنییە بۆ مومارەسەکردنی فەلسەفە، واتە ڕێگەیەك نییە بۆ مومارەسەکردنی ژیان بەشێوەیەکی فەلسەفی، تەنها مەگەر لەوحاڵەتەدا نەبێت کە سیاسەت مەرجە پێویستەکانی تێدابێت لەنێو فەزای سیاسی گشتیدا بۆ ئەنجامدانیی، ئەمەش مانای ئەوەیە کە سیاسەت تاکە ڕێگەیە بەرەو فەلسەفە، هەرچەندە لە داستانی ئەشکەوتی ئەفلاتونەوە وادەردەکەوێ کە کاری فەیلەسوف ئەوەیە بەشێوەیەکی خێرا بتوانێت لە ئەشکەوتەکە دەرچێت،

واته له فەزای سیاسی دەرچێت.[١٥] لەڕاستیدا ئەمە بارودۆخێکی سەرنجڕاکێشە، چۆن دەکرێت سیاسەت مەرجێکی پێویستبێت بۆ دەرچوون له سیاسەت؟ یان چۆن دەکرێت "شارەزایی سیاسی" که ئەو توانایەیە بۆ هەڵبژاردنی بیروبۆچوونە دروستەکان کە خزمەت بە بەرژەوەندییەکانمان دەکەن و بیروبۆچوونە نادروستەکان کە زیان بە بەرژەوەندییەکانمان دەگەیەنن وەلادەنێت، ئەوەش ئەو پلەبەندییەیە فەیلەسوف پێیدابەرزدەبێتەوە له سیاسەتەوە بۆ فەلسەفە، واته بۆ فەزای حەقیقەتی دوور لە بەرژەوەندییەکان و ململانێکان؟

لەلایەکیدیکەوە سیناریۆی داستانی ئەشکەوت واپێویستدەکات فەیلەسوف بگەڕێتەوە بۆ ئەشکەوتەکە پاش ئازادبوونی له کۆتوبەندەکانی، واته گەڕانەوەی فەلسەفە بۆ سیاسەت، ئەمەش وەك ئامانجی یەکەمی وایە. ئایا واتای ئەمە ئەوەیە کە مومارەسەی فەلسەفە وادەکات له فەیلەسوفەکان توانای مومارەسەی دەسەڵات و فەرمانڕوایی بەدەستبهێنن یان بنیاتنانی شاری یۆتۆپیا؟ فەیلەسوف به سروشتی خۆی له فەرمانڕەوایەتیکردن هەڵدێت و بەناڕازیی و دوودڵییەوە لێپرسراوێتی وەردەگرێت یاخود هەر وەریناگرێت، بەمەش ئەفلاتون دەگاتە ئەو دەرەنجامەی کە بنیاتنانی شارێکی دادپەروەر و یۆتۆپیا بەدینایەت.[١٦] لەبەرئەوە دیموکراتییەت تاکە ئیحتمالی نزیکە له شاری یۆتۆپیاوە، بەڵام ئەفلاتون لەم ئەلتەرناتیڤە دڵنیانییە، لەبەرئەوەی سیستمی دیموکراتی لەسەر ئازادی بنیاتنراوە، نەك لەسەر چاکێتی، ئەمەش دەبێتە هۆی بنیاتنانی مرۆیەکی ناچالاك وتەمەڵ و گۆڕاو وکەمتەرخەم بەرامبەر بە ئەرکەکانی لە ئاست شارەکەدا. [١٧]

هەڵوێستی ئەرستۆ لەسەر فەلسەفە و فەیلەسوفەکان زۆر جیاوازنییەلە هەڵوێستی ئەفلاتون، بڕوایوایە کە "فەیلەسوفەکان.. بەشەکانی هیچ دەوڵەتێك نین، لەبەرئەوەی ئامانجی دەوڵەت لەڕووی ئەوەی کە دەوڵەتە کامڵبوونی تیۆری تێفیکرینی نییە، چونکە شارەکان و نەتەوەکان نافەلسەفێندرێن".[١٨] رەنگە ئەوەش ئەو هۆکارە بێت کە فەیلەسوف لەشاردا بەشێوازێکی رەها ئازادی دەربڕینی نییە، بەڵام ئەم دژیەکییە حەشاردراوە لەوەی ئەو واقیعە سیاسییە دژبە ئازادی تێڕامانی فەلسەفییە کە هانی فەیلەسوف دەدات گرنگیبدات بە سیاسەت و هەموو شێوە وتارییەکان بەکاربهێنێت بۆ چاندنی گومانەکانی و ئاراستەکردنی پرسیارەکانی بەتەواوی ئازادییەوە.

**٢.جیاکاری لەنێوان ئاکار و سیاسەتدا بۆ سەرکەوتن بەسەر مرۆڤدا:**

ئەوەی مۆدێرنەی پێجادەکرێتەوە ئەوەیە کە دژیەکی نێوان فەلسەفە و سیاسەت هەڵدەوەشێنێتەوە. ئالۆویری ماکیاڤیللی بۆ ئاراستەی "فەلسەفەی سیاسی" لە تێڕامانی تیۆرییەوە لەبری راگەیاندنی رەسمییە بۆ لەهاتنەبوونی مۆدێرنەی سیاسی،[١٩] بەلاّم لەهەمانکاتدا بوو بە یەکەم کەلێنی قەیرانی مۆدێرنەی سیاسی، لەبەرئەوەی بەڕووی مێژوویێتییەوە توانجی لێدەگێرێت و بەعەدەمییەت لێکدەدرێتەوە. مەترسیدارترین نیشانەی ئەم قەیرانە چییە کە مێژوویێتی نوێنەرایەتیدەکات لە چارەسەرە عەدەمییەکەیدا؟

بێگومان "پرسی جوولەکەکان" هۆکاری راستەوخۆ و خودی بوو لە ئاگادارکردنەوەی شتراوسدا بۆ سنووری دیموکراتی لیبراڵی. ئەویش وەك فەیلەسوفەکانیدی، باوەڕی بە شکۆداری بەها بەرزەکان هەبوو کە مۆدێرنەی لیبراڵی مژدەی پێدەدا، لە لێبوردەیی و دادپەروەی و داننانبە مرۆڤدا وەك کائینێك و داننانبە ئەویتردا و هەروەها لەگەڵ ئەوەشدا بانگەشەکردن بۆ ئازادی و یەکسانی، بەلاّم تووشی بێهیواییەکی گەورەبوو پاش ئەوەی بۆ خۆی بینی کە کۆماری ڤایمەری ئەڵمانی نەیتوانی بنەمای بێلایەنی دەوڵەت بەدیبێنێت و سەرکەوتوونەبوو لەڕێگرتن لە دوژمنانی دیموکراتی لە نازییەکان بۆئەوەی نەچنەسەر حوکم و رێگربێت لەو تاوانە ترسناکانەی کە بەرامبەر بە جوولەکەکان ئەنجامیاندا.[٢٠] ئەم تەجروبە سیاسییە بووەهۆی لێکجیاکردنەوەیەکی خودی بنەماکانی لیبراڵییەت و بەها رۆشنگەرییەکانی، ئینجا دوژمنەکانی دەتوانن بە خودی خۆی و لەناوخۆیدا بەکاریبهێنن. بۆ نموونە زیادەڕەویکردن لەلێبوردندا ئاسانکاریکرد بۆ نازییەکان بۆئەوەی رۆشنبیری لێکنەبوردن بلاّوبکەنەوە و زیادەڕەویکردن لەدیموکراتییەتدا وایلێکردوون مافی دەستبەسەراگرتنی فەرمانڕەوایەتییان پێبدرێت بۆ بەرتەسککردنەوەی. ئەمەیە وایکردوە مەرج دابنرێت بۆ جێبەجێکردنی بنەماکانی دیموکراتییەت هەتا نەبێت بە چوارچێوەیەك بۆ لەگۆڕنانی.[٢١]

هۆکاری دووەم لەپشت تەشەنەکردنی قەیرانی مۆدێرنەی سیاسییەوەیە لەرۆژئاوادا خۆی دەبینێتەوە لە وەرگرتنی شێوازێکی تایبەت لە عەقڵ ئەویش "عەقڵی حسابی تەکنیکی"ە کە "عەقڵی بنەڕەتی" لە ناوەڕۆکەکەی خاڵیکردەوە و هیچیدیکە نەبوو جگەلە هەستان بەئەنجامدانی دەستەبەرییەکی میتافیزیکی لە تێڕوانینی تەکنولۆجییەوە بۆ وجودی تاکی و کۆمەڵی.[٢٢] رەنگە وەرگرتنی ئەمجۆرە لە عەقڵی حیسابی تەکنیکی لەلایەن مۆدێرنەوە بووبێتە

هۆی بالآدەستی تێڕوانینی مێژوویەتی بەو رۆڵەی کە بینیویەتی بووەتە هۆی بڵاوکردنەوەی تێڕوانینی رێژەیی، هەروەها لە تێڕوانینی عەدەمییەوە دەیڕوانییە هەموو شتێك، دەیڕوانییە سروشت و مرۆڤ و بەها و خێر و شەڕ و دادپەروەری و ستەم.(٢٣) نەزعەی عەدەمی بەتایبەتی لە نووسراوەکانی نیچەدا رەنگدەداتەوە کە شەپۆلی سێیەم و زیاتر ریشەیی پێکدەهێنێت بۆ مۆدێرنە.(٢٤)

لە دەرەنجامەکانی بالآدەستی عەقڵی حیسابی سوودبەخش جیاکردنەوەی سیاسەتە لە چاکە یان وردتر بڵێین چاکەی خستەژێر فەرمانی سیاسەتەوە، ئەوەش هۆکاری سێیەمی قەیرانی مۆدێرنەی سیاسییە. ماکیاڤیللی خاوەنی ئەم بەشە بوو کە دواتر هۆبز و ئەوانەی بەدوای ئەویشدا هاتن پاڵپشتییانکرد، لەناوەڕۆکیدا بەکودەتایەك دادەنرێت بەسەر فەلسەفەی کلاسیکیدا کە سیاسەت ملکەچدەکات بۆ بەها رەوشتی و عەقڵییەکان نەك بەپێچەوانەوە. راستە کە هیچکەسێك ناتوانێت نکوڵی لە گرنگی رەتکردنەوەی ئەم بەشە بکات یان ئاوەژوویبکاتەوە کە خۆی دەبینێتەوە لە سەربەخۆیی بوونی زانستی سیاسەت و دانان بە بوونی و ئەو یاسایانەی تایبەتە بەخۆی، واتە بە رەسمی زانستی سیاسەت بنیاتبنرێت، بەڵام دوورخستنەوەی سیاسەت لە چاکە بەو رۆڵەی دەبێتە هۆی ئەوەی هەموو شتێك رێگەپێدراوبێت و بەمەش مرۆڤەکان دەبنە دوژمنی یەکتر.

بەشی سیاسەت لە رەوشت جیادەکاتەوە لەبەر بەشێکیدی لەنێوان عەقڵ و وەحیدا و لەنێوان مەعریفە و ئیماندا. ئامانج لەم بەشەی کۆتایی بریتییەلە دانانی کاروبارە سروشتی و مرۆییەکان لە دەرەوەی ئەو دوو بنەمایەی کە هەموو دینێکی لەسەر وەستاوە، ئەوانیش موعجیزە و چاودێری خوداییە، لێکدانەوەی - واتە لێکدانەوە و شیکردنەوەی کاروبارە سروشتی و مرۆییەکان - تەنها بە مەعریفەی زانستی ورد کە مرۆڤ لەیەککاتدا دەتوانیت لە نهێنییەکانی کەون و شاراوەکانی مرۆڤ و کۆنترۆڵکردنیان تێبگات.

بەشەکە لەنێوان ئەخلاق و سیاسەتدا کۆتاییدێت بە داماڵینی مانای بنەڕەتی مرۆڤ، بەوەی کە بە بوونەوەرێکی شەفاف وێنایدەکات، بە شتی ناڕوون و شاراوە دەورنەدراوە. دانپێدانانی مۆدێرنە بەسەربەخۆیی خودی مرۆڤدا، یەکێکە لە نیشانەکانی کەموکوڕی نەخۆشی مۆدێرنە، سەرەتای کرداری داماڵینی مرۆڤە لەڕێگەی دانان بە تواناکانی لەسەر بەرهەمهێنانی کارەکانی و خولقاندنی فیکرەکانی لە ناخی خۆیدا بەو ئیعتبارەی "سەرچاوەی ماف و راستییە

پێكەوە". هەریەك لە ماكیاڤیللی و هۆبز و سپینۆزا بەشدارن لەم كرداری داماڵینەی مرۆڤدا، كاتێك هەریەكەیان لە روانگەی خۆیانەوە هەستان بە:

یەكەم: چاوخشاندنەوە بە پێناسەی سیاسەتدا لە دەرەوەی شاری یۆتۆپیا و ئایین و فەلسەفەی كلاسیكی و سەدەكانی ناوەندەوە.

دووەم: چاوخشاندنەوە بە پێناسەی مرۆڤدا لە دەرەوەی سروشتدا.(٢٥) بەمجۆرە مرۆڤ لە دژی سروشت دانراوە، بۆیە لەوكاتەوە بەشێوەیەكی چاوچنۆك و دڕندانە هەوڵدەدات بۆ بەفیڕۆدان و وێرانكردنی خێروبێری سروشت بەمەبەستی تێركردنی غەریزەكانی و قایلكردنی ویست و داواكارییەكانی بەبێ هیچجۆرە بەربەستێكی ئەخلاقی. لەڕاستیدا چاوخشاندنەوە بە پێناسەی سیاسەت و مرۆڤدا وایكردووە ئازادی و مەعریفەی زانستی لە چەقی گرنگیپێدانی فەلسەفەی سیاسی نوێدا دابنرێت، لەبری چاكە و مەبەستە سروشتی و میتافیزیقییەكان كە ئامانجی فەلسەفەی كلاسیكی و ناوەندە، مرۆڤ شكستدەهێنێ لەبەردەوامیدان بە تاڵانی و عەدەمییەت و بێیاوەڕی.(٢٦)

### ٣. مێژووی فەلسەفە چارەسەری قەیرانی مۆدێرنیتە:

لەبەردەم والآنەكردنی مێژوودا بۆ كەلێنێكی رزگاربوون بەڕووی مرۆڤی نوێدا بۆئەوەی ئەشكەوتەكەی بەجێبهێڵێت و رووبكاتە فەزای فەلسەفە، شتراوس ناچاربوو بە دووی دەرچەیەكیدیكەدا بگەڕێت بۆئەوەی لێوەی بچێتەنێو ئەشكەوتی مێژووەوە و ئەوەشی لە "مێژووی فەلسەفە"دا دۆزییەوە، هەروەك "فەیلەسوف، ئەگەر بیەوێت بە فەیلەسوفی بمێنێتەوە، پێویستە ببێتە مێژوونوسێكی باشی فەلسەفە".(٢٧) ئەوە ناشارێتەوە كە ئەم چارەسەرە لەڕووی رواڵەتەوە وەك ئەوەیە لە مۆدێرنە هەڵبێیت، لەبەرئەوەی لەبری رووبەڕووبوونەوەی قەیرانەكەی بە كاركردن لەسەر رەگوڕیشەی مۆدێرنە و كاركردن بۆ بەرەوپێشبردنی بەگەشەپێدانی فەلسەفە سیاسییەكەی، گەڕانەوە بۆ باكگراوندە مێژووییەكەی، دەگەڕێتەوە بۆ شتراوش كە بەمەبەست لەبیریكردووە. لەبەرئەوە بەجێهێشتنی ئەشكەوتی مۆدیرنەی سیاسی، واتە رووبەڕووبونەوەی ئەو كودەتایەی كە ماكیاڤیللی پێیهەستا بەسەر فیكری سیاسی كلاسیكدا ئەویش بریتیبوولە ملكەچپێكردنی چاكە بۆ سیاسەت، شتراوس داوای گەڕانەوە دەكات بۆ فەلسەفەی سیاسی كلاسیكی لەبەرئەوەی ئەو فەلسەیەیە كە سیاسەت دەخاتەژێر فەرمانی ئەخلاق و عەقڵەوە.(٢٨)

ئەوە روونە ئەو "گەڕانەوە"یەی کە شتراوس داوایدەکات گەڕانەوەیەك نییە بۆ دەقەکانی ئەفلاتون و ئەرستۆ وەك ئەوەی مۆدیرنە لێیتێگەشتووە، بەڵکو "گەڕانەوەیەکی نوێیە" وەستاوە لەسەر پەیبردن بەو دەقانە وەك چۆن هاوەڵەکانی پەیبانپێبردووە، نەك وەك ئەوەی نوێگەرەکان پەییانپێبردووە لەمیانی دیدگای نوێگەری تایبەت بە خۆیانەوە.[٢٩] راستە، ئەو دانیناوە بەوەدا کە نیچە و هایدگەر راستبوون کاتێك داوای گەڕانەوەیان کردووە بۆ فەیلەسوفە پێشینەکانی یۆنان، بەڵام لەوەدا هەڵەیانکردووە کاتێك گەڕانەوەیان بۆ ئەو فەیلەسوفانەیان بەباشتر زانیوە کە لەپێشی سوکراتەوە بوون، نەك بۆ ئەفلاتون وئەرستۆ کە ئەو دوو فەیلەسوفە نوێیە لیپرسراوێتی قەیرانی میتافیزیکای رۆژئاوا دەخەنە ئەستۆیان.[٣٠] لە روانگەی شتراوسەوە چارەسەری قەیرانی مۆدێرنیتە، هەرگیز ناکرێت تەنها بە گەڕانەوەی گرنگیی و بایەخ نەبێت بۆ سوکرات و دوو قوتابییەکەی ئەفلاتون و ئەرستۆ، لەبەرئەوەی لە بیرکردنی مۆدیرنە لەلایەن فەلسەفەی سیاسی کلاسیکەوە ئەمانە دروستیانکرد لەسەر بنەمای چاکە بوو و نزیکبوونەوە لە سروش یەکێك لە هۆکارە سەرەکییەکان بوو لە هەڵگیرساندنی قەیرانی مۆدیرنەی سیاسی.[٣١] ئەوەی گەواهیدەری ئەمەیە ئەوەیە کە هایدگەر قەیرانی مۆدیرنەی سیاسی بە لەبیرکردنی بوون (وجود)و گۆڕینی بەمێژوو لێکدەداتەوە، لەبری ئەوەی بەلەبیرکردنی سروشت لێکیبداتەوە کە لە سەردەمە نوێکاندا وێرانکراوە.[٣٢] ئەمەش واتای ئەوەیە کە کێشەی مۆدێرنە کێشەی بوونگەری (وجودی) نییە، واتە پەیوەندیداربێت بە واتای بوونی تاکەوە یان جادووکردن بەم دەستەواژە خوازراوانە "مردنی خوا"و "لەبیرچوونی بوون" یان داننان بە "نیسبییەت"و "قبوڵنەکردنی مافی سروشتی"، لەڕاستیدا ئەوە کێشەی شارە، واتە ئەخلاقی و سیاسی، بەتایبەتی لەوەدا دەردەکەوێت کە نەمانتوانی پێکەوەژیان و پەیوەندییەکی هاوکارییانەی هاوبەش لەگەڵ هاولاتییان لەناوشاردا بنیاتبنێین، بەمەبەستی بەدیهێنانی چاکەی گشتی و خۆشبەختییەکی هاوبەش بۆ هەمووان.[٣٣] مەبەست لەم تێڕوانینە قووڵەی شتراوس بەجۆرە بریتییەلە گەیشتن بە مرۆڤ هەتاوەکو ببێت بە هاولاتییەك بەشداربێت لە ژیانی سیاسی و ئەخلاقی هاوبەش لەنێو دەوڵەتدا و نەگەیشتن بە مرۆڤ بەوەی کە هەیە لەوێدا.

بەڵگەیەکیدیکە هەیە کە شتراوس لە پێویستی گەڕانەوە بۆ مێژووی فەلسەفە پشتیپێدەبەستێت بۆ چارەسەکردنی ئەو قەیرانە سیاسییەی کە مۆدێرنەی تێدانقوومبووە، ئەویش بریتییەلەوەی کە ئەم ئەزمەیە لەکرۆکیا قەیرانی "فەلسەفەی سیاسی نوێیە"، واتە ئەزمەی

راستێتی و کاریگەری ئەو بنەمایانەی کە بەهۆیانەوە دەوڵەتی نوێ دادەمەزرێت، بەتایبەتی ئەو پێشەکییانەی کە عەدالەت دەبەستێتەوە بە خۆشبەختی و خۆشگوزەرانی و زانست دەبەستێتەوە بە زاڵبوونی سروشتەوە. بابەتەکە زیاتر پەیوەندی بە قەیرانی "تیۆرییەوە" هەیە تا بە قەیرانی "پراکتیکییەوە"، ئەمەش دەلالەتە بۆئەوەی کە ناکرێت و ناتوانرێت چارەسەری قەیرانی مۆدێرنە بکرێت لەنێو خودی مۆدێرنە خۆیدا، بەڵکو پێویستە لێیدەرچین و بگەڕێینەوە بۆ کەلەپووری فەلسەفەی سیاسی کلاسیکی و ناوەندی بۆ وەستان لەسەر ئەو بنەمایانەی کە مۆدێرنە لێیهەڵگەڕایەوە و لەبیریکردن.[٣٤] وازهێنانی فەلسەفەی سیاسی نوێ لە فیکری کلاسیکی بەبیانوی ئەستەمی دەرککردن بەبوون لە خودی خۆیدا بەڵکو گرانی دەرککردنی بە رووکاری دەرەوەی ئەم بوونە تەنها مەگەر لە سیاقە مێژووییەکەیدا داینێین، دەبێتەهۆی هەستکردن بە بێکەڵکبوونی پرسیارکردن لە جەوهەری بەها و نموونە باڵاکان، جەوهەری ماف و چاکە و بەختیاری، باوەڕبوون بە نوێگەری بەوەی کە ئەم پرەنسیپانە هیچیان بوونیان نییە جگەلە وێنەیەکی مێژووی گۆڕاو کە سروشتی سەردەمەکان و دەربڕینەکان و مەرجە کۆمەڵایەتی و سیاسی و مێژووییەکان کە لێوەی دەرچووە ئاوەژوودەکاتەوە.

پێویستنییە ئێمە لێرەدا دڵنیابین لەوەی کە پرۆژەکەی شتراوس مەبەستی ئەوەیە بمانگەڕێنێتەوە بۆ رابردوو و لەسەری بوەستین. ئەو داندەنێت بەوەدا کە ئەوە کارێکی ئەستەمە، بەتایبەتی ئەگەر ئەوە وەرگرین کە رەخنەکانی ئەفلاتون لە دیموکراتییەت رەخنەیەکەی راست نییە و نە چاکەکەی ئەرستۆ یان سیستمە سیاسییە ئایدیالییەکەی (کە تابعێکی دوو لایەنەی هەیە و کۆکەرەوەی دوو سیستمی جیاوازە: کۆماری و ئەرستۆکراتی) دەرچەیەکی ئایدیاڵییە بۆ قەیرانی دیموکراتی نوێ. لەڕاستیدا رەخنە شەڕانییەکەی شتراوس لە دیموکراتییەتی لیبراڵی رێگرنەبووە لەوەی کە لە بەرگریکارە زۆر بەهێزەکان بێتلێی.[٣٥] ئامانجی لەپشت رەخنە توندەکانییەوە بریتییەلە وەبیرهێنانەوە بەگرنگی گەڕانەوە بۆ نموونە باڵا ئەخلاقی و سیاسی و سروشتی و میتافیزیکی کلاسیکی و سەدەکانی ناوەڕاست بەمەبەستی تێرکردنی دیموکراتییەتی لیبراڵی نوێ بۆئەوەی بتوانێت لە قەیرانەکەی دەربازبێت.

**٤. چوار بۆ گەڕاوەکە: گەڕانەوە بۆ سروشتی بنەڕەتی، عەقلانییەتی دروست، سروشی دروست، سیستمی دروست:**

لەوەی پێشوو بۆمانڕووندەبێتەوە کە گەڕانەوە بۆ فەیلەسوفە پێشینەکان بۆ خودی خۆی نابێت، بەڵکو بۆ چاکسازی کۆمەڵێك تێڕوانین و بڕیار و هەڵوێستی پێشوەختە کە مۆدێرنە لەخۆیگرتووە و دڵسۆزی مرۆڤی نوێی پێچەواشەکردووە. کاتێك "سروشت" یەکەم قوربانی ئەو هەڵوێستە پێشوەختانە بێت، ئەوە لە مەبەستەکانی گەڕانەوە بۆ مێژووی فەلسەفە گەڕاندنەوەی سروشتە لە واتا بنەڕەتییەکەی پێشوو لەپێش مۆدیرنەدا، واتە ئەو سروشتەی کە مۆدیرنە بە زانست و تەکنیکەکانییەوە داگیریکردووە، بەڵکو سروشتی پێش ئەو بەکارهێنانە ترسناکە پاڵپشتیدەکرێت بە لێکدانەوەی نوێی نادروست. لەڕاستیدا گەڕاندنەوەی سروشت بە مانا بنەڕەتییەکەی واتە تێگەشتنی هەمەلایەنەی سروشت، بەو مانایەی کە گشتێکە بەبێ ڕەگەز و بەشەکانیدیکە، ئەمەش سروشتێکی ئالۆزی پێدەبەخشێت، بۆیە ئەو نادیاری و ناڕوونییەی بۆ دەگەڕێتەوە کە پێش شتراوس بە مرۆڤی بە خشیبوو، لەوکاتەدا هۆشیاری و وریاییەك لەلای فەیلەسوف بەدەستدێت بەوەی کە ئەو ناتوانێت دەرك بەم هەموو گشتە بکات بەهەموو بەشە زۆرەکانییەوە، واتە ناکرێت سروشت ببێت بە بابەتێکی پەتی فیکر.[٣٦]

گەڕانەوە بۆ سروشت بەو مانایەی کە هۆکارێکە بۆ دەرچوون لە قەیرانی مۆدێرنیتە کارێکی ئاسان نییە، لەبەرئەوەی مۆدێرنە بە داماڵینی سروشت، واتە بە گۆڕینی بەمێژوو و سەپاندنی بەسەر مرۆڤدا بەو سیفەتەی کە تاکە جیهانێکە دەتوانرێت ژیانی تێدابێت کە خۆی بنیاتناوە لەسەر شێوازی ئەشکەوتێکی قووڵ کە دەرچوونلێی گرانە.[٣٧] ئەم ئەشکەوتە بریتییەلە "عەدەمییەت" کە دەرەنجامی دوورکەوتنەوەی مرۆڤە لە جیهانی سروشت و تێوەگلاندنی لە جیهانی مێژوودا کە مرۆڤ بەدیهێناوە. لەبەرئەوە رزگاربوون لە نوێگەری بە واتایەکیدیکە رزگاربوونە لە مێژووی مرۆڤایەتی و گەڕانەوە بۆئەو سروشتەی مێژوو بەرینەکەوتووە.[٣٨] "مێژووی فەلسەفە" ئەوەیە کە یارمەتیماندەدات لەسەر جیاکردنەوەی مرۆڤ لە مێژوو و گەیشتنی بە سروشت، واتە بەهۆکاری دەرچوون لە ئەشکەوتی دووەم "ناسروشتی" یان ئەشکەوتی مێژوویی یارمەتیماندەدات، بەرەو ئەشکەوتی یەکەم "سروشتی"، کە بەشێوازێکی ڕێژەیی دەرچوونلێی ئاسانە بەرەو هۆشیاری فەلسەفە بەواتا بنەڕەتیەکەی.[٣٩] بەمجۆرە جێهێشتنی ئەشکەوتەکە بەرەو فەلسەفە واتە ئارەزووی جیابوونەوە لە جیهانی سیاسەت کە بەشێکە لە

فەزای مێژوو و کات، بۆ ژیان لە فەزای ڕەهاکاندا، ڕەنگە مرۆڤی (پاش مۆدێرنە) جۆریك لەتێربوونی مێژوویی بەدیبێنێت کە وایلێدەکات بتوانێت لەگەڵ ئەودا ئومێدی گەیشتن بە جیهانی میتافیزیکا بەدیبێنێت.

لەڕاستیدا هۆشیاری (بە سروشتی بنەڕەتی) سەرەتایەکی پێویستە بۆ فەلسەفە، ئەگەر بۆ خۆی ویستی رزگاریبێت لە گرێی "کۆتایی عەقڵ"و لە ئاوەزخوازی سوودمەندانە و تەکنیککارانە، تەنانەت لە نائاوەزخوازییە پێشووەکان بەسەر سوکراتدا، و گەڕانەوە بۆ ئاوەزخوازی دروست. ئاوەزخوازی دروست هیچ شتێکیدیکە نییە جگەلەو ئاوەزخوازییە دیالۆگییەی کە گفتوگۆکانی ئەفلاتون زۆر بە باشی دیاریکردووە[٤٠].

لەپاش ئەو دوو گەڕانەوەیەی پێشوو، بۆ (سروشتی بنەڕەتی) و (عەقڵانییەتی دروست)، دەرگا بۆ گەڕانەوەی سێیەم دەکرێتەوە، ئەویش گەڕانەوەیە بۆ عەقڵ بەهۆی سروشەوە، ئەویش ئەو بەیەکگەیشتنەیە کە فەلسەفەکانی سەدەکانی ناوەڕاست تایبەتمەندبوون پێوەی و بانگەشەیاندەکرد بۆ بەجێگەیاندنی. گرنگی زیندووکردنەوەی فیکرەی پێکگەشتنی دانایی بە شەریعەت سەرلەنوێ دەگەڕێتەوە، یان ئەوەی دەکرێت پێیبلێین "سروشی دروست"، لەبەرئەوەی یەکێك لەڕێگاکانی چارەسەری قەیرانی مۆدێرنە پێکدەهێنێ، چونکە مرۆڤ و کۆمەڵگای مۆدیرن دەتوانن یەکێتی نێوان ماف و ئەرك بگەڕێننەوە، و دەرگایەکی نوێ دەکاتەوە لەبەردەم "هۆشیاریە نوێکاندا" و کۆدەبێتەوە لەنێوان ڕاستییەکان و ڕووداوەکان و بەهاکاندا[٤١]. ئەوەش ڕوونە کە "سروشی دروست" یان وردتر "عەقڵی دروست"ی کراوە بەڕووی سروشدا، لەتوانایدا هەیە کە نادیاری بگەڕێنێتەوە بۆ مرۆڤ کە نوێگەری بۆ خۆی داگیریکردبوو، بەوەش پڕدەبێت لە نهێنی، دواتریش لێوانلێودەبێت لە دەلالەت و واتا.

بۆ گەڕاوەی چوارەم و کۆتایی کە شتراوس پێشنیازیکردووە لەنێو ئەلتەرناتیڤی سیاسی گەیشتوو بە لایەنێکیدیکەی خودی مرۆڤەوە، ئەویش گەڕانەوەیە بۆ مەنهەجی سوکراتی کە خاوەن مۆرکێکی پرسیاری – ئیشکالی بەستراوە بە ژیانی مەدەنییەوە بۆ دەربازبوون لە لێکدانەوەی هایدگەری بۆ خودی مرۆیی بەو مانایەی "بوونێکە لەوێدا". هێزی مەنهەجی سوکراتی لە دانپێدانانی مرۆڤەوە دێت بە سنوور و ئاستی زانیاری ڕاستی شتەکان، ئەوەش وایلێکردووە بە گەڕان بەدوای زانیندا وازبهێنێت نەك چاوچنۆکی لە بوون بە خاوەنیدا، بە خۆشویستنی فەلسەفە قایلدەبێت، نەك بە ئارەزووی گەیشتنپێی.[٤٢] ئەوەش زانراوە کە

دانپێدانانی سوکرات بە سنووردا لەجۆری کانتی بێهوایی لە زانینی "شتکە لە خودی خۆیدا"، لەبەرئەوەی سوکرات کاتێك داندەنێت بەوەی کەوا "ئەو دەزانێت کە نازانێت"، نایەوێت لەپشت ئەوەدا لە هەوڵدان بوەستێ بۆ زانینی راستییە خودییەکانی شتەکان و ئەوەی پەیوەندی پێوەی هەیە، بەڵکو هەوڵدەدات ئەو راستییانە بخاتەڕوو کە بەردەوامە و سروشتێکی ئیشکالییان هەیە، دوای ئەوە ناتوانرێت یەکلابکرێتەوە بەشێوەیەکی کۆتایی. کاتێك فەیلەسوفێك هات و باوەڕی وابوو وەڵامەکەی ئەو کە پێشکەشیکردووە بۆ پرسیارەکە کۆتا وەڵامە و وەڵامێکی ئیشکالی نییە، و بەڵگەکانیشی لەسەر وەڵامەکانی لە رەخنەکانی ئەوانیدی گرنگترە کە لێیدەگرن، ئەوە دەوەستێ لەوەی بە تەواوی ببێتە فەیلەسوف.(٤٣)

گەڕانەوە بۆ مێژووی فەلسەفە لای لیو شتراوس لەسەر میتۆدۆلۆژیەکی نوێ وەستاوە خۆی دەنوێنێ لە هەڵوەشاندنەوەی کەلەپوور و نەریت بەهەوڵدان لەپشت خوێندنەوەی راستییە بنەڕەتییەکانی کە لەنێو دێرەکانیدا دەبینرێت،(٤٤) بەڵام ئەم گەڕانەوەیە، وەك وتمان، لەپێناو باشتر تێگەشتنی دەقەکان نییە لەوەی کە خاوەنەکانیان لێیتێگەشتوون لە لێکدانەوەی فەلسەفە و وردبوونەوە مێژووییەکانیانەوە، بەڵکو ئەوانیش هەروەك خاوەن دەقەکان لە دەقەکان گەشتوون. لەبەرئەوە دەبینین سەرزەنشتی ئەو نوێگەرانە دەکرێت کە دەقی پێشینەکانیان بەشێوەیەکی لایەنگرانەوە شیکردووەتەوە جا ئەوەش لەپێناو بەکەسیکردنی قەیرانی مۆدێرنەدا بێت یان لە بەئامانجی باسکردنی رێگەی دەرچوونلێی. جگەلەوەی ئەم میتۆدۆلۆژیە لە تێڕوانینی ئێمەوە مۆرکێکی لێکجیابووەوەی هەیە، لە لایەکەوە خوێندنەوەیەکی سیاسییە لەبەرئەوەی پەیوەستە بە خوێندنەوەیەکی شپرزەی رووکار بە ناوەڕۆك بەمەبەستی ئاشکراکردنی ئەوەی کە شاردویەتییەوە بە کۆمەکی چاوی وردبینەکانەوە لە ترسی شوێنکەوتن و چەوساندنەوە، سەرەڕای ئەوەی کە فەیلەسوفەکان ناتوانن هەڵبژاردەیان دیاریبکەن تەنها مەگەر لە کەشێکی پڕلە سەرکەشی و قەلەقی لە ترسی بەرتەسککردنەوەی ئازادی، بەڵام ئەم خوێندنەوەیە، لەلایەکیدیکەوە، رەدی ئەوە دەکاتەوە ببێتە چەمکەکان و کێشەکان کە رەگداکوتاوە لە ئاسۆ مێژوویە تایبەتەکەیدا یان لە ئاسۆی سیاسیدا کە گەشەیتیادادەکات.(٤٥)

**٥. پەیوەندی ئیشکالی نێوان فەلسەفە و سیاسەت:**

ئەو تێبینییەی پێشوو دەمانگەیەنێتەوە ئەوەی بڵێین بارودۆخی فەلسەفە لەشاردا زۆرجار شڵەژاو و پەشۆکاوە.

یەکەم: بەهۆکاری خودی ئەویش خۆی دەبینێتەوە لەوەدا کە فەلسەفە جەختدەکاتەوە لەسەر دژایەتیکردنی ئەو بارودۆخەی کە هەیە و بانگەشەکردن بە مافی ناکۆکبوون و بەرگریکردن لە ئازادیی و غیرەکردن لە سەربەخۆییە خودییەکەی، تەنانەت ئەگەر کارەکە ئەوەشی بوێت دژایەتی بەشداری سیاسی بکەیت لەشاردا.

دووەم: بەهۆکاری بابەتی، ئەویش بەدواداچوون و چەوساندنەوە و بەرتەسککردنەوەی ئازادی بیربۆچوون، کە فەلسەفە بەدەستیەوە دەناڵێنێ جا لەلایەن دەوڵەتەوە بێت یاخود لە لایەن ئایینەوە.[٤٦] لەپێناو چاککردنی ئەو باودۆخە شەرمهێنە و دابینکردنی دەسەبەرێتی پاککردنەوەی لە چەوساندنەوەی سیاسییەکان و چاودێری پیاوانی ئایین، پێویستە فەلسەفە گۆڕانێکی ناوخۆیی ریشەیی بکات بەمەبەستی ئەوەی فیکرەکانی ئاڕاستەی کارە سیاسییەکان بکات.[٤٧]

ئەم مەیلی گۆڕانە بەرەو لایەنی کرداری لە فەلسەفەی سیاسیدا بۆ یەکەمجار لە زەمەنی یۆنانیدا روویدا، شتراوس ناویدەنێت بە چەمانەوەی سوکراتی – ئەفلاتونی – ئەکزینۆڤی،[٤٨] کە پرسیاری فەلسەفی دەبەستەوە بە پرسیاری رەوشتی و چاکە و پرسیاری مەعریفییەوە و بە هۆشیاری خودی فەیلەسوفەوە، واتە لیکۆڵینەوەی فەلسەفی پەیوەستدەکرد بە ژیانی فەلسەفییەوە، بەڵام لادانی تەواو لە فەلسەفە بەرەو لایەنی سیاسی کرداری ئەوەبوو کە ماکیاڤیللی لە زەمەنە نوێیەکاندا ئەنجامیدا. توانی بەوەهەستێت کاتێك پاڵپشی لەوەکرد فەلسەفە زۆر بەقووڵی بەسیاسیبکرێت ئەویش بەگرێدانی رێککەوتن لەنێوان فەلسەفە و ئەمیردا لەپێناو بەتەواوی دەستبەسەراگرتنی سروشت و کۆمەڵگە پێکەوە و کارکردن لەپێناو سەرلەنوێ رێکخستنەوەی بەگوێرەی بنەماکانی عەقڵی کرداری سوودبەخش، ئەوکارەی کە سیاسەت ئازاددەکات، لەگەڵ ئەودا مرۆڤ تەماشای جیهان دەکات، لە ستەمی ئایینەوە و زیاتر عەقلانی و واقیعی دەبێت. بەچاکەی ئەم هاوپەیمانێتییە سیاسەت سەربەخۆیی بەدەستدەهێنێت و پلەوپایە و گرنگی بۆ دەگەڕێتەوە.[٤٩]

جگەلەوەی بەدەستهێنانی ئەم دەسەبەرییە بۆ بەفەلسەفەکردنێکی بێترس و دڵنیا مەترسی لەسەر ڕاستێتی فەلسەفە دروستدەکات، لەبەرئەوەی کاتێك بەرگریکردنلێی دەگۆڕێت بۆ ئامرازێك بۆ ملکەچکردن و بەکارهێنانی توانا و لێهاتوویيە تیۆری و وتارییەکانی لە خزمەتی سیستمی سیاسی یان بابەتی نیشتمانپەروەری یان ئامانجی ئایینی یان ئایدۆلۆجیایەکی دیاریکراو، دەبێت بە خزمەتکاری ئەویدی و دەکەوێتە بارودۆخێکەوە وەك بارودۆخی فەلسەفە لە سەدەکانی ناوەڕاست یان لە سیستمە تۆتالیتارییەکان تەنانەت لەهەندێ لە سیستمە لیبراڵییەکانیشدا کە ئاڕاستەیەکی کۆنسێرڤاتیان هەیە. ڕاستە، نابێت نکوڵی لەوەبکەین کە لەڕاستیدا فەلسەفە بەم لادانە سیاسییەی سەربەخۆیی خۆی بەدەستهێنا و پێگەی خۆی بەهێزکرد و تێڕوانین و شێوازی میتۆدۆلۆژی خۆی سەپاند بەسەر دامەزراوە فێرکارییەکاندا، ئەمەش وایلێکرد بەشێوەیەکی فرەلایەنە بەشداربێت لە پێکهێنانی سلوکێکی ئازادکەرانە بۆ خەڵکی و گەلاڵەکردن و خستنەڕووی دیدێکی زیندووگەرایانە بۆ جیهان، بەلاّم ئەم بارە ئاسوودەیە، فەلسەفە نەیتوانی بەدیبێنێت پاش تێکۆشانێکی دوورودرێژ نەبێت، ئەمەشی خستەڕوو بۆئەوەی ببێتە بابەتی بەکارهێنان لەلایەن هێزە نەیارەکانیەوە بۆ بەدیهێنانی ئامانجە کۆمەلاّیەتی و سیاسییەکان، ئەو کارەی کە هەڕەشەیە لە سەربەخۆییەکەی و سروشتە ئیشکالییە گوماناوییەکەی، لەبەرئەوە پرسیار و تێڕوانین و چەمکەکانی دەگۆڕێن بۆ شتێکی بەڵگەنەویست کە هەموو کۆمەڵگە پێیقایلدەبێت. لەپێناو وەلانانی ئەم کەوتنە تێکشکێنەرە، پێویستە لەسەر فەلسەفە وازبهێنێت لە ویستی خۆی بهێنێت لەوەی کە ببێتە هێزێکی گشتگیری کاریگەر بەشێوەیەکی بەردەوام بەسەر سیاسەت و ئەخلاق و ئایینەوە، لەبەرئەوەی ئەمە وایلێدەکات ببێت بە شوێنکەوتەی ئەوەی کە دەیەوێت شوێنکەوتەی بێت. واتای ئەوەی باسکرا ئەوەیە کە وازهێنان لە "مێژوویەتی" کارێکی پێویستە بۆ فەلسەفە بۆئەوەی رۆڵی راستەقینە و کاری بنەڕەتی خۆی لەخۆبگرێت کە بریتییەلە تێرکردنی لایەنە گۆڕاوە گشتگیرەکان لە مەرجەکانی ژیان لەکۆمەڵگەکانیدا.[٥٠]

بەلاّم وازهێنان لەو ئارەزوەی پێشوو کە باسکرا بەسنییە بۆ لادانی مەترسی کەوتنەناو بارودۆخی خزمەتکارییەوە بۆ ویستەکانیدیکە کە مەبەستی فەلسەفی نییە، بەڵکو پێویستە لەسەر فەلسەفە کە مومارەسەی رەخنە خودییەکانیی بکات.[٥١] ئەم رەخنەیە هیچ واتایەکی نییە ئەگەر بەنێو لادانە سیاسییەکەدا نەڕوات کە لەپشت مەترسی گۆڕانی فەلسەفەوەیە بۆ

هێزێکی گشتگیر یان بۆ ئایدۆلۆجیا.[٥٢] "فەلسەفەی سیاسی" لە تێڕوانینی لیو شتراوسەوە ئەو بەشەیە لە فەلسەفە کە ڕێگەدەدات بە فەلسەفە بۆ ئەوەی خۆی بخاتە شوێنی تاقیکردنەوە و پرسیارکردنەوە، بەمەش دەرفەت بۆ فەیلەسوف دەڕەخسێنێ بۆئەوەی بەردەوام بە بیرمەندێکی پێش سوکراتی بمێنێتەوە و بگەڕێتەوە بۆ خودی خۆی و شارەکەی، بەبێ ئەوەی گەڕانی بەدووی ڕاستی گشتگیردا لەبیربکات.[٥٣] بەمجۆرە ڕووندەبێتەوە کە سیاسەت پەیوەندی بە فەلسەفەوە نییە تەنها ئیشکالییەت نەبێت. بۆیە فەلسەفە و سیاسەت بەو ئەندازەیەی کە بەیەکدەگەن لە بابەت و ئامانجدا، جیاوازن لەڕێگەی گەیشتن پێیان و بەو ئەندازەیەی کە هەریەکەیان ئەویدیکەیان بونیاددەنێت، دەبێتە مەترسییەك لەسەر بوونی و پێناسی و سەربەخۆییەکەی. سیاسەت بەبێ فەلسەفە دەرەنجامەکەی بێجوولە و ناچالاك و ستەمکاری دەبێت، فەلسەفە بەبێ شوێنکەوتنی شار دەکەوێتە حاڵەتی سستی و چەقبەستوویی و لاساییکردنەوە کە جەماوەر وەریانگرتووە. لەپێناو ئەمەدا ناکۆکی و گرژی باشترین پەیوەندی گونجاوە لەنێوان فەلسەفە و سیاسەتدا، بۆئەوەی هەمیشە لە بەهێزی و دەسەڵاتی بەردەوامدا بمێننەوە. ئەگەر کارەکە بەمجۆرەبێت بەنیسبەت پەیوەندی سیاسەت بە فەلسەفەوە، ئایا پەیوەندی فەلسەفە بە ئایینەوە چۆن دەبێت؟

### سێیەم: سیاسەت و ئایین/ لە لاهووتی سیاسییەوە بۆ فەلسەفەی سیاسی:

تێبینی ئەوەمانکرد کە چۆن پەیوەندی نێوان سیاسەت و ئایین بە فەلسەفەدا تێپەڕدەبێت و چۆن پەیوەندی نێوان فەلسەفە و ئایین بە سیاسەتدا تێپەڕدەبێت، ئەمەش دەلالەتە لەوەی کە ناکرێت ئەم سێ ئاسۆیە لێکجیابکرێتەوە: سیاسەت و فەلسەفە و ئایین. پرسیارێکی غەریب وەك سروشێك دێت لە گفتوگۆی سیاسی ئەفلاتون بە ئاڕاستەی سوکراتدا، ئەویش: "ئایا سوفستائی و سیاسی و فەیلەسوف یەك کەسن، یان دوو، یاخود سێ کەسن؟"[٥٤] گوتم پرسیارێکی غەریب وەك سروش دێت، دەکرێت ئەم سێ جۆرە لە کاراکتەر لە مەیدانی گشتیدا تاڕادەیەك یەکبخرێن، بەڵام ئەوەی سەرنجی شتراوسی لەم پرسیارەدا ڕاکێشاوە بریتییەلە ئامادەنەبوونی یان باسنەکردنی یان سەرنجنەدانی پیاوی ئایینییە، سەرەڕای گرنگییە بنەڕەتییەکەی لە فەزای گشتیدا لای یۆنان و لای ئەفلاتون خۆشی. ئایا مانای ئەوکارە ئەوەیە کە ئەفلاتون سوود لەوەدا نابینێت کە دامەزراوەیەکی ئایینی بخزێنێتەناو کاروباری گشتییەوە، لە ترسی ئەو زیانانەی کە دەکرێت یەکێکیان بەویدیکەیانی بگەیەنێت لە ئەنجامی ئەوکارەوە؟

**١. دامەزراندنی لاهوتی سیاسی: فارابی، ئیبن مەیمون، ئیبن روشد**

پێشتر ئاماژەدرا بەوەی کە شتراوس ناکۆکی نێوان ئەسینا و قودس واتە لەنێوان فەلسەفە و ئایین دادەنا بەوەی مێژووی فیکری رۆژئاوا و نهێنی هەمیشە زیندووی شارستانییەتەکەیە. مانای ئەمەش ئەوەیە کە "پرسیاری لاهوتی" بەشێك لە مەسەلەی فەلسەفی پێکدەهێنێت، هەروەها بەشێك لە بابەتی دادپەروەری سیاسی پێکدەهێنێت، هەروەك چۆن "پرسیاری سیاسی"، بە رۆلی خۆی رەگەزێکی دونیایی پێکدەهێنێت لە مەسەلەی رزگاربوونی ئایینی، ئەمەش وایلێدەکات تەداخولێکی بەهێز لەنێوانیاندا دروستببێت.[٥٥] جگەلەوەی مۆدێرنە جەختدەکاتەوە لەسەرئەوەی سەرهەڵدان و پەیدابوونی رابگەیەنێت بە کودەتاکردن بەسەر ئەو پەیوەندییە دۆستانەی نێوان حیکمەت و شەریعەت، چوونەنێو رەوتی دژ بە لاهوت بەبێ هیچ میهرەبانییەك. ئەمەبوو هانی شتراوسی دا بۆئەوەی بگەڕێتەوە بەسەر مێژووی فەلسەفەی سیاسی کلاسیکی لە فۆرمەلە یۆنانی و ئیسلامی و یەهودی و مەسیحییەکەیدا، بۆئەوەی پێگەی سێنتڕالی ئایین لەدەوڵەتدا بگەڕێنێتەوە، بەیەکێك لە پاڵپشتییە سەرەکییەکانی دادەنێت.[٥٦]

گرنگی شەریعەت لەدەوڵەتدا بۆ هەندێك هۆکار دەگەڕێتەوە، لەنێویاندا ئەوەیە کە شەریعەت، هەروەك چۆن ئیبن مەیمون روونیکردووەتەوە بەدوای ئەوەشدا ئیبن روشد، توانای بەدیهێنانی کەماڵی دوولایەنەی هەیە بۆ مرۆڤ، کەماڵی جەستەیی بە شەریعە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان و کەماڵی نەفسی بە بنەما فەلسەفی و بەها ئەخلاقی و نموونە ئایینییەکان. ئەم هاوسەنگییە لەنێوان نەفس و جەستەدا هانی شتراوسی داوە بۆ ئەوەی پەیوەندی وەحی بە عەقڵی چارەسەری نموونەیی ببینێت بۆ ئەو ئەزمەیەی کە سیاسەتی مۆدێرنیتەی تێدانغرۆبووە. ئەمەش واتای ئەوەنییە کە شتراوس ئاگای لەوە نەبووە کە ئایین لەڕووی تیۆرییەوە دوژمنێکی هاوبەشی سیاسەت و فەلسەفەیە پێکەوە. لەبەرئەوەی ئەگەر ئامانجی سیاسەت بریتییبێتلە ریکخستنی ژیانی مەدەنی خەڵکی لەسەر بنەمای یاسا مرۆییەکان، ئەوە ئامانجی ئایین بەپێچەوانەی ئەوەوەیە کە بریتییەلەرێکخستنی ژیانی خەڵکی لەسەر بنەمای ملکەچکردن و گوێرایەڵی فەرمانەکان و حوکمە خوداییەکان و دانانی ژیانی مەدەنی بەوەی کە تەنها وێستگەیەکی پەڕینەوەیە لە چاوەڕوانی ژیانە راستەقینەکەیدیکە: هەروەك چۆن ئەوەی ئەگەر مەبەست لە فەلسەفە بریتیبێتلەوەی لەهەموو شتێك پرسیاربکرێت، لەنێویشیدا پرۆژەی خودی "لاهوتی سیاسی"،[٥٧] لەڕاستیدا ئایین وەستاوە لەسەر تەسلیمبوون بە وەحی لە چوارچێوەی

لێکدانەوە و شیکردنەوەی دانپێدانراودا وەك داواکارییەك بۆ باوەڕهێنانی عەقڵ و دڵنیابوونی نەفس.

زیاتر لەوەش، ئێمە ئەوە دەزانین کە فەلسەفە هەماهەنگبووە لەگەڵ ئاییندا لە سەدەکانی ناوەڕاستدا بۆ رووبەڕوبوونەوەی سیاسەت، ئەمەش بووە هۆی لەبیرکردن و لەناوچوونی فەلسەفە و فەسادبوونی سیاسەت پێکەوە. لەبەرامبەر ئەوەشدا و تێگەیشتنی بەم وانەیە، فەلسەفە لە سەردەمە نوێکاندا تێدەکۆشا بۆ گۆڕینی ستراتیژیەتی خۆی ئەمجارەیان لەگەڵ سیاسەتدا هەماهەنگبوو بۆ رووبەڕووبوونەوەی ئایین، لەبری هەماهەنگبوونی لەگەڵ ئایین بۆ رووبەڕووبوونەوەی سیاسەت. ئەم هاوپەیمانێتییە نوێیە بووەهۆی ئەوەی کە هەموو دەسەڵاتی سیاسی بخاتەدەستی فەرمانڕەوای مەدەنییەوە، لەبەرامبەردا فەلسەفە چەکی دڵنیایی لەچەوساندنەوەیدا لێوەرگرت، ئەویش بەدانان بە ئازادی رەهایدا لەبیرکردنەوەدا، بەڵام وادەردەکەوێت نرخی ئەم هاوپەیمانێتییە بەنیسبەتی فەلسەفەوە زۆر گەورە و سەختبێت، لەبەرئەوەی کاتێك سیاسەت بوونێکی دڵنیا و جێگیر بۆ فەلسەفە دەستەبەردەکات و مەرجە پێویستەکانی بۆ فەراهەمدەکات بۆ بڵاوکردنەوەی دەسەڵاتی خۆی بەشێوەیەکی فراوان و دوور لە رەخنەگرتن و مەترسی، ئەمەش دەبێتەهۆی فەسادکردنی سروشتەکەی و وازهێنان لە نهێنیبوونی کە وەستاوە لەسەر پرسیارکردن و گومان و دوودڵی و سەرەڕۆییکردن کە وایلێدەکات سەرلەنوێ رووبەڕووی مەترسی کەوتنەنێو "ئەشکەوتی دووەم" ی بکاتەوە کە لە ئەشکەوتی ئەفلاتونی قووڵترە، ئەویش ئەشکەوتی مێژوویەتییە. سەرەتای هەڵکەندنی ئەم ئەشکەوتە، بریتییەلە گۆڕینی پرسیاری فەلسەفی بۆ یەکێك لە بوونە سیاسییەکان، گونجاودەبێت لەگەڵ دانانان بەپێگەی سیاسەت و مەعریفییەت و ئایدیۆلۆجیەتی دیاری فەلسەفە لەنێو کۆمەڵگە و دەوڵەتدا.(٥٨)

ئەم گێژاوە وای لە شتراوس کردووە بۆئەوەی بگەڕێتەوە بۆ فارابی و ئیبن مەیمون، بەڵکو لای ئەوان بەڵگەیەك بدۆزێتەوە بۆ ئەوەی ئەوە بسەلمێنێت کە هاوپەیمانێتی نێوان فەلسەفە و سیاسەت دەکرێت شتێکی دیکەی لێبەرهەم بهێنرێت جگە لە دژایەتیکردنی ئایین، جگە لە لادان لە تایبەتمەندی هەموو بوارەکان بەبێ لێدان لە بەرژەوەندی هاوولاتیان. لەڕاستیدا ئەو دوو فەیلەسوفە فارابی و ئیبن مەیمون توانیان بوونی شەرعی وێنا بکەن لەنێو بوونی فەلسەفیدا هەتا ئەو رادەیەی کە هەردووکیان باسیان لە کۆمەڵێك مەسائیلی زۆر هەستیاری شەریعەتی خوایی کردووە، وەك پاراستن و چاودێر خوایی و موعجیزە و پێغەمبەرایەتی، بەو ئیعتبارەی کە بابەتی

فەلسەفین و دەچنە بواری فەلسەفەی سیاسیەوە، یانی بەو واتایەی ئەو بابەتانە لەکاری بەڕێوەبردنی "شاری یۆتۆپیا"ن. بەمجۆرە ئەو دوو فەیلەسوفە هەستاون بە دامەزراندنی فەلسەفی بۆ شەریعەت، ئەو دامەزراندنەش "ئەو شوێنە گونجاوەیە بۆ پێشکەشکردنی پرسیاری راست لە ژیانی فەلسەفیدا"[(٥٩)]، واتە پرسیاری "دامەزراندنی شەرعی بۆ فەلسەفە". ئەگەر فارابی و ئیبن مەیمون هەوڵیاندابێت دەسەبەری پاراستنی هەمیشەیی بۆ فەلسەفە بەدیبهێنن لەڕێگەی چەسپاندن و جێگیرکردنی شەریعە بەشێوەیەکی فەلسەفی و دامەزراندنی فەلسەفە بە شێوەیەکی شەرعیانە، واتە بە چاکەی سەلماندنی "پەیوەندی" نێوان حیکمەت و شەریعەت، و نێوان عەقڵأ و وەحی، لەڕاستیدا ماکیاڤیللی، دامەزرێنەری نوێگەری فەلسەفی، لەنێو پاراستنی هەمیشەیی فەلسەفەدا بەپێچەوانەی "بە جیاکردنەوەی" کەسی سیاسی لە لاهوتی، و پێکگەیاندنی "فەلسەفی بە سیاسی". بەمجۆرە لە تێڕوانینی شتراوسەوە ئەمە داوێکە و مۆدێرنەی سیاسی تێدەکەوێت.

### ٢. مارسیلیۆس: سەرەتای ساتی تێپەڕاندنی لاهوتی سیاسی بۆ - فەلسەفەی سیاسی نوێ

بۆئەوەی زیاتر نزیکبینەوە لە تێگەیشتن لە هەوڵی لیو شتراوس بۆدەرخستنی ئەو رۆڵەی کە لاهوتی سیاسی پێیهەستاوە بۆ نزیککردنەوەی عەقڵ و وەحی بەبێ ئەوەی رێگە بە کڵێسە بدات بۆئەوەی ببێتە دەوڵەتێك لەنێو دەوڵەتێکیتردا، باس لە شیکردنەوەکانی دەکەین بۆ هەڵوێستەکانی مارسیلیۆس دی بادوا (Marsilius of Padua ١٢٧٥ - ١٣٤٢)، یەکێك لەو قەشانەی کە شۆڕشیانکرد بەسەر کڵێسەدا لەنێوان سەدەکانی سیانزە و چواردەدا. ئەم قەشەیە ئەوەی هەڵبژارد کە لە روانگەی فیکری سیاسی ئەرستۆییەوە تەماشای سیاسەتی مەدەنی بکات، سەرەڕای ئەوەش ئەو لەوە دوورتریش رۆشتووە لە قەیرانە عەقلانی و مرۆیی و دیموکراتییەکەدا. خاڵی دەستپێکردنی وەك پیاوێکی ئایینی مەسیحی پێشەکییەکە دەڵێ وەحی عەقڵ ساغدەکاتەوە، بەبێ ئەوەی ببێت بەدژی. لەم پێشەکییە دوفاقییەوە، مارسیلیۆس ئەنجامێکی سیاسی سەرەتایی بۆ دەردەکەوێ کە خۆی دەبینێتەوە لە بەرتەسککردنەوەی ئامانجی دەوڵەت لە دەستەبەرکردنی مەرجە پێویستەکان بۆئەوەی مرۆڤ ئازادبێت: بەدوایدا دووەم ئەنجامی سیاسی دێت بەگرنگییەگی گەورەوە، ئەویش بریتییەلە دوورخستنەوەی پیاوانی ئایینی لە

مومارەسەکردنی سیاسی و قەزائی پێکەوە، بەبێ بچووککردنەوە و کەمکردنەوەی توانا و پێگەیان لە ناوخۆی دەوڵەتدا، ئەویش وەك ئەرستۆ پێیوایە کە پیاوانی ئایینی یەکێکن لە شەش بەشە گرنگ و پێویستەکەی دەوڵەت، بەڵکو تەنانەت بەشە شکۆدارەکەیشی.(٦٠) هەروەك چۆن ئەرستۆ تەماشای کاهینەکانی دەکرد وەك هاوڵاتیان نەك لەوان زیاتر وەك چۆن کەنیسە بانگەشەی بۆدەکرد، لەمیانی ئەمەشەوە داوالیێدەکردن ژیانی سۆفیگەری و دنیانەویستی هەڵبژێرن و گرنگی بە کاروباری قەیسەر نەدەن، لەمەشدا ئارەزوی ئەوەبووە کە جیاکارییەك لەنێوان ئەوان و سەرجەم هاوڵاتیاندا بکات. مارسیلیۆسیش وەك ئەرستۆ لەو بەڵایانە دەترسا کە تووشی دەوڵەت دەبن، لەبەرئەوە لە دژی کەنیسە وەستایەوە لە مافی رێکخستنی هاونیشتمانییەکانی دوور لە چاودێریکردنی دەوڵەت، لەبەرئەوەی ئەمە لە باریدا هەیە کە پاڵی پێوەبنێت بۆ گۆڕینی دەوڵەت لەنێو دەوڵەتدا. دۆخەکەش ئەوەیە کە دەبێت تەنها یەك دەوڵەت هەبێت و دەسەڵاتە بنەڕەتییەکانی لە دەست یاسادانەرێکدا بێت ئەویش یاسادانەری مرۆییە، واتە گەل کە کۆی هەموو هاوڵاتیانە. دەرەنجامێکی سیاسیدیکەی پێکهاتوو لەم بارودۆخە نوێیە بریتییەلە ملکەچپێکردنی پیاوانی ئاییتی مەسیحییەکان بۆ عەلمانییە مەسیحییەکان و ملکەچکردنی ئەرستۆکراتەکان بۆ هاوڵاتییان و گەلی مەسیحیی. بەپێدانی دەسەڵاتی یاسادانان بە هاوڵاتییان، بەمە مارسیلیۆس هەستاوە بەئەنجامدانی دوو شۆڕش بەسەر فیکری پێش خۆیدا، جا یۆنانی بێت یان ناوەند بێت، لەلایەکەوە وازیهێناوە لە فیکرەی سەرخستنی خەڵکی تایبەت (دەسەڵاتداران) بەسەر خەڵکی ئاسایی و گشتیدا، گشتی بەنیسبەت ئەوەوە "پێویستە رۆڵێکی گەورە بگێڕێت بۆ ئامانج"، ئەگەر یەکلاکەرەوە نەبێت لە کاروباری گشتیدا: لەلایەنێکیدیکەوە وازهێنان لە "جیاکاری کلاسیکی لەنێوان گەل و پیاوانی ئایینی بەشێوەیەکی ریشەیی لە بەرژەوەندی گەل"دا.(٦١)

بەمجۆرە مارسیلیۆس رێگەی خۆشکرد بۆ تێپەڕاندنی زەمەنی "لاهوتی سیاسی" کە لە زەمەنی هیللینیستییەوە درێژەیکێشا هەتا دەوروبەری سەدەی (١٧) حەڤدە، بۆئەوەی زەمەنی "فەلسەفەی سیاسی نوێ" جێگەی بگرێتەوە.(٦٢) کە سێ فەیلەسوف ململانێیاندەکرد لەسەر بنیاتنانی بەبێ ئەوەی کەسیان دانبنێت بەویدیکەیاندا ئەوانیش ماکیاڤیللی و هۆبز و سپینۆزایە. هۆبز (Tomas Hobbes ١٥٨٨ - ١٦٧٩) خۆی بە دامەزرێنەری راستەقینەی "فەلسەفەی سیاسی" لەقەڵەمدەدات، وادادەنێت فیکری سیاسی پێشوو زیاتر لە خەونەوە

نزیکبوو تا له زانستی سیاسییەوە، بەمەش نکولّی لەوەدەکات کە ماکیاڤیللی هیچ پێشینەیەکی لەو بوارەدا هەبێت،[٦٣] پاشان سپینۆزا دێت (Baruch Spinoza ١٦٣٢ - ١٦٧٧)و نکۆڵی له پێشینەیی هۆبز دەکات لە بنیاتنان و دامەزراندنی زانستی سیاسی، رەخنە لە سەرجەم فەیلەسوفە پێشووەکان دەگرێت کە تێڕوانینیان بۆ مرۆڤ هەڵەبووە لەبەرئەوەی وەستاوە لەسەر سەلماندنی "نەبوونی سروشتی مرۆیی.. لەبەرئەوە زانستە سیاسییەکەیان هیچ سوودێکی نییە"، جگەلەوەی ئەوەی وەرگرتووە کە "هێرشی ماکیاڤیللی زیاتر کپکردنی تێدایە لەسەر فەلسەفەی سیاسی کلاسیکی"،[٦٤] بەلاّم گرنگی و رۆڵی ماکیاڤیللی لە مێژووی گواستنەوە لە "لاهوتی سیاسییەوە" بۆ "فەلسەفەی سیاسی" دەگەڕێتەوە بۆئەوەی کە ماکیاڤیللی "لە حەقیقەتی کارەکەدا هیچ لاهوتێك نابینێت و نازانێت جگەلە (لاهوتی مەدەنی) نەبێت، مەبەستم ئەو لاهوتەیە کە خزمەتی دەوڵەت دەکات و دەوڵەت بەکاریدەهێنێت یاخود نا، بەگوێرەی ئەوەی بارودۆخەکە داوایدەکات. ئەو ئاماژە بۆئەوە دەکات کە دەتوانێ وازبهێنێت لەهەموو ئایینەکان ئەگەر هاتوو پاشایەکی بەتوانا و دەسەلآتدار بوونی هەبوو.[٦٥]

لەمەی پێشوو دەگەینە ئەو دەرەنجامی کە شتراوس لە راڤە و لێکدانەوەکانیدا، جا بۆ ئەفلاتون بێت یان ئەرستۆ یان ماکیاڤیللی یان لە راڤە و لێکدانەوەکانیدا بۆ فارابی و ئیبن مەیمون و ئیبن روشد و مارسیلیۆس دی بادوا و تۆما ئەکوینی (Thomas d'Aquin ١٢٢٥ - ١٢٧٤)، داندەنێت بەگرنگی سەرەکی و بنەڕەتی ئاییندا بەنیسبەت دەوڵەتەوە بە سیفەتێکی گشتی،[٦٦] بەلاّم ئەم دانپێدانانە رێگری لە شتراوس نەکردووە کە ئاگاداری ئەوەبێت ئایین و سیاسەت دوو دامەزراوەی جیاوازن، بەڵکو دەکرێت زۆرجار جیاوازی و ناکۆکی نێوان ئایین و سیاسەت بگاتە ئاستێك کە رێککەوتنیان پێکەوە سەختبێت. ئایین بە فیترەتی خۆی ئارەزووی لە تەقلید و پاراستنی کەلەپوورە، لەکاتێکدا سیاسەت بە سروشتی خۆی ئارەزوو لە گۆڕانی بەردەوام دەکات بۆئەو بارودۆخەی کە هەیە لە چوارچێوەی بەردەوامی دامەزراوەییدا، ئەگەرنا جڵەوی دەسەلآتەکەی لە دەستدەدات و وازیلێدێنێت بۆ ئەوانیدیکە. سیاسەت وەك سروشت وایە، ئەگەر جووڵەنەکات دەمرێت و بەهەموو ئاڕاستەکاندا دەبزوێت، بە ئاڕاستەی حەق و باتڵدا، راستگۆیی و درۆ، دادپەروەری و چەوساندنەوە و جیاکاری، رێککەوتن لەگەڵ ئاییندا و دژایەتیکردنی، بەلاّم لەبەرئەوەی سیاسەت لەکۆمەڵگەدا کاردەکات و کۆمەڵگەش بە بیروبۆچوون و باوەڕ و ئەفسانە دەژی و بەردەوامدەبێت، بۆیە پێویستە لەسەری ئەوەی لە دینەوە دەبەخشرێن

وەلاینەنێت و ڕەچاوبکات، بەتایبەتی لە دەیەی ئاخیردا بزوێنەرێکی بنەڕەتی و کاریگەری پێکهێنا لە بزوێنەرەکانی مێژوو.

پەیوەندی پێکەوەلکان و جیابوونەوە لەنێوان حیکمەت و شەریعەتدا پێچەوانەدەبێتەوە لەسەر پەیوەندی نێوان "فەلسەفەی سیاسی"و "لاهوتی سیاسی": لەلایەنی زاتییەوە ئەو لایەنەی کە لێوەیدەردەچێت جیاوازن، لەکاتێکدا "فەلسەفەی سیاسی" لەسەر دەسەڵاتی فەرمانڕەوا وەستاوە، بەڵام "لاهوتی سیاسی" پشتیبەستووە بە دەسەڵاتی خودا، بەڵام لەلایەکیدیکەوە، لەڕووی "بابەتەوە" یەکدەگرنەوە کە بریتییەلە بایەخدان و ئاگاداربوون لە مەسەلە سیاسی و مەدەنییەکان کە تایبەتە بە ژیانی سروشتی مرۆڤی ئاساییەوە، ئەگەرچی جیاوازیشبن لە وەسفێکی گونجاو بۆئەو ژیانە. "لاهوتی سایسی" وەسفێك پێشکەشدەکات کە بنیاتنراوە لەسەر ملکەچکردن و باوەڕهێنان بە وەحی بەو واتایەی کە تاکەگرەنتی و ڕەهاترینە بۆ حەقیقەت و رزگاربوون لە دنیا و دوارۆژ، لەکاتێکدا "فەلسەفەی سیاسی" وەسفیکی دژبە سەرکەوتن لە ژیانی وەستاو لەسەر حیکمەتی مرۆیی پێشکەشدەکات کە وەرگرتن و ڕەدکردنەوە و ڕاستی و هەڵە پەسەنددەکات، واتە ئەولەوییەت دەدات بە مەعریفە و ئازادی، نەك ئیمان و ملکەچبوون.(٦٧) لەلایەنی سێهەمەوە هەردوو سیاسەتی فەلسەفی و لاهوتی جیاوازن لەوەدا کە ئەوە مرۆڤە ڕێسا و یاسا و تەعالیمی فەلسەفەی سیاسی بە عەقڵ و هۆشی خۆی دەردەچوێنێ و بەڵگەدەهێنێتەوە بۆی بەو دەرەنجامە و تەجروبە مرۆییانەی کە پێیگەیشتوە، لەکاتێکدا تەعالیمی سیاسەتی لاهوتی لەڕێگەی وەحیەوە و لە خوداوە دادەبەزێت و ئاڕاستەی دڵی مرۆڤی باوەڕدار دەکرێت کە پێویستە لەسەری باوەڕی پێبهێنێت، بەڵگەکانیشی بۆ ئەمە موعجیزەکانە، نەك بەڵگەکان و سەلماندنەکات.(٦٨)

لیو شتراوس ڕەخنەی لە مۆدێرنەی سیاسی گرتووە نەك بەو واتایەی ئەو سەرکەوتووە بۆ گەڕانەوەی فەیلەسوفەکان یان پیاوە ئاینییەکان بۆ لەئەستۆگرتنی لێپرسراوێتی فەرمانڕەوای سیاسی، جا لەسەر ئاستی سیاسی بێت یان قەزائی، ئەوەی لە ئایینەوە دەبەخشرێت پێویستە ڕەچاوبکرێت و وەربگیرێت. بۆیە پیاوی ئایینی بۆ کۆمەڵگە پێویستە، لەبەرئەوەی ئاگادارە لە ڕەهەندی ڕۆحیی ناڕوون و ئاڵۆز، ئەو ڕەهەندەی کە لەپشت ئەو واتایەوەیە کە مرۆڤ کۆیکردووەتەوە، بەڵام بەبێ ئەوەی "پیاوی ئایینی" ببێت بە "کاراکتەری سیاسی" بەواتای پرۆفیشناڵی و ڕاستەوخۆی وشەکە. لەبەرئەوە بەڕێوەبردنی ڕاستەوخۆی کاروباری دەوڵەت

پێویسته بەبەردەوامی له تایبەتمەندی ئەو کەسانه بێت که خاوەنی شارەزایی پراکتیکی و کارامەییەکی سیاسین، ئەوانیش پیاوانی سیاسین، لەژێر چاودێرییەکی بەئاگایانه و بەردەوامی گەلدا. لەلایەکیدیکەوە، ئەگەر بابەتی ئایین خودا بێت، نەك ئیمان، بەڵکو هەروەها وەك شەریعەت، لەڕاستیدا سیاسەت لەو کاتەیا بەشێکی گرنگی ئایین پێکدەهێنێت، لەبەرئەوەی بایەخدان به چارەنوسی دوارۆژی مرۆڤ بەبایەخدان به چارەنوسی دونیایی دەستپێدەکات که پێویستی بەگرتنەبەری ڕێوشوێنی توندوتۆڵ هەیه که ماف و دادپەروەی و خۆشبەختی دەستەبەردەکات. جگەلەوەی مەترسییەکی گەورە خۆی مەڵاسداوە بۆ ئایین ئەگەر هەوڵبدات خۆی بخاتەنێو مەیدانی جەنگی سیاسییەوە، ئەویش بریتییەله گۆڕینی بابەتەکەی لەخوداوە (لاهوت) بۆ مرۆڤ (سیاسەت)، بنەماکانیشی دەگۆڕێت له ڕەهاوە بۆ نسبیەت که دەبێتەهۆی بانگەشەکردن بۆ کۆتایی ئایین و ناتوانێت ئەم ئیشکاله هەڵوەشێنێتەوە تەنها مەگەر گرنگیدانی ئایین به سیاسەت مۆرکێکی لاوەکی وەربگرێت، نەك گرنگیپێدانێکی سەرەکی و مەبەستدار.

بەئاگابوون له سیاسەت بەسەر فەلسەفەشدا دەگونجێت، ئەگەرچی سروشت و ئامانجی هەردووکیشیان (ئایین و فەلسەفە) جیاوازیشبن، لەبەرئەوە فەیلەسوف پێویسته بۆ کۆمەڵگەی سیاسی، چونکه هۆشیاری دەکاتەوە بۆ بەرهەمهێنانی ئەڵتارناتیڤە گونجاوەکان که پێشکەشیدەکات لەڕێگەی پرسیارە موحریج و بانگشەکانییەوە بۆ چاوخشاندنەوە بەپێکهێنەرە سەرەکی و بەهاکانی دەوڵەت و کۆمەڵگە. بەڵام فەیلەسوف لەبەرامبەردا شیاونییه بۆ فەرمانڕەوایی و گرتنەدەستی دەسەڵات به هۆکاری ناکۆکی نێوان سروشتی شارستانی و سروشتی فەلسەفی، بۆیه دەوڵەت به سروشتی خۆی داخراوە بەسەر هەڵبژاردنەکانی و بەهاکانیدا که بنەمای دەستپێوەگرتن و پەیوەستبوونی هاولاتیانه پێوەی، لەکاتێکدا فەلسەفه به سروشتی خۆی ئازاد و کراوە دەردەکەوێت بەڕووی داهاتوودا بەهەموو ئەلتەرناتیڤ و گریمانەکانییەوە.[٦٩]

سەرەڕای ئەوەی که سیاسەت به سروشتی خۆی مێژوویێتییه، و ناکرێت بابەتەکانی بگۆڕدرێت بۆ بنەمای جێگیر و نەگۆڕ، تەنها له تێفیکرینی فەیلەسوفاندا نەبێت. لەبەرئەوە فەیلەسوفەکان بۆ گرتنەدەستی دەسەڵات و فەرمانڕەوایی شیاونین، بەهۆی ئەو توانا لەڕابەدەرەی که هەیەتی لەسەر گۆڕینی هەموو جوولاوێکی هەستپێکراو بۆ شتێکی جێگیری لەسەروو بوون و زەمانەوە.

واتای ئەمە ئەوەنییە کە لەوێدا دوورخستنەوەیەکی ئاڵوگۆڕکراو و بنچینەیی هەیە لەنێوان مومارەسەکردنی سیاسەت و ئایین و فەلسەفەدا. مومارەسەی سیاسەت پێویستی بەوەنییە وازبهێنرێت لە مومارەسەی ئایینی بەهۆکاری ئەوەی داوایدەکات لە لەخواترسان و بەخشندەیی و وەلانانی دونیا، ئەمەش کۆمەڵەکارێکە دژ دەوەستێ و ناکۆکە لەگەڵ هەندێ فەلسەفەدا. مومارەسەرکردنی ڕێوڕەسمە ئایینییەکان مەرجی وازهێنانی لە سیاسەت نییە بەهۆکاری ئەو فێڵ و تەڵەکە و بەدی و پیسی و گرنگیدان بە کاروباری دونیا لەسەر حیسابی ژیانی دووەم کە لەخۆیگرتووە، لەبەرئەوە بۆ هەموو مومارەسەکردنێك کات و مەزاج و کەشوهەوا و بوار و شوێنی خۆی هەیە و ناکرێت تێکەڵیبکرێت لەنێوانیاندا. هەمانشتیش هەیە سەبارەت بە پەیوەندی فەلسەفە بە سیاسەتەوە، لەبەرئەوە لە پێویستییەکانی فەیلەسوفی زاتی ئەوەیە کە پابەندبێت بە شارەوە و هۆگریبێت، ئەگەرنا تێفیکرینەکانی هیچ واتایەکی نابێت و ئەڵتەرناتیڤە گریمانەییەکانیشی هیچ دەلالەتێك ناگەیەنێت، جگەلەوەی ئینتمای فەیلەسوف بۆ شار لەوڕووەوەی کە شارێکی داخراوە، یانی وابەستەیە بە فەلسەفەیەکی نیشتمانی دیاریکراوەوە، ناکرێت و نابێت لەسەر حیسابی ئاسۆکراوەکاندا بێت بۆ فەلسەفە. لەبەرئەوە فەیلەسوف بەجیدی هەوڵدەدات بۆ دەرچوون و رزگاربوون لەو ئەشکەوتە، واتە لە سیاسەت، لەبەرئەوەی رەدیدەکاتەوە کە بەردەوام ببەسترێتەوە بە بیروباوەڕی گشتی خەڵکییەوە، وەك هەوڵدانێك بۆ زاڵبوون بەسەریدا و گەڕان بەدوای بنەماکانیدا هەتا بتوانێت بیگۆڕێت بۆ مەعریفە، بەبێ ئەوەی ویستی ئەوەی هەبێت پێیبگات، لەبەرئەوەی ئەوە بەباشتر دەزانێت ئەو مرۆڤە وابمێنێتەوە کە ئەوە دەزانێت کە نازانێت. لەگەڵ ئەوەشدا فەیلەسوف مەیلی لەوەیە بگەڕێتەوە بۆئەو ئەشکەوتەی کۆچیلێکردووە بۆئەوەی هەستێت بەئەنجامدانی کاری رۆشنگەری، واتە ئەنجامدانی سیاسەت لەسەر بنەمای چاکە و مەعریفە و کرانەوە بەڕووی بیروبۆچوونەکاندا، هەتاکو فەلسەفەی مەدەنی بێت. لەبەرامبەر ئەوەشدا پێویستە بۆ سیاسی، ئەگەر بیەوێت بەڕاستی ببێت بە سیاسی، واتە خاوەن نەفەسێکی ئیستراتیجی بێت، لەکاتێکەوە بۆ کاتێکیدیکە لەبڵندیا بێت، لە دیدێکی گشتگرەوە بۆ ماوەیەکی درێژ سەرنجبدات، واتە دەبێت تێڕوانینێکی فەلسەفی هەبێت. جگەلەوەی کرانەوەی سیاسی بەڕووی فەلسەفەدا پێویستناکات بەمەبەستی گۆڕینی بێت بۆ هێزێکی فیکری کە توندبێت بە چاودێری هاوڵاتیان و لە ئازادی بیرکردنەوەیان و تێڕوانییان بۆ ئەلتەرناتیڤە گونجاو و ناگونجاوەکان دیاریدەکرێت.

ئامانجی پرۆژه سیاسییەکەی شتراوس بریتییەله گرێدانی سیاسەت به ئایینەوە، لەڕێگەی فەلسفەوە، یان وردتر بەهۆی مێژووی فەلسەفەوە یان بەوەی رابردوو هۆکارێکی چارەسەرە بۆ تێپەڕاندن و چارەسەرکردنی قەیرانی ئێستا. لەڕاستیدا بیرۆکەی پێکەوەگرێدانی ژیریی بە شەریعەتەوە و بیرۆکەی نووسینەوەی ستەملێکراو کە نادیاری و ناڕوونی مرۆڤ دەشارێتەوە، ئەو دوو بیرۆکەیەش شتراوس لەڕێگەی ئیبن مەیمونەوە لە فارابی و ئیبن روشدەوە وەریگرتوون وەك چارەسەرێك بۆ قەیرانی مۆدێرنەی سیاسی، ئەو دوو بیرۆکەیەش گرنگی گەڕانەوە بۆ مێژووی فەلسەفە دەردەخەن بۆ لێوەرگرتنی دەرچەیەك بۆ ئەو قەیرانانەی کە رووبەڕووی مرۆڤی ئەمڕۆژگارە دەبێتەوە. بەڵام ئایا هێشتا بەڕاستی رەوشت و سیاسەتی ئەفلاتون و ئەرستۆ و فارابی و ئیبن مەیمون و ئیبن روشد دەتوانن مرۆڤی ئەم سەردەمە رزگاربکەن لەبەردەم ئەم لێشاوی مەعریفی و زانیاری و عەمەلییە زۆرە و رۆژانەش بەردەوامە کە هەموو گریمانە و پێشبینی و بیروباوەڕەکانمانی ئاوەژووکردووەتەوە و لەبەردەم ئالۆزی و زۆری گرفتەکانی ئەم زەمەنەی ئێستادا کە زاڵبووە بەسەر هەموو تێگەیشتنوو دنیابینییەکانمانا، هەڕەشەدەکات لە بنەمای بوونی مرۆڤ لەسەر ئەم زەوییەدا کە لەهەر کاتێکدابێت لێیدەسەندرێت. ئەگەر ئاشتبوونەوە و رێککەوتن لەگەڵ رابردووی فەلسەفی و ئایینیدا پێویستبێت، بەهەر جۆرێکبێت نابێت ئێمە گومانبکەین لەو دەسکەوتانەی کە مرۆڤایەتی بەدەستیهێناوە لەسەر ئاستی دیموکراتی و مافی گەلان لەبڕیاردانی چارەنوسیاندا و گەڕانەوە بە چرکەژمێرەکانی زەمەندا بۆ چیرۆکی پێشنییەکان بۆ سەپاندنی چارەسەرە چەوسێنەرەکان و ناواقعییەکان بەسەر ئێستادا.

رەنگە لیو شتراوس خۆشی نەیویستبێت رەخنەکانی لە مۆدێرنە لە دەرخستنی لیبراڵییەت و مێژوویەتی و عەدەمییەتدا بگۆڕێت بۆ رەوتێکی پارێزکارانە. لەگەڵ ئەوەشدا رەخنە توندەکانی لە لیبراڵییەت و عەقڵانییەت و مۆدێرنە، سەرەڕای گرنگی و سەرنجڕاکێشی پاڵنەرەکانی، نابێتە شتێکیدیکە جگەلە هەڵوێستی پارێزکاری.

•••

محەمەد میسباحی
بەشی فەلسەفە، کۆلێجی ئاداب
ریبات/ مەغریب

## پەراوێز و سەرچاوەکان:

١. سەبارەت بە قەیرانی مۆدێرنیتە بگەڕێرەوە بۆ قەیرانی فەلسەفەی سیاسی نوێ، بڕوانە:
Leo Strauss, (Les Trois vagues de la modernite), trad. Par Yves Hersant, Cahiers philosophiques, n°٢٠, September ١٩٨٤, p. ١٠٥.

٢. Daniel Vidal, Leo Strauss. Une autre raison, (٢) d'autres Lumieres. Essai sur la crise de la rationalite contemporaine, Paris Vrin, ٢٠٠٥; in http:// assr. Revues.org/ document ٤٠ ١٨.html. Consulte le ١١ octobre ٢٠٠٨.

٣. Cf. Robert Locke, (Leo Strass, Conservative (٣) Mastermind) in http:// www.Frontpagemag.com/ Articles/Printable. Aspx? GUID = E١F٧٦٢٠E – B٨٣A – ٤S٠١ – ٨٦٩E – ١٥٣٩١DEE٢F٠٢.

٤. سەبارەت بە ناکۆکی نێوان قودس و ئەسینا بڕوانە:
Strauss, L., Etudes de philosophie politique platonicienne, tr. De I'anglais par O. Sesey, Paris, Belin, ١٩٩٢, p. ٢٠٩ – ٢٤٦.

٥. C.F Maurice – Ruben Hayoun, (Recension du Gerald Sfez, Leo Staruss, foi et raison), Paris, Beauchesne, ٢٠٠٧.

٦. Cf. Lampert, Laurence, Leo Strauss, and Nietzsche, University of Chicago Press, ١٩٩٦, P. ١٦٢ – ١٦٣.

٧. Cf. Meier, Heinrich. Carl Schmitt, Leo Strauss la notion de politiqque: un dialogue entre absents, Paris, Julliard, ١٩٩٠, note p. ١٠٦.

٨.. Lampert, L., op. cit. p. ١٦٣.

٩. بڕوانە مایر هەمان سەرچاوە. لاپەڕە ٩٨.

١٠. سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە١٠٠.

١١. سەبارەت بەلێکچوونی سیاسەت بەئەشکەوت لای ئەفلاتون، بڕوانە: کۆماری ئەفلاتون، وەرگێڕانی فوئاد زەکەریا، قاهیرە "الهيئە المصريە العامە للكتاب"، ١٩٨٥، لاپەڕە ٤١٨: و سەبارەت بەوەی کە خەڵکی ئاسایی لەئەشکەوتدا تێناگەن تەنها لەڕێگەی بیروڕاوە نەبێت تەماشای هەمان سەرچاوە بکە ٤٢١: وە سەبارەت بە بیروبۆچوون و پەیوەندیی بە مەعریفەوە، بڕوانە لیۆ. شتراوس (ئەفلاتون)، لیو، و کروبسی، جووزیف، مێژووی فەلسەفەی سیاسی، وەرگێڕانی مەحمود سەید،، پێداچوونەوەی ئیمام ع. ئیمام، بەرگی یەکەم، قاهیرە، المجلس الآعلى للثقافة، ٢٠٠٥، بەرگی یەکەم، لاپەڕە ٩٦: و شتراوس لەکتێبەکەیدا باس لە مافی سروشتی و مێژووی بەیەکگەیشتنی نێوان زانست و کۆمەڵگە دەکات و دەڵێت (لەڕاستیدا مەبەست لە زانست ئەوەیە کە هەیە، بەبێ سەرنجدان لە سوودەکەی، لەمیانی ئەوەشەوە دەکەوێتە مەترسییەوە بەهۆی ئەو ئامانجەیەوە، بەوەی کە کۆتاییدێت بە کۆمەڵێك راستی کە سوودی نییە، بەڵکو تەنانەت ئازاردەریشە، بەڵام کۆمەڵگە پەروەردەکردنی لە ئیمان و رەئیدا دەبینرێت. لێرەوە زانست، ئەو هەوڵەیە کە تێدەکۆشێ بۆئەوەی مەعریفە بخاتەبری رەئی، هەڕەشەیە بۆ کۆمەڵگە)، ل٢٦٧: سەبارەت بە هەڵوێستی جان جاك رۆسۆ لەسەر فەلسەفە و زانست بەوەی کە کۆتاییپێدێنێت و دەڵێت: (فەلسەفە یان زانست بەدژ دادەنێت لەگەڵ کۆمەڵگەیەکی ئازاد یان خاوێن)، هەمان سەرچاوە، ل٢٦٨: رۆسۆ بەو وتەیەی ئەوە دەردەخات کە زانست بۆ کۆمەڵێکی زۆر کەم لە خەڵکی زیرەك بەسوودە، بەڵام بە نیسبەت گەلەوە ئەوە زیانیانپێدەگەیەنێ، بەڵکو مەبەستی ئەوەیە بڵاوکردنەوە و ئاسانکردنی مەعریفەی عەمەلی وێرانکەردەبێت نەك تەنها بۆ کۆمەڵگە بەڵکو بۆ خودی زانست و فەلسەفەش:

بەگشتگیرییەکی ئاسانکارییانە، زانست دەکشێتەخوارەوە و دەگۆڕێت بۆ رەئی. زانست دەبێت تەنها لەلایەن ژمارەیەکی کەم لە خەڵکییەوە مۆنۆپۆڵبکرێت و دەبێت شاراوەبێت لە چاوی خەڵکی ئاسایی، هەمان سەرچاوە ٢٦٩: Strauss, Leo, Droit naturel et histoire, tr. De l'anglais par M. Nathan et E. de Dampierre, Paris, Plon, ١٩٥٤.

١٢. بڕوانە مایەر، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ١٤٠ - ١٤١.

١٣. شتراوس، (ئەفلاتون)، سەرچاوەی پێشوو، بەشی یەکەم، لاپەڕەی ٩٦: لەکۆماردا دەبینین ئەفلاتون لەبارەی شارەزایی و مەعریفەی سیاسییەوە دەدوێت کە پێکهاتووە لە (دوو بەشی دژ بەیەك)، لە مەعریفەی فەلسەفی داماڵراو لەو فیکرانەی کە گەیشتووە بە لوتکە لە دیدیگای نمونەی چاکە لەلایەکەوە و شارەزایی تەواو کە ناتوانێت بەهیچ جۆرێك مەعریفە دابڕێژێت، بەڵکو یارمەتی مرۆڤ دەدات بۆئەوەی لە ئەشکەوتەکەدا ڕێگەی خۆی بگرێت و لەلایەکیدیکەوە هەستێت بە جیاکردنەوەی ئەو سێبەرانەی کە لەسەر دیواری ئەشکەوتەکەن. هەمان سەرچاوە، بەرگی یەکەم، لا ١١١.

١٤. بڕوانە هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ١٢٢ - ١٢٣.

١٥. Remi Brague, (Leo Strauss et Maimonide), in Maimonides and Philosophy, Paris ١٩٨٦, لاپەڕەی ١٥٨.

١٦ سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٩٥.

١٧. سەبارەت بەتایبەتمەندییەکانی مرۆڤی دیموکراتی بڕوانە سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ١٠٣ - ١٠٥، سەبارەت بەوەی کە ئەفلاتون پەیپێبردووە بەوە کە کرۆکی مۆراڵی سیاسیی فۆرمەڵە بوو، بریتییەلەو کارەی کە وەستاوە لەبەردەم دژەکانیدا بۆ دیموکراتییەت کە گوێپێنادا بەهۆی دووری چاکە لە شێوازی فەرمانڕەواییەکەیدا، بڕوانە:

Drury, Shadia B., Leo Strauss and the American Right, New York, St. Martins press, ١٩٩٩, p.٧٨.

١٨. شتراوس، (مارسیلیوس ئوڤ بادوا)و کروسی، جوزیف، مێژووی فەلسەفەی سیاسی، هەمان سەرچاوە، بەرگی یەکەم، لاپەڕە ٤٠٤.

١٩. پێناسەی مۆدێرنە دەکات: (لە مۆدێرنەوە ئەو گۆڕانە ریشەییەی فەلسەفەی سیاسی پێش سەردەمی نوێ تێدەگەین - ئەو گۆڕانەیە کە پێش هەموو شتێك دەرکەوت وەك رەدکردنەوەیەك بۆ فەلسەفەی سیاسی پێش مۆدێرنە، سێ شەپۆلەکەی مۆدێرنە، لاپەڕە ١٠٥.

٢٠. بڕوانە سەرچاوەی پێشوو، بەشی دووەم، لاپەڕە ٦٤١: سەبارەت بە لێپرسراوێتی مێژوویی ئەم بیئومێدییە (ئاماژەیەك بۆ هەڵوێستی هایدگەر) بڕوانە:

Strauss L., Qu'est ce-que la philosophie? , tr. Par O. Sedeyn. Paris, PUF, ١٩٩٢, P. ٣٢.

لە گاڵتەجاری (مێژوو) ئەوەیە بڕوانێتە عەرەب و موسوڵمانەکان لەمڕۆدا بەهەمان ئاستی ئەو ئازارەوە کە دیموکراتی رۆژئاوا بەدەستیەوە دەناڵێنێ کە نەیتوانیوە رێ لە سەهیۆنییەکان بگرێت زەوی خەڵکانیدیکە (گەلی فەلەستینی و سوری) داگیرنەکات و کوشتارگە بەدوای کوشتارگەدا ئەنجامینەدات و رێگریانبکات لە مومارەسەی رەگەزپەرستی و پاکتاوی رەگەزی، زۆرجار بەناوی دیموکراتی و شارستانێتەوە و جارێکیتر لەژێر ناوی مافی ئینتیمابوون بۆ بیروباوەڕ لە ئەفسانە ئاینییەکاندا. ئێمە لێرەدا لەبەردەم قەیرانێکی راستەقینە و تاقیکردنەوەیەکی جیدی و بەهێزداین بۆ بەهاکانی دیموکراتی لیبراڵی، لەبەرئەوەی پێکهاتن و ئاشتبوونەوە لەنێوان ئیمان و مەعریفە و لەنێوان ئاین و نوێگەری لەباریدایە کە دەوڵەتان و گەلان و شارستانێتییەکان وێرانبکات و بیردۆزەکانی پێکدادانی شارستانێتییەکان شتێك نین جگەلە بەڵگەنامەی لێبوردن کە ئەمجارەیان لەپەیمانگاکانی لێکۆڵینەوەی زانستییەوە دەرچووە، نەك لەپەرستگای ئیمانی ئاینییەوە، بۆئەوانەی کە تاوان لە دژی رۆشنبیری و زەوی خەڵکانیدیکە

ئەنجامدەدەن.

٢١. بڕوانە: روبرت لۆك، سەرچاوەی پێشوو.

٢٢. بڕوانە: دانییل فیدال، سەرچاوەی پێشوو.

٢٣. سەبارەت بەتایبەتمەندییەکانی مێژوویەتی و بوونی بەگەورەترین دوژمنی فەلسەفەی سیاسی، بڕوانە:

Strauss, L., Qu'est – ce que la philosophie? Op. cit., ١٩٩٢, p. ٣١.

و سەبارەت بە وەسفەکەی بۆ مێژوویەتی هایدگەر بەوەی کە توندڕەوە، بڕوانە:

Strauss, Leo, on Tyranny, ed. By V. Gourevitch and M. Roth, New York, The Freee Press, ١٩٩١, p. ٢٥٠ – ٢٥١.

و بۆ فراوان بوون لە تێگەیشتنی شتراوس لە عەدەمییەت، بۆ نموونە بڕوانە کتێبەکەی:

Strauss, L., Nihilisme et politique, traduit de l’anglais par O. Sedeyn, Paris, Rivages, ٢٠٠١, p. ٣١ – ٧٣.

٢٤. سەبارەت بەتایبەتمەندییە تێکشکێنەرەکانی شەپۆلی سێیەمی مۆدێرنە بڕوانە:

Leo Strauss, (Les trios vagues de la modernite), trad. Par Yves Hersant, Cahiers philosophiques, n’٢٠, September ١٩٨٤, p.

٢٥. سەبارەت بە گۆڕینی رۆسۆ لەپێناسەی مرۆڤ بە عەقڵ، بۆ پێناسەی بە ئازادی، بڕوانە مافی سروشتی و مێژوو،لا ٢٧٤ - ٢٧٥ - ٢٧٩ - ٢٨٩: سەبارەت بەباشتر دانانی هەست و سۆز بەسەر عەقڵدا لە دیدگای مرۆڤەوە، بڕوانە سەرچاوەی پێشوو، لا٢٦٦: سەبارەت بەبەرامبەرکردنی لەنێوان دەربڕینی (مرۆڤ پێوانەی هەموو شتێکە)و دەربڕینی (مرۆڤ گەورەی هەموو شتێکە) بڕوانە:

Strauss, L., (Les trios vagues de la modernite), op. cit., p. ١٠٧.

٢٦. بڕوانە: رۆبرت لوك، سەرچاوەی پێشوو.

٢٧. مایر، سەرچاوەی پێشوو، لا ١٠١ - ١٠٣.

٢٨. تارکوف، س. و بانگل، توماس ل.، (لیو شتراوس و مێژووی فەلسەفەی سیاسی)، لەنێو مێژووی فەلسەفەی سیاسی، بەرگی دووەم، لا ٦٢٤ - ٦٢٥، هەروەها بڕوانە: Vidal, Daniel,

٢٩. ئاماژە بەوەدەکەین کە شتراوس هەستاوە بە هەوڵێکی پێچەوانە و دژی نوێگەرەکان، بۆ نموونە بۆ تێگەیشتنی وتەکانی و پڕکردنی کەلێنەکان لە فیکری ماکیاڤیللیدا پشتدەبەستێ بە روشدییەت، بڕوانە:

Strauss, Leo, Thoughts on Machiavelli, Seattle and London, University of Washington Press, ١٩٦٩, p.٢٠٣.

٣٠. شتراوس نکوڵی لە گرنگی ئەو رەخنەگرتنە ناکات کە ئاراستەی شەپۆلی سێیەمی مۆدێرنەی کردووە، بەڵکو بانگەشەی ئەوەدەکات کە رەچاوبکرێت و گرنگیپێبدرێت، لەگەڵ ئەوەش (واتە سەرەڕای ئەوەی فاشییەت لە دەرەنجامەکانی سیاسەتی شاراوەی شەپۆلی سێیەمی مۆدێرنەیە)، ئەم راستییە قابیلی تانەلێدان نییە رێمانپێنەدراوە بگەڕێینەوە بۆ وێناکانی پێش فیکری نوێ: رەخنەی نیتشەیی لە عەقڵانییەتی نوێ یان لە متمانەی نوێ لە عەقڵ ناکرێت دووربخرێتەوە و لەبیربکرێت، سێ شەپۆلەکەی نوێگەری، سەرچاوەی پێشوو، لا ١١٥.

٣١. مایر/ سەرچاوەی پێشوو، لا ١٥٢.

٣٢. زۆر جار شتراوس شەپۆلی سێیەمی نوێگەری پێناسەکردووە بە گۆڕان بۆ هۆشیاری سەبارەت بە مێژوو: (دەکرێت وەسفی شەپۆلی سێیەمی نوێگەری بکرێت بەو ئیعتبارەی وێنایەکی نوێیە بۆ هەستکردن بە بوون: ئەم هەستکردنە نوێیە بە بوون تەجروبەیەك نییە بۆ گونجان و ئاشتی هێندەی ئەوەی کە تەجروبەیەکە بۆ ترساندن و دڵەڕاوکێ: بەڕاستی هەستکردنە بە بوونی مێژووی بەو ئیعتبارەی بوونێکی تراژیدییە)، (سێ شەپۆلەکەی نوێگەری)،سەرچاوەی پێشوو، لا ١١٢.

٣٣. بڕوانە: Strauss, Leo, On Tyranny, op. cit., p. ٢١٢.

٣٤. بڕوانە: تارکوف، سەرچاوەی پێشوو، لا ٦١٥.

٣٥. تارکوف/ بانگل، (لیو شتراوس و مێژووی فەلسەفەی سیاسی) سەرچاوەی پێشوو، بەرگی دووەم، لا ٦٣٨ - ٦٣٩.

٣٦. سەبارەت بە گێڕانەوەی مانای بنچینەیی بۆ سروشت بەو واتایەی کە گشتێکی ناکۆکە، بڕوانە نایل رۆبرتسون، سەرچاوەی پێشوو.

٣٧. سەبارەت بە نیسبی و لەپێشینەیی مێژوو بەسەر سروشتدا لای نیچە، بڕوانە:

Strauss, Leo, The Rebirth of classical political rationalism, p, ٢٤.

٣٨.

Cf. Robertson, N., (Leo Strauss, Palatonism), op. cit.

٣٩. سەبارەت بە واتای بنەڕەتی فەلسەفە بەو واتایەی توێژینەوە و بەدواداچوونە سەبارەت بە بابەتەکان و بنەماکان و سیستمە زیندووەکان، بڕوانە:

Strauss, Leo, On Tyranny, op., p. ٢١٢.

٤٠. Ibid.

٤١. Vidal, op. cit.

٤٢. ناسان تارکوف و توماس ل. بانجل، "لیو شتراوس و مێژووی فەلسەفەی سیاسی"، سەرچاوەی پێشوو، بەرگی دووەم، لا ٦٤٩.

٤٣. Strauss Platonism, op. cit.

Robertson, N., (Leo Strauss Platonism), op. cit.

٤٤. Strauss, Leo, Persecution et I'art d'ecrire, traduit par O. Sedeyn, Agora, Presses – Pocket, Paris, ١٩٨٩ p. ٦٠.

٤٥. مایر، لا ١١١ - ١١٣.

٤٦. بڕوانە: مایر، سەرچاوەی پێشوو، لا ١٤٧ - ١٤٩.

٤٧. سەبارەت بە گۆڕانی بایەخپێدانی فەلسەفە لە تیۆرەوە بۆ پراکتیك لە جوانترین پارێزگارییەکانی ئازادییەکانییەتی لەبیرکردنەوەدا، بڕوانە هەمان سەرچاوە، لا ١٣١ - ١٣٢ - ١٤٠.

٤٨. کزینوفون (Xenophon) یەکێکە لە قوتابییەکانی سوکرات، و لە ژمارەیەك جەنگدا بەشداریکردووە وەك سەرکردە، لەنێوان ساڵانی ٤٣٠ - ٣٥٥ پ.زدا ژیاوە.

٤٩. بڕوانە: مایر، سەرچاوەی پێشوو، لا ١٥١ - ١٥٥.

٥٠. شتراوس دەڵێ: (کرۆکی ئەم قەیرانە، لە دیدی منەوە خۆی حەشاردەوە لە گۆڕینی ئەوەی لە بنەڕەتی فەلسەفەدا هەیە بۆ ئایدۆلۆجیا)، لا ٨٢، لە Strauss L.,Nihilisme et politique, op, cit بڕوانە مایر، سەرچاوەی پێشوو لا١٠٥.

٥١. بڕوانە مایر، سەرچاوەی پێشوو، لا١٤٦.

٥٢. هەمان سەرچاوە، لا ١٤٩ - ١٥٠.

٥٣. بڕوانە هەمان سەرچاوە، لا ١١١ - ١١٣، هەروەها لا ١٤٧، هەروەها بڕوانە تارکوف/ بانگل، سەرچاوەی پێشوو بەشی دووەم، لا ٦٣٧.

٥٤. شتراوس (ئەفلاتون)، هەمان سەرچاوە، بەشی یەکەم، لا ١١١.

٥٥. بڕوانە ناسان تارکوف و توماس ل. بانگل، (لیو شتراوس و مێژووی فەلسەفەی سیاسی)، سەرچاوەی پێشوو بەشی دووەم، لا ٦٣١.

٥٦. سەبارەت بەپێویستی گەڕانەوە بۆ فەلسەفەی سیاسی کلاسیکی بۆ چارەسەرکردنی قەیرانی رۆژئاوا، بڕوانە عەدەمییەت و سیاسەت، لا ١٠٨.

٥٧. بڕوانە: مایر، لا ١٤٥.

٥٨. بڕوانە، هەمان سەرچاوە، لا ١٠٧ - ١٠٩.

٥٩. هەمان سەرچاوە، لا ١٥٣.

٦٠. بڕوانە: شتراوس، (مارسیلوس ئوف بادو)، هەمان سەرچاوە، بەشی یەکەم، لا ٤٠٢ - ٤٠٤.

٦١. بڕوانە، هەمان سەرچاوە، بەشی یەکەم، لا ٤٠٥ - ٤٠٩.

٦٢. لەمبارەیەوە دەپرسین ئایا زەمانی (لاهوتی سیاسی) سەرلەنوێ نەگەڕاوەتەوە لە ماوەی نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەوە، کاتێك کە دەوڵەتی ئیسرائیل لەسەر بنەمای لاهوتی سیاسی دامەزرێنرا، ئەم (ڕووداوە لاهوتیە) کە زۆر بە باشی چەند شەپۆلێکی دیکەی لاهوتی سیاسی لە چەند ئاینێکی دیکەدا بوروژێنێت، و بەتایبەتی لە ئیسلامدا؟ ئایا ناکرێت وا دابنێین تیۆریەکەی لیو شتراوس بۆ خۆی لە جەوهەریدا دەدرێتە پاڵ جۆرێك لە لاهوتی سیاسی، بەوەش بووە پاساوێك بۆ مەشروعییەتی دروستکردنی دەوڵەتی جولەکە کە تێیدا نوێگەری لەگەڵ تەوراتدا ڕێکدەکەوێت؟ لەمبارەیەوە بڕوانە پێشەکی وانەکەی (فەلسەفەی سیاسی چییە؟) بڵاوکراوەتەوە لە:

Strauss, L., Qu'est – ee que la philosophie?, op. cit, p. ١٥.

٦٣. شتراوس: (نیقولا ماکیاڤیللی)، لەنێو مێژووی فەلسەفەی سیاسیدا، سەرچاوەی پێشوو، بەشی دووەم، لا ٤٣٠ - ٤٣١: سەبارەت بەدانپێدانەنانی هۆبز بەو شۆڕشەی کە ماکیاڤیللی بەرپایکرد بڕوانە هەمان سەرچاوە، لا ٤٣٢: سەبارەت بەدرکردنی ماکیاڤیللی بەداهێنانی زانستێکی نوێ. بڕوانە هەمان سەرچاوە، لا ٤٤٣.

٦٤. بڕوانە، هەمان سەرچاوە، لا ٤٣٢.

٦٥. شتراوس: (نیقولا ماکیاڤیللی)، لا٤٥٤: ئاماژە بەوەدەکات کە ماکیاڤیللی ئاگادارە بە دژیەکی تەورات لەگەڵ واقیع و تەورات خۆشیدا، بڕوانە: شتراوس چەند تێڕوانینێك سەبارەت بە ماکیاڤیللی، لا ٢٠٢.

٦٦. کاتێك سەبارەت بە لێکدانەوەکانی بۆ هەڵوێستی هیگڵی ناچارە دابنێت بەوەی کە مەسیحییەتی بەعەلمانیکراو بریتییەلە کرۆکی مۆدێرنە: (مەسیحییەت ئایینی راستی و حەقە (بەلای هیگلەوە) یان ئایینی رەهایە، بەڵام مەسیحییەت لەڕێککەوتنیدا لەگەڵ جیهاندا وەستاوە لەسەر عەلمانییە تەواوەکەیدا، ئەوەش ئەو بەرەوپێشچوونەیە کە چاکسازی پرۆتستانتی ئەنجامیداوە، پاشان رۆشنگەرەکان شوێنیکەوتن و کرداری بەرەوپێشچونەکەش کۆتاییهات لە دەوڵەتی پاش شۆڕشی فەرەنسیدا کە یەکەم دەوڵەتە بنیاتنرابێت لەسەر دانان بە مافی مرۆڤدا. ئێمە ناچارین سەبارەت بە هیگڵ بەوەی بڵێین کە ناوەڕۆکی مۆدێرنە بریتییەلە مەسیحییەت کە سیکولاریزی کردووەتە قوربانی، چونکە سیکولاریزم مەبەستی هیگڵییە کە بە هۆشیارانە و بەڕوونی دەریبڕیوە، سێ شەپۆلەکەی مۆدێرنە، لا ١١٣: بەڵام دەبینین دەڵێت: (مۆدێرنە بریتییەلە باوەڕێکی تەوراتی و بە عەلمانیکراوە، هەمان سەرچاوە لا١٠٥.

٦٧. بڕوانە مایر، لا ١٤٣ - ١٤٦.

٦٨. شتراوس، مارسیلو ئوف بادوا، بەشی یەکەم، لا ٤٠١.

٦٩. سەبارەت بەوەی پێویستە دەوڵەت داخراوبێت، بۆ نموونە بڕوانە: مافی سروشتی و مێژوو، لا٢٦٦.

سەرچاوە:

- گۆڤاری الفیکرالعربی المعاصر ژمارە ١٤٩-١٤٨ ٢٠٠٩

# پرۆژەی سیاسی پارتی داد و گەشەپێدان لە تورکیا

ن: د. سەعد عەبد ولعەزیز موسەلیت
و: بەرزانی مەلا تەها

**پوختەی کۆڵینەوە**

کۆڵینەوە لە بابەتی پرۆژەی سیاسیی پارتی داد و گەشەپێدان لە تورکیا بازنەیەکە لە بازنەکانی کۆڵینەوە لە واقیعی وەرچەرخانەکان کە سیاسەتی حیزبیی تورکیی بەخۆیەوە بینیویەتی و هەرچی وەرچەرخانە لە هێندێك ستراتیژ و روانگەی برێك لە تەوژمە سیاسییەکان لە تورکیا و لەنێویشیاندا ئەو هێزانەی کە نوێنەرایەتیی تەوژمی ئیسلامیی دەکەن، تایبەتتر ئەم کۆڵینەوەیە پارتی داد و گەشەپێدانی کردووەتە نموونە بە رێبەرایەتیی رەجەب تەیب ئەردۆگان، ئەم پارتە توانی لەهەلومەرجێکدا بێتەکایەوە کە قۆناغەکە پێویستیی بەجۆرە ئاراستەیە هەبوو لەتورکیادا، تاکو ببێتە پردی پەیوەندی و دروستکردنی هاوسەنگیی لەنێوان واقیعی تورکیای ئیسلامیی و رووخسارە سێکیۆلارەکەی، ئەمەش فرەئاشکرایە لەرێگەی تێڕوانینی کەسایەتییەکانی ئەم پارتە کە زۆر چین و توێژی سیاسەتی تورکیی لەخۆدەگرێت، بەئامانجی دارشتنەوەی پرۆژەیەکی سیاسیی کە لەبنەڕەتدا بەرنامەیەکی چاکسازییە پێشنیاریدەکات بۆ گۆڕەپانی سیاسیی تورکیی تاکو ببێتە خاڵی وەرچەرخان لە بواری کاری سیاسیی پراکتیکیی وەك پارتێکی فەرمانڕەوا لەدەسەلاتدا.. ئەم کۆڵینەوەیە پتر تیشکدەخاتە سەر پێنج لایەنی سەرەکیی تایبەت بەم بابەتە، لەپێش هەموویانەوە کۆڵینەوە لە هەلومەرجی گشتیی تورکیا لەپێش لەدایکبوونی ئەم پارتە و ئەو هەلومەرجانەی کە کاریگەریی و گۆڕانیان دروستکرد لە پشکووتنی ئەم پارتەدا، بەتایبەت کێشمەکێش و بگرەوبەردەی نێوان هێزە ئیسلامیی و سێکیۆلارەکان، ئەمەش وایکردووە پارتی داد و گەشەپێدان پتر تیشکبخاتەسەر بنەما و ئامانجی تایبەت لە پەیوەندیی ئەو بە ئیسلام و سێکیۆلاریزەبوونی دەوڵەت، بۆیەشە زەمینەی

خۆشکردووه لەبەردەم پرۆسەی گەیشتنی بەدەسەلاّت لەڕێگەی بردنەوەی لە هەڵبژاردنەکـانـدا و ڕەنگدانەوەکانی بەتایبەت لەسەر هێزە سێکیۆلاریزەکان لە تورکیا و ئەوانەی نـوێـنـەرایـەتـیـی دامەزراوەی سەربازیی دەکەن. پرۆژەی سیاسیی پارتی داد و گـەشـەپـێـدان گـەوهـەری ئـەم کۆڵینەوەیەیە کە وەك بەرنامەیەکی چاکسازیی ئەم پارتە گرتوویەبەر لەپـاش پـێـکـهـێـنـانـی حکومەت و هەرچی کاریگەرییە لەسەر واقیعی سیاسەتی پارتایەتیی لە تورکیا بەوپێیەی یەکەم پارتی ئیسلامییە لەتورکیادا کە تێڕوانینی وەهای لەخۆگرتبێت کـە پـردی پـەیـوەنـدیـی و هاوسەنگیی دروستکردووە لەگەڵ هێزە سێکیۆلارەکان لەتورکیادا.

**پێشەکیی**

قۆناغی دەسەلاّتی مستەفا کەمال ئەتاتورك و (١٩٢٣-١٩٣٨) جێگرەکەی عیسـمـەت ئینونو (١٩٣٨-١٩٥٠) بە پێکدادانی ڕاستینەی نێوان دین و دەوڵـەت تـایـبـەتمـەنـدبـووە، سیستەمی تاکحیزبیی (پارتی گەلی کۆماریی) لەو قۆناغەدا پایەداربوو، هەروەها قۆناغگەلێکی لە ستەمکاریی بەخۆوەبینی، هەروەها بەرتەسککردنەوەی جموجۆڵی تەوژمە ئیسـلامـیـیـەکـان. ئەمەش بووە هۆی دەرکەوتنی چەندین پارتی نوێ لەسەرێی هەمووشیانەوە پارتی دیموکراتیی کـە زۆر ئازایانە و لەخۆبردووانە بەرهەڵستیی نیشاندا دژبە کەمالیزم و سەرکەوتنی بەدەستهێنا لـە کەمەنکێشکردنی چەندین کەسایەتیی و شێخی ئاڕاستە دینییەکان.

لەم چوارچێوەیەدا قۆناغێکی نوێ لە ژیانی سیاسیی تورکیی دەبینرێت کە تایبەتمەندە بە فرەیی سیاسیی و سەرلەبەری چین و توێژ و ئاڕاستەکان بەتایبەت تەوژمی ئیسلامیی تاکو ئـەم تەوژمە بچێتەنێو ململانێی ژیانی سیاسیی و بەشداریی لەدەسەلاّتدا بەشێوەیەکی ڕاسـتـەوخـۆ یاخود ناڕاستەوخۆ لەڕێگەی چەندین قۆناغی جیاواز لە مێژووی تورکیای هاوچەرخ و هـەرچـی جموجۆڵەکانیەتی کە بەخۆوەبینیویەتی لەڕێگەی ئەزموونی بەشـداریـی سـیـاسـیـی ئـەو لـە گۆڕانکارییەکان تاکو ئەوەی دواجار دامەزراوەی سەربازیی دێتـە مـەیـدان و لـە دەسـەلاّت دووریدەخاتەوە، بەوپێیەی مەترسییبوو لە کەمالیزم و سێکیۆلاربوونی، ئەمەش لە ساڵی ١٩٩٧ وەختێك حیزبی ڕەفاه بە ڕێبەرایەتیی نەجمووددین ئەربەکان کە یەکـێـك بـوو لـە دیـارتـریـن جەمسەرەکانی تەوژمی ئیسلامیی لە تورکیا و هەرچی پێشێویی و بەربەست و قۆرتە لە کایـەی سیاسیی تورکیادا، هەروەها لە بوارەکانی سیاسیی و ئابووریی و کۆمەلاّیەتیشدا.

ئەم هەڵبژاردنەی ئێمە سەبارەت بە بابەتی پرۆژەی سیاسیی پارتی داد و گەشەپێدان هەڵوەستەکردنە لەسەر دیارترین ئەو وەرچەرخانانەی کە بازنەی سیاسەتی پارتایەتیی تورکیی بەخۆوەیبینیوە لە گۆڕانی تێڕوانین و لەسەر تەوژمی ئیسلامیی بەوپێیەی پارتی داد و گەشەپێدان ئەزموونێکی نوێیە لەسەر ئاستی پارتە ئیسلامییەکان کە توانیویەتی هاوسەنگیی رابگرێت لەنێوان ئاڕاستەکانی کۆمەڵگەی تورکیی بە جیاوازییەکانەوە و کەمەنکێشکردنیان لەڕێگەی پرۆژەی سیاسیی و ئابووریی و کۆمەلآیەتییەوە.

کۆڵینەوەکەمان پێنج تەوەر لەخۆدەگرێت،

یەکەمیان باس لەو دۆخ و هەلومەرجە پێشوەختانە دەکات کە بوونەتە مایەی پشکوتنی پارتی داد و گەشەپێدان. لەڕێگەی وەستان لەبەردەم دیارترین ئاوێتەبوونەکان لەنێو شەقامی تورکیدا لە ململانێی بەردەوامی نێوان هێزە سێکیۆلار و هێزە ئیسلامییەکان و هەرچی دژواریی ئابووریی و کۆمەلآیەتییە لەو ولآتەدا.

تەوەری دووەم باس لەو ئامانج و بنەمایانە دەکات کە دامەزراندنی پارتی داد و گەشەپێدانی لەسەر بنیاتنراوە، بەتایبەت پەیوەندیی ئەم پارتە بە ئیسلام و ئیسلامییەکان و هەڵوێستی بەرامبەر بە سێکیۆلاریزەبوونی دەوڵەت و فەلسەفەی ئەتاتورك.

تەوەری سێیەم باس لە گەیشتنی پارتی داد وگەشەپێدان دەکات بە دەسەلآت و بردنەوەی هەڵبژاردنەکان و ئەو ئەنجامانەی بەدەستیهێنا و فاکتەرەکانی سەرکەوتنی.

تەوەری چوارەم باس لە هەڵوێستی هێزە سێکیۆلارەکان دەکات بەتایبەت دامەزراوەی سەربازیی کە رەگەزی هاوسەنگیی سیاسییە لە تورکیا بەرامبەر بە سیاسەتی پارتی داد و گەشەپێدان و پەرچەکردارەکانی هێندێك لە سەرکردەکانی سەبارەت بە تێڕوانینەکانی حیزب و ئامانجەکانی بەتایبەت باگڕاوندی ئیسلامیی رێبەرانی ئەم پارتە.

تەوەری پێنجەم تیشکدەخاتەسەر پرۆژەی سیاسیی پارتی داد و گەشەپێدان کە لەبنەڕەتدا بەرنامەیەکی چاکسازییە ئەم پارتە گرتوویەبەر لەپاش پێکهێنانی حکومەت بە ئامانجی بەدیهێنانی سیاسەتێکی نوێ لەتورکیادا لەپێناو دروستکردنی هاوسەنگیی لەنێوان هێزە جیاوازەکاندا لەنێو چوارچێوەی سیاسیی تورکیدا.

ئەم کۆڵینەوەیە پشتدەبەستێت بە چەندین سەرچاوەی جیاواز بەتایبەت ئەو باس و کۆڵینەوانەی کە گرنگییدەدەن بە بارودۆخی سیاسیی تورکیا و زۆربەشیان لەنێو تۆڕەکانی

ئەنتەرنێتدا لەبەردەستدان، وێڕای کەمیی ئەو سەرچاوانەی کە ئەو قۆناغە لەخۆدەگرن بەتایبەت ئەو کتێبانەی کە لەکتێبخانەکاندا دەستدەکەون، بەمشێوەیە ئەم کۆڵینەوەیە خراوەتەبەردەست، خوا پشتوپەنایە.

### یەکەم: هەلومەرجی دامەزراندنی پارتی داد و گەشەپێدان لە تورکیا:

ئیسلام و ئیسلامییەکان چەکی بەهێزی دەستی مستەفا کەمال ئەتاتورك بوون لەجەنگەکەیدا دژبە هێزە ئیمپریالیستەکان کە ئەنادۆڵیان داگیرکردبوو لەپاش جەنگی جیهانی یەکەم لە سەروبەندی شکستی دەوڵەتی عوسمانیدا، بەلآم زۆرینەبرد ئەم ستراتیژە پێچەوانە بووەوە و ئیسلامییەکان بوون بە ئامانجی یەکەمی جەنگەکەی ئەتاتورك دژ بە بەرهەڵستکار و نەیارەکانی لەنێوخۆدا لەپاش راگەیاندنی کۆماری تورکیا لە ساڵی ١٩٢٣ بە تۆمەتی یاخیبوون لە سیستەمی کۆماریی سێکیۆلاری نوێ، ئیدی کایەی سیاسیی تورکیی زنجیرەیەك پشێوییی و ناهێوریی بەخۆوەبینی لەنێوان ئیسلامییەکان و سیستەمە سێکیۆلارەکە کە دامەزراوەی سەربازیی پاڵپشتیدەکرد.

لە ئاکامی ئەم کێشمەکێشەدا دیاردەی ئیسلامی سیاسیی لە ژیانی سیاسیی تورکیدا هاتەئاراوە لەڕێگەی چەند قۆناغێکەوە، ماوەی نێوان سالآنی ١٩٥٠ بۆ ١٩٦٠ تەوژمی ئیسلامیی رابوونێکی نوێی بەخۆوەبینی وەختێك ئەنکەرە لەحاڵی هاوپەیمانیدا بوو لەگەڵ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا کە هیچ خێرێکی نەدیبوو لە ئیسلام لە بەرەنگاربوونەوەی مەترسیی شیوعیی کە خۆی لە یەکێتی شورەویی و هاوپەیمانە رۆژهەلآتییەکانیدا دەبینییەوە، ئەم ئاسانکارییە لەگەڵ ئیسلامییەکاندا بووە مایەی زۆربوونی رێکخراو و گرووپە ئیسلامییەکان، ئەمەش دامەزراوەی سەربازیی بێزارکرد و لە ئایاری ١٩٦٠ بەری لەم تەوژمە گرت کە خەتەرناکیی لەسەر سیستەمە سێکیۆلارەکە دروستکردبوو.

پاشتر لە هەشتاکانی سەدەی پێشوودا جوولآنەوەی ئیسلامیی سەرلەنوێ سەریهەڵدایەوە لە دەرەنجامی گۆڕانکارییە نێودەوڵەتییەکان کە خۆی لە هەلآیسانی شۆڕشی ئیسلامیی لە ئێران و چوونی هێزەکانی سۆڤیەت بۆ ئەفغانستان دا دەبینییەوە، ئەمەش سەرلەنوێ واشینتۆنی هەڵپێچا و داوای لە ئەنکەرە کرد ئیسلام وەك چەکێك بەکاربهێنێت لەپێناو بەرەنگاربوونەوەی ئەو گۆڕانکارییانە بەتایبەت لەپاش گەیشتنی تورکوت ئۆزال بە دەسەلآت کە مەیلی ئیسلامیی

هەبوو لە ساڵی ١٩٨٣، ئەم هەلومەرجانە زەمینەی خۆشکرد لەبەردەم ڕێبەری ئیسلامیی نەجموددین ئەربەکان و لە هەڵبژاردنەکانی کانونی یەکەمی ١٩٩٥ سەرکەوتنی بەدەستهێنا و بوو بە یەکەم سەرۆك وەزیرانی ئیسلامیی کە جڵەوی دەسەڵات بگرێتەدەست بەشێوەیەکی دیموکراتیی لە وڵاتێکی وەك تورکیادا.

ئەمەش بۆ جاری سێیەم کۆدەتای بەسەردا کرا لەلایەن دەمەزراوەی سەربازییەوە، بەڵام ئەمجارە ئیسلامییەکان و نشوستیهێنان لەپشتیپەردەوە بە ئەربەکان لە ساڵی ١٩٩٧و پارتی رەفاه لە ساڵی ١٩٩٨، بەدەستپێشخەریی توسیاد Tusiad دامەزراوەی ئابووریی و سەربازیی کە نێوەندەکانی هێزی سەربازیی و ئابووریی و میدیایی لەخۆی گردکردبووەوە، راپۆرتێکی بلاوکردەوە و تێیدادامەزراوە سێکیۆلارەکانی بەتوندیی بەئاگاهێنایەوە لەوڵاتدا، تێیداهاتبوو: "پارتی رەفاه لە هەڵبژاردنەکانی کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٩٥ ڕێژەی ٣و٢١٪ بەدەستهێناوە و لە هەڵبژاردنی شارەوانییە فەرعییەکانیشدا ڕێژەیەکی بەرزتری بەدەستهێناوە، ئەمەش زەمینەی بۆ خۆشدەکات دەستکاری دەستوور بکات و کۆتاییبهێنێت بە سیستەمە سێکیۆلارەکە.. ئیدی واپێویستدەکات ڕێوشوێنێکی وەها بگیرێتەبەر کە هەرئەمرۆ سەرچاوەکانی وشکبکرێت نەك سبەی..". هەمدیسان لەڕاپۆرتەکەدا (١٨ ماددە) هاتبوو دەبێت هەموو ئەو سەرچاوانەی کە دەگونجێت، لەبندا وشکبکرێن، ئەمەش هەمان ئەو خالانە بوو کە دامەزاروەی سەربازیی لە چاوپێکەوتنی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەییدا هەڵیانگرتبوو لە ٢٨ی شوباتی ١٩٩٧. ئەمەش لە زنجیرە ڕووداوەکانی پاش کۆدەتادا لە دادگاییە سەرپێیی و ڕووخاندنی حکومەت و هەڵوەشاندنەوەی پارتەکە و داخستنی دامەزراوە و قوتابخانە ئیسلامییەکاندا بەدیارکەوت.

لەژێر سایەی ئەو گۆڕانکارییانەدا کە توندییەکی بەرچاوی بەخۆوەبینی لەنێوان ئیسلامییەکان و سیستەمە سێکیۆلارەکەدا بە سەرۆکایەتیی دامەزراوەی سەربازیی، ئیسلامییەکان تۆمەتبارکران بە هەوڵدان بۆ گۆڕینی سروشتی سیستەمەکە و بە ئیسلامییکردنی دامەزراوەکانی و کۆدەتا بەسەر فەلسەفەی کەمالیزمدا، بەمشێوەیە پارتی داد و گەشەپێدان دامەزرا و هەمان ئەو گومانانەی کە لە تەوژمی ئیسلامیی ئەربەکانی دەکرا لەمیشکرا، بۆیەشە ڕێبەرانی ئەم پارتە میکانیزمی نوێیانگرتەبەر لە کاری سیاسیدا بەبێ بەرەنگاربوونەوەی سیستەم و سروشتە بنجداکوتاوەکەی و بیانوونەهێنانەوە بۆ دووبارەبوونەوەی ڕووداوەکانی شوباتی ١٩٩٧.

له ئابی ساڵی ٢٠٠١ ڕەجەب تەیب ئەردۆگان سەرۆکی پێشووی شارەوانیی ئەستانبوڵ داوای مۆڵەتی بۆ پارتەکەی کرد بەنێوی پارتی داد و گەشەپێدان. دەستەی دامەزرێنەرانی سیازدە ژنی لەخۆدەگرت کە چواریان بالاپۆش بوون، لەنێویشیاندا گۆرانبێژ و ئەکتەر و دکتۆر و مامۆستا هەبوون، سەرباری چەندین کەسایەتی پارتی فەزیلەت کە پێشتر کاری سیاسییان لێقەدەغەکرابوو، لەگەڵ برێکیتر لە پارتە ناسیۆنالیست و سێکیۆلارەکان.

**دووەم: ئامانجەکانی پارتی داد و گەشەپێدان و پەیوەندیی بە ئیسلامەوە:**

دروشمی کۆنگرەی دامەزراندنی پارتی داد و گەشەپێدان لە ١٤ی ئابی ٢٠٠١ لەژێر ئەم نێونیشانەدا بوو (کارکردن لەپێناو تورکیا و کەمەنکێشکردنی چین و توێژەکانی تورکیا)، دەسپێکی جموجۆڵی ئەم پارتە لەسەر مەزاری ئەتاتورکەوە دەستپێکرد وەك ئاماژەیەك بە قبوڵکردنی سێکیۆلاریزم وەك بنەمای سیستەمی فەرمانڕەوایەتیی، یەکێك لە دەستەی دامەزرێنەرانی پارتەکە لە کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەوانیدا گوتوویە پارتی داد و گەشەپێدان بۆیە دامەزراوە تاکو ئەو بۆشاییە سیاسیی پڕبکاتەوە کە لە ژیانی سیاسیی تورکیادا هەیە لەپاش ئەوەی گەل متمانەی بەو پارتانە نەماوە کە لەپارلەماندان، بۆیە پارتی داد و گەشەپێدان نوێنەری سەرلەبەری تەوژمە لیبراڵەکانە و هەموو چین و توێژەکانی گەل لەخۆدەگرێت، ئەردۆگان بەخۆی وەختێك بەکۆیدەنگ وەك سەرۆکی پارت هەڵبژێردرا ئەو بنەمایانەی ئەژمارکرد کە پارتی داد و گەشەپێدان بەرگرییلێدەکرد:

- بنەمای کۆماریی نێوەندیی یەکگرتوو پشتبەستوو بە پرەنسیپەکانی دیموکراسییەتی سێکیۆلار و دەوڵەتی مافە کۆمەلایەتییەکان.
- بنەمای بەدیهێنانی یەکسانیی هەل بۆ هەمووان و دروستکردنی پەیوەندیی باش لەگەڵ سەرجەم دەوڵەتانی جیهان و هەستان بە گواستنەوەی موڵکداریی لە کەرتی گشتییەوە بۆ کەرتی تایبەت لەپێناو بەرژەوەندیی وڵاتدا.
- بنەمای زامنکردنی باج و کەمکردنەوەی و دابەشکردنی بەشێوەیەك بگونجێت لەگەڵ بونیاتی کۆمەلایەتیی وڵاتدا.
- بنەمای جەختکردنەوە لەسەر ڕەتکردنەوەی هەموو جۆرەکانی توندوتیژیی و تیرۆر و ملکەچکردن لەلایەن پارتی داد و گەشەپێدانەوە.

سەبارەت بە سێکیۆلاریزم سەرۆکی پارتەکە بەشێوەیەك راڤەی کردووە کە خۆی دەبینێتەوە لەوەی دەوڵەت بێلایەن بێت بەرامبەر بە بیروباوەڕەکان و بەمشێوەیەش زامنی دیموکراسییەت دەکات.

ئەردۆگان جەختیکردەوە لەسەر پێویستیی ئامادەکردنی دەستورێکی هاوچەرخ و گۆڕینی هەردوو یاسای پارتە سیاسییەکان و هەڵبژاردنەکان بەشێوەیەك بگونجێت لەگەڵ خواستەکانی سەردەم، لە چوارچێوەی هەڵوێستی پارتی داد و گەشەپێدان بەرامبەر بە سێکیۆلاریزم و ئیسلام سەرۆکی پارتەکە سێکیۆلاریزمی بە بنەمایەکی سەرەکیی نێوزەدکرد بۆ ئازادیی و ئاشتیی کۆمەلایەتیی، هەمدیسان جەختیکردەوە لەسەر مەرجەعییەتی (راگەیاندنی جیهانیی بۆ مافەکانی مرۆڤ)و (رێکەوتننامەی ئەوروپیی بۆ پاراستنی مافەکانی مرۆڤ و ئازادییە بنەڕەتییەکان)، لەپاڵ ئەمەشدا عەبدوڵلا گویل کەسی دووەمی پارتەکە لە چاوپێکەوتنێکیدا لەگەڵ رۆژنامەی (ستار) لە ٢٠٠١/٧/١٤ گوتوویە: "سەرلەبەری پارتە سیاسییەکان لە تورکیا.. پارتی سەرۆکن، گوتەی ئەوانە لەهەموو پرسەکاندا گوتەی کۆتاییە.. ئەم پارتانە هیچ شوێنێکیان لەنێو دیموکراسییەتدا نەگرتووە، بەلاَم پارتەکەی ئێمە جیاوازە و بە هەمووان بڕیاردەدەن..".

هەرچی تایبەت بە ئیسلامیەتی پارتی داد و گەشەپێدان، رێبەرانی پارتەکە خۆیان وادەردەخەن کە پارتێکی کۆنسێرڤەتیڤی دیموکراتخوازە یاخود کۆنسێرڤەتیستە دیموکراتخوازەکان، پارتەکە لە سێ تەوژمی سەرەکیی پێکهاتووە، تەوژمە بەهێزەکەیان و خاوەن دەسپێشخەرییەکە تەوژمی ئیسلامیی جیابۆوەیە لە جوولانەوەکەی ئەربەکان، تەوژمی د ووەم بریتییەلە تەوژمی ناسیۆنالیستی جیابووەوە لە پارتی جوولانەوەی ناسیۆنالیست، هەرچی تەوژمی سێیەمە بریتییەلە تەوژمی سێکیۆلاریستی لیبراڵیی جیابووەوە لە پارتە سێکیۆلارەکانیتر، ئەوەی ئەم سێ تەوژمە کۆدەکاتەوە رەتکردنەوەی رانەگەیاندراوی پیرۆزیی ئایدۆلۆجیای کەمالیزم و هەژموونی دامەزراوەی سەربازییە بەسەر بڕیاری سیاسیدا، ئەمەش لەسەروەختێکدا روونەبێتەوە کە پارتەکە پتر تیشکدەخاتەسەر پرۆسەی ریفۆرمی سیاسیی و هەولدان بۆ بنچداکوتینی دیموکراسییەت و گۆڕینی بۆ رۆشنبیرییەکی جەماوەریی و کاراکردنی چەمکی دەوڵەتی دامەزراوە سەربازییەکان بەسەر بڕیاری سیاسیدا.

لەبەر رۆشنایی ئەمە و فرەیی تەوژمەکانی نێو ئەم پارتە ناتوانین پارتی داد و گەشەپێدان بخەینە خانەی تەوژمی ئیسلامییەوە، بەلاَم سەددەرسەد قوتابخانەیەکی نوێیە لە بیرکردنەوە و

پڕاکتیتك لەکن هێندێك لە ئیسلامیستە تورکەکان. بۆ پاڵپشتیکردنی ئەمەش لەپاش یەك رۆژ لە دامەزراندنی پارتەکە عەبدوڵلا گویل گوتوویە: "پارتەکەمان پارتێکی دینیی نییە و کاردەکەین لەسەر دەستەبەرکردنی نوێنەرایەتیی گشت و لە ریزی دامەزرێنەرانی پارتەکەماندا بالاپۆش و سافیرە و ریشدار و بێڕیش هەیە، پارتی سیاسیی میکانیزمێك نییە بۆ بانگەشەکردن بەڵکو بۆ خزمەتە، ئامانجمان جێبەجێکردن و کارکردنە لەسەر گشتاندنی تێگەیشتنێکی نوێ بۆ سیاسەت..".

لەچاوپێکەوتنێکیدا لەگەڵ رۆژنامەی حەیاتی لەندەنیی ئەردۆگان جەختی لەوەکردووەتەوە کە جیاوازییان هەیە لەپرەنسیپەکاندا لەگەڵ نەجموددین ئەربەکاندا، ئەمەش هەڵیپێچاوە کاربکات بۆ دامەزراندنی پارتێکی نوێ و جیابوونەوە لەو هێڵە، ئەردۆگان داتەپینی قەبارەی تەوژمی ئیسلامی سیاسیی لە تورکیای گەڕاندووەتەوە بۆ دۆگمابوونی فیکریی کە دووچاری جوولانەوەکە بووەتەوە و دەستەوسانیی لە خۆگونجاندن لەگەڵ هەلومەرجی سیاسیی نوێی پاش کۆدەتاکەی شوباتی ١٩٩٧. هەروەها گوتوویە: "خۆی بەدووردەگرێت لە بەکارهێنانی چەمکی ئیسلامیی و پارتەکەی کۆنسێرڤەتیڤ و دیموکراتخوازە، پارتەکەی هیچ نیازێکی نییە بۆ دامەزراندنی سیستەمێکی دینیی یاخود ئیسلامیی لە تورکیا، پارتە نوێکەمان پشتدەبەستێت بە ئەقڵ و گفتوگۆ و سەرجەم بیروبۆچوونەکانی کۆمەڵگەی تورکیی لەخۆدەگرێت، دوژمنکاریی ناکاتە سەر چینێك لە چینەکان بەتایبەت سوپا..". بەرنامەی پارتی داد و گەشەپێدان جەختدەکاتەوە لەسەر پابەندبوون بە سیستەمی سێکیۆلاربوونی دەوڵەت و خۆبەدورگرتن لەهەر تێڕوانینێك کە ئامانج لێیجێبەجێکردنی شەریعەتی ئیسلامیی بێت.

### سێیەم: پارتی داد و گەشەپێدان و گەیشتنی بە دەسەڵات:

لەژێر سایەی دژواریی سیاسیی و هەڵکشانی تەنگژەی ئابووریی و سیاسیدا، حکومەتەکەی بلند ئەجەوید (١٩٩٩-٢٠٠٢) بڕیاریدا بە هەڵبژاردنی پێشوەخت لە سێی تشرینی دووەمی ساڵی ٢٠٠٢، پارتی داد و گەشەپێدانیش بەشداریی لەهەڵبژاردنەکاندا کرد بە رێبەرایەتیی عەبدوڵلا گویل، بەهۆی سەپاندنی سزا بەسەر ئەدردۆگاندا هەر لە ساڵی ١٩٩٨ەوە، پارتەکە توانیی سەرکەوتنێکی بێهاوتا بەدەستبهێنێت ئەویش بە بەدەستهێنانی رێژەی (%٣٤,٢٩) دەنگی دەنگدەران و بەمەش ٣٦٣ کورسی لە کۆی ٥٥٠ کورسی بەدەستهێنا،

بەمەش سێیەکی دەنگەکانی بەدەستهێنا و توانی بەتەنها حکومەت دابمەزرێنێت لە ئەنجومەنی نیشتیمانیدا، لەبەرامبەردا پارتی گەلی کۆماریی رێژەی (١٩,٤%)ی دەنگەکانی بەدەستهێنا و (١٧٨) کورسی لە ئەنجومەنی نیشتیمانیدا پڕکردەوە. بەمەش پارتی داد و گەشەپێدان حکومەتی (٥٨) پێکهێنا و سنووری دانا بۆ دیاردەی هاوپەیمانێتیی حکومیی لە تورکیا. برێکی زۆر ئەم سەرکەوتنەی مەزنەی پارتی داد و گەشەپێدان بە خواستی دەنگدەری لێکدەدەنەوە بە ئامانجی جەختکردنەوە لە شوناسی ئیسلامیی تورکیا، وێڕای ئەوەی بڕێکی زۆر لە ئەندامانی پارتەکانیتر دەنگیاندا لە بەرژەوەندیی پارتی داد و گەشەپێدان بەتایبەت بزووتنەوەی ناسیۆنالیست و نیشتیمانی دایك و رێگەی راست و پارتە چەپڕۆکان.

پرسی هەڵگرتنی سزای سیاسیی لەسەر رێبەری پارتەکە ئەردۆگان لە کارە بەرابیەکانی حکومەتەی عەبدوڵلا گویل بوو، ئەنجومەنی نیشتیمانیی توانی ماددەی ٣١٢ لە یاسای سزاکان دەستکاریبکات تاکو زەمینە خۆشبکات بۆ خۆپالاوتن لە هەڵبژاردنە تەکمیلییەکاندا، ئەردۆگان لەهەڵبژاردنەکاندا سەرکەوتنی بەدەستهێنا لەپاش خۆپالاوتنی وەك کاندیدی شاری سعرت siirtو چووە نێو ئەنجومەنی نیشتیمانییەوە، عەبدوڵلا گویلیش لەدەسپێشخەرییەکدا دەستیلەکارکێشایەوە وەك زەمینە خۆشکردنێك لەبەردەم ئەردۆگاندا تاکو سەرۆکایەتیی حکومەتی نوێ (٥٩) بکات لە ١٢ی ئاداری ٢٠٠٣.

## چوارەم: هەڵوێستی هێزە سێکیۆلارەکان بەرامبەر بە پارتی داد و گەشەپێدان و سیاسەتەکانی:

هێزە سێکیۆلارەکان بەرامبەر بە مامەڵەکردن لەگەڵ ئەم هێزە هاوچەرخەدا بوون بە دوو ئاراستەوە: **ئاراستەی یەکەم:** سوورە لەسەر پێویستیی بەرەنگاربوونەوەی ئەم پارتە بەوپێیەی درێژکراوەی جوولانەوەی ئیسلامیی سوننەتییەو لەژێر عەباکەی نەجموددین ئەربەکانو هەردوو پارتەکەی فەزیلەت و رەفاهدا هاتووەتەدەرێ، بەلام ئاراستەکەیتر کاتی ئەوە هاتووە بەئامانجی کردنەوەی لاپەڕەیەکی نوێ لەپێناو مامەڵەکردن لەگەڵ پاشهاتە نوێیەکان بەتایبەت لەگەڵ نزیکبوونەوەی تورکیا لە یەکێتی ئەورووپا کە داوا لە ئەنکەرە دەکات پتر دیموکراسیی بێت و سنوورێك دابنێت بۆ رۆڵی سوپا لە ژیانی سیاسیدا، لایەنگرانی ئەم ئاراستەیە پارتی داد و گەشەپێدان بە ئاراستەیەکی ئیسلامیی کۆنسێرڤەتیڤو میانڕۆو تەوفیقیی دەبینن، ئەمەش

سەرنجی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و تەنانەت ئیسرائیلی بەلای خۆیدا ڕاکێشاوە، بەرهەڵستیی هێزە ئیسلامییە رادیکاڵ و دژە سیاسەتەکانی بەرامبەر بە فراوانخوازیی و هەژموونی نێونەتەوەیی لەگەڵیدا دێتەوە و ئەمەریکا دەیەوێت ئەزموونی تورکیای ئیسلامیی دیموکراتیی میانڕۆ نموونەیەکی قبوڵکراوبێت لەکن دەوڵەتانی ئیسلامیی بەتایبەت لەپاش ڕووداوەکانی ئەیلولی ٢٠٠١، ئەم پێشنیارەش بەسبوو بۆ واشنتۆن و هاوپەیمانەکانی لە تورکیا بەئامانجی چوونە نێو گفتوگۆی ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆ لەگەڵ ڕێبەرانی پارتی داد و گەشەپێدان.
لەبەر ڕۆشنایی ئەمەدا یەکێك لە ڕۆژنامە تورکییەکان چاوپێکەوتنێکی لەگەڵ ئۆڵتی کۆلاج ئەنجامدا، ئەو سەرۆکی کاروباری دینیی پێشوو بووە و یەکێکبووە لەوانەی هاریکاریی سوپای کردووە، تێیداگوتوویە کە ژەنەڕاڵ کەنعان ئیفرین ڕێبەری کۆدەتاکەی ئەیلولی ١٩٨٠ یەکێك لە نوێنەرانی پارتە نوێکەی بینیوە.. ئیفرین بەمشێوەیە وەلامی داوەتەوە: "پارتە نوێکە دەکرێت پارتێکی سێکیۆلار بێت تاکو قبوڵبکرێت.. بڕوانە ئەربەکان چەند پارتی دامەزراند.. چ سوودێکی گەیاند.."، لە کۆتایی چاوپێکەتنەکەدا کۆلاج بۆ ژەنەڕاڵ ئیفرینی دووپاتکردووەتەوە کە بەنێوی سوپاوە دەئاخفێت: "ئەردۆگان ئەوپەڕی سێکیۆلاریستە و بابەتەکەش لەکن ئەو فرەئاشکرایە.."، هەروەها ئیفرین گوتوویە: بەلآم هێدێك ڕاڕایی هەبووە لە گوتەکانی ئەردۆگاندا دەبێت ئاگاداربێت هەرئەمەش مەرجی قبوڵکردنی خۆیی و پارتەکەیەتی، تاکو پیاوێکی ئاقڵ بێت و توقییە بەکارنەهێنێت و دین نەکات میکانیزم..".

### پێنجەم: پرۆژەی سیاسیی پارتی داد و گەشەپێدان "بەرنامەی چاکسازیی سیاسیی":

لە ١٨ی ئاداری ٢٠٠٣ ئەردۆگان بەرنامەی حکومەتەکەی پێشکەشکرد کە لەبنەڕەتدا پرۆژە و ئامانجی پارتەکەیەتی بۆ ئەنجومەنی نیشتیمانیی کە تێیدا هەوڵەکانی ئەتاتورك لە بنیاتنانی دەوڵەتی تورکیای هاوچەرخدا ئامادەیی هەبوو، دووپاتیکردەوە کە پارتەکەی پابەندە بە بنەماکانی کەمالیزم، پارتەکەی پارتێکی دیموکراتخوازی کۆمەلایەتیی کۆنسێرڤەتیڤە و بەرنامەکە ڕاڤەیەکی تەواوی سیاسەتی حکومەتە نوێکەی لەخۆگرتبوو، لەپاڵ دانانی چارەسەری سەرکەوتووانە بۆ کێشە سیاسیی و ئابوورییەکانی ولآت. لەسەر ئاستی پرۆژەی سیاسیی پارتی داد و گەشەپێدان چەندین تێڕوانینی لەخۆدەگرت لە بواری چاکسازیی سیاسیدا، لەسەر ئاستی

سیاسەتی نێوخۆیی بەرنامەکە سیاسەتی سەرکوت و ئەو پرۆژانەی رەتکردبووەوە کە ئامانجلێی دروستکردنی کەلێنە لەنێو ریزەکانی گەلدا لەسەر بنەمای تۆرەمە یاخود نەتەوە یاخود مەزهەب، جەختکرابووەوە لەسەر پێویستیی نوێکردنەوەی ژیانی سیاسیی لەرێگەی چەسپاندنی بەهاکانی دیموکراسیی و دەوڵەتی یاسا کە زامنی رێزگرتنی کۆمەڵی نێودەوڵەتیی دەکات لە تورکیا. لەپێناو بەدیهێنانی ئەمەشدا دەبێت پشتببەسترێت بە دەستوورێکی نوێ کە دادی کۆمەلاّیەتیی بەدیی بهێنێت و رۆڵی گەل لە پرۆسەی بڕیارسازیدا کارابکات، لەپاڵ گۆڕینی یاساکانی پەیوەست بە پارتە سیاسییەکان و سزا و یاسای بازرگانیی و یاسای کار. لەسەر ئاستی سیاسەتی دەرەوەش، پرسی چوونی تورکیا بۆ نێو یەکێتی ئەورووپا لە کارە لەپێشینەکانی حکومەتەکەی بوو لەگەڵ هەوڵی بەردەوامیان بە ئامانجی درێژەپێدانی گفتوگۆکانی تایبەت بە چوونی تورکیا بۆ نێو یەکێتی ئەورووپا. لەم چوارچێوەیەشدا حکومەتەکەی پارتی داد و گەشەپێدان لە بەڕێوەبردنی دەسەلاّتدا هەوڵ بۆ بەدیهێنانی ئەم ئامانجانەی لای خوارەوە دەدات:

- بەدیهێنانی سەقامگیریی و هێوریی سیاسیی و کۆمەلاّیەتیی و ئابووریی لەولاّتدا.
- زامنکردنی ئاییندەی سیاسیی پارتی داد و گەشەپێدان لەکن شەقامی تورکیی.
- بەدیهێنانی پرۆژەی چاکسازیی پارتەکە.
- دوورکەوتنەوە لەو هەڵوێستانەی کە بەریەککەوتن دروستدەکات لەگەڵ هێزە سێکیۆلارەکاندا.
- هەوڵدان و بەردەوامیی گفتوگۆکان بە مەبەستی چوونی تورکیا بۆ نێو یەکێتی ئەورووپا.

لە میانی پرۆژەی سیاسیی پارتی داد و گەشەپێداندا کە ئامانجلێی بەدیهێنانی بەرنامەی چاکسازیی سیاسییە بەپێی بەرنامەی راگەیەندراوی حکومەت، پرسی نووسینەوەی دەستووری نوێی ولاّت لە کارە لەپێشینەکانی حکومەتەکەی ئەردۆگان بوو لەپێناو جێبەجێکردنی پرۆژە چاکسازییەکەی کە ئامانجلێی تێشکاندنی کەلتوری کۆدەتای ١٢ ئەیلولی ١٩٨٠و دانانی دەستوورە بە ویستی سوپا و دوورخستنەوەی دەستێوەردانی سوپا لە ژیانی سیاسیدا، پارتی داد و گەشەپێدان پێیوایە دەستووری ساڵی ١٩٨٠ چیتر پێویستیی و خواستە نێوخۆیی و دەرەکییەکانی تورکیا پڕناکاتەوە، بۆیە پێویستە دەستوورێکی هاوچەرخ ئامادەبکرێت لەپاڵ رەزامەندیی زۆرینەی تورکەکان و تێپەڕاندنی ئەو بەربەست و قۆرت و نەرێنییانەی دەستوورەکەی پێشوو کە کاریگەرییەکی گەورەی هەیە لە خراپبوونی واقیعی تورکیدا.

ئەردۆگان سوودی زۆری بینی لە ئەزموونەکانی پێشوو، هەموو ئەو هەڵانەی کە پارتی رەفاه تێیکەوتبوو، وەختێك حیزبی رەفاه جڵەوی دەسەڵاتی گرتەدەست لە ساڵی ١٩٩٦و دوورکەوتنەوەی لە یەکێتی ئەوروپا، لەهەمانکاتیشدا هەوڵیدا ئاڕاستەکانی شەقامی تورکیی بەرەو ئەوروپا وەبەربهێنێت لە جێبەجێکردنی بەرنامە چاکسازییەکەی بە ئاگایی و شەفافییەت و خۆبەدوورگرتن لە دژایەتیکردنی هێزە سێکیۆلارەکان، ئەمەش لەڕێگەی چەندین رێوشوێنەوە، لە گرنکترینیان:

دەرکردنی بڕیارێك بە پێکهێنانی لیژنەیەکی زانستیی لە پسپۆڕانی یاسای دەستووریی لە شەش ئەکادیمیست لەپێناو ئامادەکردنی پرۆژەی دەستووری نوێ بەشێوەیەك پێکهاتەی کۆمەڵگەی تورکیی و تایبەتمەندیی و پێویستیی و خواستەکانی لەبەرچاوبگرێت، لەپاش چەند هەفتەیەك لە کاری بەردەوام لیژنەکە رەشنووسی دەستوورەکەی پێشکەش بە رێبەرایەتیی پارتی داد و گەشەپێدان کرد بە ئامانجی کۆڵینەوە و لێوردبوونەوەی، رەشنووسەکە لە (٤٠٠) پەڕەو ( ١٩٠) ماددەی لەخۆگرتبوو.

ژیاندنەوەی پرۆژە چاکسازییەکەی حکومەتەکەی پێشووی ئەجەوید لەلایەن پارتی داد و گەشەپێدانەوە کە لەڕێگەی پێشکەشکردنی لیستێکەوە بوو کە چەندین چاکسازیی لەخۆدەگرت بۆ بەردەم ئەنجومەنی نیشتیمانیی تورکیی گەورە، لەکن چاودێرانی کاروباری تورکیا بە "پاکێجی شەشەم" ناسراوە کە پەیوەستە بە "پێوەرەکانی کۆپنهاگن" - ناسراوە، ئامانجلێی پێکڕاگرێدانی بونیاتی سیاسیی تورکیابە بە بونیاتی دەوڵەتانی یەکێتی ئەوروپاوە لە رۆژی ٢٦س حوزەیرانی ٢٠٠٣، لە گرنگترین ئەو تەوەرانەی کە لە پاکێجەکەدا هاتبوو:

١. لە بواری چەسپاندنی بەهاکانی دیموکراسیەتو شەفافییەت و دەوڵەتی یاساو مافەکانی مرۆڤ و رەتکردنەوەی سزای لەقەنارەدان، گۆڕینی سیستەمی گرتووخانەکان، پاراستنی گیراوان لە جەزرەبەدان، رەتکردنەوەی دادگەکانی ئەمنی دەوڵەت، دادگە ئیستینائییەکان، بەرگرتن لە دادگاییکردنی هاوڵاتیان لە دادگە سەربازییەکاندا، رەتکردنەوەی تاوانەکانی دەربڕینی بیروڕا و تاوانی زینا و دەستکاریکردنی یاساکانی کۆمەڵە ئەهلییەکان و پووچەڵکردنەوەی ئەو ماددە یاساییانەی کە رەخنەگرتن لە دەوڵەت قەدەغەدەکەن و داننان بە پێشینەیەتیی یاسا و نەریتە نێودەوڵەتییەکان لەسەر حسێبی یاسا نیشتیمانییەکان لە بواری مافەکانی مرۆڤ سەرباری چەسپاندنی سەربەخۆیی دادوەریی.

٢. پرۆژەی تایبەت بە یاسای خوێندنی باڵا و سوککردنی ئەو بەربەست و قۆرتانەی کە دەخرێنە بەردەم قوتابیانی پەیمانگە دینییەکان، ناسراوە بە پەیمانگەکانی پێشنوێژ و گوتارخوێن و وەرگرتنیان لە زانکۆکان.

٣. باشکردنی ئاستی ژیانی کوردان و بەرفراوانکردنی سەقفی ئازادییەکانیان و ڕێگەدان بە فێربوونی زمانی کوردیی و کردنەوەی قوتابخانەی کوردیی و تەرخانکردنی نیو سەعات بۆ بەرنامە کوردییەکان لە تەلەفیزیۆنی تورکیی TRT و بەردانی ئەندام پارلەمانی کوردیی لەیلا زانا و سیان لە هاوەڵەکانیی.

٤. پرۆژەی تایبەت بە ئەنجومەنی ئاسایشی نیشتیمانیی و هێزە چەکدارەکان، تێیداهاتووە:

- کەمکردنەوەی دەسەڵاتەکانی ئەنجومەنەکە و پووچەڵکردنەوەی دەسەڵاتە تەنفیزییە نادیموکراسییەکانی.

- سەرلەنوێ دارشتنەوەی هەیکەلی پەیوەندییەکانی ئەنجومەنەکە لەگەڵ دەسەڵاتە مەدەنییەکاندا.

- کەمکردنەوەی بوونی سەربازیی لەنێو ئەنجومەنەکە و کورتکردنەوەی لە سوپاسالاری ولاتدا.

- گۆڕینی ئەنجومەنەکە بە دەستەیەکی راوێژکاریی کە هەردوو مانگ جارێك کۆببنەوە و ئەمانەتەکەی بخەنەژێر دەستی سەرۆکوەزیرانی هەڵبژێردراو.

- بودجەی دامەزراوەی سەربازیی بخرێتەژێر باری چاودێریی پارلەمانییەوە.

ئەم پرۆژەیە و بەتایبەت پابەندبوونی پارتی داد و گەشەپێدان بە مەرجەکانی چوونە نێو یەکێتی ئەوروپاوە سیاسەتێکی ژیرانەیە لەپێناو فەرزکردنی میتۆد و پلانی گشتیی پارتەکە، رەنگە لەکن ئەردۆگان ئەجێندای تۆڵەسەندنەوەی هەبێت لەپاڵ هەق و حساب کردن لەگەڵ هێزەکانیتردا بەتایبەت هێزە سێکیۆلارەکان بەهۆی ئەزموونی پێشووی لەو ماوەیەدا کە سەرۆکی شارەوانی ئەستەنبوڵ بووە، وێڕای ئەوەی پرۆژەی سیاسیی چاکسازیی بە دەسپێشخەرییەکی بوێرانە دادەنرێت پلانەکەی حکومەتی زۆرینەیە لەنێو ئەنجومەنی نیشتیمانیی گەورەدا ئامانجلێی تاقیکردنەوەی هێزە سێکیۆلارەکانە کە دەستیانگرتووە بەسەر کەناڵەکانی بڕیارسازیی سەرەکیدا وەك سەرۆکایەتی کۆمار و دادگەی دەستووریی و دامەزراوەی سەربازیی.

لەبەر رۆشنایی ئەمەدا هێزە سێکیۆلارەکان ئەم پرۆژەیان بەشێوەیەك راڤەکردووە هەرچی پەیوەندیی هەیە بە پەیمانگەکانی پێشنوێژ و گوتارخوێن بەوەی هەنگاوێکە لەلایەن پارتی دەسەڵاتدارەوە بۆ بەرفروانکردنی ژێرخانی فیکری دینیی کە زەمینە خۆشدەکات بۆ دەرچووانی ئەو پەیمانگانە بچنە نێو وەزیفە باڵاکانەوە، هەمدیسان ئەم پلانەیان بە شێوازێك لە تاقیکردنەوەی ئەوان نێوزەدکردووە تاکو گۆڕانی گەوهەریی بکەن بۆ نموونە باڵاپۆشیی یاخود دانانی رۆژی هەینی بە پشووی فەرمیی لەبری رۆژی یەك شەممە.

هەرچی دامەزراوەی سەربازییە بێدەنگبوو بەرامبەر بەو گۆڕانکارییە دەستوورییانە کە دەسەڵاتی ئەوانی کەمکردەوە و پەیوەندیی هەبوو بە یاسای سزاکان و بەندی تایبەت بە بەرفروانکردنی سەقفی ئەو ئازادییانەی درابوو بە کوردان، دامەزراوەی سەربازیی مەترسیی خۆی دەربڕیی سەبارەت بەوەی پارتی دەسەڵاتدار ئەو چاکسازییانەی کە یەکێتی ئەورووپا داوای لێدەکات بەکاریبهێنێت لەپێناو بەرفروانکردنی قاعیدەکەی، هەروەها پاڵپشتیکردنی رەوتە ئیسلامییەکان لە تورکیا و قبوڵکردنی فێدراڵیزم. بەمشێوەیە پەرچەکرداری دامەزراوەی سەربازیی لە هەستانی سوپاسالاری پێشوو حیلمی ئۆزگۆگ Ozgog خۆی دەبینێتەوە کە حکومەتی ئاگادارکردووە لەوەی کە سوپای تورکیا بە توندی بەرامبەر بەو ئاراستانە دەوەستێتەوە کە ئامانجلێی سستکردنی سیستەمی سیاسیی سێکیۆلارە لەوڵاتدا، گوتوویە: "پێویستە هەموان بزانن کە هێزە چەکدارەکانی تورکیا بێلایەن نابێت لە پرسەکانی سێکیۆلاریزم و مۆدێرنیزمدا". لەهەمانکاتدا پارتی گەلی کۆماریی ئۆپۆزیسیۆن لەسەر زمانی سەرۆکەکەی دەنیز بایکال Baykal دژایەتیی خۆی بۆ سیاسەتی پارتەکە دەربڕیی لە هەرچی پەیوەستە بە کوردانی تورکیا و بە نانەوەی جیاوازیی ئیتنیی لەوڵاتدا نێوزەدیکردووە.

Abstract

Studying the topic of political project of AK party in Turkey represents a ring of so many ones which show the charges witnessed by the Turkish politics as will as changes accompanied in some strategies of political trends in Turkey .These trends represent of Islamic direction represented in this study by Justice and Development party headed by Tayyib Erdogan .This party presents itself in crtain cordition which need such a trend in Turkey to be a joining ring and a balance between Islamic reality of Turkey and its secularist frontage .This has been clear through the perspectives of partys leaders which included different elites of politics in Turkey in order to form a political project prepared to be a reform project for the political arena in Turkey and also to be a starting point in its political action as being the ruling party. The study concentrated on five major aspects and at the beginning comes the general conditions in Turkey before the birth of the party and how such conditions and changes have been an effective motive in its foundation .Therefore, the party depends on bases and aims of particular form especially its relation with Islam and state Se cularism .This has facilitated the process of reaching the power by its winning the elections and the reflections of this upon secularist powers in Turkey. represented by the military .The political project of the party is the main aspect of this study being a reform program prepared by the party after forming the government and also having its effect upon party politics in Turkey for it is the first Islamic party in Turkey adopts perspectives wgich represent a type of continuation and balance with secularist powers in Turkey.

•••

## پەراوێزەکان:

(١) حنا عزو بهنان: التطورات السياسية في تركيا ١٩٢٣-١٩١٩، رسالة ماجستير غير منشورة،جامعة بغداد، كلية الآداب، ١٩٨٩)، ص ١٥.

ر..:Ahmed Emin : Turkey in the World War. (London, 1930), P 33

(٢) احمد السعيد سليمان: التيارات القومية والدينية فى تركيا امعاصرة، (القاهرة، دارالمعرفة، د.ت)، ص ٧٠. جميل عبدالله المصرى: حاضر العالم الإسلامي وقضاياه المعاصرة، ج ١، ط ٨، (الرياض، مكتبة العبيكات، ٢٠٠٢)، ص ص ١٢٧-١٢٦

(٣) زينب أبو سنة: تركيا الإسلامية الحاضر ظل الماضى، ط ١، (القاهرة، الدار الثقافية للنشر،٢٠٠٦)، ص ١٦٠. خليل علي مراد: "الأحزاب السياسية والمسألة الدينية فى تركيا ١٩٦٠-١٩٤٦"، فى

إبراهيم خليل احمد وآخرون، "الإسلام والعلمانية فى تركيا المعاصرة"، جامعة الموصل، مركز الدراسات التركية (الإقليمية حاليا)، ١٩٩٦، ص ٧٠. محسن حمزة حسن العبيدي: التطورات السياسية الداخلية فى تركيا ١٩٦٠-١٩٤٦، رسالة ماجستير غير منشورة، (جامعة الموصل، كلية الآداب، ١٩٨٩) ، ص ٦٤ وأيضا. نوال عبد الجبار سلطان ظاهر الطائي: التطورات السياسية الداخلية فى تركيا ١٩٨٠-١٩٦٠، أطروحة دكتوراه غير منشورة، (جامعة الموصل، كلية التربية، ٢٠٠٣)، ص ٣٥.

(٤) سعد عبدالعزيز مسلط موسى الجبوري: التطورات السياسية الداخلية في تركيا ١٩٩١-١٩٨٣، أطروحة دكتوراه غير منشورة، (جامعة الموصل، كلية التربية، ٢٠٠٧)، ص ٦٦ . رضا هلال: السيف والهلال: تركيا من أتاتورك إلى اربكان: الصراع بين المؤسسة العسكرية والإسلام السياسي، ط ١، (القاهرة، دار الشروق، ١٩٩٩)، ص ١٤٥.

(٥) مصطفى محمد الطحان: تركيا الى عرفت.. من السلطان.. إلى نجم الدين اربكان ١٨٤٢ -عام ٢٠٠٦، ج ٢، (د. م، ٢٠٠٦)، ص ٣٥٤.

(٦) هەمان سەرچاوە، لا ٣٥٦.

(٧) هەمان سەرچاوە، لا ٣٥٧.

(٨) هەمان سەرچاوە، لا ٣٥٨.

(٩) هەمان سەرچاوە، لا ٣٥٩.

(١٠) محمد العادل: "قراءة في أبرز النجاحات والإخفاقات في المسيرة السياسية للحركة الإسلامية في تركيا"، بحث منشور في ندوة "االحركات الإسلامية المشاركة في المؤسسات السياسية في البلاد العربية وتركيا"، للفترة ١٧-١٦ حزيران عام ٢٠٠٦، مراكش، ص ١٧.

(١١) محمد نورالدين: "تركيا .. إلى أين حزب العدالة والتنمية (الإسلامي) في السلطة؟"، مجلة المستقبل العربى، السنة (٢٥)، العدد (٢٨٧)، بيروت، كانون الثانى عام ٢٠٠٣، ص ٢٢.

(١٢) صحيفة (االحياة)، لندن ٢٠٠١/٨/٢٤

(١٣) الطحان، هەمان سەرچاوە، لا ٣٦٠.

(١٤) هەمان سەرچاوە، لا ٣٦٢.

(١٥) "Ak Partive Recep Tayyip Erdogan Iktidardan Gitmeli," www.akpyehayir.blogspot. com.

(١٦) الطحان، هەمان سەرچاوە، لا ٣٦٣.

(١٧) صحيفة (ستار) ،التركية ٢٠٠١ / ٧ / ١٤ .

(١٨) "Basbakan Recep Tayyip Erdogan Tarafindan Sunulan 59 Ucu Hukumet Programi 18 Mart 2003" www.Akparti.org.tr.

(١٩) Ayni Eser.

(٢٠) Michael Rubin, "Green Money, Islamist Polities in Turkey", The Middle East Quartely, Winter 2005, Vol (28), Number (1), www.meforum.org.

(٢١) "Akp nin Yeni anayasa Uzerine– Ender Buyukculha", 17 Eylul 2007, www.sendika.org; "Yeni anayasa taslag alternatiflere Sunulacak", 18 11 2007, haber.mynet.com.

* له دیارترین پێوەرەکانی کۆپنهاگن بریتییەلە پێوەرە سیاسییەکان کە جەختدەکاتەوە لەسەر ئەو دەوڵەتانەی کە کاندیدن بۆ چوونە نێو یەکێتی ئەوروپاوە کە زامنی سەقامگیریی دامەزراوەکانی بکات و دیموکراسییەت بپارێزێت، هەمدیسان پەیمانبدات بە زامنکردنی دەوڵەتی یاسا و ماف مرۆڤ و کەمەنەتەوەکان. پێوەرە ئابوورییەکانیش بریتییەلەوەی خۆگربێت لەبەردەم فشاری کێبڕکێکان لە بازاڕە نێوخۆییە ئەوروپییەکاندا، لەگەڵ چەندین پێوەریتر. بۆ زانیاری پتر بڕوانە: عوني الداوودي، "تركيا أمام خيارين". www.krg.com

(٢٢) محمد نورالدين: "الديمقراطية التركية أمام امتحان جديد.. هل تمر الإصلاحات رغم اعتراض العسكر"، صحيفة الشرق القطرية، ٢٢ / حزيران / ٢٠٠٣ منشور في شبكة المعلومات الدولية (الانترنت) ومتاح على الموقع : www.alsharq.com (23) Guven Ozalp: "AB Sonkez", Milliyet gazetesi, 19 Mayis, www.milliyet.com.tr.

إبراهيم داقوقي: "الاختلاف الثقافي لا يقف حائلا دون انضمام تركيا للنادي الأوربي"، صحيفة الحوار المتمدن، العدد (١٣١١)، في ٨ / أيلول لعام ٢٠٠٥ / منشورة على شبكة المعلومات الدولية (الانترنت) ومتاح على الموقع

: www.rezgar.com (24) Rubin. Op. Cite

(٢٣)جهاد صالح: "تركيا ومسألة الانضمام إلى الاتحاد الأوربي"، الحلقة الأولى، تقرير منشور على شبكة المعلومات الدولية (الانترنت) ومتاح على الموقع www.efrin.net :

(٢٤)التقرير الاستراتيجي العربي – ٣ –، "تركيا.. تحديات الانضمام إلى الاتحاد الأوربي"، إصدار مركز الأهرام للدراسات السياسية والإستراتيجية، القاهرة، www.ahram.org.eg.

بڕوانە: داقوقي، سەرچاوەی پێشوو.

(٢٥) التقرير الاستراتيجي العربي، سەرچاوەی پێشوو.

(٢٦) متابعة إخبارية لبرنامج ماوراء الخبر الذي بثته قناة الجزيرة الفضائية بتاريخ ٢٦ / أيلول / ٢٠٠٦.

(٢٧) الجيش التركي يتعهد بالدفاع عن العلمانية"، تقرير منشور على شبكة المعلومات الدولية (الانترنت) بتاريخ ١٤ / نيسان / ٢٠٠٤ ومتاح على الموقع www.alarabiya.net

(٢٨) Sabah Gazettes , 29 Mart 2004.

### لیستی سەرچاوەکان

یەکەم: تێزی ماستەر و دکتۆراکان

١. بهنان، حنا عزو: التطورات السياسية في تركيا ١٩٢٣–١٩١٩، رسالة ماجستير غير منشورة،(جامعة بغداد، كلية الآداب، ١٩٨٩).

٢. الجبوري، سعد عبدالعزيز مسلط موسى: التطورات السياسية الداخلية في تركيا ١٩٩١–١٩٨٣، أطروحة دكتوراه غير منشورة، (جامعة الموصل، كلية التربية، ٢٠٠٧).

٣. الطائي، نوال عبدالجبار سلطان ظاهر: التطورات السياسية الداخلية في تركيا ١٩٨٠–١٩٦٠، أطروحة دكتوراه غير منشورة، (جامعة الموصل، كلية التربية، ٢٠٠٣).
٤. العبيدي، محسن حمزة حسن: التطورات السياسية الداخلية في تركيا ١٩٦٠–١٩٤٦، رسالة ماجستير غير منشورة، (جامعة الموصل، كلية الآداب، ١٩٨٩).

دووەم: كتێبە عەرەبیی و بیانییەكان

١. سليمان، احمد السعيد: التيارات القومية والدينية في تركيا المعاصرة، (القاهرة، دارالمعرفة،د. ت).
٢. أبو سنة، زينب: تركيا الإسلامية الحاضر ظل الماضي، ط ١، (القاهرة، الدار الثقافية للنشر)، ٢٠٠٦
٣. الطحان، مصطفى محمد: تركيا التي عرفت .. من السلطان .. إلى نجم الدين اربكان ١٨٤٢ – عام ٢٠٠٦، ج ٢، (د. م، ٢٠٠٦).
٤. المصري، جميل عبدالله: حاضر العالم الإسلامي وقضاياه المعاصرة، ج ١، ط ٨، (الرياض، مكتبة العبيكات، ٢٠٠٢).
٥. هلال، رضا: تركيا من أتاتورك إلى اربكان: الصراع بين المؤسسة العسكرية والإسلام السياسي،ط ١، (القاهرة، دار الشروق، ١٩٩٩).
٦. Ahmed Emin : Turkey in the World War. (London , 1930)

سێیەم: باس و كۆڵینەوەكان

.١ العادل، محمد: "قراءة في أبرز النجاحات والإخفاقات في المسيرة السياسية للحركة الإسلامية في تركيا "، بحث منشور في ندوة" الحركات الإسلامية المشاركة في المؤسسات السياسية في البلادالعربية وتركيا "، للفترة ١٧–١٦ حزيران عام ٢٠٠٦، مراكش.
.٢ مراد، خليل علي: "الأحزاب السياسية والمسألة الدينية في تركيا ١٩٦٠–١٩٤٦"، في إبراهيم خليل احمد وآخرون، "الإسلام والعلمانية في تركيا المعاصرة"، جامعة الموصل، مركز الدراسات التركية الإقليمية حاليا)، ١٩٩٦.
.٣ نورالدين، محمد: "تركيا .. إلى أين حزب العدالة والتنمية (الإسلامي) في السلطة"، مجلة المستقبل العربي، السنة (٢٥)، العدد (٢٨٧)، بيروت، كانون الثاني ٢٠٠٣.

چوارەم: ڕۆژنامەو كەناڵە ئاسمانییەكان

١. ڕۆژنامەی (الحياة). لندن ٢٠٠١/٨/٢٤،
٢. ڕۆژنامەی (ستار). التركية ٢٠٠١/٧/١٤.
٣. Sabah Gazettes , ٢٩ Mart ٢٠٠٤
٤. بەرنامەی (ما وراء الخبر) كەناڵی ئەلجەزیرە ڕۆژی ٢٦ / أيلول / ٢٠٠٦.

پێنجەم: تۆڕەكانی ئەنتەرنێت

(١) "Ak Partive Recep Tayyip Erdogan Iktidardan Gitmeli, "www.akpyehayir.blogspot. com.

(٢) "Basbakan Recep Tayyip Erdogan Tarafindan Sunulan ٥٩ Ucu Hukumet Programi ١٨ Mart ٢٠٠٣ " www.Akparti.org.tr.

(٣) Michael Rubin, "Green Money, Islamist Polities in Turkey", The Middle East Quarterly, winter ٢٠٠٥, Vol (٢٨), Number (١), www.meforum.org.

(٤) "Akp nin Yeni anayasa Uzerine – Ender Buyukculha", ١٧ Eylul ٢٠٠٧, www.sendika.org; "Yeni anayasa taslag alternatiflere Sunulacak", ١٨ ١١ ٢٠٠٧, haber.mynet.com.

(٥) **محمد نورالدين: "الديمقراطية التركية أمام امتحان جديد.. هل تمر الإصلاحات رغم اعتراضالعسكر"، صحيفة الشرق القطرية، ٢٢ / حزيران / ٢٠٠٣ منشور في شبكة المعلومات الدولية (الانترنت) ومتاح على الموقع:** www.alsharq.com

(٦) Guven Ozalp: "AB Sonkez", Milliyet gazetesi, ١٩ Mayis, www.milliyet.com.tr.

(٧) **إبراهيم داقوقي: "الاختلاف الثقافي لا يقف حائلا دون انضمام تركيا للنادي الأوربي"، صحيفة الحوار المتمدن، العدد (١٣١١)، في ٨ / أيلول / ٢٠٠٥ منشورة على شبكة المعلومات الدولية (الانترنت) ومتاح على الموقع:** www.rezgar.com

(٨) **جهاد صالح: "تركيا ومسألة الانضمام إلى الاتحاد الأوربي"، الحلقة الأولى، تقرير منشور على شبكة المعلومات الدولية (الانترنت) ومتاح على الموقع:** www.efrin.net

(٩) **جهاد صالح: "ليلى زانا ملكة الكرد ثورة للحب الأنثوي"، مقالة منشورةعلى شبكة المعلومات الدولية (الانترنت) ومتاح على الموقع:** www.bahoz.htm

(١٠) **التقرير الاستراتيجي العربي – ٣ –، "تركيا .. تحديات الانضمام إلى الاتحاد الأوربي"، إصدار مركز الأهرام للدراسات السياسية والإستراتيجية، القاهرة، منشور على شبكة المعلومات الدولية (الانترنت) ومتاح على الموقع:**
www.ahram.org.eg

(١١) **"الجيش التركي يتعهد بالدفاع عن العلمانية"، تقرير منشور على شبكة المعلومات الدولية (الانترنت) بتاريخ ١٤ / نيسان / ٢٠٠٤ ومتاح على الموقع:** www.alarabiya.net.

(١٢) **عوني الداوودي، "تركيا أمام خيارين"، بحث منشور على شبكة المعلومات الدولية (الانترنت) ومتاح على الموقع:** www.krg.com

# هەندێ لە تایبەتمەندێتییەکانی خەباتی سیاسیی پارتی کرێکارانی کوردستان

سەلام عەبدولکەریم(*)

## سەرەتا

بۆچی پێویستە باس لە تایبەتمەندێتی پارتی کرێکارانی کوردستان بکرێ؟ ئایا ئەم پارتە هیچ جیاوازییەکی بونیادی و بنەڕەتی وەهای هەیە تاوەکو پێویستبکات لەبارەیەوە توێژینەوەی لەسەربکرێ؟ ئایا سەرهەڵدانی پارتی کرێکارانی کوردستان هاووێنەی زۆرێك لەو پارتە سیاسییانەیترە، چ لە باشوور و رۆژهەلات و رۆژئاوا یاخود باکووری کوردستان دامەزراون یان ئەم پارتە لە سەرەتاوە خاوەنی پرەنسیپی کاری سیاسی خۆیبووە کە هۆکاری جیاوازی قووڵە لە زۆربەی پارتە سیاسییەکانی کوردستان.

## رەگوڕیشەی پارتی کرێکارانی کوردستان

ئەو ئازادییە سیاسییەی دەستوری ١٩٦١ هێنایەئاراوە، بۆ یەکەمجار رێگەی بە رەوتی چەپ لەتورکیادا کە پارتی سیاسی بەگوێرەی یاسا دابمەزرێت.[1] هاوکات بەهۆی خراپی رەوشی ئابووری تورکیا لە ساڵانی شەستەکان و تێکچونی نەسیجی کۆمەڵایەتی ئەو وڵاتە و بڵاوبوونەوەی بێکاری و بەرزبوونەوەی بژێوی ژیان و پەیوەستبوونی دەسەڵاتی سیاسی ئەو وڵاتە بە بلۆکی سەرمایەدارییەوە،[2] لەگەڵ کارلێککردنی رەوتی چەپی تورکیا بە جووڵانەوە و شۆڕشە چەپە رزگاریخوازییەکانی ناوچەکە و جیهان لە نموونەی شۆڕشی ١٩٦٨ی فەرەنسا و شۆڕشی ڤێتنام و کوبا و لە سەرووی هەمووشیانەوە نزیکبوونەوە لە بلۆکی سۆسیالیستی بەرابەرایەتی یەکێتی سۆڤیەت، وایانکرد لە ماوەیەکی کەمدا رەوتی چەپ لە تورکیا گەشەسەندنێکی بەرچاو بەخۆوەببینێت و مەترسی لەسەر ژیانی سیاسی لە تورکیا دروستبکات.[3]

*) قوتابی دکتۆرا لە بواری کاروباری تورکیا، زانکۆی سلێمانی. Salam_٨٠jornalist@yahoo.com

ئەگەرچی لە ساڵی ١٩٧١ بۆ جاری دووەم کودەتایەکی سەربازی کرایەوە و ئامانج لێی پارێزگاری بوو لە بنەماکانی کەمالیزم کە دەوڵەتی تورکیای لەسەر دامەزرابوو لەڕێگەی خۆرزگارکردن لە هەڵکشانی رەوت و پارتە چەپەکان،[٤] بەڵام ئەمە رێگرنەبوو، لەوەی جارێکیتر لە ساڵانی حەفتاکان رەوتی چەپ کارایی خۆی لەسەر گۆڕەپانی سیاسی جێبهێڵێت. بەتایبەت رووبەڕووبوونەوە و ململانێی سیاسی لە تورکیا پێینابووە قۆناغێکی هەستیارەوە، چونکە بەردەوامبوونی خراپی رەوشی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی تورکیا پاڵنەرێکی بنەڕەتی بوو، لەوەدایە ئەو پارت و رێکخراوە چەپانەی تورکیا خەباتی سیاسی و مەدەنیانەی خۆیان بگوێزنەوە سەر شەقام و نێو زانکۆکان کە دوو ژینگەی بەهێز و بەپیتی ململانێ سیاسییەکان بووون. دەستپێکردنی خۆپیشاندان و ناڕەزایی جەماوەری کرێکاران و قوتابیانی زانکۆکان فاکتەری یارمەتیدەری دەرکەوتنی چەندین رێکخراوی چەپ بوون لە سۆسیالیزمی سۆڤێیتەوە تادەگاتە ماویزم و مارکسیسزم و لینینیزم.[٥]

پێشتر بەهۆی رێگرە دەستوری و یاساییەکانەوە رووناکبیر و تێکۆشەرانی کورد نەیانتوانی پارت و رێکخراوی سیاسی کوردی ئاشکرا دابمەزرێنن، بەڵام ساڵی ١٩٦٣ یەکەمین پارتی سیاسی بەناوی (پارتی دیموکراتی کوردستانی تورکیا) دابمەزرێنن، دوای شەش ساڵ ئەم پارتە بۆ دوو باڵ دابەشبوو، دوای ئەوەی دووبەرەکییانتێکەوت، باڵێك بە سەرکردایەتی د.سەعید قورمزی توبراق (د.شوان)و پێیانوترا (شوانییەکان) ئاراستەیەکی چەپڕەوی هەبوو باڵەکەیتریش بە سەرۆکایەتی (سەعید ئالچی)و درێژکراوەی پارتی دیموکرات بوو.[٦] دواتریش هەندێکیتریان لە چوارچێوەی رێکخراو و یانە و پارتە چەپەکانی تورکیاوە هاتنەوەنێو کایەی سیاسی تورکیا و بەشداری ئەکتیڤیان تێداکردن لەوانە پارتی دیموکرات و پارتی کاری تورکی، بەڵام پاش ماوەیەك بەشێکی زۆریان لەو رێکخراوانە هاتنەدەرەوە، بەهۆی ئامادەنەبوونی رێکخراو و پارتە چەپەکان بۆداننان بە پرسی نەتەوایەتی کورد لە تورکیا و روویانکردە ئەوەی بەنهێنی رێکخراو و یانەی سیاسی و کۆمەڵایەتی کوردی دابمەزرێنن، هەندێکیان خاوەن شەقڵی سیاسی و هەندێکیشیان لەگەڵ گرتنەبەری خەباتی سیاسیدا خەباتی چەکداریشیان بەپێویستزانی و پەیڕەویانلێکرد، بەڵام لەسەرئاستێکی سنووردار،لەوانەش کۆمەڵەی کاوە و کۆمەڵەی رۆشنبیری یانەکانی رۆژهەڵات.[٧]

ئەگەرچی بەشێك لەو کەسایەتییە سیاسیانەی دواتر پارتی کرێکارانی کوردستانیان دامەزراند وەك (عەبدوڵڵا ئۆجەلان و کەمال پیر و حەقی قەرار) لەنێو رەوتی چەپی تورکیا

دەستیان بەکاری سیاسی کرد، بەڵام هەرزوو، بەدیاریکراویش لەساڵی ١٩٧٣ لەچوونە دەرەوەیەکی نارێکخراویاندا بەمەبەستی پشوو گەشت لە نزیك بەنداوی (چوبووك) لەڕێگەی ئۆجەلانەوە یەکلایەنە بناغەی کارکردن بۆ رێکخراو و جووڵانەوەیەکی چەپی سۆسیالیستیانە کاری لەسەرکرا، دوای ئەوەی بە رستەیەك دەسپێکی گفتوگۆکردن لەسەر دۆخی سیاسی نێوخۆیی تورکیای کردەوە، کاتێك وتی:"کوردستان کۆلۆنییە".[٨]

ئەم کۆبوونەوە نارێکخراوە لە مێژوی پارتی کرێکارانی کوردستاندا وەك رەگوڕیشەی کارکردن بۆ دامەزراندنی پارتییەکی سیاسی تەماشادەکرێ، چونکە ئەو بابەت و مەسەلانەی تێیدا گفتوگۆیان لەبارەوەکرا، هۆکاری نزیکتربوونەوەی ئەو کەسانەبوون بۆ بەردەوامبوون لەسەر گۆڕینەوەی بیروڕای زیاتر و دواتریش سەرەنجام لە ساڵی ١٩٧٨ پێکەوە پارتی کرێکارانی کوردستانیان دامەزراند.

**بۆچی پارتی کرێکارانی کوردستان دامەزرا؟**

دامەزراندنی کۆماری تورکیا لەسەر دەستی مستەفا کەمال ئەتاتورك و لەسەر ئێسکوپروسك و پاشماوەی دەوڵەتی عوسمانی دوای جەنگی یەکەمی جیهانی و جێبەجێکردنی سیاسەتی قڕکردن و تواندنەوەی کورد لەسەر هەموو ئاستەکانی نەتەوە و دامرکاندنەوەی شۆڕشەکانی کورد و دواتریش سەپاندنی یەك پارتی سیاسی و قەدەغەکردنی فرەپارتاییەتی لە تورکیا، جووڵانەوەی نەتەواییەتی کوردی تا قۆناغی هاتنەئارای دیموکراسیی سیاسی و ژیانی فرەحیزبی سستکرد. لەو قۆناغانەشدا ستەمی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی تورکیا لەسەر کورد بەردەوامبوو، سەرباری خراپی بارودۆخی ناوچە کوردنشینەکانی باکووری کوردستان، بۆیە بەردەوام هۆشیاری نەتەوایەتی کوردیی ئامادەیی هەبوو، چونکە سەرباری ئەوەی بارودۆخەکان ناهەمواربوون، بەڵام جموجووڵی رووناکبیری و سیاسی کورد بەردەوامبوو.[٩]

بۆیە رەتکردنەوەی ئەو ستەمە یەکێك لە هۆکارە سەرەکییەکانی دامەزراندنی پارتی کرێکاران بوو، هەروەها کارکردن بۆ رزگارکردنی کوردستان و بەرپاکردنی سیستمێکی سۆسیالیستی پاڵنەرێکیتری ئەو دامەزراندنەبوو.[١٠] سەرەڕای ئەوەی لەبنەڕەتدا سەرهەڵدانی پارتی کرێکارانی کوردستان گەڕان بوو بەدوای ئازادی و ژیانێکی ئازادانەدا، کە مرۆڤی کورد هەست بەرێز و بەها و کەرامەتی نەتەوەیی خۆی بزانێت و بەرپەرچی کۆیلایەتی بداتەوە.[١١]

**تایبەتمەندێتییەکانی خەباتی سیاسی پارتی کرێکارانی کوردستان**

راستە بەر لە پارتی کرێکارانی کوردستان زۆر رێکخراو و گروپ و یانە و پارتی سیاسی کوردیتر دامەزران، بەڵام بۆچی هیچ یەکێکیان وەك ئەم پارتە نەیانتوانی درێژە بەکاری سیاسی بدەن و دوای ماوەیەك تووشی دووبەرەکی و هەڵوەشانەوە بوون و کەمێکیان مایەوە، بەڵام وەك پەکەکە کاریگەرنەبوون لەسەر گۆڕەپانی سیاسی و رووداوە سیاسییەکانی نێوخۆ و دەرەوەی تورکیا؟ بۆیە تایبەتمەندێتییەکانی خەباتی سیاسی پەکەکە نهێنی ئەو بەردەوامییەیە لەگەڵ ئەو بارودۆخ و رووداو و پێشهاتانەی کە ئەو پارتەی پیاتێپەڕیوە و هاتوونەتەپێشەوە.

**یەکەم: بونیادی رێکخراوەیی پەکەکە:**

ئەگەر سەرنجی بونیادی رکخراوەیی پەکەکە بکەین لەڕووی دەستەی دامەزرێنەرانیەوە، تێبینی ئەو تایبەتمەندێتییە دەکەین، کە هەر لە سەرەتاوە پەکەکە پێچەوانەی زۆربەی پارت و رێکخراوە سیاسییەکانیتر پشتی بە چینی سەرەوەی کۆمەڵگەی کوردی لە نموونەی (ئاغا و شێخ و مەلا و سەرۆك هۆز و خێڵەکان) نەبەستبوو، بەڵکو تەرکیزی وردی پەکەکە لەسەر چینەکانی خوارەوەی کۆمەڵگەی کوردی بوو، بەتایبەت چینی کرێکار و کەمدەرامەت و هەژاران.[١٢] بۆیە کە رێکخراوەکەیان دامەزراند لە سەرەتاوە و وەك پارتێکی سیاسی رایانگەیاند تاماوەییەکی زۆر خاوەنی ئیمکانیاتی مادی نەبوون، تاوەکو بتوانن لە ماوەییەکی کەمدا خۆیان ساز و ئامادەبکەن، بەتایبەت لەڕووی چەکدارییەوە تادرەنگێکیش کەموکوڕی داراییان زۆربوو.

ئەگەر ئەم پشتبەستنەی پەکەکە بەم چینانەی خوارەوەی کۆمەڵگە لە پەیڕەوکردنی بیری سیاسی و ئایدۆلۆژیای سۆسیالیزمی شۆڕشگێڕانەوە سەرچاوەیگرتبێت، بەڵام ئەم پێکهاتە کۆمەڵایەتییە رۆڵ و کاریگەری گرنگی خۆی هەبوو کە لەبەرامبەر هەموو سیاسەت و رووبەڕووبوونەوەکانی تورکیادا خۆیان راگرت و بەرەنگاریانکرد، چ ئەو خەبات و تێکۆشانەی لە کاری سیاسی و رێکخستندا ئەنجامیاندا و چ ئەو بەرخۆدانە مەزنەی لەزیندانەکاندا درێژەیانپێدا، لەلایەك ورەی ئەندام و لایەنگر و کادرەکانیان بەرزترکردەوە، بەتایبەت دوای کودەتای (١٢ی ئەیلولی ١٩٨٠) تورکیا بەتووندترین شێواز رووبەڕووی ئەندام و لاییەنگر و کادرەکانی پەکەکە ببوویەوە و لەلاییەکیتریشەوە تورکیایان تووشی سەرسوڕمانکرد، چونکە زۆربەیان بەگیانیان

لەپێناوی سەرخستنی خەباتی پارتەکەیاندا قوربانیاندا کە ئەمە لەو قۆناغەدا شتێکی چاوەڕواننەکراوبوو، هەروەك ئەوەی زانراوبێت، هیچ ڕێکخراوو پارتێکی سیاسی تری تورکیا چ کورد یان چەپە تورکەکان نمونەی ئەو قوربانیانەیان لەزیندانەکاندا نەدا، بەتایبەت بەرخودانەکانی (مەزلوم دۆغان، محەمەد خەیری دورموش و کەمال پیر و.. تاد) لە مێژوی پەکەکەدا بەناوبانگن.(١٣) ڕوییەکیتری ئەم بونیاد و پێکهاتە کۆمەڵایەتییەی پەکەکە، ئەوەیە کە دەستەی دامەزرێنەر زۆربەیان خەڵکانی خوێندەوار و قوتابی زانکۆکان بوون، بەتایبەت زۆربەیان لە کۆلێژی زانستە سیاسییەکانی زانکۆی ئەنقەرە بوون کە بیهێنینە پێشچاوی خۆمان و بەراوردی بکەین، لە ساڵانی حەفتاکان کەسێك لە زانکۆییەکی پێشکەوتووی وەك ئەنقەرە و بەدیاریکراویش لە کۆلێژی زانستە سیاسییەکان و لەنێو گەرمەی خۆپیشاندان و مانگرتنی قوتابیانی زانکۆکانی تورکیا کە بە جووڵانەوەی خوێندکاری لەو ساڵانەدا بەناوبانگە، دەبێ چ ئاستێکی بەرزی هۆشیاری سیاسی و ئابووریان هەبووبێت، وێڕای ئەوەی کە خۆشیان چەپ بوون و لەنێو تێزە فیکری و شۆڕشگێڕییەکانی مارس و ئەنگلز و لینینەوە سەریاندەرهێنابوو! لەم نێوەندەدا ناکرێ ڕۆڵ و ئاستی هەریەکە لە عەبدوڵلا ئۆجەلان و حەقی قەرار و کەمال پیر لەبیربکەین، بەتایبەتیش ئۆجەلان، چونکە ئەو دوانەکەیتر کوژران، چونکە لەڕاستیدا ئۆجەلان تەنها خەباتگێڕێکی سیاسی نەبوو، بەڵکو تائێستاش وەك بیرمەند و داڕێژەری فیکری و سیاسیی و چەکداری پەکەکە لەقەڵەمدەدەرێت و ئەو کتێب و نوسینانەی هەیەتی بەڵگەیەکی بەرچاوی ڕۆڵی ئەوە کە تایبەتمەندێتییەکی فیکری و فەلسەفی بەخشیوەتە پەکەکە کە ئەمەش سەرچاوەکەی بریتییەلە بونیادی کۆمەڵایەتی پارتەکە و تایبەتمەندێتییەکی گرنگە.

**دووەم: ئامادەیی ژن وەك ڕەگەزێکی کارا:**

ئەگەر ئامادەیی ژن وەك ڕەگەزێکی سیاسی لە خەباتی پارتە سیاسییەکانی پارچەکانیتری کوردستاندا بوونی هەبێت، ئەوا ئەم تایبەتمەندێتییە لای پەکەکە تەواو جیاوازە و هەر لە دەسپێکی ڕاگەیاندنی پارتیبوونی پەکەکەوە لە ساڵی ١٩٧٨ هەستپێدەکرێت کە دووان لە دەستەی دامەزرێنەری ژن بوون کە تائێستاش یەکێکیان لە ئەنجوومەنی بەڕێوەبردنی ئەو پارتەدا ماوە بەناوی (ساکینە چانسز).(١٤) پشتبەستنی پەکەکە بە ڕەگەزی ژن پشتبەستنێکە لەسەر بنەمای ئازادکردنی ژن لە دابونەریت و ئەوەی خۆیان لە ئەدەبیاتی پارتەکەیاندا ناویانلێناوە کۆتوپێوەندە کۆمەڵایەتییەکان، بەجۆرێ بە چەمگە شۆڕشگێڕییەکەی پەکەکە، ڕوانینێکی

رزگاریخوازانەی ژنە و بەشدارییپێکردنیەتی لە پرۆسەیەکی رزگاریخوازیی فراوانی نەتەوەییدا کە ئەم خەسڵەت و تایبەتمەندێتی و روئیاییە بەئێستاشەوە لای زۆربەی پارتە سیاسییەکانی پارچەکانیتری کوردستان بەدیناکرێت. هەربۆیە پەکەکە توانیویەتی لەڕێگەی بەشداری ژنەوە لە خەباتە سیاسییەکەیدا لە سەرەتای دامەزراندنییەوە ببێتە خاوەنی جۆرێك لە دونیابینی سیاسی و کۆمەڵایەتی و فەلسەفی ژن، لەڕووی ئەرك و مافەکانییەوەو پەکەکە توانی سوود لە توانا جەستەیی و عەقڵی هەزاران نەك تەنیا ژنی کورد، بەڵکو ژنی ئەو نەتەوانەیتریش کە هاوسۆزی کێشەی کورد و پەکەکەن چ لە چوارچێوەی پارتە سیاسییەکەدا بن، یاخود لە دەرەوەی پارتەکە و تەنانەت لە ئەوروپا و وڵاتانیتر هاوشانی هاوسەنگەرەکانیان خەباتدەکەن.

**سێیەم: بایەخدان بە میدیا:**

پەکەکە بە حوکمی پێشکەوتنی ئاستی هۆشیاری سیاسی هەرز و توانی سوود لە میدیا وەك ئامرازێکی تەکنەلۆژی کاریگەری سەردەم لە خەباتی سیاسی خۆیدا وەربگرێت و بتوانێت لە ماوەییەکی کەمدا پرسی کورد بگەیەنێتە زۆربەی نێومالّی کورد و ناوەندەکانی بڕیاردانی سیاسی لەجیهاندا، بەدیاریکراویش کردنەوەی کەناڵی ئاسمانی (MED-TV) کە بەیەکێك لە تایبەتمەدێتییە هەرەدیارەکانی خەباتی سیاسی پەکەکە هەژماردەکرێت، چونکە یەکەمین پارتی سیاسی کوردی بوو کە دەرك بەبایەخ و گرنگی و پێویستی ئەوجۆرە میدیایە بکات لەپێناوی تەوزیفکردنی خەباتی سیاسی خۆیی و پرسی نەتەواییەتی کوردیدا، لەبەرئەوەی سوود و کەڵکەکانی ئەو میدیایە فرەبوون و لە ژیانی سیاسی و خەباتی پەکەکەدا لە ماوەییەکی کەمدا رەنگیدایەوە و پەکەکە و پرسی کوردی بردە قۆناغێکی پێشکەوتوو پەرەسەندووەوە.

ئەوەش لەبەرئەوەی بۆ نێوخۆی کورد ئەو کەناڵە ئاسمانییە ئامرازێك بوو نوێکردنەوە و بەرزکردنەوەی ئاستی هۆشیاری نەتەواییەتی مرۆڤی کورد لەهەموو پارچەکانی کوردستان و لە ئەوروپاش،[١٥] هەروەها کردنەوە و رەخساندنی دەرفەت و کەناڵێکی سیاسییانەی سەردەمیانە بوو لە خەباتی مەدەنی و سیاسیدا بەڕووی ئەوروپا و ناوەندەکانی بڕیاری سیاسی لەجیهاندا کە تائەو قۆناغە ئامرازێکی جیهانی وا بەنیسبەت جووڵانەوەی رزگاریخوازیی کوردییەوە نەبوو.

**چوارەم: بایەخدان بەکوردانی تاراوگە:**

تایبەتمەندێتییەکیتری پەکەکە ئەوەیە هەر لە سەرەتاوە بایەخی بەو کوردانەدا، کە هەرییەکە و بەهۆکارێك لە پارچەیەکی کوردستانی بندەستی عێراق و سوریا و تورکیا و ئێران بەرەو وڵاتانی ئەوروپا کۆچیانکردبوو. بۆیە لە ماوەییەکی کەمدا پەکەکە توانی جووڵانەوەیەکی جەماوەری و مەدەنییانەی گەورە لەم کوردانەی تاراوگە دروستبکات، بەتایبەت لە وڵاتی ئەڵمانیا کە لەلایەك وەك سەرچاوەی دارایی و بژێوی پارتەکە و لەلاییەکیتریشەوە وەك شێوازێکی نوێی خەباتی سیاسی و مەدەنییانەی سەردەم سوودی لێبینین، بەتایبەتیش ئەو خۆپیشاندان و گردبوونەوە جەماوەرییە بەرفراوانانەی لە زۆربەی وڵاتانی ئەوروپا ئەنجامیدەدان بۆ پشتگیری لە خەباتی پەکەکە و چارەسەرکردنی پرسی کورد، لەکاتێکدا زۆربەی پارتە سیاسییەکانیتری پارچەکانیتری کوردستان خەمسارد و کەمتەرخەمبوون لەمەدا و نەیانتوانیوە وەك پێویست سوود لەو وزە مرۆییەی کوردانی تاراوگە وەربگرن. سەرباری ئەوەی ئەو هێزە مرۆییەی کورد لە تاراوگە بەدیوێکیتردا ئامرازێکی گرنگی ناساندنی کولتور و ئەدەب و هونەر و مێژوی نەتەوایەتی و خەباتی رزگاریخوازی کورد بوو، بە خەڵکانی بیانی لەو وڵاتانەی تێیدانیشتەجێببوون، لەرێگەی سازدانی فێستیڤاڵی نەتەوەیی و ئاهەنگەکانی جەژنی نەتەوەیی نەورۆز و سەری ساڵی زایینییەوە.

•••

## پەراوێز و سەرچاوەكان


١. د. عماد الجواهري: النظام السياسي التركي، ماخوذ من كتاب د.ابراهيم خليل احمد واخرون: تركيا المعاصرة، مركز الدراسات التركية، ص(١٠٣-١٠٤)، د.ابراهيم د.خليل احمد و د.خليل علي مراد: ايران وتركيا، دراسة في التاريخ الحديث والمعاصر، دار الكتب للطباعة والنشر، الموصل، ١٩٩٢، ص(٢٩٢-٢٩٣).

٢. صلاح سعدالله: المسالة الكردية في تركيا،ط١، مطبعة (شفيق)، بغداد، ١٩٩١، ص١٥، و د.عماد احمد الجواهري: البنية الاجتماعية في تركيا، ماخوذ من كتاب تركيا المعاصرة، ص١٥٥.

٣. د.احمد نوري النعيمي: ظاهرة التعدد الحيزبي في تركيا (١٩٤٥-١٩٨٠)، دار الحريية للطباعة، بغداد، ص٢٠٢، و ر.يورك اوغلو: تركيا حلقة ضعيفة في السلسة الامبرياليية، ترجمة (فاضل لقمان) دار ابن رشد للطباعة والنشر، بيروت، ١٩٧٩،ص(٣٢،٤٧).

٤. كودەتا سەربازییەكان ٥٠ ساڵ توركیایان بەرەو دواوە برد، ئا: باران كایا، گۆڤاری (دۆسێی توركیا)، ژ(٢) مایسی ٢٠٠٥، ل(١٢٠-١٢١).

٥. د.ابراهيم خليل احمد: الاحزاب السياسيية في تركيا، ماخوذ من كتاب د.ابراهيم خليل احمد واخرون: تركيا المعاصرة، ص(١٧٨-١٧٩).

٦. د.حنا عزو بهنان: قضية حزب العمال الكردستاني وانعكاساتها على العلاقات العراقية – التركية ١٩٨٤-٢٠٠٧، مجلة(دراسات اقليمية)، عدد(٥)، النسخة الالكترونية.

٧. ماجد خەلیل: رێكخستنە سیاسییەكانی باكووری كوردستان، ١٩٦٠-١٩٨٠، ل(٤-٤٥).

٨. نبيل الملحم: سەرۆك و گەل، حەوت رۆژ لەگەڵ ئاپۆ، تشرینی دووەمی ١٩٩٩، ل٤٩، حەسەن جوودی: مێژووییەك لەئاگر، ل(٧٦-٧٧).

٩. د. ابراهيم الداقوقي: اكراد تركيا،ط٢، دار ئاراس للطباعة والنشر، اربيلن ص١٨٣، ئۆجەلان: عەشقی كورد، و. (ئەستێرە عەبدولجەبار)، چ١، ٢٠٠٩، ل(١٨٩،١٨٥).

١٠. حەسەن جوودی: سەرچاوەی پێشوو.

١١. ئۆجەلان، هەڵبژاردە، ل(٦٨،٦٦).

١٢. ميخائيل. م. جوونتر: الاكراد ومستقبل تركيا، ترجمة (د.سعاد محمد ابراهيم خضر)، ٢٠٠٧، السليمانية، مركز كردستان للدراسات الاستراتيجية، ص٤٠.

١٣. مظلوم دوغان: المقاومة حياة، نصوص المرافعات (مظلوم دوغان، محمد خيري دورموش، كمال بير) اعضاء اللجنة المركزية لحزب العمال الكردستاني، ماخوذة من محاكمتهم.

١٤. ئۆجەلان: عەشقی كورد، سەرچاوەی پێشو، ل١٧٣.

١٥. كریستینا كۆیڤۆنەن: جەنگی شاراوە لە باكووری كوردستان، و. (د.یاسین سەردەشتی)، چ١، چاپخانەی (روون)، سلێمانی، ٢٠١١، ل(٢٠٧-٢٠٩).

# تیْڕوانینی هیگلْ بۆ دەوڵەتی نەتەوەیی و شویْنی کورد لە نیْو ئەم تیْڕوانینەدا

حەمە غەریب حەمە تۆفیق

**داری ئازادی بە خویْن ئاونەدریْ، ئەبەد بەرناگریْ**

**سەربەخـــۆیی بیْفیداکاری ئەبەد سەرناگریْ**

ئیْمە وامان بەباشتر زانی ئەم باسە دابەشی سەر چەند تەەوەریْکی سەرەکی بکەین، چونکە هیگلْ Hegle [١]هەلْگری پەیامیْکی فەلسەفییانەی هەمە چەشنەو فرە ڕەهەند بووەو تەنها لەبازنەی هزری فەلسەفەی ویْناگەرایی ویْناگرایی c·nseptualism وئایدیالیستیIdealism (المثالية) تاکرەهەندانە، یاخو دفەلسەفەکاریْکی هەستگەرا و Censualismزانستی کۆمەڵناسی ئەنتۆلۆژیایی (الانتولوجیا)Ethnology نەبووە یان وەك هەندیْك زیاتر قسەیان لەسەر لۆجیکی Logic هیگلْ کردووە هەروەکی ئەوەی کە بەتەنیْ فەلسەفەکاریْکی لۆجیکی بیْت، هەرچەندە هەمووان بەچاکی ئەوە دەزانین کە لۆجیك بەردی بناغەی فەلسەفەکەی هیگڵە، کە لەڕاستیدا مەزهەبە فەلسەفییەکەی هیگلْ بەجۆرە دابەشدەبیْت کە بریتییەلە لۆجیك، فەلسەفەی سروشتی، فەلسەفەی رۆح یان فەلسەفەی ئەقلْ[٢] لەکاتیْکدا فەلسەفەی میْژوو وەك ناسنامەی هیگلْ وایە، ئەوانەی دەیانەویْت قسەلەسەر فەلسەفەی میْژوو بکەن ناتوانن لە دەرەوەی هیگڵەوە کارەکەیان تەواوبکەن، لەبەرئەمە پیْمانوایە کە لە بابەتیْکی تایبەت و دیاریکراویشدا کە بەشیْوەیەك لەشیْوەکان پەیوەندیداربیْت بە هزری فەلسەفییەوە ئیدی جیاوازی نییە ئەو هزرە چ کایە و مەیدانیْکی لەخۆگرتبیْت ئەوا هیگلْ قسەیەکی بۆکردن هەیە و لەحالْیواشدا نووسەر بۆ دەولْەمەندکردنی بابەتەکەی و هەمیش بۆ زیاتر ئاشناکردنی خویْنەرەکانی، باشترە کە ئاماژە بەهەندیْك لە تەوەر و سەرباسە فەلسەفییەکانی فەلسەفەکەی هیگلْ بکات، ئیْمەش ئەمە دەکەین، چونکە بابەت و تەوەرە فەلسەفییەکان تەواوکاری یەکترن.

**تەوەری یەکەم: فەلسەفەکەی هیگڵ**

لای هیگڵ Hegle ئەمە گرنگە کە مرۆڤ لەوە تێبگات کە ئەو لەبەرامبەر بیر راوەستاوە، بیرۆکەشIdea یان ئەقڵ لەگەڵ ئەم کاتیگۆریانەداCategoria بریتینلە چەمکگەلی وەکی بیر (فکر) Thoughtو وێناکردن (التصور) Conseptualism کە لەڕاستیدا ئەمانە بابەتی سەرەکی فەلسەفەن، بەلاّم ئیدی ئەمە راستە کە یەکەمین کاتیگۆریا Categories بریتییەلە بیر، چونکە هیگڵ پێیوایە بیر قووڵترین قوولاّیی هەموو شتەکانە، بیر ئاغا و سەرداری سەرجەم داهێنانەکانە، رێپیشاندەر و مامۆستایە و لە دەرەوەی بیر دنیای مرۆڤەکان جگەلە تاریکستانێك بەولاوە هیچیدیکە نییە، بیری فەلسەفیش بیرێکی هەمەکییە (الکلی) Univesal [٣]، بەرهەمی بیرکردنەوەش هەر بیرە، دەکرێت ئەم بیرە خودیی (ذاتی) Essential,Subjective یان بابەتی (موضوعی) Objectivity بێت، گەر لەڕووە بابەتەکەیەوە سەیریبکەین، ئەوا ئەو بیرانە دەبینینەوە کە بەبیرە هەمەکییەکان (الافکار الکلیة) Universal Ideas ناودەبرێن. راستی فەلسەفەکەی هیگڵ هەروەکی هیگڵ وایدەبینیّ کە مێژوو تەنها هەرئەوەیە کە ئەو بیرە گەردوونییە دەکاتەوە لەزەماندا، ئەو پێیوابووە ئەقڵ و ئاوەز جیهان بەڕێوەدەبات، لای هیگڵ تێگەیشتنێکی تایبەتی هەبووە بۆ هزر، وەك گوتراوە یەکەمین کەس کە بەوشێوە دروستە لە هزر تێگەیشتووە "ئەنکساگۆر"Anaxagore بووە، ئەو بەشێوەیەکی فەلسەفییانە بڕیاریداوە کە (ئاوەز جیهان بەڕێوە دەبات) بزاوتنی سیستەمی هەسارە هەڵواسراوەکان بەپێی یاسای جێگیر بەڕێوەدەچن. هیگڵ فەلسەفەکارێکی ئایدیالیستی بووە، بەلاّم هەروەکی فەلسەفەکارانی فەڕەنسی دەگەڕایەوە بۆ رەوشی کۆمەلاّیەتی کە بنچینەیەکی قووڵە لە ژیانی گەلاندا، هەربۆیە هیگڵ دوانەکەوتووە لە سەردەمی خۆی، بەلاّم بەسەریشیدا سەرنەکەوتووە. هیگڵ هزر دەکاتە دواپاڵنەر بۆ رەوتی مێژوو، کاتێك گەلێك لەپێشکەوتنیدا لە پلەیەکەوە بۆ پلەیەکیتر، بەلاّم بەرهەمی نەبێت بۆ هزری رەها یان گەردوون، ئەو گەلە تەنها دەبنە کەرەستە و پلەیەکی بەرزتر وەردەگرێت لەگەشەکردنەکەیدا[٤]. هیگڵ هانی بایەخدانێکی زیاتریداوە بە مێژوو، بەوەی وەکو دەرکپێکردنێکی قووڵتری واقیع وێنابکات لەچاو زانستی سروشتیدا، سەبارەت بە بۆچوونی ئەو دەربارەی دەوڵەتی نەتەوەیی، هیگڵ ئەوەی رەتکردووەتەوە کە گوایە ئایدیالیستی ئەوەیە مرۆڤ شتە هەستەندەکان (المحسوسات) Sensiple قبووڵنەکات و شتە هەستپێکراوەکان جگەلە شتگەلێکی خودی و جیهانی هەستییانە بەولاوە هیچ نین، واتە

شته هەستپێكراوەكان تەنها لەنێو هەست و ئیحساساتی مرۆڤەكاندا بوونیان هەیە، بەلاّم ئیدی دیارە كە هیگلّ فەلسەفەكارێكی ئایدیالیستییە و Idealism خاوەنی فەلسەفەیەكی لەمجۆرەیە كە بیرۆكە رەهایە (المطلق) The Absolute، بیرۆكەش Idea لای هیگلّ رێك بەرامبەرە بە بیرۆكەی فۆرمە Form لای ئەفلاتونPlato [٥].

## هیگلّ و فەلسەفەی رۆح

فەلسەفەی رۆح ئەو تاجەیە كە لەسەر فەلسەفەكەی هیگلّ رۆنراوە، چونكە بیرۆكە (فكرة) Idea لەرۆحدا دەگاتە ئەوجی خۆی، بیرۆكەی لۆجیكی و سروشت دوو مەرجن بۆ بەرجەستەبوونی رۆح، هیگلّ مانایەكی قوولّی دەرهێناوە بۆ هەموو جۆرەكانی دیاردەی فیكر، لەبەرئەمە فەلسەفەیەكی بۆ شارستانییەتی مرۆڤایەتی بەرهەمهێناوە، بنەڕەتەكانی فەلسەفەی زانستی مرۆڤایەتی دامەزراندووە.

## تەوەری دووەم: مێژووی فەلسەفە لە تێڕوانینی هیگڵەوە

**یەكەم: فەلسەفەی مێژوو** Philosophy of History: راستییەكەی نابێت لە بەكارهێنانی تێرمە لێكنزیكەكاندا غافلّگیربین، چونكە تێرم یان میتۆدی فەلسەفەی مێژوو لەگەلّ مێژووی فەلسەفە بەجۆرێك لەیەكترەوە نزیكن كە هەندێكجار ئەوانەی قسە لەسەر ئەم بابەتانە دەكەن تێكەلّوپێكەلّیان دەكەن، بۆیە ئێمە لە سەرەتاوە وریایی دەدەین كە خوێنەر بەیەك شتیان نەزانێت. لە چاخەكانی كۆن و سەردەمە دێرینەكاندا كە بە مێژوو ناوزەددەكرێت مێژوو رۆلّی كاریگەری بینیوە بۆ بەرەوپێشەوەچوونی كۆمەلّگە مرۆییەكان، هەموو ئەو گەل و نەتەوانەش كە نرخ و بەهای مێژوویان زانیوە لەئەنجامدا بوونەتە خاوەنی مێژوو، بەپێچەوانەشەوە ئەو نەتەوانەی كە ئاوەڕیانلێنەداوەتەوە و نرخ و بەهاكەیان نەزانیوە ئەوا بوون بە پاشكۆی مێژوو، بوون بەبندەستی گەل و نەتەوەكانیدیكە و بە ئایین و كلتور و نەریت و تەنانەت لە زۆر جیگای دنیادا زمانی نەتەوەسەردەستەكانیشیان گرتووە، بەمجۆرە مێژوو ئەو شمشێرە تیژەیە كە گەر بەفریای خۆت نەكەوتی ئەوا دووكەرتتدەكات.

**دووەم: مێژووی فەلسەفە** History of philosophy:

هەرچەندە ئەم بابەتانە کەمێك لە ئەسڵی مەبەست دوورماندەخاتەوە، بەلاّم ناکرێت لە باسی "هیگڵ"دا قسەلەسەر مێژووی فەلسەفە نەکرێت کە وەك باوکی ئەم کایە ناسراوە، "هیگڵ دەڵێ مێژووی فەلسەفە - یەکەمجار- پێویستە ئەو رووداوانە بگێڕێتەوە کە لەناو زەمەندا روویانداوە و ئەو رووداوانەی کە لەلایەن گەلەکان و تاکەکەسەکانەوە روویانداوە، ئەم رووداوانە دروست روویانداوە، بەلاّم بەپێی ئەو بەدوایەکداهاتنەی کە لەزەمەندا هەیانە، روویانداوە یان بەپێی ناوەڕۆکەکانیان، دواتر لە دەرکەوتنی رووداوان و بەدوایەکداهاتنی زەمەنی دەکۆڵێنەوە، بەلاّم ئەو چەمکەی کە لێرەدا دەمانەوێت یەکەمجار لێکۆڵینەوەی لەبارەوەبکەین، پەیوەندی بەخستنەڕووی ناوەڕۆکەوە هەیە، ئەو بیرانەن کە کرۆکی فەلسەفە شێوەگیردەکەن، نەك کردار و رووداوە دەرەکییەکان یان خۆشییەکان یاخود هەڵچوون و مەبەستەکان. لەکاتێکدا بیرە پیشاندراوەکان جگەلە کۆمەڵە رایەك هیچیتر نین، راوبۆچوونە فەلسەفییەکانیش تەنها کۆمەڵە راوبۆچوونێکن بە ناوەڕۆکێکی تایبەتەوە پەیوەستن، بابەتی گونجاوی فەلسەفەش بە دەوری خوا و سروشت Natureو گیان- رۆح Spirit دەسووڕتەوە. ئالێرەدا دەگەین بە باوترین راوبۆچوون لەبارەی مێژووی فەلسەفەوە، کە بەجۆرە وەسفی ئەم مێژووە دەکات کە بریتییەلە ریوایەتکردنی ژمارەیەك لە راوبۆچوونی فەلسەفی، بەوشێوەیەی کە لەزەمەندا خراونەتەڕوو کە ئێمە بە (راوبۆچوونەکان) ناویاندەبەین. لێکۆڵینەوەی مێژووی فەلسەفە، لێکۆڵینەوەیە لە فەلسەفە خۆی و ناکرێت جگەلەمە شتێکیتربێت، ئەوەی کە لە مێژووی زانستی سروشتی وبیرکاری.. هتد، دەکۆڵێتەوە دەبێت شارەزایی لە زانستی فیزیا و بیرکاری.. هتد، هەبێت، بەلاّم بۆ زانینی بەرەوپێشچوونی فەلسەفە و زنجیرەکەی بەوەی کە پەرەسەندنی بیرۆکەیە Idea بێگومان هەردەبێت مرۆڤ شارەزای بیرۆکە بێت.

**تەوەری سێیەم: بەرجەستەبوونی رۆحی نەتەوە لەدەوڵەتدا لە روانگەی هیگڵەوە**

هیگڵ گرنگییەکی زۆری داوەبە بابەتە سیاسییەکان، چونکە ئەو لەسەردەمێکدا ژیاوە کە بە سەردەمێکی مێژوویی حسێبدەکرێت کە سەردەمی شۆڕش و ئیمپراتۆریا و سەردەمی مافەکانی مرۆڤیش بووە، هیگڵ بە سروشتی خۆی سوربووە لەسەر چاودێریکردنی رووداوەکانی سەردەمی خۆی تەنانەت گوتویەتی رۆژنامە وەکی ویرد و دوعا و نزاکانی بەیانی وایە و دەبێت

هەموو بەیانیانێك بخوێندرێنەوە. هیگڵ ژمارەیەك نامێلکە وگوتاری سیاسی نووسیوەتەوە و ساڵی ١٨٩٢ بابەتێکی دەربارەی دەستوری ئەڵمانیا نووسیوەتەوە کە هەرچەندە تاکو ساڵی ١٨٩٣ بلاْویشنەکراوەتەوە، ئەو سەرنووسەری رۆژنامەیەکیش بووە، نامێلکە و گوتارەکانی لەرۆژنامەکاندا نیشانەی ئەوەن کە زۆرگرنگی بە بابەتە سیاسییەکانی رۆژگاری خۆیداوە.

هیگڵ بانگەشەی ئەوەیدەکرد کە جیاوازی لەنێوان کایە پراکتیکییەکان و کایە هزرییەکاندا نەکرێت، چونکە بەپێی فەلسەفەکەی ئەو ئیرادە بۆخۆی جۆرێکە لە هزر، ئیرادە هەر فیکرە و بە واقیع تەعبیری لێدەدرێتەوە، بەلاّم ئەوکەسانەی کە بەوجۆرە تەماشای هزر دەکەن کە توانایەکی بەشەکییە و لە ئیرادە جودایە، پێیانوایە فیکر ئەدای ئیرادەدەکات بەتایبەتی ئیرادەی چاکەخوازی. ئەوانە بەم تێڕوانینەیان بۆ ئیرادە ئەوە دەسەلمێنن کە هیچ شتێك دەربارەی سروشتی ئیرادە نازانن. هیگڵ تێڕوانینە سیاسییە گرنگەکانی خۆی لە کتێبی (بنەماکانی فەلسەفەی یاسا)دا فۆرمەلەکردووە، ئەم کتێبە ساڵی ١٨٢١ بلاْوکراوەتەوە، لەم کتێبەدا بەشێوەیەکی تۆکمە و گرنگ کایەکانی سیاسەت و ئەخلاق و دەروونناسی و ئیرادە و فەلسەفەی مێژووی پێکڕا گرێداوە بەیەکترەوە، لە پێشەکییەکەی (فەلسەفەی یاسا)دا زۆر بەڕوونی ئاماژەدەکات بۆئەوە کە ئەو مەبەستی ئەوەنییە بونیاتی دەوڵەتێکی نمونەیی بنێت، چونکە ئەرکی فەلسەفە ئەوەیە لەوشتانە تێبگات کە لەحالێحازدا و هەنووکە بوونیان هەیە، چونکە ئەوشتەی کە لەحالێحازردا هەیە ئەوە بۆخۆی ئەقڵە، ئەو راڤە ئەقڵییەی کە لەم کتێبەیدا پێشنیاریکردووە وەکی گونجاندنێك وایە لەگەڵ حەقیقەتی هەنووکەیی و واقیعییانەدا. هێگڵ پێیوایە لەناو مێژوودا دەرکەوتنی رۆح بەتەواوەتی لەسەر دەرکەوتنی ئازادی سیاسی وەستاوەتەوە. ئازادی سیاسیش، واتە ئازادی لەدەوڵەتدا، کاتێك دەستپێدەکات کە تاکەکەس وەك تاکەکەس هەست بەخۆی بکات. بیرکردنەوەی فەلسەفی یەکسەر بە ئازادی سیاسییەوە پەیوەستدەبێت، ئەمەش لەوەوەیە کە بەهەمانشێوە بەوەی کە بیری بابەتی هەمەکییە، دەردەکەوێت، ئەمە بیرێکە بەوەدەناسرێتەوە کە شتێکی هەمەکییە(٦).

لای هیگڵ یەکەمین بەرجەستەبوونی رۆحی کۆمەلاّیەتی لەخێزاندا دەبێت، رۆڵی بنەڕەتی خێزانیش پەروەردەکردنی نەوەکانە. ئەمەش یەکەمین رواڵەتی ئەخلاقییانەیە، دووەمین بەرجەستەکردنیشی بریتییەلە کۆمەڵگەی مەدەنی، لە کۆمەڵگەی مەدەنیشدا خەڵکی بەپێی بەرژەوەندییەکانیان کۆدەبنەوە، لەم گردبوونەوانەدا هەندێکجار دەکەونە پەیوەندی باش و

هەندێکجاریش دەکەونە دۆخی بەرەنگاربوونەوە و ململانێوە. سێیەمین بەرجەستەکردنی رۆح ئەوەیە کە لەدەوڵەتدا دەبێت، هیگڵ پێیوایە ئەم تێڕوانینە بۆ دەوڵەت وەکی ئامرازێك بۆ پارێزگاریکردن لە ئازادییەکان و بەرژەوەندییەکانی تاك، ئەم تێڕوانینە تێڕوانێکی بەشەکی و ناتەندروستە. ناشکرێت بەتەواوەتی رەتبکرێتەوە چونکە ئەمە لایەنێکی حەقیقەتانەی دەوڵەتە، ئەم لایەنە لای هیگڵ بە کۆمەڵگەی مەدەنی یان بۆرژوازی ناوزەدکراوە(٧).

## تەوەری چوارەم: دروستبوونی دەوڵەتی کوردی لەنێوان خەون و واقیعدا و شوێنی لەنێو فەلسەفەکەی هیگڵدا

### سیاستی حیزبیانە تاچەند هۆکارە بۆ دواکەوتنی دروستبوونی دەوڵەتی کوردی

لە نیشتیمانی ئێمەدا ئەوەندەی بایەخ بەسیاسەتکردن دەدرێت ئەوەندە بیر لە دەوڵەتداری و دروستکردنی دەوڵەت ناکرێتەوە، لەهەر شوێن و لەهەر کاتێکدا باسی دروستکردنی دەوڵەتێکدەکرێت بۆ کورد ئەوا وەڵامەکە ئامادەیە، ئەویش ئەوەیە زەمینەسازنییە بۆ دروستکردنی دەوڵەت، کاتی دروستکردنی دەوڵەت نەهاتووە، جیۆپۆلەتیك و هەڵکەوتەی جوگرافیایی کوردستان شیاونییە بۆ ئەم خواستە - ئەگەر دروستیش بێت وەك خواست ناوبرێت - دروستکردنی دەوڵەت خەون و خەیاڵە، فیدراڵییەت سەروزیادە.. هتد. هەڵبەتە ئەوەی کە گوتمان لە نیشتیمانی ئێمەدا هەموو شت بەسیاسیکراوە و هەموو بابەتەکان رەهەندێکی سیاسییان وەرگرتووە، ئەمە راستییەکە کە کەس ناتوانێت نکوڵیلێبکات، بەلآم خۆئەمەش راستە کە سیاسەت رێگایەکە بۆ دەسەڵات، یەکێك لە تەبیعەتەکانی سیاسەت ئەوەیە کە هەر هەموو کایە ئایینی و دنیاییەکان بەناوی هاوکاری و هاوئامانجی و یەکێتی نەتەوەیی و چینایەتی و پیشەیی بخاتە خزمەتی خۆیەوە، تادەگاتە دەسەلآت، هەرکە دەگاتە دەسەلآت ئیدی حەزی لەهیچ شەریکایەتییەك نامێنێت، بۆیە چەندین بیریاری سیاسی بانگەشەی جیاکردنەوەی دەسەلآت یان دروستتر ئەخلاق و سیاسەت و هەروەها دین و سیاسەتیشیان کردووە. ئێمە گرفتی ئەوەماننییە سیاسەت بووەتە باوی سەردەمەکەمان، گرفتی ئێمە ئەوەیە کە لە کایە چارەنووسسازەکانیشدا سیاسەت دەبێتە رێگر و پێش بە خەونە پەمەییەکانی گەل دەگرێت، چونکە تێڕوانینی سیاسییەکان زۆرتر لە بەرژەوەندییە تایبەتییەکانەوە سەرهەڵدەدات نەك ئەوەی قوربانی بە بەرژەوەندییەکان بدرێت لەپێناوی ئامانجە ستراتیژی و نەتەوەییە گرنگەکاندا، دیسان

سیاسەتکردن لە نیشتمانی ئێمەدا لەسەر بنەمایەکی نەتەوەییانە ناکرێت ئەوەندەی بۆ پاراستنی پێگەی سیاسی و دەسەڵاتدارێتی کەسە کارێزماکانی ناو کۆمەڵگەیە، ئەمە بابەتێکە لەدوای هەرەس و رووخانی خەلافەتی عوسمانییەوە کاری لەسەردەکرێت و هەرئەمەش یەکەمین کۆسپی پێشدەمی یەکنەگرتنی گەلە لەلایەك و زەمینەسازنەبوونە بۆ دروستکردنی دەوڵەتێك بۆ کورد لەلایەکیدیکەوە. تۆ سەرنجبدە کاتێك قسەلەسەر ئەم بابەتە هەستیارە دەکرێت گوتاری سیاسییەکان و ژمارەیەکی زۆر لە رۆشنبیرانیش هیچ جیاوازنییە لە گوتاری دوژمنەکانی گەل و دەبینیت لە خاڵی سەرەکیدا کۆك و تەبان کە ئەم دەوڵەتە لەسەر خاکی کوردستان مەحاڵە و زەمینە لەبارنییە بۆئەم دەوڵەتە.

هەر دەسەڵاتێك دوای جێگیرکردنی دینگەکانی خۆی ئەوا هەوڵی ئەوەدەدات کە وێنا و بۆچوونە سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانی خۆی لە چوارچێوەی پلان و بەرنامەیەکی دیاریکراو و تایبەتدا بخاتە پێشچاوی خەڵکی، دەسەڵات هەوڵی داسەپاندنی ئەو ئایدۆلۆژیایە دەدات کە خۆی بڕوای پێیەتی، تابتوانێت رێگەنادات هیچجۆرە پێڕەو و ئایدۆلۆژیایەکیدیکە لەنێو کۆمەڵگەکەی خۆیدا کاری پێبکرێت و پەرەبسێنێت، ئامانجی حیزبایەتیش هەرئەمەیە، بەڵام کورد ئەوەندەی کەڵکی لە حیزبایەتی وەرگرتووە لە بواری بەهێزکردنی پێگەی سیاسیدا ئەوەندە ئەم حیزبە نەبووەتە ئامرازێك بۆ بەرجەستەکردنی دەلالەتی دەسەڵات و سەپاندنی بەوجۆرەی کە لە بەرژەوەندی گەل و نەتەوەدا بێت، بەڵام کاری زۆر گرنگیشی ئەنجامداوە، چونکە حیزبی کوردی ئامرازێکی بەهێزبووە بۆ وشیاری نەتەوەیی و نیشتمانی و بەرخودان، بۆیە کاتێك ئێمە بە مانایەك لە ماناکان ستایشی حیزب ناکەین ئەوە بەهۆی ئەوەیە کە لە سەروبەندی کۆتایی دەسەڵاتی سوڵتانەکانی عوسمانییەوە کورد سیاسەتدەکات و حیزب دروستدەکات، بەڵام یەك سەدە تێدەپەڕێت و هێشتا ئامانجی سەرەکی لە دروستکردنی حیزب بەدەستنەهاتووە کە ئەویش دروستکردنی دەوڵەتێکە بۆ کورد.

ئەزموونی رابردوو ئەوەی سەلماند کە خیتابی حیزبی، ئینتیمای حیزبی ناوچەیی بچووك بچووك، گەورەترین بەربەستبووە، ئەمە ئەو گرفتەبووە کە ئێمە ئیستا پێوەیدەناڵێنین، گەورەترین قەیران و کارەساتە لە هەرێمی کوردستاندا، چونکە پێویستە لەپشتی ئەو کورسییانەوە و لەپشتی ئەوپارە و کەس و حوکمدارانەوە، بیرکردنەوەیەك هەبوایە کە بریتییەلە بیرکردنەوە لە دروستکردنی دەوڵەت لەئاییندەدا [٨] ئەوەی پێشەوە تێڕوانینی دکتۆر زانا رەئوف مەنمی پسپۆڕ

له بواری یاسای دەستووری و ئەندامی پەرلەمانی کوردستان (٢٠٠٩-٢٠١١) بوو، باس له گرنگیی بیرکردنەوە له دروستکردنی دەوڵەت دەکات لەم قۆناغەدا و نەبوونی ئینتیمای تاك بە یەکێك له گرفتەکانی بەردەم دروستبوونی دەوڵەتی کوردستان دادەنێت و پێیوایە بەرلە دروستکردنی دەوڵەت له جوگرافیای خاکدا، پێویستمان بەوەیە له جوگرافیای ناخی تاکدا دەوڵەت دروستبکەین، بەلاّم بەپێچەوانەی ئەم تێڕوانینەی دکتۆر زاناوە لای هیگڵ ئەم رۆحە بوونی هەیە و له ئەزەلەوە رۆحی نەتەوە هەڵگری بیری ئازادی و سەربەستییە و له ئەزەلیشەوە ئەم رۆحە کە دروستبووە بەردەوام لەبەرخودااندایە تاکو ئەوەدەمەی خۆی لە دەوڵەتی نەتەوەییدا دەبینێتەوە و هەموو گەل و نەتەوەیەکیش ئەم هێز و توانایەی تێدائەفرێندراوە، هەرچەند من لەگەڵ ئەم تێڕوانینەی ئەودام کە دەبێت ئەمشێوە ئینتیمابوونەی تاك بۆ زێدی خۆی و بۆ گەورەیی ئەم نیشتمانە زیندوبکرێتەوە یان هەر لە بنەڕەتەوە پەروەردەی نەتەوەیی و نیشتمانی دەستپێبکرێت و وابکرێت کە تاکی کورد بڕوای بەئەوەهەبێت کە رێگای سەرفرازی و رێگای ئۆقرەیی و ئارامی و تەنانەت مانا و دەلالەتی نەتەوەبوونیش تەنها لە بوونی دەوڵەتێکی سەربەخۆدایە، ئەمشێوە بیرکردنەوەیە لای کورد هەر هیوایەکە و نەبووەتە پرۆژەیەك بۆ کارلەسەرکردن. بەهەرحاڵ ئێمە گوتمان سیاسەت یان دەسەلاّت خۆی بە ئایدۆلۆژیا دەڕازێنێتەوەو رووە جوانەکەی خۆی پیشانی گەل دەدات، بەلاّم دەسەلاّت زۆربەی جار ئایدۆلۆژیا وەکی پەردەیەك بەکاردێنێت، دەتوانێ بەهۆیەوە زۆر حەقیقەت حەشاربدات(٩)، لەحاڵێکدا کە دەسەلاّت تووشی تەنگەژە و قەیرانی جۆربەجۆر دەبێتەوە ئەوا پەنا بۆ ئایدۆلۆژیا دەبات و دەتوانی سۆز و مەیلی جەماوەر بۆخۆی رابکێشێت، جەماوەر بەئاسانی بە دروشم و کاتیگۆریا ئایدۆلۆژیاییەکان دێتە جۆشوخرۆش و کاری مەزن ئەنجامدەدات، پرسەکە ئەمەیە تاچەند لەنێو حیزبەکانی ئێمەدا ئایدۆلۆژیا جێگیرە و ئۆرگانە جۆربەجۆرەکانی حیزبی رەنگڕێژکردووە و چووەتەنێو جومگە سەرەکییەکانیەوە؟ تاکو چەندە کەسێکی حیزبی بۆ ئایدۆلۆژیا دەمرێت کە ئەمە بۆ ئەمڕۆ زۆر گونجاونییە، بەلاّم راستییەکی حاشا هەڵنەگرە، چونکە ئایدۆلۆژیا یەکێکە لە چەمکە هەرەفراوان و فرەڕەهەندەکان و چەندین واتا و دەلالەتی هەیە، لێرەدا دەگوترێت تاکو چەندە تاکی حیزبی یان تاکی کورد کە هەواداری حیزبە سیاسییەکانی کوردە بڕوای بەئەوەهەیە کە ئەسڵ لەمرۆڤدا سەربەستی و ئازادبوونیەتی لەهەر شێوە کۆنترۆڵکردن و دەستەمۆیی و تەنانەت چاودێریکردنیشی، ئەمە نەك لەلایەن حکومەتە داگیرکارەکان و ئەتنیکە نەیارەکانەوە بەڵکە

لەلایەن دەسەلآتە لۆکاڵییەکانیشەوە، تاکی کورد بڕیاری ئەوەی داوە کە وەکی نەتەوەیەك مافی خۆیەتی دەوڵەتی سەربەخۆیی هەبێت و شەریکایەتی کەسیدیکە نەکات، چونکە بنەماکانی حکومەتداری هەیە و خاکی زۆر و ئابووری باش و جوگرافیایەکی شیاو و ملیۆنان رۆناکبیر و پسپۆڕ و کەسانی بەئەزموونی هەیە و سەدان حیزبی سیاسی و چەکداریشی هەیە، داخۆ هێشتا هەرلەوە دەترسێت لەوەها داواکردنێك ئیمانی لەقببێت و بکەوێتەبەر خەشم و قینی ئیلاهی؟ یا هێشتا هەر پێیوایە لەگەل و ئەتنیکەکانیدیکە کەمترە و ناتوانێت بەبێ سەردار و گەورەیەك ژیانی سیاسی و ئیداری و کۆمەلآیەتی خۆی وەك پێویست بگوزەرێنێت. ئەوەی دەگوترێت ئەمەیە کە کورد لەئاستی نێو دەوڵەتیدا وەکی پێویست نەناسراوە، واتە بەرلەئەمڕۆ نەدیتراوە ئەزموونی حوکمڕانی هەبێت ئەمەش دەبێتە مایەی ئەوەی کە کورد هەر لەچاوەڕوانیدا بیگوزەرێنێت تاکو بەچاکی دەناسرێت، بەلآم پێناچێت ئەمە راستییەکە بێت، فاکتەری بەهێزتر هەیە کە ئاماژەی پێبکرێت ئەویش ئەوەیە کە هەندێك پێیانوایە بەهۆی دابەشبوونی کورد بەسەر ئەو حکوماتەندا کە لە بەرەی زلهێزەکاندان بووەتەرێگر لەبەردەم هەرجۆرە بیرکردنەوەیەك لە خەونی دروستکردنی دەوڵەتی کوردی، بائێمە ئەو راستییە لە هیگڵەوە ببیستین کە ئەویش ئەوەیە هەموو نەتەوەیەك دەتوانێت دەوڵەت دروستبکات، رۆحی نەتەوە لەدەوڵەتدا بەرجەستەیە و تاکو ئەوکاتە ئەم رۆحە ئۆقرەناگرێت، نازانین بۆچی هێشتا چاوەڕوانی زەمانە دەکەین بۆ بەرجەستەبوونی ئەم رۆحە. بەهەرحاڵ ئێمە دواتر دەگەڕێینەوە بۆئەم بابەتە و رای ئەوانە وەردەگرین کە قسەیان هەیە لەسەر ئەم بابەتە هەستیارە.

### شیاوبوونی هەڵکەوتەی جوگرافیایی کوردستان بۆ بەدەوڵەتبوون

مەبەست لەهەڵکەوتەی جوگرافیایی سنووری جوگرافیاییە کە تاچەند ئەم سنوورە بەرفراوانە لەڕووی جوگرافیاییەوە شوێنی دەوڵەتی لێدەبێتەوە، راستییەکەی لەهەموو دنیادا کێشەی دیاریکردنی سنووری جوگرافیایی بوونی هەیە، چونکە ئەمە دەرەنجامی داگیرکاری و دەستێوەردانی حکومەتە بەهێزەکان بۆسەر خاکی ئەو ولآتانەی کە وەك پێویست نەیانتوانیوە بەرگری لەخۆیان و خاکەکەیان بکەن، سنووری کوردستانیش لەم یاسایە بەدەرنییە، کوردیش بەهۆی ئەوەی دەوڵەتێکی سەربەخۆ و بەهێزی نەبووە ئەوا دەوڵەتە هاوسنوورەکانی بە ویستی خۆیان و بەپێی بەرژەوەندی تایبەت بەخۆیان هەرجارە و بەشێکیان لێداگیرکردووە و

خستوویانەتەسەر نەخشەی بنەڕەتی ولاّتەکانی خۆیان، ئەمەش گەورەترین کێشەی ناوەتەوە کە تاکوئیستاش بێچارەسەرە. تاکوئێستاش نەخشەیەکی ئەوتۆ نییە کە بکرێت لەڕووی یاساییەوە کاریلەسەربکرێت، بەلاّم لەڕووی مێژووییەوە ئەوا مێژوونووسەکان باسیان لەم سنوورە جوگرافییاییە کردووە و دەکرێت تەنها وەك دیکۆمێنتێکی مێژوویی تەماشابکرێت، چونکە لەحالّیحازردا ئەستەمە بیر لە یەکخستنەوەی ئەم جوگرافیا بەرفراوانە بکرێتەوە کە دابەشی سەرچەند دەولّەتێك کراوە، ئەم دەولّەتانە هێشتا کورد وەك نەتەوە ناناسن و دانیپێدانانێن چجای ئەوەی ئەو بەشە خاکەی بۆ بگەڕێیننەوە کە داگیریانکردووە.

مێژوونووسی ئێرانی "حەمدولاّی موستەوفی ئەلقەزوینی"(١٣٣٩ ز. کۆچیدواییکردووە) بەجۆرە سنووری کوردستانی دەستنیشانکردووە کە لە خۆرهەلاّتەوە بە عێراقی عەجەم، لە باکوورەوە بە ئازەربایجان، لە خۆرئاواوە بە عێراقی عەرەبی و لە باشووریشەوە بە خوزستان دەستنیشاندەکات. مێژوونووسی کورد"شەرەفخانی بەدلیسی"(٧٤٠ کۆچی ١٥٩٦ ز) لەشەرەفنامەکەیدا بەوردی ئەم سنوورەی دیاریکردووە و زانای گەورەی کورد "محەممەد عەلی عەونی" لە سالّی (١٩٢٠)دا لەو پێشەکییەدا کە بۆ (شەرەفنامە) عەرەبییەکەی نووسیوە دەلّێ: (پوختەی سنووری کوردستان ئاوایە: لە باکوورەوە کۆماری ئەرمەنستانی بەردەستی ڕوس، لە ڕۆژهەلاّتەوە: ئازەربایجانی ئێران و عێراقی عەجەم و مەلّبەندی فارس، لە باشوورەوە: خوزستانی ئێران و عێراقی عەرەب و چۆلّی شام، لە خۆرنشینیشەوە: چۆمی فورات و بڕێك لە ویلایەتی ڕۆژهەلاّتی ئەنادۆلّ.[١٠] هەلّبەتە کەسانیدیکەش قسەیان لەسەر ئەم سنووربەندییە کردووە و بەپێی توانا سنووری جوگرافیایی کوردستانیان دیاریکردووە لەوانە مێجەر "ئەدمۆندز".[١١] هەروەها پرۆفیسۆر لازەریف[١٢] و د. جەمال نەبەز. [١٣] عەبدوللا غەفور بەجۆرە ئەم جوگرافیایەی کورت و پوختکردووەتەوە دەلّێت: کوردستان دەکەوێتە باشووری ڕۆژئاوای کیشوەری ئاسیاوە. سنوورەکەی لە باکوورەوە لەگەلّ ئازەربایجان و ئەرمینیا و تورکیادایە، لە باشوورەوە ئیران و کەنداوی (فارسی-عەرەبی) لە ڕۆژهەلاّتەوە ئازەربایجان و ئێرانە. لە ڕۆژئاواشەوە، عێراق و سوریایە. گەر سەرنجبدەین شوینگەی فەلەکی کوردسان بەگوێرەی تۆڕی هێلّەکانی درێژی و پانی کوردستان لەنێوان هێلّی پانی ٣٩، ٤٠ی باکوور و ٦١، ٣٠ی باکوور، (واتە ٧٨. ٩هێلّ)و لەنێوان هێلّی درێژی ٦١، ٥٢ی ڕۆژهەلاّت و٠٠. ٣٦ ڕۆژهەلاّتدا (٦١، ١٦هێلّ) ڕاکشاوە، درێژایی خاکی کوردستان لە باکوورەوە تاکو باشوور،

نزیکەی ١٣٠٠ کیلۆمەترە. پانایییەکەشی لە ڕۆژهەڵاتەوە بۆ ڕۆژئاوا، خۆی لە ٥٥٠کم دەدا، ئەو پانایییە لەهەموو لایەکەوە وەکو یەك نییە. هەتا بەرەو باشووریش بڕوێن، ئەو پانایییە تەسکتردەبێتەوە. لە بەشی کۆتایی باشووردا، لە١١٢کم زیاترنابێ. لە شوێنگەی فەلەکی کوردستاندا بۆماندەردەکەوێت کە ئەم وڵاتە کەوتووەتە بەشی باشووری نێوچە سازگاری باکوورەوە، واتە شوێنی کوردستان لەنێوان ئاووهەوای بیابانی گەرم و زەریای ناوەڕاستدایە،[١٤] ئیدی دیارە کە کوردستان هەولکەوتەیەکی تەواو گونجاوی هەیە بۆ بونیاتنانی دەوڵەت و دەبینی لە دوو لاشەوە بواری کەناری زەریایی هەیە، یەکەم: تەنگەی (هورمز) کە لەژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی داگیرکەری ئێراندایە. دووەمیش: شاری (ئەسکەندەروونە) کە لە بن چنگی دەوڵەتی داگیرکەری تورکیادایە.[١٥]

## چیاکانی کوردستان لەنێوان کۆسپی بەردەم دروستبوونی دەوڵەت و قەڵایەکی قایم بۆ پاراستنی گەل

زیاتر لەنیوەی تۆپۆگرافیای کوردستان لە (چیا) پێکهاتووە و تۆپۆگرافیای کوردستان لەڕووی بەرزی و نزمییەوە لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکیدیکە جیاوازی هەیە، ناوچەی باکوور و ڕۆژهەڵات بە چیای بەرز داپۆشراون کە بەرزایی هەندێکیان لە چوار هەزار مەتر زیاتر[١٦] دەبێت، بەڵام ناوچەی باشوور و ڕۆژئاوا نزمن و چیایان کەمە و بەزۆری لە دەشتایی پێکهاتوون. لەنێوان ئەم دوو دیاردە سروشتییەدا چەندین تەپۆڵکە هەن، بەشێوەیەکی گشتی تۆپۆگرافیای کوردستان لە سێ بەشی جوگرافیایی جیاواز پێکهاتووە.[١٧]

تاکوئیستاش ژمارەی تەواوەتی چیاکانی کوردستان نەزانراوە، هەرچەندە ناوبەناوە هەندێ نامێکەی واهەیە ٢٢٠ چیای تۆمارکردووە و هەندێکیش ١٢٢چیا.[١٨] لەڕووی ستراتیژی سەربازییەوە ئەو کۆمەڵە چیایە بایەخێکی یەکجار گەورەی بۆ کوردستان پەیداکردووە، بۆیە هەر لە کۆنەوە تائەوڕۆش، نەتەوەی کورد تەنیا کەژ و کێوەکانی کوردستانی بە دۆستی ڕاستەقینەی خۆی زانیوە، لەهەموو تەنگانە و لێقەومانێکدا هەر پەنای بۆ ئەو شاخانە بردووە.[١٩]

**سایکۆلۆژیای کورد و بەستنەوەی بە دەوڵەتدارییەوە**

دەربارەی ساکۆلۆژیاو کەسایەتی کورد هەندێك لە توێژەرە بیانی و خۆماڵییەکان بەشێوەی سەرپێی دید و تێڕوانینی خۆیان خستۆتەڕوو، کە هەندێکیان بەئاشکرا ئەم فاکتەری کەسایەتی و ساکۆلۆژیایە وەك هۆیەکی سەرەکی پیشانداوە بۆئەم دۆخەی ئیستای کورد و نەبوونی سەربەخۆیی و دروستنەکردنی دەوڵەتێکی سەربەخۆ. کورد نەتەوەیەکی هیندو-ئەوروپییە، لە رەگەزی ئارییە ئێرانییەکانە و دەرەنجامی توێژینەوە زانستییەکانیش دەرکەوتووە کە لە نەوەی میدیاییەکانە. نەتەوەی کورد بە یەکێك لەهەرە نەتەوە کۆنەکانی ناوچەی خۆرهەلاتی ناوەڕاستی ئاسیای بچووك دادەنرێت. پتر لە شەش هەزار ساڵ دەبێت، لەسەر خاکی نیشتیمانی بابوباپیرانی خۆی دەژی. نەتەوەی کورد راستەوخۆ بەشداری لە گەلێ رووداوی گرنگی ناوچەکەدا کردووە، بەلاّم هیچکاتێك لەلایەن ئیمپراتۆریاکان و دەوڵەتەکانی ئەوڕۆی ناوچەکەوە بایەخیپێنەدراوە.[٢٠]

کورد خاوەنی چەندین خەسڵەتی تایبەتییە و هەموو ئەوکەسانەی کە ئاوێتەیانبووە و لەنزیکەوە دەیانناسێت دان بەئەمەدا دەنێت. ئەوان زیرەکن و ئەم زیرەکییەش لە جەستەیانەوە بەدیاردەکەوێت، خاوەنی بڕیاری دروست و دڵنەرمین، خاوەنی خەیاڵی شیعری بەپیتن و گیانێکی هەجوکارانەی چاوەڕواننەکراویشیان هەیە. تادەگاتە ئەوە کە دەڵێت خواست و حەزی ئەوان بۆ ئازادی لەوانە کەمترنییە.[٢١]

ئیدی دیارە کە کورد ئەو گەلەیە کە دوژمنەکانی و رۆژهەلاّتناسەکانیش پێکڕا شایەتی ئەوەی بۆدەدەن کە نەتەوەیەکە لەڕووی سایکۆلۆژیاوە و رۆحییەتەوە نەتەوەیەکی خاوەن خەسڵەت و سیفەتە گەورە و گرانەکانە کە هیچی لەئەودوای نەتەوەکانیدیکەی سەرزەمین کەمترنییە بۆ سەربەخۆبوون و دروستکردنی دەوڵەتێکی سەربەخۆ لەسەر خاکەکەی. تەنانەت کورد لەچاو گەل و نەتەوە خۆرهەلاّتییەکانیشدا بڕوای بە ئازادی چین و رەگەزەکانیش زیاترە وەکی "لۆسیان رامبۆ دەڵێ: سەبارەت بە مەسەلەی ئازادی و مافەکانی ژن، کورد بەپێچەوانەی ئەوەی کە دەربارەی گەلانی خۆرهەلاّتی هەیە بەگشتی و گەلە موسڵمانەکانیش بەتایبەتی، ئافرەت لای کورد لەگەڵ پیاودا یەکسانە و هیچ کۆتوبەندێکی لەسەر نییە. لەمەڕ دۆزی رۆشنبیریشەوە ئاماژە بەئەوە دەکات کە رۆشنبیرەکانی کورد بیریان فراوانە و ئەم رۆشنبیرانە کاریگەری تەواویان لەسەر کۆی هاولاّتییەکان هەیە و دەبینیت رۆشنبیری کورد بە چەندین زمان قسەدەکات یان بە چەند

زمانێکی ئەورووپیی قسەدەکات وەك ئینگلیزی و فەڕەنسی و ئەڵمانی و تەنانەت زمانی روسیش دەزانن، ئەمە وێڕای زمانەکانی عەرەبی و تورکی و فارسیش، من چەندە دڵخۆشدەبووم کاتێك گوفتوگۆیەکم لەگەڵ دادەمەزراندن دەمبینی ئەوان بەتەواوی ئاگاداری کێشە و بابەتە سیاسی و کۆمەلآیەتییەکانی جیهانن.[٢٢]

حوسێن **محەممەد** عەزێز دەڵێت: هۆی دواکەوتن و سەرنەکەوتنمان لە مێژووی تاڵماندا گەلێ زۆرە، بەلآم دڵپاکی، سافیلکەیی، خۆشبڕوایی، باوەڕکردن بە دوژمنان و داگیرکەران سەرباری هەمووانە. سەردار و میرە کوردەکان نەیاندەزانی، بەڵێن و سوێندی فەرمانڕەوایان و دەسەلآتدارانی داگیرکەران، بێبنج و بنەوانن، بنیان شڕە، زوو پەشیماندەبوونەوە و هەڵدەوەشێنرێنەوە یا کاتێ مردن لەدوای خۆیان یەکێکیدیکە، گوێ بۆ ئەو بەڵێنانە شلناکات. لەبەرئەوەی هەستی نەتەوەیی کورد لاوازبوو، بیروباوەڕێکی رەسەنی کوردی نەبوو، تینی پلەی نیشتمانپەروەری کزبوو، دەماری بیر و هۆشی ئەو فەرمانڕەوا کوردانە سڕبووبوو، بە قەوانی برایەتی و هاوئایینی تەفرەدەدران، لەبەر - راستگۆیی، بێفێڵی وکاڵوکرچی- خۆیان کە ئەمانە لە کاری جەنگ و رامیاریدا بێکەڵکن، زۆرجار وەك کەوی خۆخۆریان لێدەهات و لە گیانی یەکدی بەردەبوون، ناپاکییان لەگەل و نیشتمانەکەی خۆیاندەکرد. کەچی گەر سەردارێکی کورد، بە دەیان ساڵ نۆکەری بۆ داگیرکەران بکردایە، تەنیا هەڵەیەکی بکردایە، بێگانە هەرگیز لەبیریاننەدەچوو، داگیرکەران هەرگیز شتیان لە کورد قبوڵنەکردووە، گەر دەسەلآتیشیان نەبووبێت یان دەستیان پێنەگەیشتبێت، ئەوە هەرگیز هیچیان لەیادنەکردووە و لەکاتی خۆیدا هەلیان بۆ هەڵکەوتبێت، تۆڵەیانلێسەندووەتەوە.[٢٣]

لەمەی پێشەوە ئەوەمان بۆ دەرکەوت کە نووسەر لەمەڕ سایکۆلۆژیای کوردەوە تێڕوانینی تایبەتی خۆی هەیە و پێیوایە کە یەکێك لە فاکتەرەکان ئەوەیە کە کورد دڵساف و ساوێلکە و خۆشباوەڕە و لەزۆرباردا دوژمن سوودی لەم بارەسایکۆلۆژییەی کورد وەرگرتووە و بەئاسانی کوردی تەفرەداوە، لەلایەکیدیکەشەوە ئاماژە بەئەوە دەکات کە کورد خاوەنی ئایدۆلۆژیایەکی بتەو و بەهێزی نەتەوەییانەی ئەوتۆ نەبووە تاکو بەشێوازێك لەسەر داوا و مافەکانی سووربێت کە چۆك بەداگیرکەران دابدات و بە مافەکانی خۆی شادبێت و دەوڵەتی خۆی بونیاتبنێت. لەکاتێکدا میر شەرەفخانی بەدلیسی لەشەرەفنامەکەیدا دەفەرموێت: چونکە کورد نەهاتوونەتە ژێر فەرمانی تاکە فەرماندارێکەوە، بۆیە لەیەکتر نامۆن وخوێنی یەکتری دەڕێژن و گوێنادەنە هێمنایەتی و

ڕێکوپێکی و لەسەر زۆر وکەم زووهەڵدەچن.[٢٤] تێڕوانینەکەی جەنابی میر شەرەفخان روونە و پێمانوایە هیچ تەمومژێکی تێدانییە و تاکو هەنوکەش کە سەردەمی ئاوێتەبوونی کلتورەکانە هێشتا کورد ماڵی خۆی ڕێکنەخستووە و نەك ناچێتەژێر ڕکێفی تاکە ڕەهبەرێکەوە تەنانەت لەڕووی ئایدۆلۆژیایشەوە هەرئەمە ناکات و تاکی کورد و گروپ و حیزبەکانی کورد توێژەر و ڕۆشنبیران و.. هتد، لەسەر تاکە یەکهەڵوێست ڕێکناکەون و ئەمەش چەندانبار زیانی بە دۆزی سیاسی و نەتەوەیی ئەم گەلە گەیاندووە، ئیستاش کورد هاوڕا و تەبانییە لەسەر ئەو شێوە دەسەلاّت و حکومەتەی کە لەئاییندەدا پێویستە کاری بۆبکرێت، ئەمەش ڕاستی و دروستی بۆچوونەکەی میر دەسەلمێنێت. ئەمین زەکی بەگ دەفەرموێت: لە ئیبتیدای تاریخەوە تائیمڕۆ، ئەگەر بەدیقەت تێفکرین، دەبینین کە پەشۆکی و ماڵوێرانی ئەم قەومە، هەموو نەتیجەی نیفاق و تەفرەقەیان بووە وتا ئەم حاڵەیان دەوامبکا دائیمەن لەژێر دەستوپێدا دەچن.[٢٥] مێژوونووسی گەورەی کورد هەموو فاکتەرەکانی گەڕاندووەتەوە بۆ تاکە فاکتەرێکی دەروونیانە ئەویش دەردی نیفاق و دوو دڵی و ناڕاستگۆییە لەگەڵ یەکدیدا، ئەم پێیوایە تاکو ئەوکاتەی ئەم گەلە بە ڕاستگۆیانە هاوڕا و هاوئاهەنگ نەبن ئەوا مەحاڵە بتوانن خواستە نەتەوەییەکانی خۆیان فەراهەمبکەن و بتوانن بە مافە نەتەوەییەکانیان شادبن، ئەویش بە دروستکردنی دەوڵەتی نەتەوەیی یان هاوچەشنی ئەو دەوڵەتە مۆدێرنانەی کە ئەمڕۆ لە زۆربەی وڵاتانی دنیادا فەرمانڕەواییدەکەن. شەهید دکتۆر عەبدوڕەحمانی قاسملو دەڵێ: نەتەوەی کورد لە مێژووی خۆیدا، لە بنەڕەتەوە حەزی لەڕێکخستن نەکردووە.[٢٦] ئەم دید و تێڕوانینەی قاسملۆ کەمێك تەمومژی پێوەدیارە، بەلاّم ئاشکرایە کە لەگەڵ دید و تێڕوانینەکانی پێشوو خاڵی هاوبەشیان هەیە و گەر دیقەتبدەین ئەوا شەرەفخانی بەدلیسیش ئاماژەی بۆ ئەوەکردووە کە کورد نەهاتوونەتە ژێر ڕکێفی تاکە فەرماندارێکەوە و لەیەکتریش نامۆن، ئەمەش هەر بە واتای ئەوەیە کورد نەیتوانیوە وەك پێویست خۆی ڕێبخات، بەلاّم حوسێن محەممەد عەزێز لەئاماژەیەکدا دەڵێت هەر ئەم هۆیانەش بووە، وایلێکردووین فێربین، بە نۆکەری بژین، خۆمان لە ئاستی داگیرکەراندا بەکەمبزانین کە ئەوەتا ئەوڕۆش بە سەرچاوەی هەموو دەردوبەلاّیەکمان دادەنرێت و لەخوێنماندا قوڵپدەدات، بۆیە ئەوەتەی نەتەوەی کورد هەیە، هەمیشە لەژێر باری چەوساندنەوەدا بووە، نیشتمانەکەی داگیرکراوە، خاکەکەی دابەشکراوە، مافی لێزەوتکراوە، بەهەموو لایەکدا ڕاونراوە، بەدەرنەراوە و پەرت و بلاّوکراوەتەوە، ولاّتەکەی بەدەیانجار لەمێژوودا تالاّنکراوە، کاولکراوە و

سووتێنراوە، خۆیشی ڕاگوێزراوەتەوە، تا بەتەواوی لێکدابڕاوە، لاواز و بێهێزکراوە، بەڵام هەرگیزاوهەرگیز، گیانی ئازادی، سەربەخۆیی و خۆبەختکردنی تێدالەنێونەچووە، هەر زینووبووەتەوە، هەستاوەتەوە و ڕاپەڕینێکی نوێی بەرپاکردووەتەوە، بۆیە هەرگیز نەمردووە و هەرگیزاوهەرگیزیش نامرێ.(٢٧)

پێمانوایە لێرەدا واتە لە خاڵی نەمری ڕۆحی نەتەوەییانەدا و لەم خاڵەدا کە کورد هەرگیز بۆ هەتاهەتایە شکستناخوات و چۆکدانادات و دەست لە مافی چارەی خۆنووسین هەڵناگرێت و هەر سوورە لەسەر بەدەستهێنانی مافە ڕەواکانی خۆی و دەیەوێ دەوڵەتی خۆی هەبێت و بە سەربەخۆیی و بە ئازادی لەسەر خاکی نیشتمان دەوڵەتێکی هەبێ، لەم تێڕوانینەدا لەگەڵ دید و تێڕوانینی هیگڵ بۆ دروستکردنی دەوڵەتی نەتەوەیی یەکدەگرنەوە، چونکە هیگڵ پێیوایە هەموو گەلێك دەتوانێت ئیرادەی خۆی بۆ دروستکردنی دەوڵەتی نەتەوەییانە بخاتەکار و دەوڵەتێك بۆ خۆی دروستبکات، گەر سەرنجبدەین زۆربەی گەڕیدەکانی خۆرئاوا سەرسامی خۆیان لە شکۆمەندێتی و شەهامەت و مەردایەتی تاکی کورد پیشانداوە "مێجەرسون" دەڵێ گەر نموونەی ڕەسەنایەتی مرۆڤ وەربگرین ئەوا هەرگیز کەس پێشی کورد ناداتەوە.(٢٨) ڕۆژهەڵاتناسێکیدیکە لەمەڕ سایکۆلۆژیای مرۆڤی کوردەوە دەڵێ: کورد لەڕووی ئەدەبییەوە دەستودەم پاکە و زیاد لەپێویست دەستپاکە، هیچجۆرە گەندەڵییەکی لێناوەشێتەوە کە بەزۆری لەئەودوای خۆرهەڵاتدا بەربڵاوە، دەکرێت بگوترێت کە ئەم گەندەڵییانەی کە دەکرێن کورد هیچ دەربارەیان نازانێت.(٢٩) میجەر باڵتونی خۆرهەڵاتناسیش لە ئاماژەیەکی زۆر گرنگدا دەڵێ: هەموو هێزە گەورەکان خۆیان تاقیکردووەتەوە و ئەو داگیرکەرانەش کە لە خۆرهەڵات و خۆرئاواوە هاتوون هەوڵی خۆیانداوە تاکو ڕۆشنبیری و کلتورەکانی خۆیان بەسەر کوردا بسەپێنن، بەڵام بۆیاننەکراوە و بۆیان نەچووەتەسەر(ئاشوریەکان) یۆنانییەکان، ڕۆمانەکان، فرسییەکان، فارسەکان، عەرەبەکان، مەغۆلەکان و تورکەکانیش، هەموویان هەوڵی خۆیانیانداوە بۆ سەرکۆنەکردنی ئەم گەلە بەڵام شکستیانخواردووە(٣٠).

### کوردستان لەیەک پارچەییەوە بۆ دابەشکردن

ئێمە تەنها وەك مێژوویەکی پڕلە شکۆمەندی و پیرۆزێتی باس لە دەوڵەتێکی سەربەخۆی کورد دەکەین لەمێژوودا کە ئەویش دەوڵەتی مادبووە، ئەینا گەر سەرنجی مێژووی نوێ بدەین

ئەوا دەکرێت قسەلەسەر کورد بەوجۆرە بکەین کە بەرلە دروستبوونی ئیمپراتۆریا و خەلافەتی عوسمانی و دەوڵەتی سەفەوی کورد بە یەکپارچەیی لەسەر خاکی خۆی نیشتەجێبووە، ئاشکرایە تاکو سەرەتای سەدەی شانزە کوردستان یەکپارچەبووە، بەلاّم کاتێك لە ساڵی ١٢٩٩ ی زایینی ئیمپراتۆریا و خەلافەتی عوسمانی لە باکووری کوردساندا شوێنی خۆی قایمدەکات و لە ١٥٠١ی زاینیشدا دەوڵەتی سەفەوی شیعە لە تەوریز جێگیردەبێت و دادەمەزرێت، چەندین شەڕ و کێشە لەنێوان ئەو دوو ئیمپراتۆریایەدا روویانداوە و کوردیش لەو نێوەندەدا تووشی زیانلێکەوتنی زۆربووە، بەلاّم زیانی گەورەی لەدوای جەنگی (چالدێران)[٣١] لێکەوتووە، ئەم جەنگە دەبێتە خاڵی وەرچەرخانی چارەنووسسازانە بۆ گەلی کورد و نوختەگۆڕانێکی گرنگە لە مێژووی نەتەوەی کوردا، سوڵتان سەلیم بە یارمەتی کوردەکان، بەسەر سەفەوییەکاندا سەردەکەوێت لە ئەنجامی ئەوشەڕەدا، تورکە عوسمانییەکان و فارسە سەفەوییەکان بەگوێرەی پەیماننامەی (زەهاو) لە ساڵی ١٦٣٩ز، بۆ یەکەمجار کوردستانیان لەنێوان خۆیاندا دابەشکرد. گوتراوە کە کورد هێزێکی گەورەبووە و حسێبی لەسەر کراوە چونکە لەو سەروبەندەدا کورد خاوەنی نزیکەی چل و شەش میرنشین بووە و شێوازی پەیوەندی نێوانیشیان زیاتر لەشێوەی پەیوەندی فیدرالیزمانە بووە، بەلاّم لەدواتردا کە جەنگ کۆتاییپێدێت ئەوا سەرەتای قۆناغێکی کارەساتئامێز لە ژیانی سیاسی و نەتەوەیی گەلی کورد دەستپێدەکات و میرنشینەکانی لای رۆژوا و سەروو و خوارووی کوردستان دەچنە ژێر دەسەلاّتی سەفەوییەکان.[٣٢] و بەشی رۆژهەلاّتەکەشی دەبێتە بەشێك لە قەڵەمڕەوی خەلافەتی عوسمانی. دوای ئەوەی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی لە ئەنجامی کۆتاییپێهاتنی جەنگی یەکەمی جیهانیدا (١٩١٤-١٩١٨) رووخا، نەخشەی رامیاری ناوچەکە بەتەواوی گۆڕا، میراتی ئیمپراتۆرییەتەکە لەنێوان دەوڵەتە سەرکەوتوەکانی جەنگدا دابەشکرا، بەوپێیەش رۆژئاوای کوردستان جارێکیدیکە دابەشکرایەوە، کۆمەڵێ دەوڵەتی نوێ لەناوچەکەدا دروستبوو، وەکو تورکیای نوێ، عێراق، سوریا، پاشان لە هەریەکێ لەو وڵاتانەدا و لە سەردەمی جیاجیادا، دەستیان بە سەرژمێری گشتی دانیشتوانکرد.[٣٣]

دابەشکردنی دووەمی کوردستان بەتەنیا لە ئەستۆی داگیرکەراندا نییە، ئیمپریالیزمی جیهانیش رۆڵی کاریگەر و راستەوخۆیان لەو دابەشکردنەدا هەبووە، ئەم رۆڵە لە چارەکی یەکەمی سەدەی بیستەمدا لەنێوان ساڵەکانی (١٩١٥-١٩٢٠)دا بوو بە یارمەتی و نەخشەڕێژی هەریەکێك لە ئیمپریالیزمی ئینگلیزی و فەڕەنسی و کەمالیستەکان و میرنشین و شێخەعەرەب و

فارسەکان، نەخشەی ئەم پلانە لەکاتی جەنگی یەکەمی جیهانی و سالانی (١٩١٩-١٩٢٢) لەکاتی شەڕی تورکی یۆنانی و شەڕی تورکی ئەرمەنی کێشراوە، بەلام ناکۆکی، ناتەبایی، دووبەرەکی، ناپاکی، نەبوونی ستراتیژێکی نەتەوەیی روون و ئاشکرا، لاوازی هەست و هۆشی کوردایەتیش هۆیەکی گەورەی ئەو دابەشکردنە پێکدێنێت کە ئیمپریالیزمی جیهانی و کۆنەپەرستەکانی ناوچەکە توانییان نەخشە و پیلانە گلاوەکانیان بەسەر سەرکردەکانی ئەو سەردەمەی بزووتنەوەی کوردایەتییدا تێپەڕێنن.[٣٤]

نووسەر تێبینییەکی جوانی داناوە لەمەڕ دووەمین دابەشکردنی کوردستانەوە کاتێك دەلێت: گەر هۆی سەرەکی یەکەم دابەشکردنی کوردستان لەنێوان تورکە عوسمانییەکانی و فارسە سەفەوییەکاندا، بۆ فاکتەری جیۆپۆلەتیك، ستراتیژی ناوچەکە، چاوچنۆکی و پاوانخوازی بگەڕێتەوە ئەوا هۆی سەرەکی لەتوپەتکردنی و دووەم دابەشکردنی کوردستان لەلایەن ئیمپریالیزمی جیهانییەوە بۆ بوونی نەوتێکی زۆر لەکوردستاندا دەگەڕێتەوە.[٣٥]

## دروستبوونی دەوڵەتی کوردی لەنێوان خەمساردی سیاسییەکان و پەرۆشی رۆشنبیراندا

رۆشنبیران لەژێر رووناکایی دید و تێڕوانینی فەلسەفەکارانی سیاسی و حوکمڕانییەوە هەر بەئومێدی ئەوەن هەلی گونجاو بڕەخسێت و کورد دەوڵەتی خۆی دروستبکات، لای رۆشنبیر ئەمە خەون نییە بەڵکو ئەمە واقیعێکی روون و رەوانە و لەئاییندەدا ئەم هیوایە دەبێتە واقیع و گەلی کورد وەکی ئەودوای گەل و نەتەوەکانیدیکە دەوڵەتی خۆی لەسەر خاکی کوردستان بونیاتدەنێت.

نەتەوەی کورد ئەوەتەی هەیە، دژی داگیرکەران و دوژمنان لە خەباتێکی سەختی بێوچاندایە، لەپێناوی ئازادی و سەربەخۆییدا خوێندەڕێژێت و لاشە دەنێژێت، تێکۆشان و قوربانییە یەك لەدوای یەکەکانی میرەکانی سۆران، بادینان، بۆتان، بابان و.. هتد، نیشانە و بەڵگەی راستی ئەم بۆچوونەمانە. هەندێك لە سەرانی کورد دەڵێن: دوژمنمان زۆرە، کوردستان بەسەر پێنج دەوڵەتدا دابەشکراوە، بۆیە ناتوانین جیابینەوە و دەوڵەت دامەزرێنین، چونکە لەکاتی داواکردنی دەوڵەتێکی یەکگرتوو بۆ کوردستانی گەورە، هەموو داگیرکەرانمان وەك شارەزەردەواڵە لێدەورووژێن، گەلەکۆمەکیمان لێدەکەن پەلامارماندەدەن. ئەمە تائەندازەیەکی زۆر راستە، بەلام ئەدی چەند ساڵە بەدرێژایی مێژوو، ئەو داگیرکەرانە گەمەیان لەگەڵدا کردووین لەچاو گەلانی

جیهاندا کە ئێمە داوای هیچپیانلێناکەین، داگیرکەران هەمیشە دژی نەتەوەی کورد یەکنەبوون؟ چەندین رێکەوتنامەیان بۆ لەنێوبردنی کورد مۆرنەکردووە؟ داخۆ گەر داوای جیابوونەوەمان کردایە لەوەزیاتر چییانلێدەکردین؟ نەتەوەی کورد ناتوانێ تاسەر برایەتی کورد و تورك، کورد و فارس، کورد و عەرەب بپارێزێ.(٣٦)

بنەماکانی بەدەوڵەتبوونیشی تێداهەیە. بۆیە بەباشمانزانی ئاماژە بە دید و تێڕوانینی چەند نووسەر و رووناکبیرێك بکەین لەمەڕ دروستبوونی دەوڵەتی کوردی و بزانین تاکو چەندە ئەوان پێیانوایە هەلومەرجی دروستبوونی دەوڵەتێکی سەربەخۆ بۆ گەلی کورد هاتووەتەپێشەوە و تاچەند دەکرێت پەلە لە راگەیاندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆ و دیموکرات بکرێت؟

لە وەڵامی ئەو پرسیارەدا لە (د. نوری تالەبانی) کە دەڵێت: ئایا مەرجە ئێمە هەرچاوەڕوانی زەمینە و هەلومەرج بین و ئەمە بکەینە بیانوو بۆ ئامادەنەکردنی پرۆژە و ئەجینداییەك بۆ ئەو مەبەستە کە خەونی چەندین ساڵەی نەتەوەکەمانە؟ دکتۆر "نوری تالەبانی" لەوەڵامدا دەڵێت: بەبێ زەمینەخۆشکردن دەوڵەتی سەربەخۆ دروستناکرێت و کۆمەڵگای نێودەوڵەتیش پشتگیریلێناکات، پرۆسەی دروستکردنی دەوڵەتی کوردی پرۆسەیەکی نەتەوەییە، بەبێ هاوکاری هەموو لایەنە سیاسییەکان و رێکخراوانی کۆمەلاگای مەدەنی و نوێنەرانی هەموو نەتەوەکان و ئایین و ئایینزا جیاوازەکانی کوردستان سەرکەوتوونابێت، لەسەرەتای نەوەدەکانی سەدەی رابردوو دروشمی دروستکردنی دەوڵەتێکی کوردی یەکگرتوو لە باکووری کوردستان بەرزکرایەوە، بەڵام لەبەرئەوەی زەمینەی بۆ خۆشنەکرابوو، بە دروشیمی مایەوە. جاروبار داوا لە کورد کراوە داوای دروستکردنی دەوڵەتی خۆیان بکەن. سەبارەت بەوەی ئایا دەکرێت کورد سوود لە بابەتی نەوت وەربگرێت بۆ سەرخستنی پرسی دروستبوونی دەوڵەتی کوردستان ؟ د. نوری تالەبانی دەڵێت: بەداخەوە تائیستا سەروەت و سامانی کوردستان سەرچاوەی نەهامەتی بوون بۆ کورد، لەپێناوی نەوتی کەرکوك، بەریتانیا لەپاش کۆتایی جەنگی یەکەمی جیهانی، ویلایەتی موسڵی خستەسەر سنووری دەوڵەتی عێراق کە لە ساڵی ١٩٢١ لەهەردوو ویلایەتی بەغدا و بەسرە دروستیکردووە. دووری کوردستان لە دەریایەکی نێودەوڵەتی بووەتە هۆی ئەوە کورد نەتوانێ وەك دەوڵەتانی کەنداو سامانی نەوت و گازی خۆی راستەوخۆ رەوانەی دەرەوە بکات، نەوتەکەی دەبێت لەرێگای وڵاتێکی دراوسێوە هەناردەی دەرەوە بکرێت، بەڵام سەبارەت بەئەوەی داخۆ هەربەرپرسەکانی کورد ئەرکی بەرپرسیارێتی دروستکردنی دەوڵەتی کوردی دەگرنەئەستۆ

یان بەشێك لەم ئەرکە دەکەوێتە سەرشانی توێژە کۆمەلاٰیەتییەکانیدیکەش لەسەروو هەمووشیانەوە توێژی ڕۆشنبیر؟ دکتۆر نوری تالەٰبانی رایوایە کە دروستکردنی دەولەٰتی کوردی ئەرکێکی نەتەوەیی چارەنووسسازە، لایەنێکی سیاسی یان گروپێك بەتەنیا ناتوانیٰ پرسی دروستکردنی دەولەٰتی کوردستان بخاتەبەردەم کۆمەلگٰای نێودەولەٰتی. پێویستە هەموو لایەنە سیاسییەکانی کوردستان و رێکخراوانی مەدەنی و ڕۆشنبیران هەموو بەشداربن لەو پرۆسەیە، بەلاٰم ئەرکی سەرەکی دەسەلاٰتە بەهۆی پەیوەندییەکانی لەگەلٰ دەولەٰتان و دەزگا نێودەولەٰتییەکان. نووسەر و ڕۆشنبیرانی کورد دەتوانن رۆلێٰکی گرنگ ببینن لەمڕووەوە.(٣٧) سەبارەت بەئەوەی کە باشترە کورد هەول بۆ دروستکردنی دەولەٰتێکی نەتەوەیی بدات یان ئەم هەولەٰ لەم سەروەختەی ئیستادا بێئاکامدەبێت و لەڕووی پراکتیکیشەوە واباشترە هەولیٰ دروستکردنی دەولەٰتێکی نیشتمانی بدات ؟. باشتروایە کە دەولەٰتەکەی لەسەر شێواز و فۆرمی کۆنفیدرالیٰ بێت نەك دەولەٰتی یەکگرتوو، چونکە لایەك دەبینین بیروبۆچوونی جیاجیا هەیە لەنێو بەش و پارچەکانی کوردستاندا و دەشێت یەکشێوە یاسا و یەکفۆرم یان یەکجۆر سیستەمی کۆمەلاٰیەتی و فیکری نەتوانێت کۆیان بکاتەوە، لەلایەکیتریشەوە سیستەمی دەولەٰتی یەکگرتوو باوی نەماوە و وەك دەولەٰتی یەکگرتووی زۆرەملیٰ وایە.(٣٨)

کورد دەبێت چاوەڕوانی گۆڕانکاری بارودۆخ و دەستی ولاٰتان بێت بۆئەوەی بڕیار لە مافی چارەی خۆنووسین و دروستکردنی دەولەٰت بدات یان دەبێت خۆی هەولەٰکانی لەم پێناوەدا بخاتەگەڕ؟ دکتۆر مەحمود عوسمان لە ولاٰمی ئەم پرسیارەدا دەلێٰت: هەر میللەتێك مافی دیاریکردنی چارەنووسی هەیە، هەر کوردێك جگەلەوەی کە لە ولاٰتی تورکیا، سوریا، ئێران، عێراق خەباتدەکات، ئەو کوردانە دەبێت خەباتی نەتەوەییش بکەن و ئاگایان لەیەکبێت لەپارچەکاندا و ئامادەشبن مافی چارەنووسی خۆیان بەکاربێنن قەوارەی خۆیان دروستبکەن، دەبێت لەکاتی گۆڕانکاری بارودۆخدا ئەو ئامادەکارییانەت هەبێت، نەك بلێٰیت با گۆڕانکاری ببێت دوایی ئەو گۆڕانکارییانە شتمان بۆ دروستبکات، کەس شت بۆ تۆ دروستناکات، دەبێت خۆت خەباتی بۆ بکەیت و هەولیٰ بۆ بدەیت و ئامادەسازیت کردبێت بۆی، بۆئەوەی ئەگەر گۆڕانکارییەکی نێونەتەوەیی هەرێمی و ناوچەیی و دۆخێکی لەبار هاتەپێشەوە تۆ بتوانیت بەکاریبهێنیت.(٣٩)

لەساتەوەختی ئیستادا پرسی دروستبوونی دەوڵەتی فەلەستین و دروستبوونی دەوڵەتی باشووری سودانیش هەیە، جا پرسەکە لێرەدا ئەمەیە داخۆ پرسی دروستبوونی دەوڵەتی کوردی لەکوێی ئەم گۆڕانکارییانەدایە؟ دکتۆر سالار باسیرە دەڵێت: گۆڕانکارییەکانی رۆژهەلاتی ناوەڕاست تاڕادەیەکی بەرچاو دەرگای بەرووی دیموکراسییەتدا کردەوە، کوردیش بەشێکە لە پرۆسەکە. کورد کەرەستەی گونجاوی بەدەستەوەیە بۆ مافی بوونبەدەوڵەت لەسەر ئاستی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان. لێرەدا پێویستە کورد خۆی داواکاری بۆ دەوڵەتێکی کوردی پێشکەشبکات، راستە کورد نەیاری سەرسەختی هەیە وەك دەوڵەتانی هاوسێی، بەلاّم ئەوە ناگەیەنێت کورد کار بۆ دەوڵەتێکی کوردی نەکات.[٤٠]

## گەڕانەوە بۆ سەرەتا

لەدوای جەنگی یەکەمی جیهانی دەنگۆی دروستکردنی دەوڵەتی کوردی زۆر گەرموگوڕتربوو تاکو ئەمڕۆ، راستییەکەی ئەمڕۆ ئەوەندەی قسەلەسەر فیدراڵییەت دەکرێت و باس لە یەکگرتنی ئارەزوومەندانەی کورد دەکرێت بەتایبەتی لە کوردستانی عێراقدا، ئەوەندە قسەلەسەر مافی چارەی خۆنووسین یان راگەیاندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆ بۆ کورد ناکرێت، راستییەکی لەمەش تاڵتر ئەوەیە کە هەر کورد باسی فیدراڵی و ئەم پێکەوەلکاندنی ئارەزوومەندانەیە دەکات، زۆرینەی بەرپرسەکانی عێراق بەتایبەتی بەلوتبەرزییەوە باس لە یەکێتی خاکی عێراق دەکەن و ئەو فیدراڵییەش وەکی ئەمری واقیع قبوڵدەکەن و دانبەئەوەدانانێن کە ئەم یەگرتنە ئارەزوومەندانەیە، بەلاّم گەر بگەڕێینەوە بۆ بیستەکانی سەدەی رابردوو ئەوا دۆزی کورد زیاتر لەپێشەوەبووە و دەبینیت هەردوو حکومەتی بەریتانی و عێراقی لە بەیاننامەیەکی هاوبەشیاندا لە٢٥ی کانونی یەکەمی ١٩٢٢دانیان بە حکومەتێکی کوردیدا ناوە کە ئەمە دەقەکەیەتی: حکومەتی خاوەنشکۆ و حکومەتی عێراقی دان بە مافی ئەو کوردانەدا دەنێت کە لە چوارچێوەی سنووری عێراقدا نیشتەجێن کە حکومەتێکی کوردی لە چوارچێوەی ئەو سنوورەدا پێکبێنن و ئەوان هیواداریشن رەگەزە جیاجیاکانی کورد لەنێو خۆیاندا لەسەر شێوەی گونجاوی ئەو حکومەتە و سنوورەکەی رێکبکەون و کوردەکان نوێنەری بەرپرسی خۆیان بنێرن بۆئەوەی دەربارەی پەیوەندییە ئابوورییەکان لەگەڵ حکومەتی خاوەنشکۆ و حکومەتی عێراقی گفتوگۆبکەن. هەرچەندە دیارە کە حکومەتی بەریتانیاش تەواو راستگۆنەبووە

لەم هەنگاوەیدا، بەلاّم پێدەچێت ڕێکنەکەوتنی کوردەکانیش فاکتەرێکی سەرەکی بووبێت لە ئەم ڕفتارەی بەریتانیا و لەحالّەتی دڵەراوکێ و ڕاڕابوونیدا. "عەزیز شەریف" سەرۆکی حیزبی گەل وسەرکردەی بەناوبانگی نیشتمانپەروەر بەمجۆرە باس لە سیاسەتی بەریتانیا و ئەو دڵەڕاوکێیە دەکات سەبارەت بە کێشەی کورد: هۆکاری ئەم دڵەڕاوکێیە لە سیاسەتی بەریتانیا جگەلەو مساوەمانەی کە بەدەسبەرداربوونی فەڕەنسا لەسەر ئەو ناوچەیە بە ڕێککەوتننامەی سانڕیمۆی ١٩٢٠ کۆتاییپێهات وەك پێشتر باسکراوە دەکرێ و هۆکاری سەرەکی هەبن کە ئەمانەن:

- سیاسەتمەدارانی ئیمپراتۆری متمانەیان بە کوردێکی خاوەن دەسەلاّت نەکرد تاپاراستنی بەرژەوەندییەکانی خۆیانی پێبسپێرن.

- دواکەوتنی ساغکردنەوەی هەڵوێست لە حکومەتی تازەی تورکیادا (کەمالی)و دەستنیشانکردنی ئاراستەی سیاسەتەکەی.[٤١] حوسێن محەممەد عەزیز پێیوایە نەتەوەی کورد تا واز لە چارەسەری کاتی (ئۆتۆنۆمی - فیدراڵی) نەهێنێ، ستراتیژێکی نەتەوەیی (فراوان، قووڵ و زانستانە)ی نەبێ باوەڕناکەم هەرگیز بتوانێ چارەسەرێکی بنەڕەتی بۆ کێشەی نەتەوەیی و رامیارییەکانی خۆی بدۆزێتەوە. مافی رزگاری تەواو لەیەکگرتوودا چارەسەردەکرێ و دەبڕێتەوە [٤٢]. ئێمە پێمانوایە وەلاّمەکە لای "هیگڵ"ەو ئەو دڵنیاییدەدات بەتەواوی گەل و ئەتنیکەکان کە رۆحی نەتەوە بەردەوام بەشێوەی دیالیکتیکانە هەر لەبەرەوپێشچووندایە و هەوڵی ئەوەدەدات کە خۆی لە ژیانی سیستماکراودا بەرجەستەبکات و بگاتە مەقامی بەدەوڵەتبوون، هەرچەندە هەموو دەوڵەتێکیش لەدوای ماوەیەك لەبەیندەچێت و دەوڵەتێکیدیکە دێتەجێگاکەی، بەلاّم نابێت ئەم دەستەواژەیە بمانترسێنێت، چونکە ئەمە کاتی زۆری دەوێت، ئەو پێیوایە کە نەتەوەیەك بەچاکی فیکری خۆی بەتاڵدەکاتەوە و هەموو بەخشندەییەکانی خۆی بەئەنجامدەگەیەنێت تاکو ئەودەمەی نەتەوەیەکیدیکە بەخشندەیی باشتر پێشکەشدەکات.

•••

**پەراوێز:**

١. هیگڵ Hegle George Willhelm Fridrich (١٧٧٠-١٨٣١) یەکێك لە دیارترین فەلسەفەکارانی کلاسیکی ئەڵمانییە، فەلسەفەکارێکی ئایدیالیستی بابەتی پۆزەتیڤیستییە و پیرۆزبایی و پێشوازی گەرمی لە شۆڕشی سەدەی هەژدەیەمی فەرەنسی کردووە لە ساڵی ١٨٧٨، ساڵی ١٨١٨ کورسی مامۆستایەتی لە زانکۆی بەرلین وەرگرتووە بووە بە یەکێك لە داکۆکیکارانی یان راستتر ئەمەیە کە بووەتە دامەزرێنەری فەلسەفەی فەرمی بروسیای پاشایەتی، فەلسەفەکەی هیگڵ رەنگدانەوەی ئەو گەشە و گۆڕانە هاودژەی ئەڵمانیایە. هیگڵ لە خێزانێکی سەربەبزاوتی ریفۆمیستی لۆتەرییەوە هاتبوو، هیگڵ بۆخۆی بڕوای بەئەوە هەبووە کە رێبازە فەلسەفییەکەی ئەم تەواوکاری بیرۆکەی هزری رەهیا، هیگڵ توانیویەتی دەرککردنی خودییانە بەکۆتابگەیەنێت واتە تەواوکاری ئەم بیرۆکەیەشە کە بە واتای ئەوەیە بیرۆکەکان خۆیان لەنێو قۆلاییەکاندا بە ریگای لۆجیك خۆیان کەشفدەکەن، ئەم خۆکەشفکردنەشیان بەلەنێو بازنەی بیرکردنەوەی پەتی و ئەبیستراکدا فۆرمەلەدەبێت، واتە لە زانستی لۆجیدا بابەتەکانی فیکر خۆیان دەدۆزنەوە و گەلاڵەدەبن و لەدواجاریشدا لە شێوە و فۆرمی مەقولە و کاتیگۆریا Categoriaگەلێکدا خۆیان نماشدەکەن، ئەم کاتیگۆریایانەش بۆخۆیان شتی پەیوەستدار و رێك و دامەزراون نەك هەڵەشە و گۆتەگەلێکی بێواتا و بێسەرەوبەرەبن. هیگڵ لە کتێبی زانستی لۆجیکدا (علم المنطق)Logic یاساکانی گۆڕانی چەندایەتی بۆ چۆنایەتی رووندەکاتەوە (موسوعة الفلسفة، د. عبدالرحمن البدوی، منشورات ذوی القربی، المطبعة سلیمانزادة، الطبعة الاولی، قم، ١٤٢٧، ص٥٨٠. الموسوعة الفلسفیة، وضع لجنة من العلماء والاکادیمیین السوفیاتیین، باشراف: م. روزنتال. ب. یودین ترجمة: یوسف کرم، دار الطلیعة، بیروت، طالاولی، ١٩٧٤، ص٥٦٦-٥٦٧)

٢. موسوعة الفلسفة، د. عبدالرحمن بدوی، ص٥٨٠.

٣. بە واتای بیرۆکە گشتییەکانە لە فەلسەفەی سەدەکانی ناوەڕاستدا (الموسوعة الفلسفیة، ص٣٩٢).

٤. فەلسەفەی مێژوو، نووسینی: رەحیم سابیر، چاپەمەنی گەنج، سلێمانی، چاپی دووەم، ساڵی ٢٠٠٥، ل٩٥-٩٧.

٥. ئەفلاتون Plato ٣٤٧-٤٢٨، فەیلەسوفێکی یۆنانییە، یەکێکە لە هەرە بیریارە خولقێنەر و کاریگەرەکانی فەلسەفەی خۆراوا، لە خێزانێکی ئەریستۆکراتدا لەدایکبووە، باوکی نەوەی پادشاکانی زووی ئەسینا بووە.(*)

*) بە لاوی سیاسەتیکردووە، بەڵام زۆر نائومێدبووە و دواتر بووە بە قوتابی سوکرات و بنەماکانی

فەلسەفەکەی و شێوازی دیالیکتیکییانەی دەمەتەقێ لەوەوە وەردەگرێت، گەیشتن بەڕاستی لەتوێی پرسیارکردن. سەرجەمی کارەکانی ٣٥ دیالۆگ و ١٣ نامەن کە هەموویان پارێزراون (فەلسەفەی خۆراوایی، ل ٣٣-٣٤).

٦. فەلسەفەی مێژوو، هیگڵ، ل ٣٣٣-٣٣٤.

٧. أعلام الفكر السياسي، موريس كرانستون، دار النهار للنشر، ص٩٥-٩٦.

٨. دەوڵەتی کوردستان لەنێوان خەون و واقیعدا- کۆدیدار- عەدنان مەلاساڵح، پێداچوونەوەی د. سالار باسیرە، بلاۆکراوەی خانەی چاپ و بلاۆکردنەوەی چوارچرا، زنجیرە ٣٦٣، چاپی یەکەم٢٠١٢، ل ٦٩.

٩. سايكولوجية الجماهير، جوستاف لوبون، ت: هاشم صالح، بيروت ١٩٩١، ص٦٧-٩١.

١٠. شەرەفنامە، شەرەفخانی بەدلیسی، وەرگێڕانی: هەژار، چاپی دووەم، تاران، ١٩٨١، ل٣٥و٩٨.

١١. كرد و ترك و عرب، ادموندز س. ج. ترجمة: جرجيس فتح الله، مطبعة تايمس، بغداد، ١٩٧١، ل٥، ٧.

١٢. کورد و کێشەی کورد، د. میخائیل س. لازەریف، گۆڤاری ئاسیا و ئەفریکای ئەورۆ، ژمارە١٢ ١٩٨٣، مۆسکۆ ( لەکتێبی کورد و شۆڕش و هەلی مێژوویی، حوسێن محەمەد عەزیز، چاپی دووەم، سولەیمانی، ٢٧٠٠ک /٢٠٠٠ز، ل١٦-١٧.

١٣. دۆزی ناسیۆنالی کورد، د. جەمال نەبەز، بنکەی چاپەمەنی ئازاد، چاپی یەکەم، سوید، ١٩٨٥، ل ١٤، ٣٦٥.

١٤. جوگرافیای کوردستان، عەبدوڵلا غەفور، چاپ و ئۆفیسی دەزگای سەردەم، چاپی دووەم، سلێمانی ٢٠٠٠، ل١٥. بۆ زانیاری تەواو لەسەر دەستنیشانکردنی سنووری جوگرافیایی کوردستان سەرنجبدە لە ل ٢٥٠-٢٦٨.

١٥. کورد و شۆڕش و هەلی مێژوویی، ل ١٧.

١٦. چیای ئاکرێی گەورە بە بەرزترین لووتکە شاخی کوردستان دەژمێردرێت و بەرزاییەکەی (٥١٦٨) مەتر زیاترە، هەروەها شاخی بەرزیدیکەشی هەیە وەکی چیای سەیحان، جیلوا، ئمابار، قەندیل، ئاکرێی گچکە کە زۆربەیان لە (٤٠٠٠)م بەرزترن ( کورد و شۆڕش و هەلی مێژوویی، ل١٤. الكرد والمسألة الكردية، شاكر خصباك، المؤسسة العربية للدراسات والنشر، الطبعة الثانية، بيروت، ١٩٨٩، ص٥٤.

١٧. جوگرافیای کوردستان، عەبدوڵلا غەفور، ل٢٥ و وواتر.

١٨. جوگرافیای کوردستان، ل ٢٦.

١٩. کورد و شۆڕش وهەلی مێژوویی، ل١٤.

٢٠. کورد و شۆڕش و هەلی مێژوویی، ل ٢٣.

٢١. الكرد والحق، لوسيان رامبو، ترجمه وقدم له ووضع حواشيه، عزيز عبدالاحد نباتي، مطبعة وزارة الثقافة، اربيل، ١٩٩٨، ل٣١.

٢٢. الكرد والحق، ص٣١-٣٢.

٢٣. كورد و شۆڕش و هەلی مێژوویی، ل٢٥.

٢٤. شەرەفنامە، ل٣٥، ١٣٢.

٢٥. كورد و كوردستان، محمدأمين زكي، چاپخانەی دار السلام، بغداد، ١٩٣١، ل٥٦، ١٣٨.

٢٦. چل ساڵ لەپێناوی ئازادی، د. عەبدولرەحمان قاسملو، بەرگی یەکەم کوردستان، ١٩٨٢، ل٢٩.

٢٧. كورد و شۆڕش و هەلی مێژوویی، ل٢٦.

٢٨. الكرد والحق، ص ١٤٥.

٢٩. سنتان فی كردستان، السيد دبليو هی HAY ترجمة: فؤاد جميل، ١٩٧٣، ص٦٢-٦٣.

٣٠. الكرد والحق، ص ١٤٨.

٣١. ئەم جەنگە نێوان "سوڵتان سەلیمی عوسمانی"و" شا سمایلی سەفەوی"دا بووە، جەنگەکە لە ٢٣/ ئۆگەستی ساڵی ١٥١٤ز/ روویداوە.

٣٢. كورد و شۆڕش و هەلی مێژوویی، ل ٣٧-٣٨.

٣٣. جوگرافیای کوردستان، عەبدوڵلا غەفور، ل١٤٨. بۆ وردەکاری سەرژمێری خەملاێندراو سەرنجبدە لە خشتەی ژمارە (١١) ل ١٤٩.

٣٤. كوردو شۆڕش و هەلی مێژوویی، ل ٣٩.

٣٥. كورد و شۆڕش و هەلی مێژوویی، ل ٣٩.

٣٦. كورد و شۆڕش و هەلی مێژوویی، ل٢٦٧-٢٦٨.

٣٧. دەوڵەتی کوردستان لەنێوان خەون و واقیعدا( کۆدیدار)، عەدنان مەلا ساڵح، بەرگی یەکەم، چاپی یەکەم، ٢٠١٢، بلاۆکراوەی خانەی چاپ و بلاۆکردنەوەی چوارچرا، ل١٣-٢١.

٣٨. هەمان سەرچاوە بەدستکارییەوە، ل ٢٦-٢٧.

٣٩. دەوڵەتی کوردستان لەنێوان خەون و واقیعدا، ل٢٩-٣٠.

٤٠. دەوڵەتی کوردستان لەنێوان خەون و واقیعدا، ل ٣٧-٣٨.

٤١. زنجیرە وتارێکی سیاسی دەربارەی فیدراڵی یەکگرتن یەکێتیی نیشتمانی عێراقی، جەلال تاڵەبانی، وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە، چاپ: ئۆفسیتی (ژیر) جەوهەر کرمانج، چاپی یەکەم ٢٠٠٤، ل٤٠-٤٢.

٤٢. زنجیرە وتارێکی سیاسی دەربارەی فیدراڵی یەکگرتن یەکێتیی نیشتمانی عێراقی، ل٢٦٥.

# فاکتەر و پاڵنەرەکانی سەرهەڵدانی دەوڵەتی سەفەویی

ن: عەلی ئەحمەد رەشید (*)
و: مەهاباد قادر


شا ئیسماعیلی یەکەم
دامەزرێنەری دەوڵەتی سەفەویی

ئێران بە وڵاتی فارس نێودەبرێت، لەپاش هاتنی ئیسلام بۆئەم وڵاتە بە عێراقی عەجەم نێوبرا و کەوتەژێر دەسەڵاتی خەلیفە و ئومەوییەکانەوە، لە سەردەمی عەبباسییەکاندا ئێران بۆ چەندین نێوچەی جیاواز دابەشکرا، دەسەڵاتدارانێك حوکمیاندەکرد کە لەلایەن خەلیفە عەبباسییەکانەوە دادەنران، لەپاش ئەمەش حکومەتگەلێکی سەربەخۆ لە چەند ماوەیەکی مێژوویی جیاوازدا، هێندێکیان لەبنەڕەتدا ئێرانیی بوون و نەیانتوانی ئێران یەکبخەن و بیکەنە دەوڵەتێکی سەربەخۆ لە خیلافەتی عەبباسیی، بەڵام سەفەوییەکان توانییان ئێران بکەنە قەوارەیەکی سیاسیی یەکگرتوو کە دەوڵەتێکی نێوەندیی بەهێز بەڕێوەیببات و هەمدیسان مەزەبێکی فەرمییان دانا جیاواز لە وڵاتانی ئیسلامییتر، لە ساڵانی ١٥٠١ بۆ ١٧٧٣ حوکمی ئێران و هێندێك لە دەوڵەتانی هاوسێی ئەم دەوڵەتەیان کرد، تەنانەت دەوڵەتی سەفەویی گەیشتە ئاستێك بانگەشەی ڕێبەرایەتیی کۆی جیهانی ئیسلامیی دەکرد، لەم بابەتەدا هەوڵدەدەین ئەو فاکتەر و هۆکارە دینیی و سیاسیی و ئابووریی و کۆمەڵایەتییانە روونبکەینەوە کە بوونە مایەی سەرهەڵدانی دەوڵەتی سەفەویی شیعەگەرا لەئێراندا.

*) کۆڵەر و نووسەر و مامۆستای زمانناسیی و هێرمینۆتیکا، ئێران.

**یەکەم: باگراوندی شیعەگەرایی لەپێش سەفەوییەتدا**

شیعەگەرایی لە ولاتی فارسدا هەر لە سەدەی یەکەمی ئیسلامییەوە پشکووت وەختێك هێندێك لە عەلەوییە هەلاتووەکان لە چنگی ئومەوییەکان روویانکردە ئەم ولاتە و فارسەکان دالدەیاندان کە دوژمنایەتیی و رقی شاراوەیان هەبوو بەرامبەر بە دەولەتی ئومەویی کە بەخراپیی مامەلەیان لەگەلدا دەکردن و بە مەوالییان دەزانین و بەشێوەیەکی رەگەزپەرستانە مامەلەیان لەگەل دەکردن.

**شیعەگەرایی بەهۆکاری جیاواز لە ولاتی فارسدا (ئێران) بلاوبووەوە نێودەبرێت:**

١. وەك پەرچەکردارێك بەرامبەر بە سەرنخونبوونەوەی ئیمپراتۆرییەتی فارسیی و دەسەلاتی عەرەب بەسەریاندا.

٢. لێکنزیکیی رۆحی باتینیی لە شیعەگەرییدا لەگەل رۆحی عیرفانیی لە ئایینزای زەردەشتیدا و ئایینە رۆژهەلاتییەکان بەشێوەیەکی گشتیی.

٣. بەدمامەلەکردنی دەسەلاتدارانی عەرەب کە نوێنەری فەرمیی ئەهلی سوننە و جەماعە بوون بەرامبەر بە هاولاتییانیان کە عەرەب نەبوون و زۆرجاران پالپشتیی و لایەنگریی فوقەها و زانایانی ئەهلی سوننەییان بەدەستهێنابوو[1].

مەیلی ئێرانیان بەلای شیعەگەرییدا بە ئاراستەی مەزهەبی ئیمامیدا نەبوو بەلکو تەوژمگەلێکی شیعەگەرایی جیاواز پشکووت، لە گرنگترینیان زەیدییەکان لە تەبەرستان لەباکوور و ئیسماعیلییەکان لە خۆراسان و نێوچەکانی رۆژئاوا و باشووری ئێران، دیسانەوە مەزهەبی ئیمامیی لەنێوچە شاخاوییەکان لەنێوەراستی ولاتدا، مەیلیان بەلای هەلبژاردنی یەکێك لەو مەزهەبانەدا نەبوو بەلکو زۆرێك لە ئەهلی سوننە و جەماعە مەیلی شیعەگەرییان هەبوو پتر وەك سوننەگەرایی دوانزە ئیمامیی دەرکەوتن کە زۆر زانا و فەرموودەوان و شاعیریان لەخۆدەگرت کە بەشێوەیەکی فەرمیی سەر بە یەکێك لە مەزهەبە سوننەکان بوون، بەلام مەیلێکی قوولیان لە کن دروستبوو بە ئاراستەی ئیمامەکانی شیعەدا، زۆرجارانیش دەگەیشتە حەددی توندرۆیی (الغلو)[2] ، لە گرنگترین سیمبولەکانی ئەم تەوژمە: حاکمی نەیسابوریی (٤٠٥ك/ ١٠١٤ز مردووە) خاوەنی کتێبی (المستدرك على الصحيحين)، حاکمی حەسکانیی (لە سەدەی

پێنجی کۆچیدا ژیاوه/ دوانزەی زایینی) خاوەنی کتێبی (شواهد التنزیل)، شاعیری ئێرانی بەدیمەن [٣] مەلا جامی (٨٩٨ك/١٤٩٢ز مردووه)، مەلا حوسێنی کاشفیی (٩١٠ك/ ١٥٠٤ز مردووه) خاوەنی (روضة الشهداء)[٤].

چەند رەگەزێکی هاوبەش هەردووك سوننەگەرایی و شیعەگەریی لەئێراندا کۆکردبووەوە لەسەر ئاستی بڕواهێنانی گشت بۆ ئیسلام، زۆرجاران لە ئینتیمای رۆحیی و سۆفیانەی رزگاربوو لە کۆتوبەندەکانی روانینی (النظرة) فیقهیی کەلامیدا بەدیاردەکەوت، وێرای ئەم شیعەگەراییە یاخود نزیکبوونەوە لێی لەسەردەمی سەفەوییەکاندا وەرچەرخا بۆ دامەزراوەیەکی فیقهیی و کەلامیی تەواو دامەزراوە سوننییەکانیتر کەوتنە ململانێ، خۆیان بە ئەلتەرناتیڤی ئەوان دەزانی، لەپێش سەفەوییەکاندا جۆرێك لە فەرهەنگی ئیسلامیی گشتیی باڵی بەسەر ئێراندا کێشابوو جیاوازییە فیقهیی و کەلامییەکان پانتاییەکی وایان داگیرنەکردبوو[٥].

پەرش و بڵاوبوونەوەی شیعە لەپاش هاتنی مەغۆل بۆ وڵاتی فارس هەڵکشا، بەهۆی سیاسەتی لێبوردەییان بەرامبەر بە ئایین و مەزهەبەکان، ئەم مەزهەبە بەرەبەرە بڵاوبووەوە لەگشت وڵاتدا بەهۆی هەوڵ و کۆششی زانایانی شیعە لە گەیاندنی مەزهەبەکەیان لە شار و گوندە جیاوازەکاندا، ئیدی شیعەگەرایی فروانترین مەزهەبی ئیسلامیی بەربڵاوبوو لەپێش هاتنی دەوڵەتی سەفەوییدا، هەروەها هەموو ئاماژەکان بە ئاراستەی دروستبوونی دەوڵەتێکی شیعەدا لەئێراندا دەچوو بەشێوەیەکی فەرمیی لەبارەی وەرچەرخانی دینیی لەپێش چەند سەدەیەکەوە و بەشێوەیەکی رێژەیی خۆی راگەیاند، بەڵام ئەمەش ناکاتە ئەوەی بڵێین کە ئامرازەکانی فشار نەخراوەتەگەڕ لە رەواجدان بە شیعەگەریی لەسەر دەستی دەسەڵاتدارانی سەفەویی، بەڵام ئەم فشارە فاکتەری سەرەکیی نەبوو لە دروستبوونی دەوڵەتی شیعە لەئێراندا، بەڵکو قۆناغێکی یەکلاکەرەوە بوو بۆ وەرچەرخانی دینیی لەوڵاتدا.

دواجار، بڵاوبوونەوەی مەددی شیعەگەریی لەئێراندا فاکتەرێك نەبوو بۆ سەرهەڵدانی دەوڵەتی سەفەویی" وەك ئەوەی لە کن هێندێك لەنووسران دیارە،بەڵکو بەپێچەوانەوە سەرهەڵدانی دەوڵەتی سەفەویی دەرەنجامێك بوو سەبارەت بە پشکووتنی شیعەگەریی لەئێراندا[٦].

خانەوادەی سەفەوییان لە سوننەگەرییەوە وەرچەرخان بۆ شیعەگەریی پێش چەند سەدەیەك لە سەرهەڵدانی دەوڵەتی سەفەویی، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەو قسەیەمان کە مەددی شیعەگەریی یەکێکە لە فاکتەرەکانی سەرهەڵدانی دەوڵەتی سەفەویی، نەوەك بەپێچەوانەوە کە

سەفەوییەت فاکتەری پشکووتن و بلاّوبوونەوەی شیعەگەریی بێت لەئێراندا، بەمشێوەیە شیعەگەریی و سۆفیزم لە خانەوادەی سەفەویدا و لە سەردەمی جونەیددا پێکڕا لکێنران، جونەید یەکێکە لەنەوەکانی شێخ سەفیوددین، خۆشەویستی شا ئیسماعیل، دامەزرێنەری دەولّەتی سەفەویی[٧]، چەندین هۆکار هەبوون هاریکاربوون لەپێکڕا نزیکبوونەوەی شیعە و سۆفیزمدا بەشێوەیەکی گشتیی، وەك هەردووك چەمکی زوهد و ویلایەت کە لە فیکر و کەلتوری شیعەگەریی و سۆفیزمدا بە توندیی ئامادەییان هەبوو لەپاڵ ئەمەشدا دیاردەی توندڕۆیی (الغلو) زیاددەکەین لە کن هێندێك لە گرووپە شیعەکان کە زۆر بیروباوەڕیان لەگەڵ تەسەوفدا هاوبەشن، ئەمەش رۆڵێکی مەزنی گێڕا لە پڕکردنەوەی کەلێن لەنێوان ئەمجۆرە لە شیعەگەریی توندڕۆ و سۆفیزمدا[٨].

وەك نموونەیەك بۆ پێکڕا نزیکبوونەوەی شیعەگەریی و سۆفیزم، یەکێك لە گرووپەکان: کوبراوییە، ژمارەیەك فەیلەسوفی سۆفی مەشرەبی پێشکەشکرد، لەوانە: عــەلائوددەولەی سمنانی (١٣٣٥ مردووە)، سەی عەلی هەمەدانی (١٣٨٥ مردووە) لە نووسراوەکانی هەردووکیاندا هێڵەکان لە فیکری سۆفیی سوننیی و ئیمامیی شیعە یەکیانگرتووە، تەوەری نێوەندیی لە فیکری ئەواندا بریتییەلە دەرخستنی بڕوای دیارنەمانی ئیمام بە چەمکی ئامادەیی هەمیشەیی[٩]. ئەگەر ئەم ئاوێتەبوونە فیکرییە بەهەند وەربگرین کە ژیانی رۆحیی لەئێراندا تایبەتمەند دەکات لەپێش سەرکەوتنی شا ئیسماعیلدا، لەوەتێدەگەین کە لە کن مێژوونووسان" دیارییکردنی مەزهەبیەتی شێخ سەفیوددین (١٢٣٢ز مردووە) ناڕۆشنە، ئەو خاوەنی رێبازی سەفەوییەتە، پرسیویانە: ئایا شێخ سەفیوددین سوننە بووە یاخود شیعە؟ ئەوەی ئەم ناڕۆشنییە راڤەدەکات سەروەریی جۆرێکە لە فەرهەنگی ئیسلامیی گشتیی لەئێراندا کە لەڕووی سەرچاوە و گوزارشتەکانەوە جۆراوجۆرە، لەدیارترین ئەو گوزارشتانە، لەپێش گواستنەوەی رێبازی سەفەوییەت بۆ سولّتانی سەفەویی، پێکڕا کۆکردنەوەی سۆفیزم و ئیمامیەتە، لە چوارچێوەی ئەم کۆکردنەوەدا رەنگە پرسیارکردن لەبارەی مەزهەبییەتی رێبازی سەفەوییەتەوە شتێکی لاوەکیبێت.

مێژوونووسان پێیانوایە شێخ سەفیوددین سوننیی بووە، مەسەلەی شیعەبوونیی و گەڕانەوەی بۆ ئیمام موسای کوڕی جەعفەر ئەلکازم گێڕانەوەیەکە لە سەردەمی ئیسماعیلی سەفەوییدا هەڵبەستراوە وەك بەشێك لە حاڵەتی تەیارکردنی سولّتانیی (التعبئة السلطانية)، گێڕانەوە مێژووییەکان باس لەوەدەکەن کە رێبەرانی رێبازی سەفەوییەت هەر لە دەورانی شێخ خواجە

عەلییەوە مەیلیان بەلای شیعەدا هەبووە و لە دەورانی شێخ جونەید و (٨٥١ك/١٤٤٧ز مردووە) شێخ حەیدەر (٨٩٣ك/١٤٨٥ز مردووە) زۆربەی خێڵ و گوندنشینەکان پەیوەندییانکرد بە ڕێبازی سەفەوییەتەوە، جوولانەوەیەکیان پێکهێنا لەسەر بنەمای بیروباوەڕی مەهدەوییەت، لەپاش دانیشتنی شا ئیسماعیل لەسەر تەختی پاشایەتیی و تاجلەسەرنانی لە تەورێز، بڕیاریدا مەزەبی شیعە بکاتە مەزەبی فەرمیی لەولاتدا، خۆی وەك جێبەجێکاری فەرمانی دوانزە ئیمامەکە دادەنا و ئاماژەی بە روانینەکانی دەدا لەبارەی ئیمام مەهدییەوە کە تاجێکی سووری لەسەرناوە و فەرمانیپێکردووە جیهادبکات[١٠]، هەروەها گوتوویە کە گشت کارەکانی بە فەرمانی دوانزە ئیمامەکە دەردەچێت[١١].

## دووەم: فاکتەرە کۆمەڵایەتییەکانی فراوانخوازیی سەفەویی

ئێران لەپاش رووخانی ئیمپراتۆریەتی ساسانیی لەسەر دەستی عەرەبە موسڵمانەکان بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ دابەشبوونی بەخۆوەبینی، هەر لەوماوەیەدا چەندین حکومەتی پەرتەوازە لەولاتدا سەریانهەڵدا، جەنگی خوێناویی بەردەوام لەنێوانیاندا دروستبوو هیچیشیان نەیاندەتوانی بەشێوەیەکی یەکلاکەرەوە زاڵبن و قەوارەیەکی سیاسیی یەکگرتوو دابمەزرێنن و گەلێك پێکبهێنن لە ولاتێکی بەرفراوانی پەرتەوازە و دابەشبوودا لەرووی تایفیی و رەگەزەوە، ئیدی دەسەلاتی رۆحییان بەکارهێنا بەو وەسفەی کە قوتبی یەکێکە لە رەگەزەکانی سۆفیزم کە ئەوکات لەئێراندا زۆر بەربلاوبوون، ئیدی ئەو دەسەلاتە رۆحییەیان بەکارهێنا بە ئامانجی سیاسیی لەپێناو یەکخستنی ولاتدا و هەمدیسان هەوڵیاندا یەکێتییەکی نیشتیمانیی دابمەزرێنن لەژێر سایەی یەکێتییەکی مەزەبیدا[١٢].

لەپاش هاتنی مەغۆل بۆ ئێران لەنێوەڕاستی سەدەی سیانزەدا و دەستەوسانیی دەوڵەتی ئیسلامیی لەبەرەنگاربوونەوەی ئەم مەددە خوێنڕێژە لە سوپایەکی بێشومار کە گسکی لەهەموو شتێك دەدا و لەپاش خۆی جگەلە کوشتن و خوێن هیچیتری بەجێنەدەهێشت، گەلانی ئیسلامیی لەنێویشیاندا فارس ئەوکات بەتەنها تەسەوف نوێنەری سەرەکیی بوو کە ئێش و ئازارەکانیان کەمبکاتەوە و لەو ترس و دڵەڕاوکێیە ئارامیانبکاتەوە و لەپاش ئەو هەموو وێنە تراژیدیی و تۆقێنەرانە هیوایان بۆبگێڕێتەوە، ئیدی خانەقاکان بەگشت ولاتدا بلاوبوونەوە، کۆڕ و دانیشتنەکان جمەیاندەهات و پڕبوون لە لایەنگران و شوێنکەوتووان[١٣]، لەژێر سایەی

گردبوونەوەی سیاسیی و کۆمەڵایەتی باوی ئەوکاتدا، کۆمەڵگەی ئێرانیی بەشێوەیەکی سەرەکیی لە چوارچێوەی سۆفیزمدا ئاوێتەببوو کە بەگشت وڵاتدا بڵاوبۆوە لەماوەی پێشسەرهەڵدانی سەفەوییەتدا، تێبینی ئەوەدەکەین کە بڵاوبوونەوەی بەرفراوانی سۆفیزم لەئێراندا یەکێك بوو لە تایبەتمەندییەکانی ژیانی رۆحیی بەدرێژایی سێسەدە کە کەوتە نێوان هێرشی مەغۆلیی و هەڵکشانی سەفەوییەت.

لەسەر بنەمای ئەوەی لەسەرێڕا باسمانکرد، گرووپە سۆفییەکان، یاخود تەسەوف لە هەردوو سەدەی چواردە و پانزەدا بێوێنە و تاقانە تەشەنەیانسەند، خانەقا و زاویەکان بەگشت نێوچەکاندا بڵاوبوونەوە، پاشاکان لەڕێبەرانی رێبازە سۆفییەکان نزیکبوونەوە بەئامانجی پشتگیریکردن لە حکومەتەکانیان و زیادبوونی جەماوەریان، لە مومارەسەکردنی دینیدا لە کن خەڵکیی وەرع و رێزگرتن لە شێخانی تەریقەت بەدیارکەوتن کە نموونەی مرۆیی جیاوازیان پێشاندەدا لە سیستەمی پێوەرە کۆمەڵایەتییەکاندا، دیسانەوە لە پێشاندانی گەشەی برایەتییە سۆفییەکان (الاخویات الصوفیة)، لەو سەروبەندەدا لە شاری ئەردەبیل خانەقا سەریهەڵدا، رۆڵێکی زۆر گرنگی گێڕا لەڕووداوەکاندا کە لەپاشدا روویاندا، رێبازێکی سۆفیی نوێ دامەزرا کە سەر بە شێخ سەفیوددینی ئەردەبیلیی بوو (١٣٣٤ مردووە)، جەماوەرێکی گەورەی بەدەستهێنا و ماڵ و داراییەکانی زۆریان چنگکەوت، رێگەی لەبەردەم نەوەکانیدا خۆشکرد کە شکۆمەندییان بنیاتبنێن و دەوڵەت دابمەزرێنن، ئیدی رێبەرایەتی رێبازی سەفەوییەت گوازرایەوە بۆ مناڵەکانی سـەفیوددین، بەمشێوەیە وەلائی شوێنکەوتووانی لە تەریقەتەوە وەرچەرخا بۆ وەلائی خانەوادەیی[١٤].

رێبازە سۆفییەکان هەر لە قۆناغی شێخ سەفیوددینی ئەردەبیلییەوە هەڵوێستێکی بەرهەڵستکارانەیان بەرامبەر بە حکومەتە ستەمگەراکان وەرگرت، سۆفییانی سەر بە رێبازی سەفەوییەت لە خۆشیی و ناخۆشیی خەڵکیدا بەشداربوون، خۆیان لە کۆمەڵگە و کێشەکانی بەدوورنەگرت وەك ئەوەی دەزانرێت لەبیروباوەڕی سۆفیزمەوە، خانەقاکەی شێخ سەفیی و نەوەکانی پەناگەی ئارامی هەر ستەملێکراوێك بوون کە دەیویست بەرگریی لە مافەکانی بکرێت، ئیدی شێخانی سەفەوییەت قودرەتێکی مەعنەویی و کۆمەڵایەتییان بەدەستهێنا لە کن شوێنکەوتووانی رێبازەکەیان، کارێزما بوونیان هاریکاربوو بەو پێیەی سەید بوون و خاوەن پیرۆزیی دینیانە بوون کە سەرچاوەکەی زوهد و دنیانەویستیی بوو هەمدیسان بەپێی بیروباوەڕی

شوێنکەوتووانیان قودرەتی خواییان هەبوو[١٥]. وەك ئەوەی گێڕانەوە مێژووییەکان ئاماژەپێدەدەن" دەنگی پیرۆزیی شێخانی تەسەوف گەیشتە ئەوپەڕی خاڵەکانی ولاتی ئەنادۆڵ و شام[١٦]، بەتێپەڕبوونی کات و زیادبوونی ژمارەی موریدانی شێخانی سەفەویی و کەڵەکەبوونی دیاریی و ماڵ و دارایی و ئەو شتانەی دەبەخشران بە خانەقا، قودرەتێکیتری بۆ سەفەوییەکان دروستکرد، ئەویش قودرەتی کۆمەلایەتیی و سیاسیی بوو کە بووە مایەی بەرقەراربوونی حکومەتی سیاسیی سەفەوییەکان لەئایندەدا[١٧].

لە سەردەمی جونەیدا کە رێبەرایەتی رێبازەکەی گرتەدەست لە ساڵی ١٤٤٥ز، رێبازەکە لەسەر دەستی ئەودا گۆڕدرا بۆ جوولانەوەیەك کە پتر مۆرکی سیاسیی بەسەریدا زاڵبوو هاوسەردەمەکانی تێبینییانکردووە کە "ئەو لەسەر رێگەی پادشایان بوو نەوەك رێگەی گەل"، موریدانیش لە ولاتی رۆم و عەجەم و سەراپای ولات ئەویان دەویست[١٨]، پاشتر رۆڵی سەرکردایەتیی بەرزخوازی شا ئیسماعیل دێتەپێشێ کە توانیی ئەو دامەزراوە کۆمەلایەتیی و دینییە خاوەن ئامانجە سیاسییە بگۆڕێت بۆ جوولانەوەیەکی سیاسیی و لەڕیزەکانیدا هێزێکی سەربازیی شەڕانیی گەورەی جێکردەوە لە خێڵە تورکمانەکان و کردنی بەهێزێکی زاڵ لەئێراندا، لە دەوری نێوەندەکانی هێزە خانەوادەییەکان گردبوونەوە و پاشماوەکانی دەوڵەتە کۆنەکانیان سڕییەوە وەك تەیمورییەکان و خانەوادەکانیتر.

شا ئیسماعیل توانی هەوڵ و تێکۆشانی باوانی کە چارەنووسی زۆربەیان کوشتن بوو وەبەربهێنێتەوە، لە ئاخروئۆخری سەدەی پانزەدا (١٤٩٤ز) دەوڵەتێکی بەهێزی دامەزراند، دوو دانە سەدە بەردەوامبوو رۆڵێکی گرنگی بینی لەسەر کۆی رووداوەکانی ئەو سەردەمە، ئیسماعیلی سەفەویی لە ساڵی ١٥٠١ز) خۆی وەك شای ولات راگەیاند و ئێرانی یەکخست، خواستی دەسەلاتی لە (دار الاسلام)دا بەرفراوانبوو لەڕێگەی ئەنادۆڵ و عێراقەوە، ئەمەش لەگەڵ مەزنترین هێزی سەربازیی و سیاسییدا پێکدادانی دروستکرد، ئەویش هێزی دەسەلاتی عوسمانییەکان بوو هەرچەندێکیش تەمەنی کورتبوو بەلاّم توانی ئێران و عێراق لە ماوەیەکی زۆر پێوانیەییدا داگیربکات.

رێبازی سۆفیزم کە شێخ سەفیوددین دایمەزراند، هاریکاری شا ئیسماعیل بوو لە دامەزراندنی خانەوادەی پاشاییدا، وێڕای ئەو شکستەی کە بەدەست عوسمانییەکانەوە بەریکەوت، بەلاّم خانەوادەی سەفەویی توانی بەردەوامیی بە ژیان بدات، بگرە پاشتر و لە قۆناغەکانی

دواییدا توانییان شکست بە عوسمانییەکان بهێنن، بەهۆی قاعیدەی کۆمەلایەتیی کە لەنێوەندە جیاوازەکانی ئێراندا هەیبوو هەر لە زانا و جووتیار و بگرە تاسەربازیش، بەتایبەت زۆر لە موریدانی سەفەوییەت لەو عەشیرەت و خێلانە بوون کە هاوەلیی شێخ جونەیدیان کردبوو لە ئەنادۆلەوە، شێخانی رێبازە سۆفییەکە و مەزنە پیاوانیان پیرۆزدەکرد، خەرمانەیەکی مەزنی ناسروشتییان پێدەبەخشین.

سەفەوییەکان توانییان بانگەوازی سەروەریی بکەن و خۆیان بگەڕێننەوە بۆ سەر پێغەمبەر (د.خ) لەرێگەی نەوەکەیەوە ئیمام موسای کازم و توانییان جەماوەرێك و خۆشەویستییەکی بەرفراوان لە کن ئێرانییەکان دروستبکەن، سەفەوییەکان خۆیان بە نوێنەری ساحێبزەمان دەزانیی کە بەپێی بیروباوەڕی شیعە غەیبییە، شا ئیسماعیل خۆی بە نوێنەری ئیمامی حوجەت دەزانی، هەروەها بەوەی کە ئیمام فەرمانیپێکردووە بە بووژاندنەوەی مەزەبی شیعە، توانیی بەم بانگەوازە متمانەی خەلکیی بەدەستبهێنێت و پالپشتییەکی جەماوەریی گەورەی بەدەستهێنا لە سەراپای ئێراندا[١٩].

**سێیەم: فاکتەرە سیاسییەکان**

هەر لە هاتنی ئیسلامەوە بۆ ولاتی فارس چەندین دەولەتی تورکمانیی لەم ولاتەدا سەریانهەلدا، ئەوانیش: دەولەتی خەزنەویی، دەولەتی ئیلخانیی، دەولەتی سەلجوقیی، هەردووك دەولەتی ئاققۆینلوو و قەرەقۆینلو و دەولەتی سەفەویی، دەولەتی ئەفشاریی و دەولەتی قاجاریی. زۆرینەی ئەو دەولەتانە لە ئازەربایجان دروستبوون و لە رووداوە سیاسیی و سەربازیی و ئیداریی و فەرهەنگییەکاندا کردیانە نێوەندی خۆیان[٢٠].

وەختێك ئیلخانییەکان فەوتان و لەنێوچوون، هێندێك لە سەرکردە و والییەکان لە ویلایەتەکانی ئێراندا سەربەخۆییان راگەیاند، دیسانەوە خانەوادەکان ویلایەتەکانیان لەنێوان خۆیاندا کوتکوتکرد، لە گرنگترین ئەو خانەوادانە: جەلائیرییەکان (١٣٣٦-١٤١١ز)، موزەفەرییەکان (١٣١٣-١٣٩٣ز)، بەنو ئینجۆفیی فارس (١٣٠٣-١٣٥٧ز)، سەربەدارییەکان لە خۆراسان (١٣٣٧-١٣٨١ز)، شاکانی کرت (١٢٤٥-١٣٨٣ز)، ئاققۆینلووەکان (١٤٠٣-١٥٠٨ز)، قەرەقۆینلووەکان (١٣٨٠-١٤٦٩ز).

تەیمورلەنگ (١٤٠٥ز مردووە) توانیی لەڕێگەی فتوحاتە مەزنەکانییەوە دەوڵەتەکەی (دولة ما وراء النهر) بکاتە پرۆژەی ئیمپراتۆریەتێکی بەرفراوان لەنیودەڵهییەوە بۆ دیمەشق و لە دەریاچەی ئاراڵەوە بۆ کەنداوی عەرەبیی، هەروەها سەمەرقەند بووە پایەختی ئەم ئیمپراتۆریتە هاوچەرخە، بەڵام ئەو سەرکەوتنە سەربازییە تیژڕەوە نەبووە مایەی دامەزراندنی ئیمپراتۆرییەتێکی ڕێکخراو لەپاش مەرگی فاتیحی سەربازیش (تەیمورلەنگ)، نەیانتوانی بەربگرن لە گەڕانەوەی خانەوادەکان بۆ دەسەڵاتداریی نێوچەکانیان، بگرە خۆشیان بوون بە یەکێك لە خانەوادە فەرمانڕەواکان لەباکووری ئێراندا و بۆ ماوەی یەك سەدە لەدەسەڵاتدا مانەوە.

لەپاش کوتکوتبوونی تەیمورییەکان لەگەڵ مردنی تەیمورلەنگدا، ئێران دوو خێڵی لە خێڵە تورکمانییەکان لەخۆگرت، ئەوانیش: "قەرەقۆینلوو" واتە خاوەن مەڕەڕەشەکان، "ئاقۆینلوو" واتە خاوەن مەڕەسپییەکان، لەوکاتانەشدا پشێویی سەراپای ئێرانی گرتەوە، جەنگ لەنێوان هەردوو خێڵەکەدا بەردەوامبوو[٢١]، ململانێ لەسەر دەسەڵات لەنێوان تیرەکاندا لە ناوچەکانی وڵاتدا بەدرێژایی هەردوو سەدەی چواردە و پازدەی زایینیی بەردەوامبوو تادەرکەوتنی ئیسماعیلی سەفەویی، خانەوادە پەرتەوازە فەرمانڕەواکان نەیانتوانی خۆیان بگرن لەبەردەم ئەم تیرە نوێیەی سەفەوییەکاندا. شا ئیسماعیل توانی لە ماوەیەکی پێوانەییدا دەستبگرێت بەسەر ناوچەگەلێکی فراوان لە نێوەڕاست و خۆرئاوای ئێراندا، بەهۆی پشێویی لەگشت نێوچەکانی وڵاتدا و نەبوونی حکومەتگەلێکی بەتوانا کە رکابەریبکات لەگەڵ سەوفەوییەتدا لە ئامانجە سیاسییەکاندا، هیچ شتێك نەیتوانی بەربگرێت لە کشانی بەرزخوازی جگەلە شکستە ناخۆشەکەی لە جەنگی "چالدێران"دا بەرامبەر عوسمانییەکان و تووشی دڵەڕاوکێیکردن لەبەرامبەر ئەم فاتیحە گەنجەدا، پشتیانبەست بە چەك و تەقەمەنی ئاگرین و[٢٢] تۆپخانە، سوپاکەی شا ئیسماعیلیان تێکوپێکشکاند کە بە شمشێر و چەك و تەقەمەنی سەرەتایی دەجەنگان.

عوسمانییەکان هیچ هەوڵێکی ئەوتۆیان نەدا بۆ تەواوکردنی راوەدوونانی پاشماوەکانی سوپای سەفەویی شکستخواردوو و هێرشکردنەسەر ئێران لەبەر چەندین فاکتەران، گرنگترینیان: سەرقاڵبوونیان بە فەتحکردنی ئەوروپا و جەنگە بەردەوامەکانیان لەگەڵ دەوڵەتە ئەوروپییە هاوسێکانیان، نەخواستنی فەتحکردنی ئێران و دەستگرتن بەسەریدا بەهۆی زاڵبوونی سروشتی بیابانیی بەزۆر زۆربەی نێوچەکانیدا، نەبوونی بەرژەوەندیی ئابووریی یاخود سیاسیی گرنگ سەبارەت بە عوسمانییەکان لەوکاتدا.

عوسمانییەکان وایانبینی کە سەفەوییەت لە جەنگی چالّدێراندا کۆتاییپێهاتووە و هیچ شتێك لەگۆڕیدا نییە جارێکیتر بکەونەوە سەرپێی خۆیان، ئەمەش ڕێگەی بۆ سەفەوییەکان خۆشکرد گیانیان بەبەردابێتەوە و هێز و توانایان بگێڕنەوە، وێڕای ئەوەی کە خودی ئیسماعیل بەرگەی ئەو شۆکەی نەگرت، بەتایبەت لە پاش بەدیلگرتنی ژنەکەی، ئیدی ئالوودەی خواردنەوە بوو، هەتامردن بەدەست ئەو شکستەوە دەینالآندا[٢٣].

سەفەوییەکان دەیانویست دڕدۆنگیی و پشێویی لەنێوچەکانی دەسەلاّتی عوسمانیی بخولّقێنن بە ئامانجی لاوازکردنی، ئەویش بەپشتبەستن بە شیعەکانی ئەو نێوچانە، تاکو ببنە پێشەنگ لە جیهانی ئیسلامیدا، ئەمەش وایکرد عوسمانییەکان هەموو ئەو شیعانە لەنێوبەرن کە لە نێوچە سنوورییەکانی ئێراندا بوون[٢٤]، ئەوکات نەخشەی سیاسیی لە گشت رووەکانەوە هاریکاربوو لە دامەزراندنی دەولّەتی سەفەویی یەکگرتوو لەئێراندا.

**چوارەم: فاکتەرە ئابوورییەکان**

ئێران بەرلە حکومەتی سەفەویی رووبەڕووی چەندین کێشە بووەوە، هەمیشە دووچاری جەنگ و مالّوێرانی دەبووەوە، لەلایەن تورك و خەزنەویی و سەلجوقیی و جەنگیزخانی مەغۆلەوە هێرشیدەکرایەسەر و داگیرکەران ولاّتیان تارومارکرد، هەزاران کەسیان دڕندانە کوشت، خوێنیانڕشت و زۆر کەسیان لە خاك و ولاّتی خۆیان کۆچڕەوپێکرد، وەك زانراوە وەختێك سەربازانی مەغۆل روویاندەکردە گوندێك باجی فرەقورسیان لە گوندنشینان دەسەند، مالّ و داراییان دەبرد و تەسەڕوفیان لەمالّەکانیاندا دەکرد، لەبەر ئەم هۆ و هەلومەرجانە کە چەند سالّی خایاند لەئێراندا، گەلی ئێرانی تینووی حکومەتێکی بەهێز و دادپەروەربوو کە پشتیپێببەستێت و هەست بە ئاسایش و ئۆقرەییبکات.

برسێتیی و هەژاریی ولاّتی تەنیبوو گەل بارگرانبوو لەژێر سایەی ستەم و زۆردا، ئیدی یەکێك لە فاکتەرەکانی کەمکردنەوەی ئەو فشارە بەهێزانە، پەنابردنبوو بۆ بیروباوەڕ و تەعالیمە سۆفییەکان، سۆفییەکان ئەوکات خەلّکییان فێردەکرد چۆن لەبەرامبەر چۆرتم و ناڕەحەتییەکاندا ئارامبگرن و گوێنەدەن بە دنیا و ئێشوئازارەکانیی، هەمدیسان داوایاندەکرد واز لە رووکەش بهێنن و گرنگیبدەن بە ناخیان، چونکە لەناخەوە هێزی رۆحیی پەیدادەبێت و مرۆڤ دەتوانێت بەسەر گرفتەکانیدا سەربکەوێت و بەرگەی ناڕەحەتییەکان بگرێت، ئیدی لەبەر ئەو فاکتەرانەی

باسمانکرد تەسەوف خەڵکیی پەلکێشکرد بەلای خۆیدا، ئیدی زاویەی سۆفییان و خانەقاکان بوونە نێوەندی خزمەت و دەسگیرۆییکردنی هەموو تاکەکانی گەل، لەم روانگەیەوە، خەڵکیی مەزنە شێخانی سەفەوییان خۆشدەویست کە لە مەزنە سۆفییەکانی ئەو سەردەمە بوون و رێزیان لێدەگرتن و بەپیرۆز تەماشایان دەکردن.

خانەقاکەی شێخ سەفیوددینی ئەردەبیلیی نێوەندێکی جەماوەریی بەهێزی بەدەستهێنا، وەختێکیش شێخانی سەفەویی هەوڵیاندا لە سەردەمی شێخ جونەید و پاشتردا کە توانای سەربازیی بەدەستبهێنن، زۆرێك لە هەژار و زەبوون و بێبەشکراوان لەکۆمەڵگەدا پەیوەندییانپێوەکردن و، یەکسەریی چوونەسەر مەزەبی شیعە، چونکە بڕوایانوابوو کە دادپەروەریی ئامانجێکی بنەڕەتیی گرنگە لە مەزەبی شیعەدا و رزگاریاندەکات لە حکومەتە زۆردار و ستەمگەراکان[٢٥]. بەمشێوەیە خەڵکی پشتیوانییانکرد لە حکومەتی سەفەویی هاوچەرخ، بەهێز و ئازایەتییەوە پشتگیرییان لە شا ئیسماعیل کرد کە تەمەنی تەنها چواردە ساڵان بوو پێیانوابوو ئەم شا گەنجە رزگارکەریانە و پەناگەیەکی بەهێزە بەرامبەر بە هێرشی تورك و مەغۆل و تەیموریی و ئۆزبەکییەکان، نموونەش بۆئەمە وەختێك شا ئیسماعیل لە دژی ئۆزبەکییەکان دەجەنگا لە خۆراسان، فەرمانی بە وەزیر "ئەمیر یار ئەحمەد ئەسفەهانیی" کرد - بە ئەستێرەی دووەم ناسراوە -سەربازانی ئۆزبەك لەهەرکوێبن بیانکوژن، لەپاش گرتنی قەلای "القرشی" کە بارەگای ئۆزبەك بوو هەرهەموویان کوشتن و گوتی: ئێستا رقەکەم نیشتەوە، چونکە تۆڵەی ئەو کوژراوانەم کردەوە کە جەنگیز و تەیمور کوشتنیان[٢٦]، ئۆزبەکییەکان لەبارەی ئەم جەنگەوە دەڵێن: "قەزاوقەدەر بوو ئەو ولاتەی رەشەی بەسەر ئێمەدا هێنا، وەك تۆڵەسەندنەوەیەك بۆئەو کوشتوبڕەی کە بە فەرمانی جەنگیز و تەیمور قەوما و جەزاکەشی هەقە، ئەو ئیسماعیلە وەك دەجالە بەهۆی تووڕەیی و دڵڕەقییە زۆرەکەی بەرامبەر بە ئێمە"[٢٧].

لەلایەکیترەوە، لەو سەروبەندەدا ئەوروپییەکان روویانکردە ئێران، چونکە عوسمانییەکان رێگەی بازرگانیی نێوان رۆژهەلات و رۆژاوایان گرتبوو بەهۆی گرتنی قوستەنتینیە (١٤٥٣ز)، بۆیە ئەوروپییەکان لایەنگری ئێران بوون بە ئامانجی لێدانی عوسمانییەکان و کردنەوەی رێگەی بازرگانیی، عوسمانییەکانیش بیریان لەوەدەکردەوە پەلاماری زەوییە بەپیتوبەرەکەتەکانی ئەوروپا بدەن نەوەك چاوبڕینە بیابانەکانی ئێران، بەمهۆیەوە روویانکردە ئەوروپا و روویان لە ئێران نەکرد مەگەر لەجەنگێکدا دژبە ئەوروپییەکان بشکانایە یاخود دەستیان بەتاڵبوایە و لە جەنگ

تەواوبوونایە(٢٨).

کۆی ئەم فاکتەرانە زەمینەیەکی لەبار و گونجاوی بۆ حکومەتی سەفەویی رەخساند و شا ئیسماعیل توانی حکومەتێکی کارا لەکاتێکی کەمدا دابمەزرێنێت، جەماوەرێکی بەرفراوانی بەدەستهێنا و بەرهەڵستکارەکانی دەچەوسانەوە، وێڕای ئەوەی سوڵتانی عوسمانیی لە شەڕی چاڵدێراندا شکستی پێهێنا، بەڵام حکومەتەکەیی و مەزەبی شیعە کە کردیە مەزەبی فەرمیی وڵات مایەی قبوڵکردنی جەماوەرێکی بەرفرانبوو کە هەرگیز نەلەرزێت، هەمدیسان جێگرەوەکانی توانییان لە دەسەڵات بەردەوامبن و توانای حکومەتی سەفەویی زیادبکەن، تاکو ببێتە رکابەرێکی جیددیی و بەهێز بەرامبەر بە ئیمپراتۆریەتی عوسمانیی سوننیی.

•••

**پەراوێزەکان**

**١. الشيعة في إيران، رسول جعفريان، المترجم: على هاشم الاسدي، منشورات (مركز الدراسات الاسلامية)، مشهد، ١٩٩٩.**

**٢. بڕوانە: پێشەکیی (رسول جعفريان) لەسەر کتێبی: (وسيلة الخادم إلى المخدوم در شرح صلوات چهارده معصوم)، فضل الله بن روزبهاني الخنجي الاصفهاني، منشورات انصاريان، قم، ١٩٩٥.**

**٣. شاعیرێکی سۆفیی سوننەی بەدیمەنە، دیوانێکی شیعریی عیرفانیی هەیە بە بۆنوبەرامەی شیعانە لە ستایشی ئیمامەکانی شیعەدا، گۆڕەکەی لە شاری تربت جامە، شارێکی سوننییە زۆرێك لە خەڵکی سوننە مەزەبی خۆراسان و بلوجستان زیارەتی گۆڕەکەی دەکەن.**

**٤. ناونیشانی یەکەم کتێبی شەهیدکردنی ئیمام حوسێنە بە زمانی فارسیی، چەند چیرۆکێکی خورافیی لەخۆدەگرێت سەبارەت بە قەومانی عاشورا.**

**٥. بڕوانە: الفقيه والسلطان، وجيه كوثراني، دار الطليعة، بيروت، ٢٠٠١، ص ١٠١-١٠٥.**

**٦. هەمان سەرچاوەی پێشوو.**

**٧. صفويه در عرصه دين فرهنك و سياست (الصفوية على الصعيد الديني والثقافي والسياسي)، رسول جعفريان، ج٢ ص٥١٥.**

٨. الصلةبين التصوف والتشيع،مصطفى كامل الشيبي، ج٢ ص٣٦٢-٣٦١.

٩. دەربارەى ئەم شاردنەوەيە لە شيعرى فارسيدا بگەڕێرەوە بۆ: حسن الامين، دائرة المعارف الاسلامية الشيعية، .Encyclopedia of Islam: Art Iran (التصوف في الشعر الفارسي) ج٢ ص٣٣٩.

١٠. الصلةبين التصوف والتشيع،مصطفى كامل الشيبي، ص٣٨٨.

١١. ايران عصر صفوي (إيران في العصر الصفوي)، راجر سيوري، ترجمة كامبيز عزيزي، طهران، نشر المركز، الطبعة الثامنة، ١٩٩٩، ص٢٦.

١٢. نقش مذهب در روابط إيران وعثماني در عهد صفويه از اغاز تا ابتداي سلطنت شاه عباس (دور المذهب في العلاقات الايرانية العثمانية من أول الصفوية إلى حكم الشاه عباس)، داود شاهي، رسالة ماجستير في فرع تأريخ الاسلام، جامعة أصفهان، (٦ أكتوبر/ تشرين الاول ٢٠٠٦).

١٣. سيرى در تصوف وعرفا ايران (نظرة في التصوف والعرفان في ايران)، محمود عبد الصمدي، ص٥٦-٥٧.

١٤. جستجو در تصوف ايران (البحث عن تصوف ايران)، عبدالحسين زرين كوب، ص٢٣٢.

١٥. صفوة الصفا، ابن بزاز، تصحيح وتحقيق: غلا ملاضا طباطبايي مجد، الطبعة الثانية، طهران، عام ١٣٧٦، ص٨٨.

١٦. تاريخ عالم اراي اميني،فضل الله روزبهان خنجي، تصحيح وتحقيق: محمد اكبر عشيق، طهران، منشورات ميراث مكتوب، الطبعة الاولى، ص٢٦١.

١٧. هويت سياسي دولت صفوي (الهومية السياسية للدولة الصفوية)، محسن بهرام نجاد،في مجموعة مقالات (ايران عبر التاريخ)، جامعة تبريز،١٣٨٣هـ/١٩٦٣م.

١٨. دائرة المعارف الاسلامية الشيعية، مادة الصفويين، مصطفى كامل الشيبي،ج٣، ص٢٢٠.

١٩. ايران در روزكار شاه اسماعيل وشاه طهماسب صفوي (إيران في عهد شا إسماعيل و شا طهماسب الصفوي)، أمير محمد بن خواندمير، ترجمة: غلام رضا طباطبائي مجد، طهران، مؤسسة دكتور محمود أفشار، عام ١٩٨٠، ص١٢٦.

٢٠. الصفويون والدولة الصفوية،فوزي توركر، مجلة ديوان العرب، يناير ، ٢٠٠٧

٢١. تأريخ الصفويين وحضارتهم، بديع جمعة وأحمد الخولي، القاهرة، دار الرائد العربي، ١٩٧٦م، ص٣-١٢.

٢٢. الصلةبين التصوف والتشيع، مصطفى كامل الشيبي، ج٢ ص٣٦٧-٣٦٦.

٢٣. انقلاب الاسلام بين الخواص والعوام، محمد عارف اسهناقچى پاشا زاده، منشورات دليل، قم، الطبعة الاولى، ص١١٢.

٢٤. نقش مذهب در روابط ايران وعثماني در عهد صفويه از اغاز تا ابتداى سلطنت شاه عباس (دور المذهب في العلاقات الايرانية العثمانية من أول الصفوية إلى حكم الشاه عباس)، داود شاهي، رسالة ماجستير في فرع تأريخ الاسلام، جامعة أصفهان، (٦ اكتوبر/ تشرين الاول ٢٠٠٦م).

٢٥. شا إسماعيل أول، منوتشهر بارسا دولت، منشورات شركت سهامي انتشار، الطبعة الاولى، ١٣٧٥، ص١٠٢.

٢٦. عالم اراي صفوي، المؤلف مجهول، منشورات بنياد فرهنك ايران، طهران، ١٩٧٠، ص٣٧٢.

٢٧. عالم اراي صفوي، ص٣٧٥.

٢٨. مسعود موسوي شفايي، تحولات روابط ايران وعثماني، مجلة كزارش كفت و كو العدد١٥، بهمن واسفند ١٣٨٥ش، (فبراير/ شباط ومارس/ اذار ٢٠٠٧، ص ٢٣-٢٤.

# خۆکوشتن
# وەك دیاردەیەکی ئاڵۆز و فرەڕەهەند

ڕەنج عەبدوڵڵا سەعید

**پێشەکی**

خۆکوشتن دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییە کە ڕێژە و شێوەکانی لەناوچەکەیەوە بۆ ناوچەیەکیتر و لەو ناوچەیەدا لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکیتر و لە سەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکیتر گۆڕانی بەسەرداد‌ێت، خۆکوشتن واتە سڕینەوەی نفوسی خود و سڕینەوەی ئامادەیی خودە لەژیاندا، ئەم دیاردەیە کۆمەڵێك هۆکاری کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسی و دەروونی و بوونی نەخۆشی درێژخایەن.. لەپشتییەوەن کە تاك وەك دوایین فریادڕەسی خۆی پەنایبۆدەبات، زانا و فەیلەسوف و کۆمەڵناس و دەروونناس و بیرمەندەکان تێڕوانینی جیاوازیان هەیە لەبارەی ئەم دیاردەیەوە کە هەندێکیان وەك کارێکی دزێو و چەوت و خراپ بۆیدەڕوانن و هەندێکیتریان وەك کارێکی جەربەزەیی و جوامێرانە لێیدەڕوانن و چێژ لە مەرگدۆستی دەبینن لەلایەن تاکەوە، وەك ئەلبێرت کامۆ و چیخۆف و سارتەر.

خۆکوشتن ڕووداوێك نییە کە مرۆڤ بەبێ بیرکردنەوە و بەبێ بوونی کاریگەرییەکی خراپ لەسەر تاك یان چەند کاریگەرییەك، پەنابۆخۆکوشتن ببات، واتە حاڵەتێکی کتوپڕنییە کە مرۆڤ ڕاستەوخۆ ئەنجامیبدات، بەڵکو مێژوو و ڕەگوڕیشەیەکی قووڵی هەیە و بە چەند قۆناغێکدا تێپەڕدەبێت، تا وا لە تاك دەکات پەنایبۆبەرێت کە سەرەتا بە قۆناغی بیرکردنەوە لەخۆکوشتن دەستپێدەکات و کۆتا قۆناغی خۆکوشتنی تەواوەتییە.

لەڕاستیدا خۆکوشتن دیاردەیەکە ڕاستەوخۆ لەهەموو دید و بۆچوونەکانەوە وەك حاڵەتێکی تاوانکاری سەیرکراوە، لەلایەنی ئایینی و کۆمەڵایەتی و مەعریفی و ئەخلاقی و زانستی و یاساییەوە ڕەتکراوەتەوە، هەرئەمەش بووە بەردەوام هەوڵی کەمکردنەوەی ئەم دیاردەیە دراوە لەبەگەڕخستنی هێزی تەواوەتی ئایین و کۆمەڵگا و یاساوە.

**بەشی یەکەم: خۆکوشتن چییە؟**

بۆ زیاتر روونکردنەوەی بابەتەکە لێرەدا پێناسەی هەردوو چەمکی کوشتن و دیاردە دەکەین:

کوشتن: وەك کردەیەك: خوێنرشتن و خاڵیکردنەوەی جەستە لە رۆح و جووڵەی وەك کائینێکی بایەلۆژی و پاشان ونکردنی هیوا و ئاوات و ژیان و پەراوێزخستن و شاردنەوەی راستی و ئازادی و مافی بوون لە تاکێکەوە وەك مرۆڤ وەك کائینێکی کۆمەڵایەتی بەهەموو ماناکانیەوە لەلایەن کەسێکی خۆبەزلزانەوە و تەنها شتبووە خۆویستن و گیانی نەرجسییەوە.[١]

هەروەها سەبارەت بە دیاردەی کۆمەڵایەتی (بریتییەلە هەر شێوازێکی هەڵسوکەوتکردن، جێگیربێت یان ناجێگیر، دەشێت جۆرێك لە فشار و ئیجبارکردنی دەرەکی بخاتەسەر تاکەکان، یان بریتییەلە هەر رەفتارێك کە تەواوی کۆمەڵگەی گرتبێتەوە، بوونێکی تایبەتی هەبێ و سەربەخۆ لەو وێنانەی لە دۆخە تاکییەکاندا لێیاندروستدەبێت).[٢]

**خۆکوشتن چییە؟**

چەمکی خۆکوشتن لەو چەمکانەیە کە مشتومڕ و بگرەوبەردەیەکی زۆری لەبارەوە هەیە، خۆکوشتن لەلایەنی زمانەوانییەوە مانای لەناوبردنی خودی مرۆڤ دەگرێتەوە و لە وشەیەکی لاتینی کۆنەوە وەرگیراوە کە لە هەردوو وشەی (CONDEN) کە مانای دەکوژێی هەیە و (Sui) بە مانای (خود یان من) پێکدێت و بەگشتی ئاماژە بۆ ئەو کەسە دەکات کە خۆیدەکوژێت، لە زمانی عەرەبیشدا (الانتحار) کە لە (نحر)ەوە داتاشراوە بە مانای سەربڕین دێت.[٣]

**خۆکوشتن:**

خۆکوشتن لە سادەترین مانایدا ئەوەیە کە کەسێك لەبووندا بوونی خۆی نەفیبکات و جەستەی خۆی رەشبکاتەوە، واتە زیندوویەتی لەدەستبدات و جووڵە و بزۆکی خۆی بگۆرێت بە متبوون، ئامادەیی خۆی لە پرۆسەی ژیاندا بسڕێتەوە و بەرەو نائامادەیی ئاراستەیبکات، بەشێوەیەکیتر خۆکوشتن ئەوەیە کەسێك بۆدی و رۆحەکەی، روخسار و جەوهەرەکەی دیار و نادیارەکەی لەژیاندا نەهێلێت و تەحویلی مەرگی بکات.[٤]

یان خۆکوشتن بڕیارێکی خۆویستانەی تراژیدییە لە چوارچێوەی زنجیرەیەك کرداردا تاك

ئەنجامیدەدات بۆ وێرانکردنی ژیانی بەدەستی خۆی بێهیچ هاندانێك لەلایەن کەسانیدیکەوە یان بێئەوەی خۆی بکاتە قوربانی بەهایەك یان مەسئەلەیەکی کۆمەڵایەتی.(٥)

یان خۆکوژی بە مانای (وازهێنان و پشتهەڵکردن لە بوون و ژیان، دواکردە و هەڵوێستی مرۆڤە لەهەمبەر ژیانی تاکەکەسی خۆیدا.(٦)

یان خۆکوشتن هەموو ئەو حاڵەتانە دەگرێتەوە کە مرۆڤ راستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ لەڕێگەی کردارێکەوە ئیتر بەهەر شێوازێك بێت، هەوڵی لەناوبردنی خودی خۆی دەدات و دەیەوێت بەدەستی خۆی مۆمی رووناکی ژیانی بکوژێنێتەوە.(٧)

کەواتە دەتوانین بڵێین خۆکوشتن: دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییە کە لە واقیعی کۆمەڵگەدا تاك وەك داواکاری هەڵدەستێت بەکوشتنی خۆی و ئامادەیی لەژیاندا دەسڕێتەوە کە بەئارەزوو و ویستی خۆی ئەنجامیدەدات جا بەهەر شێوازێك و لەڕێگەی هەر کردارێکەوە بێت و بەهۆی هەر هۆکارێکەوەبێت.

**کورتەیەك لەبارەی مێژووی خۆکوشتنەوە:**

خۆکوشتن دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییە کە لەناو هەموو کۆمەڵگەکاندا بوونی هەبووە، بەڵام بەڕێژەی جیاواز لە کۆمەڵگەیەکەوە بۆ کۆمەڵگەیەکیتر و لەناو هەمان کۆمەڵگەدا لەکاتێکەوە بۆ کاتێکیتر جیاوازی هەبووە، هەرئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە بەردەوام کۆمەڵناسان و فەیلەسوفان و دەروونناسان و ئەنترۆپۆلۆجیستەکان و.. بەردەوام لێکۆڵینەوەیان لە رێژە و ئامارەکانی و هۆکارەکانی خۆکوشتن کردووە. (خۆکوشتن بەیەکێك لەنموونەکانی نەگونجانی مرۆڤ دەژمێردرێت، ئەم رەفتارەش بە کێشەیەکی کۆمەڵایەتی گەورە دادەنرێت کە لە کۆنەوە ئەم بابەتە بووەتە جێگەی پرسیار و بەردەوام ئەم پرسیارە خراوەتەڕوو کە بۆچی مرۆڤ پەنادەباتەبەر خۆکوشتن؟ ئەم پرسیارەش لە دێرزەمانەوە هەوڵی وەڵامدانەوەی دراوە، لەلایەن ئەو کەسانەی کە لە بوارە کۆمەڵایەتی و پزیشکی و دەروونی کاردەکەن.(٨) هەربۆیە زۆربەی فەیلەسوف و زانا و رۆشنبیرەکان ئاماژە بۆئەوە دەکەن کە خۆکوشتن کارێکی دزێو و چەوتە و دژ بە مرۆڤایەتی و شارستانییتەکەیەتی، چونکە دژی خودا و کۆمەڵە و بەردەوامیش هەوڵی زانینی هۆکارەکان و چۆنیەتی خۆپاراستن و چارەسەرکردنی دراوە، لەگەڵ ئەمەشدا رێژەکەی بەرەو زیادبوون رۆشتووە. خۆکوشتن ئەوپەڕی بێئومێدی مرۆڤە کە دەگاتە رادەیەك هیچجۆرە هەستێکی بەرامبەر ژیان

نامێنێت لەوکاتەدا سەنتەری هەست و دەمارە بەرزەکانی توانای وەرگرتن و رێکخستنی نامێنێت، بەجۆرێك توانای بیرکردنەوەی نامێنێت دەرەنجام کەسێتییەکی ئیفلیجدەبێت بەرامبەر کێشەکانی ژیان.[٩]

دیاردەی خۆکوشتن رەگوریشەی لەناخ و قووڵایی مێژووی مرۆڤایەتیدا داکوتیوە، زانای ئەنترۆپۆلۆجی (برۆنسلاو مالینۆفسکی ١٩٤٩ز) ئاماژەدەکات بۆ بوونی ئەم دیاردەیە لەلای هۆزەکانی دوورگەکانی (ترۆبریاند)، هەروەها خانم بندکت دەڵێت: (خۆکوشتن) لەلای کۆمەڵگەی (ئەلوبو)ی خوارووی ئۆپیانوسی باسنیك باوە و کەسانێك هەن کە خۆیان دەکوژن، هەروەها لە کۆمەڵگەی (ئەلیو) لە ئەفریقا، ئەو کەسەی کە دەستدرێژیبکاتەسەر شەرەفی خزم و کەسوکارێکی خۆی کە بۆی حەڵاڵ نەبێت، ئەوا ناچاردەکرێت خۆی بکوژێت.[١٠]

هەروەها بەدرێژایی مێژووی مرۆڤایەتی رەگیداکوتیوە لەلای هۆزە هیندییەکانی ئەمریکای باکوور کە جێی شانازیە خزمەتکار و دیلەکان خۆیان بکوژن پاش مردنی سەرۆکەکەیان، هەروەها لە ئەمریکای ناوەڕاست پاش مردنی سەرۆکخێڵ واپێویستدەکات کە خێزان و خزم و هاوڕێیانی خۆیان بکوژن. ئەم شێوازەی خۆکوشتنە باوبووە لەناو هۆزەکانی هیندستانیش تاوەکو ساڵی (١٩٤٠ز) پاش مردنی پیاو ژنەکەی وەك وەفایەك لەکاتی مەراسیمی بەخاکسپاردنیدا خۆی دەکوشت.[١١]

لە یابان کۆمەڵەی سامورای بەوە ناوبانگیان دەرکردبوو کە بەپێی دابونەریتی کۆمەڵایەتییان لە بۆنە و کاتی تایبەتدا خۆیان دەکوژن. لەلایەکیترەوە لە شەڕی جیهانی دووەمەوە سیستمی خۆکوشتن بە ئامانجی خۆبەختکردن و قوربانی (کامیاز KMIKAZE) سەریهەڵدا.[١٢] کە تاك لەپێناوی رزگارکردنی ژیانی خەڵکیدا خۆی بەختدەکات بۆ نموونە لە ئابی ساڵی (١٩٤٥) داوای خۆبەخشیان کرد بۆ سواربوونی بۆمبی گەورە بۆ لەناوبردنی کەشتی و ژێردەرياییەکانی دوژمنان ژمارەی خۆبەخشەکان گەیشتە (١٢٢٨) کەس و توانیان (٢٨) کەشتی ئەمریکی نووقمبکەن و زیان بە (٢٨٠) کەشتیتر بگەیەنن.[١٣]

لەتەوراتیشدا چەند نموونەیەك دەربارەی خۆکوشتن ئاماژەی بۆدەکرێت لەوانە (خۆکوشتنی (شمشۆن)و (شائولی) پاشا و (اختوفلی) سەرکردە. لە شارستانییەتی کۆنی یۆنانیدا دیاردەی خۆکوشتن هەبووە لەوانە خۆکوشتنی (سوکراتی فەیلەسوف بە خواردنی ژەهر)، لەرۆمانیشدا خۆکوشتن هەرهەبووە بەتایبەتی بۆ خۆرزگارکردن لە ژیان و بارودۆخی دژوار و نالەبار، وەك

خۆکوشتنی (بروتوس، سینیکا، کاتو).[١٤]

جۆرێکیتر لە خۆکوشتن بریتییەلە خۆکوشتنی بیروباوەڕیانە کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەفسانەی (ساموری) کە بەدرێژایی تەمەن لەپاڵ درەختێکدا دەژیا پاش وشکبوونی درەختەکە بڕیاردەدا خۆی بکوژێت تاگیانی لەگەڵ درەختەکەدا یەکبگرێت و پێکەوەبژین، هەمانجۆری خۆکوشتن لەهەندێ هۆزەکانی ئەسکیمۆدا هەیە کە لە باکووری ئاسیادایە، ئەویش بە خواردنی خۆڵی سەرگۆڕی مردووەکە تاوەکو دەمرن بە نیازی یەکگرتن،[١٥] هەروەها مرۆڤە بە ساڵاچووەکانیش لەهەمانشوێندا واتە لەلای ئەسکیمۆکان لەکاتی گرانی و برسێتیدا خۆیاندەکوژن.[١٦]

### بەشی دووەم: قۆناغەکانی خۆکوشتن

خۆکوشتن یەکسەر ڕوونادات و کتوپڕنییە، بەڵکو ڕەگوڕیشە و مێژوویەکی دووردرێژی هەیە، بەچەند قۆناغێکدا تێپەڕدەبێت تادەگاتە ئەوکاتەی مرۆڤ بڕیاری یەکلاکەرەوە دەدات و کارەکە بەئەنجامدەگەیەنێت. واتە باری دەروونی ئەو کەسانەی خۆیان دەکوژن وەك میزەڵدانێکە کە ئازار و مەینەتی و فشار و زوڵم و زۆری ڕۆژگار پڕیکردووە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ هەرگەورەبووە، تاگەیشتووەتە ئەوڕادەیەی کە یەك فویتر (فشارێکیتر) دەیتەقێنێتەوە.[١٧]

دەتوانین بڵێین هەر کردارێکی خۆکوشتن کە ڕوودەدات پاشخانێکی گەورەی لە ئازار و دەرد و ناڕەحەتی هەیە کە ئەمەش پەیوەندی بەوکەسەوە هەیە کە گیرۆدەی ئەو خەم و ئازارەیە، واتە کەسێك کاتێك خۆی دەکوژێت خەڵکی بە ڕەفتار و هەڵسوکەوتی کاتی بارودۆخی خۆکوشتنەکە تەفسیریدەکات، ناگەڕێتەوە بۆ پێشتر بۆ زانینی هۆکارەکانی و لەکوردەواریشدا دەوترێت: (کە جام پڕبوو لە سەری دەڕژێت).

### خۆکوشتنیش بە چەند قۆناغێکدا تێپەڕدەبێت

بیری خۆکوشتن: بیرکردنەوە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ لە خۆکوشتن یان خۆئازاردان، بەڵام بەبێ دەربڕینی نیبەتێکی ڕاست و هەبوونی ڕەفتاری خۆکوژی،[١٨] واتە مێژوویەکی پڕلە گرفت و ئەندێشە، واتە ئەوکەسەی خۆی دەکوژێت زۆربەی ژیانی ڕابوردووی پڕلە کارەسات و گرفت و خەم و خەفەت بووە، ماوەیەکی زۆر بەدەستیانەوە ناڵاندوویەتی.[١٩]

واتە دەتوانین ئەوە بە حاڵەتێکی هەڵەشەیی ناوببەین کە مەبەست لەحاڵەتەش رەفتاری خێرا و کتوپڕ و لەناکاوە، تەنانەت لەو حاڵەتەدا لای ئەوکەسە خۆشی بیرۆکەیەکە بەخێرایی دروستدەبێت، دەکەوێتە پێش ئەم رەفتارە و هاوکاتیشە لەگەڵیدا، بەلآم وەك دەردەکەوێت ناڕواتە بواری دەرککردنی عەقڵەوە.[٢٠] واتە تاك بەشێوەیەکی راستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ بیر لەوەدەکاتەوە خۆی بکوژێت، بەلآم رەفتاری خۆکوشتنی نییە.[٢١]

هەروەها لەژناندا ئەوانەی بەردەوام پێویستیان بەجەختکردنەوەی دەوروبەر لە تواناکانی و دڵنەوایکردنییەوە هەیە بەرامبەر بەو بابەتانەی جێگەی بایەخە لای ئەوان و خاوەنی کەسایەتییەکی نیمچە هەرزەکارانەن و لەڕووی سۆزداری و دەروونییەوە ناسەقامگیرن، ئەگەری بیرکردنەوە لە خۆکوشتن ئەگەرێکی دوورنییە لەژیانیاندا ئەگەر هەندێك فاکتەریدیکە بوونە هاندەری، کەسێتی ئەم ژنانە بە شەڕەنگێز و توندوتیژ بەرامبەر دەوروبەر و خۆشیان دەناسرێت کە هۆکارەکەی بۆ چەپاندن و ئارەزووە ئاسایی و سێکسوالێتییەکان دەگەڕێتەوە. تێڕوانینێکی رەشبینانەیان بەرامبەر بە ژیان و ئەوکەسانە هەیە کە لێیانەوەنزیکن، هەست بە بوونی خۆیان ناکەن، لە بۆشاییەکی پووچدا دەسووڕێنەوە و تواناکانی خەیاڵکردنەوە و وێناکردنیان پووکاونەتەوە و جگەلە خۆکوشتن بیر لە هیچ هەوڵ و رێگەچارەیەك ناکەنەوە بۆ زاڵبوون بەسەر ئەوبارە دژوارەی تێیدادەژین و ئەو فشارانەی واقیعی ژیان بەسەریاندا سەپاندوویەتی.[٢٢]

### هەڕەشەکردن بە خۆکوشتن:

تاك راستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ لەڕێی دەربڕینی قسە یان نووسینەوە، هەڕەشەی خۆکوشتن دەکات،، بەلآم بەشێوەی کرداری هیچناکات.[٢٣] لەڕاستیدا لە زۆربەی ئەو توێژینەوە و بەدواداچوونانەی لەسەر خۆکوشتن ئەنجامدراون باس لە کۆمەلەنیشانەیەك دەکەن کە لەو کەسانەدا بەدیکراوە کە بەنیازبوون خۆیان بکوژن یان مەیلی لەوجۆرە بەخەیاڵیاندا هاتووە، بۆ نموونە هەندێك دەستەواژەی وەك ئەمانە دووبارەدەکەنەوە (ئەمە کەی ژیانە)، (مردن لەم ژیانە خۆشترە) ، (بۆچی خوا نامکوژێت و لەم ژیانە رزگارمببێت) یان (ناتوانم لەم ژیانە بەردەوامبم)، (نازانم خەڵکی چۆن پێدەکەنن)، (ئەم ژیانە شایەنی ئەوە نییە بۆی بژیت)، (خۆزگەم بەوانەی لەژێر خاکدا نووستون و بێئاگان)..[٢٤] واتە دەتوانین بڵێین کە ئەمە لاوازی خۆسازدانە بۆ پرۆسەی خۆکوشتن، ئامانجەکەی مردن نییە، بەڵکو ئاڕاستەکردنی پەیامێکی هەڕەشەئامێزە یان

هەڕەشەکردنە یان بانگەشەی داواکردنی یارمەتییە لەکەسانیدیکە، لەبەرئەوە خۆسازدان بەنارێکی و لاوازی بەڕێوەدەچێت، بەوەی لەهەندێك حاڵەتدا ئارەزووی خۆیان بەچەند دەقیقەیەکی کەم دەدرکێنن.[٢٥]

بۆ نموونە ئەو ژنانەی هەڕەشەی خۆکوشتن دەکەن بەهەمانشێوەی ئەوانەی هەوڵی خۆکوشتن جێبەجێدەکەن، دەیانەوێت بەمکارەیان دەوروبەریان هانبدەن بۆ چارەسەرکردنی کێشە و رەوینەوەی نارەحەتییەکانیان و بەدیهێنانی ئارەزووەکانیان واتە ئەو ژنانەی هیوایەکی گەورەیان بە ژیان هەیە تا ئەو ئاستەی دەگاتە قوربانیدان بە جەستەی خۆیان، ئەمەش جیاوازییەکی گەورەی هەیە لەگەڵ خۆکوشتندا.[٢٦]

### رەفتاری خۆکوشتن (خۆکوژی):

هەڵدەستێت بەهەندێك رەفتار دڵنیایە نابێتە هۆی مردن وەك خواردنی بڕێك دەرمان کە زیاترە لە بڕی چارەسەر، بەڵام ناگاتە ئاستی خۆکوشتن..[٢٧] یان هەندێ رەفتار دەکات بەمەبەستی خۆئازاردان کە دڵنیایە نابێتە هۆی مردنی وەك هەوڵدان بۆ بڕینی دەماری مەچەکی یان هەرشوێنێکیتر بە چەقۆ..[٢٨] بۆ نموونە دەچنە چێشتخانەیەکەوە، خوێنهێنەری مەچەکیان دەبڕن و کاتێك خوێن دێتەخوارەوە دێنەدەرەوە و بەرەوڕووی ئەوکەسانە دەڕۆن کە لەوێن تا بیانتۆقێنن جەخت لە رازی نیازیشیان بۆ خۆکوشتن بکەن کە لەڕاستیدا ئەوان دەستێوەردانی راستەوخۆ دەکەن لەوکەسانە بۆئەوەی یارمەتیانبدەن و بەفریایانەوەبێن یان بەبڕی کەم دەرمان دەخۆن، لەڕێی تەلەفۆنەوە قسەدەکەن لەگەڵ دایکیان یان هاوڕێیان یان خۆشەویستەکەیان، تا بەشێوەیەکی تراژیدی خۆکوشتنەکەیان ئاشکرابکەن، ئەویش لەڕێی وتنی کۆمەڵێك وشەی وەرگیراو لە چیرۆکە سۆزدارییەکان یان لە قەسیدەی شاعیرە عاشق و ئازاکان.[٢٩]

### هەوڵی خۆکوشتن:

زیان بەخۆگەیاندن بەمەبەستی خۆکوشتن کە لەوانەیە ببێتە هۆی برینداربوونی بچووك یان گەورە، بەمەبەستی کۆتایهێنان بە ژیانی خۆی ئەنجامیدەدات وەك بریندارکردنی جەستەی خۆی.[٣٠] لێرەوە ئامرازەکانی خۆکوشتن و هەوڵدان بۆ خۆکوشتن جیاوازدەبن، چونکە ئامانجەکان جیاوازن، بەپێی ئەو داتا و نموونانەی توێژەران و پسپۆڕان کاریان لەسەرکردووە، ئەو کەسانەی

هەوڵی خۆکوشتن دەدەن، بەشێوەیەك هۆکاری خۆکوشتن بەکاردەهێنن کە بواردەدەن بە کەسانی چواردەوریان بۆ دەستێوەردان و یارمەتیدانیان، بەڵام ئەوانەی خۆیان دەکوژن هۆکاری زۆر توندوتیژ بەکاردەهێنن کە راستەوخۆ بەهۆیەوە گیانلەدەستدەدەن، فرسەتی دەستێوەردان لەلایەن کەسانی چواردەورەوە زۆر بچووکە، ئەگەر فریای ئەوەش بکەون کات تێپەڕبووە، ئەوکەسە بەهۆی سەختی ئازار و برینەکانیانەوە گیانلەدەستدەدەن، (فاربەر و شنیدمان) تێبینییانکردووە، ئەوانەی هەوڵی خۆکوشتن دەدەن هۆکاری کەم و کارا و لاواز بەکاردەهێنن، وەك حەپە هێورکەرەکان و بڕینی خوێنبەر، بەڵام ئەوانەی خۆیان دەکوژن هۆکارێکی خۆکوشتن هەڵدەبژێرن کە کارابیەکی خێرای هەیە وەك خنکان و فیشەك هەروەها لە شوێنێك ئەنجامیدەدەن کە دووربێت لە بواری کۆمەڵایەتی.(٣١)

**خۆکوشتنی تەواوەتی (خۆکوشتنی سەرکەوتوو):**

کەسەکە بەتەواوی کۆتایی بە ژیانی خۆی دێنێت بەهەر رێگایەك بێت، دەرمانخواردن یان سووتان بێت لە خۆکوشتنی سەرکەوتوودا مردن دێتەدی و وێرانکردنی خود یەکجارەکییە، ئارەزووی مردن لێرەدا لەڕێی رەفتارێکی واوە بەدیدێت کە جێبەجێکردنی تێر و تەواوە، تیایدا بۆ هەتایەهەتایە وزەی ژیان لە جەستەی جیادەبێتەوە، هیچ هەوڵدانێك بۆ چارەسەرکردن سوودینابێت، کەسی مردوو دەبێتە قوربانی خودی خۆی و خۆکوشتوو هیچ ئامرازێك بۆ رزگارکردن بەجێناهێڵێت.(٣٢)

هەروەها لە لێکۆڵینەوەکانی (تیاچر و جاکۆبز) دەریانخستووە، زۆر لەو هەرزەکارانە بەرگەی ئەو گرفت و خەم و خەفەتانەیان دەگرن، بەڵام سەرهەڵدانی گرفتی تازەتر و پچڕاندنی هەموو سەرەداوە باریکە کۆمەڵایەتییەکانیتر کە ئەو تاکە بە کۆمەڵگەکەیەوە دەبەستێت و کوژاندنەوەی هەموو تروسکاییەکان و هەستکردن بەنامۆیی، دواهەمین قۆناغە و ئەوجۆرە مرۆڤانە خۆیان دەکوژن.(٣٣)

**دیاردەی خۆکوشتن و پەیوەندی بە تاوانەوە**

لێرەدا پێویستە کۆمەڵێك پرسیاربکەین ئایا خۆکوشتن کارێکی قبوڵکراوە لەلایەن کۆمەڵگا و خێزان و هاوڕێ و دەوروبەرەوە؟ ئایا خۆکوشتن تاوانە؟ ئایا خۆکوشتن بە زمانی ئایین

گوناهه (حەرامە)؟ ئایا ئێمه كاتێك بەپێی مۆدێرنه مافمان هەیە، دەبێت خۆمان بکوژین؟ ئایا یاسا رێگەی بە خۆکوشتن داوە؟.. هتد.

تێڕوانینی ئایین بۆ خۆکوشتن: لە هەندێ گەل و نەتەوەدا حەرامی و حەلاڵی خۆکوشتن بۆ تاکەکانیان دیار و ئاشکرانییە، واتە نە بەشێوەیەکی ئاشکرا پشتگیری و هانیدەدەن، نە لەڕێگەی ئایین و یاساکانییەوە حەرامیدەکەن، واتە حەز و ئارەزوو و ویستی خۆکوشتن بۆ تاکەکانیان بەجێدەهێڵن، بەڵام هەندێك ئایین و یاساش بە ئاشکرا حەرامیانکردووە هەڕەشەی گوناه و سزا لەوکەسانە دەکرێت کە خۆیان دەکوژن.[٣٤] لەئیسلامدا باس لە حەقیقەتی مردن دەکات و هەموو نەفسێ دەبێت بمرێت هەموو مردنێ بە فەرمانی خوداوەندە خۆکوشتنیش گوناهێکی گەورەیە، لە قورئانی پیرۆزدا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلاَ تَقْتُلُواْ أَنفُسَكُمْ إِنَّ اللّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا﴾ سورەتی ئەلنیساء ئایەتی (٢٩)، واتە: (خۆتان مەکوژن خوا بەبەزەییە بەرامبەرتان).[٣٥] هەروەها پێغەمبەر (د.خ) لەفەرمودەکانیدا دژی خۆکوشتن وەستاوە. (جابری کوڕی سەمرە دەڵێت: جارێکیان بە پێغەمبەریان (د.خ) گوت کە پیاوێك خۆی کوشتووە، ئەویش لەوەڵامدا وتی: نوێژی لەسەر ناکەم) (أخرجه أبو داود).(٨)

لە ئایینی مەسیحی و جوولەکەدا ئەمە زۆر رووننەبوو واتە بەئاشکرا قەدەغەنەکراوە، بۆیە خۆکوشتن زۆربوو و بەردەوام لەزیادبووندا بێت و رێژەکەی بەرزبێتەوە تا وای لە زۆر قەشە و حاخامەکان کرد بەتایبەتیش (قەشە ئۆگستین)و (تۆماس ئەکوینی) کە داوای قەدەغەکردنی دیاردەی خۆکوشتن بکەن و پشتبە چەند پرەنسیپێك ببەستن لەوانە:

کەس مەکوژە (کە لە وەسیەتی شەشەمی مەسیحەوە) وەرگیراوە.

نابێت مرۆڤی تاوانبار بکوژرێت، ئیتر چۆن دەبێت مرۆڤێکی بێتاوان بکوژرێت کە تاوانی دووەم گەورەترە.

گەورەیی و پیرۆزی گیان لەژیاندایە نەك مردن.

خۆکوشتن لەپێناوی دوورکەوتنەوە لە گوناهێك زۆر زۆر گەورەترە لە گوناهەکە و لێخۆشبوونی نییە کە ئەم بیروبۆچوونانە وای لە ئەنجومەنی ئایینی مەسیحی کرد لە ساڵی (٤٥٢ز) بڕیاری تایبەتی خۆی دەربارەی حەرامکردنی خۆکوشتن دەربکات.[٣٦]

هەروەها بەپێی ئەو سەرژمێریانەی کە دۆرکهایم تۆماریکردوون رێژەی خۆکوشتن لە کاسۆلیك کەمترە وەك لە پرۆتستانت، بۆ نموونە: رێژەی خۆکوشتن لە ئیتالیا (١,٧) کەس،

لەئێرلەندا (٢,٣) کەسە، لە ئیسپانیا (٥,٩) بۆ هەر (١٠٠٠٠٠) سەدهەزار کەسێك، لەم وڵاتانەدا مەزهەبی کاسۆلیك باڵادەستە و لە سوید ڕێژەی خۆکوشتن لە (١٧,٨)، لە فەرەنسا ( ١٥,٨) کەسە، لە دانیمارك (٢٣,٣)ە، بۆ هەر (١٠٠٠٠٠) سەدهەزار کەسێك، لەم وڵاتانەدا مەزهەبی پرۆتستانت باڵادەستە هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆئەوەی مەزهەبی پرۆتستانت تاڕادەیەکی زیاتر ڕێگە بە ئازادی تاك و فیکر دەدات، هەندێکیتر دەیگەڕێننەوە بۆ بوونی حاڵەتی دانپێدانانی گوناهکردن لای کاسۆلیك کەوا لە تاك دەکات تاڕادەیەکی کەمتر هەست بە گوناه بکات.[٣٧]

لەڕووی زانستیشەوە ئەمکارە بێدەستەڵاتی و بێعەقڵییە، چونکە لەوەتەی دنیا دنیایە خێر و شەڕ هەرهەبووە و لە سەردەمی قابیل و هابیلەوە کوشتن هەبووە، بەڵام تۆ بۆچوونی لایەنی شەڕ هەڵدەبژێریت؟ خۆ کەس تاسەر بێکار و خەمبار و نەخۆش و هەژار نابێت، هیچ گرفتێك بەخۆکوشتن چارەسەرنابێت ئەو تێگەیشتنە هەڵەیە ئایا ژیان تەنها بریتییەلە بڕوانامە خۆ باوپیرانمان بڕوانامەیان نەبووە، خۆ لە وڵاتی سوید گرفتی مادە و گوزەرانیان نییە لەگەڵ ئەوەشدا خۆیان دەکوژن، ڕێژەی خۆکوشتنیان زۆرە، چونکە دەڵێن فێربووم لەڕووی جەستەوە، بەڵام لایەنی رۆحی برسییە و ناتەواوە و خۆی دەکوژێ، لەلایەنی ئایینیشەوە و دیسان ئەمکارە حەرامە و قەتڵە و لە تاوان گەورەکانە و سەرەنجامەکەی ئاگری دۆزەخە.[٣٨]

لەڕووی ئەخلاقییەوە (تۆماس زاس) پێیوایە ئەوکەسەی خۆی دەکوژێت پێیوایە خۆکوشتن چارەسەرە ئەگەر وەك چاودێرێك ئەمە بە گرفت دابنێت، ئەوە تێگەیشتنی لە خۆکوژی دەگۆڕێت، هەروەها وەك تاکەکەس دەتوانین هەڵبژێرین لەنێوان ئەوەی چالاکانە بمرێت یاخود ناچالاکانە لەڕێگەی جێبەجێکردنی کۆنترۆڵی مردنەوە یان نەخۆش بوون و کەوتنە تەمەنەوە وەك کۆمەڵگەش دەتوانین ر ێگە بە خەڵك بدەین بمرن بەو شێوەیەی کە خۆیان حەزدەکەن یان بەو شێوەی ئەخلاقی باڵادەست دایڕشتووە، کامۆ پێیوایە (خۆکوژی گرفتێکی جددی فەلسەفیە) ئەگەر وردتربین گرفتێکی جەوهەری ئەخلاقی سیاسیە.[٣٩]

بەڵام ئەم تێڕوانینە ئەخلاقییەی (تۆماس زاس) کە سەر بەو بۆچوونەیە کە پێیوایە ئەخلاق لە حاڵەتی فەردی و کۆمەڵگاییدا دیسان سەربەخۆیی بۆ تاك هەڵدەبژێرێت لەنێوان مردن و ژیاندا، بەڵام بۆچوونێکیتر پێیوایە ئەخلاق لەگۆڕێدا نییە تاکاتێك دنیا بەکۆمەڵایەتیبوون دروستنەبووە، واتە من تاکاتێك سەربەخۆ و ئازادم کە بەشداری گروپ و کۆمەڵگام نەکردووە،

بەلام لەڕاستیدا ئەم بۆچوونەش هەڵەی تێدایە باشە ئەگەر کەسێك چاوێکی خۆی دەربێنێت یان لەشفرۆشی بکات کە جەستەی خۆیەتی زیانی بۆ خۆی نییە یان دەتوانێت خۆی بکوژێت؟ بێگومان ئەمەش نابێت چونکە مرۆڤ هەمووکات لە دنیای بەکۆمەلایەتیبووندایە و مافی خۆکوشتنی نییە.

لەڕووی مەعریفییەوە: خۆکوشتنی هەریەك لە تاکەکانی واتایەکە لە خۆکوشتن، وەك چۆن مردنی هیچ کەسێك لەهی کەسێکیتر ناچێت، هەربەوجۆرەش خۆکوشتنی هیچ کەسێك لەهی کەسێکیتر ناچێت (هەرچەندە دەڵێن ئەنجامەکەی هەرمردنە)، واتە مەبەست ئەوەیە هەرتاکێك جیهانێکی تایبەت بەخۆی هەیە، واتە جیاوازە لە جیهانی کەسانیدیکە، بۆیە دەرەنجامەکانیشیان جیاوازدەبن، (بۆیە کاتێك مرۆڤ کە هاتەبوونەوە جارێکیتر ناچێتە عەدەمەوە) باخۆشی بکوژێت، بەوەی کە من هاتوومەتە بوونەوە و دروستبووم، ڕێیەکی درێژم بڕیوە وەك حافیز دەڵێت:

(از سرحد تا به اقلیم وجود، این همه راه امدەایم)

لەنەبوونەوە هاتوومەتە بوون ئیتر دواجار خۆکوشتن نامباتەوە بۆ عەدەم.

بەوەی کە لەپێش خۆکوشتنیش لەم بوونەدا حزوورم هەبووە، ئەو کاریگەرییانەش کە بە حزووری من دوای خۆکوشتنەکەوە لەبووندا دروستدەبێت چ بوونە ماددیەکە چ بوونە مەعنەوییە نەبینراوەکە، چ بوونە مێژوویەکەی پێش خۆکوشتنەکە و چ بوونە خۆکوشتنەکەی پاش خۆکوشتنەکە. بە بۆچوونی عەبدولکەریم سروش زۆری ڕێژەی خۆکوشتن لەخۆرئاوا دەگەڕێتەوە بۆئەوەی کە تاك دروستدەبێت کە تاکیش دروستبوو چەمکی مافیش دێتەئاراوە و مافیش بریتییەلە ئیختیاری مرۆڤ واتە مرۆڤ ئازادە چیدەکات و چیناکات؟ کێشەکە لەوەدایە لە ئەوروپا ماف هەیە، بەلام ئەرك نییە واتە ئەگەر ئەرك هەبوو ئەو خۆکوشتنە زۆرە ڕوونادات، لەڕۆژهەلاتیشدا بۆیە خۆکوشتن هەیە لەبەرئەوەی ئەرك هەیە و ماف نییە.[٤٠]

لەڕووی کۆمەلایەتییەوە: باشە کە دەڵێین تاك ئازادە لە خۆکوشتن گەر مردنی ئەو زیانی بۆ کەس نەبێ، باشە: ئایا هیچکەس هەیە مردنی ئەو زیانی هیچکەسی نەبێت؟ کەس هەیە خێزان، هاوڕێ، هاونیشتمانی نەبێ؟ کەس هەیە مردنی ئەو کار لە کەسیتر نەکات، کەس هەیە هیچ سوودێکی بۆ ئاژەڵ و مرۆڤ و درەخت و بێگیان نەبێ؟! ئەوەمان بیرنەچێ کە خۆکوشتن دواجار هەڵوێستێکی ترسنۆکانەیە بەرامبەر ڕووداوەکان.[٤١] زۆربەی فەیلەسوف و زانا و

رۆشنبیران ئاماژه بۆئەوه دەكەن كه خۆكوشتن كاریكی دزێو و چەوتە، دژبه مرۆڤایەتی و شارستانییەته و هیچ هۆكارێك هەرچەنده بەهێزیش بێت ناتوانێت پاساوی باشی و دروستیبداتەوه، چونكه كارێكی دژی خودا و كۆمەڵ و خێزانه و تاك دەبێته هۆی هەڵتەنگاندنی بنەمای كۆمەڵ، تاكەكان بەرەو چڵپاو و هەڵدێر دەبات. هەرئەو زەرەر و زیانەی خۆكوشتنیشه كه پاڵی بەزۆربەی ئایین و یاساكانەوه ناوه تاوەكو خۆكوشتن به تاوان دابنێن و ئەوكەسەی خۆی بكوژێت بەتاوانبار لەقەڵەمدەدرێت.(٤٢) ئەو كاریگەرییانەی كه خۆكوشتن لەسەر دەوروبەر جێدەهێڵێت جیاوازن، هەندێك له كەسوكاری ئەوانەی خۆیان دەكوژن هەست به تاوان دەكەن، بەرپرسیارێتی خۆكوشتنی ئەوكەسه دەخەنه ئەستۆی خۆیان و خۆیان ماندوودەكەن لەرێی گەڕان به شوێن سزادا یان گەڕان به شوێن ئەوەدا ئایا چیبكەن تا بەهانه بهێننەوه بۆئەو كارەی كه خۆیان پێیانوایه بەرپرسیارن له خۆكوشتنی ئەوكەسه؟ هەندێ خێزان یان كەسوكاریش بەرپرسیارێتی دەخەنەئەستۆی كەسانیدیكه و پەنجەی تۆمەت درێژدەكەن بۆ ئەوكەسه خۆی، واته ئەوكەسەی كه خۆی كوشتووه، ئەمه ئەوەدەگەیەنێت كاریگەریەكانی خۆكوشتنی كەسێكی نزیك لەسەر كەسانی دەوروبەر رەنگدەداتەوه، دەگۆڕێت بەپێی كەسێتی ئەوكەسانه و بارودۆخیان.(٤٣)

لەڕووی یاساییەوه، ئەرستۆ پێیوایه خۆكوشتن تاوانێكه دژی دەوڵەت، له یۆنانی كۆندا ئەوكەسەی خۆی بكوشتایه بێبەشدەبوو له مەراسیمی بەخاكسپاردن و هەروەها دەستی راستی ئەو كەسەیان دەبڕی له شوێنێكی دوور له لاشەكه دەخرایەژێر گڵ، بەڵام له رۆما كه فەیلەسوفانی وەك سینیكا رابەرییاندەكرد بانگەشەی بۆ خۆكوشتنی بونگەرایی دەكرد، دروشمەكەشی "شكستهێنان له گۆڕینی ئەوشتانەی كه پەیوەندی به ئێمەوه نییه"، بەڵام له سەردەمی نوێ بۆ نموونه له ساڵی (١٧٩٠ز) لەدوای شۆڕی فەرەنسی خۆكوشتن به كارێكی تاكانەی تایبەت دادەنرا و سزای خێزان و تەرمەكەی نەئەدرا.(٤٤)

### بەشی سێیەم: ١. هۆكارەكانی خۆكوشتن

لەبەرئەوەی ئەو كەسەی هەڵدەستێ به ئەنجامدانی خۆكوشتن، دواتر لەژیاندا نامێنێت، ناتوانرێت بەڕوونی و بەتەواوەتی هۆكارەكانی خۆكوشتنی كەسێك بزانرێت، لەوەشدا خۆكوشتن پەیوەندی به كلتوری كەسەكەوه هەیه، واته ئەوەی لێره دەكرێت هۆكاربێت بۆ خۆكوشتن له شوێنێكیتر بەمشێوەیه نەبێت.

ئەریك فرۆم لە كتێبی ئەودیوی زنجیرەكانی گوماندا لە ساڵی (١٩٦٢)، لە یەكێك لە باسەكانی باسی خۆكوشتن دەكات، باس لەوەدەكات ئەمجۆرە لەخۆكوشتن و نەوەكوشتن و پێویستی بەڕوونكردنەوە هەیە، دەرككردن بە هۆكارەكانیان دژوارە و ئەم بەهایەی كە مرۆڤ لەبری ئەم ڕەنج و چارە دەیدات، پێویستی بە ڕێگەچارەیەكی جیددی هەیە هەموو كارەكانی فرۆم هەوڵێك بوون بۆ تێگەیشتن لە كرداری مرۆڤەكان و ئەو بەڵگانەی كە بۆچی تائەوڕادەیە چارەڕەشی و ناعەدالەتی لەجیهاندا بوونی هەیە.(٤٥)

**یەكەم: هۆكاری دەروونی:**

بە بۆچوونی هەندێك لە زانایان هۆكارەكانی خۆكوشتن هۆكاری دەروونین، هەندێك لەوانەی دووچاری نەخۆشی دەروونی دەبن هەستەكانیان لەدەستدەدەن و كۆمەڵێك بیر و خەیاڵی لەلادروستدەبێت وادەزانێت بەردەوام ستەمی لێدەكرێ، گاڵتەی پێدەكرێت لێیدەبێتە خەمۆكی و دەڵێت ژیان تامی نەماوە و مردن باشترە بۆیە پەنادەباتەبەر خۆكوشتن.(٤٦) لاوازی و سستی كەسایەتی و بەرگری دەروونی، ئەمەش كە تێكچونێك لەناو مێشكدا هەیە، بەهۆی بوونی فشاری دەوروبەر لەسەر دەروون و هەستكردن بەشكستهێنان لە ژیان و دروستبوونی كۆسپ و تەگەرە لەبەردەم ئاوات و داخوازییەكانی تاك و تێكشكانی بەهاكانی كەسایەتی و نەمانی ڕێز و خۆشەویستی و هەستكردن بەكەمی كە ئەمانە هەمووی فشاری دەروونی دروستدەكەن.(٤٧) لەڕاستیدا ئەوكەسەی هەوڵی خۆكوژی دەدات تووشی یەكێ لە نەخۆشییە دەروونییە درێژخایەنەكان بووە وەك (خەمۆكی، توندوتیژی، شیزۆفرینیا، هستریا..) هۆكەشی بۆئەوە دەگەڕێتەوە كە زۆرجار ئەونەخۆشانە پرۆسەكانی ژیری و هەڵسەنگاندن و بەراوردكرن و لێكدانەوەی مەنتیقی لەدەستدەدەن و بەردەوامیش لە بازنەیەكی داخراوی پڕلە خەم و خەفەت و دڵەڕاوكێدا دەژین.

**چەند جۆرێكی نەخۆشییە دەروونییەكان كە پەیوەندییان بە خۆكوشتنەوە هەیە:**

**خەمۆكی:** لە (٣٠٪ – ٧٠٪) خۆكوشتنەكان پەیوەندی بە خەمۆكییەوە هەیە و سەرەتای چاكبوونەوەی بە قۆناغێكی ترسناك دادەنرێت.(٤٨) لەلایەكیترەوە ئەوانەی بڕیاری خۆكوشتن دەدەن تووشی نەخۆی خەمۆكی بوون و ناتوانن لە ژیان بەردەوامبن، بەپێی ڕێكخراوی

تەندروستی جیهانی (W. H. O) لەتەواوی جیهاندا (٥٠ - ٦٠) ملیۆن کەس تووشی نەخۆشی خەمۆکی هاتوون لە (٨٠٪) یان بڕیاری خۆکوشتن دەدەن.[٤٩]

حاڵەتی پەرەسەندووی خەمۆکی کە لەتوێکانیدا مردنی خۆویستانەی هەڵگرتووە، پێیدەوترێ خەمۆکی رەشبینانە یان (مەلانخۆلیا) لەوانەیە ئەمە هۆکاری سەرەکی و یەکەمی خۆکوشتن بێت لەهەموو جیهاندا و قوربانیانی مەلانخۆلیا ژمارەیان زۆرە و زۆرجار واوەسفدەکرێت کە تووشی حاڵەتێك بوون پێیدەوترێ مەزاجی دەوری.[٥٠] (گۆڵد)ی زانا دەڵێت: خەستەیی و رێژەی خەمۆکی راستەقینە لەلای ئەو هەرزەکارانەی هەوڵی خۆکوشتن دەدەن، زۆر زیاترە لەوانەی لە گۆڤار و رۆژنامەکاندا ئاماژەی بۆدەکرێت.[٥١]

**شیزۆفرینیا:** لەماوەی (١٠) دە ساڵی یەکەمی نەخۆشییەکەدا نزیکەی لە (١٠٪) یان هەوڵی خۆکوشتن دەدات و لەنێو ئەمانەشدا (٧٥٪) رەبەنن.[٥٢] ئەوکەسانەی تووشی شیزۆفرینیا دەبن، زۆرکات نیشانەکانی هەستکردن بە زوڵم و ناهەقی سەرودڵی گرتوون وایانلێدەکات بیروبۆچوونێکی وەهایان لەلا دروستببێت کە هەموو دونیا دژی ئەوانن، خەڵکی دژایەتیدەکەن و کەسانی چواردەوری نەخشە و پلانی بۆ دەکێشن و ئەم ژیانە وەك دۆزەخی لێهاتووە و جێگای ئەوی تێدانابێتەوە، زۆرجار ئەم هەست و بۆچوونە پاڵیپێوەدەنێت و بەرەو خۆکوشتنی دەبات.[٥٣] چەندین نەخۆشی دەروونیتر وەك (دڵەراوکێ و کەسایەتی دژەکۆمەڵ و پشێوی کەسێتی نێوانگیری، ناسنامەی توخمی و لادانی سێکسی) دەبنەهۆی خۆکوشتن.

### دووەم هۆکاری کۆمەڵایەتی:

هۆکاری کۆمەڵایەتی رۆڵی سەرەکی هەیە لە زیادکردنی دیاردەی خۆکوشتن، مەبەستیش لە هۆکارە کۆمەڵایەتییەکان: سەرجەم ئەو گرفت و کێشە کۆمەڵایەتییانەن کە دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان بە (خێزان، قوتابخانە، برادەری خراپ، ئامرازەکانی راگەیاندن، گۆڕەپانی کارکردن، کۆڵان و نادی و دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان، کە هەندێکجار بە هۆکاری سەرەکی خۆکوشتن دادەنرێن.[٥٤] بێگومان هۆکارە کۆمەڵایەتییەکان رۆڵێکی سەرەکیان هەیە بۆ سەرهەڵدانی دیاردەی خۆکوشتن، چونکە مرۆڤ بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتی و هەموو هەڵسوکەوتەکانی لەئەنجامی کارلێککردنی لەگەڵ دەوروبەردا دەبێت. بۆیە لێکترازانی خێزان و نەمانی پەیوەندییە رۆحییەکان لەنێوانیاندا، هۆکارێکە بۆئەوەی مرۆڤ هەست بەنامۆیی و

گۆشەگیریبکات، لەدواییشدا دوورنییە پەناببابەتەبەر خۆکوشتن، بۆئەوەی لەم بارودۆخە ئالۆزە رزگاری ببێت.[٥٥] ئەو هۆکارە کۆمەڵایەتییانەی کە تاك هاندەدەن بیر لە خۆکوژی بکاتەوە یان پەناببابەتەبەر ئەم دیاردەیە بریتینلە: ژیانی شاری، زۆربوونی حەشامەت و قەرەباڵغی، پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و پێکەوەنەگونجانی تاکەکانی کۆمەڵگە و شکستی کۆمەلایەتی و دەستکورتی و هەژاری، بێکاری و بنەماڵە و تەڵاق.[٥٦] لە کۆمەڵگەی کوردیدا بەهۆی ئەو نائومێدییانەی کە تووشی تاك دەبێت بەتایبەتی مێینە لە هەڵبژاردنی هاوسەردا زۆرجار لەلایەن کەسوکارەوە بەزۆر بەشوودەدرێت، یان دەدرێت بە یەکێك کە خۆشی ناوێت یان لەتەمەندا بە باوك یان بە باپیری کچە دەشێت وا لە مێینە دەکات پەناببابەتەبەر خۆکوشتن بەهەر رێگەیەك بێت، ئەمە لەلایەکەوە بە کارەساتی گەورە دەژمێرێت بۆ تاك و خێزان و کۆمەڵگە.[٥٧]

### ئەمانەش چەند هۆکارێکن بۆ خۆکوشت:

### پشێوی پەیوەندییە سۆزداری و خۆشەویستییەکان:

خۆشەویستی بەگرنگرتین رەهەندەکانی خۆکوشتن و ئامانجەکانی هەوڵدان بۆ خۆکوشتن دادەنرێت، چونکە بەشێوەیەکی خۆرسك مرۆڤ پێویستی بەخۆشەویستییە بەردەوام پێویستی بەجەختکردنەوەیە لە خۆشەویستی لەلایەن کەسانی بەرامبەرەوە.[٥٨] جوانترین بەسەرهات ئەوەیە کە لە کتێبی (ئیبن حەزم) بەناوی گرفتی کۆترەکە بڵاوبووەتەوە.

### خۆکوشتنی لە دەستدانی پلەوپایەی کۆمەلایەتی:

زۆربەی کۆمەڵناس و فەیلەسوف و دەروونزانەکان لەو بڕوایەدان کە مرۆڤ بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتییە و دەبێت پلەوپایە و ناوبانگی کۆمەڵایەتی و شیاو و بەڕێزی هەبێت تاکو بتوانێت رۆڵی خۆی وەك بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتی لەتەك کۆمەڵەکەیدا خۆی بسازێنێت و هەست بەئارامی و دڵنیایی دەروونی بکات، هەرکاتێك بەهۆی هەر هۆیەکەوە بێت تاك ئەو پلەوپایە و ناوبانگە کۆمەڵایەتییەی لەدەستدا و کەوتەبەردەم هەڕەشە و گلەیی و گازندەی دامودەزگا کۆمەڵایەتییەکان ئەوا دوورنییە ئەو تاکە پەنا بۆ خۆکوشتن ببات وەك رێگەچارەیەك بۆ دەربازبوون لەهەموو گلەیی و سوکایەتی و خەم و خەفەت و ئازارەی کە لەلایەن دامودەزگای کۆمەڵەوە ئاڕاستەیکراوە.[٥٩]

**گۆشەگیری کۆمەڵایەتی:**

نەبوونی هەڵسوکەوتکردن و شێوازی رەفتاری خێزانی تەندروست هەستکردنی کەسی ئافرەت خۆبەکەمزانی، گوێ لێنەگرتن و گرنگی پێنەدانی کە دەبێتەهۆی شێواندنی و ونبوونی ناسنامەی کەسیەتی ژن کە ئەمەش رەەنگدانەوەی لەسەر باری دەروونی ژن دەبێت.(٦٠) ئەمەش هەندێکجار وایلێدەکات کە ئافرەت پەنابباتەبەر خۆکوشتن لەئەنجامی ئەو سوکایەتییانەی کە پێیدەکرێت.

**لێکترازان و گرفتی ناو خێزان:**

مەبەست لە لێکترازان و گرفتی ناوخێزان سەرجەم ئەو هۆکارانەیە کە دەبنەهۆی دروستکردنی کێشە و ململانێ لەناو خێزاندا لەوانە: شەڕ و ئاژاوەی ناوخێزان، تەلاقدان، تێرنەکردنی پێداویستییەکانی تاک کە زانایەك لە کەنەدا لەئەنجامی یەکێك لە توێژینەوەکانییەوە گەیشتە ئەو راستییەی کە بێبەشبوون لە سۆز و خۆشەویستی دایك و باوك شێواندنی شێوە و تێکچوونی لەگەڵ باوك لەگرنگترین هۆکارەکانی خۆکوشتنە لای هەرزەکاران.

**هەڵوەشاندنەوەی بنەما و بونیادی کۆمەڵایەتی:**

وەك لە ئامارەکاندا دەردەکەوێت رێژەی خۆکوشتن لە شارە قەرەباڵغەکاندا زۆر زیاترە لە رێژەی خۆکوشتن لە شارە بچووك و کۆمەڵگە سەرەتاییەکان، لەبەرئەوەی ژیان لە شارە قەرەباڵغ و ئاڵۆزەکاندا زەحمەت و پڕلە گرفت و ململانێیە کە تاك تێیدا وندەبێت و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان لاوازدەبێت هەرکەس هەڵپەی گیرفانی خۆیەتی و بەها و دابونەریتە گرنگەکان بەرە و لێکترازان و شێواندن دەچێت و دیاردەکانی چەوساندنەوە و ململانێ و بێبەشبوون و کۆسپ و تەگەرە و پێشبڕکێ بەسەر دیاردەکانی تەبایی و یەکسانیدا زاڵە، مرۆڤ لەوجۆرە کۆمەڵگە و شارانەدا هەست بەتەنیایی و نامۆیی و ونبوون دەکات، لەبەرئەوە زۆرجار ئەو کۆمەڵگە و شارانە بوون بەهاندەر بۆ خۆکوشتن و رزگاربوون لەوجۆرە کۆمەڵگایانە.(٦١)

هەروەها پەیوەندی خراپی ناو تاکەکانی خێزان و پەروەردەی خراپ و بوونی جیاوازی نێوان منداڵەکانی نێو یەك خێزان، دابونەریتی دواکەوتوو و رووداوە خێزانی و کۆمەڵایەتییەکان، ئەمانە و چەندین هۆکاریتر بەشێوەیەك لە شێوەکان دەبێتە هۆی خۆکوشتن.

**سێیەم: هۆکارە ئابوورییەکان:**

یەکێك لە هۆکارەکان یان فاکتەری سەرەکی لەم پرۆسە ڤێزەونەدا، بۆ باری دارِماوی ئابووری خێزانەکان دەگەڕێتەوە، کە بەداهاتێکی زۆر کەم ژمارەیەکی زۆری خێزانی لەسەر بەخێوکردووە، ئەمبارە نالەبارەی ئابووری خێزان لەسەر سەرجەم ئاستەکانی ژیان رەنگی داوەتەوە، واتە باری دەروونی و کەسایەتی و جۆری هەڵسوکەوت و فاکتەرەکانیتری تووڕەبوون، هەموو ئەمانە بوونەهۆی پێکهێنانی ئەو بەڵگانەی کە ئاماژەکانی زیادبوونی ئەم دیاردەیە لە خۆبگرن، هەندێجار ئابووری و تێزی کۆمەڵایەتی بۆ ژن و باری ئایدۆلۆژی تەقلیدی کۆمەڵگا هۆکاری ئەم دیاردەیەن.[٦٢] مەبەستمان لەڕووداوە ئابوورییەکان هەموو ئەو رووداوانەیە کە پەیوەندیان بە پارە و کارکردن و بژێوی ژیانەوە هەیە، بەڵام حاڵەتاکانی خۆکوشتن لە لوبنان زیادیکرد لەدوای هەرەسهێنانی لیرەی لوبنانی (کە دراوی نیشتمانی)یە بەرامبەر بە دۆلاری ئەمریکی.[٦٣] هەژاری، بێکاری بەربڵاو و بێهوایی و نزمی ئاستی داهات و دەرامەتی تاکەکەس کە کاریگەری بەهێزی هەیە لە دروستکردنی ئارەزوو و حەزی خۆکوژی، لەلایەك لێکۆڵینەوەکان ئەوە دەردەخەن کە بەجیهانیبوون (عەولەمە) کاریگەریکی زۆر خراپ و وێرانکەری هەیە بۆ سەر ژیانی تاك و ژنان بەتایبەتی، چونکە لێرەدا جیاوازی چینایەتی و هەژاری فراوانتردەکات، لەم روانگەیەوە هەژاری خراپترین جۆری توندوتیژییە کە بەرامبەر مرۆڤەکان ئەنجامدەدرێت[٦٤] یان زۆرجار ئیفلاسکردنی هەندێکەس دەبێتەهۆی خۆکوشتنیان، لەمبارەیەوە زانای هۆنگ کۆنگی (یاب) دەڵێت: (هەژاری و نەبوونی و برسیەتی تێکچوونی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان هۆکارن بۆ بەرزبوونەوەی رێژەی خۆکوشتن،[٦٥] هەروەها لەکاتی هەڵکشان و داکشانی ئابووریدا رێژەی خۆکوشتن زۆرتردەبێت، ئەوەی جێی سەرسوڕمانە سەرمایەی زۆر و خۆشگوزەرانی باڵا کاریگەری پێچەوانەی هەیە وەکو هەژاری و کەمدەرامەتی لێدێت، بەپێی هەندێ توێژینەوە بەرزبوونەوەی رێژەی خۆکوشتن لە سوید دەگەڕێتەوە بۆ گەلێهۆکار یەکێك لەوانە خۆشگوزەرانی و رەفاهییەتە بەهۆیەوە تاك هەست بە بەتاڵی دەکات و بێزاردەبێت لە ژیانێکی رێکوپێك و شادمان (خۆکوشتنی بێزاری) جۆری پیشە لەهەموو جۆرە پیشەیەك برێکیترسناکی هەیە و بێکاری لە هەمووی خراپترە و تێبینیکراوە رێژەی خۆکوشتن لەنێوان خاوەنپیشە بەرزەکاندا کە بەرپرسیارێتی گەورەتریان هەیە و تایبەتمەندی کارەکەیان وادەخوازێت شێوازێکی تایبەتییان هەبێت لەژیاندا و ئەگەری خۆکوشتنیان زیاترە لە خەڵکانیتر.[٦٦]

**چوارەم: هۆکاری سیاسی:**

گۆڕانکارییە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان هیچ ئاسۆیەکی روونی بۆ گەنجان تێدانییە، لەمەش زیاتر ئاڕاستە سیاسییەکان کە لەئەنجامی سیاسەتی شەڕەکان هاتەکایەوە و بووە مایەی لەدەستدانی ئازادی و پێشێلکردنی مافەکان کە عێراقییەکان بەگشتی بەدەستیەوە دەناڵێنن، بەڵام خەڵکانی کوردستان بەشێوەیەکی زیاتر ئازاریان چەشت بەهۆی شەڕی ناوخۆ و شەڕە یەك لە دوای یەکەکان.(٦٧) لەلایەکیترەوە سیستمی وڵات دیکتاتۆرییانە بێت و ستەم لە هاوڵاتییان بکات و وا لە تاکەکان بکات تووشی بێئومێدی بن و ئاسۆی ئاییندەیان لا رووننەبێت نیشتمان بە بەندیخانەیەکی گەورە ببینن و رێی رادەربڕینی ئازادییان نەبێت بێگومان گروپ و کۆمەڵی جیاجیا پەیدادەبن تاکەکان بەئاقارێکیتردا دەبەن و چەمکی مردن و خۆکوشتنی لەلا ئاسانتردەکەن لەژێر کۆمەڵێ ناوی رازاوەدا پەیمانی گەورە و چەوریان دەدەنێ و بەرامبەر دۆزەخی میری بەهەشتیان بۆ سازدەدەن چ لەم دونیا یان لەو دونیا بێت.(٦٨) بۆ نموونە لە کۆماری میسری عەرەبی، موشیر عەبدولحەکیم عامر وەزیری بەرگری و سەرۆکی ئەرکانی سوپای میسری لە رۆژی (١٤/٩/١٩٦٧) خۆی کوشت، لەدوای ئەوەی سوپاکەی لەبەرامبەر سوپای ئیسرائیلدا لە ( ٦/٦/١٩٦٧) شکستیهێنا، کاتێك بەتۆمەتی پیلانگێڕی لە (٢٥/٨/١٩٦٧) بۆ کودەتا دژی رژێمی میسر گیرا. لە کۆماری سوریای عەرەبی سەرۆکی پێشوی حکومەت (مەحمود زەعبی) خۆی کوشت پێش ئەوەی بەتۆمەتی گەندەڵی بگیرێت، لەدوای ئەوەی بەشار ئەسەد حوکمی گرتەدەست لە کۆتاییەکانی ساڵی (٢٠٠٠) دا.(٦٩)

**پێنجەم: نەخۆشییە درێژخایەنەکان:**

هەندێجار ئەم هۆکارە کاریگەری خراپی دەبێت لەسەر مرۆڤ و وایلێدەکات پەنابباتەبەر خۆکوشتن، بۆئەوەی لە ئازار و خەم و خەفەت رزگاریببێت، لەم نەخۆشییە کە نارەحەتیکردووە و وایلێکردووە هیوای لەژیاندا نەمێنێت.(٧٠) ئەم قسە بۆ هەموو کات راست نییە، هەندێجار بەدەگمەن نەخۆشییە جەستەییە درێژخایەنەکان ئەوانەی مرۆڤ دووچاری ئازاری زۆر و بێزاری دەکەن، دەبنە رەهەندی خۆکوشتن لای ژنان و سەرجەم تاکەکانیدیکە، چونکە لە کۆمەڵگە دواکەوتووەکاندا تاکەکان بڕوایان بە دەسەڵاتێکی باڵا هەیە و بیروباوەڕێکی رەهایان بەقەدەر و چارەنووس هەیە، بەشێوەیەك لە نەخۆشی و بەتایبەت نەخۆشییە قورسەکان دەڕوانن کە وەك

ئەزمونێك وایە و بەهۆیەوە لەلایەن ئەو دەسەڵاتە رەهایەوە تاقیدەکرێتەوە یان باوەڕیانوایە ئەو دەسەڵاتە رەهایە نەخۆی بۆ مرۆڤ دەهێنێت کە خۆشەویست و نزیکنلێیەوە، لەبەرئەوە لەجیاتی کۆتاییهێنان بە ژیانی خۆیان و خۆکوشتن بەپێچەوانەوە وەك پاداشتێك لەحاڵەتی نەخۆشی خۆیان دەڕوانن، بەوپەڕی دانبەخۆداگرتن و بڕواوە لە چاوەڕوانی مەرگی ئیلاهیدا ژیان دەبەنەسەر،[٧١] بەڵام دیسان ئەم قسەیەش بۆ کات و شوێنێك راستنییە، هەندێکجار نەخۆشی درێژخایەن هیچ تروسکاییەك و هیوایەکی چاکبوونەوەی نەبێت، مرۆڤ بەرەو چلپاوی خۆکوشتن دەبات، لەبەرئەوەی ئەوجۆرە نەخۆشانە بەردەوام ئازار و خەم و خەفەت دەکێشن، سەرودڵی گرتوون، زیاد لەپێویست ئازاردەچێژن، بەلای ئەوجۆرە نەخۆشانەوە، ئەو نەخۆشییە دریژخایەنانەیان، خۆکوشتنێکی لەسەرخۆ و مردنێکی چاوەڕوانکراوی بە ئازارە و جیاوازییەك لەنێوان ئەو و ئەوکەسەی فەرمانی لە سێدارەدانی بۆ دەرچووە نییە، لەلایەکیدیکەشەوە ئەو نەخۆشە درێژخایەنەی، کۆمەڵێك خەم و گیروگرفتی بۆ کەسانی چواردەوری دروستکردووە و بێزاری و وەڕسی لە سیما و دەموچاویاندا دیارە، لەبەرئەوە خۆکوشتن باشترین رێگە چارەیە بۆ نەهێشتنی سەرجەم ئەو ئازار و خەم و خەفەتانەی کە باسمانکرد.[٧٢]

(جۆ) ژنەکەی (هلموت کول) راوێژکاری ئەڵمانی، لە ٥/٧/٢٠٠١ دوای ئەوەی ماوەیەکی دووردرێژ بەدەست نەخۆشییەکی دەگمەنەوە ئازاری چەشت، خۆی کوشت و کۆتایی بەژیانی خۆی هێنا، بەمردوویی لە ژوورەکەی خۆیدا لە شاری (لود فیغ ئوغر شایم هانلور) دۆزرایەوە، کە دەیناڵاند بەدەست هەستیاری بەرامبەر هەر رووناکییەکی بەهێز، ئەمەش ناچاریدەکرد بۆ ماوەیەکی دووردرێژ لە ماڵەوە بمێنێتەوە کە ناچاربوو بە تەواوەتی خۆر لە ماڵەکەی دابڕێت. کاتێك لە تەمەنی شست و هەشت ساڵیدا بوو بۆ هاوسەرەکەی و کوڕەکەی روونکردەوە سوورە لەسەر خۆکوشتن بەهۆی حاڵەتی تەندروستییەوە هەیەتی و لەشەودا نەبێت ناتوانێت بێتەدەرەوە، لە دواڕۆژەکانی تەمەنیدا هەستیدەکرد ئازارەکانی زیاترە و زۆر لاوازە و هیچ چارەسەرێکی نییە نە لە ئەڵمانیا و نە لە دەرەوەی ئەڵمانیا.[٧٣]

**باسی دووەم: خۆكوشتن لە روانگەی دۆركهایم و فرۆیدەوە**

**كورتەیەك دەربارەی ژیانی دۆركهایم:**

دۆركهایم لەهەموو سۆسیۆلۆجیستەكانیتر شیاوی ئەوەیە كە كارەكتەری دامەزرێنەری كۆمەڵناسی پێبەخشرێت، ئەو دامەزرێنەربووە چونكە ناوەڕۆكی پرۆژەكەی بریتیبوولە دامەزراندنی سۆسیۆلۆژیا وەك زانستێكی پۆزەتیڤ و سەربەخۆ لە سایكۆلۆژیا و فەلسەفەی مێژوو.(٧٤)

ئەمیل دۆركهایم لە ساڵی ١٨٥٨ز لە شارۆچكەی (ئیسپینال)ی نزیك پێدەشتی (لۆرین)ی فەرەنسی لەدایكبووە، بۆیە هزر و ئاوەزەكەی لەنێو كولتوری (لۆرین)دا ئاوێخواردووەتەووە، ئەو كلتورەی كە مۆركێكی پیشەسازی و كوشتوكاڵی هەبووە، هەربۆیە شتی كۆن و نوێی ناوچەكە بەخۆوەدەگرێت. دۆركهایم لە باوەشی خانەوادەیەكی جوولەكەدا چاویبەدنیاهەڵهێناوە، چونكە باپیرە گەورەی یەكێك بووە لە حاخامەكانی سەربە تەریقەتی (رەبانی) كە بەتەواوی بڕوای بە هزری نوێی عیبری هەبوو. ئەم پاشخانە ئایینییەی دۆركهایم ناچاریكردووە دووبارە بە تەلمود و تەوراتدا بچێتەوە و زمانی عیبری و مێژووی دوورودرێژی جوولەكە و خودی مێژووی ئایینەكان بە دوورودرێژی بخوێنێتەوە، جگەلە جوولەكە دۆركهایم كاریگەری راسپاردەكانیدیكەشی لەسەربووە وەك كاسۆلیك، لەسەر دەستی یەكێك لە خانمە مامۆستایانی ئایینی فێری دروشم و رێنماییەكانی ئەو مەزهەبە ئایینییە بووە.(٧٥)

دۆركهایم لە ساڵی ١٨٨٢ دەبێتە مامۆستای فەلسەفە و لە یەكێك لە ئامادەییەكانی فەرەنسا وانە دەڵێتەوە، ساڵی ١٨٨٦ دەبێتە مامۆستای پەروەردە لە زانكۆی بۆرۆ (١١) ساڵ لەم زانكۆیەدا دەمێنێتەوە، هەرلێرەشدا نامەی دكتۆراكەی لەسەر دابەشبوونی كاری كۆمەڵایەتی تەواودەكات و ساڵی (١٨٩٣ز) بڵاویدەكاتەوە، دۆركهایم بۆ یەكەمجار دەگاتە (زانكۆی سۆربۆن) دەبێت بە پرۆفیسۆر لە بواری زانستی پەروەردەدا، لە ساڵی ١٩١٢ كتێبە بەناوبانگەكەی بەناوی (فۆرمە سەرەكییەكانی ژیانی ئایینی) بڵاودەكاتەوە. لە ساڵی ١٩١٣ دەبێت بە پرۆفیسۆر لە بواری سۆسیۆلۆژیادا، لە ساڵی ١٩١٦ز لەژێر زەبری نەخۆشیدا واز لە چالاكی دەهێنێت و هەرلەوماوەیەدا تەرمی ئەندریەی كوڕی لە بەرەكانی جەنگەوە خۆی دەكات بەماڵدا "دۆركهایم"ی نەخۆش ناچاردەكات لەسەر تەرمی كوڕەكەی بگری، زۆری پێناچێت لە ١٥ی نۆڤەمبەری ١٩١٧ دۆركهایمیش كۆچیدواییدەكات.(٧٦)

**تەفسیری دۆرکهایم بۆ دیاردەی خۆکوشتن:**

لەهیچ شوێنێك بۆ نیزامی کۆمەڵگە تاکوئێستا روونکردنەوەیەك نەکراوە وەکو ئەو لێکۆڵینەوەیەی دۆرکهایم کردی لەبارەی خۆکوشتنەوە لە ساڵی (١٨٩٧ز) دا. بەڕای دۆرکهایم کەمترین یاسای هاوبەش هەبووە لەسەر ئەوکەسانەی کەوا زۆرترین ڕێژەی خۆکوشتن ئەنجامدەدەن و دەیچێژن، بۆیە دەبینین کەوا ئەوکەسانەی کە گەنج و دەوڵەمەند و بەناوبانگن و زیاتر ڕێپێدانێکی گەورەتر دەگرنەئەستۆی خۆیان، چونکە ئەمانە نرخێکی بەرزیان هەبووە لەبارەی ئەوەی چۆن ژیانی خۆیان دەخەنەبەر مەترسی خۆکوشتن.[٧٧] دۆرکهایم بەهۆی بەکارهێنانی ئامارەوە دەریخست کە هۆکارە کۆمەڵایەتییەکانی وەکو خێزان و ئایین پەیوەدنی بە خۆکوشتنەوە هەیە، سەرەڕای ئەوەی وادێتەبەرچاو کە ئەم دیاردەیە شێوەیەکی تاکەکەسییانەی هەیە، بەڵام دەتوانین بیسەلێمنین کە جگەلە دیاردەیەکی کۆمەلایەتی لادەرانە هیچیتر نییە. میتۆدی دۆرکهایم لە لێکۆڵینەوەدا ئەمانەی لەبەرچاوگرتبوو: پەیوەندی خۆکوشتن بە کات و وەرزەکانی ساڵەوە، خۆکوشتن لەناو گرووپ و چین و توێژە جیاجیاکاندا، پەیوەندی خۆکوشتن بەشوێنی نیشتەجێبوون، پەیوەندی خۆکوشتن بەئینتیما و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و کاریگەری کێشە و گرفتی ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان لە سەرهەڵدانی خۆکوشتندا.[٧٨] دۆرکهایم پێیوایە کە کۆمەڵگە نییە خۆکوژی تێدارووندەدات زۆرێك لە کۆمەڵگەکان بەدرێژایی کات نرخی خۆکوژی یەکسانییان هەیە. ئەوهۆکارە واخۆی نیشاندەدات کە خۆکوژی وەك دیارەیەکی گونجاو و ئاسایی ببینین، بەڵام زیادبوونی لەناکاوی ڕێژەی خۆکوژی لەهەندێ لە گروپەکانی کۆمەڵگە یان هەموو کۆمەڵگە ڕووداوێکی نەگونجاوە و وانیشاندەدات کە تێکچوونی تازە لە کۆمەڵگە دروستبووە، لەمڕووەوە بەهای بەرزی و نەگونجاوی خۆکوژی لەناو گرووپ و توێژی کۆمەڵایەتی بەتایبەت یان لەناو تەواوی کۆمەڵگە توانی بە ناونیشانی سەرچاوە و هیزگەلێکی دانێت کە چوارچێوەی کۆمەڵگە لە ئاڕاستەی یەکپارچە کاردەکات.[٧٩]

دۆرکهایم هەردوو بەشی دووەم و سێیەمی کتێبەکەی تەرخانکردووە بۆ بەڵگەهێنانەوە بۆ فاکتەری خۆکوشتن کە ئەوانیش فکتەری کۆمەڵایەتین، لەو کۆمەڵگەیانەی کە پەیوەندی تاك بە کۆمەڵگەوە بەهێزە، هەژمoونی عەقڵی جەمعی لەسەر تاکەکان هەژموونێکی کامڵە و خۆکوشتنیش کەمدەبێتەوە، بەڵکە بەرەولەناوچوونیش دەچێت، بەڵام لەو کۆمەڵگەیانەی کە دەزگا و دامەزراوە تایبەتییەکان و سیاسییەکان و ئابوورییەکان و خێزانییەکان هەژموون و

بالادەستی خۆیان لەدەستدەدەن، بەمەش ڕێژەی خۆکوشتن بەرزدەبێتەوە، بەشێوەیەك دەبێتە دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی..[٨٠] واتە دۆرکهایم (خۆکوشتن) بەدیاردەیەکی کۆمەڵایەتی دادەنێت و پێیوایە لێکدانەوەی تەنها بەهۆی هۆکارە کۆمەڵایەتییەکانەوە دەبێت و گشتگیرتنی جۆری خۆکوشتن ئەوەیە کە پەیوەندی تاکەکەس بە کۆمەڵگەوە بڕابێت، بەکورتی ئەو لە کتێبی خۆکوشتندا پەیڕەوی لە پرنسیپی (لێکدانەوەی کۆمەڵایەتی لەڕێی دیاردەی کۆمەڵایەتییەوە) دەکات، چونکە سوود لە میتۆدی گۆڕانکارییە لێکنزیکەکان وەردەگرێ و دەیەوێت پەیوەندی لەنێوان خۆکوشتن و دیاردە کۆمەڵایەتییەکانیتر دروستبکات.[٨١]

دۆرکهایم لە خۆکوشتن ڕێگە و شێوەیەکی داناوە کە هێڵکاری تەواوی بۆکردووە نموونەی ڕاستی لە لێکۆڵینەوە کۆمەڵناسییەکاندا بەدیهێناوە کە لەبری پشتبەستن بە ئەزموون و تەجروبەکان پشتی بە ڕاستییەکانی کۆمەڵگا بەستووە، خۆکوژی یەکێکە لە نموونەگەلی تازەی سیستماتیك کە لەڕێگەی بەکارهێنانی ئامار لە لێکۆڵینەوە کۆمەڵایەتییەکان دەبێت، دۆرکهایم باوەڕیوابوو کە دەتوانێ بە هاوکاری ژمارەیەك لە هۆکاری کۆمەڵایەتی شەرحبکرێ کە بۆچی هەندێ لە تاکەکان زیاتر لە خەڵکیدی پەنا بۆ خۆکوشتن دەبەن، بۆیەدەرکەوت کە یەکپارچەیی گرووپە کۆمەڵایەتییە جۆراوجۆرەکان لەگەڵ یەکتر جیاوازی هەیە و ڕێژەی خۆکوشتنیش لەناو ئەندامانی ئەم گرووپانە جیاوازی هەیە لەگەڵ گرووپەکانیدی، کۆمەڵگەیەك کە یەکپارچەیی و دەستەجەمعی هەیە تاکەکانی دەخاتەژێر دەسەڵات و کۆنترۆڵی خۆی، مەبەست لە یەکپارچەیی دۆخی هاوبەشبوون و هەستی گرووپییە لەنێو تاکەکانی کۆمەڵدا.[٨٢]

دۆرکهایم باوەڕیوایە لەهەر کۆمەڵگایەکدا مەیلێکی دەستەجەمعی هەیە کە پاڵ بەتاکەکانەوە دەنێت بەرەو خۆکوشتن، ئەم مەیلە لە ڕێژەی خۆکوشتنی ناو کۆمەڵگەوە دەردەکەوێت کە ئەم ڕێژەیە بەپێی سروشت و بارودۆخی ئەو کۆمەڵگەیە دەگۆڕێت، بۆ نموونە ڕێژەی خۆکوشتن لە کۆمەڵگە پیشەسازییە بەرزەکاندا زیاترە کە ژیانی کۆمەڵایەتی تیایاندا ئاڵۆزە، کەچی ئەو ڕێژەیە لە کۆمەڵگە کشتوکاڵییە سادەکاندا نزمە، هەروەها لەشارەکاندا ڕێژەکە بەرزترە لەچاو لادێکاندا، هەروەها لەنێو سەڵتەکاندا نزمترە تا لەنێو خێزاندارەکاندا بەتایبەتی ئەوانەی منداڵیان زۆرە.[٨٣] پێیوایە هەمیشە لەنێو یەهودییەکاندا بە بەراورد لە گەڵ پرۆتستانەکان پاڵنەرێکی کەمتریان بۆ خۆکوژی هەبووە، هەروەها بەشێوەیەکی کەم بەرامبەر کاسۆلیکیش هەروابووە. هەندێجاریش پێچەوانەی ئەم پرسە ڕوویداوە کە جوولەکەکان پتر لە

کاسۆلیکەکان خۆیان کوشتووە و کاسۆلیکەکانیش کەمتر لە پرۆتستانتەکان خۆکوژیان ئەنجامداوە و موسوڵمانەکان لەهەموویان کەمتربووە، چونکە بەئاشکرا ئەم کارەی نەهی و حەرامکردووە.[٨٤]
سەبارەت بە پرسی رەگەز لە پشکنینەکانی دۆرکهایمدا ناهاوسەنگییەك بەدیدەکرێت لەنێوان هەولّی خۆکوژی بەلای رەگەزی نێر و مێ، لە ولاتانەی کە دۆرکهایم لێکۆڵینەوەی تێدائەنجامداوە، رێژەی خۆکوشتنی پیاوان لە ئافرەتان زیاتر تۆمارکراوە، هۆکاری ئەم پارادایە بەقەناعەتی دۆرکهایم دەگەڕێتەوە بۆ ئامۆژگارییەکانی ئایینەکان و پرسی پابەندبوونی ژنان بە ئایینەکانەوە، ئەو پێیوایە کە ژنان زیاتر لە پیاوان لەژێر کاریگەری ئایین و قەناعەتە ئایینییەکاندان، هەرئەم دۆخە وادەکات کە ژنان کەمتر بیر لە خۆکوشتن بکەنەوە و زیاتر لە پیاوان ملکەچی کۆگەراییبن.[٨٥] دۆرکهایم کۆمەڵێك فاکتەری جۆراوجۆری وەك فاکتەری گەردوونی و بواری جوگرافیا و فاکتەری فیزیکی و ژینگەیی و فاکتەری سروشتی، کەشوهەوا و رێژەی پلەی گەرما و شێ.. دەوروژێنێت دەڵێت لەوانەیە رێژەی خۆکوشتن لە هیندستان بەهۆی بەرزی پلەی گەرماوە بەرزبێت.[٨٦]

**جۆرەکانی خۆکوشتن لای دۆرکهایم:**

دۆرکهایم پێیوایە هەر یەك لەم جۆرانەی خۆکوشتن پەیوەندی بە حاڵەتی هاوبەندی تەزامنی کۆمەڵایەتییەوە هەیە:

**خۆکوشتنی گۆشەگیری کۆمەڵایەتی (خۆکوژی خۆپەرستانە):**

ئەمجۆرە زیاتر لەو گروپ و کۆمەڵگەیانەدا روودەدات کە تاکەکان بەتەواوی لەگەڵ کۆمەڵگە و یەکەی کۆمەڵایەتی گەورەتر تێکەڵنەبوون، خەسڵەتی سەرەکی ئەم کۆمەڵگەیانە تاکگەرایی زیاد لەحەدە.[٨٧] واتە کاتێك روودەدات کە رادەی یەکگرتویی کۆمەڵگا لاوازبێت، بەهۆی هۆشیارنەبوون و کامڵنەبوونی تاکەکانی ناو کۆمەڵگاکە، کاتێکیش دەزانێت ناتوانێت جێگەی خۆی لەنێو کۆمەڵگەکەیدا دیاریبکات و ملکەچی دەستەڵاتی کۆمەڵایەتی بێت، ناچارە پەنابەرێتەبەر دابڕان و دوورکەوێتەوە لە کۆمەڵەکەی، لەبەرئەوەی تاك واهەستدەکات زۆر دوورە لە حەز و خواست و ئامانج و بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵگەکەیەوە،[٨٨] ئەمەش هۆکارەکەی پەیوەستە بەخودی تاکەوە یان پەیوەستە بە کۆمەڵگەکەیەوە کە تاك تێیدادەژی و کارلێکدەکات لەگەڵیدا و ئەم تاکە ناتوانێت پەیوەندییەکی سروشتی لەگەڵ کۆمەڵگەدا ببەستێت، بەهۆی

حەزنەکردنی بە یاسا و دابونەریتی کۆمەڵگە و ئەو رقوقینەی هەیەتی بەرامبەر سیستم و بارودۆخی گشتی و کۆمەڵگەش لەلای خۆیەوە بوار نارەخسێنێت بۆ تاك تاوەکو بەشداربێت لەگەڵیدا و تێکەڵبێت بەدامەزراوە و بونیادەکانییەوە..[٨٩] ئیتر لەمەوە تاك هەست بەبێزاری و پشتگوێخراوی بێنرخی خۆی دەکات، هەستێکی وای لا دروستدەبێت کە هیچ رۆڵێکی لەناو کۆمەڵگەکەیدا نییە و لە مشەخۆرێك زیاتر نییە، ئا لەمکاتەوە دوورنییە کە ئەو هەست و سۆزە پاڵ بەتاکەوە بنێت بەرەو هەڵدێر و خۆکوشتنی ببات، چونکە بەلای ئەمجۆرە کەسانەوە ئازاری خۆکوشتنەکە لە ئازاری تەنیایی و گۆشەگیرییەکە کەمترە، مەبەستیش لە گۆشەگیری کۆمەڵایەتی ئەوەنییە کە تاك دوورە لە قەرەباڵغی و تێکەڵاوی کۆمەڵایەتی، بەڵکو مەبەست لە رۆڵ و شێوەی پەیوەندی و جۆری هاوبەشیکردنەکەیە وەك ئەوەی لە شارێکی گەورەدا هەست بەتەنیایی و گۆشەگیری دەکات لە ئەنجامی (بێکاری و نامۆبوون و ئاوارەیی و بێکەسی و پیری..).[٩٠]

**خۆکوشتنی قوربانیدان لەپێناو کەسانیدیکە (خۆکوژی خۆبەخشانە):**

ئەمجۆرە خۆکوشتنە یان قوربانیدانە لەپێناوی ئەوانیدیکەدا و خۆکوشتنی ئەویترخوازانە، کاتێك روودەدات کە تەواوکاری کۆمەلایەتی هێندە بەهێز و توندوتۆڵە ئەنگێزەی تاکانەیی نامێنێت. ئەمەش شێوەیەکە لە خۆکوشتن کە کۆ رازیدەکات و ئەقڵی کۆ بانگەشەی بۆ دەکات.[٩١] بەبۆچوونی دۆرکهایم ئەمە لە دوو نموونەی سەرەکی پێکدێت، نموونەی یەکەم لە کۆمەڵگە سەرەتاییە تەقلیدییەکاندا هەیە کە ژیانی کۆمەڵ داوایدەکات، بۆ نموونە لە هیندستان ژنێك لەپاش مێردەکەی خۆی دەسووتێنێت، ئەمە خۆکوشتنێکی خۆویستانە نەبووە، بەڵکو خۆکوشتنی ئەم تاکە لەپێناو کەسانیتر و پێوەرە کۆمەڵایەتییەکاندایە، ئەوکەسەی مردنەکە هەڵدەبژێرێت پابەندیی تەواوی هەیە بە دابونەریتە کۆمەڵایەتییەکانەوە،[٩٢] واتە ئەمە هۆیەکەی تەواو پێچەوانەی هۆکار و پاڵنەرەکانی خۆکوشتنی ئیگۆییە، هۆکارەکەش پەیوەندی بە بەهێزبوونی پەیوەندی تاك و کۆمەڵ و گونجان و هەمانهەنگییەوە هەیە، هەروەها ئامادەشە لەپێناو گروپ و کۆمەڵەکەیدا قوربانی بەخۆی بدات (ئەمەش لەکاتێکدا روودەدات کە تاکەکە نوشوستیهێنا یاخود نەیتوانی کۆمەڵەکەی لە مەترسی و هەڕەشەی دەرەکی یان ناوەکی رزگاربکات، ئینجا لەپێناو خودی ئەو کۆمەڵەی کە ناتوانێت بێنە و بژیەت خۆی دەکوژێ. یان وەك ئەوکەسە خۆی

دەکوژێت یان هەندێککەسیش لەپێناو هۆز و تیرە و خێڵەکەیدا کە دووچاری دەستدرێژی و تالآن و سەرشۆڕی و دەبنەوە لەلایەن هۆز و خێڵەکانیدیکەوە، زەقن بۆ جۆری خۆکوشتنی ئالتوویستی.(٩٣)

**خۆکوشتنی هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵایەتی (ئانۆمی):**

ئاماژەیە بۆئەو بارودۆخە لەدەستدراوانەی کەوا کۆمەڵگە هەستیپێدەکات کاتێك کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی لە رەفتاری تاکەکاندا بێسوود و کاریگەردەبێت، ئانۆمی کاتێك روودەدات کە خەڵکی لەرێگا راستەکەی خۆیان وندەکەن کە ئەمەش لەوکاتانەدایە کە گۆڕانی کۆمەڵایەتی رووئەدات کە خەڵکی سەرلێشێواو و بێتوانادەکات و ناتوانن چارەسەری ئەو ژینگە کۆمەڵایەتییە نوێیە بکەن کە لەوانەیە ئەوان بگەڕێنێتەوە بۆ ژیانی سەربەخۆیی خۆیان.(٩٤) واتە دەرەنجامی کەموکوڕی و تێکچوونە لە سیستمی کۆمەلایەتی باودا، ئەم حاڵەتە لە کۆمەڵگەکانی سەدەی نۆزدەدا و سەرەتای سەدەی بیستدا زۆر باوبووە. دۆرکهایم ئەمە دەگەڕێنێتەوە بۆئەو گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییانە کە بەسەر دابونەریتە باوەکاندا دێت، لەبەر ئەم هۆکارە خۆکوشتن لە قەیرانە نەتەوەییەکاندا، کۆمەڵایەتی و ئابووری یان تەنانەت لە حاڵەتەکانی خۆشگوزەرانی کتوپڕ یان هەڵگەڕانەوەی هۆیەکانی بەرهەمهێناندا زۆردەبێت، دۆرکهایم ئەمە بەوشێوەیە لێکدەداتەوە کە تاك لە کۆمەڵێك ئارەزووی ناکۆتادا وندەبێت کە ئەم ونبوونە لەگەڵ لاوازی تواناکانی تاك بۆ بەدیهێنانی ئەو ئامانجانە هاوکاتە ئەویش بەهۆی پشێوی ئەو کۆمەڵگەوە، بەمەش تاك خودێتی خۆی لەدەستدەدات، وایلێدێت بێچێژوەرگرتنی لایەنە مرۆییەکەی بەدەستهەستکردن بە بۆشایی و دۆگماییەوە بنالێنێت و بۆ بوونەوەرێکی بایۆلۆژی بگۆڕێت.(٩٥) ئەمەش وا لە تاك دەکات پەنابۆ خۆکوشتن ببات. ئەم حاڵەتە لە خۆکوژی لەدۆخێکدا بەرجەستەدەبێت کە تاك هەستدەکات ئەو نۆرم و رێسا کۆمەڵایەتییانەی کە لەگەڵیدا گۆشکراوە تووشی هەرەسهێنانهاتوون، ئەمەش لەحاڵەتێکدا سەرهەڵدەدا کە پنتە سروشتییەکانی کۆمەڵگە کە بریتییەلە نۆرم و بەها کۆمەڵایەتییەکان، گۆڕانی بەسەردادێت و دەکەونەژێر کاریگەری مۆدێلێکی نوێ، بە بۆچوونی دۆرکهایم ئالۆمی لەحاڵەتێکیوادا سەرهەڵدەدا کە گۆڕانکارییەکی خێرا لە پێکهاتەی کۆمەڵگەدا بکات. ئەم حاڵەتەش دەبێتەهۆی ئەوەی توانای بەسەر تاکدا نەمێنێت، دروستبوونی ئەم دۆخە نوێیە دەبێتەهۆی لەناوچوونی بەها مرۆییەکان و لاوازبوونی پێکهاتەی کۆمەڵگە، دروستبوونی

دۆخی ناعەدالەتی کۆمەڵایەتی لەمبارەدا سەرهەڵدەدات و تاك هەستدەکات مافەکانی زەوتکراوە، پەیوەندی مرۆڤانەی بە ئاوەژوویی بەرجەستەدەکرێ و داڕووخانی ویژدانی کۆمەڵایەتی بەهای پێنادرێت، مانای ژیانی لێوندەبێت و روو لە خۆکوشتن دەکات.[٩٦]

## تێڕوانینی فرۆید دەربارەی خۆکوشتن:

گەورە دەروونناسی نەمسایی و دامەزرێنەری قوتابخانەی دەروونشیکاری (سیگمۆند فرۆید ١٨٥٦ – ١٩٣٩)، بڕوایوایە کە دووجۆر پاڵنەر و رەمەکی سەرەکی بۆ رەوشت و هەڵسوکەوتی مرۆڤ هەن، ئەوانیش رەمەکی ژیان و رەمەکی مردنە (ساناتۆس THANATOS).[٩٧]

فرۆید قوتابخانەی دەروونشیکاری دامەزراند و کاری تێداکرد و راڤەی دەروونیی کرد، هەروەها سەرجەم فاکتەر و پاڵنەرە بزوێنەرەکانی دەروونی راڤەکرد خەموخەفەتی بەستەوە بەلەدەستدانی شتێك کە دەشێت ئەوشتە ماددی خەیاڵی بێت یان زۆرجار لەدەستدانی مرۆڤێك بێت وەك لەدەستدانی کەسێکی خۆشەویست.[٩٨]

فرۆید لەوباوەڕەدایە کە دووجۆر پاڵنەر و رەمەکی (غەریزە) سەرەکی بۆ رەوشت و هەڵسوکەوتی مرۆڤ هەیە، ئەوانیش غەریزەی ژیان (ئیرۆس)و غەریزەی مردنە (ساناتۆس)، پاڵنەری سەرەکییە بۆ کوشتن و تێکدان و کاولکاری و تێکشکاندن، بە بۆچوونی فرۆید مردن و خۆکوشتن لەئەنجامی رەمەکی ساناتۆسە و بەرجەستەکردنی گرۆتینییەتی لەژیاندا.[٩٩] خۆکوشتن بە گەڕانەوەی شەڕەنگێزی بۆ خود وەسفدەکات، چونکە مرۆڤ توانستی پێویستی نییە تا پراکتیزەی توندوتیژی دژی غەریزەی ژیان بکات، لەم لێکدانەوەدا پشتدەبەستێ بە گریمانەکەی سەبارەت بەپێکهاتەی سایکۆلۆژی تاك کە دوو غەریزەی دژبەیەك لەخۆدەگرێت و بەردەوام لە ململانێدان ئەویش غەریزەی مردن و وێرانکارییە کە سەرچاوەی هەموو کارێکی وێرانکاری و رەفتارێکی شەرانگێزییە لەگەڵ غەریزەی ژیان کە سەرچاوەی هەموو کارێکی داهێنەرانە و رەفتارێکی بیناکار و کارە پۆزەتیڤەکانە بۆ بەردەوامبوونی ژیان، بەڵام کاتێك غەریزەی مردن بەهێزتردەبێت غەریزەی ژیان لەگەڵ ئەویشدا بەرەنگاریدەکات، بەڵام غەریزەی مردن زاڵدەبێت و لەمساتەدا مرۆڤ دەتوانێت خۆی بکوژێت، چونکە لەمکاتەدا مرۆڤ دەبێتە قوربانی پاڵنەرە شەڕەنگێزەکانی، غەریزەی مردن دەیانبزوێنێت و لە گوزارش کردنلێیان بۆ دەرەوە فەشەلدەهێنن و بەرەوناوەوە و بەئاڕاستەی خود دەگەڕێنەوە و خود وێراندەکەن.[١٠٠]

مرۆڤ لەئەنجامی خەم و خەفەت و خەمۆکییەوە تووشی خۆکوشتن دەبێت بەتایبەتی کاتێك کەسێکی خۆشەویستی یان هێمایەکی بەنرخی ژیانی (سەربەستی، نیشتمان، ئازادی، شەرەف و کەرامەت..) لەدەستدەدات، ئەو لەدەستدانە تووشی خەمۆکییەکی زۆری دەکات، لەلای زۆربەی ئەندامانی کۆمەڵ ئەو خەم و خەفەت و دڵەڕاوکێ و خەمۆکییە رەنگدانەوەیەکی سروشتی ئەو لەدەستدانەن و هیچ مەترسییەکی لەسەر ژیانی مرۆڤ نییە، لەبەرئەوەی پاش ماوەیەك ئیتر وردەوردە لەبیردەچنەوە و وەك هەوری هاوین دەڕەوێنەوە و مرۆڤ کەس و هێمایەکیتر لەجیاتی ئەو کەس و هێما لەنێوچاوانی دەدۆزێتەوە و پەیوەندی کۆمەڵایەتی و سۆز و خۆشەویستی نوێ لەگەڵیان دادەمەزرێنێت.[١٠١] بەشێك لە دەروونزانەکان بڕوایانوایە، ئەو کەسانەی پەنادەبەنەبەر خۆکوشتن کۆمەڵێك گرفتی دەروونیان هەیە، بۆ نموونە فرۆید دەڵێت: (ئەو کەسانەی پەنادەبەنەبەر خۆکوشتن، لەئەنجامی زاڵبوونی (الانا العلیا - منی باڵا) بەشێوەیەکی لەڕادەبەدەر بەسەر (الهو - ئەو) کەوا لە مرۆڤ دەکات، هەموو هەڵەیەکی بچووك بەتاوان بزانێت، بەردەوامبوون و دووبارەکردنەوەی ئەم هەڵانەی وایلێدەکات تووشی خەمۆکی بێت و ناچاریبکات پەنابباتەبەر خۆکوشتن، بۆئەوەی خۆی لە گوناهەکانی بشواتەوە.[١٠٢]

**بەشی چوارەم: ناسینەوەی ئەو کەسانەی کە مەترسی خۆکوشتنیان لەسەرە.**

کۆمەڵێك نیشانە و هۆی دیاریکراو هەن کەوا دەکەن ئەو کەسانەی کە نیازی خۆکوشتنیان هەیە بناسرێنەوە، ئەمەش لەڕێگەی وەرگرتنی قسەکانیان بەجیدی و حیسابکردن بۆیان، هەمیشە ئەو کەسانەی کە مەترسی خۆکوشتنیان لەسەرە پاشخانێکی زۆریان لە خەم و خەفەت و ئازار و ناخۆشی و دڵەڕاوکێ و نەخۆشی و بارودۆخی خراپی ئابووری و کۆمەڵایەتی هەیە، وەك ئەوەی لە خوارەوە ئاماژەپێدەدەین:

- زۆرجار ئەوکەسانە باسی خۆکوشتن بۆ دۆست و برادەرە نزیکەکانی خۆیان دەکەن.

- بەردەوام دەڵێن مردن لەم ژیانە خۆشترە و ئەوەندە ناهێنێت کە مرۆڤ لەپێناویدا ئەو هەموو خەفەت و دەردەسەرییانە بچێژێت و بەکارهێنانی کۆمەڵێك دەستەواژەیتر وەك (ئەمە کەی ژیانە، خۆزگە دەمردم، خوابمباتەوە بۆ خەزێنەکەی خۆی..).[١٠٣]

- هەستان بەو چالاکییانەی کە ئاماژەبەخشن بۆ خۆکوژی وەکو ماڵئاواییکردن و نووسینی وەسیەتنامە و داواکردن لە هاوڕێیەکی نزیکی یان یەکێك لە ئەندامەکانی خێزانی بۆ شتنی

لەدوای مردنی.

- بوونی پلانێکی روون سەبارەت بەخۆکوشتن وەك بیرکردنەوەلێی یان گفتوگۆکردن سەبارەت بەو بابەتە.

- بوونی دیاردەیەکی خۆکوژی لەو خێزانەدا یان هاورێیەکی بەمنزیکانە خۆی کوشتبێ.[١٠٤]

- کڕینی یان پەیداکردنی (چەك و تەقەمەنی و ژەهر و حەب و دەرمانی بێهۆشکەر و چەقۆ و کەرەستەی بریندارکردن و بوون و دانانی ئەم کەرەستانە لەماڵدا دەکرێت وەك نیشانەیەکی گرنگ بزانرێت.

- گرنگینەدان بە تەندروستی و پشتگوێخستنی پاکوخاوێنی جلوبەرگ.

- خەولێزڕان و بینینی خەونی ناخۆش و ترسناك و لەگەل بوونی هەلۆەسەی بینین و بیستن و فەرمانی خراپ بەنەخۆش، چونکە بەشێکی زۆری ئەوانەی خۆکوشتن ئەنجامدەدەن گرفتی هەلۆەسەی بیستن و بینییان هەیە.

- لاوازی و کەمخواردن و بوونی ململانێی دەروونی و دڵەڕاوکێ و خەمۆکی و گرژی و بێزاربوون لە ژیان.

- خەمۆکی و لەگەڵ بێئومێدی لە چاکبوونەوە و بوونی خەم و خەفەت و گرژی و رەشبینی بەردەوام، تەنانەت دوورکەوتنەوە لە زۆر کۆڕ و کۆبوونەوە و تێکەڵاوکردنی کەسانیتر.[١٠٥]

- ئالودەدەبێت لەسەر بەکارهێنانی دەرمان و مادده بێهۆشکەرەکان.

- لەدەستدانی کەسوکار بەتایبەتی کەسوکاری پلە یەك وەك باوك و دایك و خوشك و برا و هاوسەری ژیان و منداڵ و لەدەستدانی پیشە و کاری سەورەت و سامان.

ن- ەخۆش بەتەنیا بژی یان گۆشەگیربێت.

- تازە لەنەخۆشخانەی دەروونی چارەسەری بۆکرابێت و نێردرابێتە ماڵەوە.

- هەستکردنی پزیشك بە حاڵەتی نەخۆش سەرەڕای ئەوەی نەخۆش دەیلێ یان دەیکات گەر ئەو هەستەی بۆ دروستبوو بەنیازی خۆکوشتنە دەبێ کاری پێویستی بۆبکرێت و لەگەڵ کەسوکارەکەیدا گفتوگۆ بکرێت.[١٠٦]

## چارەسەر و پاراستن لە خۆکوشتن

وەك دیارە دیاردەی خۆکوشتن دیاردەیەکی ترسناکە کۆمەڵگە بەرەو لێکترازان و هەڵوەشانەوەدەبات، مێژوو و رەهەندێکی دوورودرێژ لە چارەسەرکردن لەلایەن فەیلەسوف و زانا و دەروونناس و کۆمەڵناسەکانەوە دەبینرێت بۆ کەمکردنەوەی ئەم دیاردەیە بەردەوام لە هەوڵدابوون، چونکە هەموو کات رووڵەزیادبوون بووە بەپێی تێپەڕبوونی کات، بۆیە هەرگیز نەهێشتنی خۆکوشتن ناکرێت و کۆتاییپێنایەت، بەڵام ئەمەش مانای ئەوەنییە کە ئەم دیاردەیە رووڵەکەمبوونەوە نەکات. لەرێگەی هەوڵدان و چارەسەرکردنییەوە، لەخوارەوە ئاماژە بەچارەسەری خۆکوشتن دەدەین:

- نەهێشتنی تەنیایی و نامۆیی و گۆشەگیری لەناو کۆمەڵگادا ئەویش لەرێگەی بەهێزکردنی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانەوە.
- دەستنیشانکردنی ئەو کەسانەی کە نیشانەکانی خۆکوشتنیان هەیە و نیازی ئەنجامدانی ئەم کارەیان هەیە و دواتر هەوڵی چارەسەرکردنی بدرێت.(١٠٧)
- گرنیگدان بە خانەنشین و پیر و بەساڵاچوەکان و زیادکردنی جێگا و ئامراز بۆ رابواردن و کاتبەسەربردن و قۆستنەوەی کاتی بێئیشییان.
- ئاگادارکردنەوە و هۆشیارکردنەوەی خەڵك و کەسانی چواردەوری نەخۆش بۆئەوەی ئگاداری نەخۆشبن و لەنزیکەوە ئاگاداری گرفتەکانیانبن.
- چاودێریکردنی وردی، فرۆشتن و بەکارهێننی ئەو دەرمانانەی کە دەتوانرێت بۆ خۆکوشتن بەکاربهێنرێت، دەبێت پزیشکەکانیش ئاگاداری مەترسی و کاریگەرییەکانی بێت.(١٠٨)
- پێویستە هەموو لایەنە بەرپرس و دەزگاکانی راگەیاندن و کۆمەڵە و رێکخراوەکانی حکومی و ناحکومی، هەماهەنگی لەگەڵ وەزارەتە پەیوەندیدارەکانی وەك وەزارەتی رۆشنبیری و وەزارەتی پەروەردە و وەزارەتی وەرزش و لاوان، وەزارەتی کاروباری کۆمەڵایەتی و وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئایینیی و وەزیری هەرێم بۆ کاروباری ئافرەتان و ژنان، کاربکەن بۆ رۆشنبیرکردن و گۆڕینی عەقڵی تاکەکەسی کورد بۆ زیاتر رێگەگرتن لەم دیاردەیە.
- بایەخدانی زیاتر بە خێزان و پەرەپێدانی هۆشیاری خێزانی ئەمەش بەشێوەیەکی گشتی و راستەوخۆ لەم خاڵانەدا خۆی دەبینێتەوە:
- ئەرکی سەرشانی حکومەتە بەکردنەوەی خول بۆ هۆشیارکردنەوەی خەڵك چونکە حکومەت

دەبێت هەڵمەتی هۆشیارکردنەوەی خەڵك بگرێتەبەر بۆ گۆڕینی تێڕوانین لە رۆڵی ژنان و ئافرەتان.
لە مەڵبەند و سەنتەرەکاندا خولی (هۆشیارکردنەوە دەربارەی خۆسوتاندن بکرێتەوە، لەڕێگەی قوتابخانەکانەوە تا ئەم دیاردەیە کەمبکرێتەوە).(١٠٩)

- گرنگی زیاتر بدرێت بە گەنجان و پەیوەندی لەگەڵیاندا کراوەتر و نەرمونیانتر بێت، دیالۆگ لەجێی شەڕ و هەڕەشە و لێدان و سوککردن بەکاربهێنرێت و توندتیژی جەستەیی و دەروونییان لەگەڵدا بەکارنەیەت، بەڕاستگۆییەوە مامەڵەی مەدەنییانە لەگەڵ کچ و کوڕی ناوخێزانەکاندا بکەین و نهێنی پارێزیبکەین و لەهەمانکاتدا گرفتی دەروونی و سۆزداری و ئابوورییەکانیان بۆ چارەسەربکەن و بێناز و بێنەوایان نەکەن، لەلایەنی داراییشەوە پیسکە و رژدنەبین و یارمەتیانبدەین.(١١٠)

- چاودێریکردنی نەخۆش ئەگەر لەنەخۆشخانە بوو لەلایەن پزیشك و کارمەندانی تەندروستی و یاوەری نەخۆشەوە، پشکنینی نەخۆش و لێسەندنەوەی هەر ئامێرێکی ترسناك لەسەر گیانی نەخۆش پەیدابکات وەك چەقۆ و دەرنەفیز و دەرمان.. هتد، ئەگەر لەماڵەوەش بوو لەلایەن کەسوکاری نەخۆشەوە، بەجێنەهێشتنی نەخۆش بەتەنیا لەژورێکدا و دوورخستنەوەی هەرشتێك کە ئەگەری بەکارهێنانی هەبێت بۆ خۆکوشتن لەلایەن نەخۆشەوە وەك چەقۆ و گوریس و نەوت و ئاگر و دەرمان.(١١١)

- زیادکردنی زانیاری خەڵك کە خۆکوشتن حاڵەتێکی ژیری نییە، بەڵکو دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییە.

- بەهێزکردن و بڵاوکردنەوەی باوەڕبەخۆبوون لەلای تاکەکان، بەتایبەتی ئەوانەی هەست بەبێ تواناییان دەکەن.

- پێویستە بزاندرێت ئەوەی جارێك هەوڵی خۆکوشتن دەدات، ئەگەری دووبارەبوونەوەی زۆرە، بۆیە پێویستە چاودێری بکرێت.(١١٢)

- چارەسەرکردن و کەمکردنەوەی ئازاری ئەو کەسانەی کە تووشی نەخۆی درێژخایەن بوون.

- نابێت گلەیی و بەزەییمان بەو کەسانەدا بێتەوە، چونکە زۆرجار گلەییکردن و بەزەییهاتنەوە و سۆز و خۆشەویستی زیاد لەپێویست دەبێتە هۆی بەهێزکردنی بیر وباوەڕی خۆکوشتن.

- نابێت بەهێمنی و ئارامی و پشووی دەروونی دوای هەڵچوون و گرژی، هەڵبخەڵەتێن چونکە زۆرجار ئەو هێمنی و ئارامییەی دەروازەیە بۆ رووداني زریان و گەردەلولی هەڵچوون و گرژی و

توندوتیژی.

- هەوڵدان بۆ بە هێزکردنی میکانیزمەکانی بەرگرییە دەروونییەکان و خودی ئەو کەسانە و گۆڕینی راوبۆچوونی رەشبینانەیان دەربارەی ژیان.(١١٢)

- رۆڵی گرنگی توێژەری کۆمەڵایەتی لەکاتی چارەسەردا گەر بەهۆی کێشەی کۆمەڵایەتییەوە هەوڵی خۆکوشتن بدات، لە کۆمەڵگە ئەمە رێژەیەکی بەرچاوی حاڵەتەکان پێکدێنێت.

رۆڵی گرنگی چارەسازی دەروونی لەکاتی چارەسەردا بەتایبەتی گەر هۆکاری خۆکوشتنەکە بگەڕێتەوە بۆ بوونی ئەو نەخۆشییانەی کە دەتوانرێت لەرێی چارەسازی دەروونییەوە سوودی پێبگەیەنرێت.(١١٣)

- بەهێزکردن و بلاوکردنەوەی بیروباوەڕی ئایینی، چونکە باوەڕبوون و ترسان لە سزای دوارۆژ، زۆر کەس لەخۆکوشتن رزگاردەکات.

- تێبگەیەنرێت کە کوشتنی ئەوان هیچ لە ژیان ناگۆڕێ و تەنها ماوەی چەند رۆژێك خەڵکی خەمیان بۆ دەخوات و دوای ئەوە لەبیریاندەچنەوە، چونکە هەندێك کەس بە خەیاڵی خۆیان بەو خۆکوشتنەیان تۆڵە لەکەسانیتر دەکەنەوە و هەتاهەتایە تووی خەم و خەفەتیان دەکەن.(١١٤)

- پێویستە بە هێند ئەو گفتەی گەنجان وەربگرین، ئەگەر وتی: ژیانم ناخۆشە خۆمدەکوژم.. دەبێت، قسەی ناشیرین و تانەوتەشەر بەکارنەهێنرێت لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە هەوڵی خۆکوژی دەدەن یان باسی خۆکوشتنیان بۆدەکەن، پێویستە لەکاتی تەنگانەدا دەستی یارمەتییان بۆ درێژبکەین و درۆیان لەگەڵ نەکەین.(١١٥)

•••

## پەراوێزەکان:

١. ئیبراهیم حاجی زەڵمی، کوشتن لەسەر شەرەف، گۆڤاری سۆسۆلۆژیا، ژمارە (٤، ٥)، سلێمانی ٢٠٠٦، لا٦٥.

٢. ئەمیل دۆرکهایم، دیاردەی کۆمەڵایەتی چییە؟ و. د. محەمەد شوانی، گۆڤاری کۆمەڵناسی، ژمارە (٧)، ٢٠١١، لا٢١.

٣. د. کەریم شەریف قەرەچەتانی، نەخۆشی و گرفتە دەروونی و کۆمەڵایەتییەکان، چاپی دووەم، ٢٠١٠، چاپخانەی پەیوەند، سلێمانی، لا٣٠٩.

٤. زیرەك عەبدوڵلا، کۆمەڵگە و شێواوی، چاپی یەکەم، بەبێ شوێنی چاپ، ٢٠٠٦، کوردستان، لا٤٧.

٥. سۆزان جەمال، سایکۆلۆژی و مێیەتی، چاپی یەکەم ٢٠٠٩، چاپخانەی خانی (دهۆك)، لا٩٥.

٦. عەتا نەهایی، خۆکوژی ژنان و رازی هەڵبژاردنی ئاگر، گۆڤاری رەهەند، ژمارە (١٦، ١٧)، ٢٠٠٤ لا٢٣٣.

٧. د. کەریم کەریم شەریف قەرەچەتانی، سەرچاوەی پێشوو لا٣٢٠.

٨. عیزەدین ئەحمەد عەزیز، بنەماکانی دەروونزانی گشتی، چاپی دووەم ٢٠١١، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی رۆژهەلات، هەولێر، ل٢٢٠.

٩. هێرۆ جەمیل، کۆمەڵناسی و دیاردە کۆمەڵایەتییەکان، چاپی یەکەم ٢٠٠٨، هەولێر ل٧٩.

١٠. د. کەریم کەریم شەریف قەرەچەتانی، سەرچاوەی پێشوو ل٣٠٨.

١١. د. ئەفرام محەمەد حەسەن، نەخۆشییە دەروونییەکان، چاپی یەکەم ٢٠٠٩، چاپخانەی نشر احسان، تاران، ل٢٥١.

١٢. د. کەریم کەریم شەریف قەرەچەتانی، سەرچاوەی پێشوو ل٣٠٨.

١٣. د. ئەفرام محەمەد حەسەن، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٥١.

١٤. د. کەریم کەریم شەریف قەرەچەتانی، سەرچاوەی پێشوو ل٣٠٨.

١٥. د. ئەفرام محەمەد حەسەن، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٥١.

١٦. د. کەریم کەریم شەریف قەرەچەتانی، سەرچاوەی پێشوو ل٣٠٨.

١٧. هەمان سەرچاوە، ل٢٢٧.

١٨. رێکخراوی هارتلاند ئەلایەنس، بۆ پێداویستی مرۆیی و مافی مرۆڤ، راپۆرتێك لەبارەی تێگەیشتن و ریگرتن لە خۆکوشتن، بە هاوکاری کۆمەڵەی کۆمەڵناسان و دەروونناسانی کوردستان، سلێمانی ٢٠٠٩، ل٤.

١٩. د. کەریم کەریم شەریف قەرەچەتانی، سەرچاوەی پێشوو ل٣٢٧.

٢٠. د. ئەحمەد عەیاش، خۆکوشتن، و. سۆزان جەمال، چاپی یەکەم ٢٠١١، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ل١١٥.

٢١. د. ئەفرام محەمەد حەسەن، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٥١.

٢٢. سۆزان جەمال، سەرچاوەی پێشوو. ل١٣٠.

٢٣. رێکخراوی هارتلاند ئەلایەنس، سەرچاوەی پێشوو، ل٤.

٢٤. سۆزان جەمال، سەرچاوەی پێشوو. ل١٣٠.

٢٥. ئەحمەد عەیاش، سەرچاوەی پێشوو، ل١٠٩.

٢٦. سۆزان جەمال، سەرچاوەی پێشوو. ل١٣٠.

٢٧. د. ئەفرام محەمەد حەسەن، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٥٢.

٢٨. رێکخراوی هارتلاند ئەلایەنس، سەرچاوەی پێشوو، ل٤.

٢٩. ئەحمەد عەیاش، سەرچاوەی پێشوو، ل١١٠.

٣٠. رێکخراوی هارتلاند ئەلایەنس، سەرچاوەی پێشوو، ل٤.

٣١. سۆزان جەمال، سەرچاوەی پێشوو. ل١٣٢.

٣٢. ئەحمەد عەیاش، سەرچاوەی پێشوو، ل٩٩.

٣٣. د. کەریم کەریم شەریف قەرەچەتانی، سەرچاوەی پێشوو ل٣٢٨.

٣٤. هەمان سەرچاوە، ل٣٢٤.

٣٥. د. ئەفرام محەمەد حەسەن، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٥٣

٣٦. د. کەریم کەریم شەریف قەرەچەتانی، سەرچاوەی پێشوو ل٣٢٥.

٣٧. د. ئەفرام محەمەد حەسەن، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٥٣.

٣٨. مەلا ئەحمەدی قامیشی، خۆکوشتن نیشانەی بێدەستەلآتی و دۆڕانە، گۆڤاری خێزان، ژمارە (٥٧)ی ٢٠١١ سلێمانی،لا١٢.

٣٩. تۆماس زاس، خۆکوژی وەك کێشەیەکی ئەخلاقی، و. شاسوار کەمال مەحمود، گۆڤاری ئایدیا، ژمارە، (١١ – ١٢)ی ٢٠٠٧، لا٣٨.

٤٠. چاوپێکەوتن لەگەڵ تەحسین حەمە غەریب، خۆکوشتن چوونەوە بۆ عەدەم یان قوتار بوون لێی، سازدانی: زانا ئیبراهیم، گۆڤاری هەژان، ٤ – ٢٠ سلێمانی، لا ١٧٢ – ١٧٣.

٤١. د. ئەفرام محەممەد حەسەن، سەرچاوەی پێشوو، لا٢٥٨.

٤٢. د. کەریم کەریم شەریف قەرەچەتانی، سەرچاوەی پێشوو لا٣٢٦.

٤٣. ئەحمەد عەیاش، سەرچاوەی پێشوو، لا١٦٥ - ١٦٦.

٤٤. هەمان سەرچاوە، لا٢١٥.

٤٥. جونێل شارۆن، دە پرسیار لە روانگەی کۆمەڵناسیەوە، و. هەورامان فەریق، چاپی یەکەم ٢٠٠٩، چاپخانەی خانی، هەولێر لا٣٠٣.

٤٦. مەلا ئەحمەدی قامیشی، سەرچاوەی پێشوو، لا١٢.

٤٧. ڤیان دزەیی، خۆسوتاندن – تێڕوانین و چارەسەر، چاپی یەکەم ٢٠٠٨، لە چاپکراوەکانی ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستان، هەولێر، لا٢٣.

٤٨. د. ئەفرام محەممەد حەسەن، سەرچاوەی پێشوو، لا٢٥٨.

٤٩. ڤیان دزەیی، سەرچاوەی پێشوو، لا٢٣.

٥٠. ئەحمەد عەیاش، سەرچاوەی پێشوو، ١٥٢.

٥١. د. کەریم کەریم شەریف قەرەچەتانی، سەرچاوەی پێشوو لا٣١٧.

٥٢. د. ئەفرام محەممەد حەسەن، سەرچاوەی پێشوو، لا٢٥٥.

٥٣. د. کەریم کەریم شەریف قەرەچەتانی، سەرچاوەی پێشوو لا٣١٧.

٥٤. هەمان سەرچاوە، لا٣١٨.

٥٥. عیزەدین ئەحمەد عەزیز، سەرچاوەی پێشوو لا٢٢١.

٥٦. حەمەی ئەحمەد رەسول، بۆ گەنجان خۆکوژی ئەنجامدەدەن، گۆڤاری سایکۆلۆژیا، ژمارە (١٨)ی ٢٠١٠ دهۆك، لا٣٩.

٥٧. د. ئەفرام محەممەد حەسەن، سەرچاوەی پێشوو، لا٢٥٦.

٥٨. سۆزان جەمال، سەرچاوەی پێشوو. لا١١٢.

٥٩. د. کەریم کەریم شەریف قەرەچەتانی، سەرچاوەی پێشوو لا٣١٨.

٦٠. ڤیان دزەیی، سەرچاوەی پێشوو، لا٢١.

٦١. د. کەریم کەریم شەریف قەرەچەتانی، سەرچاوەی پێشوو لا٣٢٠.

٦٢. ئاوات ئەحمەد، سوتان هۆکار و دەرئەنجامە ترسناکەکانی، رێکخراوی ئاسوودە، ٢٠٠٣، لا٢٢.

٦٣. ئەحمەد عەیاش، سەرچاوەی پێشوو، ١٤١.

٦٤. ڤیان دزەیی، سەرچاوەی پێشوو، لا٢٠.

٦٥. عیزەدین ئەحمەد عەزیز، سەرچاوەی پێشوو لا٢٢٣.

٦٦. د. ئەفرام محەممەد حەسەن، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٥٤.
٦٧. ڤیان دزەیی، سەرچاوەی پێشوو، ل٣٢.
٦٨. د. ئەفرام محەممەد حەسەن، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٥٤.
٦٩. ئەحمەد عەیاش، سەرچاوەی پێشوو، ١٤٠.
٧٠. عیزەدین ئەحمەد عەزیز، سەرچاوەی پێشوو ل٢٢٣.
٧١. سۆزان جەمال، سەرچاوەی پێشوو. ل١٢٢.
٧٢. د. کەریم کەریم شەریف قەرەچەتانی، سەرچاوەی پێشوو ل٣٢١.
٧٣. ئەحمەد عەیاش، سەرچاوەی پێشوو، ١٤٢.
٧٤. عادل باخەوان، ئایین چییە؟ دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی ٢٠٠٨،ل
٧٥. ئازاد خدر، دۆرکهایم و هزری کۆلاکتیڤ، تەوئەمیزم، سۆسیۆلۆژیای خۆکوشتن، گۆڤاری سەنتەری برایەتی، ژمارە (٢٦)ی ساڵی ٢٠٠٢، سلێمانی، ل٢٤٩.
٧٦. ئاسۆ محەممەد ئەمین، دۆرکهایم و راڤەکردنێکی کۆمەڵایەتییانە بۆ خوکوژی، گۆڤاری کۆچ، ژمارە (١١ – ١٢) ی ساڵی ٢٠٠٩، ل٩٧.
John J. macionis and kenplummer, sociology, third edition 2005, p93.77.
٧٨. مەنوچێهر موحسنی، کۆمەڵناسی، و. موسڵح شێروانی، بەرگی یەکەم، چاپی دووەم، ٢٠٠٧ کوردستان، ل١٦٤.
٧٩. لئویس کوزر، زندەگی و اندیشە بزرگان جامعە شناسی، ترجمە، محسن تلاشی، چاپ شانزدەهم ١٣٨٩، خیابان انقلاب، ص١٩٣.
٨٠. دانا مەلا حەسەن، خۆکوشتن – تێڕامانێکی سۆسیۆسایکۆلۆژی، گۆڤاری سۆسیۆلۆژیا، ژمارە (١) ٢٠٠٥ سلێمانی ل٧٤.
٨١. مەنوچێهر موحسنی، سەرچاوەی پێشوو. ل١٦٤.
٨٢. ئیم دیلینی، نظریەهای کلاسیك جامعە شناسی، ترجمە، بهرنگ صدیقی، وحید مللوعی، چاپ چهارم، ١٣٨٩ تهران، ص ١٥٠ – ١٥١.
٨٣. دانا مەلا حەسەن، سەرچاوەی پێشوو. ل٧٥.
٨٤. لویس کوزەر، دۆرکهایم ژیان و ئەندێشەی، و. محەممەد قادر، چاپی یەکەم ٢٠٠٨ سلێمانی، ل١٢٠.
٨٥. ئاسۆ محەممەد ئەمین، سەرچاوەی پێشوو. ل١٢.
٨٦. ئازاد خدر، سەرچاوەی پێشوو. ل٢٥٩.
٨٧. ئیم دیلینی، سەرچاوەی پێشوو. ل١٥١.
٨٨. ئاسۆ محەممەد ئەمین، سەرچاوەی پێشوو. ل١٢.
٨٩. دانا مەلا حەسەن، سەرچاوەی پێشوو. ل٧٥.
٩٠. د. کەریم کەریم شەریف قەرەچەتانی، سەرچاوەی پێشوو ل١٩١.
٩١. ئەحمەد عەیاش، سەرچاوەی پێشوو، ل١٩١.
٩٢. د. قیس الغوری، و د. عبدالمنعیم الحسني، النظریات الاجتماعیة، الطبعة الاولی ١٩٨٣. بغداد، ص١١٥.
٩٣. ئازاد خدر، سەرچاوەی پێشوو. ل٢٥٨.

94. Richard T. shshefer, sociology, ninth edition, 2007, p.12.

٩٥. ئەحمەد عەیاش، سەرچاوەی پێشوو، لا١٩٢.

٩٦. ئاسۆ محەممەد ئەمین، سەرچاوەی پێشوو. لا١٤.

٩٧. دانا مەلا حەسەن، سەرچاوەی پێشوو. لا٧٢.

٩٨. ئەحمەد عەیاش، سەرچاوەی پێشوو، لا١٩٣.

٩٩. د. کەریم کەریم شەریف قەرەچەتانی، سەرچاوەی پێشوو لا٣١٣.

١٠٠. سۆزان جەمال، سەرچاوەی پێشوو. لا٩٩.

١٠١. د. کەریم کەریم شەریف قەرەچەتانی، سەرچاوەی پێشوو لا٣١٣.

١٠٢. عیزەدین ئەحمەد عەزیز، سەرچاوەی پێشوو لا٢٢٢.

١٠٣. د. کەریم کەریم شەریف قەرەچەتانی، سەرچاوەی پێشوو لا٣١٣.

١٠٤. د. ئەفرام محەممەد حەسەن، سەرچاوەی پێشوو، لا٢٦٠.

١٠٥. د. کەریم کەریم شەریف قەرەچەتانی، سەرچاوەی پێشوو لا٣١٢.

١٠٦. د. ئەفرام محەممەد حەسەن، سەرچاوەی پێشوو، لا٢٦١.

١٠٧. عیزەدین ئەحمەد عەزیز، سەرچاوەی پێشوو، لا٢٢٣.

١٠٨. د. کەریم کەریم شەریف قەرەچەتانی، سەرچاوەی پێشوو، لا٣٣١.

١٠٩. ڤیان دزەیی، سەرچاوەی پێشوو، لا٣٧.

١١٠. حەمەی ئەحمەد رەسول، سەرچاوەی پێشوو، لا٤٠.

١١١. د. ئەفرام محەممەد حەسەن، سەرچاوەی پێشوو، لا٢٦٠.

١١٢. د. کەریم کەریم شەریف قەرەچەتانی، سەرچاوەی پێشوو، لا٣٣٢.

١١٣. د. ئەفرام محەممەد حەسەن، سەرچاوەی پێشوو، لا٢٦٠.

١١٤. د. کەریم کەریم شەریف قەرەچەتانی، سەرچاوەی پێشوو لا٣٣١.

١١٥. حەمەی ئەحمەد رەسول، سەرچاوەی پێشوو، لا٤٠.

سەرچاوەکان:

١. د. کەریم شەریف قەرەچەتانی، نەخۆشی و گرفتە دەروونی و کۆمەڵایەتییەکان، چاپی دووەم، ٢٠١٠ سلێمانی، چاپخانەی پەیوەند.

٢. زیرەك عەبدوڵلا، کۆمەڵگە و شێواوی، چاپی یەکەم، بەبێ شوێنی چاپ، کوردستان ٢٠٠٦.

٣. سۆزان جەمال، سایکۆلۆژی و مێیەتی، چاپی یەکەم ٢٠٠٩، چاپخانەی خانی (دهۆك).

٤. عیزەدین ئەحمەد عەزیز، بنەماکانی دەروونناسی گشتی، چاپی دووەم ٢٠١١، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی رۆژهەلات، هەولێر.

٥. هێرۆ جەمیل، کۆمەڵناسی و دیاردە کۆمەڵایەتییەکان، چاپی یەکەم ٢٠٠٨، هەولێر، بەبێ دەزگای چاپ.

٦. د. افرام محمد حسن، نەخۆشییە دەروونییەکان، چاپی یەکەم ٢٠٠٩، چاپخانەی نشر احسان، تهران.

٧. د. ئەحمەد عەیاش، خۆکوشتن، و. سۆزان جەمال، چاپی یەکەم ٢٠١١، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی.

٨. جونێل شارۆن، ده پرسیار له روانگەی کۆمەڵناسییەوە، و. هەورامان فەریق، چاپی یەکەم ٢٠٠٩، چاپخانەی خانی، هەولێر.

٩. ڤیان دزەیی، خۆسوتاندن – تێروانین و چارەسەر، چاپی یەکەم ٢٠٠٨، له چاپکراوەکانی ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستان، هەولێر.

١٠. عادل باخەوان، ئایین چییە؟ دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی ٢٠٠٨.

١١. ئاوات ئەحمەد، سوتان هۆکار و دەرئەنجامە ترسناکەکانی، رێکخراوی ئاسوودە، ٢٠٠٣.

١٢. مەنوچێهر موحسنی، کۆمەڵناسی، و. موسڵح شێروانی، بەرگی یەکەم، چاپی دووەم، ٢٠٠٧ کوردستان.

١٣. لویس کوزەر، دۆرکهایم ژیان و ئەندێشەی، و. محەمەد قادر، چاپی یەکەم ٢٠٠٨ سلێمانی.

**سەرچاوە ئینگلیزیەکان:**

١.John J. Macionis and Kenplummer, sociology, third edition 2005, p93.

2.Richard T. shshefer, sociology, ninth edition, 2007, p.12.

سەرچاوەی فارسی

٣. لئویس کوزر، زندەگی و اندیشە بزرگان جامعە شناسی، ترجمە، محسن تلاشی، چاپ شانز دەهم ١٣٨٩، خیابان انقلاب.

٤. ئیم دیلینی، نظریةهای کلاسیك جامعە شناسی، ترجمە، بهرنگ صدیقی، وحید طلوعی، چاپ چهارم، ١٣٨٩ تهران.

**سەرچاوەی عەرەبی:**

١. د. قیس الغوری، و د. عبدالمنعیم الحسني، النظریات الاجتماعیة، الطبعة الاولی ١٩٨٣. بغداد.

**گۆڤارەکان:**

١. ئیبراهیم حاجی زەڵمی، کوشتن لەسەر شەرەف، گۆڤاری سۆسۆلۆژیا، ژمارە (٤، ٥)، سلێمانی ٢٠٠٦.

٢. ئەمیل دۆرکهایم، دیاردەی کۆمەڵایەتی چییە؟ و. د. محەمەد شوانی، گۆڤاری کۆمەڵناسی، ژمارە (٧)، ٢٠١١.

٣. عەتا نەهایی، خۆکوژی ژنان و رازی هەڵبژاردنی ئاگر، گۆڤاریلا رەهەند، ژمارە (١٦، ١٧)، ٢٠٠٤.

٤. مەلا ئەحمەدی قامیشی، خۆکوشتن نیشانەی بێدەستەڵاتی و دۆڕانە، گۆڤاری خێزان، ژمارە (٥٧)ی ٢٠١١ سلێمانی.

٥. تۆماس زاس، خۆکوژی وەك کێشەیەکی ئەخلاقی، و. شاسوار کەمال مەحمود، گۆڤاری ئایدیا، ژمارە، (١١ - ١٢)ی ٢٠٠٧.

٦. چاوپێکەوتن لەگەڵ تەحسین حەمە غەریب، خۆکوشتن چوونەوە بۆ عەدەم یان قوتاربوون لێی، سازدانی: زانا ئیبراهیم، گۆڤاری هەژان، ٤ - ٢٠ سلێمانی.

٧. حەمەی ئەحمەد رەسول، بۆ گەنجان خۆکوژی ئەنجامدەدەن، گۆڤاری سایکۆلۆژیا، ژمارە (١٨)ی ٢٠١٠ دهۆك.

٨. ئازاد خدر، دۆرکهایم، هزری کۆلاکتیڤ، تەوتەمیزم، سۆسیۆلۆژیای خۆکوشتن، گۆڤاری سەنتەری برایەتی، ژمارە (٢٦)ی ساڵی ٢٠٠٢، سلێمانی.

٩. ئاسۆ محەمەد ئەمین، دۆرکهایم و راڤەکردنێکی کۆمەڵایەتییانە بۆ خوکوژی، گۆڤاری کۆچ، ژمارە (١١ - ١٢) ی ساڵی ٢٠٠٩.

١٠. دانا مەلا حەسەن، خۆکوشتن - تێرامانێکی سۆسیۆسایکۆلۆژی، گۆڤاری سۆسیۆلۆژیا، ژمارە (١)، ٢٠٠٥ سلێمانی.

* رێکخراوی هارتلاند ئەلایەنس، بۆ پێداویستی مرۆیی و مافی مرۆڤ، راپۆرتێك لەبارەی تێگەیشتن و ریگرتن له خۆکوشتن، به هاوکاری کۆمەڵەی کۆمەڵناسان و دەروونناسانی کوردستان، سلێمانی ٢٠٠٩.

# سوپا و سیاسەت

د. حسێن بەشیریە
و. لە فارسییەوە: حەسەن حسێن

**پێشوتار**

لێکۆڵینەوە لە پەیوەندی سوپا لەگەڵ کۆمەڵگە، گروپ و بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکان لەلایەکەوە و لەگەڵ دەزگای دەسەلاتی سیاسی لەلاکەیدیکەوە، لە روانگەی کۆمەڵناسی سیاسییەوە جێیبایەخە. بەدەربڕینێکیدیکە ئەوەی لە روانگەی کۆمەڵناسیی سیاسییەوە گرنگە ئەو رۆڵەیە کە سوپا وەك نێوانکارێك لەنێوان چین و گروپە کۆمەڵایەتییەکانەوە لەلایەك و حکومەت لەلایەکیدیکەوە دەیبینێ.

بەشێوەیەکی ئاسایی سوپا بەپێی یاسا، وەك ئامرازێکی جێبەجێکردنی دەسەلات و توندوتیژیی دەوڵەت، بەرپرسیارێتی سیاسیی ناکەوێتەسەرشان، بەلام لەکردەوەدا و بەگەلێك بەڵگە دەشێت بەشێوەی جۆراوجۆر و راستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆ بەرپرسیاربێت لە بەکارهێنانی دەسەلاتی سیاسیدا. بێگومان شێوە و سەنگی هەژموون یا دەستوەردانی سوپا لە رژێمە سیاسییەکاندا (زۆردار، توتالیتار و دیموکراسی پەرلەمانی) دەگۆڕێت. لە ولاتانی کۆمۆنیستی سەدەی بیستدا ئەفسەرە بالاکانی سوپا لە پارتی دەسەلاتدار بەشداربوون و لەلایەکیدیکەشەوە رێکخراوە حیزبییەکانیش لەنێو سوپادا چالاکبوون. لە دەوڵەتە دیموکراسییەکاندا لەگەڵ ئەوەشدا سوپا دەستوەرناداتە دەسەلات، بەلام سوپاکان بەبەشێك لە گروپەکانی فشار دەژمێردرێن. بۆ نموونە لە ئەمریکا هەندێك پیشەی نەتەوەیی کە سوود لە گرێبەستە سەربازییەکان وەردەگرن، هەمیشە پەیوەندییەکی تایبەتییان لەگەڵ سوپادا هەیە.

لە ولاتانی گەشەسێندا دەستوەردانی راستەوخۆی سوپا لەسیاسەتدا ئاشکراترە. هۆکارێکی ئەم دەستوەردانە ئەو رۆڵە دیارەیە کە زۆرینەی سوپاکان لە خەباتی دژی داگیرکاری لەم ولاتانەدا گێڕاویانە.

بەمپێیە هەر لە دەستپێکی سەربەخۆییەوە، سوپا وەك پاسەوانی سەربەخۆیی و پارێزەری شوناسی نەتەوەیی دەرکەوتووە. بەهەرحاڵ پرسیاری گرنگ لە روانگەی کۆمەڵناسی سیاسییەوە هەرتەنها دەستێوەردانی سوپا لەسیاسەتدا نییە، بەڵکو ئەوەیە کە ئەو دەستوەردانە لە بەرژەوەندی چ گروپێکی کۆمەڵایەتیدایە. دەستوەردانی سوپا لەسیاسەتدا بەتایبەت بەشێوەی کودێتای سەربازی بەزۆری بەجۆرێك لەجۆرەکان پەیوەندی بە بەرژەوەندی گروپە کۆمەڵایەتییەکانەوە هەیە.

لەولاتێکدا کە لە بنەڕەتەوە دەسەلاتی سیاسی لە دەستی خانەدانانی خاوەنزەویوزاردا بێت، دەشێت کودێتا نیشانەی ناکۆکی نێوخۆیی چینی دەسەلاتدار بێت. لەلایەکیدیکەوە دەشێت لەگەڵ گەشەی چینی ناوەڕاستدا، ئەفسەرانی سوپا وەك نوێنەری بەرژەوەندی ئەو چینە دەسەلات بگرنەدەست و رووەو بەدیهێنانی ئەو بەرژەوەندییانە دەستبدەنە ئاڵوگۆڕ.

بەمپێیە پێویستە بووترێت کە چەمکی حکومەتی سەربازیی بەتەنها چەمکێکی کۆمەڵناسی نییە. دەشێت حکومەتە سەربازییەکان لەڕووی پێگەی کۆمەڵایەتی و مەیلە چینایەتییەکانیانەوە زۆر و جۆراوجۆربن. هەر لەمڕووەوەیە بابەتی سەرەکی کۆمەڵناسی سیاسیی حکومەتە سەربازییەکان توێژینەوەیە لە پەیوەندی تایبەت، گروپی و ئیدۆلۆژی نێوان سوپا و چینە کۆمەڵایەتییەکان. بەمپێیە باسی دەستوەردانی سوپا لە سیاسەتدا لە روانگەی کۆمەڵناسی سیاسییەوە بەرتەسکترە لەکۆی بابەتی دەستوەردانی هێزە چەکدارەکان لە ژیانی سیاسییدا.

## پێشینەی مێژوویی سوپا

یەکەمین ئیشکالییەتی سوپا لە کۆمەڵگە کشتوکاڵییە سەرەتاییەکانەوە دەرکەوت کە لەگەڵ کۆمەڵگاکانی دەوروبەری خۆیاندا دەکەوتنە ململانێیەوە. هەموو ئیمپراتۆریا کۆنەکان دامەزراوەی سەربازیی تایبەتیان هەبوو، لەو قۆناغانەدا سوپاکان وابەستەی خانەدانە خاوەنزەویوزارەکان بوون. لەگەڵ فراوانبوونەوەی شارەکاندا تایبەتمەندێتی سوپا بۆ بەرگریکردن لە شارەکان لەبەرامبەر هێرشی دەرەکیدا حاشاهەڵنەگربوو. سەردەمانی کۆن لە زۆربەی ولاتاندا بۆ پێکهێنانی سوپای بەکرێگیراو سوودیان لە میللەتە ژێردەستەکان وەردەگرت. لە ئەورووپای سەدەکانی ناوەڕاستدا دەوڵەتە بچووکە هەرێمییەکان سوپای بچووك و پەرشوبلاویان پێکهێنا. لەوسەردەمانەدا پاشاکان لەجیاتی دانی پارەوپول پتر زەویان بە سەربازان دەبەخشی. ئا

لەمڕووەوە خۆیان کۆڵەکەی وەرچەرخانبوون بۆ پێکهاتنی چینی دەرەبەگ. خانەدانی خاوەنزەوی لە ئەوروپا ریشەیەکی سەربازیشی هەبوو. لە سەدەکانی ناوەڕاستدا خانەدانی چەکدار هێزی سەرەکی بەرگریکردنبوون لە شارەکان. پەرشوبلاّوی سوپا تایبەتییەکان لە چاخی دەرەبەگیدا، رێگربوو لەبەردەم پێکهاتنی رێکخراوێکی یەکپارچە و گردوکۆدا. تەنانەت لە شەڕی کریستیانەکاندا ( ئەوەی موسڵمانان بە شەڕی خاچپەرستەکان ناویدەبەن. و.ك) رێکخستن و یەکێتی پێویستیان نەبوو. لە کۆتایی سەدەکانی ناوەڕاستدا و لەگەڵ پەیدابوونی دەوڵەتە رەهاکان، پاشاکان کەوتنەلاوازکردنی خانەدانە چەکدارەکان و سەرنجڕاکێشانی چینی بازرگانانی شار. بێگومان دامەزراوە سەربازییەکانی حکومەتە رەهاکان چاکتربوون لە لەشکرە بچووك و تایبەتییەکانی خانەدانان. لەگەڵ بەرهەمهێنانی چەکی نوێ لەنێوان ساڵانی ١٥٥٠ ـــ ١٦٥٠ لەشکری دەوڵەتی رەهای پاشاکان شێواز و هێزێکی تازەی هەبوو. هەر لەوقۆناغەدا بوو کە جلوبەرگ، کەلوپەل و دیسپلیینی سەربازیی ستاندارد سەریانهەڵدا. زنجیرەی پلەوپایەکان، دامەزراندن، پلە و نیشانەی تایبەتیش لەسوپادا دەرکەوتن. سوپای پاشای پروس دیارترین نموونەی سوپای مۆدێرن بوو کە لەماوەی سەدەی هەژدەهەم لەلایەن فرەدریکی دووەم، بە بناغە و مۆدێرنێتییەکی تەواوەوە، دامەزرا. سوپا لە بروسیا وەك (قوتابخانەی گشت میللەت) ناودەبرا.

سوپای حکومەتە رەهاکان یەکەمین سوپای پرۆفیشناڵی مۆدێرن بوون. لەگەڵ ئەوەشدا سوپاکان تاڕادەیەك داخراوبوون، چونکە تەنها خانەدان و کەسە نزیکەکانی پاشا دەیانتوانی بگەنە پلەی باڵای سەربازیی. ئەفسەرانی سوپای حکومەتە رەهاکان لە خەراج بەخشرابوون، چونکە دەووترا ئەوان خەراجی خۆیان بە خوێن دەدەن. هێشتاش لوتف و تووڕەیی پاشاکان لە بەرزکردنەوەی پلە یان داگرتنیان کاریگەریی هەبوو. بەوجۆرە سوپای حکومەتە رەهاکان لەڕووی رێکخراوەییەوە سوپای سیستمی باوکسالاری یا بەرەبابیی( پاتریمونیال) بوون.

هەر لەو سەردەمانەدا کڕین و فرۆشتنی پلەوپایەی سەربازییش برەویهەبوو، ئەوەش ببووە هۆی زیادبوونی بێبنەمای ئەفسەر. بۆ نموونە سوپای فەرەنسا لە ساڵی ١٧٨٧دا ٣٦ هەزار ئەفسەری هەبوو کە تەنها ١٣ هەزاریان بەکردەوە لە سوپادا خزمەتیاندەکرد. بەمجۆرە ماشینێکی سەربازیی تاڕادەیەك گەورە لە دەوڵەتە رەهاکاندا پەیدابوو. لە سەردەمی لویسی چواردەدا، فەرەنسا خاوەنی گەورەترین سوپای مۆدیرنی راهێنراوبوو و نزیکەی ٤٠٠ هەزار سەربازی هەبوو، ( ژمارەی دانیشتوانی فەرەنسا لەو سەردەمەدا ٢٣ ملیۆن کەس بوو). هەر لەوسەردەمانەدا

بەریتانیا توێژێکی بچووکتری سوپای هەبوو کە لەژێر چاودێری پەرلەماندا بوو. نەریتی کڕین و فرۆشتنی پلەوپایەی سەربازی لەو وڵاتەدا تا ساڵی ١٨٧١ بەردەوامبوو. لە پروسیا ئەفسەرانی سوپا بەگشتی لە چینی خانەدانی خاوەنزەوی (یونکەرەکان) بوون. لە ساڵی ١٧٩١، سەرجەم ئەفسەرە باڵاکانی سوپای ئەو وڵاتە سەربە ٥١٨ خێزانی ئەشرافی خاوەنزەوی بوون. ساڵی ١٨٠٦ لەکۆی نزیکەی ٨٠٠٠ ئەفسەری پروسی تەنها ٧٠٠ کەسیان لە خانەدانی خاوەنزەوی بوون. سوپای پیشەیی نەتەوەیی بە مانای مۆدێرن لەگەڵ سەرهەڵدانی سیستمی کار (وەزیفەکان) تەنها لە سەدەی ١٩دا پەیدابوو. شەڕی ساڵانی ١٨٧٠ تا ٧١ لەنێوان ئەڵمانیا و فەرەنسادا بەهەموو پێوانەیەك شەڕی سوپا نەتەوەییەکان بوو.

پێشینە و سەرەتای پێکهێنانی سوپای نەتەوەیی دەگەڕێتەوە بۆ شەڕی سەربەخۆیی ئەمریکا لە ساڵانی ١٧٧٥ ـــ ١٧٨٣و شەڕە شۆڕشگێرانەکان و جەنگەکانی ناپلیۆنیش لە فەڕەنسا. ساڵی ١٧٩٣ بە دانانی یاسای سیستمی کاری گشتی لە فەڕەنسا levee en (masse)، تۆوی پێکهاتنی دانرا. سوپای نەتەوەییش بە مانا مۆدیرنەکەی لە شۆڕشی فەڕەنسادا و لەلایەن (لازارکارنۆ)وە داهێنرا. بنەمای رژێمی کاری گشتی پەیوەندی نێوان سوپا و گەلی بەهێزکرد. لە ساڵانی سەرەتای شۆڕشدا سەربازان ئەفسەرانی خۆیان هەڵدەبژارد. بەپێی دەستووری ساڵی ١٧٩٣ هەموو فەڕەنساییەك بە سەربازی گەل دەژمێردرا. بەوەشەوە ٧٠٪ ئەفسەرانی سوپای فەڕەنسا لە چینی خانەدانەکانی ئەو وڵاتەوە هاتبوون. هەرچۆنێك بێت سوپای نوێی گەل پێکهاتەیەك بوو لە سوپای مەشقپێکراو و سیستمی وەزیفە. گرنگترین ریفۆرمی سەربازیی لە سەدەی نۆزدەدا لە پروس روویدا. ساڵی ١٨١٠ ئەکادیمیای سەربازیی (کریگ) لە بەرلین دامەزرا. بەدیهێنانی ناوەندێکی هاوبەشی سوپا لە ساڵی ١٨٦٠ داهێنانێکی دەوڵەتی پروسی بوو. مۆدیلی سوپای پروسی نموونەیەکیدیکەی وڵاتانی ئەوروپایی بوو کە دواتر لەسەر ئاستی جیهاندا سوودیلێبینرا. تەنانەت فەڕەنسا لەدوای شکستی ١٨٧١ چاوی لە سوپای پرۆسی کرد. دوای ئەوساڵە گشت وڵاتانی ئەوروپا خزمەتی سەربازییان لەنێو میللەتدا کردە ئیلزامی. پێشبڕکێی چەك لە دەورانی ئاشتی ساڵانی ١٨٧٠ ـــ ١٩١٤ لەنێوان وڵاتانی ئەوروپاییدا، بایەخ و پێگەی سوپای نەتەوەیی زیادکرد. لەدوای ئەوەوە سوپا بە مانایەکی نوێوە خۆی گرت. لەماوەی سەدەی بیست وڵاتانی دەرەوەی ئەوروپاش دەستیاندایە پێکهێنانی سوپای نەتەوەیی و سیستمی ئەرکی سەربازی.(١)

له شارستانێتی ئیسلامیدا لەڕووی مێژووییەوە دەسەلأتی سەربازی و مەدەنی هەمیشە ئامێتەی یەکتریبوون. داگیرکردنی خاکی نەتەوەکانیدیکە ڕێگای باوی دامەزراندنی دەوڵەت بوو لەم شارستانێتییەدا کە ئەمەش بەهۆی سوپاوە ئەنجامدەدرا.

پێغەمبەری ئیسلام و خەلیفەکانی بە فەرماندەیی لەشکر و سوپا حسابدەکران. هەروەسا لەلای ئەمیرەکانی ولأتانی ئیسلامی باجی پاسەوانێتی سوپای بەکرێگیراو لە کۆنەوە لەئارادابووە لەڕاستیدا خودی خەلیفەکانی بەغداد پشتیان بە دەسەلأتی لەشکری بەکرێگیراو بەستبوو، تا ئەوجێیەی بەلای ئیمام محەمەد غەزالییەوە دەسەلأتی خەلیفە جگەلە ئەفسانەیەك هیچیدیکە نەبوو، بەڵگەشی دەهێنایەوە کە لە سەردەمی خۆیدا دەوڵەت تەنها بەرەنجامی هەبوونی دەسەلأتی سەربازییە. خەلیفە کەسێکە کە خاوەن شکۆکان و دەسەلأتی سەربازی دڵسۆزین.

لەلای ئیمپراتۆریای عوسمانیش کە دوا ئیمپراتۆریای ئیسلامی بوو، بەشی زۆری دەسەلأت لە دەستی (یەنیچرییەکان) یا گیانبەختکەرەکاندا بوو کە ناوکۆکەی سەرەکی سوپای ئیمپراتۆریاکەی پێکدەهێنا.

### میلیتاریزە بوونی کۆمەڵگە و سیاسەت

چەمکی میلیتاریزم لە مێژووی ململانێی حیزبی و سیاسیدا، بەتایبەت، لەلایەن پارت و ڕێکخراوە سۆسیال دیموکرات و چەپەکانەوە، وەك دروشمێکی سیاسی لەپێناو ناشیرینکردن و رەخنەگرتن لە هەڵوێستی هەندێك حکومەتی سەربازیی بەکارهێنراوە. بەشێوەیەکی سەرەکی میلیتاریزم بەدوو مانا بەکاردەبرێت، یەکێکیان پەرەسەندن و زاڵبوونی کەلتووری چەکداری و سەربازییە لەکۆمەڵدا و دووەم دەستوەردانی سوپایە لە سیاسەتدا. مەبەست لە میلیتاریزم لە مانای یەکەمدا بەشێوەیەکی گشتی بریتییەلە زاڵبوونی سوپا و شێوە ژیان و کەلتووری سەربازی لە ژیانی سیاسی و کۆمەلأیەتیدا. هەروەك بینیمان میلیتاریزم، لە رەوەندی پێکهاتنی ناسیونالیزم و دەوڵەتی نەتەوەیی مۆدیرندا، بەمانای تامەزرۆیی کۆمەڵگە بۆ ئامانجە سەربازییەکان دەرکەوت. پتر لە شێوە ژیان و فەرهەنگی سەربازیدا سیستم و دیسپلین و زنجیرە پلەوپایەکان، پەیوەندی دەسەلأت، ملکەچی و روانینی شەڕخوازانە جێیشانازییە و یا تەنانەت جەنگ لەڕووی ئەخلاقییەوە بە جێکەوتەکەر و بەدیهێنەری وزەی رۆحی و دەروونی مرۆڤ دەزانرێت. لەمڕووەوە بەزۆری میلیتاریزم بە مانای بەرژەنگ و نەخۆشی سیاسی ـــ کۆمەلأیەتی

بەکاردەبرێت و مەبەستلێی ئەوەیە کە سوپا سنووری پەیوەندییە شیاوەکان و کارە رەواکانی خۆی تێپەڕاندووە و واوەتر رۆیشتووە.

میلتاریزم، بەم مانایە، دەکرێت لە ئەنجامی زیادبوونی ململانێ سەربازییە نێونەتەوەییەکان و پێداویستی بە زیادکردنی بودجەی چاکسازی و نۆژەنکردنەوەی سوپا و زیادکردنی ژمارەی سەرباز لەلایەن حکومەتێکی مەدەنییەوە، بێتەئارا، هەروەك دەشێت هەژموون و دەسەلآتی سەرکردە و کۆمەڵە سەربازییەکان لە سیاسەتی ناوخۆیی و دەرەوە بەشێوەیەکی راستەوخۆ زیادبکات و سەرەنجام میلیتاریزم پەرەبسێنێت. بە دەربڕینێکیدیکە (میلیتاریزمی) (مەدەنی یا نا چەکدار) لە ئەنجامی فراوانبوونی گیانی سەربازی و جەنگاوەریی لە کۆمەڵگا و دەوڵەت و نێوان خەڵکیدا پەیدادەبێت، لەکاتێکدا (میلیتاریزمی چەکداری) بەرەنجامی زاڵبوونی دەسەلآتی سوپایە لە حکومەتدا.

میلیتاریزم، لەباری زەمینەکانی پەیدابوونییەوە، لەبەردەوامبوونی تێڕوانینە باوەکان یا دیاردە باو و نەریتییەکانەوە سەرچاوەینەگرتووە تاکو بکرێت بەهۆی مۆدیرنیزەکردنی کۆمەڵگەوە خۆبەخۆ لەناوبچێت، بەڵکو سەرچاوەگرتووی هەلومەرجی مۆدیرنی ژیانی سیاسی و کۆمەلآتییە، بەتایبەت فاکتەرە سەرەکییەکەی، زیادبوونی بەکارهێنانی تەکنەلۆژیا لە کایەی چەکسازیدا کە هۆیەکە بۆ گەشەپێدانی دامەزراوەیی و تەکنیکیی سوپا.

سوپا مۆدیرنەکان هێزی کۆمەلآیەتی ـ سیاسی رێکخراو و هاوپەیوەندن، راستەوخۆ یا ناراستەوخۆ بە دامەزراوەی حکومییەوە بەستراونەتەوە. ئامانجی سەربازیی بەلای سوپاوە گرنگترین ئامانجە، لەکاتێکدا کۆمەڵگە ئەمجۆرە ئامانجانە قبوڵبکات ئەوا ئارەزووی میلیتاریستی هەموو ژیانی کۆمەڵگە دادەگرێت. لەمڕووەوە میلیتاریزم شتێکی زیاترە لە فراوانبوونەوەی چەندێتی تواناییەکانی سوپا و ئاماژە بۆ دۆخێك دەکات کە تێیدا لایەنە ئاساییەکانی ژیانی کۆمەلآیەتی "سەربازیی" دەبێت (کۆمەڵگە وەك سەربازگەیەکی لێدێت ـ و.کوردی). میلیتاریزم پەیوەندییەکی وای بەتایبەتمەندێتییەکانی سوپاوە نییە و پەیوەستیش نییە بە هەلومەرجی شەڕ و ئاشتییەوە. ئاکامی دروستی تایبەتمەندێتی سوپا بەشێوەیەکی پیشەیی، خۆی کۆسپێکی بەردەم پەیدابوونی میلیتاریزمە و بەربە فراوانبوونی گیانی جەنگاوەریی لە ژیانی مەدەنیدا دەگرێت. بەشێوەیەکی گشتی فراوانبوونی تەکنەلۆژیای مۆدێرنی سەربازیی، پەیدابوونی( کۆمەڵگەی سەربازی ـــ پیشەسازی)و (کەلتووری چەکداریی) بە زەمینەی فراوانبوونی میلیتاریزمی نوێ

دەژمێردرێت. سەرەنجام "سەرباز و جەنگاوەر لە دارشتنی سیاسەتگەلێکدا، بەشێوەیەکی زێدە ئاوقای سیاسەت دەبن کە دەسەڵات و ئەزموونی پێویستیان لەبارەوەنییە.(٢)

میلیتاریزم لەباری پێشینەی مێژووییەوە پتر بۆ نەریتی سوپای پرۆسیا و حەزی سەربازیی دەوڵەتی ئەڵمان، لە سەردەمی فرەدریکی گەورە و دوای ئەو، دەگەڕێتەوە. بسمارك بەشێوەی تایبەتی سەربازییانەی خۆی رایگەیاندبوو کە پرسە سەرەکییەکانی مێژوو گەی "خوێن و شمشێرەوە " چارەسەردەکرێن. ئەندێشەی بسمارك سیمای لێکهەڵپێکانی میلیتاریزم، ناسیونالیزم و کۆنزەرڤاتیزم بوو. لە سەردەمی ئەودا ژیانی کۆمەڵایەتی سیمای سەربازیی وەرگرت و بەشی زۆری بۆرژوازی ئەڵمانیا، بوونە هاودەمی شێوەکانی ژیانی سەربازیی. لە سەردەمی حکومەتی سەربازیی ولیامی دووەم سوپا دەسەڵاتی بەسەر پەرلەماندا هەبوو. هەڵایسانی جەنگە جیهانییەکان بەهۆی سیاسەتی فراوانخوازی و سەربازیی ئەڵمانیاوە، بەتایبەت لە جەنگی دووەمدا رەوتە میلیتاریستییەکانی بەهێزکرد، هەروەها سیاسەتی دەوڵەتی ژاپۆن لەماوەی دوو جەنگی جیهانیدا، وەك روخسارێکی گەورەیدیکەی میلیتاریزم ئەژمارکرا. هەژموونی سەرکردە سەربازییەکان لەنێو حکومەت و سیاسەتی ژاپۆندا لە ١٩٣٠ ـ ١٩٤٥ لە سەردەمی فاشیزمی ژاپۆنیدا هاوکاتبوو لەگەڵ بەهێزبوونی نەریتی سامۆرایی لەوڵاتدا. لەو سەردەمەدا سوپا ئیرادەی خۆی بەسەر هێز و پارتە سیاسییەکان و رایگشتیدا سەپاند و سیستمی پەرلەمانی لەناوبرد و بەکۆنترۆڵکردنی هۆکارەکانی پەیوەندیگرتن کەوتە پەیڕەویکردنی سیاسەتی "بەرهەڤکردنی ئەندێشەی گشتی". هەندێك وایانلێکداوەتەوە کە "مۆدیلی هزری میلیتاریستی" ئەڵمان و ژاپۆنییەکان فاکتەری گرنگی جەنگەکە بووە. بەهەمەوو ئەمانەوە سەربازیی نەبوونی ژیانی سیاسی لە دەوڵەتە هاوچەرخەکاندا، وەك ئەزمونێکی نوێ، بووەتەهۆی ئەوەی کە میلیتاریزم بەمانای دەستوەردانی راستەوخۆی سوپا لەسیاسەتدا بەشێوەیەکی هەڵاوێر سا وەربگیرێت و ئەگەرنا لەهەمەوو شوێنێك، لە ئیمپراتۆریا مەزنەکان و لە سەردەمی دەوڵەتە رەهاکاندا لەشکر و سوپا هەژموونی بەرچاویان بەسەر سەرکردە سیاسییەکاندا هەبووە. لەلایەکیدیکەوە بەجێگیربوونی سوپای مۆدێرن وەك رێکخراوەیەکی فراوان و رێکوپێك، ئەگەری میلیتاریزەبوونی کۆمەڵگا، کەلتوور و بەتایبەت حکومەت زیاتربووە. بۆ نموونە لە فەرەنسا لە سەردەمەکانی شۆڕش و شەڕە شۆڕشگێڕییەکاندا ئەم سوپایە وەك سیمای نەتەوە و کۆمەڵگەی فەرەنسی سەیردەکرا و تەنها وەك ئامرازێك لە دەستی دەوڵەتی شۆڕشگێڕدا ئەژمارنەکرا.

دەسەلاٰتی سوپا بەسەر ژیانی کۆمەلاٰیەتییەوە لەفەرەنسادا لە سەردەمی ناپلیۆن پۆناپارتدا گەیشتە ترۆپك. لە حکومەتی پۆناپارتیستی ناپلیۆنی سێیەمدا، سوپا گرنگترین هۆکاربوو بۆ بەدیهێنانی سیستمی ولاٰت و هاوپشتی کۆمەلاٰیەتی. پاشان بایەخی سوپا لە ژیانی سیاسی و کۆمەلاٰیەتیدا و میلیتاریزم بەشێوەیەکی گشتی، لە ئەنجامی روودانی شەرەگەورە و جیهانییەکانەوە زیادبوونێکی بەرچاوی بەخۆوەدیت. هەندێك بیرمەندی وەك (هارۆڵد لاسۆل) توتالیتاریزمی میلیتاریستی سەردەمی هەردوو جەنگەکەی بە( دەوڵەتی سەربازگەیی) ناوبردووە. (٣)

شەڕی سارد لەدوای جەنگی دووەمی جیهانەوە، رەوتی میلیتاریستی رژێمە سیاسییەکانی ولاٰتانی رۆژئاواو رۆژهەلاٰتی، توندترکرد. هەرچەندە نەریتی عەسکەرتارییەت زەمینەیەك بوو بۆ پەیدابوونی فاشیزم، بەلاٰم لەلایەکیدیکەوە فاشیزم خۆیشی نەریتی میلیتاریزمی بەهێزکرد. بزووتنەوە فاشیستییەکان سوودیان ورەسمی سەربازی وەرگرت و رێپێوان (بزووتنەوەی جەماوەریی)و زنجیرە پلەوپایەی نیمچە سەربازییان کردە شتێکی ئاسایی و ستایشی نەریتی سەربازی و جەنگیان کرد. گروپە چەکدارە فاشیستەکان و ئەو رێکخراوانەی بانگەشەیان بۆدەکردن لەگەڵ سوپادا زۆر لێکدەچوون. پەیوەندی نێوان پەیرەوان و سەرکردە لە پارتە فاشیستەکاندا جۆرە پەیوەندییەکی نیمچە سەربازیی بوو. بزاوتە فاشیستەکان لەگەڵ دامەزراوە سەربازییەکانیشدا پەیوەندییان هەبوو. بە بەهێزبوونی بزافە فاشیستەکان رۆڵی باوی سوپاکان تارادەیەك لاوازبوو و ناچاربوون لەگەڵ ئەو بزووتنەوانەدا پەیوەندی نزیك دروستبکەن. جگەلەوەش دوای جەنگی یەکەمی جیهان لەگەڵ کەمبوونەوەی ژمارەی سەربازانی سوپادا زۆرێك لە ئەفسەرانی پێشوو چووبوونە نێو دامەزراوە سەربازی و نیمچە سەربازییەکانی گروپە راستڕەوەکانەوە. بەهەرحاڵ هێزە سەربازی و ئەفسەرەکانی کە دوای جەنگ دووچاری شکستی جۆراوجۆر ببوونەوە پەیوەندییەکی گەرمیان لەگەڵ بزاوتی فاشیستیدا هەبوو. جەختکردنەوەی بزووتنەوەی فاشیزمیش لەسەر چاکێتی گروپە سەربازییەکان و ئەو بەرگریکردنەش کە لەنێو ئەنجومەن و یانە سەربازییەکان لە ئەڵمانیاو ئیتاڵیا لە فاشیزم دەکرا، نیشاندەری ئەو پەیوەندییەیە. دەوڵەتە فاشییەکان بۆ پتەوکردنی یەکگرتنی کۆمەڵگە لەبەرامبەر نەیاریی هێزە سیاسییەکان سوودیان لە پەیڕەوگەلێکی ناوەرۆك سەربازیی وەك ( جەنگی هەمەلایەنە) ( لەشکری جەماوەر)، وەك بەشێك لە ئایدۆلۆژیای خۆیان، وەردەگرت*.




سەبارەت بە ئیسپانیا بەشێکی سوپا بە سەرکردایەتی فرانکۆ بەکردەوە دەسەڵاتیان بەدەستەوەبوو. ژەنراڵ فرانکۆ، بەپشتبەستن بە سوپا، پارتی فاشی ( فالانژ) ی کردە پاشکۆ و گوێلەمستی خۆی. فاشییەکان لەهەر شوێنێك بن بە پشتیوانی شاراوەی هێزەکانی سوپا گەیشتنەدەسەڵات. پاشان دەوڵەتە فاشییەکان بۆ سیاسەتی فراوانخوازی خۆیان سوودیان لە سوپا وەرگرت. لەهەرجێیەك ناکۆکییەك کەوتبێتە نێوان رێکخراوە نیمچە چەکدارییە فاشییەکان و سوپاوە، ئەوا ناکۆکییەکە بە قازانجی سوپا شکاوەتەوە. هەڵبەتە لەلایەکیدیکەوە، پاکتاوکردنی سوپا و دەسەڵاتی پۆلیسی نهێنی بەسەر یەکەکانی سوپاوە سەربەخۆیی کارکردنی ئەفسەرانی سوپای لەناوبرد. لە ئەڵمانیا ئەفسەرانی سوپا لە شۆڕشی بێئاکامی ٢٠ حوزەیرانی ١٩٤٤ نارەزاییان دەربڕی. هیتلەریش لەکاردانەوەیدا بەرامبەر ئەو نارەزایەتییە پڕوپاگەندە و ڕێنوێنی سیاسی لەنێو سوپادا توندکردەوە.

جەنگە جیهانییەکان، لە وڵاتانی دیموکراسیشدا، بووە هۆی بەهێزکردنی هەژموونی سوپا لەنێو سیاسەت و کۆمەڵگەدا. رۆزفلیت سەرۆکی ئەمریکا دەستی لە سەرکردایەتی گشتیی هێزە چەکدارەکان کێشایەوە و لەبەرامبەردا پێگەیەکی بەهێزی بۆ ناوەندی هاوبەشی سەرکردە سەربازییەکان دانا. بەتایبەت سوپا لە سیاسەتی دەرەکیدا هەژموونێکی سەرووئاسایی بەدەستهێنا. بەپێچەوانەوە چەرچڵ لە بەریتانیا بەپێی رابردووی سەربازیی خۆی توانی هەژموونی دەسەڵاتی دامەزراوەی سیاسی بەسەر سوپاوە وەك خۆی بپارێزێت. دوای جەنگ، لە ئەمریکا سەرۆك ترومان تێکۆشا سوود لە دەسەڵاتی سوپا کە بەهۆی شەڕی ساردەوە روولەزیادبوون، وەربگرێت.

لەئەنجامدا ژمارەیەکی بەرچاوی ئەفسەران لە پلەی سیاسیدا دامەزران. هەڵبەتە یاسای ئاسایشی نەتەوەیی ساڵی ١٩٤٧رۆڵی ناوەندی هاوبەشی سوپای بەتەواوی بەکاروباری سەربازییەوە بەرتەسککردەوە. لە سەردەمی ئایزنهاوەردا دەسەڵاتی سوپا بەسەر دامەزراوەی سیاسیدا کەمکرایەوە. هێشتاش کۆنگریس، تارادەیەك بەکۆ، پشتیوانی لە خواستەکانی سوپا

دەکرد. سەرەڕای ئەوەش دوای جەنگ کارکردنی گەلێك ئەفسەری سوپا لە پلەوپایەی پیشەسازیی و بازرگانیدا، پەیوەندی نێوان گروپە سەربازی و پیشەییەکانی بەهێزکرد. پیشەگەلی وەك پیشەسازی فڕۆکە، گرێبەستی دارایی زۆر و زەبەندیان لەگەڵ سوپادا ئەنجامدا. هەربە و هۆیانەوە لە ئەمریکا چەندینجار ئەفسەرانی سوپا دوای خانەنشینبوونیان وەك پاداشت چوونە نێو بواری پیشەسازیگەلێکەوە کەپێشتر لە ئەنجامدانی گرێبەستدا، بەشیان لە خزمەتگوزارییەکانیان هەبوو.

سوپا لە زۆربەی ولآتانی گەشەسێندا، لەبەر لاوازی چینە کۆمەلآیەتییەکان و هێزەکانی کۆمەڵی مەدەنی و پارتە سیاسییەکان، رۆڵی بەرچاوی هەبووە. لەرزۆکی پێکهاتەی دەوڵەت، دەستوور و رەوایی (شەرعییەت) لەو ولآتانەدا پاڵنەرێکی گرنگی بۆ دەستوەردانی سوپا لەسیاسەتدا فەراهەمکردووە، هەروەها پێویستی چاکسازیی و پەرەسەندنی ئابووری وکۆمەلآیەتی و ئاتاج بە گروپی نوێگەر و چالاك لەم ولآتانەدا وایکردووە سوپا، لە نائامادەیی گروپە ریفۆرمخوازەکانیدیکەدا، وەك رایيکەری بەرنامەکانی پەرەسەندنی ئابووری و کۆمەلآیەتی دەسەلآتی سیاسی بگرێتەدەست.

سەرباری ئەوەش لاوازیی دامەزراوەکانی کۆمەڵی مەدەنی، لەوانەش پارتە سیاسییەکان، سەندیکاو دەزگا مەدەنییەکان لەو ولآتانەدا دەرفەتیداوە بە سوپا تاوەك رێکخراوترین و رێکوپێکترین دامەزراوەی سیاسی دەسەلآت بەدەستبهێنێت. لەمە بگوزەرێت لاوازی یەکێتی نەتەوەیی و پەیدابوونی هێزگەلێك لە دەرەوەی ناوەندەوە ( لێرەدا مەبەست لە پایتەختی ولآتە. و.ك) هەمیشە پاڵنەرێکی بەهێزبووە بۆ دەستوەردانی سوپا لەحکومەتدا. بەزۆری سوودوەرگرتن لە سوپا بۆ گەیشتن بە ئامانجی سیاسی، لەو ولآتانەی کەمتر پەرەیانسەندووە ئاسانتر لە پێکهێنان و دروستکردنی پارت و رێکخراوەی سیاسی، چەسپاوە. لەوجۆرە ولآتانەدا بەتایبەت لە سەردەمانی دوای جەنگی دووەم، سوپا نوێبوونەوەی زیاتری بەدەستهێناوە



و بەزۆری لەگەڵ بەرژەوەندی چینی تازەی مامناوەندیدا هاوبیربووە. هەر لەمڕووەوە سوپا لەم وڵاتانەدا کاریگەربووە بە ئایدۆلۆژیاکانی چینی ناوەند بەتایبەت ئەندێشەی ناسیونالیستی و گەشەسەندنی ئابووری. بەگشتی سوپا لە وڵاتانی گەشەسێندا هەم وەك هێزێکی کۆنزەرڤاتیڤ و هەمیش وەك فاکتەری نوێبوونەوە کاریکردووە. لە وڵاتانی ئەمریکای لاتین، دەستوەردانی سوپا، تایبەتمەندییەکی کەلتووری بووە کە پێشینەی بۆ شەڕەکانی سەربەخۆیی دەگەڕێتەوە. لەو وڵاتانەی کە بەشێوەیەکی بەردەوام یا ناوبەناو رووبەڕووی ناکۆکی و شەڕبوونەتەوە (وەك هەندێك وڵاتی عەرەبی، ئیسرائیل، پاکستان) ئامادەیی سوپا لە ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسیدا هەستپێکراوتربووە.

## چەند بابەتێکی تیۆری

فەیلەسوف و نووسەرانی مەزنی وەك تۆماس کارلایل و فرەدریك نیچە گیانی جەنگاوەری و ژیانی سەربازییان لەگەڵ سیفەتی بێگیان ودڵی شارستانێتی بۆرژوازی هاوچەرخدا بەراوردکردووەو لە چاکیی ژیانی جەنگاوەر دواون. لەڕاستیدا تایبەتمەندییەکانی وەك بارودۆخ، دیسپلین و ملکەچی و دەسەڵات و زنجیرەی پلەوپایە لە ئامانجەکانی کۆنزەرڤاتیڤ دادەنرێن.

تەنانەت کەسانێکی وەك (ماکس ڤێبەر) وێنایەکی ترسناکیان، لە کۆمەڵگەیەکی تووشبوو بە بازرگانیکردن و بیرۆکراسی و بەتاڵ لە چاکێتی جەنگاوەریی و سەربازیی، نیشانداوە. میلیتاریزم بەزۆری هاوەڵی رەوتە خۆپارێز و دژەلیبراڵەکان بووە، هەروەها رێزدانان بۆ تێڕوانین و رەوتە سەربازییەکان لەگەڵ دژایەتیکردن سەبارەت بە سۆسیالیزم و پارلەمانتاریزم پێکەوەبوونە.

(گایتانۆ مۆسکا) کۆمەڵناسی ئیتاڵی لە کتێبی چینی فەرمانڕەوادا، مەترسییەکانی عەسکەرتارییەتی لە ژیانی مەدەنیدا باسکردووە. بە بۆچوونی ئەو سوپا، لەنێو هێزە کۆمەڵایەتییە جۆراوجۆرەکاندا، زیاتر توانایی و هێزی پێویستی بۆ گرتنەدەستی دەسەڵات و پەیڕەوکردنی یەك لایەنەی دەسەڵاتی لەبەردەستدایە. لە ژیانی سیاسیدا ئارەزوویەکی بەهێز هەیە بۆ پەیدابوونی دیکتاتۆریی سەربازیی. لێ چاکترین رێگا بۆ خۆلادان لەم ئارەزووە زاڵە، بە بۆچوونی مۆسکا، دروستکردنی سوپایەکی جێگیر و سەقامگیرە کە ئەندامبوون تێیدا وەك پیشەیەك بێت و سەرەنجام ئارەزووی کەللەڕەقی و شەڕانگێزیی ئەفسەران بەرتەسکبکرێتەوە.

مارکس و ئەنگلس ساڵی ١٨٥٤، لە پەیوەند بە رۆڵی سوپا لەسیاسەتدا، لەسەر بنەمای مۆدیلی "دەوڵەتی سەربازی" پروسیا وێنایەکی کۆمەڵگەی میلیتاریستییان کێشاوە. بە بۆچونی ئەوان سوپا لە پروسیا چینی فەرمانڕەوای پێکدەهێنا. هەروا ئەوان لە سۆنگەی پەیوەندی سوپا بە چینە کۆمەڵایەتییەکانەوە ناوەڕۆکی رژێمی دەوڵەتی (بسمارك) لە ئەڵمانیا و دەوڵەتی ناپلیۆنی سێیەمیان لە فەرەنسا خستەڕوو. ئەنگلس، پۆناپارتیزمی وەك ( زۆرداریی سەربازیی) باسلێکردووە کە تێیدا وەك چۆن بۆرژوازی نەیتوانی بەتەنها فەرمانڕەواییبکات بۆیە دەسەڵاتی سپارد بە سوپا تا بەربە رێکخستنی هێزی شۆڕشگێری چینی کرێکار بگرێت. بە بڕوای ئەو رژێمی پۆناپارتیستی رێگربوو لەبەردەم چارەسەری ململانێ چینایەتییەکان. دوای شکستی پۆناپارتیزم لە فەرەنسا ئەنگلس ئیمپراتۆریای ئاڵمانی بە (نوێنەری راستەقینەی میلیتاریزم) دەزانی.

مارکس و ئەنگلس چەمکی پۆناپارتیزم و" زۆرداریی سەربازی" یان بۆ باسکردن لە هەلومەرجی هاوسەنگی نێوان بۆرژوازی و پرۆلیتاریا بەکاردەهێنا. بە گوتەی ئەنگلس دەسەڵاتی راستەقینە لە ئەڵمانیا لە دەست ( تاقمی خانەدانی ئەفسەر و بەڕێوەبەرانی دەوڵەتیدا) بوو نەك لە دەستی بۆرژوازی. مارکس "بسمارکیزمی" بە لێکهەڵپێکانی هەریەکە لە دیسپۆتیزمی سەربازیی، پەرلەمانتاریزمی رووکەشی، فیوداڵیزم و دەسەڵاتی بۆرژوازی دادەنا.(٤)

## کۆمەڵناسی سیاسیی دەستوەردانی سوپا لەسیاسەتدا

### توانا سیاسییەکانی دامەزراوە سەربازییەکان

بەبەراورد بە دامەزراوە سیاسییە بێچەکەکانی وەك پارتەکان، سوپا لە سێ رووەوە لەوان لەسەرترە: یەکەم لەڕووی رێکخراوەییەوە، دووەم لەڕووی توانای سازدان و تەیارکردنیان، سێیەم لەڕووی ئەو ئامرازانەی لەبەردەستیاندایە و سوودیلێدەبینن. لەڕووی رێکخراوەییەوە، سوپا مۆدیرنەکان رێکخراوەی خاوەن ناوەندێتی، دیسپلینی توند و زنجیرە پلەوپایەیی رێکوپێکن. سوپا رێکخستنێکی ناوەکیی یەکپارچە و هاوئاهەنگی هەیە. توانایی جەنگاوەریی لە نیشانە (رتبە)و پلەوە سەرچاوەی گرتووە، تایبەتی و کەسیی نییە.

سوپای مۆدرین، لەڕووی توانایی تەیارکردنیشیانەوە، بەپێی ئامانجە تایبەتییەکانیان ناوەڕۆکێکی سیمبۆلی و ئایدۆلۆژییان هەیە و پتر لەسەر بنەمای کۆمەڵێك بەهای دۆزدار (خاوەن

رێباز) دامەزراون. ناسیونالیزم گرنگترین رێبازی سوپای نوێ بووە. هەروەسا سوپا زیاتر ئەندێشەیەکی بەکۆمەڵ دێنێتەئارا کە تاك تێیدادەتوێتەوە، لەوێشەوە کە بیرکردنەوەی بەکۆمەڵ بەگشتی سەرچاوەی بزافە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانە، هەر بەوهۆیەوە دەشێت سوپا بزافی سیاسی دروستبکات. لەنێوان رێکخراوە سیاسییە مەدەنییەکانی سەدەی بیستدا تەنها پارتە کۆمۆنیستەکان ئاستێکی بالای ئەندێشەی بەکۆمەڵیان هەبووە. وەکو بنەمای کاریش، بێگومان لەوێوە کە سوپا رێکخراوێکی کەم تا زۆر پاوانە بۆ چەسپاندنی دەسەلات، لەچاو رێکخراوە مەدەنییەکاندا بەشێوەیەکی بەرچاو لەسەرترە. لەبەرامبەر ئەو خالە بەهێزانەدا سوپا، بەبەراورد بە پارت و رێکخراوە سیاسییەکان خالی لاوازیشیان هەیە. لەو خالانەش، سوپا بۆ کاروباری سیاسی دروستنەبووە. هەر لەوڕووەوەیە تەنانەت لە رژێمە سەربازییە دیکتاتۆرییەکانیشدا بەڕێوەبردنی هەندێك لە کارەکان دەسپێردرێن بە مەدەنییەکان. بێگومان تا سیستمی ئابووری، کۆمەلایەتی و کەلتووری، ئالۆزتربێت، توانای سوپا بۆ بەڕێوەبردنی کاروبارەکان کەمتردەبێتەوە.(٥)

### پاڵنەرەکانی دەستوەردانی سوپا لە سیاسەتدا

پاڵنەرەکانی دەستوەردانی سوپا لەسیاسەتدا پێچەلپێچترە لە پاڵنەری گروپەکانیدیکەی وەك یەکێتییە کرێکارییەکان یا خاوەنکارەکان بۆ بەشداری لە ژیانی سیاسیدا، بێگومان پێویستە لە پێکهاتەی سوپادا بۆ بەلگەی ئەم پێچەلپێچییەش بگەڕێین. هەلبەتە سوپا چین، توێژ یاخود گروپێکی کۆمەلایەتی یا گروپێکی پیشەیی خۆبەخشانە نییە. بەلکو بەشێکە لە بیرۆکراسیزمی دەولەت بە مانای فراوان، لەهەمانکاتدا لەناوخۆیدا کاریگەری پەیوەندییە کۆمەلایەتییە جۆراوجۆرەکانی لەسەرە.

بۆ تێگەیشتن لە پاڵنەرەکانی سوپا لە دەستوەردان لە ژیانی سیاسی پێویستە سەرەتا ئەو جیاکارییە پەسەندبکەین کە لەنێوان ئایدۆلۆژیای سوپا و پاڵنەرە واقیعی و شاراوەکان هەیە. بەزۆری لەهەموو شوێنێك سوپاکان دەستوەردانی خۆیان لە ژیانی سیاسیدا بە پاراستن و بەرگریکردن لە بەرژەوەندی گشتی و میللی پاساودەدەنەوە. (خوان پیرۆن) لە ئەرژەنتین سوپای بە ( کرۆکی نەتەوە)و بالاتر لەهەموو پارت و گروپە خاوەن بەرژەوەندی و گروپەکانی فشار دەزانی. سوپا بەزۆری وایڕادەگەیەنن کە لە هەلومەرجێکدا ئەگەر مەترسی و هەڕەشە هەبێت بۆسەر

بەرژەوەندی میللی، ئەوا بۆ نەهێشتنی ئەو مەترسییانە دێنەناوەوە، بەڵام ئەو دەستوەردانە کاتییە و دوای نەمانی هەڕەشەکە، دووبارە دسەلآت دەسپێرنەوە بە مەدەنییەکان.

بەزۆری سوپا، دوای بەدەستەوەگرتنی دەسەلآت، بەلای ئەوەدا دەچێت کە لەدەسەلآتدا بمێنێتەوە. هەڵبەتە بۆچوونی سوپا سەبارەتبە (بەرژەوەندییەکانی میللەت) زۆر جیایە. بۆ نموونە لە ولآتی ئیسپانیا و پورتوگال سوپا بەرژەوەندی نیشتمانیی یەکسانکردبوو بە بەرژەوەندی ئۆلیگارشی خاوەنزەوی، لەکاتێکدا بەرژەوەندی نیشتمانی بەگوێرەی سوپاکانی ولآتانی خۆرهەلآتی ناوەڕاست زیاتر لەنێو بەرژەوەندی چینی ناوەڕاستدا بووە. بەمپێیە هەمیشە لەپشت ئایدۆلۆژیای پاراستنی بەرژەوەندی نیشتمانییەوە بەرگریکردن لە بەرژەوەندی هەندێك هێز و گروپ یا چینی کۆمەلآیەتی خۆی مەلآسداوە و کۆمەڵناسی سیاسیی دەستوەردانی سوپا پێویستە بچێتەسەر ناساندنی ئەو بەرژەوەندییانە.(٦)

بزوێنەرە راستەقینەکانی دەستوەردانی سوپا لە کاروباری سیاسی دەشێت بەرگریکردنبن لە بەرژەوەندی چینایەتی، ناوچەیی، ئایینزایی یا فەردی. بێگومان دەشێت تێکەڵەیەك لە پاڵنەری جۆراوجۆریش لەکاردابن. پەیوەستبوونی چینایەتی لەهەندێك حاڵەتدا دەستوەردانی سوپا لەسیاسەتدا نیشاندەدات، بۆ نموونە دوای ١٩١٨ لە ئەڵمانیا پەیوەندییە چینایەتییەکان کاری زۆریکردە سەر رەفتاری سوپا. سوپای ئەڵمانیا لەوکاتەدا زیاتر لە چینی خانەدانەکان پێکهاتبوو. لە ١٩٣٠دا ٩٥٪ ی ئەفسەرانی سوپا لە چینی بالآی خاوەنزەوی بوون. سوپای پێکهاتوو لە خانەدانانی ئەڵمانیا بێگومان روانینێکی دژەدیموکراسی و دژەسۆسیالیستی هەبوو و ناکۆکییەکی توندیشی لەگەڵ بزاوتی سۆسیال دیموکراسی ئەڵمانیادا هەبوو، هەر بە بۆنەی ئەوتێڕوانینە سیاسییانەیەوە بوو کە سەرەنجام سازشی لەگەڵ حکومەتی هیتلەردا کرد. هەروەها سەبارەت بە چالاکی سیاسیی سوپای ژاپۆن لەماوەی نێوان دوو جەنگی جیهانیدا پەیوەندی چینایەتی فاکتەری چارەنووسساز بوو. لە بیستەکانی سەدەی رابردوودا ژمارەی ئەفسەرانی چینی ناوەڕاست و خوارەوە و گوندنشینەکان بەتایبەت سامۆراییەکان کە خەریکبوو دەپووکانەوە، روویان لەزیادبوونکرد، لەکاتێکدا کە ئەفسەرە پایەبەرزەکانی سوپا لە خانەدانە نەجیبزادەکان و رژێمی کۆن بوون. لە ساڵی ١٩٣٧ نزیکەی یەك لەسەر سێی ئەفسەرانی سوپای ژاپۆن لەنێو وردەبۆرژوازی و خاوەندارە بچووکەکانەوە راستببوونەوە. لەبەرامبەردا پارتە سیاسییەکان زیاتر لەلایەن چینی زایباتسو( خاوەن پیشەکان)ەوە پشتیوانی دارایی دەکران. دژایەتیکردنی

چینەباڵاکان بەتایبەت زایباتسۆ و پارت و دامەزراوە سیاسییە نوێیەکان لەلایەن سوپاوە و بەشێوەیەکی گشتیش دژایەتیکردنی کۆمەڵگەی مۆدێرن کە لە ئەنجامی چاکسازیی سەردەمی (میجی)ەوە دروستببوو، نموونەیەك بوو لە دوژمنایەتیکردنی چینە تەقلیدییەکان کە بەرەونەمان دەچوون و لەکاردانەوەیان بەرامبەربە نوێبوونەوە و مۆدێرنیزمی ژاپۆن، دواجار بەرگرییان لە روانگەی دژەسەرمایەداری، دژەسۆسیالیزم و دژەپارلەمانتاریزمی (ئیکی کیتا)، سەرکردەی ناسیونال سۆسیالیزم یا فاشیزمی ژاپۆن، دەکرد.

لە میسریش تێڕوانین و رەفتاری سیاسی سوپا لەژێر کاریگەریی پەیوەندییە چینایەتییەکانی ئەفسەراندا بوو. دوای کردنەوەی خوێندنگەی سەربازیی لە سالّی ١٩٣٦دا گروپێکی تازەی ئەفسەرانی لاو لەو ولاّتە پەروەردەبوون کە زیاتر لەنێو چینی خاوەندارە بچووکەکان و جووتیارانەوە راستببوونەوە. ئەوان بەپێی پەیوەندییە چینایەتییەکانیان هەستێکی دوژمنکارانەیان دەرهەق بە چینی ئەفەندی ( خاوەن زەوییەکان) هەبوو. عەبدولناسر و لایەنگرانی نوێنەری ئەوجۆرە هێزە بوون کە ئۆباڵی شکستی سالّی ١٩٤٨ی فەلەستینیان دەخستەملی توێژی ئەفەندی. ئەوان لە سالّی ١٩٥٢دوای ئەوەی دەسەلاّتیان بەدەستەوەگرت هێرشیانکردەسەر چینی بالاّ و پارتە سیاسییەکانی سەربەو چینە. پاشان ریفۆرمی زەویوزاریان بە قازانجی جووتیاران دەستپێکرد. بە راگەیاندنی رەوتی ( سۆسیالیزمی عەرەبی) لەسالّی ١٩٦١دا پیشەسازیی تایبەتیشیان خۆماڵیکرد. لە هەندێك ولاّتی ئەمریکای لاتین، وەك بەرازیل و ئەرژەنتین، پەیوەندییە چینایەتییەکانی ئەفسەرانی لاو کاریکردووەتە سەر رەوت و رەفتاری سیاسییان. بەرلە جەنگی یەکەمی جیهان ئەفسەرەکانی سوپای ئەو ولاّتانە زیاتر لە چینی ئۆلیگارشی خاوەنزەوییەوە هاتبوون. بەپێچەوانەشەوە لەدوای جەنگی دووەمەوە پێگەی چینایەتی ئەفسەرە گەنجەکان زیاتر چینی ناوەڕاستی شار بوو. دەبێت رەوتە ناسیونال و رادیکال و دژە ئۆلیگارشییەکانی ئەفسەرە لاوەکان تائەندازەیەکی زۆر بە بەرەنجامی ئالوگۆڕی پێگەی چینایەتییان بزانرێت. راپەڕینی ئەفسەرە لاوەکانی بەرازیل کە بۆ بەرگریکردن لە گواستنەوەی دەسەلاّت بۆ (وارگاس) ئۆلیگارشی خاوەنزەوی ئەو ولاّتە لەسالاّنی ١٩٢٠، نموونەیەکی دیاری ئەوحاڵەتەیە. لە ئەرژەنتین ئەفسەرە گەنجەکان کە سەر بەچینی ناوەڕاست بوون، (خوان پیرۆن)یان گەیاندە دەسەلاّت، بەلاّم کاتێك پیرۆن هەوڵیدا گەی هەڵخراندنی کرێکارییەوە دەسەلاّتەکەی لە سوپا جیابکاتەوە، هەندێك هەر لەو ئەفسەرانە سالّی ١٩٥٥ لایان برد.[٧]

**پەیوەندی ناوچەیی (هەرێمایەتی)**

دەشێت سوپا لەپێناو بەرەوپێشبردنی پەیوەندییە ناوچەیەکانی دەستوەربداتە سیاسەتەوە. بۆ نموونە لە ئیسپانیا دوژمنایەتی سوپا بەرامبەرکاتالۆنیا و بزاڤە جیاخوازەکەی لەوێوە سەرچاوەیدەگرت کە ئەفسەرانی سوپا زۆربەیان خەڵکی کاستیل و ئەندەلوس بوون. لە پاکستان زۆربەی ئەفسەرانی سوپا خەڵکی رۆژئاوای پاکستانن کە سەربە خاوەن موڵکەکانی ناوچەی پنجاب بوون و بە چاوێکی سووك سەیری خەڵکی رۆژئاوای پاکستانیان دەکرد. لە یۆغۆسلاڤیا بەرلە جەنگی دووەمی جیهان کە پێکهاتبوو لە ویلایەتەکانی بۆسنیا، کرواتیا، مەسەدۆنیا، مۆنتینگرۆ، سربستان و سلۆڤینیا، ئەلیکسانەدەری یەکەم لە ساڵی ١٩٢٩دا حکومەتێکی دیکتاتۆریی بەدەسەڵاتی دامەزراند. ئەلیکساندەر سیاسەتێکی دوژمنکارانەی بەرامبەر نەتەوەکانیدیکەی جگەلە سربەکان، پیادەکرد بەتایبەت دەرهەق بەکرواتەکان.زۆربەی ئەفسەرانی سوپاکەی خەڵکی سربیابوون کە هەستێکی قیناویان بەرامبەر بەنەتەوەکانیدیکە هەبوو.[٨]

هەروەها دەشێت سوپا بۆ پاراستنی بەرژەوەندی و پەیوەندیی رشتەییەکان وەك مەسەلەیەکی کۆمەڵایەتی سیاسی بەرەنگاری حکومەت ببێتەوە یان دەستیتێوەردات. بۆ نموونە لە ئەڵمانیای سەردەمی ئیمپراتۆری ١٨٧١ تا ١٩١٨و لە سەردەمەکانی کۆماری ڤایمار و نازیزمیشدا، سوپا لەبەرامبەر حکومەتدا، بەرگری لە پەیوەندییە رشتەییەکانی خۆی دەکرد. وەزیری جەنگ لەبەرامبەر رایشتاگدا بەرپرس نەبووو نەیدەهێشت رایشتاگ دەستوەربداتە ناو سوپاوە. تەنانەت رایشتاگ هیچ دەسەڵاتێکی بەسەر بودجەی سوپادا نەبوو. لەڕاستیدا ناوەندی سوپای ئەڵمانیا سەربەخۆییەکی بەرچاوی هەبوو. سوپا دوای جەنگی یەکەم، لە سەردەمی کۆماری ڤایماردا، بە شوێن پاراستنی سەربەخۆیی و سەربەشییەکان( امتیازات)ی خۆیەوە، لەبەرامبەر حکومەتدا، بوو، چەند هەنگاوێکیشی بەمەبەستی لاوازکردنی حکومەت نا کە رێخۆشکەربوون بۆ هێنانی هیتلەر بۆسەر دەسەڵات. لە سەردەمی هیتلەریشدا سوپای ئەڵمانیا لەبەرامبەر دەستوەردانی پارتی نازی و گۆستابۆدا راوەستایەوە، تائەوکاتەی خودی هیتلەر لە ساڵی ١٩٣٨ سەرکردایەتی سوپای گرتبەدەستەوە.

بەمپێیە پاڵنەرەکانی دەستوەردانی سوپا بەگشتی لە سیاسەت و حکومەتدا ئاڵۆزە و پێکهاتووە لە پاڵنەرە رشتەیی، چینایەتی، ناوچەیی و شەخسییەکان. بۆ ناسینی ئەو پاڵنەرانە لەهەر وڵاتێکدا پێویستە سەیری پێکهاتەی کەلێنە کۆمەڵایەتییەکان بکرێت. بەگشتی ئەو

کەلێنانە لە ئاستی دامەزراوە و ڕێکخراوە سیاسییەکان و لەوانەش سوپا ڕەنگدەدەنەوە و دەبێتە هۆی پەیدابوونی لایەنگریی نەیار لەنێویدا (واتە لەناو سوپادا).

**ئاستە جۆراوجۆرەکانی دەستوەردانی سوپا لە سیاسەتدا.**

دەستوەردانی سەربازیی لەسیاسەتدا ئاستی جۆراوجۆری هەیە. دەتوانرێت چوار ئاست یا پلە لەم زەمینەیەدا لەبەرچاوبگیرێت:

یەکەم: هەژموونی سوپا لە دەزگای حکومەتدا بەبێ ئەوەی دەسەلاّت لە دەستی مەدەنییەکان دەربچێت. لێرەدا سوپا وەك گروپێکی فشار دەردەکەوێت.

دووەم: پیادەکردنی هەڕەشە و فشار لەلایەن سوپاوە بەسەر حکومەتدا، بەتایبەت هەڕەشەی کودێتا بەمەبەستی دابینکردنی خواست و بەرژەوەندییەکانی سوپا لەلایەن حکومەتەوە، لەمەدا بێگومان دەسەلاّتی سوپا سنووری هەژموونی تەواو تێدەپەڕێنێت و لە دەسەلاّت نزیکتردەبێتەوە.

سێیەم: دەستوەردانی ڕاستەوخۆ لە سیاسەت و گۆڕانکاریی حکومەت بەهۆی توندوتیژییەوە و دانانی حکومەتێکی سەربازییدیکە لە جێگەی حکومەتی لەسەرکارلابراو.

چوارەم: زەوتکردنی پلەوپایە حکومییەکان بەهۆی ئەفسەر و پلەدارەکانی سوپاوە یا دانانی حکومەتی سەربازیی.

بەپێی ڕاڤەی کلاسیکیی ئێس، ئەی، فاینەر، کۆمەڵناسی سیاسیی ئینگلیزیی ئەوەی کە دەستوەردانی سوپا لەکام یەك لەو ئاستانەدا بێت بەستراوەتەوە بە ئاستی بەدەزگاییبوونی ژیانی سیاسیی، گەشەسەندنی (فەرهەنگی سیاسی)و فراوانبوونەوەی دامەزراوە و دامەزراوەکانی کۆمەڵی مەدەنییەوە.

بنەماکانی پشتبەستنی دەسەلاّتداران لە کاروباری حکومەتدا، واتە بنەماکانی ڕەوایی دەسەلاّتی سیاسی، لە هەلومەرجی بەدامەزراوەییبوون و پەرەسەندنی کەلتووری سیاسیدا ڕەزامەندی گشتی و پشتیوانی ئەخلاقیی هەیە. ڕێساکانی دەستاودەستکردنی دەسەلاّتی سیاسی بەدروستی دەڕوات بەڕێوە و دامەزراوەکانی کۆمەڵی مەدەنی وەك پارتەکان، سەندیکا و کۆمەڵەکان و ڕێکخراوە مەدەنییەکان بەهێزن.

**فاینەر وڵاتانی جیهانی، بەپێی ئەو دەرکەوتانە لە زەمینەی گەشەی سیاسییدا، کردووە بە چوار پۆلەوە:**

یەکەمین ئەو وڵاتانەی کە لەسەر ئەو دەرکەوتانەی باسکران ( وەك بەریتانیا، ئەمریکا، وڵاتانی ئەسکەندنافییە و.. هتد) لەم وڵاتانەدا دەستوەردانی راستەوخۆ و ئاشکرای سوپا لەسیاسەتدا بەنارەوا (نامەشروع) دەزانرێت. هەرچەندە دەشێت هەژموونی سوپا لە ئاستی یەکەمدا بێت.

دووەم ئەو وڵاتانەی کە تیایاندا چەند دیاردەیەکی پەرەسەندنی سیاسی وەك فراوانبوونی رێکخراو و دامەزراوەکانی کۆمەڵی مەدەنی، بەرەوپێشچوون، بەڵام هەندێك پێناسەیدیکە بەتایبەتی رەوایی و رێگاکانی دەستاودەستکردنی دەسەڵاتی سیاسی هێشتا نەچوونەتە ئاستی پێویستەوە. ئەڵمانیا لەماوەی ساڵانی ١٩١٨ تا ١٩٣٣ ، ژاپۆن لەماوەی نێوان دوو جەنگی جیهانی و فەرەنسا لە سەردەمی کۆماری سێیەمەوە بەرەودوا لەوجۆرە وڵاتانە بوون. لەم وڵاتانەدا هەوڵی سوپا بۆ دەستوەردان لەسیاسەتدا رووبەرووی بەرەنگاری کۆمەڵی مەدەنی دەبوونەوە. پۆلی سێیەم ئەو وڵاتانەن کە دیاردەکانی پەرەسەندنی سیاسی تیایاندا زۆر پێشکەوتوونییە، رایگشتی و کۆمەڵی مەدەنی گەشەیاننەکردووە و رێکخراونین، شێوە یاساییەکانی دەستاودەستکردنی دەسەڵاتی سیاسیش مەشروعییەتێکی واینییە.

لەمجۆرە هەلومەرجەدا دەستوەردانی سوپا بەرەنگارییەکی واینییە. وڵاتانی وەك تورکیا، ئەرژەنتین، میسر، سوریا، پاکستان و عیراق لە دەیەی شەستەکاندا لەوەها هەلومەرجێکدا بوون. دواجار گروپی چوارەم ئەوجۆرە وڵاتانە دەگرێتەوە کە لەرووی پێناسەکانی پەرەسەندنی سیاسییەوە هیچجۆرە پێشکەوتنێکیان بەدەستنەهێناوە، دەشێت سوپا رێکخراوترین دامەزراوەی سیاسی - کۆمەڵایەتی بێت. لەمجۆرە وڵاتانەدا بەدەسەڵاتگەیشتنی سوپا بەشێوەیەکی ئاسایی وەردەگیرێت.

بابەتی دەستوەردانی سوپا لەسیاسەتدا بەتایبەت لە پەیوەند بە وڵاتانی گروپی دووەم و سێیەم چەند خاڵێکی پێچەڵپێچی کۆمەڵناسی دەگرێتەخۆی. لە وڵاتانی گروپی دووەم دەستوەردانی سەربازیی بەزۆری دەگمەن، کورتماوە سەرنەکەوتووبووە و بەرەورووی دامەزراوەکانی کۆمەڵی مەدەنی بووەتەوە. بۆ نموونە سوپا لە ژاپۆن لەماوەی دوو جەنگی جیهانی و لەماوەی جەنگی دووەمیشدا لەوپەڕی بەهێزی خۆیدا ناچاربوو ( لەگەڵ دامەزراوەگەلێکی بەهێزی وەك پارلەمان، دەرباری ئیمپراتۆر، ئەنجومەنی هۆزەکان (Genro ) خێڵە گەورەکان، پارتە سیاسییەکان، زایباتسۆ، یەکێتییە کرێکارییەکان و.. هتد، بچێتە کەنارەوە. سوپا لە ساڵی ١٩٣٠ بەدواوە پەنایبردە بەکارهێنانی فشار و هەڕەشە لەبەرامبەر حکومەتدا. راپەڕینە سەربازییە بەناوبانگەکەی شوباتی ١٩٣٦ بۆ گرتنی دەسەڵاتی

سیاسی بەرەورووی بەرەنگارییەکی زۆربووە و سەرەنجام شکستیخوارد. هەڵبەتە باڵی میانڕەوتری سوپا هەژموونی فراوانی خۆیان لە دەزگای سیاسی وڵاتدا پاراست و لە جەنگی دووەمدا بەگشتی لە لووتکەی ناوەندی بڕیاردا بوون.

کودیتای ناسراوی کاپ (Kapp) لە ساڵی ١٩٢٠ لە ئەڵمانیا زۆر لە کودیتا سەرنەکەوتووەکەی ١٩٣٦ی ژاپۆن دەچوو. لەماوەی ساڵانی ١٩١٨ تا ١٩٣٣ سوپای ئەڵمان بەردەوام بەشوێن بیانوویەکی سیاسییەوە بوو بۆ دەستوەردان لە سیاسەت و حکومەتدا. بەوحاڵەشەوە هەوڵی سوپا لە ساڵی ١٩٢٠ بەرەورووی بەرەنگاری دامەزراوە مەدەنییەکان، رایگشتی، یەکێتییە کرێکارییەکان، کڵێسا و پارتە سیاسییەکان بووەوە. لە شوباتی ١٩٢٠دا دەوڵەتە سەرکەوتووەکانی جەنگی یەکەم لیستی ناوی تاوانبارانی جەنگیان دا بە حکومەتی ئەڵمانیا. لەکاردانەوەیدا سوپا بە سەرکردایەتی ژەنراڵ (لوت ویتز Luttwitz) بەهاوکاری گروپێکی راستڕەو بە سەرکردایەتی (ۆلفگانگ کاپ) کۆدیتای کرد و( کاپ) بووە راوێژکاری ئەڵمانیا. لەبەرامبەردا ئەندامانی حکومەتە شەرعییەکە بەرەو شاری درسدن هەڵهاتن و لەوێوە بە جووڵاندنی رایگشتی و هاندان بۆ مانگرتنی گشتی بەرەیەکی ئۆپۆزسیۆنی بەرچاویان لە دژی حکومەت پێکهێنا.

سەرەنجام دوای ٥ رۆژ حکومەتی کاپ روخا. بەشێوەیەکی گشتی لە وڵاتانی ژاپۆن و ئەڵمانیا نەیاریی هێزە مەدەنییەکان لەبەرامبەر دەستوەردانی راستەوخۆی سوپا لە سیاسەتدا شتێکی بەرچاوبووە و سوپا تەنها دەیتوانی لە چوارچێوەی یاسا و وەك گروپێکی فشار لەپشت پەردەوە هەنگاوبنێ.

لە یەکێتی سۆڤییەتیش دەسەڵاتی گشتگیری پارتی کۆمۆنیست بوارێکی بۆ دەستوەردانی راستەوخۆی سوپا نەهێشتبووەوە. سوپای سۆڤییەتی سوپایەکی بەدیسپلین و بەهێزو خاوەن ئیمتیازاتی کۆمەڵایەتی جۆراوجۆربوو. هەڵبەتە حکومەتی کۆمۆنیستی لەکاتی دامەزراندنی سوپای سوورەوە نیگەران بوو لەئەگەری هەر سەرپێچییەکی سەربازیی. بەتایبەت راپەڕینی چەکداریی کرۆنشتاد لە ساڵی ١٩٢٢دا ئەو نیگەرانییەی بەهێزترکرد. هەر لەورووەوە حیزبی کۆمۆنیست کۆمسیۆنی سەربازیی بۆ چاودێریکردنی سوپا دانا. بەهەرحاڵ لەگەڵ فراوانبوونەوەی یەکێتییە کرێکارییەکان کە هەموویان گەی ئەندامەتی حیزبەوە پەیوەندییان پێکەوەهەبوو، بواری کاری سوپا وردەوردە هاتەخوارەوە. بەمحاڵەوە نارۆشنی رێسای دەستاودەستکردنی دەسەڵاتی سیاسی بەردەوام دەستوەردانی سوپای وەك ئەگەرێك هێشتبووەوە. هەڵبەتە لەهەمانکاتدا هەژموونی حیزب بەسەر سوپاوە روولەزیادبوون بوو. بۆ نموونە لە ساڵی ١٩٢٤دا تەنها ٣٨٪ ئەفسەرەکانی سوپا کۆمۆنیست بوون، ئەم ژمارەیە لە ١٩٢٧

بووە ٥٦٪و لە ١٩٣٠ گەیشتە ٩٠٪ . ٣٢٪ ئەفسەران بەشێوەیەکی فەرمی وەك ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی حیسابدەکران. کۆمیتەی ناوەندی حیزب بەردەوام چاودێربوو بەسەر کاری سوپاوە و پۆلیسی نهێنی حیزبیش لەنێو هێزە چەکدارەکاندا چالاکی ئەنجامدەدا. لە ساڵی ١٩٣٧ ستالین ٤٠٪ی ئەفسەرە پایەبەرزەکان و نیوەی ئەفسەرانی پاکتاوکرد. ستالین هەوڵیدەدا سوپا، لە وڵاتێکی سەراپا میلیتاریستیدا، لەڕووی سیاسییەوە بێکاریگەربکات. ئەو لەلایەکەوە حیزبی کردە ڕێکخراوێکی سەربازیی و لەلایەکیدیکەوە سوپای نایەژێر ڕێنمایی و ئاراستەکردنی سیاسییەوە. لە جەنگی دووەمی جیهانیدا بەبەهێزبوونی ناسیونالیزمی روسی جارێکیدیکە رۆڵی سوپا وەك رزگارکەری روسیا و سۆسیالیزم جەختی لێدەکرایەوە.

بەشێوەیەکی گشتی دەوڵەتی روسیا هەوڵیدەدا گەی بانگەشەی سیاسی و حیزبی فراوانبوونی چالاکی پۆلیسی نهێنی و هەروەها گەی بەخشینی ئیمتیازاتی ئابووری و فەرماندەیی دوو لایەنە (حیزبی ـــ سەربازی)ەوە بەر بە سیاسییبوونی سوپا بگرێت. (سەرکردایەتی دوو لایەنەی سوپا لە ساڵی١٩١٨ دامەزراو ١٩٣٧ لە سەردەمی پاکتاوی گەورەدا توندبووەوە. لە ساڵانی جەنگی دووەم بەبیانووی سەرکەوتنی سوپاوە سەرکردایەتی سیاسی نەما و لە دەیەی ١٩٦٠ بەرپرسیارێتی پەروەردەکردنی ئایدۆلۆژیی سپێردرا بە سەرکردایەتی سوپا). بەهەموو ئەوانەشەوە سوپای سۆڤییەت لە چەند حاڵەتێکدا راستەوخۆ هاتەنێو ژیانی سیاسییەوە. یەکێك لەو حاڵەتانە لەناوبردنی (بریا) سەرۆکی پۆلیسی ستالین لە ساڵی ١٩٥٣، بوو (بریا) لە پلەی سەرۆکایەتی (کەی جی بی دا) بە دوژمنی ئاسایی سوپا دەزانرا. لەو ساڵەدا یەکەکانی سوپا بە فەرماندەیی مارشاڵ ژۆکۆف و مارشاڵ کانییف (بریا)یان دەستگیرکرد. دووەم حاڵەت لەکاتی لابردنی (مالینکۆف) لە ساڵی ١٩٥٥دا بوو.

رابەرانی سەربازیی لە کۆمیتەی ناوەندیی حیزبدا، راستەوخۆ و کاریگەر دەستیانتێوەردا. دوای رووخانی مالنیکۆف، خرۆچۆف داواکاری سوپای سەبارەت بەزیادکردنی بودجە دابینکرد و مارشاڵ ژۆکۆف گەیشتە وەزارەتی بەرگری، هەروەها سوپا بە سەرکردایەتی مارشاڵ ژۆکۆف بەرگریی لە هەوڵەکانی خرۆچۆف لە دژی نەیارەکانی لە بیرۆکراسییەتی دەوڵەتی ( مۆلۆتۆف، بۆلگانین و مالنکۆف) کرد. بەشێوەیەکی گشتی لە یەکێتی سۆڤییەت سوپا نەیتوانی لەبەرامبەر حیزبدا سەری بەرزبکاتەوەو بەهۆی دەسەڵاتی فراوانی حیزبەوە ناچاربوو لەکەوتنەشوێن بەرژەوەندییە رشتەییەکانیدا بەناوی حیزبەوە کاربکات. بەمجۆرە رۆڵی سوپای یەکێتی سۆڤییەت لەسیاسەتدا لە پەیڕەویکردنی هەژموونداا قەتیسمابوو.

لە وڵاتانی گەشەسێندا بەبیانووی لاوازیی مەشروعییەتی سیاسی و کۆمەڵی مەدەنی و تەشەنەنەکردنی پارتە سیاسییەکانەوە دەستوەردانی راستەوخۆی سوپا لەسیاسەتدا فراوانتربووە. لەو وڵاتانەدا سوپا وەك ڕێکخراوترین هێزی سیاسی لەجیاتی پارت و دامەزراوە سیاسییەکانیدیکە کاریکردووە. بۆ نموونە لە تورکیا دوای دامەزراندنی رژێمی کۆماریی، دوو پارتی کۆماریخوازی گەل و دیموکرات دەرکەوتن. بەکردەوە تا ساڵی ١٩٤٥ تەنها پارتی کۆماریخوازی گەل دەسەڵاتی لەدەستدابوو، لەو ساڵەدا مۆڵەتدرا بەهەندێك کەسی نەیار لەنێو پارتی دەسەڵاتدا تا پارتی ئۆپۆزسیۆن پێکبهێنن. لەئەنجامدا پارتی دیموکرات پێکهات و لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٥٠دا دەسەڵاتی بەدەستهێنا. پارتی دیموکرات نوێنەری ترادیسیۆنالیزم، دژی نوێبوونەوەی رۆژئاوایی بەشێوە کەمالییەکەی و مەزهەبی و لادینی بوو. لەم نێوەدا سوپای تورکیا کە رەوتێکی بەهێزیی نەریتی کەمالیزم بوو بەرگری لە رۆشنبیرانی لایەنگری رۆژئاوا و پارتی کۆماری دەکرد.

کودیتای ساڵی ١٩٦٠ی تورکیا بە سەرکردایەتی (جەمال گورسەل) لەلایەن چینەکانی ناوەڕاستەوە پشتیوانییلێدەکرا. بەهەرحاڵ بەپێی هێزی دامەزراوەکانی کۆمەڵی مەدەنی، ژەنراڵ جەمال گورسەل بەڵێنیدا کە پاش نووسینی دەستووری نوێ و ئەنجامدانی هەڵبژاردن دەسەڵات رادەستی مەدەنییەکان بکات، بەڵام هەتا ئەوکاتە بەهۆی پشتیوانی تارادەیەك فراوانی کۆمەڵایەتی لە پارتی دیموکرات، حکومەتی گورسەل پەیڕەوی لە سیاسەتێکی سەرکوتگەریی فراوان کرد. هەرجۆرە هاوکارییەکی پارتە سیاییەکانیدیکە لەگەڵ پارتی دیموکراتدا یاساغکرا. لەو هەڵبژاردنەدا کە سەرەنجام لەژێر فشاری پارت و دامەزراوە سیاسییەکاندا و بە چاودێری سوپا ئەنجامدرا پارتی کۆماریخواز گەیشتەدەسەڵات. بەمشێوەیە سوپای تورکیا نوێنەری پەیوەندی و بەرژەوەندی چینە تازە و مۆدیرنیستەکان بووە و هەمیشە بەدەرخستن و زەقکردنەوەی هەڕەشەکانی سەر میراتی ئەتاتورك بۆ بەرگریکردنلێی و لە ناسیونالیزمی تورکی هاتووەتەناوەوە. کودێتای ژەنراڵ کەنعان ئیڤرینیش لە ساڵی ١٩٨٠ هەمان ناوەڕۆکی هەبوو.(١٠)

بەگشتی بە فراوانبوونەوەی پارتە بەهێزەکان، پەرەسەندنی دامەزراوەکانی کۆمەڵی مەدەنی، فراوانبوونەوەی بەشداریی خەڵك، پێگەیشتنی رایگشتی، بەهێزبوونی نەریتی پەرلەمانتاریزم و.. هتد، وردەوردە، بۆشاییەك کە سوپاکان بۆ دەستوەردانیان لە ژیانی سیاسی وڵاتانی پەرەسێندا سوودیانلێبینیوە، پڕدەبێتەوە و لەئەنجامدا بەرێکخراوبوون و هوشیاریی هێز و گروپە کۆمەڵایەتییەکان، چیدی سوپا ناتوانێت بەناوی پەیوەندی و بەرژەوەندییەکانیانەوە مەیدانی سیاسی داگیربکات.

## سوپا و سیاسەت لە ئێراندا

سوپای مۆدێرنی ئێران بەرەنجامی نوێبوونەوەیەك بوو، بەدوای شۆڕشی مەشروتە، لە هەناوی حکومەتی رەزا شادا. تۆوی سەرەتای سوپا لە پێکهاتەی هێزەکانەوە، بەتایبەت بریگادی قۆزاق و بریگادی ناوەندیی، دامەزرا. پۆشاکی سوپا هەمووی بووبەیەك. ئەفسەرەکانی دەرەوە پەراوێزخران و لە ساڵی ١٣٠٠ کۆلیژێکی ئەفسەری دروستکرا. یەکەمین رێکخستنەکانی سوپای رەزا شا بەشێوەی دابەشکردنی سوپا بۆ شەش لەشکری ناوچەیی هاتەئارا. لە سەردەمی رەزا شادا تێکڕای بودجەی هێزە چەکدارەکان یەك لەسەر سێی هەموو بودجەی وڵات بوو. ژمارەی سەربازان لەو ساڵانەدا لە ٤٠ هەزارەوە بۆ ١٥٠ هەزار زیادیکرد. لە حکومەتی رەزا شادا سوپا ناڕاستەوخۆ دەسەڵاتی سیاسی بەدەستەوەبوو. سوپا لە بەڕێوەبردنی کاروبارەکاندا دەسەڵاتی بەسەر پلە و پۆستە مەدەنییەکانەوە هەبوو. سوپا نوێنەری رەوتی مۆدیرنیزاسیۆن و داردەستی دەسەڵاتی دەربار رەهابوو. دەستەبژێر "ئیلیت"ی سوپای ئێران لە گروپی تازە پێگەیو و سەربەخۆ لە ئاغازادەی خێڵەکی و خاوەنزەوی سەردەمی قاجار پێکهاتبوون. لێ بەنۆبەی خۆیان بەدەستبەسەراگرتنی موڵك و زەوی بەرفراوان بوونە بەشێك لە چینی خاوەنزەوی. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا دەسەڵاتی تایبەتی رەزا شا رێگربوو لە سەربەخۆی کاری سوپا. بەمپێیە دامەزراندنی سوپای نوێی ئێران پێکهاتەیەکی بەربایی بوو. لە ساڵانی ١٣٢٠و ١٣٣٢ دوای رووخانی رەزا شا بەهۆی چالاکی گروپ و پارتە جۆراوجۆرەکان و بەشداری پیاوانی ئایینی، ئاغاکان، شەقام، رۆشنبیران و یەکێتییە کرێکارییەکانەوە لەسیاسەتدا و ناوەندێتی ئەنجومەنی شورای میللی و لاوازیی دەربار، سوپا نەیتوانی وەك گەمەکەرێکی سیاسی کاربکات. لەو ساڵانەدا دەربار هەوڵیدا تا سوپا وەك ئامرازی دەسەڵاتی خۆی گەی زیادکردنی بوودجە و وەرگرتنی کۆمەکی دارایی لەدەرەوە بەهێزبکەن.

کودێتای ساڵی ١٣٣٢ بەرەنجامی هاوکاریی دەربار و سوپا بوو. دوای ئەوە تاماوەیەك رۆڵی سیاسی سوپا لەئێراندا زەقبوویەوە. دوای کودیتا سوپابورد ( پلەیەکی بالاترە لە سەرلەشکر) (زاهیدی) جڵەوی سوپای بەدەستەوەگرت و چاودێریی خولی هەژدەیەمی هەڵبژاردنیشی کرد. دەربارێش فراوانبوونەوەی دەسەڵات و هەژموونی سیاسیی سوپای بەدڵنەبوو. بەتایبەت لەوێدا کە (زاهیدی) پێداگریدەکرد کە سەرکردایەتی گشتی هێزەکانی پێبدرێت، بەڵام سەرکردایەتی هێزە چەکدارەکان لە دەستی "شا" دا مایەوە. لە رەوەندی پتەوبوونی دەسەڵاتی شا لە ساڵی ١٣٣٩ بەدواوە چەندین ئەفسەری سوپا کە لەڕووی سیاسییەوە گرنگ یا مەترسیداربوون، دەستگیرکران هەروەك ژمارەیەك سەرلەشکر و سەرهەنگ پێشوەخت خانەنشینکران.

ئەگەرچی لە ساڵەکانی ١٣٣٢ ــ ١٣٥٧ سوپا ئامرازێکی ئاسایی دەسەڵاتی دەربار بوو، بەڵام هیچکاتێك سەربەخۆ کارینەکردووە. شا لەو ساڵانەدا هەوڵیدا ناوەندێکی دڵسۆز دەستەبەربکات و گەی زیادکردنی بودجەی سەربازیی و زیادکردنی ژمارەی سەربازانی سوپاوە بەهێزیبکات. ژمارەی هێزە چەکدارەکان لە ١٢٠ هەزار کەسەوە لەساڵی ١٣٢٠ بۆ ٤٠٠ هەزار کەس لە ساڵی ١٣٥٦ زیادیکرد. بەزیادبوونی داهاتی نەوت، کڕینی چەکوچۆلیش لە ساڵانی ١٣٥٦ ــ ١٣٥٨دا شەش ملیار دۆلاری تێپەڕاند. بودجەی سەربازیی ساڵانە لە ٧٠ ملیۆن دۆلارەوە لە ساڵی ١٣٣٩ بۆ ٩ ملیار دۆلار لە ساڵی ١٣٥٦ بەرزبوویەوە. شا بە مەبەستی مسۆگەرکردنی دڵسۆزیی سوپا سەرپەرشتی دامەزراندن و پلەبەرزکردنەوەی هێزە چەکدارەکانی دەکرد. دڵسۆزیی سوپا بەچەند فاکتەرێکەوە بەسترابووەوە لەوانە: چاودێریی هێزەکانی ئاسایش و هەواڵگریی بەسەریانەوە، بەهرەمەندبوونی هێزی چەکدار لە ئیمتیازاتی ئابووری و کۆمەڵایەتیی بەرچاو و پێدانی پلەی مەدەنی پێیان و.. هتد. هەرچۆنێکبێت سوپای ئێران لەو ساڵانەدا لەسەر بناغەی دڵسۆزیی تەواو بۆ دەربار خۆیگرتبوو و سەربەخۆ نەبوو لە را و کارەکانیدا.

لە ساڵانی کۆتایی دەوڵەتی پەهلەویشدا کاتێك شا تووشی بێتوانایی ببوو، دەبینی پشتیوانی دەرەکیشی لەدەستچووە. وردەوردە هەمان هەستکردن بە لاوازی دزەیکردە نێو ریزەکانی سوپایشەوە. دوودڵی و ڕاڕایی شا لەپەنابردنەبەر سەرکوت، توانای سوپای لاوازکرد. سپابورد مقدم سەرۆکی ساواك لە گەرمەی قەیرانی شۆڕشگێرانەدا گوتی: (شاهەنشا کە بڕوای تەواویان بە فەزای سیاسی کراوە و دیموکراسی و جێبەجێکردنی دەستوور هەیە، ڕێگە بەکاردانەوەی توندی هێزی چەکدار و سوپا نادەن.. من لێرەدا بەئاشکرا رایدەگەیەنم کە شاهەنشا دەستی ئێمە و هێزە چەکدارەکانی بەستووە و ڕاییکردنی کاروبارەکانی بە سەرۆکوەزیرانی وڵات سپاردووە. هەڵبەتە ئێمە سەرمانسووڕدەمێنێ کە بۆچی شاهەنشا پەیڕەوی لەم سیاسەتانە دەکات[11]).. بەپێی شایەتییەکیدیکە"بەرنامە و ڕێوشوێنەکانی حکومەتی (شەریف ئیمامی) بەتەواوی جیاوازبوو لەگەڵ بڕیارەکانی حکومەتی سەربازیی کە لە سەردەمی خودی خۆیدا ڕاگەیەندرا بوو.. ژەنراڵ (ئۆیسی) فەرماندەی تاران تیامابوو کە چۆن بڕیارەکانی حکومەتی سەربازیی لەگەڵ سیاسەتی تەبایی و ئاشتییانەی دەوڵەتدا دەگونجێت.[12]

سەرەنجام بە گوتەی ئارتشبەدی ( پلەیەکی سەربازییە) قەرەباغی حکومەتی سەربازیی بە وێنەی شێرێکی بێبیاڵ و کلکی لێهاتووە.[13] حکومەتی سەربازیی ئەزهاریش کە لە ١٥ مانگی ئابانی ١٣٥٧ دامەزرابوو، بەهۆی دوودڵی و ڕاڕاییەکانی دەربارەوە هیچپێنەکرا. هەرئەو دوودڵیانە گرنگترین کاریگەرییان لەسەر پێشڤەچوونی بزاڤە شۆڕشگێڕانەکە دانا." ئەزهاری.. گوتی بەهۆی دووپاتکردنەوە و فەرمانی بەردەوامی شا سەبارەت بە خۆپاراستن لە کاری توندوتیژیی، حکومەتی سەربازیی بووە ناوێکی بێناوەڕۆك و توانای ڕاگرتنی بارودۆخی لێزەوتکرا.[14] سەبارەت بە ئەزموون و سەربەخۆیی کاری سوپا،

ئارتەشبەد تۆفانیان لە دانیشتنی ئەنجومەنی سەرکردایەتی سوپا رایگەیاند: "ئێمە تەمەنێك خەباتی سیاسیمان نەبوو. هەنووکە من شارەزانیم[١٥]" لە ٢٦ی مانگی دی ١٣٥٧ دوای رۆیشتنی شا لە ئێران، ئیدی پشتوپەنای سوپا رووخا. ژەنراڵی ئەمریکی( هایزەر) بەمەبەستی بەرگرتن بە پاشەکشەی سوپا، رەنگیشە بۆ رێکخستنی کودێتایەکی سەربازیی، سەردانی ئێرانی کرد. دوای ئەوەی شا ئێرانی بەجێهێشت دەنگۆی ئەوە بلاوبوویەوە کە ئەگەری دەستوەردانی راستەوخۆی سوپا لە دژی کابینەکەی (شاپوور بەختیار) هەیە. هەرچەندی شا بەرلەوەی بڕوات چەند راسپاردەیەکی بە مەبەستی جلەوگرتن لە کودێتا بەجیهێشتبوو.[١٦]

هایزەر لەیاداشتەکانیدا دەڵێت ئەگەرچی سەرکردەکانی سوپا هەمیشە باسیان لە کودێتا دەکرد، بەلام لەبارەی چۆنێتی ئەنجامدانیەوە هیچیاننەدەزانی. سەرکردەکانی سوپای ئێران بەتەواوی داماو و بێتوانا بوون)،[١٧] دوای رۆیشتنی هایزەر لە ئێران لە ١٥ی بەهمەنی ١٣٥٧ هەستی بێتوانایی لەنێو سوپادا گەیشتە ترۆپك. لەلایەکیدیکەوە ئەنجومەنی شۆڕش بۆ کێشکردنی یارمەتی یا لەناوبردنی سوپا دەرکەوت. هەندێك لە سەرکردەکانی سوپا کە پشتوپەنایان نەبوو، دەیانویست بێلایەن بن. بە گوتەی قەرەباغی سوپاپورد موقەدەم سەرۆکیساواك، سپابورد (روبەیعی) سەرکردەی هێزی ئاسمانی، سەرلەشکری چالاکیی فەرماندەی گاردی شاهنشهایی و سەرلەشکر مەولەوی بەڕێوەبەری پۆلیسی تاران پشتیوانی خۆیان بۆ شۆڕش رایگەیاند.[١٨] دواجار لە ئەنجامی ئەو هەلوێست و هەنگاوانەدا شورای فەرماندەکانی سوپا لە ٢٢ی بەهمەن و ١٣٥٧ بڕیاریدا کە ئالآی سپی لەبەرامبەر شۆڕشدا هەڵبکات و لەئاکامدا سوپا بێلایەنی خۆی راگەیاند.

**هەندێك ناو کە لەوتارەکەدا هاتووە، وەرگێڕی کوردی ئامادەیکردوە:**

- ئیفرین، ئەحمەد کەنعان (١٩١٧ ـ) حەوتەم سەرۆکی تورکیا. ساڵی ١٩٨٠ دوای کودیتایەك هاتەسەر حوکم. ساڵی ١٩٨٢ بە هەڵبژاردن بووە سەرۆکی تورکیا

- ئەلیکسەندەری ١(١٩٢١ ـ ١٩٣٤) پاشای یۆگۆسلاڤیا لە شاری مارسیلیای فەرەنسی کوژرا.

- ئەفەندی: نازناوێکی تورکییە و لە وشەی (ئەفناس)ی یۆنانییەوە وەرگیراوە کە مانای (کاك)ی کوردی و ( Monsieur) فەرەنسی و ( Mister)ی ئینگلیزی دەگەیەنێت. دواتر لە جیهانی عەرەبیدا بە فەرمانبەرانی حکومەت دەوترا. لە سەردەمی فەرمانڕەوایی عەلەوییەکاندا لە میسر ئاماژەبوو بە (والی)، چونکە خدێوی بە (ئەفەندییەکەمان) بانگدەکرا.

- بسمارك (ئۆتۆ ڤۆن) ١٨١٥ ـ ١٨٩٨ سیاسییەکی ئەڵمانی بوو، هەوڵی یەکگرتنی ئلمانیای دەدا.

دوای سەرکەوتنی ئەڵمانیا بەسەر فەرەنسا لە ساڵی ١٨٧٠دا بووە راوێژکاری ئەڵمانیا. لە سەردەمی ئەودا وڵاتەکەی بووە هێزێکی گەورەی ئەوروپا دەوڵەتێکی ئیستیعماری.

- بریگاد: گروپێکی چەکدار کە لە چەند مەفرەزەیەك پێکهاتووە.

- پیرۆن، خوان(١٨٩٥ ـ ١٩٧٤) سەرۆککۆماری ئەرژەنتین لە ساڵی ١٩٤٦ بۆ ١٩٥٥. ئیڤا دوارتەی هاوسەری کاریگەری زۆری لەسەر سیاسەتکانی هەبوو. دوای لەسەرکارلابردنی چووە ئیسپانیا. ساڵی ١٩٧٣ گەڕایەوە بۆ سەر کورسی دەسەڵات. دوای خۆی (ئیزابێل) هاوسەری سێیەمی جێیگرتەوە کە لە ساڵی ١٩٧٦ دا سوپا ئەویشیان لەسەرکارلابرد.

- سامۆرا: چینێك لە ئاغاواتی شەڕکەری ژاپۆنی بوون لە سەردەمی دەرەبەگایەتیدا.

- رایشتاگ: پەرلەمانی ئەڵمانیا لە سەردەمی ئیمپراتۆرییەتدا، بیناکەی لە بەرلین بوو، ساڵی ١٩٣٣ سووتێنرا.

- فالانژ: ناوی رێکخراوێکی فاشیستی و نیمچە سەربازییە کە لە ٢٩ی تشرینی یەکەمی ١٩٣٣ لەمەدریددا دامەزرا. فالانژی ئیسپانیا لە شەڕی ناوخۆی ئیسپانیادا (١٩٣٦ ـ ١٩٣٨) لە شەڕکردن لەگەڵ هێزە چەپ و راستڕەوەکانیدیکەی ئیسپانیادا ( کۆمۆنیستەکان، ئانارشیستەکان و کۆنەپارێزان) رۆڵێکی گرنگییان هەبوو. سەرچاوە فەرهەنگی سیاسی، ئامادەکردنی زاهیر محەمەدی و یاسین حاجی زادە. چاپخانەی رۆژهەلات ٢٠٠٦ ل،٦٣٦و ٦٣٧.

- ڤایمار: کۆماری ئەڵمانیا ساڵی ١٩١٩ تا ساڵی ١٩٣٣ ، دوای شکستهێنانی سپارتاکییەکان ( سۆسیالیستە چەپەکان) لەلایەن ئەنجومەنی دامەزرێنەری نیشتمانیی ئەڵمانییەوە لە شاری ڤایمار، دامەزرا.

- فرەدریکی گەورە دووەم: ١٧١٢ ـ ١٧٨٦ پاشای بروسیا ساڵی ١٧٤٠، پیاوێکی سەربازیی و ئیداری بوو. لە شەڕی حەوت ساڵەدا بەڕووی هاوپەیمانێتی فەڕەنسا، رەسیا و نەمسا وەستایەوە. بەهۆی فراوانی رۆشنبیریی و کرانەوەی بەڕووی فەلسەفە و ئەدەبدا نموونەی زۆرداری رۆشنگەربوو.

قۆزاق: هێزێکی چەکداری تایبەتبوو لە ئێران لەنیوە دووەمی سەدەی پێشوودا.

- میجی تینۆ یا مۆتسۆهیتۆ (١٨٥٢ ـ ١٩١٢) ئیمپراتۆری یابان لە ١٨٦٧. رژێمی دەرەبەگی هەڵوەشاندەوە و دەستوری دانا. شارستانێتی خۆرئاوایی بردە ژاپۆن. ساڵی ١٨٩٥ بەسەر چین و ١٩٠٥ بەسەر روسیادا سەرکەوت.

- ناپلیۆن پۆناپارت ١٧٦٩ ـ ١٨٢١ ئیمپراتۆری فەرەنسا لە ١٨٠٤ تا ١٨١٥ لە شاری ئەجاکسیۆ لەدایکبووە. لە جەنگەکانی ئیتاڵیادا ناوبانگیدەرکرد.ساڵی ١٨١٤ لەسەرکارلابرا و دوورخرایەوە بۆ دوورگەی ( ئیلبا). پاش چەند مانگێك گەڕایەوە پاریس. وڵاتانی ئەوروپا لە دژی ئەو یەکیانگرت و

ساڵی ١٨١٥ له شەڕی واترلۆدا دۆڕاندی، پاشان دوورخرایەوە بۆ دورگەی ( هیلانە).
- ناپلیۆنی سێیەم ١٨٠٨ ـ ١٨٧٣ ئیمپراتۆری فەڕەنسا لە ١٨٥٢ بۆ ١٨٧٠، دوای ئەوەی لەجەنگدا بەرامبەر ئەڵمانیا دۆڕانی لەسەرکارلابرا.
*) دەسەڵاتی بەعسیش وەك نەریتێکی فاشیستیانە لە کاتی فەرمانڕوایی خۆیدا سوپای میللی ( الجیش الشعبی) دروستکرد کە سەرجەم کۆمەڵگای چ لە فۆرمە مەدەنییەکەیدا و چ لە فۆرمە چەکدارییەکەیدا میلیتاریزەکردبوو. و. ك.

•••

## سەرچاوەکانی نووسەر:


١.A Vagts, AHistory of Militarism
٢. R.Goodwin ,"The National Security Establishment", in American Militarism, edited by E. Knoll and J.McFadden,(New York,1969),p.17.

٣.H.Laswell,"The Garrison - State Hypothesis Today", in Changing Patterns of Military Politics, edited by S.Huntigton(New York,1962),pp.51 – 70.
٤.Marx and Engels, Selected Works.vol.1.p605, vol.2 .p. 33.
٥.S.E.Finer,The Man on Horseback:The Role of the Military in Politics.(London, Pall Mall Press,1962) ,pp. 6- 22.

٦. Lbid.pp 35 - 39
٧.Lbid.pp.40- 43.

٨. Lbid.pp.43- 47.
٩. Lbid.pp.47- 56.

١٠. Lbid.chaps,7,8,9.
١١. ئیبراهیم یزدی، اخرین تلاشها در اخرین روزها، تهران، قلم ١٣٦٣، ص ٢١٠ ـ ٢٠٨
١٢. ویلیام سولیڤان، ماموریت در ایران، ترجمه محمود مشرقی، تهران، انتشارات هفته، ١٣٦١، ص ١١٩.
١٣. عباس قرباغی، اعترافات ژنرال، تهران نشر نی ١٣٦٥،ص ٣٦.
١٤. سولیڤان، سەرچاوەی پێشوو،ل ٥٠ ـ ١٥٠.
١٥. میل برف اب خواهیم شد. تهران، نشر نی ١٣٦٥،ص٢٤٤.
١٦. قەرەباغی، سەرچاوەی پێشوو،ص ١٥٣.
١٧. رۆبرت هایزر، ماموریت در تهران، ترجمه عبدالرشیدی، انتشارات اطلاعات، ١٣٦٥،ص٦٨.
١٨. قەرەباغی، ل ٣٥٦.


**سەرچاوە:** جامعه شناسی سیاسی، نقش نیروهای اجتماعی در زندگی سیاسی. دکتر حسین بشیریه.

# چەند یاداشتی بێمانا

## "کارکرد"و "گەمە" کانی زمانن
## "زمان تەنیا ئاڵای سەدەی "٢٠"ە باوان!"

**ساڵح سووزەنی**


ساڵح سووزەنی

دوای بڵاوبوونەوەی بەشێك لە شیعرەسات بوو كە دەنگ و هەرا بەرزبۆوە كە زمانی كوردی دەشێوێنن، ئەدەبی كوردی دەفەوتێنن، زمان نازانن و ئێلە و بێلە.. و هەمان شەڕەقەڵەم كە كاتی خۆی لەگەڵ سەلەفییەتی چەقەخانەیی هاتەئارا و هۆگرانی ئەدەب ئاگاداری هەن و بەدوای هەڵسوكەت و كوژانەوە و داگیرسانەوەی جاروبار.. باسەكە درێژەیدەبوو و دادەمركایەوە.. دوایی "بە عیجە و فینجەوە چ شار" دیسانەوە دەنگوهەرا بەرزبووەوە كە شیعریان بێمانا كردووەتەوە و كەس لێیحاڵێنابێ و نموونەی كاری وا لەجیهانا نییە و.. هەندێ لەو دۆستانە دووجار لە گوتەی خۆیان پەشیمانبوونەوە و ددانیان بەوەدانا كە نوێخوازی دەبێ بەردەوامبێ و هیچ تكنیك و دەرەتانێ موڵكی باوكیی كەس نییە و بەكارهێنانی ئەو گەمە و دەرەتانانە نەك هەر خەسارێك لە بەرژەوەندی زمانی كوردی نادا، بەڵكو دەیخاتە گەشەونەشە، بەڵام دیارە ئەو كێشمەكێشمە ئاوەها بە سانایی كۆتاییناییێ و هەنێ لە دۆستان ئامادەی وەرگرتنی هەنێ لەو دەرەتانانە بۆ زمانی كوردی نین.. ئەوەش ناگەڕێتەوە بۆ وڵات و ئەدەبی مە، بەڵكو لەهەموو جیهان بەربەرەكانێی بەرەی ترادسیۆن و نوێترخوازانە.. تكایە بڕواننە "حەقیقەت و رەخنە"كەی رۆڵان بارت وەك نواندنەوەی ئەو هێرش و بەرەنگاریكردنانەی رەخنەی كۆن و نوێ لە نەوەكانی ئەوروپا..

لای خۆیشمان هاتنەئارای، زمانییەتی شیعر، ئانارشیسمی شاعیرانە، گەمەكانی زمانی و لادان لە نۆرمی زمانی باو، لافاوی زەین، چەند دەنگییبوونی دەق، هارمۆنیای مۆسیقای

دەروونی دەق و زۆر فۆرمیدیکە دەبێ کاریی تیئۆرکی لەسەربکرێ و زێدەتر شرۆڤەکرێ و.. بۆئەوەی سەقامگیربێ و ئەوەندە بەرهەڵستی نەبنەوە و.. هەربۆیە بەپێویستمزانی سەرلەنوێ بەپێی توانا ئەو گوتارانە بێنمەوە ناوباس و شرۆڤە و تاوتوێکردن و بەو مەبەستە زنجیرە باسێکیدیکە ئاراستەبکەم بەڵکو هاندەرێکبێ بۆ خوێنەرانی دەقی بەڕۆژی کوردی و وەڵامێکبێ بۆئەو پرسیارانەی هەنێ لە دۆستان ئاراستەیدەکەن.

بەرلەوەی باسەکەم دەستپێبکەم حەزدەکەم چەند نموونە دەق بهێنمەوە:

"دەڵێم بڕۆم لە شارەکەت، لە شاری چاو لەبەر چرای نیئۆن شەوارەکەت.."

".. دەلادە لادە لادە لەچکە کەسکە تەسکەکەت.."

"من چۆلەکەی باڵشکاوی وەرزی رەشی گەردەلوولم

" ئاگر هانێ باڵەکانم پێیهەڵفڕە.. لەوبەر جەنگەڵ لە تاریکایی دەستی تالای خودا چووە.."

"هەور: کامێرا/ برووسکە: فلاش/ نمنمەی باران/ بۆ شووشتنەوەی.. دڵی منیش قاپ"

"عایشە دەڵێن: ژنان بێترس لەبەر باران رووتئەبنەوە/ دڵدارەکان لەسەر شەقامەکان/ تێرتێر ماچی یەکترئەکەن.."

"بەچ مۆسیقایەك دەنوێ فەرخەماسی؟/ لەچی ناسڵەمێتەوە مامزێکی تەنیا.."

"چ هێرشتان باقیماوە: / دیوار خاچ!

ژیان کەروێشکەی مەزراکانی خەونە/ لە کیشوەری داسا"

شاعیرم/ تاویشکە ساڵی هەمیشە/ تاکو دلۆپەی شیتنوێتی بۆ کەربەلا.. کە من بم-مەسیحێك عاشقی هەمیشەی خاچیسوور/ کە من بم مێژوویەك بۆ دڕك و تەنیایی.. "

زمان لەم دەقانەدا بەئاشکرا لە خزمەت سازکردنی وێنەدایە واتە شاعیر شێعر لەڕێگای وێنەوە پێناسەدەکا (باجارێ باسی کێش نەکەین)و بۆ تێگەیشتن یان چێژوەرگرتن لەم دەقانە خوێنەر دەبێ هەست بەو وێنانە بکا و هەوڵبدا لە زێهنی خۆیدا بیانکێشێتەوە: لەناو ئەو سیستەمە نیشانەییەدا هەر "دال"ێك بۆئەوە دێت کە مەدلولێك وێنابکا.. باچەند نموونە دەقیدیکەش بهێنینەوە:

"ئەگەر شێتی چاوی سەرمابردووی رۆح و بەزمی ئەستێرە هەمووی مۆسیقای شەوانە..

" ناترسم لەم دێڕەدا کە وشەکانم دابکەنم/ پاڵتاوەکەم بە حەرفێکەوە کەوایە هەڵواسم "شەڕ"ی

ناو ئەم دێرە: بە شێنەوە دەستپێدەکا و بە "ڕێ"وە کۆتاییدێ..
"شیری بازاڕی بێدەرگا/ حەیای رووتە و / فریام"ناکەوێت"ە رێ..

لێرەدا خوێنەر ناتوانێ بۆ چێژوەرگرتن بەدوای وێناکردندا بێ، بۆ وەی "شێتی چاوی سەرمابردووی رۆح" یان "لەدێڕێکدا کە وشەکانم"و "فریامناکەوێتە رێ"

هیچ وێنەیەکی جیهانی واقیعییان لاناخولقێنێ.. بۆوەی شاعیری شێعری بەپێی وێنە پێناسەنەکردووە و دەقەکانیش لەڕاستیدا بەدوای ئەو چەشنە دال بۆ مەدلولەوە نییە.. کەوایە ئێمە لەگەڵ دوو جۆرە پێناسە رووبەڕووین لە زمانی شێعریی.. یەکەمیان زمان بەپێی وێنە پێناسەدەکا و دووهەمیان زمان بەپێی گەمە و کارکردن..

من لاموانییە ئەم پۆلێنکارییە ویتگونشتاین کردبێتی بۆوەی دەسەڵاتی وێنە و شەمایل و شبهی واقیع زۆر لە ئەفلاتونیش کۆنترە.. و زۆرینەی ئوستوورەکانی جیهانی لەڕێگای وێنەسازیی لە جیهانی واقیعەوە دەهاتەنواندن و دەربڕین.. بەڵام ئەوەی راستیبێ ئەوە ویتگونشتاین بوو کە لە دوو قۆناغی جیاوازیی ژیانی خۆیدا بەوردی ئەو دوو گریمانەیەی شیکردەوە و فەلسەفاندیی..

وەك ئاگادارین ویتگونشتاین (فەیلەسووفی ئوتریشی) سەرەتا لەکتێبێکدا بەناوی "رەسالەی مەنتەقی - فەلسەفی" داکۆکیدەکا لە بیرۆکەی مانا لەڕێگای وێنەوە.. دواتر لە کۆڵ فەلسەفە دەبێتەوە و.. دوای ماوەیەکیدی بە بڕوایەکیدیکەوەوە دەگەڕێتەوە.. کە حاسڵەکەی دەبێتە کتێبی "لێکۆڵینەوەی فەلسەفی"و لەو کتێبەدا بەشێوەی کارکرد و گەمەکانی زمان لەهەموو مانا و چەمکێك دەڕوانێ.. لە قۆناغی یەکەمدا ویتگونشتاین مانا بە وێنەیەکی زێهنی پێناسەدەکا.. ئەو لە ناوەکانەوە دەستپێدەکا و دەڵێ کە "مانای هەر ناوێك شتێکە کە ئەو ناوە بەسەریەوەیە و جیهان پڕە لەو شتانە".. ویتگونشتاین لایوایە وەڵامدانەوە بەو پرسیارە کە: ئەو شتە چییە؟ کاری فەیلەسوف و فەلسەفە نییە.. ئەوە کاری زانستە.. و بەوچەشنە فەلسەفە لە زانست جوێدەکاتەوە.. لەم بڕگەیەدا ویتگونشتاین لایوایە "زمان، جیهانی خۆی دەنوێنێتەوە و هەر دێڕێك وێنەیەکە لە دۆخێکی گونجاو" هەربۆیە ئەگەر وێنەیەك کە زمان، لە جیهان ئەیدابەدەستەوە، لەگەڵ دۆخێکی دیاریکراو و گونجاو تەبایی هەبێ، ئەو دێڕە مانای خۆی هەیە و ئەگەر ئەو وێنەیە لەگەڵ هیچ واقیع یان دۆخێکی هەبوودا نەخوێنێ (تەبانەبێ).. ئەوە

بێمانایه، یانی لای ویتگونشتاین له قۆناغی "ڕەساله.."دا، زمان سیستەمێکی وێنەییه له جیهان و هەر دێڕێك دەبێت وێنەیەك بێت له دۆخێکی گونجاو، ڕێزمان (سینتاکس)ی زمانیش ڕێگەگەل گونجاوه بۆ تێکەڵکردن و سازکردنی پێکهاتەی مانایی وشەکان (یان ناوەکان)و کاریی فەلسەفەش ئاشکراکردنی سیستمی ئەو زمانەیه و بەدەستەوەدانی ڕێزمانەکەی و دوای ئەوه ئیتر فەلسەفه بەکەڵکی هیچ نایەت و "وەك پەیژەیەك که بەسەریدا سەرکەوتوویت" دەبێ فڕێبدرێ.. دەبینین که لەم بۆچوونەدا زمان و فەلسەفه بۆ نواندنەوەی واقێعی شتەکان هاتوون و جگەئەوەی لا بێمانایه.. ئیدیالیسم لەم پێناسەیەدا نایەتەماناکردن و چەمکگەلی وەك ئەخلاق و جوانیناسی و ئایین و..یش هەروەتر.. باوەکو لەو قۆناغەدا ویتگونشتاین فەلسەفه و زانستی لێکجویێدەکردەوه، بەڵام هەموو هەوڵەکانی ئەو بەڕاستی زانستیی بوون بۆ دەرخستنی مانا و هەربۆیه "ڕەساله" زۆرترین شوێنپەنجەی لەسەر "بازنەی وییەن"و پوزیتیویسته مەنتیقییەکان دانا که ئەوه ڕەنگه باسەکەی ئێمه نەگرێتەوه، بەڵام دڵنیام وێنەیی دیتنی مانا لای ویتگونشتاین زۆرترین کارتێکردنی بووه لەسەر ئیماژیسته مۆدێرنیستەکانی ئەوکاتی ئەورووپا.. که ئەوەش ڕەنگه له شوێنی خۆیدا بێینەوەسەری یان وەك ویتگونشتاین دەڵێ بائیتر فڕێیدەین..

له بڕگەی دووهەمی فەلسەفاندنی چەمکەکاندا ویتگونشتاین ئیتر له کۆڵ مانا بووەتەوه و پەرژاوەتەسەر مانا وەك کارکرد و گەمە زمانییەکان ( Language game)ئەو لەوه بەدوا بەراوردکردنی زمان و بابەتی مرۆڤاتیی بەپێی زانست، بەگشتی ڕەفزدەکاتەوه: "فەلسەفه هیچ یەك له زانسته سروشتییەکان نییه" (گوزارەی ٤/١١١ لێکۆڵینەوەی فەلسەفی) له گوزارەی ١٠٩ی لێکۆڵینەوی فەلسەفیدا دەڵێ:

"فەلسەفه خەباتێکه دژ به سیحر و جادووکردنی فام (شعور)ی ئێمه لەڕێگەی زمانەوه" ئەو ئیتر لایوایه که "چەمکگەل فەلسەفی بابەتگەل ئەزموونی نین، بەڵکو لەڕێگەی کارکردیی زمانەوه دێتەچارەسەریی.. ئەویش به لەونێك که هانمانبدا بۆ پەسەندکردنی کارکردەکانی.." مانای وشه و دێڕ لای ئەو دەبێته کارکردی ئەوان لەناو سیستمی زماندا و بەس لەزماندا دێتەگەڕ و له دەرەوەی زمان نییه..

"له بەندی یەکەمی کتێبی لێکۆڵینەوەی فەلسەفیدا بۆ وێنه دەڵێ: وابزانن کەسێکمان بۆ کڕینی ئەم شتانه هەناردووه و لەسەر قاقەزێك بۆماننووسیوه: پێنج سێوی سوور. ئەو قاقەزەکه دەبا و دەیداتەدەست دووکاندارەکه و ئەویش، که چاوێدەکاتەوه که لەسەری نووسراوه "سێو"

دواجار لەخشتەیەکدا وشەی "سوور" دەدۆزێتەوە و وێنەی ڕەنگەکەی دەبینێ و ئینجا ڕەقەمەکان دەژمێرێ ١،٢،٣،٤ تادەگاتە پێنج و بابڵێین ڕەقەمەکانی لەبەرەو بەپێی هەر ژمارەیك سێوێك (یەك سێو) هەڵدەگرێ و ئا بەوجۆرە لەگەڵ وشەکان هەڵسوکەوتدەکا.. بەڵام هەرگیز نازانێ لەکوێ و چۆن بۆ وشەی سوور بگەرێ و چی لە وشەی "پێنج" بکا؟ بابڵێین ئەو کاری خۆی بەوچەشنە خستووەتەڕێ، بەڵام بەڕاستی مانای وشەی "پێنج" چییە؟ شتی وا (پرسیاری وا) لەئارادانییە. بەس گرینگ ئەوەیە کە بە پێنج چۆن کاردەکەین و چ کارکردێکی هەیە. کابرای بەننا بەئاماژەکردنێك بۆ ئاجوورِ بە بەردەستەکەی دەگەیەنێ کە هەڵدەلو ئەویش ئاجوورێك هەڵدەدا بۆی، بەڵام چۆن ئاماژەدەکرێتە ڕەقەمی "نۆ"؟ یان "درێژایی" بەس لەپێواندا دێتەکارکردن و کەس ناتوانێ وەك وێنە ئاماژەپیبکا.

فەلسەفەی دووهەمی ویتگونشتاین لەسەر ئەم دێرە وەستاوە کە دەڵێ: "بڕوانە و بلێ" واتە بەدوای ئەوەوە بووە کە وشەکان لە کارکردیی مێتافیزیکی خۆیان بهێنێتەوە ناو کارکردیی رۆژانەی خۆیانەوە.. ئەو لە سەرەتای کتێبی "ئاویی و قاوەیی"دا دەپرسێ کە: "مانا چییە؟و خۆی وەڵامدەداتەوە کە زمان سەربەخۆیە، ماناکانی لەناو خۆیدایە.. واتە بۆ تیگەیشتن لە مانا بەس دەبێت هانابەریتەبەر زمان.. مانا نەك نەك هەر لەزێهندا، بەڵکو لە جیهانی دەرەوەش نییە.. و پێوەندیشی بەهیچ دۆخێکی گونجاو و ناگونجاوەوە نییە و بۆ دەرکپێککردنی وشە یان دێڕێك دەبێ بزانین بۆ هاتوونەتە کارکرد؟ ئەوەی کە، ئەو کارکردە بزانێ دیارە ماناکەشی دەزانی.. بانموونەیەك بهێنمەوە کە پێشتر لەوتوێژێکیشدا ئاماژەمپێکردووە:

وشەی خەیار لەم دوو دێڕەدا دوو کارکردیی جیاوازی هەیە: ١. خەیار کیلۆی بە چەند؟

٢. ئەم خەیارە بخەمەناو پاکەت؟ تەنانەت ئەگەر دەوری خەیار لە هاونشینی لەگەڵ پاکەتدا بگۆڕین کارکردەکەی دەگۆڕدرێ: پاکەتی خەیارەکە کوا؟ ساویلکەییە ئەگەر کەسێك ئەو دوو خەیارە بە یەك مووتیڤ ببینێ.

ویتگونشتاین دەڵێ: "ئێمە ئەو شتە بە گەمەی زمان دەزانین کە لە ژیانی مرۆڤدا دەوری تایبەت دەگێرێ.. سەیر ئەوە بزانین کە ئەم پێناسەیەی لە گەمەی زمان، دوای پرسیارێك سەبارەت بەداهێنانی هونەریی دێنێتەئارا:

"ئەگەر کەسێك، ئاسمان سوور و گەڵاکان ئاویی بکێشێ، شتێکی کێشاوە؟ وەڵامەکەی ئەوەیە کە ئەرێ *! بەپێی ڕێساگەلێکی نوێ، لە گەمەیەکی نوێدا شتێکی کێشاوە!"

جەختكردنی ویتگونشتاین لەسەر دەوری تایبەتیی گەمەی زمان لەژیاندا. دەوری كاركردیی زمان گرینگتر دەكاتەوە. هەركەس دەتوانێ گەمەیەك سازبكا بوەی ئەزموونی خۆی یا ئەزموونی دەروونیی خۆی پێدەربڕێ.. ویتگونشتاین دەڵێ: "ئەو دەنگەی كە كەس تێیناگا و من وادەزانم تێیدەگەم، دەتوانێ گەمەیەكی شەخسی بێ. گەمەی زمان پێوەندیی دەخاتەنێوان هەموو گەمە شەخسییەكان و گرینگی چەمكی كاركردی زمان یان چۆنیەتی بەكارهێنانی زمان لەوەدایە:

"یك قصه بیش نیست غم عشق و زین عجب
از هر زبان كه می شنوم نا مكرر است" حافز

ئەوەی باشتر بتوانێ لەناو ئە گەمانەدا یاریبكا دیارە باشتر لە كاركردیی زمان تێگەیشتووە و ئەگەر گەمەكە بە یاری فوتباڵ دیارییبكەین و شتەكان بە تۆپەكە.. ئاشكرایە دەوری ئەو تۆپە لەهەر خاڵێكی یارییەكەدا و بەدەست هەركام لە یاریزانەكانەوە دەگۆڕدرێ و یاریزانێكی وەك پلە، مارادۆنا، رۆناڵدۆ، مێسی و.. وەك ئەو كەسانەی كە زێدەتر شارەزای گەمەكە و كاركردیی تۆپەكەن.. دیارە باشتریش "شوت" دەكەن و رەنگە لەڕێسا و یاساكانیشی تێپەڕێنن.

ویتگونشتاین دەڵێ: "ئەگەر بمانهەوێ لێكۆڵینەوە بكەین، سەبارەت بە كاری منداڵێك كە خەریكی فێربوونی زمانە، لەڕاستیدا خەریكی لێكۆڵینەوە لەسەر گەمەیەكی زمانیی تایبەتین.. كاتێك ئۆگۆستین باسی فێربوونی زمان دەكا لە بیرەوەرییەكانی خۆیدا دەڵێ: "هەوڵمدەدا ئەمئەوەیی (این همانی) بخەمەنێوان وشە و شتەكان.." ویتگونشتاین دەڵێ: لەوێدا ئێمە بەس رووبەڕووی گەمەیەكی زمان بووینەتەوە، ئەویش ئەوەیە كە لامانوایە هەر گوتەیەك مانایەكی تایبەتی هەیە، بەڵام دوای ئەوەی فێر "دەلالەتی كاركردیی" ئەو گوتەیە دەبین، دەزانین كە هێشتا توانایی كاركردییەكانی ئەو گوتەیەمان بەگشتی نەناسیوە.. بۆوەی هەر ئەگەرێكی بەكارهێنان (كاركردی) گەمەیەكی نوێ سازدەكا.."

باپێكەوە بڕوانینە كاركردیی وشەی "پەنجەرە" بۆ وێنە لە دوو دەقی جیاوازدا:

"تەوژم و تین ئەگەرا/ ئەگەرا نوتفەدانی پەنجەرەکان/ وەماڵی بێزگوزا/ پڕنەبوو/ لە بۆنی بەهار" خۆشەویستەکەم/ لە پەنجەرەی نیوە تاکی بوومەلێڵەوە/ چاوی من لە دیمەنی کچی بەیانییە/ لە حەنجەرەی زەمانەوە/ گوێم لە زەمزەمەی زوڵاڵی خیزە وردەکانی کانییە.. "سوارە"

بەسووکە ئاوڕێك لە کارکردیی وشەکان لەناو دوو دێڕ و بەستێنی زمانیی جیاوازدا دەردەکەوێ کە ناتوانین وەك یەك مووتیڤ دیارییان بکەین. لە دەقی یەکەمدا پەنجەرەکان: أ. زیندوون ب. خوازەن ج. کۆن (نەك تاك) د. ئاکتیون و پشت دەق دەمانبا بۆ بەهار و زگوزا و تەنانەت جنس.. واتە پەنجەرە کارکردێکی ژنانەیی هەیە:

"یك پنجره كه مثل حلقەی چاهی، در انتهای خوّد به قلب زمین می رسد" فروغ

بەڵام هەمان وشە (پەنجەرە) لە دەقی دووهەمدا، أ. شت (شیء)ە ب. ئاکتیونییە، راستە پەنجەرەی بوومەلێڵ "ئیزافەی خوازەییە، بەڵام ئەوە بوومەلێڵە کە جەختی لەسەرکراوە. "پەنجەرە" دەوری "حەنجەرە" دەگێڕی لە دێڕی دواییدا. ج. تاکە د. لە پشت دەقەوە دەمرێ یانی ئەگەر رووبەری یەکەم و دووهەمی دەق هەڵدەیتەوە پەنجەرەی تێدانامێنێ:

رووبەری دەق (توێ مانایی یەکەم): بوومەلێڵە (رووناکییەکەی لەوەدەچێ پەنجەرەیەك نیوەتاك کرابێتەوە) ماتڵێ بەیانیم..

توێی مانایی دووهەم: لە بوولێڵی خەباتی بەرەو رووناکییدا گوێم لە زەمزەمەی رەوتەکەیە (کەوایە، لێرەدا پەنجەرە کوا؟ رەنگە ئەم دوو شێعرە شێوەی یەك بدەن بەڵام یەك مووتیڤ نین.

پەنجەرە لە شێعرەکانی فروغیشدا بەرەبەرە لە شتەوە بەرەو "خودێك رووبە زانست و روانین و بێدەنگی دەروون و ژنانەیی دەگۆڕدرێ.. لە ئەسیر"دا (واتە سەرەتاکانی کاریی شاعیریی فرووغ) پەنجەرە رەنگە هەمان کارکردیی پەنجەرەی هەبێ:

دختر كنار پنجره تنها نشست و گفت ای دختر بهار حسد بی برم به تو".

واتە شت یان کەرەستەیەك بۆ پێوەندیی (دیتن و تەنانەت بیستن..)، بەڵام لە قۆناغی دووهەمی دەقەکانی فرووغدایە کە مووتیڤی سەورەکی پەنجەرە (بە ٥٠ جار فرەهات (بسامد)ەوە لە دیوانگەلی: زایینی سەرلەنوێ" ئیمانبهێنین بە دەستپێکی وەرزی..") دەبێتە ئەو مووتیڤەی کە رەخنەگران لێیدەکۆڵنەوە:

" يك پنجره براى من كافى است/ يك پنجره به لحظة اگاهى و نگاه و سكوت"
(پەنجەرەيك بۆمن بەسە/ پەنجەرەيك بەرە و ساتى زانست و روانين و بێدەنگى)

لەم خوێندنەوەدا ئيتر پەنجەرە بەس بۆديتن نييە:

ميان پنجره و ديدن هميشه فاصله هست.. چار نگاه نكردم"
(لەنێوان پەنجەرە و بووندا بەردەوام مەودايەك هەيە/ بۆ نەمڕوانى؟)

بە گشتى فرووغ پەنجەرە وەك ژنانەيى يان خودى كچەكە دەئافرێنێ.. و دەيكاتە دڵى زەوى و لەوێوە دەيكاتەوە "بە سوى و سعت اين مهربانى مكرر ابى رنگ.. (بەرەو پانتاى ئەم دلۆڤانييە بەردەوامە رەنگ ئاوييە..)و زگوزا لەمبەروئەوبەرى پەنجەرەكەيدا بيچمدەگرێ:
سال دگر وقت بهار با اسمان پشت پنجره همخوابه مى شود، و در تنش فوران مى كنند... فوارهاى سبز ساقەهاى سبكبار شكوفه خواهەد داد.. (ساڵێكيدى كاتێك بەهار و ئاسمان لەپشت پەنجەرەكەدا تێكدەئاڵێن و دەفيشقێنێتەناو گيانى، فوارەى سەوزى ساقەتى ئێسكسووك گڵۆوك دەگرن..)

با لە باسەكە لانەدەين. "گەمەكانى بەگشتى وێكچوو نين، بەڵام هەنێ وێكچوونييان تێدابەديدەكرێ، شتێك وەك شێوەكردن لەناو ئەندامانى بنەماڵەدا.." بۆ وێنە رەنگى شێعرى كلاسيكى وەك گەمەيەكى تايبەت بەبۆنەى "عەرووز و بەديع و قافيە" وێكچوو بنوێنن، بەڵام ئەگەر لێيانوردببيتەوە دەبينى كە زۆربەيان عەرز و ئاسمان جياوازييان هەيە و لەئەنجامدا، وشەكان هەرگيز بەس كاركردێكييان نييە، ئەوان لە گەمەگەل زمانيى جياوازدا ماناگەل نوێتر دەدەنبەدەستەوە:

شيرەيى جانە وتم يا مەيە؟ چابوو فەرمووى
عكسى لەعلى لەبى مەرجانە لەفنجانمدا

بڕوانن گەمەیەك كە نالی بە "شیرە"و "چا" دەیكا بۆ دواخستنی ماناكان و گۆڕانی مووتیڤە سەرەكییەكانیان و.. یان:

".. زەفافەتگاهی پەردەی ئاڵی چاوم
موبارەك حەجلەبێ بۆ بووك و زاوا

لەم گەمەیەدا نالی بە هاونشینكردنی "چاوم" لەگەڵ "زەفافەتگاهی پەردەی ئاڵ" یاسای گەمەكانی پێشوو دەشكێنێ و دەیكاتە مووتیڤێكیدیكە، واتە خوێنەر تانەگەیشتووەتە وشەی "چاوم" وێنەیەكی تەواو جیاوازی لەزێهندا دروستكردووە و كە دەگاتە ئەو وشەیە لەناكاو لێیدەڕووخێ و ئیتر بەخوێندنەوەی دێڕی دووهەمیش "موبارەك حەجلەبێ بۆ بووك و زاوا" بۆی ناچێتەوە سەریەك.. ئەمەیە گەمە و كاركردی زمان..

دەقی نالی نموونە وای (گۆڕینی مانا سەرەكییەكان زۆرە)..+

ئەم بۆچوونانە دواجار شوێنپەنجەیان لەسەر كەسانی وەك دریدا و لویتار و.. پاشمۆدێرنخوازەكان زۆربوو.. كە لەم وتارەدا جێینابێتەوە.

ئەگەر شێعریش وەك سیاسەت و زانست و هونەر و بابەتگەلی كۆمەڵایەتی بەیەكێك لەو گەمەگەلە بزانین، دیارە بەهۆی مەیدان دان بەئەوپەڕی وانواندنی زمان گەمەكەمان بەردەوام نوێ و نوێتردەبێتەوە و كاركردی وشە و دێڕ زێدەتر و خێراتر دەگۆڕدرێ و ماناگەلی پێشووش لەگەڵ خۆی دەگۆڕێ.. هەربۆیە كاتێك نالی لەبری هەڵبژاردنی "كۆد"ێكی نیشانەیی لە سێ كۆدی (زمانی فارسی و عەرەبی و كوردی) كەڵكوەردەگرێ ڕێساكان دەگۆڕێ و بەهێزتر لە تۆپی گەمەكە دەسرەوێنێ و شێعرەكەشی تاعەرش دەگەیەنێ.. من پێشتر باسی "نالی و یارییە زمانییەكانی ویتگونشتاین"م كردووە و نامهەوێ دووپاتیانبكەمەوە، بەس دەڵێم ئەگەر ڕۆژێ لە ڕۆژان شاعیرێك هەنێ لەڕێساكانی پێش خۆی گۆڕی و هەوڵی سازكردنی گەمەیەكیدیكەیدا.. زۆر لێیتووڕەمەبن.. لەمێژوودا ئاساییە ئەگەر دابێ گەمەكان بگۆڕدرێ.. بۆوەی نوێخوازیی بەردەوامە و بەپشتبەستن بە ریفۆرم و شۆڕش و وێرانكردنەكانییەوە بەناوبانگە!

●●●

**سەرچاوەکان:**


١. ویتگونشتاین، لودویك، پژوهشهای فلسفی، ترجمه فریدون فاگمی، نشر مرکز، ١٣٨٠.
حقیقت و زیبایی - مقاله هنر به عنوان شکلی از زندکی - بابك احمدی -
"نگاه کن و بگو" چیا موحد
ویتگونشتاین و نظریة معنا، امنه غروری


٢. باسی جیاوازیی ئەو دوو چەشنە گەمەیەم لە وتاریی "لەگەڵ شەپۆلەکانی شێعریی نوێی کوردی"دا کردووە.

\+ = تیری موژگانت لە سینەمدا دەچێ بۆ **پیری دڵ**

هێندە کەچ رەفترە قەستی **خانەدانێ دڵ** دەکا

....

چاوی من **بەحری موحیتی** تۆیە بۆ دەفعی گەزەند

لێت موعەییەنبێ کە نالی گوڵ بە دڵ پەرژیندەکا

....

ئەی واعیزی بارید چییە هەر وەك هەرەسی کێو

بەو وەعزە کە بایە هەموو، هاتوویی **بەسەرما**

...

بێ سەروی رەوانم، کە لەبەر ئەشکی رەوانم

خەرقە بووەتە غەرقە **کەوا** سەوزە لەبەرما

# پێویستە ئێلبەگی جاف
# وەك پێشبینیناسێکی سەدەکانی پێشوو بناسرێت

دانا تۆفیق جاف


ئێلبەگی جاف

نەتەوەکانی ئەمرۆی گۆی زەوی وەک شانازییەک باس لە کەسایەتییەکانی خۆیان هەڵکەوتوو لە بوارە جیاوازەکاندا دەکەن، کە لە سەدان ساڵ پێشەوە بە شێوەیەک لە شێوەکان شاکارێکیان هەبوو، هیندێکیش لەو کەسانەی کە باسیان لێوە دەکرێت دەچێتە قاڵبی ئەفسانەو شکو گمانەوە، بەڵام نەتەوەکانی خۆیان بە شانازییەوە باسی لێوەدەکەن و بە پەیکەرو نازناو خەڵاتی ساڵانەوە. هەروەها بەخستنە نێو پەرتووکی مێژووی وانەی خوێندن لە خوێندنگاکان زیاتر یادی دەکەنەوە ولە مێژووی خۆیان زیندوو ڕایدەگرن. لە مێژووی ئێمەی کوردیشدا کەڵە پیاومان زۆر بووە، بەڵام بە داخەوە وەک پێویست گرنگیان پێنەداوە. یا لە ڕوانگە جیاوازەکانەوە لە توانای ئەو کەسایەتیانە کەم کراوەتەوە. یەکێک لەو کەسایەتییانە کە دەبوو لە مێژووی کوردا زۆر ڕەونەقی پێبدرابایە ( ئێلبەگی جافە).

## ئێلبەگی جاف کێ بووە.

ئێلبەگی جاف وەک هیندێک سەرچاوە باسی لێوەدەکەن کە لە ساڵی ٨٩٨ زاینی لە دایکبووەو لە ٩٦١ کۆچی دوایی کردوە. لە سەر شوێنی ژیانی ناوبراو بۆچوونی جیاواز هەیە. هیندێک دەڵێن لە ناوچەکانی سنجاویی لای کرماشانی ڕۆژهەڵات ژیاوەو، و هیدنێکیش دەڵێن لە دەوروبەری شارەزوورو گەرمیان لە باشوری کوردستان ژیاوەو و پاشان لە تەمەنی گەنجێتی چووەتە هەورامان و بە هۆی خۆشی و دڵگیری ناوچەکە لەوێ بە یەکجاری ماوەتەوەو ژنی هێناوە.

## شاکارەکانی ئیلبەگی جاف

ئێلبەگی جاف کەسێکی پێشبینیکەری سەدەی نۆیەم بووە، کە گشت پێشبینیەکانی بە زمانەکانی کوردی و فارسی و عەرەبی لە چوارچێوەی هەڵبەستدا وتووەتەوە. ئێلبەگ خاوەنی سەدان پێشبینی گرنگی جیهانی و دەروونانسی بووە، کە بە داخەوە تەنیا بەشێکی کەمی لە پێشبینییەکانی لە چوارچێوەی هەڵبەستێکدا لە ژێر ناوی ( هەروایە و هەروا ئەبێ) ماوەتەوە، تەنیا ئەو کورتە پێشبینییەی کەدەستبەدەست ماوەتەوە، دەرکەوتووە کە هەموو پێشبینییەکانی دروستبوون و لە کاتی خۆیداڕاستییانە دەرچوون. باسیش لەوە دەکرێت کە زۆر لە پێشبینییەکانی بە زمانەکانی فارسی و عەرەبی خراونەتەوە نێو ئەدەبیاتی مێژووی بەغداو تاران و بە شیعری شاعیری نەناسراوی ئەو وڵاتانە ناوزەدکراوە.

کاتێک ئێلبەگی جاف باسی دەسەڵاتدارێتی وزوڵم زۆری نادر شای سەدەی نۆیەمی ئێران کردوە. لەو هەڵبەستەی کە نزیک بە١٠٥٠ ساڵ پێش لە سەر زوڵم و زۆری بۆ خەڵک وە هاوارا هاتووە، کە هیچ کەس لەو کات و سەردەمەدا ئەو پێش بینییەی نەکردوە. خەڵکانێک کە ئیستا لە مێژووی وڵاتانی عەرەبی و ئوروپی وەک پیاوی مێژو باسی لێوەدەکەن هەر لەو جۆرە کەسانە بوون کە وەک ئێلبەگی جاف شاکارێکیان هەبووە، بەڵام ئەوان زیرەکانە خراونەتە نێو مێژووی کەسایەتیەکانی جیهان و بە فەیلەسوف وئەندێشەناس و داهێنەر ناویان هاتووە. ئەوانەی کوردیش هەر باسیان لێوە ناکرێت. با کۆپلەیەک لەو هەڵبەستەی ئێلبەگی جاف بخوێنینەوە کە ١٠٥٠ساڵ

پێشوتراوە: دەڵێ :

**ڕوو لە تووری سینا ئەکەم**
**ئەوسـا نیگای دونیا ئەکەم**
**ئـیران پڕ لـە دەعوا ئەبێ**
**حوكمي سولطان نادر ئەبێ**
**مـولّكی ئێران باهیر دەبێ**
**ستەم لە خەلق صادر دەبێ**
**دەوران دەوری نـادر دەبێ**
**لە پـەی نادەر دەعوا دەبێ**
**ئێران پـر لە غـەوغا دەبێ**
**خاسـان وەبێ كفن ئـەبێ**
**شاهان دوور لە وەتەن ئەبێ**
**هـەروا بوە و هەروا دەبێ**
**خاسـان وەبێ وەتەن دەبێ**

هەروها پێشبینی هاتنە سەر دەسەلآتی كەریمی زەند و تەیموری لەنگ دەكات و دەڵێ:

**مورغان دوور لە چەمەن ئەبێ**
**خێڵی شـاهان قاتی ئەبێ**
**شـاهی ئێران وەزەنـد ئەبێ**
**حوكمی موسـتەمەند ئـەبێ**
**حوكمی كـەریمی زەند ئەبێ**
**دونیا بێ قسـە و باس ئەبێ**
**لە دوای كـەریم بەدتر ئەبێ**
**ئەوسـا دەورەی قەجەر ئەبێ**
**تەیمور لە خـەو خەبەر ئەبێ**
**سـەری ئیران بێ سەر ئەبێ**
**هـەروا بوە و هـەروا دەبێ**

ئەم پێشبینیانەی کە لە چوارچێوەی ئەو هەڵبەستەدا هاتووە، بەراوردی بکەین لەگەل دونیای ئیستای زۆڵم و زۆر کە بە هۆی بوونی ڕاگەیاندن و تۆری پێشکەتووەوە باسی لێوەدەکرێت. بەڵام ئایا ١٠٠٠ ساڵ پێش ئەم وتنە گرنگ بووە یان نە، ئەوەی کە بە گرنگ دەزانرێت بۆ وەک پێویست گرنگی پێنادرێت. بۆ لە شەقامەکانی بەغداو تاران پەیکەری ڕەسافی و ئیبن خەلدوون، ئەبوعەلی سیناو فیردەوسی دروستکراوە. ئەی بۆ لە کوردستان پەیکەری ئەم پێشبینیکەرە گرنگەی کورد نە لای کورد و نە لای ئێرانییەکان پەیکەری بۆ دروستنەکراوە، زۆر بە دەگمەن لە گۆشەی پەرتووکە ئەدەبیەکانی کوردی وەک شاعیرێکی دێرین باسی لێوەکراوە.

لە نموونەیەکی دیکەی پێشبینییەکانی کە زۆر گرنگەو بەرچاوە باس لە هاتنی تەکنەلۆژیا، کە وادەردەکەوێت باس لە شەمەنەفەر و کارەبا و پێشکەوتنی کۆمەڵگا و پێڕاگەیشتنی گرنگتر دەکات. لەم کۆپلە هەڵبەستەشی بکۆڵنەوە زیاتر کەسایەتی و پێشبینی ئەم کەڵە پیاوا زاناو پێشبینیکەرەی کوردستان، بەڵام لە بیرکراومان بۆ دەردەکەوێت. کە دەڵێ:

**بـــــەرقی یە لە ئـــــەروپا ئەبێ**
**کـــوران وکچان قەشـــەنگ ئەبێ**
**تەیـــرێ وەک ڕەعد و بەرق ئەبێ**
**گوێچکەی لە دووکەڵ غەرق ئەبێ**
**دەشـــت و دەری پێ لـــەق ئەبێ**
**بە ڕووی هـــەوا مۆڵـــەق ئەبێ**
**هـــــەروا بووە و هـــــەروا ئەبێ**

لە درێژەی ئەو پێشبینیانەی دا کە لە چوارچێوەی هەڵبەستی هەروا بووەو هەروا ئەبێ، باس لە هاتنی دەسەڵاتی پەهلەوی و قاتی و قرانی لە ئێران دەکات. هەروەها لە چەند دێڕێکی دیکەشدا باس لە هاتنی رووس دەکات بۆ ئێران. کە هەمو ئەمانەش بە پێی تێپەربوونی مێژوو دروست دەرچوون، ئەگەر بە وردی لە تەواوی دێرو وشەکانی ئەم فەیلەسوفە لە یادکراوە بکۆڵینەوە، دەبینین یەک وشەی نییە کە نەهاتبێتە دێ یا وا دەرنەچووبێت.

دروستبوونی سەنتەری ئێلبەگی جاف

بەو ناوە زۆر لە جێی خۆیدابوو.

لە ساڵی ٢٠٠٦، سەنتەرێکی ڕووناکبیری و ڕۆشنبیری بەناوی سەنتەری ئێلبەگی جاف دروستبوو، کە لە سەرەتای دروستبوونی ئەم سەنتەرەوە، وێڕای ئەوەی کە زۆرکەسی شارەزا دەستخۆشی و پێشوازی لێکردن، بە لای دیکەشەوە هیندێک کەس خۆێندنەوەی بە پەلەیان لە سەر ئەم سەنتەرە دەکرد، تاوانی ئەوەیان دەخستە پاڵیان کە گوایا وەک سەنتەرێکی ناوچەگەرایی دامەزراوە. ئەو کەسانەی کە وایان بیرکردوەتەوە بە داخەوە وەک پێویست زانیارییان لەسەر ئێلبەگی جاف نەبووە، کە ئەوە فەیلەسوفێکی کوردستانییە و لە هۆزی جافە. هەروەها هۆزی جافیش بەشێکی زۆرە لە مێژووی سیاسی و ڕوناکبیری کوردستان و گەورەترین هۆزی کوردە. لە هەموو شۆێنێکی جیهان بوونی هۆزێک یا گروپێکی بەو شێوە کە خاوەنی مێژوو خەڵکی زۆر لە مێژوودا دەدرەوشێتەوەو ڕێکخراوە ناوەندی بە ناو دروستدەکرێت، یا فیلمی سینەمایی ومێژووی لە سەر دروسکراوە. هەروەها بوونی کەسایەتی بە ناوبانگی ئێلبەگی جاف شایانی ئەوەیە کە دەیان ڕێکخراو ناوەندی بە ناو بکرێت.

جێی خۆیەتی کە دەستخۆشانە ئاراستەی ئەو چەند کەسایەتییە ڕۆناکبیرەی کوردستان بکرێت، کە ئەو سەنتەرەیان بە ناوی سەنتەری ئێلبەگی جاف داناوە یا بیریان لەو ناوە کردوەتەوە. هەروەها جێی خۆشحاڵییە کە لە ماوەی تەمەنی کەمی ئەم سەنتەرەوە ساڵانە چەندین چالاکی گرنگی پر جەماوەرییان بە ڕێخستووە. چەندین گۆڤارو نامیلەکشیان بڵاوکردوەتەوە، چاوەروانی زۆر کاری گرنگتریان لێدەکرێت.

خەڵاتی ساڵانەی ئێلبەگی جاف و بەجیهانیکردنی ئەم کەسایەتییە

من وەک نووسەری ئەم بابەتە! پێشنیارێک ئاراستەی سەنتەری ئێلبەگی جاف دەکەم، کە ئەگەر بۆیان بکرێت لە لایەن وەزارەتی ڕۆشنبیری، یا بە هاوکاری خواپێداوانی کوردستان سپۆنسەر بکرێن، خەڵاتی ساڵانەی ئێلبەگی جاف دروستبکەن و بیدەن بە کەسایەتییەکی ئەدەبی و ڕووناکبیری. واتە ئەو جۆرە کەسایەتییانە کە داهێنەرێکن لەو بوارەدا. واتە کەسێک بێت کە خۆی توانیبێتی خۆی بگەیەنێتە ئەو

ئاستەوە. ئەو خەڵاتە وێڕای ئەوەی کە سیمبولێکی مێژوویی بێت، هاوکات بریتیش بێت لە مەبلەغێکی دارایی بۆ ئەو کەسەی کە بتوانێت بەرهەمی کارێکی خۆی پێ جێبەجێ بکات.

•••

سەرچاوەکان:


١. گۆڤاری کۆچ / سەنتەری ئێلبەگی جاف

٢. مێژووی هۆزی جاف خەسرەو جاف

٣. هیندێک سەرچاوەی زارەکی لە کەسانی بە تەمەن و شارەزا بیسراوەتەوە




# سەرهەڵدانی کۆیلایەتی لە ئەمریکا و بارودۆخی ژیانیان

هاوار حەمید

پێناسەی کۆیلە: کۆیلە ئەو کەسانەبوون کە لە هەموو مافێکی مرۆیی و رامیاری و مەدەنی و کۆمەلآیەتی بێبەشبوون لەڕووی یاساییەوە ئەمانە بەشێکبوون لەوەی پێیدەگوترا (سیستەمی موڵك) بەشمەك دانراون نەك مرۆڤ .

**سەرەتای دروستبوونی کۆیلە لە ئەمریکا:**

سەرەتای دروستبوونی کۆیلە لەڕووی کۆمەلآتییەوە دەگەڕێتەوە بۆ ململانێی نێوان رەشپێستەکان و سپیپێستەکان، سپیپێستەکان لە هەولّی بەردەوامدابوون بۆ دەستگرتن بەسەر رەشپێستەکان و کردنیان بە کۆیلە[1] .

چەوساندنەوەی مرۆڤ لەلایەن مرۆڤێکیترەوە و دەستگرتن بەسەر هێزەکانی بەرهەمهێنان و توخمە بەرهەمهێنەرەکان و رژێمی زۆرەملی و چەوساندنەوە، ئەمانە لاپەرەی رەشی ژیان و دەسەلآتی سەرمایەداریمان نیشاندەدەن، کڕین و فرۆشتنی ئادەمیزاد و سەیرکردنی مرۆڤ وەکو کەرەستەیەکی بازرگانی و بەکارهێنان و فرۆشتنی لەلایەن مرۆڤێکیترەوە و داگیرکردنی هێزی مەچەك و هۆش و بیری، ماهییەتی چینایەتی و سەردەمی کۆیلەداری دەردەبڕن[2]، کۆیلەکانی ئەفریقا نزیکەی (٣٥٠) سالّ، لە (١٥٢٠- ١٨٧٠) لەڕێگای ئۆقیانوسی ئەتلەسییەوە لە ئەفریقاوە دەیانبردن بۆ ئەمریکا، ئەوانە ناچاربوون، وەکو کۆیلە خزمەتی خەڵك بکەن[3].

زۆربەی دەوڵەتەکانی کەناری ئەوروپا تاوەکو سالّی (١٦٥٠ز) چەند ناوچەیەکی ئەمریکایان بەدەستەوەبوو، وەك ئەسپانیا لە ئەمریکای ناوەند و خواروو، هۆڵەندە و پرتوگال لە بەرازیل، بەریتانیا و فەرەنسا لە دوورگەکانی ئانتیك و ژووروی ئەمریکا.. هتد، هەموو ئەمانە لە ئەفریقاوە کۆیلەیان دەبرد، لە سەدەکانی (١٧-١٨)دا خەڵکی ئەوروپا زۆرترین سوودیان لە

بەروبوومی ناوچە گەرمەسێرەکان وەردەگرت، وەکو شەکر، چا، قاوە، لۆکە، لە ئەمریکا ئەمانەیان بەهۆی کۆیلەکانەوە بەرهەمدەهێنا، هەرچەند کێڵگەکان فراوانتربوونایە کۆیلەی زیاتریان لە ئەفریقا دەکڕی بۆ ئێشکردن لە کێڵگەکانیان[٤]، لە سەرەتای کارەوە کەشتییە بارهەڵگرە تایبەتییەکان دەچوون بۆ کەنارەکانی رۆژئاوای ئەفریقا کە بەشێك لەوێ ئێستاش بە (کەناری کۆیلەکان) بەناوبانگە، هەرکات دەیانویست هەموو ئەو رەشپێستانەی کە دەکەوتەدەستیان دەیانیانگرت و بۆ ئەمریکا دەیاننارد، بەلاّم لەنێوانی خودی ئەفریقییەکان کۆیلایەتی زۆر کەمبوو تەنها دیلی جەنگ و کەسانێك کە قەرزیاندەکرد و توانای دانەوەیان نەبوو دەبوون بە کۆیلە، لەکاتێکدا ئەوانەیان کە دەیانبردن بۆ ئەمریکا هەموویان بەشێوەی کۆیلە دەفرۆشران[٥]، ئەو کۆیلانەی دەبران بۆ ئەمریکا لە بەندەرەکانی ئەمریکا دادەبەزێنران و دەفرۆشران، ئەمە شتێکی زۆر ئاساییبوو کۆیلەکانیان جەڵدەدەکرد و لە مەیدانەکان وەکو ئاژەڵ نیشانی خەڵکییان دەدان، تاوەکو کڕیارەکان بەئارەزووی خۆیان هەڵیانبژێرن، هەرکەس پارەی زۆرتری بدایا بەوکەسەیان دەفرۆشت، لە ئەمریکا کۆیلە رەشپێستەکان بە بەشێك لە سامان دادەنران، خاوەن کۆیلەکان وەکو ئاژەڵ و کەلوپەلی ناوماڵ سەیری کۆیلەکانیان دەکرد و دەیانفرۆشتن، خێزانێك کە بە کۆیلە دەگیران بەئارەزووی بازرگانەکان (خاوەن کۆیلەکان) دابەشدەکران و ئیتر ئەندامانی ئەو خێزانە یەکتریان نەدەبینێتەوە، ئەو کۆیلانەی لەئیشوکاردا



سستبوونایە ئازاردەدران و زنجیرکاریدەکران یان بەئاگر داخیاندەکردن، هەروەها خاوەنکۆیلەکان سپیپێستەکانیان دەکرد بە چاودێر لەسەر کۆیلەکان ئەوانیش زۆر بەخراپی مامەڵەیان لەگەڵ دەکردن، هەروەها ژنخواستن لەنێوان رەشپێست و سپیپێستەکانە بەیەکەوە قەدەغەبوو، بەڵام هەندێك لە خاوەن کۆیلەکان دڵداری رەشپێستیان هەبوو ئەم کارە بووە هۆی ئەوەی کە نەژادی دوو رەگ لەئەمریکادا بکەوێتەوە[٦].

بردنی ئەم رەشپێستانە لە ئەفریقاوە بۆ ئەمەریکا و فرۆشتنیان بەشێوەی کۆیلە بازرگابیەکی بەسوودبوو. بەمشێوەیە کۆیلەفرۆشتن فراوانبوو و شێوەی بازرگانییەکی رێکوپێکی لێهات بەتایبەتی لە دەستی ئینگلیزییەکان و ئیسپانییەکان و پرتوگالییەکانەدابوو، هەندێ کەشتی تایبەتییان بۆ گواستنەوەی کۆیلە دروستکرد کە لەژێر تەختەبانی (عەرشە)ی کەشتییەکە چەند دالآنێکی قەفەسئاسا هەبوو، لەم دالآنانەدا رەشپێستە بەدبەختەکانیان بەزنجیر دەبەست و هەردوو کەسیانیش بەیەکەوەدەبەست، تێپەڕبوونی کەشتییە دەریایەکان لە ئوقیانوسی ئەتلەسییەوە چەندین هەفتە و هەندێجاریش چەند مانگێك درێژەیدەکێشا لە تەواوی ئەو ماوە درێژەدا رەشپێستەکان لەو دالآنە تەنگ و تاریکانە بەبەستراوی دەمانەوە شوێنی هەر یەکێك لەو رەشپێستانە درێژییەکەی دوو مەتر کەمتر و پانیەکەی چل سانتیمەتر بوو[٧] .

کۆیلەکان لە رۆژەوە تاشەو کارییاندەکرد تەنها رۆژی شەممە یان یەکشەممان نەبێت، هەروەها تەنها نیوەڕوان بۆیانهەبوو پشوویەکی کورتبدەن، ئەم کۆیلانە هەموو کارێکیاندەکرد لە سالّی (١٨٥٠ز) کۆیلە زیادیکرد رێژەکەی گەیشتە (٣١٠) هەزار، ئەم ژمارەیە لە شارەکانی باشوور (کارۆلینیا و میسیسپی) لە سپیپێستەکان زیاتربوون، هەروەها لە ناوچە شاخاوییەکانی (ئەپەلآش و ئەلەباما) هەروەها لە ناوچەکانی باکووری تشارلۆستن (٨٨٪)ی دانیشتوانی پێکدەهێنا، هەروەها کۆیلەکان لە دەوروبەری ئاوی (میسیسپی) زیاتر لە (٩٠٪)ی پێکدەهێنا، ئەم کۆیلانە زیاتر لەو شوێنانەدا دەژیان کە ئاووهەواکەی گەرمبوو، ئەم کۆیلانەش لەو هەرێمانەدا بوون بە چاندنی برنج و شەکر و کاریترەوە خەریکبوون، لە باشوور نزیکەی (٣) هەزار خێزان هەبوون لە جۆرجیا زیاتر لە هەزار کۆیلە کاریاندەکرد، بۆیە لەم ناوچانەدا دەستێوەردانی سیاسی و سەرکردایەتی کەوتبووەدەست کەسانێکی کەم کە ئەمانەش زیاتر لە چینی دەوڵەمەندەکان بوون[٨]، لە سالی (١٧١٣ز) بەپێی (پەیمانی ئۆپرشت) کە لەدوای شکستی ئیسپانییەکان بەسترا، ئینگلیزەکان مافی بازرگانی کۆیلەی لە نێوان ئەفریقیا و ئەمەریکا لەو

وڵاته سەندەوه و تایبەتیکرد بەخۆیەوه، تەنانەت پێش ئەوەش ئینگلیزەکان کۆیلەکانی بۆ سەر زەمینەکانی ئینگلیزی ئەمەریکی دەبردو دەفرۆشت، بەلاّم له سەدەی (١٨)دا لەگەڵ ئەوەی له پەیمانی (ئۆترێش) رێکخرابوو ئینگلیز هەولێدا که بازرگانی کۆیلەفرۆشتن و گواستنەوەی کۆیله له ئەفریقاوه بۆ ئەمەریکاوه تایبەتبکات بەخۆیەوه، له ساڵی (١٧٣٠ز )شاری لیڤەرپول (١٥) کەشتی هەبوو که خەریکی بازرگانی کۆیله بوون، بەلاّم ژمارەی ئەو کەشتیانه بەردەوام لەزیادبووندابوو بەجۆرێك که له ساڵی(١٧٩٢ز)ژمارەیان گەیشته (١٣٢)کەشتی که هەموویان له بازرگانی کۆیلەدا کاریاندەکرد[٩].

## هەوڵەکان بۆ نەهیشتنی کۆیله له ئەمریکا و ئازادبوونیان

سەرەتای هەوڵەکان بۆ ئازادبوونی کۆیله سەرەتا لەوه و دەستیپێکرد که له سەدەی حەڤدەیەم چەند کۆیلەیەکی رەش له بەرازیل کۆمارێکی سەربەخۆیان له (پارلماس) دامەزراند توانیان بۆ ماوەیەك لەبەرامبەر هۆڵەندییەکان و پرتۆگالییەکان راوەستن که دەیانویست کۆمارەکەیان لەناوبەرن و دەستگیریانبکەن، خاوەن کۆیلەکان هەمیشه بیریان له شۆڕش و راپەرینی کۆیلەکانیان دەکردەوه و لێدەترسان، له ناوچه ژێردەستەییەکانی ئەمریکادا زۆرجار شۆڕشی کۆیلەکان روویداوه، بەلاّم شۆڕشەکانیان وەکو ئاژاوەیەکی کەمخایەن وەهابووه که به زوویی سەرکوتدەکران، تەنها شۆڕشی سەرکەوتوانەیان ئەوەبوو که له دوورگەکانی (ئانتیل) له دورگەی (ساندومینگۆ) روویدا (کوسن لورتور) که سەرەتا کۆیله بوو لەبەر مەودای کاریگەریتی شۆڕشی فەرەنسادا رابەری ئەم راپەرینەی کرد، (کوسن لورتور) ( Toussaint ouverture'L) (توسان لیڤێرتویر) فەرماندەیەکی لێوەشاوەبوو، سەرکەوتن بەسەر سوپای ئەسپانیا و فەرەنسادا یارمەتی دامەزراندنی یەکەمین کۆمـــــــاری رەش پێستەکاندا له (هاییتی)[١٠].

له سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەیەم پەرلەمانی بەریتانیا چەند یاسایەکی له دژی کۆیلەفرۆشتن دەرکرد، بەدوای ئەوه له ولاّتانیتری ئەوروپا و ئەمریکاش چەند یاسایەکیتریان دەرکرد، بەلاّم لەوکاتەشدا بازرگانی کۆیله به قاچاغ هەرهەبوو له ئەفریقایەوه بۆ ئەمریکا، بارودۆخی گواستنەوەی رەشپێستەکان خراپتربوو، چونکه هەڵگرتن و گواستنەوەیان بەشێوەی ئاشکرا ئەنجامنەدەدرا، بەڵکو ئەوانەیان له عەمباری تاریك و شاراوه و جێگایەك که به

بەرچاوەوە نەبوو دەیانخستنە سەریەك و دەیانشاردنەوە، بارودۆخی ئەم هەڵگرتن و گواستنەوەش بە ئەندازەیەك خراپ و پیسبوو کە هەر کەشتییەکی گواستنەوەی کۆیلە لەدوای چوار تا پێنج گەشت خراپدەبوو و کارپێنەدەکرا، بەڵام سوودی ئەم بازرگانییە بە ئەندازەیەك زۆربوو کە قەرەبووی لەدەستدانی کەشتییەکەشی دەکردەوە(١١). بەریتانیا و فەرەنسا بۆ کۆتاییهێنان بە مسەلەی بازرگانیتی کۆیلەکان چەندین ئەنجومەنی یاساییان پێکهێنا. دانیمارك یەکەمین وڵات بوو کە بازرگانی کۆیلەی بە کارێکی نایاسایی دانا، دەوڵەتی فەرەنسا لە ساڵی (١٧٩٤ز)دا هەموو کۆیلەکانی ئیمپراتوری ئازادکرا، بەڵام زۆری پێنەچوو (ناپلیۆن) سەرلەنوێ یاسای کۆیلەداری دانایەوە، لە ساڵی (١٨٠٧ز) بەریتانیا یاسایەکی نۆێی دانا فرۆشتنی رەشەکانی ئەفریقای بەخەڵکی بەریتانیا قەدەغەکرد(١٢) . ئەمریکا دەستەواژەی کۆیلە لەدەستورەکەیدا نابینرێت، بەڵام بەشێوەیەکی ناڕاستوخۆ رێگاپێدراوە(١٣)، لە ساڵی (١٧٧٥ز)دا پێش دەستپێکردنی شۆڕشی ئەمریکی (بنیامین فرانکلین) کۆمەڵەیەکی لە (بنسلڤانیا) بنیادنا، مەبەستی سەرەکیشی هەوڵدانبوو بۆ رەتکردنەوەی کۆیلایەتی(١٤). لە ساڵی (١٨٠٧ز) کۆنگریس بریاری دەرکردنی یاسایەکیدا بەقەدەغەکردنی بازرگانیکردن بە کۆیلەوە، ئەم یاسایە لە مایسی ساڵی (١٨٠٨ز) جێبەجێکرا، لە ساڵی (١٨٠٩ز) ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا یاسایەکی دەرکرد ئەمریکییەکانیان لە بەشداریکردنیان لە بازرگانی کۆیلەدا قەدەغەکرد و ئەو نوێنەرانەی ئەمریکا بەشداری کۆنگرەی (ڤیەننا)یان کرد لە ساڵی (١٨١٥ز) بەفەرمی دژی بازرگانی کۆیلە وەستانەوە(١٥) .

ئەو جووڵانەوەی ئامانجی نەهێشتنی بازرگانی کۆیلە بوو، لەپشتییەوە پاڵنەرێك هەبوو بنچینەکەی ئازادی بیر و ئازادی خۆی بوو(١٦)، نابێ ئەوەمان لەبیربچێت کە ئەمکارە تەنها کەمکردنەوەی بازرگانی کۆیلە بوو نەك لەناوبردنی سیستەمی کۆیلەداری، چونکە هێشتا لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە زۆربەی ناوچە ژێردەستەکانی ئەوروپادا کڕین و فرۆشتنی کۆیلە هەرماوەتەوە، لەواقیعدا ئەم یاسایانە کارێکی ئەوتۆیان نەکردەسەر باری بازرگانیتی ئەو کۆیلانەی لە ئەفریقاوە دەبران بۆ ئەمریکا، هەندێك لە وڵاتان بەتایبەتی ئەسپانیا و پورتوگال و کوبا و بەرازیل کۆتاییان بە بازرگانی کۆیلە هێنا، دەوڵەتی بەریتانیا ئەو کارخانانەی داخست کە کۆیلەکان کاریانتێدەکرد(١٧)، بەڵام قەدەغەکردنی کۆیلە هێشتا نەبووبووە گشتگیر و ویلایەتەکانی باشوور لەبەرئەوەی زیاتر ویلایەتگەلێکی کشتوکاڵی بوون دەستیان لە

سیستەمی کۆیلەگەریتی بەرنەدابوو، بۆیە ناکۆکیکی توند لەنێوان ویلایەتەکانی باکوور و باشووری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا سەبارەت بە مان و نەمانی کۆیلە سەریهەڵدا. لەم نیوەندەدا و لەسەر ئاستی جەماوەریش لەلایەن (ئارسەر و لویس ئابان)ەوە بۆ یەکەمجار کۆمەڵەی دژبە کۆیلەگەری لە ساڵی (١٨٣١ز) لە نیویۆرك دروستبوو کە هێندەی نەخایاند ئەو کۆمەڵگەیە بووە ریکخراوێکی نیشتمانی و کارگەیشتە ئەو رادەیەی لە ساڵی (١٨٤٠ز) ریکخراوەکەی (ئارسەر و لویس ئابان) (٢٥٠) هەزار ئەندامی لەدەورکۆبووەوە، ئەم کۆبوونەوە فراوانەی جەماوەریش لە ریکخراویك کە بەرگری لە ئازادی کۆیلە دەکرد بووە مایەی ترس و دڵەراوکێ بۆ خاوەن کیڵگەی کۆیلەکانی باشوور و هەر ئەم ترسەش بوو دووچاری چەند کاردانەوەیەکی خۆسەرانەی کردن[١٨].

دانیشتوانی ویلایەتەکانی باشووری ئەمریکا لەسەر یەك بیروبۆچوون یەکگرتوونەبوون، سەبارەت بە کۆیلەکان تیایاندا هەبوو داوای رەتکردنەوەی خێرای کۆیلایەتی دەکرد، هەندێکیکەشیان وەك پاریزگاران لەگەڵ کۆیلایەتیدا نەبوون، بەلاّم پێیانئەستەمبوو کەوا بتوانن رەتیبکەنەوە، زۆربەی دانیشتوانی ویلایەتەکانی باکوور لەم مەسەلەیەدا دوو بیروبۆچوونیان هەبوو یەکەمیان: دژایەتی بلاّوبوونەوەی کۆیلایەتیان دەکرد لە زەوییە تازەکاندا لە رۆژئاوا، دووەمیان: داوای نەهیشتنی کۆیلەیان دەکرد لە ویلایەتەکانی باشووردا، چونکە پێیانوابوو لەگەڵ بەرەوپێشچوونی ژیاندا یەك ناگریتەوە[١٩]، گو لە ساڵی (١٨٥٧ز) چالاکییەکانی (جۆن براون) دەستیپێکرد کە هەوڵیدا کێشەی کۆیلایەتی بکاتە کێشەیەکی سەرەکی، لە ساڵی (١٨٦٠ز) کە لەوکاتەدا بووەهۆی دروستبوونی جەنگی ناوخۆی ئەمریکا و جیابوونەوەی، کۆنگریسی ئەمریکا هەنگاویکی دڵنیایی نەنا لەپێناو ئازادکردنی کۆیلایەتی تا مانگی نیسانی (١٨٦٢ز) بڕیاریدا یارمەتی دارایی دابینبکات بۆئەو ویلایەتانەی کۆیلەکانی ئازاددەبێت، ئەم هەنگاوەش بەشکست کۆتاییهات، دوای چەند رۆژێك کونگریس سیستەمی مولکایەتی لە هەریمی کۆلۆمبیا هەڵوەشاندەوە، بیری ئازادکردنی کۆیلە بەشێوەیەکی دیار لە مانگی حوزەیراندا بوو، لەومانگەدا کونگریس مۆڵکایەتی کۆیلەگەری لەهەموو هەرێمە رۆژئاواییەکاندا بەبێ رووبەڕووبوونەوەی ویلایەتەکان هەڵوەشاندەوە، ئەو کەسانەی بنەمای هەڵوەشاندنەوەی تەواو و یەکجارەکیان دەرکرد سەرۆك (لنکۆڵن)یان بە ڕاڕا و لاواز تاوانباردەکرد[٢٠].

(ابراهام لنكۆڵن) رزگاركردنی كۆیلەی راگەیاند لەئەمریكادا لە ١ ی ینـــــایری ســـاڵی (١٨٦٣ز)،[٢١] كە دەڵێت: (لە دەستپێكی یەكی ینایری ساڵی ١٨٦٣ز تا هەتای هەموو كۆیلەیەك ئازادە لە هەر ویلایەتیكدا بێت و هەموو سەربازیكی ئەمریكی چ لە دەریا و چ لەسەر زەوی داندەنێت بەم راگەیاندنەدا و كاردەكات بۆ ئازادكردنی ئەوان و هیچ كارێكییان پێناكری كە بیانبەستێتەوە و ئازادیان لەدەستبدات، هەروەها بۆیان هەیە خزمەت لە بواری سەربازیدا بكەن بۆ بەرگریكردن لە ناوچە و شوێنە سەربازییەكان و لەهەموو بوارەكانیتریش)[٢٢]، دوای ئەم مێژووە هەندێ لە ویلایەتەكان لەرێگەی نوێنەرەكانیانەوە یاسای ئازادكردنی كۆیلەكانیان گرتەدەست [٢٣]، لە ١٨ی دیسمبەری ساڵی (١٨٦٥ز) كۆنگریس ئەمریكی رازیبوو مادەی (١٣) ی دەستوری چاك (تصدیق)كردەوە و هەندێك لە ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا كۆیلایەتی تێدانەما، بۆ نموونە بورکۆریکو لە ساڵی (١٨٧٣ز)، بەرازیل لە ساڵی (١٨٧٠ز)، بەلآم زۆربەی ئەو ئاستەنگانەی رووبەرووی كۆیلەكان دەبوویەوە لە ئەفریقیا بوو بەتایبەت لە كۆنغۆ، بەلآم لە زۆربەی ئەو ناوچانەش كۆیلایەتی تێدانەما بەتایبەت لە زنزبار لە ساڵی (١٨٧٣ز)، مدغشقر لە ساڵی (١٨٧٧ز)، لە ساڵی (١٨٣٢ز) هەرێمی (لایبرا) بنیادنرا وەك نیشتمانێك لە ئەفریقیا بۆ كۆیلە ئازادكراوەكان كە لە ئەمریكاوە دەهاتنەوە و كۆمارێكی سەربەخۆیان دامەزراند[٢٤].

•••

## پەراوێزەکان:

(١) الان نڤز و هنری شیل کومجر: تاریخ الولایات المتحده الامریکیه ، ، قاهیره ، ل٣٣٧-٣٣٩.

(٢) برهان قانع: بازرگانی کۆیله لەئەفریقادا، وەزارەتی راگەیاندن، بغداد، ل٥-٦.

(٣) برهان قانع: هەمان سەرچاوە، ل١٠.

(٤) هەمان سەرچاوە، ل١٦.

(٥) جواهر لعل نهرو: نگاهی به تاریخ جهان ، چ١٠، ب٢، تهران، ١٣٧٧، ل٨١ .

(٦) برهان قانع: سەرچاوەی پێشوو، ل٢٢-٢٣.

(٧) جواهر لعل نهرو: سەرچاوەی پێشوو، ل٨٢-٨٣ .

(٨) الان نڤز و هنری شیل کومجر: سەرچاوەی پێشوو، ل٣٣٧-٣٣٩.

(٩) جواهر لعل نهرو: سەرچاوەی پێشوو، ل ٨٣.

(١٠) برهان قانع: سەرچاوەی پێشوو، ل٢٦.

(١١) جواهر لعل نهرو: سەرچاوەی پێشوو، ل٨٤ .

(١٢) برهان قانع: سەرچاوەی پێشوو، ل٢٦.

(١٣) نوسەر نادیار: موجز التاریخ الامریکی، ل٣٤.

(١٤) فرزند شێرکۆ: ئەمریکا لە مێژووەوە بۆ داهاتوو، چاپخانەی خاك، چ١، ٢٠٠٥ ، ل٣٨.

(١٥) الان بالمر: موسوعه التاریخ الحدیپ، گ١، ج٢، دارالمامۆن، بغداد، ١٩٩٢ز، ل٢٧٩.

(١٦) دان لیس: الپورەالامریکیه ( دوافعها و مغزاها)، ج٢، قاهیره، ١٩٩٦، ل١٤٦.

(١٧) برهان قانع: سەرچاوەی پێشوو، ل٢٧.

(١٨) فرزند شێرکۆ: سەرچاوەی پێشوو، ل٣٩.

(١٩) فرحات زیاده و ابراهیم فریجی، تاریخ الشعب الامریکی، مگبعه جامعه بوسنتون، ل١٢٤-١٢٥.

(٢٠) گۆڤاری ئەمریکاناسی، ژمارە(١)ی هاوینی، ٢٠٠٥ز ، چ٢، و/ عبدالله گەرمیانی، ل٧٩.

(٢١) الان بالمر: سەرچاوەی پێشوو ، ل٢٧٩.

(٢٢) لاری الویتز: نڤام الحکم فی الولایات المتحده الامریکیه ، الجمعیه المصریه لنشر المعرفه و الپقافەالعالمیه ، القاهره ، ل٣٨١-٣٨٣.

(٢٣) د. عبدالعزیز سلیمان و د. عبدالمجید نعنعی: تاریخ الولایات المتحده الامیرکیه الحدیپ ، منشورات دار النهچه العربیه ، بیروت ، لبنان ، ل١٢٩.

(٢٤) الان بالمر: سەرچاوەی پێشوو، ل٢٧٩.

# چۆنیەتی گۆڕینی

# ساڵی زایینی بۆ کوردی و ساڵی کۆچی بۆ زایینی و ساڵی کوردی بۆ کۆچی و بە پێچەوانەوە

ئا: ئارام مەجید عەلی



ئەم بابەتەی بەردەستت لەم سەردەمەدا گرنگییەکی پڕبایەخی خۆی هەیە لە توێژینەوە مێژووییەکاندا، چونکە زۆرجار لەکاتی نووسینی توێژینەوەیەك و ئامادەکردنی بابەتێکی ئەکادیمی مێژوویی، توێژەر یان خوێندکار ڕووبەڕووی کێشەیەکی گەورە دەبێتەوە کاتێك ساڵێکی کۆچی یان کوردی دێتەبەردەستی، ئەمەش بەوەی کە نازانێت چۆن ساڵێکی کۆچی یان کوردی بگۆڕێت بۆ زایینی یان بەپێچەوانەوە یان نازانێت ساڵێکی زایینی بگۆڕێت بۆ کوردی یان کۆچی بگۆڕێت بۆ زایینی یان کوردی بگۆڕێت بۆ کۆچی.. بۆیە لێرەدا بەگرنگمزانی ڕوونکردنەوەیەك لەسەر ئەوەبدەم و بیخەمەڕوو، چونکە خوێندکاری بەڕێز زۆرجار لەماوەی خوێندن و تەنانەت دوای تەواوکردنی خوێندنیش شارەزاییەکی تەواوی لەسەر ئەم ڕاستییە زانستییە نییە، کاتێك ساڵێك یان سەدەیەك دێتە پێشچاوی نازانێت لەکەیەوە دەستپێدەکات و تاچ ساڵێك دەگرێتەوە یان نازانێت نیوەی یەکەم و دووەمی سەدەیەك چۆن دیاریبکات، بۆیە بەشێوەیەکی گشتی هەوڵمداوە ئەم کارە لە چوارچێوەی چەند یاسایەکدا کۆبکەمەوە و ئامادەیبکەم و بخەمەڕوو بۆ توێژەران و خوێندکاران و ئەو کەسانەی سەرقاڵی توێژینەوەن لە مێژووی ئیسلام یان لە مێژووی کورد یان هەر بابەت و سەردەمێکیدیکەی مێژوو، ئەمەش بۆ زیاتر دەوڵەمەندکردنی توێژینەوەکەیان دەبێت و لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا ئەمەی کە نووسراوە بۆ هەموو مامۆستایەکی بەشی مێژوو یان کۆمەلایەتی پێویستییەکی گرنگە، چونکە

رووبەڕووی ئەم پرسیارانە دەبێتەوە، ئەوەی گرنگە بیزانین ئەوەیە لە گۆڕینی هەموو ئەم یاسایانەدا تەنها ساڵەکەت دەستدەکەوێت نەك رۆژ و مانگ، ئەگەر دەتەوێت رۆژ و مانگیشت دەستکەوێت ئەوا سەردانی ئەو سایتە بکە کە لە خالی (٧ و ٩)ی سەرچاوەکان نووسیومانە ئەمەش ئاسانکاری و گرنگییەکی باشە بۆ توێژەران.

ئەوەی شایەنی ئاماژەپێکردنە ئەم کارە یەکەمینجارە بەمشێوەیە کۆی یاسا هزرییەکانی کۆکردبێتەوە لە یەك چوارچێوە کۆیکردبێتەوە.

**بەشی یەکەم: گۆڕینی ساڵی زایینی بۆ کوردی**

**یاسای یەکەم : برگەی یەکەم: گۆڕینی ساڵی زایینی بۆ کوردی**

یاساکە: (٧٠٠ پ. ز + ساڵی زایینی = ساڵی کوردی )

٧٠٠+ ٢٠٠٩= ٢٧٠٩ کوردی

هەموو نەتەوەیەك ساڵنامەیەك یان رۆژی سەری ساڵی خۆی هەیە کە سەرەتای ساڵی نوێیە شانازی پێوەدەکەن، لە ساڵنامەی زایینیدا رۆژی ١\١ واتە (١)ی کانونی دووەم سەرەتای هەموو ساڵێکی زایینیە یان رۆژی (١)ی موحەڕەم سەرەتای هەموو ساڵێکی کۆچییە، بەلاّم لەهەمانکاتیشدا سەرەتای هەموو ساڵێکی کوردی ٣\٢١یە کەواتە، جیاوازی هەردوو ساڵی زایینی و کوردی دوومانگ و ٢٠ رۆژە، بۆیە ئەم یاسایە تەنیا بۆ مانگەکانی کانونی دوەم و شوبات نابێت، بەلاّم لە (٩) مانگ و (١١) رۆژەکەیتردا ئەم یاسایەی بەسەردا جێبەجێدەبێت لە ساڵی زایینیدا واتە لە٣/٢١ ی ئازار تاوەکو ١٢/٣١ کانونی یەکەم، مەبەستمان لە ســــــاڵی (٧٠٠) لە یاساکەدا ئەو ساڵەیە کە (دیاکۆ)ی کورد هەموو تیرە و هۆزەکانی نەتەوەی مادی یەکخست و لەدەوری دەسەلاّتەکەی خۆی کۆیکردنەوە و ئیمپراتۆریای مادی دامەزراند و رۆڵیان لە مێژووی کورددا دیارە.

**بەشی دووەم: گۆڕینی ساڵی کوردی بۆ زایینی**

**یاسای یەکەم : بڕگەی یەکەم: گۆڕینی ساڵی کوردی بۆ زایینی**

یاساکە: ساڵی کوردی – ٦٩٩= زایینی

٢٧١٠– ٦٩٩= ٢٠١١ زایینی

**بەشی سێیەم: گۆڕینی ساڵی کۆچی بۆ زایینی**

**یاسای دووەم: بڕگەی یەکەم : گۆڕینی ساڵی کۆچی بۆ زایینی**

یاساکە: (ساڵی کۆچی × ٩٧ + ٦٢١٥٦)

لەم یاسایەدا پاش کۆکردنەوە و لێکدان ژمارەیەك دەردەچێت لێرەدا ئەگەر:

**یەکەم:** ئەگەر دوو ژمارەی یەکەمی ژمارەکە لە نیوە واتە (٥٠) زیاتربوو ئەوا دوو ژمارەکە دەکەین بە ژمارە (١) و لەگەڵ ژمارەکەیتر کۆیدەکەینەوە:

ساڵی کۆچی × ٩٧ + ٦٢١٥٦

١٢٥٧٨٨ = ٦٢١٥٦ + ٩٧ × ٦٥٦

دەبینین دوو ژمارەی یەکەمی (٨٨)ە و لە نیوە گەورەترە ئەوا ئەوە دەکەین بە ژمارە (١) و لەگەڵ ١٢٥٧کەدا کۆیدەکەینەوە دەبێت بە ١٢٥٨ی زایینی.

**دووەم:** بەڵام ئەگەر دوو ژمارەکەی یەکەمی لە نیوە کەمتربوو واتە (٥٠) ئەوا دوو ژمارەکە لادەبەین و ژمارەکەیتر وەك خۆی دەنووسینەوە:

ساڵی کۆچی × ٩٧ + ٦٢١٥٦

١٦٣٩٠٩ = ٦٢١٥٦ + ٩٧× ١٠٤٩

لێرەدا دەبینین دوو ژمارەی یەکەمی ژمارەکە لەنیوە واتە (٥٠) کەمترە ئەوا لێرەدا دوو ژمارەکە لادەبەین و ژمارەکەیتر وەك خۆی دەنووسینەوە ئەوەش دەبێتە ١٦٣٩ی زایینی. ئەم یاسایە کەمێك گۆڕانکاری و وردەکاری دەوێت.

**یاسای دووەم : برِگەی دووەم : گۆڕینی ساڵی کۆچی بۆ زایینی**

یاساکە: ساڵی کۆچی×٠/٩٧+٦٢٢

١٧٨٦ =٦٢٢ +٠\٩٧×١٢٠٠

تێبینی: ئەم برِگەیە لە هەردوو برِگەی (١و٢) ئەم یاسایە ئاسانترە.

**یاسای دووەم برِگەی سێیەم: گۆڕینی ساڵی کۆچی بۆ زایینی**

یاساکە: (ساڵی کۆچی× ٣÷١٠٠)

٣×١٢٠٠ ÷١٠٠=٣٦ ئەو ژمارەیەی ماوەتەوە (٣٦) دیسانەوە دەریبکە (-) لە ساڵە کۆچییەکە ژمارە (٦٢٢) لەگەڵ کۆمەڵەی یەکەم بکەرەوە بەمشێوەیە: ١٢٠٠- ٣٦+ ٦٢٢= ١٧

**یاسای دووەم: برِگەی سێیەم: گۆڕینی ساڵی کۆچی بۆ زایینی**

یاساکە: ساڵی کۆچی+٦٢٢- ساڵی کۆچی÷ ٣٣

٣٣ ÷١٣٠٠ - ٦٢٢+ ١٣٠٠

١٩٢٢ - ٣٩ = ١٨٨٣زایینی

**یاسای دووەم: برگەی چوارەم: گۆڕینی ساڵی کۆچی بۆ زایینی**

یاساکە: ساڵی کۆچی+٦٢٢-٤٣ = ساڵی زایینی

٢٠١٢ = ٤٣-٦٢٢+١٤٣٣

**بەشی چـوارەم:گۆڕینی ساڵی زایینی بۆ کۆچی**

**یاسای یەکەم: بڕگەی یەکەم: گۆڕینی ساڵی زایینی بۆ کۆچی**

یاساکە: (٦٢٢- ساڵی زایینی ÷٠/٩٧)

٦٢٢-٢٠٠٩÷ ٠/٩٧ = ١٤٣٠ کۆچی

**یاسای دووەم: بڕگەی یەکەم: گۆڕینی ساڵی زایینی بۆ کۆچی**

یاساکە: زایینی-٦٢٢ + زایینی-٦٢٢÷٣٣

٦٢٢-١٨٨٣ + ١٨٨٣- ٦٢٢÷٣٣

١٢٦١ + ٣٩ = ١٣٠٠ کۆچی

**یاسای سێیەم : گۆڕینی ساڵی زایینی بۆ کۆچی**

ساڵی زایینی- ٦٢٢ +٤٣ = ساڵی کۆچی

٢٠١٢-٦٢٢+٤٣ = ١٤٣٣

**بەشی پێنجەم: گۆڕینی ساڵی کوردی بۆ کۆچی**

یاساکە: (ساڵی کوردی-١٣٢١,٦)×١٠٠÷٩٧

٢٧١٢-١٣٢١,٦×١٠٠÷٩٧

١٤٣٣.<u>٤٠٢١</u>

ئەو ژمارەیەی دوای فاریزەکە ماوەتەوە لە ٥٠٪ کەمترە  لایدەبەین و ساڵەکە وەك خۆی دەمێنێتەوە، وەك: **١٤٣٣** کۆچی

**بەشی شەشەم: گۆڕینی ساڵی کۆچی بۆ کوردی**

یاساکە: ساڵی کۆچی- (٣×ساڵی کۆچی)÷١٠٠+١٣٢١,٦

١٤٣٣-(٣×١٤٣٣÷١٠٠) + ١٣٢١,٦

١٤٣٣- ٤٢,٩٩+١٣٢١,٦

٢٧١١.٦١

ئەو ژمارەیەی دوای فاریزەکە ماوەتەوە لە ٥٠٪ زیاترە دەکرێت بە (١)و دەخرێتەسەر ژمارەکە، وەك: **٢٧١٢**

**بەشی حەوتەم : گۆڕینی ساڵی ئیرانی (هیجری شەمسی) بۆ ساڵی زایینی**

یاساکە: ساڵی ئێرانی+٦٢١= ساڵی زایینی

١٣٩١ + ٦٢١ = ٢٠١٢ زایینی

**بەشی هەشتەم: دۆزینەوەی ماوەی سەد ساڵی سەدەیەك**

بۆئەوەی خوێندکار بزانێت ماوەی سەد ساڵی هەر سەدەیەك لە ساڵی چەندەوە دەستپێدەکات و تا چ ساڵێك دەگرێتەوە ئەوا ژمارە (١) لە سەدەکە کەمدەکەینەوە ئەوکات دووجار ساڵی سەدەکە دەنووسینەوە ئەوەش یەکێکیان لای دەستەڕاست و ئەویتریان لای دەستەچەپ پاشان دوو سفر (٠٠) لەپێش ژمارەی دەستەڕاست زیاددەکەین و ژمارە (٩٩) بۆ ژمارەی دەستەچەپ زیاددەکەین بەمشێوەیە:

سەدەی (١٦)ی زایینی ژمارە (١) لە سەدەکە دەردەکەین و دەبێت بە (١٥)

ئەوکاتە ژمارەکە دووجار دەنووسین:

(١٥ - ١٥)

دواجا دوو سفر بۆ دەستەڕاست زیاددەکەین دەبێتە (١٥٠٠)و ژمارە نەوەد و نۆ بۆ دەستەچەپ زیاددەکەن و دەبێتە (١٥٩٩)

کەواتە سەدەی شازدە ماوەی سالآنی (١٥٠٠-١٥٩٩) دەگرێتەوە.

**بەشی نۆیەم: زانینی ساڵێک کە دەکەوێتە چ سەدەیەک**

لەم یاسایەدا خانەی یەکان و دەیان یان بە واتایەکیتر دوو ژمارەی یەکەمی ژمارەی ساڵەکە لادەبەین و ئەوکات ئەو ژمارەیەی کە دەمێنێتەوە لەگەڵ ژمارە (١) کۆیدەکەینەوە بۆ زانینی ساڵی سەدەکە، نموونە:

ساڵی (١٩٨٨) دەکەوێتە کام سەدەوە؟

١٩٨٨ دوو ژمارەی یەکەم دەبەین دەمێنێتەوە ژمارە (١٩)

١٩ + ١ = ٢٠ کەواتە ساڵی ١٩٨٨ دەکەوێتە سەدەی بیستەمەوە.

**بەشی دەیەم: نیوەی یەکەم و دووەمی سەدەیەک**

کاتێك دەڵێین نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم مەبەستمان ئەوەیە لە سەرەتای ساڵی ١٩٠٠وە دەستپێدەکات تا ناوەڕاستی ساڵەکە واتە ١٩٥٠واتە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم دەکەوێتە نێوان (١٩٠٠ - ١٩٥٠)، بەلآم کاتێك دەڵێین نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم ئەوا مەبەستمان ئەوەیە لە نیوەی دووەمی ساڵی ١٩٥٠وە دەستپێدەکات تا کۆتایی ساڵەکە واتە ١٩٩٩، ئەمەش واتە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم دەکەوێتە نێوان (١٩٥٠- ١٩٩٩) ئەمەش بۆ هەموو سەدە و ساڵەکانی زایینی بە هەمانشێوەیە.

**تێبینی(١):** کاتێك لەیاساکاندا دەڵێین ساڵی کۆچی یان ساڵی زایینی یان کوردی مەبەستمان هەموو ساڵێکی کۆچی و زایینی و کوردییە.

**تێبینی (٢):** ساڵی کۆچی (مانگی) کەمترە لە ساڵی زایینی (خۆری) هەر ٣٣ ساڵی کۆچییەك یەکسانە بە ٣٢ ساڵی زایینیەك و پێوستە ٣ی لێدەربکەیت و لەگەڵ ٦٢٢دا کۆیبکەیتەوە

**تێبینی (٣):** توێژەری بەڕێز ئەگەر هاتوو بەئاسانی لەم یاسایانە تێنەگەشتی بەکرداری یان بەئەنجامگەشتنی ئاساننەبوو بۆت ئەوا دەتوانی سەردانی ئەو سایتانە بکەیت لە (خاڵی حەوتەم و نۆیەم) کە لەخوارەوە سایتەکەی نووسراوە وەك خۆی کۆپیبکە و لە ئینتەرنێتەوە بەیستیبکە و دەجێتەسەر بەرنامەکە، بەلاّم ئاگاداربە ژمارە (٧) کە ریزبەندی ژمارەکانە لایبە و ئەوکات تەنها سایتەکە کۆپیبکە و دینێ لە ئینتەرنێتەوە، ئەمەش زۆر کارئاسانیت بۆ دەکات چونکە هەر ساڵێکی بدەیتێ راستەوخۆ بۆتدەگۆڕێت بۆ ساڵی هەتاوی و کۆچی و زایینی و لەوەش گرنگتر رۆژ و مانگی ساڵەکە دیاریدەکات، ئەمەش پێویستە لەبەردەستی هەموو توێژەرێکدا بێت کاتێك توێژینەویەکی مێژووی ئەنجامدەدات.

•••

**سەرچاوەکان**

شێرزاد سەعید محەمەد: بنەماکانی پێرست و پۆلێن لە کتێبخانە و بنکە زانیارییەکاندا، چاپی دووەم، ٢٠١١

وریا عومەر ئەمین: ساڵنامەی کوردستان، دەزگای ساڵنامەی کوردی، چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٢

گۆڤاری چەرمۆ: ژمارە (٦)، زستانی ٢٠٠٩، رووپەری ناوەوەی بەرگی یەکەمی

گۆڤاری چەرمۆ: ژمارە (١٤)، زستانی ٢٠١١، رووپەری ناوەوەی بەرگی یەکەمی

گۆڤاری مێژوو: ژمارە (٥)، زستانی ٢٠٠٨، سەروەر جەبار: چۆنیەتی زانینی ماوەی سالآنی سەدەکان و سەدەی ساڵەکان

گۆڤاری مێژوو، ژمارە (٦)، بەهاری ٢٠٠٨، سەروەر جەبار: ئایا لە هەموو کاتێکدا راستە ژمارە (٧٠٠+ساڵی زایینی)= ساڵی کوردی؟

http://www.elib.hbi.ir/persian/CLINICAL-EPIDEMIOLOGY/calendar%20converter4.htm

http://www.kurdzhin.net/forum.php/viewtopic.php?id=81365

http://www.9ate.com/hijri-converter.php

www.rwgash.info/meko/viewtopic.php

# تیڕامانێك له ژیاننامەی نالی

حەبیب جاف

له مێژووی ئەدەبی کوردیدا مشتومڕێکی زۆر هەیە لەسەر ژیان و مێژووی لەدایکبوون و مردنی شاعیره کلاسیکییەکان، هەمیشه لەلایەن نووسەر و مێژوونووسەکانی ئەدەبەوه چەند ساڵێکی جیاواز دانراوه بۆ مێژووی لەدایکبوون و مردنی شاعیرەکانمان، تائێستاش ئەو مێژووانه بەتەواوی یەکلانەکراوەتەوه، پێدەچێ نالی لەهەموویان زیاتر مشتومڕی لەسەربێت بەهۆی کۆچکردنی له کوردستان و نەگەڕانەوەی و مردنی له ئەستەمبوڵ، ئەگەرچی تائێستا نالی زۆرترین قسه لەسەر ژیاننامەی کراوه، بەڵام نەتوانراوه مێژووی لەدایکبوون و مردن و وێستگەکانی ژیانی دیاریبکرێت و گۆڕەکەشی بدۆزرێتەوه، مامۆستا (عەلادین سەجادی) پێیوایه نالی له ساڵی (١٧٩٧) له گوندی (خاکوخۆڵ) لەدایکبووه و له ساڵی (١٨٥٠) کۆچیدواییکردووه، بەڵام هەریەك له (محەمەد ئەمین زەکی بەگ و د. کەمال فوئاد و د. مارف خەزنەدار) پێیانوایه (نالی) له ساڵی (١٨٠٠) لەدایکبووه و له ساڵی (١٨٥٦) کۆچیدواییکردووه، بەپێی ئەو مێژووەی مامۆستا (عەلادین سەجادی) دایناوه نالی (٥٦) پەنجا و شەش ساڵ ژیاوه و بەپێی مێژووەکەی (محەمەد ئەمین زەکی بەگ و د. کەمال فوئاد و د. مارف خەزنەدار) نالی (٥٨) پەنجا و هەشت ساڵ ژیاوه.

مامۆستا (مەسعود محەمەد) پێیوایه دیاریکردنی ئەم مێژووه بۆ لەدایکبوونی (نالی)و کۆچیدوایی (بابی فلسێك لێکۆڵینەوەیان لەگەڵدا نەکراوه)، بەڵام (ئەحمەد محەمەد حەزراوی) له کتێبی (نزهة الفکر)دا له باسی نالیدا دەڵێ: له ساڵی هەزار و دووسەد و هەشتا و( ئەوەندە - نیف، دەکاته ژمارەیەك له (١-٩) هاتووەته مەککەوه که دەکاته (١٨٦٣-١٨٧٢) هاتووەته مەککەوه و دەڵێ: ئەم کەسه (مەبەستی نالییه) خاوەن پله و پایەیەکی زانستی بەرزبووه، پیرێکی سەنگینی کەنەفت بووه).

هەروەها باوکی مەلای گەورەی کۆیەش (حاجی مەلا عەبدوللای جەلیزادە) وتوویەتی: لە ساڵی (١٢٨٨ (١٨٧١ –١٨٧٢) نالیم لە مەککە بینیوە.

لێرەوە دەردەکەوێت ئەو مێژوویەی لەلایەن نووسەر و مێژوونووسەکانی ئەدەبی کوردییەوە دانراوە بۆ ساڵی وەفاتی (نالی) هەڵەیە، لەمەشەوە دەردەکەوێت هەروەك چۆن مێژووی کۆچیدوایی نالی هەڵەی گەورەی تیاکراوە، بەهەمانشێوە مێژووی لەدایکبوونیشی بەهەماندەرد برابێت، و نالیش تەمەنێکی درێژیکردووە کە چەندین ساڵ پێش ئەوەی بڕواتە ئەستەمبوڵ و لەکاتی رۆشتنی بۆ مەدینە کە پیریەتی رووبتێکردووە هەروەك خۆی دەڵێ:

**ئەی تازە جەوان! پیرم و ئــوفتادە و و کەوتووم**
**تا مــاوە حەیاتم**
**دەستێ بدەرە دەستی شکستەم کە بەسەرچووم**
**قوربانی وەفاتم**

– سەبارەت بە ژیاتی خێزانی نالی، هیچ بەڵگەیەك لەبەردەستدا نییە نالی ژنی هێنابێت، تەنها ئەوەندە لەشیعرەکانیدا دەردەکەوێت حەزی لە کچێك کردبێت لە ناوچەی قەرەداغ و لەشیعرەکانیدا بە (حەبیبە یان مەحبوبە) ناویهێناوە، هەندێك لە نووسەران پێیانوایە ئەو کچە خەڵکی گوندی (تەکیە)ی قەرەداغ بووە و ناوی (ئایشێ) بووە و کچی (شێخ جامی) بووە و بەڵگەشیان بۆ ئەم قسەیە شیعرێکی نالی خۆیەتی بۆ (حەبیبە – ئایشێ) وتووە لە وەڵامی ئەو کەسانەدا کە وتوویانە خێل و قیچە، نالی دەڵێ:

**پێم دەڵێن: مەحبوبە خێل و قیچە مەیلی شەڕەدەکا**
**خێل و قیچە یــان تەرازوی نازی نەختێك سەردەکا**

دەڵێن ئەم شیعرەی بۆ (ئایشێی شێخ جامی) گوتووە کاتێك نالی فەقێ بووە لە تەکیە، بەڵگەکەش ئەوەیە تائێستاش لە نەوەی (شێخ جامی) باوکی (ئایشی)دا تیلی و قیچی و خێلی وەك نەخۆشییەکی ویراسی چاو ماوەتوە و بگرە لەهەندێکیاندا لەوەش خەسترە.

– ئەوەش دەگوترێ نالی لە ئەستەمبوڵ ژنێکی تورکی هێناوە و دوای وەفاتی، ژنەکەی هەموو کتێب و پاشماوەکانی نالی سوتاندووە.

– سەبارەت بە شوێنی گۆڕی نالی لە کتێبی (عوسمانلی موئەلیفلەری)ی (محەممەد تاهیر بورسەلی) دەڵێ: (لە ساڵی ١٢٩٠ کۆچی لە حەجی شەریف گەڕایەوە، ئەو ماوەیەی کە لە ئەستەمبوڵ مایەوە، بەوپەڕی رێز و شکۆدارییەوە زانا و شاعیرانی ئەستەمبوڵ روویانتێدەکرد، پاش ماوەیەك وەفاتیکرد و لە گۆڕستانی (قاراجا ئەحمەد Karaka Ahmad) تەرمەکەی بەخاکسپێردرا.

– سەردەمی نالی سەردەمی تەریقەت و تەسەوف بووە لەسلێمانیدا و هاوزەمانی سەرهەڵدانی رێباز و تەریقەتێکی نوێ بووە کە تەریقەتی (نەقشبەندی خالیدی)ە، کە بووە مایەی سەرهەڵدانی ململانێی توند لەنێوان نەقشبەندی و قادری لەسلێمانیدا کە بە کۆچی یەکجارەکی (مەولانا خالید) لە سلێمانی ئەو کێشمەکێشە هێوربوویەوە، ئەگەرچی (نالی) لەو سەردەمەدا ژیاوە، تەنانەت شوێنی تایبەتی خۆی لە خانەقەکەی مەولانادا بووە و لەو تیرەیەی جافیش بووە کە (میکایلی)یە کە مەولاناش سەر بەهەمان تیرەیە، بەڵام نالی توخنی تەریقەت نەکەوتووە، ئەگەرچی کاریگەری عیرفانی لەسەربووە، ئەوەش وایکردووە نالی هەر وەك (حافزی شیرازی) پیری موغان بکات بە مورشیدی خۆی وەك رەندێك بژی هەروەك خۆی دەڵێ:

**بەزمی رەندانە ئەمە، مـــەلعەبەیی وەعـز نییە**
**لە بەد و نێکیی و قـــەللابیی دونیا نییـە باس**
**ئەمە جێی رەمز و ئیشاراتی دەروونە، لە گەرووی**
**تەنگی پڕ غەرغەرەیی واعیزی غەڕا نییە باس**

نالی زۆر هێرشیکردووەتە سەر سۆفی و زاهیدە رواڵەتپەرستەکان، هەر وەك دەڵێ:

**وەك سۆفیی سافیی مەبە ئالۆدە بە دونیا**
**بێهودە موکەدەر مەکە سەرچاوەیی مەشرەب**

یان دەڵێ:

**نالی كه ویقاری نییه، بێباكه له خەلقیی**
**سۆفیی كه سلووكێكی هەیه عوجب و ڕییایه**

یان ڕەندانه وەك حافز دەڵێ:

**ساقی وەره ڕەنگین كه به پەنجه لەبی ئەقداح**
**بـەم ڕاحه لەسەر ڕاحه دەڵێن ڕاحەتی ئەرواح**
**بەم كاسه لەســـەر پەنجەدەڵێن نوری علی نور**
**ڕەخشانه له میشكاتی قەدەحدا وەكو میسباح**

نالی دادەنرێت به دامەزرێنەری قوتابخانەی شیعر به زمانی كوردی شێوەزاری باشوور، ئەگەرچی پێش نالیش كەسیتر بەتایبەتی مەولانا خالید شیعریان بەم شێوەزاره وتووه وەك لەعەقیدەكەیدا دەردەكەوێ، بەڵام هیچ كەسێكیتر وەك نالی نەبووه به ڕێبازێك بۆ شیعری كوردی. ئەم ئەركەی كه نالی گرتیەئەستۆ كارێكی ئاسایی نەبوو بەڵكو ئەركێك بووه پێیسپێردراوه و نالیش خۆی تەرخانكردووه بۆ لێكۆڵینەوه له هەموو دیالیكته كوردییەكان بەمەبەستی دانانی زمانێكی ستاندارد و یەكگرتوو بۆ میرنشینی بابان، ئەگەر ململانێ و كێشمەكێشی نێوان برا و مامۆ دەسەڵاتدارەكانی بابان نەبوایه ئومێددەكرا ببێت به ناوكی قەوارەیەك لەئاییندەدا بۆ كورد و نالیش ئەركی دانانی زمانی ستاندەری كوردی ئەو قەوارەیەی پێسپێردرابوو به هاندان و تەكلیفی ئەحمەد پاشای بابان و مەولانا خالید. هەروەك ئەلیكساندەر خۆدزكۆ كه زمانزان و دیپلۆمات و ڕۆژهەڵاتناسێكی ئەورووپییه له ساڵی (١٨٥٣ – ١٨٥٤) له پاریس به هاوكاری ئەحمەد پاشای بابان نووسینێك سەبارەت به فیلۆلۆژی زمانی كوردی (شێوەزاری سلێمانی) دەنووسێت.. پاشان له ١٨٥٧دا بڵاویدەكاتەوه، كه خۆدزكۆ خۆی دەڵێ بەشی زۆری ڕووداو و ڕێزمانی كتێبەكه لەلایەن ئەحمەد پاشاوه نووسراوه، پاشان خۆدزكۆ عەودالی كەسێكی زمانزانی كوردی دەبێت ئەحمەد پاشاش باسی نالی بۆدەكات كه زمانزانێكی گەورەی میللەتكەیەتی و پێیدەڵی ئێستا ئەو له شامه و خۆی تەرخانكردووه بۆ لێكۆڵینەوه له دیالیكته كوردییەكان.

لێرەوە دەردەکەوێت کە نالی کەسێکی راسپێردراو بووە بۆ دانانی زمانێکی یەکگرتوو و ستاندار بۆ کورد، چونکە دوای ئاوابوونی میرنشینی بابانیش هەر بەردەوامبووە لە راپەڕاندنی ئەرکەکەی، بەڵام بەداخەوە هیچ لێکۆڵینەوەیەکی نالیمان لەسەر زمانی کوردیمان تائێستا نەدۆزیوەتەوە، بۆیە پێویست بە گەڕان و پشکنینێکی زۆر دەکات لە شام و ئەستەمبوڵ بۆ دۆزینەوەیان.

•••

**سەرچاوەکان:**

١. دیوانی نالی: لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس و فاتیح عەبدولکەریم، ئینتیشارات کوردستان، چاپی سێهەم، سنە ١٣٨٣.
٢. چەند لێکۆڵینەوەیەکی فیلۆلۆچی دەربارەی زمانی کوردی (دیالیکتیکی سلێمانی) ئەلیکسەندەر خۆدزکۆ، نەجاتی عەبدوڵڵا لە فرانسییەوە کردوویەتی بە کوردی، بنکەی ژین، سلێمانی ٢٠٠٥.
٣. نالی هەر لە لوتکەدایە، ئامادەکردنی م. عەلی، دەزگای چاپ و پەخشی حەمدی، چاپی یەکەم سلێمانی ٢٠٠٩.
٤. دیداری نالی، بەرهەمەکانی دیداری نالی ساڵی ٢٠١١، بەڕێوەبەرایەتی گشتی رۆشنبیری و هونەر لە سلێمانی، چاپی یەکەم، سلێمانی ٢٠١١.
٥. چەپکێك لە گوڵزاری نالی، مەسعود محەممەد، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، چاپی یەکەم بەغدا ١٩٧٦.
٦. مێژووی ئەدەبی کوردی، عەلادین سەجادی، چاپی دووەم، بەغدا ١٩٧١.
٧. مناظر الأنشاء، تأليف محمود بن محمد الطيلانى، تقديم و شرح الأبيات العربية بالفارسية الملا خضر النالي الشهرزورى، چاپی یەکەم، بنکەی ژین ٢٠١١.
٨. نزهة الفكر، تأليف: احمد محمد الحضراوي الملكى الهاشمى، حققه محمد المصرى، دمشق ١٩٩٦.

# جارێکیدی لەگەڵ حەزرەتی نالی

حەکیم مەلاساڵح

ئەم شاعیرە خواپێداوەمان گەلێ خوێندنەوەی بۆ کراوە و تاڕادەیەکی باش ئاشنایەتیمان لەگەڵ چرکە دەروونییەکانی و هونەرە بەرزەکەیدا پەیداکردووە، کەچی هێشتا خوێندنەوەیدیکە هەڵدەگرێ، چونکە ئەوەندە بە وردەکاری دەستی لەسەر پیت و وشە و رستە داگرتووە تادێ زیاتر بەرەو خۆیمان کێشدەکات،

من بۆخۆم بە جیاواز لە سەرسامبوونم بە هونەرە بەرزەکەی، سەرم لەوەشی سوڕماوە کە دەبێتە یەکەمین کەس بۆ پێکهێنانی زمانی ئیستانداردی گەلەکەمان، ئەوەش لەو رۆژگارەی ژیانی ئەم حەزرەتە خەمخۆرەی زمان و هونەردا کارێکی گەلێ زەحمەت و دژواربووە، ئەوێ رۆژێ وەك ئێستا کەرەستەی پێویست لەدەستدا نەبووە، وەك زانکۆ، کۆڕی زانیاری، یەکێتی نووسەران، بلاوکراوەی زۆر، بەرزبوونەوەی رادەی خوێندەواری و هتد. ئەم خۆی بەتەنیا شانیداوەتەبەر ئەو ئەرکە قورسە نەتەوەییە، بە ئەندازەی ئەو رۆژانە توانیویەتی بەپێی پێویست وشەی ئەملاولای زمانەکەمان بشیعرێنێ و گرەوی خۆی بباتەوە، دیارە ئەو سەردەمەش خەڵك هەبووە بڵێ: نالی خۆی بۆ خۆی زمان دادەتاشێ، دیارە ئەو خەڵکانە وەکو ئەم بەوردی ئاگایان لە زار و بنزارەکانیدیکە نەبووە، لەشیعرێکیدا دەڵێ:

**کەس بە ئەلفازم نەڵێ خۆکردییە، خۆ کوردییە**

**هەرکەسێ نادان نەبێ خۆی تاڵبی مەعنا دەکا. ل١٠٧**

بەداخەوە لەدیوانەکەدا نووسراوە (خۆ کوردییە، خۆ کردییە) کە هەرگیز بەمشێوە جێگەی مەبەستەکەی نالی ناگرێتەوە، چونکە شاعیر خۆی زمانی دانەهێناوە و پێماندەڵێ: ئەم تەرزە شیعرەی من دەینووسم وشەکانی ئەوە نین خۆم دامتاشیبن، بەڵکو لەم گۆشە و لەو کەناریدیکەی زمانی کوردیمان وەرمگرتوون و لەشیعرەکانمدا جێگام کردوونەتەوە، واتە دروستکراوی دەستی خۆم نین، بەڵکو کوردی پەتین و ئێوە لێیبێئاگان،

بەمەبەستی ئەوەی پتر قسەکەمان روونبکەینەوە دەبێ بڵێم لای هەندێ نووسەر خوێندوومەتەوە یاخود بیستوومە شیعرەکانی نالی بەشێوەی بنزاری (بابان) دەزانن، بەڵام ئەوەش وانییە و دەچینەسەر شێوەی ئاخاوتنی (بابان) کە شاعیرمان چۆن هەم لەڕووی گرامەر و هەم لەڕووی وشەوە چۆن لە شێوەی (بابان)ی تێپەڕاندووە و هەندێکی زۆری لێخستووەتە کەنارەوە و سفریکردوون بە مەبەستی مەبەستەکەی خۆی کە پێکهێنانی زمانێکی یەکگرتووە،

**یەکەم: لەڕووی زمانەوە**

١. لابردنی پاشبەندی (وانێ) کە لە بنزاری باباندا برەوی خۆی هەیە و لەجێگەیدا پەنای بۆ شێوەی (موکریان–سۆران) بردووە و گۆڕیویەتی بە (وە) بۆ نموونە دەچێتە سەر سەرواکانی ئەم پارچە شیعرە:

**گەرمی و تەڕپی بەهارە کە پشکۆ کوژایەوە**

**پشکۆی گوڵتەشین بە نەسیم بوو گەشایەوە. ل٥٤٨**

واتە گۆڕینی (کوژایەوانێ، گەشایەوانێ) بەوشێوەیە و لە هەموو شیعرەکەدا بەمشێوەیە، دیارە نالی زمانزان زانیویەتی پیتی زیادەن و لابردنی بۆ ئەمشێوە زمان چڕتردەکاتەوە، هەرچی نالیشە لە سەرجەمی شیعرەکانیدا هەوڵی جیدی بۆ دەربڕینی چڕوپڕ داوە، ئەمە و هەندێ نموونەیدی کە باسیانلێوەدەکەین ئەوەمان پێدەڵێن کە شاعیرمان کاری بۆ دروستکردنی زمانێکی ئیستاندارد کردووە و تەعەسوبی شێوەی بابانی خستووەتە کەنارەوە، لەکاتێکدا ئەوەش چاك دەزانین کە نالی چەند دڵبەندی کۆڵان بە کۆڵان و جێ بە جێی سلێمانی و پاشاکانی ئەو شارە و سوپاکەیان و تەنانەت (مەخە) شێتیش بووە،

٢. لەپاڵ (من)ی راناوی یەکەمدا گەلێجار پەنای بۆ شێوەی (سۆران–موکریان) بردووە و (ئەمن) ی بەکارهێناوە یا لە کرمانجی ژووروو (ئەز) خواستووە، دەڵێ:

**ناری سینەم گەر نەبێ، غەرقم ئەمن**

**ئاوی چاوم گەر نەبێ، سووتاوم ئەز. ل٢٢٢**

هەرچەندە لەکۆندا (ئەز) لە هەورامی و محاڵی سلێمانیدا هەبووە، وەك بابا ناووسی سەرگەتی دەڵێ:

**ئەز (ناووس)ە نان جەی بەرزە ماوا**

**ئاسیاوم نیـــاوە جـــەی تاشی کاوا**

هەروەها لە دیوانی سەیدی یەکەمیشدا پێشچاومان دەکەوێت وەك دەڵێ:

**ئەز ئوروموون مەکانم بی ولآتم**

**سەرو پیری خوای گیرەن خەلآتم**

(ئیبنولحاج)ی هەزارمێردیش بەر لە نالی بەکاریهێناوە، بۆ نموونە دەڵێ:

**ئەزم محەممەدی دڵرێش**

**حاڵم وەکی حاڵی دەروێش**

**٣**. هەندێجاریش (تۆ)ی راناوی دووەمی گۆڕیوە بە (ئەتۆ) کە ئەمەی لە بنزاری (سۆران- موکریان) هێناوە، دەڵێ:

**(ئەتۆ) میهری و مەهرووییان ستارەن**

**لە خزمەت شەوقی تۆدا شەوچرا چین؟. ل٣٤٨**

**٤**. یەکخستنی هەردوو راناوی (تۆ- من) بەشێوەی (تۆم) وەك دەڵێ:

**هەتا (تۆم) ئاشنابووی ئاشنـــام بوون**

**ئەمێستا موو بە مووم ئەغیارە بێ تۆ. ل٣٨٣**

بە پێوانەی زمانی باو دەبوو بیگوتایە (هەتا تۆ ئاشنام بووی،،)

٥. گۆڕینی پێشگری (ئە) لەکاردا بە (دە) وەکو لەبابانیدا دەگوترێ (ئەخۆم، ئەڕۆم، ئەوێ) هتد، وەك دەڵێ:

**گەر دەپرسی من لەبەرچی کەم (دەخۆم)**

**من بە برسی قەت مەزانە خەم (دەخۆم). ل٢٩٥**

یا:

**بۆ جیواری حەق لە هەرجێ سیدقی نییەت کافییە**

**من لە – بیت اللّٰە– ئینشەڵلاً– بأژن اللّٰە (دەڕۆم). ل٣٠١**

یا:

**یار دڵی خوێنین و چاوی پڕ لە گریانی (دەوێ)**

**ئارێ ئارێ گوڵ لە باخان ئاوی بارانی (دەوێ). ل٧٠١**

٦. گۆڕینی شێوە دەربڕینێکی بابانی بەشێوەیەکیدی، وەك (حەوشەییێکە) بۆ (حەوشێکە) دەڵێ:

**مەڵێ: دەشتە، بڵێ: دنیا هەموو خانێکە ئەم حەوشە**

**چ (حەوشێکە)؟ کە ئافاتی حەسار، ئەفلاکی سەربانە. ل٤٩١**

یا

(پەردەییێکی) بۆ (پەردێکی) وەك دەڵێ:

**وەک خەیمە بە (پەردێکی) دوو ئەستوونە بە پا بێ**

**سەرتیلەکی نەختێ بە نەزاکەت قڵەشابێ. ل٦٠٩**

یاخود نموونەی ئەم وشانەیدیکەشی هەیە (نوکتێکی، موددێکی، جێگێکی، کاسێکی، قەترێك، غونچێك، پارێك، هتد..).

ئەم دارشتنەشمان لەلا روون نییە کە لە کام زاراوە و بنزاراوەی زمانەکەمانی قەرزکردووە، لەوە دەبێ داهێنانی خۆی بێت بۆ چڕکردنەوەی وشە و کورتبڕی کە ئەمەش لەدیوانەکەیدا زۆر بەرچاودەکەوێ، گەلێ دەستی بە وشە بەڵکو بە پیتیشەوە گرتووە، ئیتر ئەوە نالییە و سیحری بەیان، نالییە و حیکمەتی شیعر، نالییە و کە بۆخۆی دەڵێ:

**(نالی) عەجەب بە قووەتی حیکمەت ئەدا ئەکا**

**مەعنایی زۆر و گەورە بە لەفزی کەم و بچووک. ل٢٦٠**

یاخود دەدا بەگوێماندا و دەڵێ:

**یا لە مەیدانی فەساحەتدا بە میسلی شەهسەوار**

**بێ تەئەممول (بەو هەموو نەوعە زوبانی رادەکا). ل١٠٦**

یا هەر لە خۆی دێ بڵێ:

**نووکی خامەی من کە بێتە مەعنائارایی کەمال**

**خەت بە خەت ئیزهاری نەقشی سوورەتی (مانی) دەکا. ل١٠٣**

٧. لە بنزاری باباندا وشە گەلێك کە بە (ند) کۆتاییان دێت دەبێتە (نگ) کە لەناو بڕناخدا گۆیدەکەن، وەکو (دەربەند= دەربەنگ، زەبەند= زەبەنگ، گۆبەند= گۆبەنگ و هیدی،،) کەچی نالی بازی بەسەر ئەمەشدا داوە و پەیڕەوی بنزاری بابانی نەکردووە، بۆ نموونە مەدهۆش دەڵێ:

**سنگم بچەسپێ لە سنگی**

**هەڵیمژم زۆر بە تونگی**

بەلام نالی (ند)ەکەی نەگۆڕیوە و لە (نگ)ەکەی بە فراوانتر زانیوە لەناو زمانەکەماندا وەك دەڵێ:

**کە لێڵ و سوور و کول بوو چاوی تیژت**

**(ئەوەندە) پێیدەڕێژی خوێنی ناحەق. ل٢٥٣**

یا دەڵێ:

**خانەقاش هەروەکو مەیخانە، کە هەر ئاوا بێ**

**مەجلیسێکی هەیە، ئەمما گەپ و (گۆبەند)ی نییە**

وەکو وشەش ئەوە گەلێ وشەی لە زار و بنزارەکانیدی کۆکردووەتەوە، ئەوانەش وەکو:

١. جوێ= جیا کە لەشێوەی جافدا بەکاردێ، وەك دەڵێ:

**بێ (جوێ) بوونەوەی، زەخم و برین و ئەسەرێ**

**تیری موژگانی درێژت لە جگەر تێدەپەڕێ. ل٦٥**

٢. ئەڵێم، دەبێژم لە کرمانجی ژووروودا بەکاردێ، لەجافیدا (یەژم) لە ئەردەلاًنیدا (ئەیژم) لە کەڵهوڕی و فەیلیدا (ئویشم)، دەبێژم، یەژم، ئەیژم، ئویشم هەموو یەك ریشەن:

**دەورانییە، وەك هێڵەکی سەودا، سەری گێژم**

**بۆیە بە دەقیقی مەسەلە هەرچی (دەبێژم). ل٢٧٦**

٣. دەرێ= دەرەوە، لە سۆرانی- موکریانی خوازراوە، دەڵێ:

**گەر بێیە (دەرێ) سەرووی رەوانی لەئیرەمدا**

**وەر نەییە (دەرێ)، ئاهوویی چینی لەحەرەمدا. ل٩٣**

بێیە= بێیتە، نەییە= نەیەیتە، وەر= کورتکراوەی (وە ئەگەر) رەنگە ئەم سێ وشە داتاشراوی شاعیر خۆی بن، یا ئێمە رێگەمان پێنەبردوون کە لە کوێی کوردەواریدا بەکاردێن،

٤. بڕوات، لەناو جافدا بەکاردێت، دەڵێ:

**ئەم (بچێ) ئەو دادەنیشێ دەم وەکو گوڵ خەندەران**

**ئەم دەبێ هەستێ کە ئەو بێ، چاو یەک و قەترە هەزار. ل١٧٣**

٥. سك، لە (سۆرانی-موکریانی) وەرگیراوە، دەڵێ:

**بن (زک)و جەبهەت سپی، کلک ئیستر دامەن سیا**

**یەککەتاز و، سێبڕ و، دوو باد و، شەشدانگ و درێژ. ل٢٢٥**

٦. ئەمێستا= ئێستا، دەڵێ:

**سەرخۆشی شەرابی دەمی تۆ بووم و (ئەمێستا)ش**

**قوربان، سەری تۆ خۆش، کە نەماوە سەری خۆشم. ل٢٨٢**

٧. نادیدە= نەبینراو، دەڵێ:

**وەک تووڕەیی پێچیدەیی تۆ ساغ و شکستەم**

**وەک نەرگسی (نادیدە) بێ تۆ خۆش و نەخۆشم. ل٢٨١**

٨. شوشتن= شتن یا شۆردن، بەوشێوەی مەبەستمانە لە (سۆرانی-موکریانی)دا بەکاردێ، دەڵێ:

**مووی سپی کردم بە (شوشتن) ئاوی عەینی شۆرەشەت**

**شۆرەشەت یەعنی کە تێیدا خود بە خود قەل بوو بە بەت. ل٢٤٢**

٩. بێن= بۆن، دەڵێ:

**خاتیری زاهیدی خاڵی، خاڵیی**
**نییە، ئەڵبەتە لە (بێن)ێکی ریا. ل١٢٧**

١٠. ئە= بۆ، لەناو جافدا دەگوترێ (ئەدەر= بۆ دەرەوە) یا بە واتای (لە)یش بەکاردێ، وەکو دەڵێن (ئە)ڕووی سەر= لەڕووی سەر، دەڵێ:

**(نالی) ئەو وەحشی غەزالە کەس (ئەبەر) داوی نەکەوت**
**چونکە شاهێنی دووچاوی تیژە، دائیم سەردەکا. ل١١١**

١١. کن= لا، لە سۆرانی و موکریانیدا بەکاردێ، دەڵێ:

**لە (کن) من با وجوودی ناس و ئەجناس**
**کەسی تێدا نییە ئەم شارە بێ تۆ. ل٣٨٣**

١٢. ردێن= ریش، لە سۆرانی و موکریانی وەرگیراوە، دەڵێ:

**غوباری ئەو شەو و رۆژەن (ردێن)ی ماش و برنج**
**کە تێکەڵن شەبەهی سوبح و شام و شیر و قیر. ل٢٠٨**

١٣. لەوڕا= لەئەوڕا، (ڕا) لە بنزاری موکریاندا هەیە و لە زمانی فارسیشدا زۆر بەکاردێ لەکوردیدا دەگوترێ (لەتۆڕا بۆ من= لەلایەن تۆوە بۆ من)، دەڵێ:

**ئەی رەفیقان سوحبەتی (نالی) مەکەن**
**بۆچ؟ کە من لەوڕا وەکو بەدناوم ئەز. ل٢٢٣**

١٤. ئیدی= ئیتر، لە سۆرانی و موکریانیدا برەوی هەیە، دەڵێ:

**کە تۆ هاتی لە نەومیدیی نەما باس**
**لە هیجر و ئینتیزار (ئیدی) نەما باس. ل٢٣٠**

١٥. هەڕۆ= بڕۆ، لەناو جافدا بەکاردێ، دەڵێ:

**ئەی نەفسی مورائی چ گرانباری، تەکالییف**
**بۆ خەڵکی دەکێشی دە (هەڕۆ) ڕێش و جەدەو بی. ل٢٩٢**

١٦. بنواڕە- بڕوانە، لەناو جافدا بەکاردێ، هەندێجاریش کورتیدەکەنەوە بۆ (بنوا)، دەڵێ:

**بنواڕە وشکە سۆفی و ڕەقسی بە هەلهەلە**
**دیسان لە بەحری وشکی هەوا کەوتە پێمەلە. ل٤٦٦**

١٧. بلاّ= لێبیگەڕێ، زۆرتر لە شێوە زارەکانی باشووردا بەکاردێ (فەیلی، کەلڕی، لەکی)، دەڵێ:

**(بلاّ) بۆ کوندەبوو بێ، مفتی مشك و ماری کەندوو بێ**
**خەتیرەی گەنجی وێرانە، زەخیرەی کونجی کاشانە. ل٤٨٣**

١٨. گوم- ون، بزر، لەناو جافدا بەکاردێ و زۆرجاریش کورتدەکرێتەوە بۆ (گم)، دەڵێ:

**لەنێو ریگی ڕەوانی قوم، نوقوم بوو وشتر و بوو (گوم)**
**نەما گوێی بیستنی (قم قم) چ جای ئیمکانی هەستانە. ل٤٩٠**

١٩. کوچه کوچه= کەم کەم، کوچه یا کوچێ لەهەورامیدا بەکاردێ، دەڵێ:

**(کوچه کوچه) خونچەکەی پەیکانی موژگانی گوڵم**

**بۆ شەهیدی شاهیدە دائیم کە خوێنم جارییە. ل٥٨٤**

یا دەڵێ:

**دا کوچه کوچه خۆڵی بەسەردا بکا بەچنگ**

**لەم خاکە ئەفخەرە کە هەموو تاج و ئەفسەرە. ل٤٢١**

وشەی (کوچه) لەدیوانەکەدا و لە هەردوو شیعرەکەدا بە (کووچەی) بەواتای کۆڵان لێکدراونەتەوە، بەڵام وانییە و با خوێنەر سەرنجی هەردوو ماناکە بدات،

٢٠. وەیە= وەهایە، ئاوایە، لە سۆرانی و موکریانیدا بیستوومە، شاعیر دەڵێ:

**عادەتێکی هەیە هەرگیز لە کەس ناپرسێ**

**زاڵمێکی وەیە قەت خەوفی خوداوەندی نییە. ل٥٩٢**

لەدیوانەکەدا (وەی) بە بەلا لێکدراوەتەوە، دەکرێ نالی لە هونەری خۆیدا هەردووکیانی لەبەرچاو گرتبێ، چونکە شتی بەم چەشنەیدیکەی زۆر هەیە، وەك ئەو راستییە دەزانین و خۆیشی پێماندەڵێ:

**نەزمی (نالی) میسلی ئاو و ئاوێنە رەنگی نییە**

**دووڕووە بۆ سەیری خاتر، یەک خەفی و یەک ئاشکارە. ل١٧٤**

٢١. هە= هەیە، لەناو جافدا بەکاردێ، هەندێجاریش بەشێوەی (هەس) بەکاردێ، وەك دەگوترێ: (کوڕێکی هە فرە ژیرە) یا دەگوترێ: (ماڵێکی هەس یەژی بەهەشتە)، شاعیر دەڵێ:

**یاخود وەکو خۆی شاهیدە با وەسفی وەها بێت**

**سیمین مەمێکی (هە) کە تازە قڵەشابێ. ل٦١٧**

٢٢. ببیەن= ببیستن، دەڵێ:

**خەڵقی هەموو کودەکن و بەستە زوبانن**

**با بێن و لە (نالی) (ببیەن) شیعری سەلیقی. ل٦٥٧**

٢٣. یەکدی= یەکتر، لە موکریانی و سۆرانیدا هەیە، دەڵێ:

**قەدری من چەندە لەلای دەوڵەتی دنیایی دەنیی**

**قەدری ئەو کەمتر و هەردوو لە غەمی (یەکدی) غەنیی. ل٦٦٧**

٢٤. دەرەقسێ= رەقس دەکا، لەشێوەی ئەردەلانیدا بیستوومە، دەڵێ:

**هێندە دڵخۆشە لەبەر سەبزی بۆ دار و دەوەنی**

**کە (دەرەقسێ) وەکو شاخ و فەنەن و نەستەرەنی. ل٦٦٨**

٢٥. چشتێکی= شتێکی، لە سۆرانی و موکریانیدا هەیە، دەڵێ:

**گەدا ئینسان و دنیا غوربەتە (من حیپ لا تشعر)**

**بە هیممەت تالیبی (چشتێکی) نازانی بڵێی ناوی. ل٦٨٦**

٢٦. چار= چوار، زۆرتر لەسۆرانیدا بیستوومە، دەڵێ:

**لەگەڵ ئال و لەگەل سەحبی، خسوسەن چار یاری دین**

**ئەبوبەکر و عومەر، عوسمان و حەیدەر، شێری یەزدانە. ل٥١٧**

٢٧. زاناندمان= زانیمان، یا ( سەلماندمان کە بیزانین)، دەڵێ:

**لوتفی بانگوش بوو کەوا لەم حوجرەدا (زاناندمان)**

**گەر بەنیئادەم بخنکێتن سەراوە نەک بناو. ل٣٦٥**

ئەم وشەیەم لە هیچ شوێنێك نەبیستووە، دیارە داهێنانی شاعیر خۆیەتی.

٢٨. تیژاو= تیزاب، تیزاب فارسییە کە کردوویەتی بە کوردی (تیژاو) دەردەچێ، ئەمەش کاری خۆیەتی چونکە هەموو هەر بە (تیزاب) یا (تێزاب) بیستوومانە، دەڵێ:

**(تیژاوی) سوروشکم وەکو ئیکسیری سوهەیلە**

**رووخسارەیی زەردم وەکو ئەوراقی خەزانە. ل٤٧٩**

٢٩. زوڵفەین= هەردوو زوڵفی، ئەم وشەیە بەمشێوەیە لەکوردیدا نەبیستراوە، نالی خۆی لەسەر شێوازی گرامەری زمانی عەرەبی کردووە، دەڵێ:

**موساوی وەک یەک و لوولن لە هەردوو لاوە زوڵفەینی**

**نموونەی عەکسی حەرفی (میم)و (نون)و (واو)ە زوڵفەینی. ل٦٧٤**

٣٠. نێو= ناو، لە سۆرانی و موکریانیدا هەیە، دەڵێ:

**ئیسپاتی خەت و خاڵە، بە سەد شووشتن و گریان**

**ناچێتەوە ئەم نوقتە لە (نێو) دیدەیی تەڕدا. ل٨١**

٣١. نەگەیی= نەگەشت، لەناو جاف و ئەردەلآنیدا بەکاردێ، دەڵێ:

**عومرێکە بە میزانی ئەدەب توحفە فرۆشم**

**زۆرم وت و کەس تێی (نەگەیی)، ئێستا خەمۆشم. ل٢٨٠**

٣٢. قەشقە= ئارەزوو، دەڵێ:

**رەقیبی جوفتەلی، نابێتە نەخچیرت کە خەرِ کورِە**

**ئەلیفی چایرە دائیم لە قەشقەی کەردرِ و جەودا. ل٨٧**

لەدیوانەکەدا وشەی (قەشقە) واتاکەیان بۆ ساغنەکراوەتەوە، ئێمەش لە فەرهەنگی هەنبانە بۆرینەدا دۆزیمانەوە، ئەمانە و هەندێ وشەیدیکە کە ئەگەر زمانزانەکان بەوردی پشکنینی دیوانەکەی بکەن زیاتریان دێتبەدەستەوە، بەگشتی مەبەست ئەوەیە کە نالی ویستوویەتی زمانێکی یەکگرتووی کوردی پێکبهێنێ و کاری باشی لەسەرکردووە، تەمەنێك بەدوای ئەدا (گۆران) دێت کە بەشێوەیەکی زۆر لەبەرچاو زمانەکەمانی خاوێنکردەوە لەو شەپۆلە وشەیەی فارسی، عەرەبی، تورکی کە خزابوونەناو شیعر و وتارەکانەوە، هەروەها گۆرانیش لە قۆناغی خۆیدا بوو بە قوتابخانەیەك کە شاعیری زۆری بەدواداهات وەك (حەسیب قەرەداغی، دیلان، کاکەی فەلاح، جەمال شارباژێری و هەوری و هەردی و پیربالّ مەحمود و سوارەی ئێلّخانیزادە و تاگەشت بە شێرکۆ بێکەس و عەبدوڵلا پەشێو و تائێستا)، واتە ئەگەر ئێستا بە پێوانەی ئەدەب بەراوردبکەین ئەوا زمانی ئێستەی ئەدەبی کوردی زۆر لەسەرووی زمانی فارسی و تورکی هاوسێمانەوەیە، واتە زمانە ئەدەبییەکەی ئێمە پوختەترە و لەدوای گۆران مامۆستایەکی پایەبەرزی وەکو (ئیبراهیم ئەمین بالّدار) دێتەمەیدان کە بە (دار، دارا)کەی و وێنە جوانەکانی زمانی گەلەکەمانی لە شالآوی وشەی بێگانە پاراست و پاکیکردەوە، بوو بە سەرمایەیەك بۆ چەند نەوە و منەتباری کردین،

لەمرِووەوە هەر بچینە سەر گۆرِە نادیارەکەی حەزرەتی نالی و بڵێین: ئەی مامۆستا گەورەکەمان ئەگەر جەنابت بەو هونەرە بەرزە و بەو هەموو قەرز و قۆڵەی زار و بنزارەکانیدیکە

ئەو خەرمانە سوورەت دروستنەکردایە و ئەو هەرایەت نەنایەتەوە ئێستا زمانەکەمان بە لازەبوونی دەمایەوە و دەبووینە پاشکۆی زمانەکانی عەرەبی، فارسی، تورکی، کەواتە قەڵەمە بە نرخەکەی تۆ و هەستە خاوێنەکەت و کوردایەتییە بێگەردەکەت بوونە رچەشکێن و لە تۆوە فێربووین کە بە دڵێکی پڕەوە خەمێکی زمانە کۆیلەکەمان بخۆین.

ئەز پێموایە تائێستاش وەك ئەوەی نالی خۆی مەبەستی بووە، دیوانەکەی ساخ نەکراوەتەوە، چونکە لەم دیوانەیدا کە خوایار کاك فاتیحی مەلا عەبدولکەریم رەنجێکی زۆری لەگەڵدا کێشاوە و دەستەودامێنی حەزرەتی باوکی و کاك محەممەدی برای بووە، هێشتا هەستدەکەین کە ناتەواوی تێدایە، ئەو ناتەواویانەش لەم خاڵانەی خوارەوەدا پێشچاوی خوێنەرانی دەخەین، تا بەڵکو هەڵبکەوێ لە ئەنجامی مشتومڕدا دیوانەکەی نالی نالییانە ساغ و پاکبکەینەوە، بۆخۆم لێرەدا هەندێ سەرنج لەسەر دیوانی چاپکراو دەخەمەڕوو:

١. مل:

**فەیازی ریازی گوڵ و میهر و مل و لەعلی**

**ئەی شەوقی روخ و زەوقی لەبت زائیقە بەخشا. ل٧٦**

**ئەو فەت و وەفاتە سەبەبی عەهد و وەفاتە**

**چوو ساعیقەیی بەردی عەجووز و گوڵ و ما هات. ل١٤٢**

لەهەردوو بەیتەکەدا وشەی (مل) نابێ و لەجێگەیدا (مول) راستە بەواتای (شەراب)

**٢. ئەمجا مەوەستە تا دەگەییە عەینی (سەرچنار)**

**ئاوێکە پڕ لە نار و و هەنار و گوڵ و چنوور. ل١٧٨**

لەباتی (چنوور) گوڵی (چو نوور) راستە بەپێی نوسخەی (ت)و (مز) چونکە گوڵی وەك نوور سپی مەبەستی گوڵەفەقێیە کە پەڕەکانی سپی تێرن.

**٣. شارێکه عەدل و گەرمە، له جێگێکه خۆش و نەرم**
**بۆ دەفعی چاوەزارە دەڵێن شاری شارەزوور. ل١٨٣**

دیاره نوسخەی (چن)و (اح) راسته که نووسویانه:

**شارێکه عەدل و گەرم، له جێگێکی خۆش و نەرم**

چونکه بەمپێیه هەردوو وشەی (گەرم)و (نەرم) دەبنه جیناسی لاحیق.

**٤. حەنایی کردووه پەنجەی به خوێناوی دڵی زارم**
**ئەمه رەنگه شەهادەت بێ که کوشتەی دەستی دڵدارم. ل٢٧١**

نوسخەکانی (کم)و (گم)و (من) راستن که (خوێناوی)یان نووسیوه، چونکه هونەری ئەوەش به بەیتەکه دەبەخشێ که لەنێوان (خەناوی)و (خوێناوی)دا جیناسی ناقیس دروستدەبێ، ئەمه جگەلەوەی که (خەنه) کوردییه و (حناء) عەرەبییه.

**٥. بەس گریه بکه بۆ پودەر و بابی حیجابت**
**بێ بابی تۆ موریسه بۆ وەسڵ و مولاقات. ل١٤٠**

بەس گریه بکه بۆ باوکی مردووت و باوی روو له من پۆشینت، مردنی باوکت دەبێته میراتییەك بۆ تۆ که دیدار و بەیەکگەشتنته به من، (باب) دەرگا، یا باوك نییه بەڵکو لەکوردیدا واتای (باو)یش وەردەگرێ، وەك دەگوترێ: (لەکۆندا بابی شتی وا نەبوو) یا (ئەوه لای ئێمه باب نییه) هێنانی (باب) بەواتای (باو) بەدوای (پودەر)ی به واتای باوك له سیحرەکانی شاعیره.

**٦. ئەو پیری خەرەف، ئافەتی مەردیی و سەفا بوو**
**تۆ شۆخ و جوان، دووربی له ئافات و خەرافات. ل١٤١**

لەباتی (مەردییو) دەبوایە لەناو نوسخەکاندا پشت بە نوسخەی ( چن) ببەسترایە کە (مەردانی) نووسیوە ئەوکاتە وشە دوانەی (مەردانی سەفا) دەبێتە (ئەهلی کەیف و خۆشی).

**٧. عومری بێ حاسڵی من چوو بە عەبەس**

**ئەمەکم هەرچی هەبوو چوو بە عەبەس. ل١٥٥**

بۆ ساغکردنەوەی ئەم بەیتە دەبوو نوسخەی (عم) لەبەرچاو بگیرایە کە لەباتی (چوو)ی دووەم (بوو)ی نووسیبایە، چونکە (بوو) لەگەڵ (چوو، بەدخوو، بفەرموو، ئەرجوو) دەبنە قافیە و هەموو بە (عەبەس)ەکان رەدیفن.

بەیتی پاش ئەم (میهری بێ میهر روخت گیراوە

**لە منی سایە سیفەت چوو بەعەبەس)**

لەباتی (چوو) نوسخەکانی (عم)و (کم)و (ت) - بوو-یان نوسیوە کە ئەمەش هەر نابێ چونکە دەبێتە دووبارەکردنەوەی قافیەکە ئەوەش نالییانە نییە، کەواتە دەبێ نوسخەیدیکەی پەیدابێ، چونکە گرفت لە (میهری بێ میهری روخت)یشدا هەیە.

**٨. فووتوری چاوەکانت نانوێنێ**

**بە (نالی) فیتنە بەس بنوێنە، قوربان. ل٣١٦**

لە یەکێك لە بەیازەکانی کە لامن لە باتی (نانوێنێ) نووسراوە (مەی نوێنە) بەواتای مەی یا شەراب دەنوێنێ (چاوەکانت مەستی دەنوێنن) چاوی مەست لە زۆر شیعردا جێگەی گرتووە.

**٩. شکاری وەحشییان بەس دەستەمۆکەن**

**نەوەك بەربێ شکاری خانەزاتان. ل٣١٩**

له هەموو شیعرەکەدا نالی رووی دەمی له پاشا و سەرانی بابانە، لەم بەیتەشدا (شکاری وەحشی) مەبەست (مەولەوی) شاعیرە کە دواپلەی خوێندنی دێنێتەوە سلێمانی و سەرانی بابانیش دڵی رادەگرن، بەلاّم نالی ئەوەی بەلاوە قورسدەبێ چونکە خۆی بە (سەرکردەی دژی غەم) یان و هەر خۆشی بەوە دەزانێ (سەری قەڵغان بێ بۆ تیری قەزایان) هەرچی مەولەویشە تەمەنێکی خوێندنی لەژێر سایەی والییەکانی ئەردەلاّندا بەسەربردووە کە ئەو دەمورۆژگارە هەردوو میرنشینی (بابان، ئەردەلاّن) ناکۆکبوون، ئێستا کە هاتووەتە ژێر سایەی میرانی بابان بەلای نالییەوە زۆر گونجاو نابێت و دوا بەیتی شیعرەکە کە دەڵێ:

**ئەوەند ئەرجوو دەکا (نالی) کە جارجار**

**بکەن یادی موحیبی بێ ریاتان**

(موحیبی بێ ریاتان)یش تانوتێکیترە کە گرتوویەتیە مەولەوی و ئەم بە ریاباز دەداتەقەڵەم، واتە دەمێ لای ئەوان و دەمێ لای ئەمان خۆی دەباتەپێشەوە.

**١٠. کوفری زوڵفەتار و ماری ئەرقەمن**

**سفری خاڵە، حەڵقەیی هیندوسییان. ل٣٢٣**

قسەمان لەسەر (حەلقەیی هیندوسییان)ە، هیندووسییان دەکرێ بە (هەندەسییان)یش بخوێنرێتەوە، هەم بەواتای (هیندە رەش)ن و هەم بەواتای (ئەندازەییان) مەبەست لە ئەندازەیی خڕێتی ئەڵقەیە.

**١١. نەوای ئاهەنگی (قەدقامەت) تەریقی جەمعی زوهادە**

**قەد و قامەت بە لەهجەی (راستی) تووبایی (عوششاق)ە. ل٤٥٦**

بەیتەکە بە (نەوا- ئاهەنگ) دەستپێدەکات، هەردووکیان پەیوەندییان بە وشەی (راستی) و (عوششاق)ەوە هەیە کە هەردووکیان دوو مەقامی مۆسیقایین، بەمەش واتایەکیدی بۆ بەیتەکە دروستدەبێ، ئەوە با خوێنەر بچێتەوە سەر دیوانەکە و ئەم دوو واتایەش لەبەرچاو بگرێ.

**١٢. واقیعەن خانەقە خۆش زەمزەمەییکی تێدایە**
**بەڵا قەندی هەیە، گەندی هەیە، رەندی هەیە. ل٥٩٥**

لە جێگەی (قەند)کە واتایەکی وا نادات بەدەستەوە (فەند) دروستە، بەواتای فڕوفێڵ.

**١٣. عادەتێکی هەیە هەرگیز لە کەسێ ناپرسێ**
**زاڵمێکی وەیە قەت خەونی خوداوەندی نیە. ل٥٩٢**

(کەسی) راستە لە جێگەی کەسێ، بەمەبەستی (کەسی خۆی)، چونکە قسەیە لەسەر حەبیبە، وەك لە بەیتی پێشەوەدا دەڵێ: ئاخ لەگەڵ ئێمە (حەبیبە سەروپەیوەندی نییە.. هتد).
وشەی (وەیە) جگەلە واتای (بەڵا) بە مەبەستی (وایە، وەهایە)ش کە دەربڕینەکە لەشێوەی (سۆران-موکریان).

**١٤. بنوارە نەوبەهار و فوتوحاتی گوڵشەنی**
**گوڵ زاری کردەوە، لە دەمی، خونچە پێکەنی. ل٦٦٢**

(زار)و (دەم) یەك واتایان هەیە و لە هونەری نالی دوورە کاری وابکات، بۆیە جوانتروایە کە (لەدەمی) نەبێ و (لەدەمێ) بێت (لەوەدەمەی) ئەوکاتە واتای نیوە بەیتەکە دەبێتە: گوڵ دەمیکردەوە لەوەدەمەدا کە خونچە پێکەنی، خونچە کە پێکەنی و گەشایەوە دەبێتە گوڵ.
سەروای ئەم پارچە شیعرە بەمشێوەیە (گوڵشەنی- پێکەنی- تەنی- رۆشنی-ئێمەنیی- غەنی- راچنی- دامەنی- ئەیمەنی) بۆ جوانتر رێکخستنی سەرواکان (رەوشەنی) راستە تا (رۆشنی)، (راچەنی)ش راستە تا (راچنی)

**١٥. هەر دارە بەرگ و، هەر گوڵە رەنگێ خەڵاتییە**
**هەر جوودی نەوبەهارە کە عالەم دەکا غەینی. ل٦٦٤**

بۆ واتای (بەرگ) بەداخەوە هەڵە هەیە، بۆ واتاکەی نوسراوە (هەر درەختێ ئەگری بەرگی گەلای نوێی پۆشیوە) وا نیشاندەدرێت کە نالی بەرگی لە جێگەی جلوبەرگ دانابێ، بەلام وانییە و بەرگ بۆخۆی بەواتای (گەلا) دێت.

لێرەدا بەم پازدە وشەیە وازدێنم و با ئەوانیدیکەی بمێنێت بۆ کتێبەکە.

**هەندێ وشەی دوور لە هونەری نالی**

لەدیوانەکەدا بە هەندێ وشە دەگەین کە نالییانە نین و پێویستە نوسخەیتر بێنینە دەست تا لەم گرفتەش قوتاربین، وشەکان بە ژمارە زۆر نین، بەلام ئێجگار دوورن لە سەلیقەی شاعیرەوە و پێموایە هەڵەی نەسساخەکان بێت، چونکە کاری بەمشێوە لە هەندێ شاعیر دەوەشێتەوە کە نەبوونەتە قووتابخانە یا سەرقوتب، واتە ئەوە نین کە( بە داوە شەعری دەقیقی خەیاڵی شیعر- بۆ ئەو کەسەی کە شاعیرە سەد داوی نایەوە)، وشەکان بریتینلە:

**١. هەرچەندە کە ئینسانە لەبەرچاوی من و تۆ**
**مومکین نییە ئەم لوتفە لە ئینسان و بەشەردا. ل٨١**

(ئینسان و بەشەر) یەکێکن، هێنانی هەردووکیان پێکەوە هونەری نین.

**٢. ئیلتیقای پۆلاو و ئاسن هەرنیزاعە و گیرودار**
**جەمعی ( ماءو نار) و ( زەند و زەندە) و ( مەرخ و عەفار ). ل١٧٠**

(نیزاع و گیرودار) یەك واتا کۆیاندەکاتەوە.

**٣. سەبزە لە دەوری گوڵ تەڕە وەك خەتی رویی یار**
**یا پووشی وشك و زوورە وەکو ریشی کاکە سوور. ل١٨٩**

(پووشی وشك) نابێ چونکە گیا (تەڕە) کە بوو بە پووش (وشك)ەبێ، کەواتە وترا پووش ئیتر وشەی وشك ئامادەگی هەیە.

**٤. بێته حوجرەم، پارچه پارچەی موسوەدەم بکرێ به رۆح**

**هەر کەسێ (کوتاڵ و پارچە)ی بێ بەدەڵ سەودا دەکا. ل١٠٧**

(کوتاڵ و پارچە) یەکێکن و لەباتی قوماش بەکارهاتوون.

**٥. ئەی تازە جەوان! پیرم و ئوفتادەو کەوتووم. ل٢٦٤**

**(ئوفتادە و کەوتوو) یەکێکن، یەکەمیان فارسییە و دووەمیان کوردی.**

**٦. رۆژی جەزا رجابکە بۆ (نالی) دەربەدەر**

**چون لەم جیهان گوناحی (گەلێ زۆر) و (ئەکپەرە). ل٤٤٧**

(گەلێ زۆر) واتە (ئەکثەر)ئەم عەرەبییە و ئەو کوردی.

**٧. حەپسی چاهی میحنەتم، کافر بە حاڵی من نەبێ**

**(کار)و (پیشە)م دائیمەن (گریان)و(شین)و (زاریيە). ل٥٨٤**

کار و پیشە یەکێکن و سێ وشەکەیدیش هەروەها.

**٨. بێ جوێ بوونەوەیێ، (زەخم)و (برین)و ئەسەرێ**

**تیری موژگانی درێژت لە جگەر تێدەپەڕێ. ل٦٥٠**

(زەخم= زام)و (برین) یەکێکن.

مەبەست ئەوەیە نالی کینایەباز و ئیجازبێژ هەرگیز بەلای (اطناب)دا نەچووە، لەمڕووەوە شاعیریدیکەمان هەیە کە لە سنووری ئیجاز دەرچوون، ئەوە لێیاننناگیرێ، بەلاٰم لەسەر نالی بەحیسابدەکەوێ، (مەعنایی زۆر و گەورە بە لەفزی کەم و بچوك).

•••

# مەیخانەیی دڵ

عەبدوڵڵا قەرەداغی

ساقی وەرە مەیخانەی دڵ، کۆنە رەحیقی
گەر مەیلی تـــەوفی حـەرەم و بەیتی عەتیقی
یەک رەنگم و بێرەنگم و رەنگین بە هەموو رەنگ
بـــەم رەنگە دەبێ رەنگرژیی عیشقی حەقیقی
مرواریی ئەشکم وەکو یاقووتی، رەوانە
ســـاقی بدە لەو لەعلە شـــــەرابێکی عەقیقی
دائیم لە حەزەردا سەفەری بە.. لە وەتەندا
غوربەتکەش و عاجزبە، ئەگەر ئەهلی تەریقی
خەڵقی کە هەموو کۆدەکن و بەستە زوبانن
بابێن و لە (نـــالی) ببیەن شــــــیعری سەلیقی[١]

ئەمە نۆیەمین غەزەلی تیپی (یێ)ی نالییە و یەکێکی لەو غەزەلە کەمانەی کە لە رەوتی گشتی شیعری نالییەوە دوورن، گریمانەی سەرەکی ئەم نووسینە بریتییەلەوەی ئەم غەزەلە کاردانەوەیە نەك راگەیاندن و سەلماندنی هەڵوێستێکی بناغەبی لە بواری پابەندی شەخسیدا. مەبەستی ئەو کاردانەوەیەش رەتکردنەوەی لافی نەناسراوێکە بەو چەکەی بە هی خۆی دەزانێ.

دووەمین دێڕی دووەمین بەیت: (بەم رەنگە دەبێ رەنگرژیی عیشقی حەقیقی) مۆرکی گشتی غەزەلەکە رووندەکاتەوە (عیشقی حەقیقی) لای هەموو ئەوانەی بایەخ بە بواری سۆفیگەری دەدەن روونە کە خۆشەویستی خوایە، ئەگەرچی هەر بۆ خودی ئەو خۆشەویستییە خۆشەویستی پێغەمبەر و پیر (مورشید)و پیاوچاکان و یارانی تەریقەتیش هەر پێویستە، بۆیە خۆشەویستی راستەقینە هەرئەوەیە و خۆشەویستیدیکەی مرۆڤ بۆ یەکدی مەجازییە، هەڵویستی

بناغەیی نالی لەژیانیدا هەڵبژاردنی (عیشقی مەجازی) بووە و ئەو عیشقەش لای ئەو یەك ئاراستەی هەبووە:

**عیشقت کە مەجازی بێ، خواهیش مەکە ئیللا کچ**

**شیرین کچ و، لەیلا کچ و، سەلما کچ و، عەزرا کچ**

١/ج١/ل١٥٧

ئەو عیشقەش بەلای نالییەوە تەنها جۆرە جوانپەرستییەك نییە، بەڵکو بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە سێکسەوە هەیە:

**کچ پەرچەمی چینچینە، دوو مەمکی لەسەر سینە**

**وەك شانەیی هەنگوینە، بۆ لەززەتی دنیا کچ**

١/١/ل١٧٠

کەواتە نالی لێرەدا هەمان ئەو (نالی)یە نییە کە لە زۆربەی غەزەلەکانیدیکەیدا بەدیدەکەین، بەڵام هێشتا زووە بۆئەوەی بڕیاری یەکلاکەرەوە لەو بوارە بدەین، چونکە ناکرێ تەنها وشەیەك، زاراوەیەك، دەستەواژەیەك، دێڕێك و تەنانەت بەیتێکیش بکەینە دەروازەی بڕیاردان لە ئاراستەی گشتی لایەنێك لە لایەنەکانی شیعری شاعیرێکی داهێنەری وەك (نالی) لەمەش بەولاوە هەر ئاراستەیەك، ئەگەر بە تاکوتەرایی بەدیبکرێت، ناتوانرێ بەشێوەیەکی عەمەلی بە ئاراستەیەکی گشتی لەقەڵەمبدرێت، بۆیە دەبێ بۆ یەکلاکردنەوەی ئەوەی ئایا (نالی) لەم غەزەلەدا هەمان ئەو (نالی)یەیە کە لە زۆربەی هەرە زۆرە شیعرەکانیدا دەبینرێ یان ئەو هەوڵی وەڵامدانەوەی دوو پرسیار بدەین کە ئەمانەن: ئایا تەنها دەستەواژەی (عیشقی حەقیقی) لەو غەزەلەدا لە غەزەلەکانیدیکەی جیادەکاتەوە یان سەرجەمی بونیادی غەزەلەکە و ئایا غەزەلیدیکە هەیە هەمان ئاراستەی هەبێ یان نەء؟

بۆ وەڵامی یەکەمین پرسیار دەکرێ لە دوولاوە هەوڵی بۆ بدەین:

١. لە بواری چەمکە تایبەتییەکانی ئەو ڕێباز (میتۆد)ەی کە پێمانوایە دەکرێ دەستەواژەی (عیشقی حەقیقی) ئاماژەی بۆ بکات، دەتوانین بەدوای سەرجەمی ئەو چەمکانەدا بگەڕێین کە لەو بوارەدا مەعنای تایبەتی خۆیان هەیە و بەشێوەی تایبەتی بوارەکەش دەتوانرێ لێکبدرێنەوە.

٢. گەڕان بەدوای مەبەستی گشتی غەزەلەکەدا لەڕێگای لێکدانەوەی چەمکەکانی و ڕەچاوکردنی مەنتیقی ناوەوەی شێوەی بەکارهێنانی ئەو چەمکانە لە ڕەوتی گشتی هەر بەیتێك و هەموو بەیتەکانیش پێکەوە واتە بونیادی غەزەلەکە.

لە بواری یەکەمین تەوەری ئەم هەوڵەی وەڵامدانەوەی پرسیاری ئاماژە بۆکراودا دەتوانین پێش هەموو شتێك زاراوە تایبەتییەکانی بواری عیشقی حەقیقی لە خودی ئەو غەزەلەدا جیابکەینەوە کە ئەمانەن:

(ساقی، مەیخانە، دڵ، تەواف"طواف"، حەرەم، بەیتی عەتیق، یەکڕەنگ، بێڕەنگ، ڕەنگین بە هەموو ڕەنگ، ڕەنگڕژیی، عیشقی حەقیقی، شەراب، حەزەر، سەفەر، وەتەن، غوربەتکەش، عاجز، ئەهلی تەریق) ئەم زاراوانە هەندێکیان بەشێوەیەکی گشتی لە ئەدەبیاتی سۆفیگەریدا بەکاردەهێنرێن کە زۆربەی هەرەزۆری ئەو زاراوەن، بەڵام هەندێکیان شێوەی تایبەتی داڕشتنی نالییان بەڕوونی پێوەدیارە، ئەگەرچی ئاماژە بۆ کۆمەڵە چەمکێکی بناغەیی بوارەکە دەکەن وەکو زاراوەکانی (یەکڕەنگ و بێڕەنگ و ڕەنگین بە هەموو ڕەنگ) کە سەرجەمیان لەگەڵ وشەی لێکدراوی (ڕەنگڕژی)دا لە ئامێزگرتنی وشەی (ڕەنگ) لەپێکهاتەیاندا بەشدارن. بەهۆی ئەم ڕاستییەوە پێشتر شێوەی لێکدانەوەی وشەکانیدیکە دەگرمەبەر و ئەم زاراوە نوێیانەش بەجیاوازی لێکدەدەمەوە و پاشان بەخوێندنەوە گشتییەکەی غەزەلەکەوە دەیبەستمەوە. ساقی ( ٢)، بەپێی هەموو سەرچاوە بناغەییەکانی سۆفیگەری یان مەعشوقە واتە (دڵ لێچوو) کە خوایە و بە (بەخشندەی ڕەهایبوون)یش زۆرجار ناودەبرێ یان هەرکەسێك بتوانێ یارمەتیدەربێت لەوەی سۆفی بگەیەنێتە سۆزی نائاسایی خۆشەویستی کە بە لوتفی مەعشووقەوە گرێدراوە، بۆیە ساقی دەکرێ مورشید (ڕێبەر)یش بێت. ئەم زاراوەیە بە چەند زاراوەیەکیدیکەی وەکو (مەی)و (مەیخانە) بەستراوەتەوە کە لە ژیانی (فیزیکی)شدا ئەو پەیوەندییە هەیە لەبەر ئەم هۆیەش پێویستە ئاماژە بۆئەوە بکرێ کە لەم بوارەدا زاراوەکان بەگشتی زاراوەکانی جیهانی فیزیکی یان زاراوەکانی قورئانی پیرۆز و فیقه (شەرع)ە، بەڵام ئەزموونەکە مەعنا تایبەتی پێدەبەخشێ:

**الرب هو الساقی، والعیش به الباقی**

**والسعد هو الراقي، یا خائف لاتحذر**

**الروح غدت سکرى، من قهوتنا الکبرى**

**و ازینـــــت الدنیا بالأخضر والأحمر**

هەر بۆ جەختکردن لەسەر بوونی جۆرە کراوەیی (مرونە)یەك لە شێوەی بەکارهێنانی (زاراوە) لەم بوارەدا سەرنجی خوێنەر رادەکێشم بۆئەوەی شاعیر لە بری وشەی مەی (خمر) وشەی قاوە (قهوە)ی بەکارهێناوە و بەهەمانشێوە لەکوردیدا مەی، ساغر، بادە، شەراب.. هتد بەکاردەهێنرێ.

مەی کە (نالی) لەم غەزەلەدا وشەی (رەحیق)ی بۆ بەکارهێناوە لای سۆفییەکان مەعنای زاڵبوونی عیشق دەبەخشێت بەشێوەیەك کە عاشق خۆی پێناگیرێ و ئەمەش لەسۆفیگەریدا پتر بەهۆی دەرکەوتن (تجلی)ی یارەوە دەبێت، بۆیە بەشێك لە گەورە سۆفییان ئەو دەرکەوتنە بە (مەی) یان (شەراب)ەکە ناودەبەن.

(مەیخانە) پتر بە مەعنای (دڵ)ی عاشق بەکاردەهێنرێت، بەشێك لە سۆفییە گەروەکان زیاتر پێ لەسەر ئەوە دادەگرن کە سۆفی پێگەیشتووە، نەك سۆفی ئاسایی، دەکرێ ناخی بە (مەیخانە) ناوببرێت، چونکە تەنها ئەو ناخەیە کە دەکرێ بەوشێوەیە باسبکرێ کە مەڵبەندی چێژ و تاسەی ناخهەژێن و زانیاری لەدوننی (لەلایەن خوداوە)یە لێرەوە و بەرەچاوکردنی ئەوەی (دڵ) بەلای سۆفییە گەورەکانی ئیسلام کانگا و گەنجینەی راز (نهێنی)ی خودایە، بەپێی لێکدانەوەی ئەم ئایەتە (٣) (أفمن شرح الله صدره للأيمان فهو على نور من ربه/ الزمر ) دەکرێ (مەی، رەحیق، شەراب)ەکەش والێکبدرێتەوە کە ئەو (راز – نهێنی)یە بێت، بەڵام زۆر پێویستە لێرەدا باس لەوە بکرێت کە خودی وشەی (نهێنی) ئاماژە بۆ شتێك دەکات کە سۆفییەکان نەیانویستووە بیدرکێنن، بۆیە زۆر بەئاڵۆزی ماوەتەوە هەندێ لە سۆفییەکان گلەیی لە کەسانی وەکو (حسین کوڕی مەنسوری حەلاج)و (سوهرەوەردی) دەکەن کە (راز – نهێنی) درکاندووە بۆیە مردن بووەتە چارەنووسیان.

تەوف (طوف) یان تەواف (طواف) مەقامی سەرسامی حیرە – تەحیورە (حیرە، تحیر)ە بەڵام (حەرەم) مەقامی بێرەنگییە، واتە مەقامی نەمانی خۆ (خود)و لە خۆچوونە (بەیتی عەتیق)یش کینایەیە لە دڵی مرۆڤی پێگەیشتوو (الأنسان الكامل) کە بۆ هەر شت و کەسێك جگەلە خۆشەویستی رەها (مەعشووق) حەرامە واتە جێی هیچیدیکەی تێدانەماوە

ئەگەرچی حەزەر (حضر) کە مەعنای ئاوەدانی دەبەخشێ، زاراوەیەکی تایبەت نییە لە بواری سۆفیگەریدا، بەڵام ئاوەدان یان (ماڵی ئاوەدان – البيت المعمور) بە دڵ دەگوترێ کە بە خۆشەویست مەعشوق (یار – خودا) ئاوەدانبێت بەمەش (حەزەر) دەبێتە ئاوەدانیی دڵ بە یار،

سەفەر (گەشت)یش بریتییەلە (دڵ) روو لە خۆشەویست (یار) بێت نەك کەسێکیدیکە، وەتەن (نیشتمان) بە مانەوەی سۆفی لە مەقام یان حاڵێکی دیاریکراو دەگوترێ کە ئەمە بەوپێیەی بەڵگەی راوەستانی پێشکەوتنە لە ئەزموونی سۆفییانە (سەیر و سلوك)دا، بە باش نازانرێت، بەڵام دوو مەعنایدیکەشی هەیە کە بریتییەلە زانینی دڵی عاریف (سۆفی)یان و بینینی رازی دۆستان، ئەمەش لێکدانەوەیەکی گەشبینانەترە.

غوربەتکەش، غوربەتێکیش (نامۆ) لە وەتەن جۆرێکە لە مەرگی نامۆ کە بەشەهیدبوونیش ناودەبرێ. ئەمەش زیاتر بەکەڵکی لێکدانەوەی ئەم غەزەلە دێت.

لەڕوویەکیدیکەوە نالی لەم غەزەلەدا وشەی (رەنگ)ی بەکارهێناوە بۆ داڕشتنی کۆمەڵە وشەیەك کە دەکرێ تێکڕایان لەسەر بناغەی سۆفیگەری بە (زاراوە)ی تایبەت لەقەڵەمبدرێن، ئەگەرچی (بێڕەنگ) خۆی هەر زاراوەیە، لەبەرئەوەی (رەنگ) کینایەیە، لەڕێوڕەسم و پەیوەندی و پێوەندەکانی مرۆڤ، واتە لایەنە فیزیکیەکەی دەگرێتەوە، دەکرێ دڵنیابین لەوەی دەکرێ بۆ داڕشتنی زاراوە، بەباشی بەکاربهێنرێت (نالی)یش هەر وایکردووە وشەی (رەنگ) کە بدرێتەپاڵ وشەی جیهانەوە بەشێوەیەك ماهییەتی جیهانەکە دیارییکات واتە کە بێتە (جیهانی رەنگ) ئەوا ئاماژەیە بۆ جیهانی فیزیکی. ئاسانیشە ئەو راستییە هەڵێنجین کە لەبەرئەوەی رەنگ لەلایەن چاوەوە بەهۆی بوونی لەبەردەم رووناکیدا دەبینرێ، ئاساییە بە کینایە بۆ جیهانی فیزیکی دابنرێت لێرەوە (یەکڕەنگ) دەکرێ (یەکبین)و (یەکتاپەرست) بێت یەکتاپەرستی (توحید)یش زاراوەیەکی دیاری بواری سۆفیگەرییە کە هەموو جۆرە خۆبەستنەوەیەك، بە غەیری مەعشوق (یار)ەوە بەناڕەوا دەزانێ (بێڕەنگی) کینایەیە لە توانەوە یان لەنێوچوون (فناو)ی خود (رەنگین بەهەموو رەنگ)یش دەکرێ بە یەکێك لە دوو شێوە لێکبدرێتەوە:

١. بە مەعنای رەنگاوڕەنگی (تلوین) کە یەکێکە لە مەقامەکانی سۆفیگەری بەمەش دەبێتە کینایە لە رەوتی بەرەو پێشچوون لە ئەزموونی رەوانیدا واتە دەبێتە کینایە لە نەمانەوە لە مەقامێکی دیاریکراودا.

٢. وەرگرتنی هەموو رەنگەکان، بەو مەعنایەی کە رەنگدانەوەبێت بۆ بەڵگەکانی خودا و رەنگاوڕەنگی و جۆراوجۆریی دروستکراو (ئافەریدەکان)ی ئەمەش هەر تێگەیشتنێکی پەیوەندی

نێوان خودا و بەندەکانێتی بەتایبەت لای ئیبن عەرەبی کە دروستکراو (مخلوق) بە ئاوێنەی دروستکار (خالق) دەزانێت.

بەم لێکدانەوەش رەنگڕژیی عیشقی حەقیقی لەوەدا دەبێ عاشق یەکتاپەرست بێت و لەئەزموونیدا هێندە رۆبچێ کە لە زاتی مەعشووق (یار)دا بتوێتەوە و بەتەواوی رەنگی خۆ - خود - خۆیەتی لە دەستبدات و لە بواری بڕینی شیو و هەوراز و نشێوەکانی ئەزموونەکەیدا بەردەوامبێت تادەگاتە ئەوەی هەمەڕەنگی هەموو بوونەوەرەکان کە بەڵگەی هاوتایی یارن لەخۆیدا کۆبکاتەوە، بەڵام هێشتا لە کێشەی زاراوەکان نەبووینەتەوە، لێرەدا دەبێ بەتەواوی پێ لەسەر دووو خاڵی گرنگ دابگرین:

زاراوەی (ساقی) لە ئەدەبیاتی سۆفیگەریدا یان بۆ خودی مەعشووق (یار - خودا) بەکاردەهێنرێ یان بۆ مورشید، کەواتە ئەگەر مەیدانی ئەم شیعرەی (نالی) (عیشقی حەقیقی) بێت، چۆن (ساقی - مەیگێڕ) بۆ مەیخانەی دڵ بانگدەکات؟و چۆن مەسەلەی (تەوفی حەرەم)و (بەیتی عەتیق)ی ئەو دەخاتەنێو کەوانی گومانەوە. ئەم پرسیارە بەرەو پشتڕاستکردنی یەکێك لە دوو گریمانە دەمانبات:

١. شاعیر نەیزانیبێ چەند چەمکی (ساقی) لە پەیکەری گشتی زاراوەسازی یان پەیکەری شەمکەکاندا گرنگە و چەمکیدیکە ناتوانێ جێیبگرێتەوە یان وەکو چەمك بەکارینەهێنابێ.
٢. شاعیر ئەوانەی زانیبێ، بەڵام لە رووبەڕووبوونەوەی کەسێکی دیاریکراودا ئەو شیعرەی دانابێ.

ناکرێ دوای جێکردنەوەی ئەو هەموو زاراوە گرنگانەی بواری سۆفیگەری تەنها لە سێ بەیتدا (یەکەمین و دووەمین و چوارەمین) بەیت و پابەندی تەواو بە پاراستنی مەعنای هەر زاراوەیەك لە چوارچێوەی بەیتەکاندا باس لەوە بکرێت کە (نالی) شارەزای مەعنای زاراوەکان نەبووە. خۆ ئەگەر باس لەو وردەکارییە بکەین کە لە پەیوەندی زاراوەی (حەرەم)ەکە مەقامی بێرەگی و بێخۆیی - توانەوەی خۆیە و لە دووەمین دێڕی یەکەمین بەیتدا هاتووە لەگەڵ بەکارهێنانی داهێنەرانی وشەی (رەنگ) بۆ داڕشتنی دوو زاراوەیدیکەی گەوهەری گونجاو لەگەڵ چەمکە بناغەییەکانی سۆفیگەری لە یەکەمین دێڕی دووەمین بەیتدا.. باس لەو دوو وردەکارییە بکەین ناتوانین ئەوە بە خەیاڵی خۆماندا بێنین کە شاعیر ئاگای لە کون و قوژبنەکانی بوارەکەدا

نەبووە، کەواتە دووەمین گریمانە راستە، بەڵام ئەو کەسە کێیە کە (نالی) رووبەڕووی بووەتەوە لەم غەزەلەدا؟

پێموایە نالی بە وشەی (ساقی) وەڵامی کەسێك بداتەوە کە خۆی نەك وەکو سۆفییەکی ئاسایی ناساندبێ بەڵکو بە (مورشید – رێبەر) یان (نیمچە رێبەر)ێك خۆی ناساندبێ، چونکە ئەگەر وانەبێ دەبێ پاش ئەو هەموو وردەکارییانەی لە بواری بەکارهێنانی زاراوەی تایبەت لەشیعردا (نالی) لەدەشتنیشانکردنی گرنگی ئەم چەمکەدا بەهەڵەداچوو‌بێت، هۆی ئەمەش دیارە.. لە بواری سۆفیگەریدا هیچ کەسێك بۆی نییە (ساقی) بۆ (مەیخانەی دڵ)و (کۆنە رەحیقی) داوەتبکات یان لە ئارەزوو (مەیلی) تەوفی رەحم و (بەیتی عەتیق)ی ئەو، بەوشێوەیە قسەبکات، ئەگەر ئەم بۆچوونە راستبێت دەبێ ئێمەش لە نووسینەوەی بەیتەکەدا (ساقی) بەمشێوەیە جیابکەینەوە. ساقی! وەرە..

واتە بەو وەستایەتییە لە لێکدانەوەی زاراوە تایبەتەکان و جێکردنەوەیان لەشیعردا بەو ناسکییەش (نالی) ویستوویەتی بە بەرانبەرەکەی بڵێت: ئا ئەمە بەڵگەی ئەوەیە کە تۆ ساقی نیت، بەڵام (نالی) سووریش بووە لەسەرئەوەی بڵێ: منیش سۆفی نیم، بەڵام من شاعیرێکی بە سەلیقەم.. لێرەشدا بەرانبەرەکەی کە یەکێکە لە (خەڵقی) بە منداڵ زانیوە:

**خەڵقی کە هەموو کۆدەکن و بەستەزوبانن**

**با بێن و لە (نالی) ببیەن شیعری سەلیقی**

خاڵێکی گرنگیدیکە هەیە کە نابێ، ئاوەها سەرپێی و راگوزەرانە بازی بەسەردا بدەین ئەویش پەیوەندیی بە چوارەمین بەیتەوە هەیە:

**دائیم لە حەزەردا سەفەری بە، لەوەتەندا**

**غوربەتکەش و عاجزبە، ئەگەر ئەهلی تەریقی**

با دەستەواژەکان بەشێوەیەکی کورتتر، بەڵام بەهەمان وشەکانی شاعیر سەرلەنوێ رێکبخەینەوە: (سەفەر لەحەزەردا) غوربەتکەش (عاجز) لە (وەتەندا) ئەم دوو دەستەواژەیە

دەتوانن ئاماژە بۆ چی بکەن؟ وەتەن لای سۆفییەکان بە (ناخ)و (دڵ)یش ناودەبرێت، بەڵام با ئەمەیان بۆ کاتێکیدیکە هەڵبگرین، چونکە مەبەست لێرەدا گرنگترە، نەك ئەو وشانەی بەکاردەهێنرێت ((سەفەر لە حەزەر)) بەوپێیەی حەزەر ناوچەی ئاوەدانە و (وەتەن)یش هەر ئاوەدانییە، بیرم بۆ لای سێیەمین رەوش یان سێیەمین وشەی تەریقەتی نەقشبەندی دەبات کە بە (سەفەر دەر وەتەن) ناسراوە وشەی (دەر) لێرەدا کە وشەیەکی فارسییە و مەعنای "لە" دەبەخشێ واتە"سەفەر لەوەتەندا" بە مەعنایەك لە مەعناکان پەیڕەوانی تەریقەتی نەقشبەندی و ئەو رەوشە وا لێکدەدەنەوە کە ئەگەر سۆفی پیر (مورشید)ی گونجاو نەدۆزییەوە، پێویستە سەفەربکات بەوڵاتدا (کە ئەو تانە نەك وەتەن و زیاتر لەگەڵ حەزەردا دەگونجێ) نموونەی مەولانا خالیدی نەقشبەندی و دۆزینەوەی شێخ عەبدوڵڵای دەهلەوی پیادەکردنی تێگەیشتنێکی ئاوەهایە، هەڵبەتە ئەگەر وەتەن (دڵ)یش بێت ئەوا دڵ بە مەعشوق (یار) ئاوەدانە واتە حەزەر هەر دڵیش مەڵبەندی ئەزموونی سۆفیگەری و بڕینی مەقامەکانە، بەمەش (سەفەر لەحەزەردا) دەبێتە گەشتی دەروونی بۆ بڕینی مەقامەکانی سۆفیگەری. لەهەموو حاڵەتێکدا سەفەر (گەشت) لە بواری سۆفیگەریدا رووکردنی (دڵ)ە لە خۆشەویست.

(لەوەتەندا غوربەتکەش و عاجز) بوون، لەبەرانبەردا دەکرێ بیرمان بۆ لای چوارەمین رەوش یان وشەی لای تەریقەتی نەقشبەندی ببات کە (خلوت در انجمن - گۆشەگیری لەکۆمەڵدا) یە پەیوەندی نێوان گۆشەگیربوون و نامۆبوون دیارە کە هەردووك دەرەنجامی دابڕانن لە کۆمەڵ. لە رەوشە ئاماژەبۆکراوەکەدا مەبەست لە خۆتەرخانکردنی تەواوە بۆ یار، ئەگەرچی لە گەرمەی ژیان و سەودای کۆمەڵایەتیشدا بێت. کۆمەڵیش بریتییەلە پەیوەندییەکانی ژیان لەو رووبەرەی کە بە (وەتەن) نیشتمان ناسراوە.. کەواتە وەکو دەستەواژە لەڕووی پێکهاتەی زمانەوانییەوە زۆر لێکەوە نزیکن، لەڕووی زاراوەشەوە ئەو غوربەتکێشییەی پێدەچێ لێرەدا مەبەست بێت ئەو غوربەتەیە کە لە بواری سۆفیگەریدا بە غوربەتی حاڵ ناسراوە، ئەوەش لە ئەنجامی خۆتەرخانکردنی تەواوی عاشق بۆ یارەوە دێت ئەو خۆتەرخاندنەی لەگەڵ رواڵەتەکانی ژیانی نێو کۆمەڵدا ناگونجێ و عاشق لە نیشتمان و لەنێو کۆمەڵگەی خۆیدا غەریبدەکات ئەمەش هەمان ئەو (خەلوە دەر ئەنجومەن) ەیە کە چوارەمین رەوشی تەریقەتی نەقشبەندییە.

لێرەوە دەکرێ بیرمان بۆئەوەبچێت کە ئەو کەسەی (نالی) بەم غەزەلەی رووبەڕوویدەبێتەوە رەنگە لافی پێگەیشتوویی لە چوارچێوەی تەریقەتی نەقشبەندی هەبووبێ

لەهەمان چرکەدا ڕێزی تەواوی بۆ خودی تەریقەتی ناوبراو دەپارێزێت.

لەدوا وێستگەی ئەم خوێندنەوەیەدا پێویستە ئاوڕ لەو پرسیارە بدرێتەوە: ئایا (نالی) غەزەلیدیکەی هەیە هەمان ئاڕاستەی هەبێ؟و ئەگەر هەبێت نیشانەی چییە؟

گەڕان بە دیوانی شاعیردا بەئاسانی وەڵامی (بەڵێ)مان دەخاتەبەردەست ئەمەش هێندەی سەرنجمدابێ، لە سێ شێوەی سەرەکیدا خۆی دەنوێنێ:

١. بەکارهێنانی زاراوەی بواری سۆفیگەری لە چەندین بەیتی چەندین غەزەلدا کە بابەتی سەرەکییان (عیشقی حەقیقی) نییە:

**کوشتەی نیگاهی دیدەتە، گەر مەست، ئەگەر خەراب**
**بەســــــتەی کەمەندی زوڵفتە، گەر شێخ، گەر سلووك**
**نەقدی دڵێ کە رائیجی سەودایی تۆ نەبێ**
**مەغشووش و کەم عەیارە و و هەم قەڵب و هەم چرووك**
**سۆفی! وەرە ئەسیری زوهوراتی باغ و راغ**
**لایێ هەمـــــــوو شــــــکۆفە و و، لایێ هـــەموو گوڵووك**

١ك ٢ تا ٤ / ل ٢٥٥ – ٢٥٦

هەروەها:

**لە هێلانەی زەمیندا وەك شتورمورغ**
**منی قودسئاشیان بێ باڵ و پەڕ مـــام**
**لە قوربی (قاب قوسین)ی دوو ئەبرۆت**
**منی (ئەدنا) چ دوور و دەربەدەر مام**

١م / ٢ و ٣/ ل٢٦١ – ٢٦٢

٢. لەو شیعرانەدا کە بۆ خۆشەویستی پێغەمبەر نووسراون نالی پەیڕەوی لەڕێوڕەسمی عیشقی حەقیقی : واتە هەموو زاراوەکانی ئەو بوارە بەکاردێنێ و هەم بەو مەبەستەش بەکاریاندەهێنێ:

**ئەی تازە جەوان! پیرم و ئوفتادە و و کەوتووم**

**تا مـــــــاوە حەیاتم**

**دەستێ بدەرە دەستی شکستە، کە بەسەرچووم**

**قـــــــوربانی وەفاتم**

**تۆ یوسفی نەوحوسنی لەسەر میسری جینانی**

**مـــــن پـیرم و فانی**

**لەم کولبەیی ئەحزانە نە زیندووم و نە مردووم**

**هــــەروا بە تــەماتم**

**فەرقێکی نەکرد نەفسی نەفیسم بە عینایەت**

**وەحشی لە ویلایەت**

**لەم گۆشەیی وێرانەیە هەر مامەوە وەک بووم**

**وەیشــــــوومی ولاٌتم**

١ م ١ تا ٣ / ل ٢٦٤ – ٢٦٦

یان:

**ئەی ســـــاکینی ریـــازی مــــەدینەی مـــــنەووەرە**

**لوتفێبکە، بـــــفەرموو: مــــەدینەی مـنە و، وەرە**

**عـــــەرشی بـەرین کە دائیرەیە، رەوزە مەرکەزە**

**فەرشی زەمین بە عەرسەیی تەیبە موجەوهەرە**

٧ هـ ١ و ٢ / ل٤١٥ و ٤١٦

تا

**لێوم لە رۆژی رۆشنی کافووری وشکی، وشک**

**چـاوم، لە شەبنمی شەوی وەک عەنبەری تەڕە**

**تەیبە کە یەعنی تەییب و تاهیر بە رەوحی رۆح**

**فەرقی دەڵێن: گڵی لە گوڵ، ئاوی لە کەوسەرە**

**یەعنی گولاٌوی قودسە گلاٌویی رەفع دەکا**

**ئەو خــــــاکە چـاکە پاکە و و ئەو ئاوە مەتهەرە**

١. لەو غەزەلانەشدا کە (نالی) ئاوڕ لەخۆی دەداتەوە کە پتر پێدەچێ یان بەهۆی پیرییەوە یان بەهۆی نامۆییەوە، گلەیی لە جڵەوشلکردنی خۆی بۆ هەوا و ئارەزوو دەکات.. لەو شوێنانەدا ئاوڕدانەوەکە بەتەواوی مۆرکی ئەدەبیاتی سۆفیگەری بەسەرەوە زاڵە:

**وەی کە رووزەردی مەدینە و رووسیاهی مەککە خۆم**

**دەرکـــراو و دەربەدەر، یارەب دەخیلی عـــەفوی تۆم**

**دەفتەری ئەعمالی من، بێ قەترەیەکی رەحمەتت**

**کەی بە سەد زەمزەم، سیاهیی نوقتەیەکی لێدەشۆم**

**کەعبە ئیشراقی وەکو خورشیدە، من چاوم زەعیف**

**لێمبووە رۆشـن کە بوعدی قوربە، قوربی بوعدە بۆم**

١١ م ١ تا ٤ / ل ٢٩٩ تا ٣٠١

تا دەگاتە:

**خەوفی من لێرە لەبەر زۆریی گوناهە یەک بە سەد**

**گەرچی عـــاصی و موزنیبم ئەمما موقیرڕ و بێ درۆم**

**شادمانی بێوەفایە، یاری تێری و مەستییە**

**یاری تەنگانەم غەمە، با هەر غەمی خۆم خۆم بخۆم**

**لامەدە (نالی) لە ئەنباری جیرایەساڵحان**

**گـــەرچی ببیە خـــــۆشەچینی دانەیی خەرمانی رۆم**

١١ م ٨ تا ١٠ / ل ٣٠٣ - تا ٣٠٤

یان:

**ئەلا ئەی نەفسی بوومئاسا، هەتا کەی حیرسی وێرانە**

**لەگـــەڵ ئەم عەشـــــقبازانە، برۆ بازانە.. ئازانە**

**موسڵمان، لێرە مانی خان و مانت هەر نەمان دێنێ**

**پـەشـیمانبە، کە دەرمـانی نـەمانـت مایەی ئیمانە**

**بلاّ بۆ کوندەبوو بێ، مفتی مشك و ماری کەندووبێ**
**خەتیرەی گـــەنجی وێرانە، زەخیرەی کونجی کاشـانە**
**بەقییەی عومری زایع، گەر موورادت پێتەدارەك بێ**
**حەیاتی مەککەت و مەوتی مەدینەت جەبری نوقسانە**

١٨ ھ تا ٤/ ل ٤٨٢ تا ٤٨٤

بەڵام ترپەی هەرە بەرز و ئاشکرای دڵی (نالی) لەم رێچکەدا پتر لەو حاڵەتە تایبەتانەدا کە نالی رووبەڕوویدەبێتەوە.. رووبەڕووی ئەوەی بە (ساقی) ناویدەبات، رووبەڕووی (نەفس) وەکو لەم غەزەلەدا دیارە:

**ساقی، بە مەیی کۆنە لەسەر عادەتی نەو بە**
**بشکێنە بە یەك نەوبە دووســــەد ماتەمی تەوبە**
**ساقی، قەدەحی گەردشی گەردوون دەشکێنێ**
**باری، کــــە دەبێ موعتەقیدی گـــەردشی ئەوبە**
**ئەی نەفسی مورائی، چ گرانباری، تەکالیف**
**بۆ خـەڵقی دەکێشێ، دەهــــەرڕۆ رێش و جەدەوبە**
**بوغزت لە زەعیفان چییە قوربان، وەکو قەسساب**
**بەو خەزز و بەزی ریشوەتە، ئەی هیزە، قەڵەوبە**
**ئەسپی نەفست دێت و دەچێ، گەرمە عنانی**
**ئەی مەستی ریازەت، هــــەلە، هوشیاری جڵەوبە**

١ ھ ١ تا ٥/ ل٣٩١ تا ٣٩٣

رووبەڕووی هاودژییە پێچەوانە نوێیەکان - وەکو گوناهی کەسێك کە نەیشارێتەوە و رووپامایی کەسێك خواپەرستی بنوێنێ:

**(حلقه در گوش)ی کەفی رەنگینی تۆیە ئەم دەفە**

**بــا نەناڵێ، لێیمـــــەدە ( عن لطمه کـــــف الـــکفة )**

**نەی کە ساحیب سیڕرە، سەرتاپا بە ئەمری (کن) کونە**

**باتینی ( قـــف قفا علی ســــــــری ) بە زاهیر قەفقەفە**

**خۆشترە عوزری گونەهکاران لە سەد زیکری ریا**

**ئەم بە نەرمی عەفوە عەفوە، ئەو بە توندی عەفعەفە**

**شێخییو سەر لنگە دەستارِی بە دەستارِی بوزورگ**

**رەندم و، دەســتارِی کەللەی من دەفە، نەک میندەفە**

٩ هـ ١ تا ٤ / ل٤٥٠ - ٤٥٢

رووبەڕووبوونەوەی هاودژییەکانی عیشق کە خودی رێبازی (عیشقی حەقیقی) بەهۆی جیهانە تایبەتەکەیەوە، هاودژی دەنوێنێ:

**حەریقی زیقی زیندانم، نەسیمی سوبحدەم بابێ**

**ئەگــــەر رۆحی منت باقــی دەوێ، ساقی، مەیی نابێ**

**لە وەسڵی تۆ زیاتر خەوفناکم، نەک لە هیجرانت**

**بە میسلی شەمع و پـــــەروانە، بەڵا عاشق دەبێ وابێ**

**نییە دەخڵم لە شانامە و مەسافی، غەیری ئەم نوکتە:**

**کە کوشتەی بەندی تۆیە هەرکەسێ ئازاد و ئازاد بێ**

**کەسێ پۆشتانی بالاتتە، حەریفی ئاڵ و والآتە**

**کە شیبهی کـــاکوڵی ژولیدە ســـەرگەردانی سەودابێ**

**فیدای تەشریفی رێگەت بێ خەراجات و خەزێنەی دڵ**

**نیساری تۆزی پێت بێ گـــــەر لە چاودا قەترەیێ مابێ**

**لە عەسکی زاتی بێڕەنگت هەتاکەی دیدە و رەنگین بێ**

**جونونی لەیل و مەیلی نەقشبەندی عەکسی ئەسمابێ**

أ ی ١ تا ٦/ ل٥٩٧ تا ٦٠٠

یاخود بڕوانه:

**خۆشا ڕەندێ له دنیا بێموبالات و موجەڕڕەدبێ**

**به ڕۆژ زیندەی جەماعەتبێ، به شەو مات و موجەڕڕەدبێ**

**به سورەت: جەلوەتی، غەرقی عەلایق هەروەکو خەڵقی**

**به مـــەعنا: خەڵوەتی، مەســـتی موناجات و موجەڕڕەد بێ**

**ئەگەر عالەمی ببێته خەلعەتی تەشریفی سەرتاپای**

**وجـــودی بێوجـــودی بێموهـــــابات و موجـــــەڕڕەد بێ**

**به زاهیر تاوسی ڕەنگین، سیفاتی (تەعلی التاهی)**

**به بـــــاتین قومرییو خاکســــتەری زات و مـــوجەڕڕەد بێ**

**ئەگەر تەکیه، ئەگەر شێخه، هەموو داوی عەلایقبوون**

**بلا ( نـــــالی ) بچێ مەســــتی خەبـــارات و موجەڕڕەدبێ**

٣ ی ١ تا ٥/ ل ٦٣٠ تا ٦٣٢

نموونەی زۆر هێنانەوه لەم بەشەی دوایی ئەم بابەتەدا دوو مەبەستی سەرەکی هەیه: یەکەمیان ئەوەیه که (نالی) زۆری پارچه شیعر (غەزەل بێ یا موستەزاد و.. هتد)ی هەیه که بابەتی سەرەکیان (عیشقی حەقیقی)یه جگەلەو حاڵەتانەیدیکه که چەندین بەیت، له دەیان غەزەلدا زەمانه تایبەتەکەی ئەو بواره (چەمك و هێما و لێکدانەوه تایبەتەکانی) تێدابەکارهێنراوه. دووەمیشیان سەلماندنی ئەو ڕاستییه که بەکارهێنانی میتۆدی ئەو بواره و ئامڕازه مەعریفییەکانی بەو شێوه بەرفراوانه و سەسەرکەوتووی (دەبێ بگوترێ که چەندین غەزەلیدیکه دەخرێته ژێر ئەم ناونیشانەوه) ناکرێ بەشێوەیەکی سەرپێی لێیبڕوانین و تەنها به بەرهەمی ئاشنایی شاعیر لەگەڵ ئەو بوارەدا لەقەڵەمیبدەین. ئەگەر بەپێویستیش بزانرێ بڕیارێکی لەوجۆره بدرێ باشتره پشت به قەناعەتێکی پشتئەستوور و بەبەڵگه و پاساوی لۆژیکی ببەستێ، نەك به حوکمێکی بێبەڵگه. ئەو بەڵگانەی له چەند لاپەڕەی پێشوودا نموونەیان هێنرایەوه و سەرجەمی بەڵگەکانیش سێ خاڵی ئێجگار گرنگ ڕووندەکەنەوه:

١. بەکارهێنانی چەمك و زاراوە تایەبتەکانی بواری سۆفیگەری لە شیعری (نالی)دا لە سنوورێکدا نییە کە بتوانرێ چاوی لێبپۆشرێ یان بە رێکەوت لەقەڵەمبدرێت.

٢. ئەم بەکارهێنانە سەلمێنەری ئەو راستییەیە کە بەڕاستی نالی لە چەمك و زاراوە تایبەتەکانی ئەو بوارە گەیشتووە، بەوردەکارییە زۆر وردەکانیشەوە بەڵگەی ئەمەش شێوەی سەرکەوتووانەی بەرجەستەکردنی ئەو مەبەستانەیە کە شاعیر سووربووە لەسەر گەیاندنیان.

٣. کێشەی بەکارهێنانی زاراوەی (ساقی) لە سەرەتای غەزەلی (٩ یی) بە مەعنایەکی دوور لەو مەعنایەی لە بواری عیشی حەقیقی/دا هەیە کە پێشتر واملێکداوەتەوە گاڵتەکردن بێت بەیەکێك لافی سالیکبوونی لە تەریقەتی نەقشبەندیدا لێدابێ، پێدەچێ زەمینەیەکی بەهێزتری بتوانرێ بۆ سازبکرێ بە بەڵگەی ئەم بەیتە:

**لە عەکسی زاتی بێڕەنگت، هەتاکەی دیدە رەنگینبێ**

**جونونی لەیل و مەیلی نەقشبەندی عەکسی ئەسمابێ**

١ ی ٦ / ل٦٠٠

لێرەوە.. ئەمە کاکڵەی تێگەیشتنی نووسەری ئەم دێڕانەیە لەبارەی ئەم مەسەلە گرنگەی لای نالی:

ناکرێ بوونی شیعری نێو چوارچێوەی (عیشقی حەقیقی) لای (نالی) پاش ئەو هەموو بەڵگەیە رەتبکەینەوە، بەڵام ئایا ئەمە دەکرێ والێکبدرێتەوە کە (نالی) شاعیرێکی سۆفییە بێگومان نەخێر بەتایبەت لەبەرئەوەی سێکس بەڕوونی زاڵە بەسەر ئەو شیعرانەی (عیشقی مەجازی) بابەتی سەرەکییانە و ئەمجۆرە بابەتەش رووبەڕووی هەرە فراوانی دیوانی (نالی) بەخۆوەگرتووە، هێندەی من ئاگام لێبووبێ بەپێی مەنتیقی ئەزموونی سۆفیگەری بەهیچ شێوەیەك ناکرێ شاعیری سۆفی شیعری لە بواری (عیشقی مەجازی)دا هەبێ، چونکە (عیشقی حەقیقی) لای عاشقی راستەقینە هەموو پەیوەندییەکی بەهەر شێوەیەکی وابەستەیی (عەلایق) بە جیهانی فیزیکییەوە رەتدەکاتەوە.

ئەم رەتکردنەوەیە بەو مەعنایە نییە سۆفی لەڕووی وەمیندا دەژی و پێویستییەکانی ژیان بەهەڵبژاردنی هاوسەریشەوە بەتەواوی رەتبکاتەوە، بەڵکو بەو مەعنایەیە کە ناخی

داگیرنەکات.. کە شیعریش زادەی ناخ بێت بێگومان نابێ تێیدارەنگبداتەوە. جگەلەمەش مەنتیقی ئەزموونی سۆفیگەری ئەوەیە کە (نامەحرەم) ناتوانێ لە رازەکانی ئەم بوارە بگات، ئەگەر مەعشوق بە لوتفی خۆی دەرگای تێگەیشتنی بۆبکاتەوە کە واتە ناکرێ نالی بەنیسبەت بوارەکەوە بە نامۆی تەواو (نائاشنا) لەقەڵەمبدرێ کە ئەمەش نەکرێ، دەبێ باس لەچ جۆرە ئاشنایيەکی (نالی) بکەین؟ بە حوکمی ئەوەی نالی مەلا بووە، سەرەڕای ئەوەش زمانی ئەدەبیاتی سۆفیگەریی بەکارهێناوە. گریمانەی بناغەییم لەم بوارەدا ئەمەی خوارەوەیە:

ڕەنگە لەقۆناغێکدا (نالی) مەیلێکی بەهێزی بەلای سۆفیگەریدا هەبێ، بەتایبەت تەریقەتی نەقشبەندی، بەڵام ئەو مەیلەی سەرینەگرتبێ لەئەنجامدا، بۆیە ئەو هێزی خۆشەویستییەی پتر بەرەو (عیشقی مەجازی) هەنگاوی نابێ، جگەلەو حاڵەتانەی باری دەروونی لەنامۆیی و بەخۆداچوونەوەدا، زۆری بۆهێنابێ یان کە رووبەڕووی بازگانیکردنی کەسێك بە سۆفیگەرییەوە بووبێتەوە، هەڵبەتە لە عیشقی مەجازی شاعیریشدا ناتوانین بەڵگە بۆ شێوەی نارەوای ئەو عیشقە بێنینەوە جگە لە قەسیدە درێژەکەی بۆ (مەستوورە) کە ئەویش خەونگێڕانەوەیە نەك لەواقیعدا ژیان.

•••

**پەراوێزەکان:**

١. نالی (مەلا خدری ئەحمەدی شاوەیسی): دیوانی نالی، لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی مەلا عەبولکەریمی مودەڕیس و فاتیح عەبدولکەریم.. پێداچوونەوەی محەممەدی مەلا کەریم، کۆڕی زانیاری کورد، بەغداد ١٩٧٦، ل ٦٥٥ - ٦٥٧.

٢. لێرەدا زۆر بەکورتی سەرەکیترین لێکدانەوەی زارەوەکە لای سۆفییەکان دەخەمەپێشچاو، خوێنەری بەڕێز دەتوانێ بگەڕێتەوە بۆ کتێبە بناغەییەکانی ئەم بوارە وەکو (اللمع)ی سەراج، (قوت القلوب)ی مەککی، (الرساله القشیریه) و (لطائف الاشارات)ی قوشەیری، (التعرف لمذهب اهل التصوف)ی کلابادی و (التعریفات)ی جورجانی و.. هتد، یان دەتوانێ هێندێ لەو سەرچاوانەی کە پتر بە (پێناسە)وە خۆیان خەریککردووە وەکو "کشاف اصطلاحات الفنون"ی "تەهانەوی" و (فرنگ مصطلحات عرفان)ی سەید سجادی و تەنانەت (حافظ نامەی خورەمشاهی)یش ببینێ.

٣. هێندێك لە سۆفییەکان دڵ بە عەرشی خوا دەزانن و پشت بە قسەیەك دەبەستن کە بە فەرموودەی پێغەمبەری دەزانن (قلب المؤمن عرش الرحمن) کە ساغنەبووەتەوە یان بە فەرموودەیەك کە بە قودسی دەزانرێ و دەڵێ: (ما وسعنی أرضي و لا سمائي و لکن وسعني قلب عبدي المؤمن النقی التقی).

# پەیامی نالی

د. سەباح بەرزنجی



باسکردن لە نالی و پەیامی نەمری ئەو بەدەر لە حەوسەڵەی وتارێکی پەرێشانی وەك ئەم وتارەیە و گەورەترە لە توانای من و سەدانی وەك من، بەڵام کە مرۆڤ رووبەڕووی دیاردەیەکی وەك نالی دەبێتەوە ناچارە بە تەناسوب لەگەڵ خۆی تەفاعولی لەگەڵ بکات و بە ئەندازەی گونجانیشی خۆیبخوێنێتەوە. ئەو رۆڵەی نالی لە چرکەساتێکی مێژوویدا بینیویەتی بایی ئەوەیە نووسەران و مێژونووسان وئەدیبان هەڵوێستی لەسەربکەن و بەجیددی لە رەهەند و لایەنەکانی بکۆڵنەوە.. نالی وەکو شاعیر و نالی وەکو مرۆڤ.

شیعری نالی و هەڵوێستی نالی ئەو دوو دەروازەیەن کە لێیانەوە دەچینە ناو جیهانی نالییەوە، جیهانی جەنجاڵ و نائارام و پڕلە سەدای ئەو کە بریتییەلە جیهانی سۆز و ئەوین و پەیوەستبوون بە نیشتمان و گەل و زمانەکەشی زمانی خۆماڵی و کەلتووری سەردەمی موکاتەباتی بابان و ئەردەلان و بەیەکگەیشتنی عەرەبی و کوردی و فارسییە.

بەبۆچونی کۆمەڵناسەکان شیعر بەرهەمی کاری دەستەجەمعی مرۆڤەکانە و لە ئەنجامی هاوئاهەنگی کردە و کردارەکانی ئەوان و تێکەلاوبونی دەنگ و هەوای ئامرازەکانی کار و سۆز و گوتەی ئەوان بەشێوەیەکی سروشتی و خۆبەخۆ دروستدەبێ، بە گوزارەیەکیتر شیعری شاعیر دەربڕی توانستی کەلتوری و هزری شاراوەی کۆمەڵگایە، کە لە خەیاڵدانی شاعیردا گەلاڵە و لەهۆنراوەکانیدا بەرجەستەدەبێ.

هەربۆیە لە فەرهەنگی زۆربەی گەلاندا شاعیر پلەوپایەیەکی وەك پێغەمبەری بۆ دروستدەبێ و شیعر لایەنێکی ئاسمانی و سیمایەکی جادوویی پەیدادەکات. شاعیر دەبێتە دڵی نەتەوە و زمانی نەتەوە دەپارێزێت. بێگومان مەبەستمان لە شاعیر شاعیری راستەقینەیە، واتە

ئەو شاعیرەی کەلتووری سەردەمی خۆی وەردەگرێت و بە ئیلهام لە ئایدیا و جوانی، خەونەکانی خۆی و گەل لەشیعردا دەنوێنێ، بۆئەوەی ئەزموونی هەست و سروشی خۆی بگەیەنێت بە ئاییندەکان.

(نالی) لە کەلتوور و فەرهەنگی ئێمەدا پێگەیەکی لەوجۆرەی هەیە، ئەو لە واقیعی خۆی و دەوروبەری ئاگادارە و هەست بە خۆی و گەل و خاك و کۆمەڵگاکەی دەکا، خاوەنی رەنج و موعاناتی راستەقینە و ئەزموونی پڕ و قووڵە لەسەر هەوراز و نشێوەکانی ژیان، لەهەمانکاتدا وەستای داڕشتن و رێکخستنی وشە و دەربڕینی مانایە.

پەیامی نالی لە شیعر و هەڵوێستدا، پەیامێکی نەمر و نەبڕاوەیە، چونکە رەنج و ئەزموون و موعاناتی ئەو وەك مرۆڤ، وەك کورد، وەك غەریب و دوورەوڵات، لە رووبەری کات و شوێن وقوڵایی دڵی مرۆڤەکاندا هەر وەك جاران بەردەوامە و کۆتاییهاتووە.

زمان لای نالی ئامرازی خۆناسینە و بۆ دۆزینەوەی خۆی بەکاریدەهێنێت، لەڕێی زمانەوە کار بۆ بووژانەوەی کەلتوور و باری ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی دەکات ئەو زمان بە موڵك و بوونی دیوان بە بەڵگە و سەنەدی ئەو موڵکە دەزانێت:

**فارس و کوردو عەرەب هەرسێم بەدەفتەر گرتووە**

**نالی ئەمڕۆ خاوەنی سێ موڵکە دیوانی هەیە**

گەلانی عەرەب و فارس و تورك، بە دامەزراندنی دیوان و زمان بووونەتە خاوەنی دەسەڵات، کەواتە بەبێ زمان دەسەڵاتی نەتەوە بوونی نابێت.

لەڕێگای زمانەوە دیسان بەرنامە بۆ بەستنی پردێکی پەیوەندی لەگەڵ خۆی و ژینگە و ئەوانیتر دادەنێ، هەربۆیە مەبەستە شیعرییەکانی نالی تاکو ئێستاش مەبەستی زیندوون و رووتەختێکی فراوان لە گرنگیدانی مرۆڤی ئەمڕۆ دادەپۆشێت.

(نالی) بەڵێ وەك شاعیرێکی کلاسیك قسەی لەسەر بابەتە لەبرەوەکانی سەردەمی خۆی کردووە، وەك دڵداری، وەسف، نزا و پاڕانەوە و بیری وڵاتکردنەوە و لاواندنەوە و پیاهەڵدانی پاش مەرگ و مەدح و پیاهەڵدان، بەڵام ئەم مەبەستە گشتییانە کە نووسەران و توێژەران ئاماژەی پێدەکەن، بۆ خۆیان دەبنە تیتر و ناونیشان بۆ ئەو پەیامەورد و بنەڕەتییانەی دەیەوێت لە ویژدانی

مێژوویی گەل و نەوەکانی دواتردا تۆماریانبکات:

پەیامی یەکەمی (نالی)، لەڕاستیدا دیاریکردنی ئەرك و مافەکانی شیعرە و لەپاڵ شیعردا بڕوای بە سیحری گوتار (سیحری بەیان) هەیە، بە گوزارەیەکیتر کاتێك شاعیر دەیەوێت ئەزموونی شاعیرانەی خۆی بگەیەنێت، پێویستی بەجۆرێك لە جادووگەریی هەیە، جادووکردنی گوێگر - بیسەر، جادووکردنی خوێنەر - وەرگر، لە ئەنجامی جادووکردندا پەیوەندییەکی نەپساوە لەنێوان شاعیر و خوێنەریدا دروستدەبێ، بەیان ڕەنگە تایبەت نەبێ، بە شیعر، چونکە چەمکێکی بەربڵاوتری هەیە، بەڵام دەکرێت ئەو سیحری بەیانە لەگەڵ حیکمەتی شیعردا ئاوێزانببێ و بۆئەم مەبەستەش دڵی بەهێز و داڕشتنی بەپێز دەبنە فاکتەری کاریگەر:

**نالی نییەتی سیحری بەیان، حیکمەتی شیعرە**

**ئەمما نییەتی قووەتی دڵ قودرەتی ئینشا**

لەم هاوکێشەیەدا شیعر بەزرترە لەوەی تەنهاوتەنها بۆ دەرخستنی حاڵەتی دەروونی شاعیر بەکاربهێنرێت، شیعر دەبێتە حیکمەت واتە پەند و فەلسەفەی ژیان، واتە ئەو گۆشەنیگایەی لەسەر مرۆڤ و ژیان و جیهان دروستدەبێ.

ئەمە ئەو شیعرەیە کە مەرحومی ئیقبال ناوی شیعری باڵای لێدەنێ کە کۆی ئەزموونی مێژووی گەلێك و ژیارێکی تێدا پوختدەبێتەوە.

یەکەمین بەیتی دیوانەکەی نالی ئاماژەیە بۆ:

١. جوانی - حوسن، کە چەمکێکی بابەتیانە و ڕاستەقینەیە.

٢. تەماشا، کە چەمکێکی خودییانە و ئیعتبارییە.

هەردوو چەمکە لە حاڵەتی عەشق و ئەویندا، کاتێك دڵدار مەستی جوانی دڵبەرەکەی دەبێ بەرجەستدەبن. نالی دەرکەوتنی ئەم دوو چەمکەی بەستووە بە خوداوە..

لەم غەزەلەدا خوێنەر هەروەك نالی خۆیشی نازانێ.. نالی سەرسامی جوانی خوای بەدیهێنەری جوانییە یان حەیرانی جوانی ئەو خوشەویستەیە کە نالی پێیدەڵێت:

**فەییازی ریازی گوڵ و میهر و موڵ و لەعلی**
**ئەی شەوقی روخ و زەوقی لەبت زائیقە بەخشا**
**جاران بەرلەبی بۆسەی لەبتە عاشقی زارت**
**(فالبائـــس یســـــتوهب مـــن فیك معاشـــا)**

ئەم سەرسامییە لەوەوە هاتووە (نالی) بە ئەنقەستبێ یا بەئەنقەستنەبێ خۆی لەبەرامبەر دوو سەرچاوەی جوانییەوە دەبینێ و دوو جوانی تەماشادەکا لە لایەکەوە خوا کە پێیدەڵێت:

**ئەی جلیوەدەری حوسن و جڵەوکێشی تەماشا**
**سەررِشتەیی دین بێمەدەدی تۆ نییە حـــاشا**
**زەرراتی عوکوسی کەششی میهری جەلالن**
**وا دێنودەچن سەرزەدە سولتان و شـەهەنشا**
**بەم رەحمەتە عامەت کە دەکا سەنگی سیەە زەر**
**لەم قەلبە کە وەك بەردەرەشە، رش رشاشا**

کاتێك دەیەوێت تەعبیر لە عیشق و ئەوین بداتەوە، کە بێگومان عەشقێکی زەمینی و مەجازییە و دوورە لەو عیشقە حەقیقییەی متسەوفین، غەزەلەکانی دەبنە تابلۆی جۆراوجۆ، دەعوای فرەچەشن و بەیتبەیتی غەزەلەکانی گوزارشت لە سروشت و جوانییەکان و ئایدیالیزەکردنی مەعشوق و مەحبووبەکەی دەکات:

**هەرچەندە کە ئینسانە لە بەرچاوی من و تۆ**
**مومکین نییە ئەم لوتفە لە ئینسا ن و بەشەردا**

لەم غەزەلەدا[١] نالی قسە لەسەر تاقانەیی و بێوێنەبوونی خوشەویستەکەی دەکات و تەنانەت ئەوەندەی بەرزدەکاتەوە لە لوتف ونازکیی و مەعنادا کە بالاًی دەشوبهێنێت بە راستەهێڵی حەقیقی و دەمی بە جەوهەری فەرد کە لای فەلاسیفە دوو ئەمری مەحالن، پاشان دەیکاتە سەبەبی چاورۆشنیی خۆی:

**ئیسباتی خەت و خاڵ بە سەد شوشتن و گریان**

**ناچێتەوە ئـــەم نوقتە لەنێو دیــدەیی تەڕدا**

**شەوقی کە نەبێ باسیرە مەئیوسە لە دیتن**

**هەر شەوقی ئەوە قووەتی دینی بە بەســەردا**

ئەم ئیحساسە نیسبەت بە خۆشەویست و ئەم بڕوایە کە جوانییەکانی بە سەرووی تەسەور ئەزانێ لە راستیدا زادەی ئەوینێکی پاك و ئەفلاتوونییە کە تەرکیز دەکاتە سەر گیان و جوانییە مەعنەوییەکان. لەم عیشقە پاکەدا نالی بەتەواوی بزردەبێ و نامێنێت جگەلەو ناڵەناڵ و گریانە نەبێت کە لە موناجاتی سەحەردا دەبیسترێت:

**نالی خەبەری بێئەسەری غائیبە ئەمما**

**ناڵێکی حەزین دێ لە موناجاتی سەحەردا**

تەبیعەت ئەو ئایدیاڵەیە کە نالیی جوانییەکانی مەعشووقی پێدەپێوێت.. بۆ نموونە لە مەتڵەعی غەزەلێکدا کە دەڵێت:

**گەر بێیەدەرێ سەوری رەوانی لەئیرەمدا**

**وەر نەییەدەرێ ئاهویی چینی لەحەرەمدا**

بەڵام لەهەمان غەزەلدا جارێکیتر لە بەراوردی سروشت و جوانیی مەعشووقدا دەبینین مەعشووق دەبێتە ستانداردی سروشت، کاتێك کە دەڵێت:

**لافی دەمی تۆ غونچە لە دەمیا بوو، بە (عەمدا)**

**با خوستی بڕی، خستی، کە مستێکی لە دەم دا**

لەم جوانی بایسەدا غونچە دەبێتە ئەنجامی ئەوەی کە ویستوویەتی لە دەمی

مەحبووبەکەی نالی بچێت کە ئەمەش ناحەقییە و سزای سروشتیی خۆی هەیە و با جێبەجێیدەکات، بەم بڕوا و بۆچوونە بێت سروشت یەکەیەکی پێکەوەگونجاوی پێکەوەبەستراوە، هەربۆیە لێکچوونێکی تەواو هەیە لەنێوان سروشت و مرۆڤدا، لەسروشتدا هەم نموونەی حاڵەتاکانی مەعشوق دەبینین، وەك بڵێی سروشت بۆخۆی جیهانی ئایدیالی عیشقە و پڕەلە دوانەی عاشق و مەعشوق:

**دڵ موزمەحیلی دەردە وەکو دیدە لەنەمدا**

**حـــەیران و پەرێشانە وەکو قەترە لـــە یەمدا**

**نالی، مەسەلی حاڵی لە ئەشکەنجەیی غەمدا**

**وەك ناڵە لەنەیدا وەکو نالە لەقەڵەمدا**

ئەمە گەڕانەوەیەکی تەواوە بۆ تەبیعەت، ئەو تەبیعەتەی لە دیدی هونەرمەندەوە سەرچاوەی هەموو ئەفراندن و داهێنانێکە، شاعیری راستەقینە ئەو کەسەیە کە جوانتر سەیری تەبیعەت دەکا و جوانتر باسیدەکات، لەوەوە دەستپێدەکات و بۆ ئامێزی ئەویش دەگەڕێتەوە، واتە دەبێتە ئەو پێوانەیەی کە خۆی خۆشەویستی، هەموو رەنج و مەینەتییەکانی خۆی و هەموو جوانیی و هەڵوێستەکانی خۆشەویستی پێدەخوێنێتەوە.

عەشقی نالیی هەرچەندە عەشقێکی پاکە بەڵام عەشقێکی ماددییە، واتە باس لە رواڵەتە بەرجەستەکانی جوانیی دەکات، لەم عەشقەدا قسە لەسەر روومەتی رەنگین، قەدی مەوزوون و شیرین و زوڵفی چینچینە، ئەمە لایەنی بەرجەستەی ئەوینی نالییە، ئەو لایەنەی لەبنەڕەتدا ئاگری خۆشەویستی لە دڵ بەردەدا خۆشیدەکات. بە بەڵگەی ئەوەی (گیانی مرۆڤ بۆ خۆی جوانە و هۆگری هەموو شتێکی جوان دەبێت)[٢] نالیی عاشقێکی گریاو، پشتچەماوە و دڵسووتاوی ئەوینی حەبیبەیە، ئەم سووتانە ئەنجامی جودایی و توانەوەی نالییە لە جوانییەکانی ئەودا، عەشقی نالی عەشقی فیراق و جوداییە، عەشقی ململانێیە لەنێوان یارێکی بێباك بەهەموو جوانییەکی سرووشتی و خودادادییەوە و عاشقێکی بێنەوای دوور:

**روخم رەنگینی رەنگی روومەتی رەنگینتە بازا**

**قـــەدی سـەروم کە مانینی قەدی شیرینتە بازا**

**غەریب و بێکەس و زار و فەقیری خانەدانی تۆ**

**جگـــەرســـوتاو و ماڵـــوێرانی زوڵفی چینتە بازا**

لەم روانگەیەوە عیش ئەو رەنج و موعاناتەیە کە مرۆڤ ساغ و قالدەکات، چونکە رەهەندی ماددیی لەناودەبا:

**ئەو چاوە غەزالە فەتەراتی سەر و ماڵە**

**ئەو نەرگسە کاڵە نە منی هێشت و نە کالا**

رێگای عیش ئەو رێگا پڕ مەترسییەیە کە عاشق ناچارە پیایدابڕوات، ئەمە ئەو مەبەستەیە کە نالی بەڕاشکاوی باسیکردووە:

**بۆ هەرکەسێ مەبزوولە تەریقێکی ئەمانەت**

**هەر عاشقی بێچارە لەڕێی خەوف و خەتەر ما**

کەواتە پەیامی یەکەمی نالی لەشیعردا پەیامی عیشق و ئەوینە و دەروازەی ئیقلیمەکەی بریتییەلە هۆگربوون بەجوانیی مەحبوب و موبتەلابوون بە فیراق و جودایی.
پەیامێکیدیکەی نالی بێزارییە لە ریا و زوهدی درۆینە و وەعزی سارد و سڕ، ئەو نایەوێ سۆفییەکی سادەلەوحی ئالوودەبەدنیا بێت:

**وەک سۆفیی سافیی مەبە ئالوودەبەدنیا**

**بێهوودە موکەددەر مەکە سەرچاوەیی مەشرەب**

رواڵەتپەرستی و خوولانەوە لە چەرخی رواڵەتی بۆش و بێناوەڕۆک بەتەواوی دەخوسپێنێت:

**ریشەکەی پان و درێژە بۆ ریا خزمەتدەکا**

**زاهیرە هەرکەس بە تول و عەرزی ریشیدا ریا**

لە غەزەلێکیتردا زۆر لە پلەوپایەی واعیز دێنێتە خوارەوە، کاتێك دەڵێت:

**ئەی واعیز بارید چییە وەك هەرەسی کێو**

**بەو وەعزە کە بایە هەموو هاتوویی بە سەرما**

ئەمە نەریتێکی دێرین و جێگیرە کە شاعیرانی راستەقینەی کورد و فارس هەیانبووە و لە ناواخنی غەزەل و قەسیدەکانیدا رەنگیداوەتەوە. ئەم بێزارییە لە زوهدی درۆینە و سۆفیگەری رواڵەتیانە، دوو مەبەستی لێدەخوێنرێتەوە، لە لایەك بوونی کەسانێکی بەناوی دینەوە خەریکی بازرگانی و دنیاپەروەری و خۆپەرستین و کۆسپی راستەقینەن لەرێی چاکسازی و بەهرەوەری دینداراندا، لەلایەکیترەوە پەیامی سەرەکیی عیرفان ئەوەیە کە خەڵك وریابکەنەوەلێیان، وەك ئەرکێکی ئایینی و ئینسانی.

پێش نالی لە شیعری حافزی شیرازیدا بەزۆری ئەم بێزاری و شۆرشە دەبینین، بۆ نموونە:

حافظ مکن ملامت رندان که در ازل

مــــــارا خدا ز زهد ریا بی نیاز کرد

ز خانقاه به میخانه می رود حافظ

مگر ز مستی زهد ریا به هوش امد

می صوفی افکن کجا می فروشند

که در تابم از دســــــت زهد ریایی(٣)

ئەم هەڵوێستە رەخنەگرانە لە واقیعی دینداری دوای حافز لەناو فارسەکاندا و دوای نالیش لەناو شاعیرانی کورددا بەردەوامبووە و بووەتە مەبەستێکی شیعری کە دەتوانین لە کۆن و نوێ نموونەی زۆر و زەبەندی بۆبهێنینەوە.

عیشق لای نالی بۆخۆی تاموچێژ و تەراوەتێکی تایبەتی هەیە کە سۆفی وشك تەبیعەت

لێی بەهرەمەند نابێت. بۆیە کە باسی وەرزی بەهار و رازانەوەی تەبیعەت دەکات بەڕاشکاویی دەڵێت:

**فەسڵێ کە هەر لە فەرقی بەشەر تا رەگی شەجەر**

**وشکێ بە غەیری سۆفیی و عاسای نەمایەوە**

**لە م فەیزی نوورە هەرچی کەوا نارە مردووە**

**بەم نەفخی سوورە هەرچی کە خاکە ژیایەوە**

لەهەمان پارچەدا تانە و توانجێکی ماناداردەگرێتە سۆفیی کە بێگومان مەبەستی سۆفیی ریاییە:

**سۆفی ریایە خەڵوەتی بێنی بەهاری کرد**

**هاتەدەرێ لە سایەیی چایەر، حەسایەوە**

لەبەیتێکیتردا رووی گوتاری دەگاتە زاهید:

**زاهید مەکە مەنعی دڵ، بۆ تۆ نییە سوودی گوڵ**

**خاکت بەسەر ئەی غافڵ، کەوتوویە چ سەودایە؟!**

لەمەوە دەردەکەوێ گەورەترین سەرمایە لەم بوارەدا بریتییەلە راستگۆیی لەگەڵ خود و لەگەڵ خەڵك، واتە دیوی دەرەوەی مرۆڤ گوزارشت لە دیوی ناوەوەی بدات بەتەواوی، ئەمە ئەو نەخۆشییە ترسناکەیە کە تووشی تاك و کۆمەڵ دەبێت و کەسایەتیی دووکەرتدەکات و لەئەنجامدا درۆ و دووڕوویی و خیانەتکردن بڵاودەبێتەوە. هەربۆیە بەلای نالییەوە ریفۆرم لە ناخەوە دەستپێدەکات نەك لە رواڵەتەوە، بە راستگۆیی و کردارە نەك بە سلوك و شیعار:

**نالی کە ویقاری نییە، بێباکە لە خەڵکی**

**سۆفی کە سلوکێکی هەیە عوجب و ریایە**

**بەزمی هەزارە، قەلفرِی ئەغیارە، دەوری گوڵ**

**سۆفی برِۆ، مەبە بە درِك تۆ لە ئێمە نی!**

نالی لەو قەسیدە نایاب و گرانمایەیدا کە لە شامەوە بۆ سالمی شاعیر و هاورِێی نووسیوە، بەو سۆز و ئەوینە بێگرێوگۆڵ و دارِشتنە وەستایانە، توانیویەتی تۆوی بیر و هەستی نەتەوەیی و نیشتمانپەروەری لە سەردەمی قەیران و داگیرکراندا لە هۆش و هەستی گەلەکەیدا بچێنێت. ئەم قەسیدەیە دەرخەری جیهانبینی و دەروونی پرِلە غەوغای نالییە و دەربرِی ئەو ئنتیما قووڵەیە کە هەستیپێکردووە بۆ زێد و وڵاتەکەی، ئەو لەم چامەیەدا وەستایانە باس لە باری دەروونی خۆی یادەوەری دیمەنە جوان و دڵرِفێنەکانی وڵاتەکەی و دواتر دەرەنجامی رووخانی میرنشینی خۆماڵی بابان بە دەستی تورکەکان و ئەو هەلومەرجە ماتەمبارەی بەسەر موڵکی باباندا هات، کاریگەری ئەو بارودۆخە لەسەر نالی کە بۆخۆی سەردەستەی شاعیرانی میرنشینەکە و ئالاهەڵگری دیالێکتەکەی بووە، وێرِای کاریگەری ژیانی تاراوگە لەسەر پێش نالی و دوای ئەویش شاکاری ئەدەبی گەورەی لێکەتۆتەوە، کە یەکێکیان ئەم قەسیدەیەیە کە پێکهاتەیەکە لە سۆز بیرەوەری و وەسف و نیشتمانپەروەی و سیاسەت و وێنە و تەشبیهات و خوازە و چەندین سنعەت و هونەری ئەدەبی و جگە ئاماژە بۆ زاراوەی زانستیی فرە چەشن، ئەم چامەیە بۆئەو سەردەمە و بۆ ئێستاش دەگونجێ مانیفێستێکی بیری نیشتمانپەروەری و خۆماڵی بێت، هەرچەندە بە کێشانەی هەندێك نووسەر و بیرمەند نالی و هەموو ئەوانەش وەك ئەو لە تاراوگەوە سەیری نیشتمان دەکەن، ناتوانن هۆشیارانە بیربکەنەوە و هەمیشە پەردەیەك لە سۆز و خۆشەویستی بەرچاوی بەسیرەتیان دادەپۆشێت، بەڵام پێویستە ئەوەشمان لەیادبێت، تاسەکردنەوە بۆ نیشتمان و بۆ زێدی باوباپیران و ناڵەناڵی نالییەکانی کۆن و ئێستە بۆ گەرِانەوە بۆ رابردوو هەروەها خەوبینین بە جوانی و لایەنە رۆشنەکانی وڵاتەوە گەورەترین فاکتەرە بۆ بنیاتنان و دامەزراندنی دەوڵەتی نەتەوەیی، ئەوەی کە پێویستە شاعیرێکی رۆشنگەری وەك نالی لە چرکەساتێکی مێژووییدا بۆ گەل و کۆمەڵگاکەی بیکات ئەوەیە کە ئەو هەست بەو پەیوەندی و ئینتیمایە قووڵ و قووڵتربکاتەوە و ئەوەی ئەو هەستیپێدەکات ببێتە هەستێکی دەستەجەمعی و پاشان نەوەکانی لەسەر پەروەردەبکرێت، بە گوزارەیەکیتر کاری شاعیر و قارەمانی میللی ئەوە نییە کە رووی گوتار تەنها لە هۆش و ژیریی تاکەکان و جەماوەر بکات، ئەمەیان لەرِاستیدا کاری ئەو

کەسانەیە کە دواتر دێن تەشکیلی هۆشیاری خەڵك دەکەن و لە زانکۆ و پەیمانگاکاندا مەشخەڵی زانست هەڵدەکەن، بەڵێ خۆشەویستی وڵات وای لە شاعیرانمان کردووە دیدێکی شەیدایانە و ناواقیعیمان لەسەر زێد و نیشتمان هەبێ و نەتوانین و نەمانەوێ لایەنە ناشیرین و دزێوەکانی ببینین، بەڵام ئەم گوتارەی کە نالی و هاوچەشنی نالی بەرهەمیدەهێنێت سەر بە مەملەکەتی رووحە نەك جەستە و لە مەقوولەی ئینفیعالە نەك فیعل، بە زمانی عیشقە نەك عەقڵ.

نالی لەدیوانەکەیدا زۆرجار بە لۆجیکی عەقڵ شیعری گوتووە و لەو شیعرانەدا لە حەکیم و فەیلەسوف دەچێت تا لە شاعیر، هەربۆیە شیعرەکانی دەچنە خانەی حیکمەتەوە، بۆ نموونە لە وەڵامی ئەو کەسانەدا کە رەخنەیان لێگرتووە، کە بۆچی شیعر بە کوردیی دەڵێت:

**کەس بە ئەلفازم نەڵێ خۆ کوردییە خۆ کوردییە**

**هــــەرکەسێ نادان نەبێ خۆی تالیبی مەعنا دەکا**

**بێتە حوجرەم پارچە پارچەی مسوەددەم بکرێ بە رۆح**

**هەر کەسێ کوتاڵ و پارچەی بێبەدەل سەودادەکا**

ئەمشێوە شیعرانە لە زمانی فەیلەسوفەوە هەڵقوڵاون نەك لە زمانی شاعیرەوە، فەیلەسوفە کە گرنگی بە مانا و کاکڵەی گوتار دەدات نەك بە وشە و توێکڵەکەی، لەشوێنێکیتردا کە روو لە مەحبووبەکەی دەکا و پێیدەڵێت:

**گێل ئەگەر تورکی تەعال گەر عەرەبی**

**بێ ئەگەر کوردی ئەگەر فورسی بیا**

ئەمە پێداگرتنە لەسەر جەوهەری ئەو پەیوەندییە رووحانییەی دوو مرۆڤ پێکەوە دەبەستێ کە رەنگە زمان تیایدا رۆڵێکی لاوەکی دەبینێت نەك سەرەکی.

لەو پارچە شیعرەدا کە بۆ تیپی سوپای بابان گوتوویەتی و تیایدا وەسفی وەستان و تەرتیب و نەزم و نیشانیان دەکات، لەو تێگەشتنەوە بۆ بابەتەکە دەڕوانێت کە ئەمە بناغەبێت بۆ سوپایەکی بەهێز کە بەرگری لە خاکی پێبکرێت، بۆیە زمانەکەی زمانی هاندان و هەڵنانە هەم بۆ ئەحمەد پاشای بابان و هەم بۆ سەربازە تایبەتەکانی:

**ئەم تاقمە مومتازە کە وا خاسسەیی شاهن**
**ئاشـــووبی دڵی مەملەکەت و قـــــەلبی سوپاهن**
**سەفسەف کە دەوەستن بە مەسەل خەتتی شوعاعن**
**حـــــــەلقە کە دەبەستن وەکو خەرمانەیی ماهن**
**نەرگس نیگە و ساق سەمەن، کورتە بە نەفشەن**
**موو سونبول و رووەمەت گوڵ و هەم لالە کولاهن**

دیسان ئەو غەزەلە نایابەی کە باسی توانا و دەسەڵاتی شیعر و ئەدەبی خۆی تیادەکا، بەتەواوی ئەوەی لێدەخوێنرێتەوە کە نالی بە زمانی عەقڵ و بڕوابەخۆبوونێکی تەواو دەدوێ:

**هەرکەسێ ئیزهاری دانایی بکات و مەقسەدی**
**خودپەسەندی بێ یەقین ئیزهـــاری نادانی دەکا**
**خەرقە پۆشێ کەی دەپۆشێ جەوهەری زاتی ئەمن؟**
**بیتە نێو جیلوەی بە زشتی خۆی بە عوریانی دەکا**
**زابیتەی تەبعم سوارە ئیددیعای شاهیی هەیە**
**موحتەشــــــەم دیوانە داوای تەختی خاقانی دەکا**
**شاهیدی فیکرم کە بێتە جیلوەگاهی دولبەریی**
**شاهی خوسرەو رووحی شیرینی بە قوربانی دەکا**
**نوکی خامەی من کە بێتمەعنی ئارایی کەمال**
**خەتبەخەت ئیزهاری نەقشی سورەتی مانی دەکا**
**ئیستیتاعە و قووەتی تەبعم بە کوردی و فارسی**
**عـــــارەبی، ئیزهاری چـــــالاکییو چەسپانی دەکا**

نالی لەڕووی پێکهاتەی هزری و کەلتوورییەوە، مەلایەکی کوردی شارەزای زانستەکانی سەردەمی خۆی بووە، ئەم زانستانە بە زاراوە و مەبەستەکانیەوە لەشیعرەکانیدا رەنگیانداوەتەوە، بەتایبەتی هونەر و سنعەتی وەستایانەی نالی لەو ئاماژە و تیلنیگا و وەرگرتنانەوە دەردەکەوێت

که لەژێر پەردەی غەزەلەکانیەوە مەلایەتییەکەی دەردەکەویٚ، بۆ نمونە لەغەزەلێکدا کە گوایا بە بۆنەی مردنی باوکی حەبیبەوە گوتوویەتی سوود لە دوو زاراوەی عیلمی میرات وەردەگرێت:

**بەس گریە بکە بۆ پدەر و بابی حیجابت**

**بی بابیی تۆ موریسە بۆ وەسل و مولاقات**

لەو قەسیدە بەهێز و پێزەدا کە باس لە پیریی خۆی وبەسەرچوونی سەردەمی لاویی دەکات، مرۆڤ لەم زمانە، لەم سنعەت و لەم وشە ئاراییی و دارشتنە سەرسامدەبێت:

**لە شەرحی هەیئەتی مەتنی مەدەن کە هەر جوزئی**

**ســــەقیمە، عــــاجزە تەســـحیح و رابیتی تەدبیر**

**تێدا حەدیسی حەداسەت زەعیف و مەترووکە**

**کە قەتعە سیححەتی ئیســـناد و عەنعەنی تەقریر**

**لە نەحو و سەرفی ئەداتی مەپرسە ئەی موعریب**

**کە رەفع و نەسب و جەڕ و جەزمی ئالەتی تەقریر**

**ئەلیف نەکیرە و بێگانە نایەتە تەعریف**

**عەلەم موشـــــابیهی غەیـــــــر و مولازیمی تەنکیر**

ئەم زمانە ئالۆز و سنعەتە هونەرییە دیارە نالی بۆ کەسانی زانا و وردەکاری ئەو سەردەمەی نووسیوە و مەبەستی ئەوەبووە دەسەڵاتی مەعریفی و شاعیرێتی خۆی نیشانبدات، مەبەستی بنەڕەتی لەمجۆرە شیعرانەی نواندنی ئاستی هۆنەریی بووە بۆ هاوچەرخەکانی، لەسەردەمێکدا کە هونەری نووسین و دارشتن پلەوپایەی بەرزی بە مەلا و فەقێ دەبەخشی لە ناوەندەکانی رۆشنبیری و سیاسیی کوردستان و دەوروبەری، لەگەڵ ئەمەشدا خاڵێکی درەوشاوەیتری نالی وەك لە دیوانەکەیەوە دەردەکەوێت ئەوەیە کە ئەگەر شیعری بۆ دەسەڵاتی سیاسیش وتبێ، بۆ میرەکانی بابانی گوتووە، کە ئەمەش نابێتە تەعنێك لە هەڵوێستی ئەو.

نالی وێرای ئەو غەزەلە نازك و بەسۆزانەی بۆ حەبیبەی مالیاوا یان هەر حەبیبەیەکیتر وتوونی، لە چەند شیعرێکدا قسەی لەسەر بابەتی داغی فەلسەفەش کردووە، وەك ئەو غەزەلەی دەڵێن تیایدا تەعریزی بە موفتی زەهاوی هاوڕێی فەقێیەتی خۆی کردووە:

**ئەحوەلی تەفرەقە نەزەر تەقوییەیی سەبەب دەکا**
**عاریفی وەحدەت ئاشنا لەم قسەیە ئەدەب دەکا**
**بەندە ئەزەل بە خەتتی خۆی قابیلی قیسمەتی بووە**
**ئیستە بە ئیقتیزای عەمەل جێگەیی خۆی تەڵەب دەکا**
**داری ئیراک و داری هیند هەردوو کە عوودە ئیسمییان**
**هەمدەمی سوننەتە ئـەوەم مەیلی ئەبولەهەب دەکا**
**سەهم و نەسیبی ئەسلییە باسی گیا و گڵ نییە**
**تووتنە خەرجی ســـــووتنە مودنە مـــاچی لەب دەکا**

لەم شیعرەدا کە تایبەتە بە بابەتی جەبر و ئیختیار و سنووری دەسەڵاتی مرۆڤ لە کار و کردەوەکانیدا، نالی پشتگیریی لە بڕوای ئەشاعیرە و ئەهلی سوننەت و جەماعەت دەکات، کە دەڵێن مرۆڤ کردەوەکانی خۆی خەلقناکات، بەڵکو خوا خەلقیاندەکا و مرۆڤ کەسبیاندەکا واتە بەدەستیاندەهێنێت، بەپێچەوانی بڕوای موعتەزیلە کە مرۆڤ بە خالیق و ئەفرێنەری کردەوەکانی دەزانن و بۆچوونی ئەشاعیرە بە جەبرییەت و دژ بە دادگەری و مەنتیقی عەقڵ و ئازادی لەقەڵەمدەدەن، لەوەدەچێت، موفتی زەهاوی بەشێوەیەك لە شێوەکان رای موعتەزیلەی پەسەندکردبێت و نالیش بەپێچەوانەوە پابەندبووبێت بە بڕوای ئەهلی سوننەتەوە، هەربۆیە بۆچوونەکەی خۆی و ئەشاعیرە بە بۆچوونی عارفی وەحدەتئاشنا ناوزەنددەکات، واتە خواناسی ئاشنا بە موقتەزای تەوحید و بڕوای موفتی زەهاویش بە بڕوای کەسێکی خێل ناوبردووە کە یەکی لێدەبێت بە دووان کە رەنگە موفتی زەهاوی بۆ خۆشی خێل بووبێت.

جاری وا هەیە نالی زۆر بەزرتر دەبێتەوە لەوەی کە ئێمە تەسەوریدەکەین، کاتێك باس لە پلەیەك دەکات کە لەسەرووی پلەی عیشقەوەیە، ئەو پلەیەشی بە بێناو هێشتووەتەوە بۆ دوای خۆی کە رەنگە مەبەستی پلەی عیرفانی حەقیقی بێت کاتێك دەڵێت:

**عاشق هەوەسی مەیکەدە و و عیلمی بەسیتە**

**عاقڵ تەڵەبی مەدرەسە و و جەهلی مورەککەب**

بەم بۆچوونە عاشق خاوەنی هەوەسە و بە دوای عیلمی سادەدا دەگەڕێت، واتە بەتەنها تەسەورێك کیفایەت دەکات، بەڵام عاقڵ واتە کەسی خیرەتمەند و زانا بە سروشت و جیهانی ئەسباب خاوەنی تەڵەبە و لەمەدرەسەدا هەندێك شتی ناواقیعی فێردەبێت و واش گوماندەکات کە بە ناوەڕۆکی راستی گەیشتووە، واتە نازانێ کە نازانێ و ئەمەش جەهلی مورەککەبە و دەربازبوون لێی ئەستەمە ئەگەر مەحاڵ نەبێت.

لەم نموونانەوە ئەو راستیەمان لابەرجەستە دەبێت کە پەیامی نالی زۆربەی زۆری بوارە زیندووەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی، هزری و سیاسی و تەنانەت ئاکاری گرتووتەوە، بۆئەمەش زمانی کوردی رامکردووە پەیامەکانی و بە غەزەلە لیریك و مەوزوونەکانی خزمەتی گەورەی بە زمانی کوردی کردووە هەربۆیە دەتوانین لە کۆتایی ئەم وتارەدا پشتئەستوور بە دیوانەکەی پەیامی نالی بە پەیامێکی نەمر و زمانەکەی بە زمانی ستانداردی کوردی لەقەڵەمبدەین، پێشنیازی ئەوە بکەین، زانکۆکانی کوردستان ئاوڕێکی جیددی لە نالی و بەرهەمەکانی بدەنەوە و بەشێك یان پسپۆڕیەك بە ناوی نالیناسییەوە بکرێتەوە، بۆ خوێندنەوەی قووڵ و هەمەگیری غەزەل و بەیتبەیتی دیوانەکەی و سۆراخی ئەو بەرهەمانەشی کە تائێستا دەستنووسن و لە گۆشەی فەرامۆشیدان و چاوەڕوانی هیممەتی نووسەران و ئەدیبانن.

•••

پەراوێزەکان:

١. غەزەل لەزماندا بە مانای عیشقبازی و قسەکردنە لەگەڵ ژنان و لەزاراوەدا یەکێکە لە قاڵبەکانی شیعری کلاسیکی کە پێنج - چواردە بەیت دەبێت بەیەك کێش و یەك سەروا، لە دواهەمین بەیتدا شاعیر تەخەللوسی خۆی باسدەکات و چاترین بەیتیشی پێیدەگوترێ.. شابەیت یا بەیتولغەزەل. واژه نامه هنر شاعری ل١٨٨.

٢. ئیبن حەزم لە کتێبی (طوق الحمامة)دا ئاماژەی بۆ ئەم فاکتەرە کردووە. طوق الحمامةل٥٣.

٣. دیوان حافظ ل ٩١، ١١٩، ٣٥١.

# ئەو گرێکوێرانەی لە ژیانی نالیدا ناکرێنەوە

م. عەلی

هیچ شاعیرێك بەقەد نالی مشتومڕی زۆری لەدوای خۆی بەجێنەهێشتووە لەسەر زۆر بابەت کە وەکو گرێکوێرە ماونەتەوە و چەندە قسەی لەسەربکرێ بەئاسانی یەکلاییناکرێنەوە.

نالی ئەو شاعیرە پایەبەرزەبوو کە توانی کودەتایەك بەرپابکا و قوتابخانەی شیعری کلاسیکی کوردی لە باشووری کوردستاندا دابمەزرێنێ.. ئەو هێشتا خۆی لەژیاندا بوو شاعیرێکی وەکو سالمی هاوڕێی بە (حەزرەت) ناویببات وەکو لەم شیعرەیدا دەڵێ:

**توخوا بڵێ بە حەزرەتی نالی دەخیلیبم**

**بەمنەوعە قەت نەکا بە سولەیمانییا گوزەر**

حاجی قادری هاوسەردەمیشی لەبارەیەوە دەڵێ:

**نالی ئوستادەکی گەلێ چابوو**

**خزری ئابی حەیاتی مەعنابوو..**

سەرەڕای ئەو هەموو پێشڤەچوونەی هەنگاوەکانی کاروانی شیعری کوردی تائێستا نەتوانراوە تخووبی ئەو ببەزێنرێ و هەتادێت ئیستاتیکای ناوەوەی شیعرەکانی دەدرەوشێتەوە.

لەوانەیە، وەکو دەوترێ نالی لەهەموو شاعیرانیتری کورد لەڕووی بایەخپێدان و لێکۆڵینەوە و لەسەرنووسین بەختەوەرتربێ، لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا نەتوانراوە پەی بەزۆر لە نهێنییەکانی ژیانی ئەو ببرێ و لەوەشناچێ لەئاییندەی نزیکیشدا شتێکی ئەوتۆ دەربکەوێ ئاراستەی قسەکردن لەسەر گرێکوێرەکانی ژیانی نالی بگۆڕێ.

گەورەترین کێشە لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا مەسەلەی مێژوو یان نووسینی رووداوەکانە کە گرنگی تایبەتی خۆی هەیە بۆ تیشکخستنەسەر رۆژگار و سەردەمی شاعیرەکان و تێگەیشتن لە ناوەڕۆکی شیعرەکانیان و جێنەهێشتنی گرێوگۆڵ و ئالۆزی و دروستنەکردنی سەریەشە بۆ دوای خۆیان.

نالی یەکێکە لەو شاعیرانەی کە رۆژ و کات و بگرە شوێنی شیعرنووسینەکانی نەنووسیوە یان باسنەکردووە، بە کەمیش لە شیعرەکانیدا بە حیسابی ئەبجەدی ئاماژەی بە رووداوێك لەسەر کەسێك داوە، مەگەر ئەوانەی لەنزیکەوە ئاگایان لە شیعرەکانی بووبێ و ئاماژەیانپێکردبێ.
لێرەدا ئێمە باس لەو شتانە دەکەین وەکو گرێوگۆڵ ماونەتەوە و مشتومڕی زۆریان لەسەرە:

**رەچەڵەکی نالی:**

لەلای میللەتانیتر گرنگی باش بە رەچەڵەکناسی دراوە، دەیان کتێب لەمبارەیەوە نووسراوە، بەلاّم لەلای کورد زۆر بایەخ بەم مەسەلەیە نەدراوە، ئەگەر کتێبیش لەسەر ژیانی کەسایەتییەکان نووسرابێتەوە، ئەوا بەسەرپێیی بەلای رەچەڵەکدا تێپەڕیون، بۆیە کاتێك کە تەماشای بیۆگرافیای ژیانی نالی دەکەین لەهەموو سەرچاوەکاندا هەر بە یەك شێوە هاتووە و یەك لەویتر وەریگرتووە و ئەویش بە کرچوکاڵی و نامانگەیەنێتە ئاستی تینوێتیشکاندن:

- مامۆستا عەلائەدین سەجادی لە کتێبی (مێژووی ئەدەبی کوردی)دا دەنووسێ: "نالی ناوی خدر – خضرە و کوڕی ئەحمەدی شاوەیسی ئالیبەگی میکایەلییە..".
- بنەماڵەی مودەڕیسیش لە کتێبی (دیوانی نالی)دا هەمان ئەو قسەیەی مامۆستا عەلادین دەنووسن: "نالی ناوی خدر- خضرە و کوڕی ئەحمەدی شاوەیسی ئالیبەگی میکایەلییە..).
- د. مارف خەزنەدار لە کتێبی (دیوانی نالی)دا دەنووسێ: "خدر کوڕی ئەحمەد شاوەیس ئالیبەگی میکایەڵی شارەزوورییە، نازناوی شیعری نالییە.."و لە کتێبی (مێژووی ئەدەبی کوردی)یشدا دەنووسێ: "نالی ناوی خدر کوڕی ئەحمەد شاوەیسە، لە تیرەی ئالیبەگی میکایەڵی عەشرەتی جافە..".
- د. عەبدوڵلاّ حەداد لە کتێبی (نالی لە دەرەوەی کوردستاندا) ئاماژە بە کتێبی (نزهة الفكر)ی ئەحمەد ئەلحەزراوی دەکات کە لە خانەی پیتی (خ)دا ئاوا باسی نالی دەکات: "الشیخ خضر افندي نالی الكردي..".

- ئیتر هەرکەسێکیتر باسی ڕەچەڵەکی نالی کردبێت هەر ئەوەندەی وتووە و لەوە زۆرتر نوبووە نەتوانراوە ناوی باوباپیرانی بهێنرێت، ئەگەر ئێستاش کەسانێك هەبن خۆیان بە خزمی نالی بزانن ناتوانن چۆنیەتی پەیوەندی ئەو خزمایەتییە بسەلمێنن تا ئێمەش لە هەندێ گرێوگۆڵی ڕەچەڵەکی نالی ڕزگارمان ببێ!

- نووسەران لەسەرچاوەکاندا بەهیچ جۆرێ باسی دایکی نالی ناکەن کە کچی کێیە و خەڵکی کوێیە؟ بەلاّم مامۆستا محەمەد عەلی قەرەداغی لە کتێبی (بەرکوتێك لە خەرمانی شیعری سالم) دا بۆ یەکەمجار باسی ئەوە دەکات کە (نالی و سالم خالۆ و خوارزا بوون، نالی سەرێکی بابانە و لەتەك کوردی و سالمدا پێکەوە سێ پایەی شیعری کلاسیکی کوردی ئەو سەردەمە پێکدێنن..)و ئاماژە بە دەستخەتێك دەکات کە دەڵێت سالم خالۆی نالی بووە.

**لەدایکبوون و مردنی نالی:**

بۆچوونی جیاواز لەنێوان نووسەران و لێکۆڵەراندا لەسەر ساڵی لەدایکبوون و مردنی نالییەوە هەیە:

**لەبارەی لەدایکبوونیەوە:**

- مامۆستا عەلادین سەجادی لە کتێبی (مێژووی ئەدەبی کوردی)دا ساڵی ١٧٩٧ بۆ لەدایکبوونی دەستنیشاندەکات.

- بنەماڵەی مودەڕیس ڕاوبۆچوونەکانی محەمەدئەمین زەکی بەگ و د. مارف خەزنەدار و د. کەمال فوئاد وەردەگرن کە ساڵی ١٨٠٠و مامۆستا عەلادین سەجادی ساڵی ١٧٩٧ بۆ لەدایکبوونی نالی دادەنێن، هۆی جیاوازییەکەش بۆ دیاریکردنی ساڵی ١٢١٥ی کۆچییە لەلایەن کوردی و مەریوانی و عەلی موقبیل لەگۆڕینی ساڵی کۆچی بۆ زایینی و خۆیان هیچ ساڵێ ساڵێك دەستنیشاننناکەن بۆ لەدایکبوونەکەی.

- د. مارف خەزنەدار لە کتێبی (مێژووی ئەدەبی کوردی)دا ساڵی ١٨٠٠ بۆ لەدایکبوونی نالی دادەنێ.

- هەروەها مامۆستا محەمەد حەمە باقیش ساڵی ١٨٠٠ بۆ لەدایکبوونی دادەنێ.

**لەبارەی مردنییەوە:**

- مامۆستا عەلادین سەجادی ساڵی ١٨٥٥ بۆ مردنەکەی دیاریدەکات.

- د. مارف خەزنەدا لە کتێبی (دیوانی نالی)دا ساڵی ١٨٥٦ دادەنێ.

- مامۆستا محەممەد حەمە باقی ساڵی ١٨٧٣ بۆ مردنی دادەنێ.

- بنەماڵەی مودەڕیس قسە لەوە دەکەن کە نالی لە ٥٦ ساڵی یان ٥٨ ساڵی زیاتر ژیاوە و قسەکەی حاجی مەلا عەبدوڵلای جەلیزادە بە بەڵگە دەهێننەوە کە ئەو نالی لە ساڵی ١٨٧١-١٨٧٢ لە مەککەدا دیوە و زۆر پیربووە.

-بۆیە مامۆستا مەسعود محەممەد مردنی نالی لە ساڵی ١٨٥٥دا ڕەتدەکاتەوە و ئەویش ئاماژە بە قسەکەی حاجی مەلا عەبدوڵلای باپیری دەکاتکە لە ساڵی ١٢٨٨دا لە مەککە نالی دیتووە و زۆر پیربووە.

- د. عەبدوڵلا حەداد لە کتێبی (نالی لەدەرەوەی کوردستاندا) دەڵێ: "نالی لە ساڵی ١٢٩٠ھ/١٨٧٣ز گەڕاوەتەوە بۆ ئەستەمبوول و پاش بەینێك کۆچیدواییکرد"، ئەمەش بەپشتبەستن بە کتێبی (عوسمانلی موئەلیفلەری) بورسەلی محەممەد تاهیرەوە وەریگرتووە.. قسەکەی حاجی مەلا عەبدوڵلا و ئەوەی بورسەلی لەبارەی ساڵی مردنی نالییەوە لەیەکەوە نزیکن.

ئەمە حاڵی نالییە لەڕووی ساڵی لەدایکبوون و مردنییەوە کە نووسەران و توێژەران لەنێوان خۆیاندا کۆك و تەبانین لەسەر دیاریکردنی ساڵێك و هەریەکە رایەکی جیاوازی هەیە.

**ناوی نالی:**

لەناو نووسەران و لێکۆڵەرانی ژیان و شیعری نالیدا مشتومڕێکی زۆر لەبارەی نازناوی نالی بەرپابووە و لەدوای خۆی هەرایەکی زۆری ناوەتەوە، ئەم هەرایە تائێستاش هەر بەردەوامە و نابڕێتەوە.. ئەمەش دوو بەرەی لێبووەتەوە:

- بەرەیەك لەسەر ئەو رایەن کە ناوەکە (نالی) بە لامی سووك (بنەماڵەی مودەڕیس و هیتریش..)، ئەمە وشەیەکی فارسییە و کوردی نییە و بە چەند واتایەك نەیجەی ناوبەتاڵ/ شمشاڵ، یان تاڵە باریکەکانی ناو قەڵەمی نەیجە

- بەرەیەك لەسەر ئەو رایەن کە ناوەکە (ناڵی) بە لامی قەڵەو (مامۆستا عەلادین سەجادی و هیتریش..)، بە واتای کەوشی وڵاخ.

- یان ناوەکە بەشێوەی (نالێ) هاتووە
- یان بە واتای نالەنالْ هاتووە.

ئەمەش یەکێکە لەو ئالۆزییانەی کە لەوەناچێ بەئاسانی روونببێتەوە ئاخۆ بۆچی نالی ئەم نازناوەی هەڵبژاردووە؟ تەنانەت لێکۆڵەرانیش نازانن مەبەستەکەی لەچییەوە هاتووە؟ کام یەك لەو واتایانە تەواوە؟ کە نازناوی شاعیرانیتری کورد هیچ جۆرە ناڕوونییەکی تێدانییە و بگرە لێکدانەوە و شیکردنەوەی جیاواز هەڵناگرێ.

**نالی و ژنهێنان:**

دیارنییە لەوکاتانەی کە نالی لەکوردستاندا بووە ژنیهێنابێ، ئەوەی کە دەوترێ گوایە حەبیبەی هێناوە و ئەو ژنی بووە هەر نەسەلمێنراوە، خۆ هیچ بەڵگەیەکیش نییە حەبیبە کێیە؟ ئەوە لەوماوەیەی لەشامدا بووە هیچ لەوبارەیەوە نازانرێ ئایا ژنی هەبووە یان نا؟ تەنیا لە ئەستەمبوولْ باسی ئەوە دەکرێ گوایە ژنێکی تورکی هێنابێ و نەوەشی لێبووبێ! بەلاّم دیارە ژنێکی خراپ و دژی کورد بووبێ، وەکو دەڵێن کاتێ دوای مردنی نالی خەڵکوخوای کورد دەچنەلای و داوای بەرهەمەکانی نالی لێدەکەن، ئەویش هەمووی دەهێنێ و لەبەردەمی ئەواندا دەیاننسووتێنێ.. هەرچەندە ئەمەش هەر قسەیە و بەڵگەی بڕواپێکراوی ئەوتۆ نییە راستییەکەی بسەلمێنێ.

بۆیە ئەم مەسەلەیەش هەروەکو گرێکوێرەیەك دەمێنێتەوە!

**نالی و حەبیبە:**

نالیش وەکو هەموو شاعیرانیتر خۆشەویستێکی هەبووە، جا ئەو خۆشەویستە کەسێکی بەرجەستە بووبێ یان خەیال و ئیلهامی شیعری بووبێ.. خۆشەویستەکەی نالی ناوی حەبیبە بووە.

**قسه لەسه حەبیبه زۆره:**

- یەکێك دەڵێ حەبیبه ناوی ئەو کچەیه که نالی خۆشیویستووه و بۆینەبووه.
- یەکێك دەڵێ حەبیبه ناوی خۆشەویستەکەی نالی بووه و دەیکا به هاوسەری.
- یەکێك دەڵێ حەبیبه ناوی شیعریی دڵخوازەکەی نالییه.
- یەکێك دەڵێ دڵخوازەکەی نالی ناوی ئایشەی مەلا جامی بووه و خەڵکی تەکیەی قەرەداغ بووه و خێلیش بووه.
- یەکێك دەڵێ حەبیبه ناوێکی وەهمییه.
- یەکێك دەڵێ نالی مەستوورەی خۆشویستووه.

**هەڵبەزودابەز لە ژیانی نالیدا لەبارەی حەبیبەوه دەردەکەوێ:**

هەردووکیان یەکترییان خۆشویستبێ و نەیاندابێتێ و شوویکردبێ یان مردبێ و نەیهێنابێ یان هێنابێتی و زوو مردبێ؟ ئەگەر لە سەرەتای شیعرنووسینەوه ناوی حەبیبه زۆر هاتبێ ئەوا لەدوادواییدا ناوی نایەت بەتایبەتی لە چامە شارەزوورییەکەیدا پرسیاری هەموو شتێك دەکات کەچی هەواڵێك لە حەبیبه نییه! لەوانەشه لەبەرئەوه بووبێ کە حەبیبه شوویکردبێ! بەلاّم به کێ؟ نازانرێ؟

مامۆستا عەلادین سەجادی لە لاپەڕە (٢١٥)ی کتێبی (مێژووی ئەدەبی کوردی)دا دەڵێ: "کە لە قەرەداغ بووه حەبیبه ناوێك هەست و شعور لە نالی دەسێنێ و نالی دەخاتە مەیدانی ئەدەبیاتەوه و ئیلهامی شیعری پێدەبەخشێ، دەیکا به هاوسەری خۆی، بەلاّم وادەرناکەوێ کە حەبیبەی تادوایی ژیانی بۆ مابێتەوه..".

پێچەوانەی ئەمە بنەماڵەی مودڕیس لە لاپەڕە (٣٣)ی کتێبی (دیوانی نالی)دا نووسیویانه: "هەندێجار (حەبیبه)ی بەکارهێناوه و جاروباریش (مەحبوبه)، هەروەها لاشمواية چ (حبیبه)و چ (مەحبوبه) هیچ کامیان ناوی راستەقینەی یارەکەی نالی نین..".

مامۆستا محەممەدی مەلا کەریم لە لاپەڕە (٢٥)ی کتێبی (نالی لە کلاّوڕۆژنەی شیعرەکانیەوه) وایبۆدەچێ کە "بۆ ئەوەش دەستەدا بڵێین حەبیبەش و مەحبوبەش هەردووکیان کینایەبن لە یار و ناوی راستەقینەی یارەکەی شتێکیتر بووبێ، بەلاّم شتێکی ئەوتۆ لە شیعری نالییەوه دەرناکەوێ وابگەیەنێ ئەم حەبیبەیه یان ئەو مەحبووبەیەی هێنابێ..".

د. مارف خەزنەدار لە لاپەڕە (٤٥)ی كتێبی (مێژووی ئەدەبی كوردی)دا دەڵێ: "وادەگێڕنەوە گۆیا شاعیر لە قەرەداغ حەزی لە كەنیشكێك كردووە ناوی حەبیبە بووە، ئەم كیژە ناوی لە شیعری نالیدا هاتووە، بەڵام بەجۆرێك ناویهێناوەدەكرێ كیژێك بێ ناوی حەبیبە بێ، وەها دەكرێ وشەكە وەك وشەیەكی عەرەبی حەبیبە وەرگێڕانە كوردییەكەی خۆشەویست یا دلبەر بێو شاعیر بە خەیاڵ وەك بووكی شیعر دروستیكردبێ.."

كەچی د. مارف خەزنەدار لە كتێبی (دیوانی نالی)دا لە بەسەرهاتی نالیدا باسی حەبیبە ناكات و باسی ئەوەدەكات كە مەستوورەی نازەنین و جوانی خۆشویستووە.. كەچی نالی خۆی ناوی مەستوورەی وەكو خۆشەویست نەهێناوە.

دڵشاد عەبدوڵلاى شاعیر گوماندەكات كە تەنیا یەك حەبیبە لە ژیان نالیدا هەبێ؟ بەڵام حەبیبە تا دواساتەكانی تەمەنیش لە خولیا و خەونی شاعیردا نەچووەتەدەرەوە..!

ئەم قسەیە لەگەڵ ئەوقسەیەی مامۆستا عەلادیندا یەكدەگرێتەوە كە لە پەراوێزی لاپەڕە (٢١٧)ی مێژووی ئەدەبەكەیدا دەڵێ: "نالی لە تەكیەی قەرەداغیش دۆستێكیتری بووە ئایشەی ناوبووە..".. كەچی لەوەناچێ وەكو پێشتر ئاماژەمان بۆكرد كە حەبیبە تا دواساتەكانی تەمەنی نالی مابێتەوە!

**حەبیبە كوێندەرییە:**

یەكێ دەڵێ خەڵكی قەرەداغ بووە، یەكێكیتر دەڵێ خەڵكی تەكیە بووە، یەكێكیش دەڵێ خەڵكی ماڵێئاوا بووە.. قەرەداغ و تەكیە دیارن، بەڵام لە هەموو قەرەداغدا شوێنێ بەناوی ماڵێئاوا نییە؟ كەچی عەلی كەلۆەشی خاوەنی كتێبی (پریاسكە) بیری بۆئەوە چوو كە مەبەست لە ماڵێئاوا گوندی (ئاڵییاوا)ی سەر ڕێگای قەرەداغ - سلێمانی بێت!

كەسیش نازانێ ئەم حەبیبەیە - گەر ڕاستەقینە بێت - لە چ تیرە و بنەماڵەیەكە، ئایا حەبیبە كەسێكی دەركەوتوو بووە لەڕووی كۆمەڵایەتییەوە؟ ئایا خوێنەواربووە؟ ئایا كچی كەسایەتی و بنەماڵەیەكی دیاربووە؟ یان هەر كەسێكی ئاسایی بووە و جوانییەكەی كە خێل و قێچیش بووە سەرنجی نالی ڕاكێشاوە و خۆشیویستووە؟

هەرچییەك بێت ئەو شتانە هەر لە چوارچێوەی لێكدانەوەدا دەمێننەوە و بۆمان ڕووننابێتەوە!




**نالی و مەستوورە:**

چەندە نالی وەکو پیاوێك کەسێکی مەزن و دیارە لە شیعری کوردیدا و لە بنەماڵە و ئێلێکی گەورەیە، مەستوورەش وەکو ژنێك چ لە بواری مێژوو و چ لە بواری شیعردا ناوێکی دەرکەوتووە و لە بنەماڵەی ناوداری ئەردەلآنیشە، بەلآم هەرگیز لەڕووی داهێنان و هێزی شیعرییەوە لەگەڵ نالیدا بەراوردناکرێ.

لە قۆناغێکی ژیانی هەردووکیاندا، نالی قەسیدەیەکی پڕ لە داهێنانی بەسەر مەستوورەدا وتووە کە بە گەورەترین شیعری ئیرۆتیکی لە ئەدەبی کوردیدا دادەنرێ و مەستوورەش وەلآمێکی نالی دەداتەوە، بەلآم لەڕووی ناوەڕۆکەوە ناگاتە ئاستی شیعرەکەی نالی..

ئەم قەسیدەیە هەرای زۆری ناوەتەوە، بۆچوونی جۆراوجۆر لەسەر وتنەکەی وتراوە، هەیە دژی نالی وەستاوەتەوە و هەشە پشتیوانی لە نالی دەکات و بەداهێنانی لەقەڵەدەدەن:

د. مارف خەزنەدار لە کتێبی (مێژووی ئەدەبی کوردی)دا دەڵێ: "بۆ وەسفکردنی دیوی دەرەوە و دیمەنی دیاری ئەو ئەندامە، شاعیر ئیلهامی لە مەستوورە وەرگرتووە، جا لەبەرئەوەی: جوان بووە، یا کچی ئاغایەکی گەورە و ژنی والیی کوردستان بووە یا لەبەرئەوەی خوێندەوارێکی بەرز و شاعیرێکی چاکبووە؟.."

گیو موکریانیش دەڵێ: "یان بۆ خۆهەڵکێشان و خۆپەسەندی پەردەی ئابڕووی مەستوورەی دڕیوە؟"

سدیق بۆرەکەیش لە (دیوانی مەستوورەی کوردستانی)دا دەنووسێ: "لەبەرئەوەی بابانەکان و ئەردەلآنییەکان بەیەکەوە لە قڕە و کێشە و شەڕ و هەرادا بوون و جافەکانیش هەموو ساڵێك لەدەوروبەری سنەدا قشلآخ و ئێلآخیان دەکرد و دەبوونە هۆی رەنج و ئازاری خەڵك، ئەوەبوو ئەردەلآنییەکان لەهێرشێکدا چەند کەسێکیان لێیانکوشت و ئەمانە هەمووی بوونە هۆی

ئەوە کە نالی بۆ بەدناوکردنی ئەردەڵانییەکان و ئابڕووبردنی مەستوورە بە پارچە هەڵبەستێك پەلامارێکی زۆر ناشیرین و نارەوایانە بباتەسەر مەستوورە تا تۆڵەی هۆزەکەی لێبکاتەوە و بەمچەشنەخۆیشی بنوێنێ و مافی خۆی لە ئەو بستێنێ..".

سدیق بۆرەکەیی لە کتێبی (مێژووی وێژەی کوردی)دا قسەیەکیتریش دەکات: "مەستوورە کە بە یەکێ لە هۆنەرانی هەرەبەرزی دەوری خۆی دێتەئەژمار، وەکو دەگێڕنەوە لەگەڵ هۆنەرانی ئەو سەردەمەدا وەکو: نالی و یەغمای جوندەقیدا راز و نیازی هەڵبەستی بووە و نالی لە ئاخروئۆخری تەمەنیا پارچە هەڵبەستێکی توانجاوی سەبارەت بە مەستوورە هۆنیوەتەوە..".

بنەماڵەی مودەڕیسیش دەڵێن: "بۆ دەبێ وایدانەنێین کە نالی لە خۆڕایی ئەم پەلامارەی مەسنوورەی نەداوە؟ بۆ دەبێ مەستوورە لەپێشا گورزی خۆی نەوەشاندەبێ و نالیی بەرپلارنەدابێ یا هەرهیچ نەبێ لای ئەموئەو بە ناشاعیری ناوبردبێ و ئەمیش بەم قەسیدەیەی بەرگری لە خۆی نەکردبێ؟!).

بەڵام هێشتا ناتوانرێ بەدڵنیایی تەواوەوە ئەو بۆچوونانە وەربگیرێ، چونکە نە نالی ئاماژە بەوە دەکات بۆچی ئەو شیعرەی بە مەستوورەدا وتووە و نە مەستوورەش لەوەڵامدانەوەکەیدا ئەوەی دەرخستووە نە کەسیش لەنزیکەوە لەگەڵ ئەواندا ئەو بابەتەیان ورووژاندووە تاوەکو ئێمە لەوە بگەیشتینایە و ئەمە بەپەنهانی نەمایەتەوە بۆ هەتاهەتایە!

تائێستاش رایەکی یەکگرتوو و چەسپاو نییە لەسەر سەردەمی وتنی ئەو شیعرەی نالی: ئایا لەتافی لاوێتیدا وتوویەتی؟ ئایا مەستوورە ئەوکاتە شوویکردبوو؟ ئایا لەکاتی پیریدا وتوویەتی یان لەودەمەدا کە مەستوورە بێوەژن بووە؟

بنەماڵەی مودەڕیس لە کتێبی (دیوانی نالی)دا بۆیان ساغنەبووەتەوە کەی ئەم شیعرە وتراوە ئایا لەپێش یان لەپاش شووکردنی مەستوور بووە؟

مامۆستا محەممەد حەمە باقی لە کتێبی (ئەدەب و مێژوو)دا دەنووسێ: "لەبەرئەوە من دڵنیام ئەو قەسیدەیەی نالی، هی قۆناغی دوای شووکردنی مەستوورەیە.. کە بەگوێرەی ئەم مێژووە بێ، دەبێ کاتی نووسینی قەسیدەکەی نالی لەنێوان ساڵانی ١٨٢٨-١٨٣٤ز بێت".

د. ئیبراهیم ئەحمەد شوانی لە کتێبی (ئەدەبی کۆنی کوردی)دا دەڵێ: "بەڵکو زیاتر بۆئەوە دەچین کە ئەم شیعرەی لەدوای مردنی خەسرەو خانی ناکام گوتبێ و لەوکاتەدا ئەستێرەی مەستوورە بەرەو لێژی چووە".

لەهەردوو بارەکەدا چ لە لاویتی و چ لەدواتردا ئایا نالی و مەستوورە یەکیان بینیوە؟ گەر یەکیان بینیوە ئایا نالی چووەتە خوازبێنی مەستوورە؟ نە نالی و نە مەستوورەش لەشیعرەکانیاندا ئاماژە بەوە نادەن نالی چووبێتە داخوازی و مەستوورەش رەتیکردبێتەوە تەنانەت بە گێڕانەوەش هەرهیچی وا باسنەکراوە.. شتێکی واش نەبیستراوە کە نالی مەستوورەی خۆشویستبێ و ئەو شیعرەی بۆ وتبێ هەروەکو د. مارف خەزنەدار لە کتێبی (دیوانی نالی)دا دەنووسێ: "مەستوورەی نازەنین و جوانی خۆشویستووە، هونەروەرترین شیعری وەسفی لەشولاری بۆ گوتووە و قەسیدەکەی لە جوانترین شیعری عالەمی کراوەی (ئیرۆتیکی) حسێبدەکرێ".

لەسەر شوێنی وتنی شیعرەکەش زانیارییەکی ئەوتۆ نییە؟ بنەماڵەی مودەڕیس لە کتێبی (دیوانی نالی)دا باسی ئەوە دەکەن کەوا (نالی لە سنە لە مزگەوتی دارولئیحسان خوێندوویەتی و ئەو رۆژەی ئەم قەسیدەیەی تەواوکردووە بۆ شەو سنەی بەجێهێشتووە و بەرەو عێراق گەڕاوەتەوە)..

بەلاّم ناوەڕۆکی شیعرەکەی نالی کە ئاماژە بەوەدەکەن کە ئەم شیعرە دوای شووکردنی مەستوورە و مردنی خوسرەو خان بووبێ هەروەکو د. ئیبراهیم ئەحمەد شوان دەڵێ: "دوورنییە نالی کە بینیویەتی مەستوورەی بێوەژن هەندە بەقەدرە لای خەڵکی و ئافرەتێکی جوانە خوازبێنیکردبێ و ئەویش رەزامەندی دەرنەبڕیبێ و لە تۆڵەی ئەمە ئەم شیعرەی پێداهەڵگوتبێ). مەستوورە ساڵی ١٨٤٤- ١٨٤٥ هاتووەتە سلێمانی، ئەو دەمە نالی لە سلێمانی نەمابوو، چونکە بەپێی قسەی مامۆستا مەسعود محەمەد بێ نالی بەر لە کۆتاییهاتنی حاکمییەتی بابان دەرچووبێ.. دواتر دەڵێ: "کەواتە، بەپێی لێکدانەوەی من کە داخوازی حاڵێش وا رادەگەیەنێ، نالی لەنێوان ساڵی ١٢٥٤ کە مەرگی سلێمان پاشای تێدابووە و ساڵی ١٢٦١ کە حوکمی بابان بەسەرچووە، رۆیشتووە بۆ حەج".

دوابیش هەر ناتوانرێ قسەی بنبجڕ و یەکلاکەرەوە لەمبارەیەوە بوترێت و بگرە هەر بەگرێکوێرەیی دەمێنێتەوە تا شتی تازەتر دەدۆزرێتەوە!

### هەردوو چامەکەی نالی و سالم:

نالی چامەیەکی لە شێوەی نامەدا نووسیوە کە بە چامەی شارەزووری ناسراوە، وادیارە ئەم چامەیەی لەئاوارەییدا نووسیوە، هێشتا نازانرێ ئایا ئەوکاتەی ئەو ئەم چامەیەی نووسیوە

ئیمارەتی بابان ماوە یان بەیەکجاری نەماوە؟ لەشیعرەکەدا دەردەکەوێ نالی ئاگاداری بارودۆخی سیاسی ئیمارەتی بابان و ئەو رۆژگارە نوێیەی سلێمانی تێکەوتووە، بووە.. ئەو بیری کوردستان دەکات و پرسیار لە داروبەردی دەکات، لە وەڵامەکەی سالمدا ئەوە دەردەکەوێ کە ئیمارەتی بابان لەناوچووە.

**بۆیە لەمەڕ ئەم چامەیە قسەی زۆر کراوە لەبارەی:**

- ساڵی ناردنی چامەکە: هێشتا بەوردی نازانرێ چ ساڵێك ئەم چامەیە لەلایەن نالییەوە نێردراوە و بۆچوونی جیاواز باسکراوە.. مامۆستا عەلادین سەجادی لە کتێبی (مێژووی ئەدەبی کوردی)دا دەڵێ لە ساڵی ١٨٣٤دا نالی نامەکەی لە شامەوە ناردووە، بنەماڵەی مودەڕیسیش ساڵی ١٨٥١ بە ساڵی ناردنی چامەکە دادەنێن، بەڵام مامۆستا مەسعود محەمەد لە کتێبی (چەپکێك لە گوڵزاری نالی)دا بەپشتبەستن بەو وتارەی خۆدزکۆ کە دەڵێ ئەحمەد خان لە پاریس ساڵی ١٨٥٣ پێیڕاگەیاندووە کە نالی لە شام دەژێت، پێیوایە نالی لەم ساڵەدا چامەکەی بۆ سالم نووسیوە.
- شوێنی ناردنی چامەکە: زۆربەی بۆچوونەکان بۆئەوە دەچن کە ئەو چامەیە لە وڵاتی شامەوە نێردرابێ.. مامۆستایان عەلادین سەجادی و مەسعود محەمەد و د. مارف خەزنەدار و بنەماڵەی مودەڕیس و هیتریش، تەئکید لەوە دەکەنەوە بە ئاماژەی ئەو دێڕەی لە چامە وەڵامەکەی سالمدا هاتووە:

**بۆ موڵکی شامە نامەیی من، سوویی نالییە**

**هەر حەرفی ئەو لە وەزعی ویلایەت دەدا خەبەر**

کەسانێکیتریش رایانوایە کە نالی ئەو چامەیەی لە شامەوە نەناردووە..

**ئاراستەکردنی چامەکە:**

بە وردبوونەوە لە چامەکە وا دەرناکەوێ نالی چامەکەی بۆ کەسێکی دیاریکراو نووسیبێ.. ئەو نە لە سەرەتای چامەکەدا سالمی دواندووە و نە لەکۆتاییەکەیدا باسیکردووە، بەڵام مامۆستایان عەلادین سەجادی و مەسعود محەمەد لەو باوەڕەدان کە نالی چامەکەی بۆ سالمی شاعیر نووسیبێ و ئەویش وەڵامیداوەتەوە.

سالمیش خۆی لەم دێڕەدا کە دەڵێ:

**پرسیویه زاهیرەن له رەفیقانی یەک جیهەت**

**ئەحواڵی ئەهلی شەهر و رەفیقانی سەربەسەر**

ئەوە دەردەخات کە نالی چامەکەی بۆ ئەو نەنووسیوە چونکە دەڵێ (پرسیویه)، ئەگەر نالی راستەوخۆ بۆ ئەوی بنووسیبایە دەبوایە سالم بیوتایە (پرسیوتە).

**بەچ کەسێکدا چامەکە نێردراوە؟:**

کەس نازانێ ئەم چامەیە بە چ کەسێکدا لەلایەن نالییەوە نێردراوە بۆ سالم تا سالم وەڵامیبداتەوە.. دیارە خەڵکانێك هەبوون هاتووچۆیان کردووە چ لە شامەوە یان لە ئەستەمبووڵەوە بۆ کوردستان و بە تایبەتی بۆ سلێمانیش، چونکە خەڵکانی سەر تەریقەتی نەقشبەندی و موریدانی مەولانا خالید هاتووچۆیان کردووە، هەروەکو چۆن خەڵکی لە ئەستەمبووڵەوە بۆ سلێمانی گەڕاونەتەوە و بەپێچەوانەوە. دەبێ بە یەکێك لەو خەڵکانەدا نێردرابێتەوە و دەست سالمی شاعیر کەوتبێ و وەڵامیدابێتەوە.

**سالم بۆ وەڵامیداوەتەوە؟:**

سالم بە کۆمەڵێك هۆکار، بەهەمان ریتمی نالی، وەڵامی چامەکەی نالی داوەتەوە:

+ سالم خزمی نالی بووە.
+ هاوڕێی نزیکی یەکتری بوون.
+ وەکو شاعیرێك شایەتحاڵێکی ئاگاداری رووخانی ئیمارەتی بابان بووە.
+ لەوانەیە یەکەم کەسێك بووبێ لە شاعیرانی ئەو سەردەمە چامەکەی دەستکەوتبێ و پەرۆشی وەڵامدانەوەی بووە.

**ئایا وەڵامەکەی سالم گەیشتووەتەوە نالی؟:**

هیچ زانیارییەك نییە و هیچ سەرچاوەیەکیش باسی ئەوەی نەکردووە کە وەڵامەکەی سالم

گەیشتبێتە نالی، جگەلەوەی ئەگەر سالم وەلاَمەکەی بۆ نالی ناردبیٚ، نازانریٚ بە چ کەسێکدا ناردوویەتی؟ ئەگەریش گەیشتبێتە دەستی هەلۆیستی نالی لەمەرِ وەلاَمەکە نازانریٚ چیبووە؟ ئەمە جکەلەوەی نازانریٚ چکاتیٚ وەلاَمەکە نووسراوەتەوە؟

**تێکەڵوپێکەڵکردنی شیعری نالی و شاعیرانیتر:**

لە ئەنجامی پەلەپەلکردن و سەرپێی تێگەیشتن لە شاعیران و شیعرەکانیان، تێکەڵوپێکەڵکەلێیەك لە دانەپاڵی شیعرێك بۆ شاعیرێك پەیدابووە، بە تایبەتی لە نێوان شیعری نالی و کوردی و سالمدا ئەمە روویداوە.. لەوانەشە ئەمە بۆ نزیکی لە دارِشتن و هاوسەردەمی ئەو شاعیرانە و سەر بە یەك قوتابخانەی شیعری بگەرِێتەوە کە قوتابخانەی شیعری کلاسیکی کوردی باشووری کوردستان بووە کە ئەم سیٚ شاعیرە وەکو سێکوچکەیەك دامەزرێنەریبوون و لە سەردەمی ئیمارەتی باباندا بووە.

**هێشتا رووننەبووەتەوە ئەم شیعرە هی نالییە یان هی کوردییە:**

**رەفیقان! من ئەوا رۆییم لەلاتان**
**لە مەزڵومان بلاَ چۆڵبیٚ ولاَتان**

یان ئەم شیعرە جاریٚ دەدرێتەپاڵ سالم و جایٚ دەوتریٚ هی نالییە و لە دیوانی نالی بنەماڵەی مودەرِیسیشدا نییە:

**بەدا ئەحوالی ئەشخاسیٚ کە خاسەی مولکی بابانن**
**لە بێدادی فەلەك هەریەك سەراسیمە و هەراسانن**

نەوشیروان مستەفا لە کتێبی (بەدەم رێگاوە گوڵچنین) لە باسی سالمدا ئەم شیعرە دەداتەپاڵ سالم.. مامۆستا محەممەد عەلی قەرەداغی ئەم شیعرە بۆ دەستنووسێك دەگەرِێنێتەوە کە لە کۆتایی شیعرەکەدا نووسراوە (تمت شد از گفتەء نالی در طهران انشا کردەاست).. بەپێی ئەو

زانیارییانەی تائێستا بلاّوبووەتەوە نالی چووەتە سنە و شام و حیجاز و ئەستەمبووڵ و کەس باسی ئەوەی نەکردووە نالی چووبێتە تاران و خۆیشی لە شیعرەکانیدا شتی واینەوتووە، بەپێچەوانەوە هەموو سەرچاوەکان لەوە دواون کە سالم چووەتە تاران و لەشیعرەکانیشیدا ئەوەی باسکردووە:

**لەگەڵ دڵ شەرتە سالم گەر نەجاتمبێ لە تارانا**

**بەهەشت ئەربێتە دەشتی رەی بە ئێرانا گوزەر ناکەم**

دەبێ کەی بێت ئەم ئالۆزییانە لە شیعری شاعیرەکاندا یەکلابکرێتەوە و لە شوێنی خۆیاندا دابنرێنەوە؟!

مامۆستا محەمەدی مەلا کەریم لە کۆتایی کتێبی (نالی لە کلاّورۆژنەی شیعرەکانیەوە)دا ئەم شیعرەی داوەتەپاڵ نالی:

**فی دڵی شەوقون ئیلا دیداریهی**

**ئین ئەگوم رۆژەن ئەپید فی داریهی**

**شەربەتون مین مائی خزرین بیهتەرون**

**بۆسەتون مین لەعلی شەککەرباریهی**

**شیتتو سالاّتین خراپەلئارەزوو**

**غونچەتەن ما چیتتو مین گولزاریهی**

کەچی مامۆستا محەمەد عەلی قەرەداغی دەڵێ ئەم شیعرە ١١ دێڕە و هی قانیع ناوێکە کە زۆر پێش نالی ئەو شیعرانەی وتووە.

هێشتاش لەوانەیە زۆر شیعریتر چ هی نالی تێکەڵ بە دیوانی شاعیرانیتر بووە یان شیعری شاعیرانیتر هاتووەتە ناو دیوانی نالییەوە کە پێویستدەکات بژاربکرێن و هەر شیعرە بدرێتەوە بە خاوەنەکەی خۆی.

**نالی و مەولانا:**

نالی و حەزرەتی مەولانا خالید نەك هەردووکیان جاف و لە تیرەی ئالێبەگی میکایەلێن، بەڵکو لەوانەیە خزمی نزیکی یەکتریش بوون، هەروەها هاوسەردەم و هاوتەمەنی یەکتریش بوون. نالی مەلا بووە و بە هەورازی شیعر و شاعیرێتیدا هەڵزنا و مەلایەتی نەکردە پیشە، مەولاناش سەرەڕای مەلایەتی ڕێچکەی سۆفیگەرێتی گرتەبەر و لە جیهانی شیعریشدا جێپەنجەی دیاری هەیە، بەلاّم چەندە نالی لە لووتکەی شیعر و شاعیریدا بالاّبڵندە، مەولاناش لە سۆفیگەریدا داهێنەر و نوێکەرەوەی تەریقەت بووە، ئەوەی دەزانرێ مەولانا لە سلێمانی خانەقایەکی دامەزراندووە و نالی لەو خانەقایەدا خوێندوویەتی و تیانیشتەجێبووە.

مەولانا لەدایکبووی ساڵی ١٧٧٩و نالیش لەدایکبووی یەکێ لەم ساڵانەیە: ١٧٩٧، ١٨٠٠، ١٨٠٥، مەولانا لە ساڵی ١٨٢٨ کۆچیدواییکردووە و نالیش لە یەکێ لەم ساڵانەدا: ١٨٥٥، ١٨٥٦، ١٨٧٣ کۆچیدواییکردووە.

کەچی لە هەڵسوکەوتەکانی ژیانی نالی و تەنانەت لە شیعرەکانیدا هیچ ئاماژەیەك نییە بۆ هیچ جۆرە پەیوەندییەك لەگەڵ حەزرەتی مەولانا خالیددا کە ئەو سەردەمە مەولانا ڕابەرایەتی تەریقەتی نەقشبەندی کردووە و جێگە و پێگەی بەهێزی دروستکردووە نەك هەر لەکوردستاندا بەڵکو لە شوێنەکانیتریش لایەنگر و موریدی هەبووە یان مەولانا ڕووبەڕووی کێشمەکێشێکی تووند بووەتەوە لەگەڵ نەیارەکانیدا، بەلاّم نالی لەمەشدا بەتەنیا دیرێك بەلای ئەو بابەتەدا نەچووە کە ڕووداو یان شتێکی ڕاگوزەر و سەرپێی نەبووە هەروا بەسانایی تێبپەڕێ! هەروەکو کاکە حەمەی مەلا کەریم لە کتێبی (لە کلاّوڕۆژنەی شیعرەکانیەوە)دا ئاماژە بەوە دەکات نالی نە بە چاکە و نە خراپە ناوێکی مەولانا ناهێنێ و هەڵوێستی خۆی لەو کێشە گەورەیەی ئەو سەردەمە بەهیچ کلۆجێ دەرنابڕێ.. کەچی نالی وەکو دەردەکەوێ دوای ڕۆیشتنی مەولانا، لە خانەقادا بووە.. نالی لە چامەی (قوربانی تۆزی ڕێگەتم..)دا وەکو دەڵێن لە شام نووسیویەتی، ١١ بەیتی بۆ باسکردن و وەسفی خانەقای مەولانا تەرخانکردووە، ئەو هەر ناوی خانەقا دێنێ:

**سەیرێکی خۆش لە چیمەنی ناو (خانەقا) بکە**

**ئایا ڕەبیعی ئاهووە یان چایری ستوور؟!**

لەناو خانەقاشدا پرسیاری حوجرەکەی خۆی دەکات:

**واسیلبکە عەبیری سەلامم بە حوجرەکەم**

**چیی ماوە؟ چیی نەماوە؟ لە هەیوان و تاق و ژوور**

لە هەموو ئەو شیعرانەدا ناوی مەولانا خالیدی نەهێناوە؟ تەنانەت لە شامیش هیچ نیشانەیەك نییە نە لە شیعری نالی خۆیدا و نە لە گێڕانەوەی خەڵکانیتری دەوروبەری مەولانا یان تەنانەت بنەماڵەکەی خۆیشی کەوا نالی مەولانای دیبێ یان جۆرە پەیوەندییەکیان هەبووبێ؟! وەکو باسیشدەکرێ نالی لە شام بووە و ئەو چامەیەی لەوێوە نووسیوە و ئەوەی جێگەی سەرسووڕمانە نالی هەم خزمی مەولانا بووە و هەم ماوەیەك لە خانەقاکەی ئەودا ماوەتەوە و لە شامەوە پرسیاری خانەقا بکات کەچی لە شام نەتوانێ یان نەیەوێ بگاتەلای مەولانا و دەردەدڵی ئاوارەیی و خەمەکانی خۆی بۆ هەڵبڕێژێ! بۆیە ئەوەی م. جەعفەر دەیڵێ: (پێموایە نالی وەکو زۆربەی ئەوانەی دوای تەپوتۆزی کاروانی مەولانا خالید و یارانی، بەرەو شام ڕۆیشتووە و لەوێ گیرساوەتەوە..) هەر لە خانەی پێموایەدا دەمێنێتەوە و بەڵگەی ئەوە بەدەستەوە نییە کە نالی موریدی مەولانا بووبێت و شوێنی کەوتبێت.. هەرهیچ نەبێت شیعرێکی لەسەر هۆکاری ڕۆیشتن و سەرهەڵگرتنی مەولانا و خۆیشی وەکو موریدێك یان پشتیوایکەرێك یان خزمێکی دەوت! دیسانەوە ڕۆیشتنی نالی بۆ شام زۆر ڕووننییە کەی بووە؟ بەڵام ڕوونبووەتەوە ئەوەیە کە نالی ساڵی ١٨٥٣ بەپێی قسەی خۆدزکۆ لە شام بووە.

تائێستاش ناتوانرێ ئەو گرێیە بکرێتەوە بۆچی نالی نەبووەتە لایەنگری مەولانا؟ بۆ تەنیا قسەیەکی لەو بگرەوبەردەیەی نێوان مەولانا و نەیارەکانیدا نەکردووە؟ ئەگەرچی م. جەعفەر باس لەوە دەکات کە نالی لە کتێبی (مناظر الانشاء)دا شیعری مەولانای بە نموونە هێناوەتەوە و ناوی بەگەورەیی باسدەکات (مولانا خالد نقشبندی سليمانی در اين غزل فرمودەاند)، بەڵام دیسانەوە ئەمە ئەو گرێکوێرەیەی پەیوەندی نێوان نالی و مەولانا ناکاتەوە؟

**نالی و ئاوارەیی:**

- بۆچی نالی ئاوارەبوو:
- ئایا نالی لە ژیانی ناو کوردستان بێزاربووە؟
- ئایا کێشەی کۆمەڵایەتی هەبووە و بۆ خۆپاراستن لە رووبەڕبوونەوەی گرفتەکان دوورکەوتووەتەوە؟
- ئایا ناوەندی رووناکبیری ئەوکاتە خامۆشبووە و ئەو ناچاربووە بۆ خۆدۆزینەوە وڵات بەجێبهێڵێ و بچێتە ئەو شارانەی کە ناوەندی رووناکبیری پڕ جۆشوخرۆشتری ئەو سەردەمە بوون وەکو شام یان ئەستەمبووڵ؟
- ئایا ناکۆکی و ناتەبایی لەگەڵ پیاوانی ئایینی ئەو سەردەمەدا هەبووە کە ئەو بە زۆری هێرشیکردووەتەسەر وشکەسۆفییەکان و ئەمەشە بووەتە مایەی هەڕەشەلێکردن و رێگای ئاوارەیی هەڵبژاردووە.
- ئایا لە داخی ناکۆکییەکانی ناو دەسەڵاتدارێتی بابانییەکان رۆیشتووە.
- بەهۆی نەدانی حەبیبە یان مردنیەوە (گەر حەبیبە وەکو کەسێکی بەرجەستە لەژیانیدا هەبووبێ) سەری خۆی هەڵدەگرێ.
- یان بە ململانێ و بگرەوبەردەی نێوان نەقشی و قادرییەوە تێوەگلاوە و نالی کە خزمی مەولانا بووە ناچاربووە کوردستان بەجێبهێڵێ وەکو م. جەعفەر لە وتاری (مەولانا خالید و نالی)دا دەڵێ: (من پێموایە نالی وەکو زۆربەی ئەوانەی دوای تەپوتۆزی کاروانی مەولانا خالید و یارانی بەرەو شام رۆیشتووە و لەوێ گیرساوەتەوە..)؟

تائێستا بەتەواوی هۆکاری سەرەکی ئەم ئاوارەییەی نالی نازانرێ و هەر لە چوارچێوەی تەوەقوعاتدا دەمێنێتەوە چونکە دیکۆمێنت لەبەردەستدا نییە ئەوە بسەلمێنێ!

هەروەکو هۆکارەکانی ئاوارەبوونی رووننییە، ئەوا بەتەواوەتی ناشزانرێ کەی و چکاتێ رۆیشتووە؟ سەرەتا چووەتە کوێ؟ لەمەشدا قسەی جیاواز دەکرێ:

- هەیە دەڵێ هێشتا میرنشینی بابان مابوو کە نالی روویکردە تاراوگە.
- هەشە دەڵێ چووە بۆ حەج و لە گەڕانەوەیدا لە شام لایداوە و دواتریش چووەتە ئەستەمبووڵ.

– کەچی هەندێك دەڵێن دوای تێکچوونی میرنشینی بابان وەکو پرۆتستۆیەك بەرامبەر تێکچوونی بارودۆخی سیاسی و داگیرکردنی کوردستان لەلایەن تورکەوە سەری خۆی هەڵگرتووە.. ئەگەر نالی لە داخی سیاسەتی چەوتی دەوڵەتی عوسمانی رۆیشتبێ ئەی بۆچی روویکردووەتە پایتەختی ئەو دەوڵەتە؟

– قسەیەك هەیە کە نالی چووبێتە تاران، بەڵام نازانرێ بۆچی چووە و کەی چووە و چەند ماوەتەوە و لای کێ بووە و کەی لەوێ دەرچووە و لەوێوە روویکردووەتە کوێ؟

– قسەیەکیش هەیە کە نالی نیازی چوونە ولاتی میسری هەبووبێ، ئەویش نازانرێ لەکوێوە چووە؟

ئەوەی مایەی نیگەرانییە ئەوەیە کە نەتوانراوە بەوردی و لەکاتی خۆیدا بەدواداچوون بۆئەوە بکرێ و ژیانی شاعیرێکی وەکو نالی کە کاریگەرێتی هەبووە و جێپەنجەی چ لە ناوەندی روناکبیری و چ لە گۆڕەپانی پەیوەندی لەگەڵ دەسەلاتدارێتی بابانەکانەوە و چ لە بواری ئایینیدا دیاربووە ئاوا بە ئالۆزی و پڕ لە کێشمەکێش نەمێنێتەوە؟

**نالی و تەریقەت:**

یەکێك دەڵێ نالی قادری بووە

یەکێك دەڵێ نالی نەقشی بووە

مامۆستا مەسعود محەممەد لە لاپەڕە (٤٣)ی کتێبی (چەپکێك لە گولزاری نالی)دا دەڵێ کە (مەشرەبی نالی لە نەسەوفدا قادری بووە نەك نەقشبەندی، لەئاست ئەم بیروڕایەدا دەبێ فەرامۆشی نەکەین نالی لە تەکیەی مەولانا خالید خوێندوویەتی و کە دەزانین مەولانا سەرۆکی تەریقەتی نەقشبەندی بووە لە سەردەمی خۆیدا..).

بەمپێیەبێ نالی چۆن توانیویەتی مەشرەب قادری بێت و لە خانەقای مەولاناشدا نیشتەجێبێت؟ کە ئەو سەردەمە کەفوکولی ناکۆکی و ململانێی نێوان قادری و نەقشبەندی لەئاستێکی توندوتۆڵدا بووە و تازە مەولانا بەو هۆیەوە ناچار نیشتمانی بەجێهێشت و ئاوارە و رەهەندەی ولاتانی دەوروبەر بووە.

لە شیعرەکانیشیدا هیچ شتێك بەدیناکرێ .. کاتێك تەماشای چامە شارەزوورییەکی دەکەین ئەوا نە ناوی مەولانا خالید هێنراوە و نە ناوی تەریقەتی نەقشبەندی، کەچی وەکو دەزانین ئەو لە یەکێك لە حوجرەکانی خانەقادا نیشتەجێبووە، هەرچەندە بوونی نالی لە خانەقای مەولانادا بەڵگەی نەقشیبوونی نییە، چونکە لەوکاتەدا کە لە خانەقادا بووە دەیان شیعری توندی لەسەر سۆفی بڵاوکردووەتەوە و هێرشی کردووەتەسەریان، دیارە دژی هەموو سۆفییەك نەبووە، چونکە وەکو لە شیعرێکیدا دەردەکەوێ باسی نووری روودباری کردووە کە سۆفی نەقشبەندی بووە، هەروەها ناوهێنانی دوو بنەماڵەی قادریش نایکاتە دەروێشێکی سەر بە تەریقەتی قادری.. لەوەش دەچێ ئەو لە مەسەلەی ململانێیەکانی ئەو دوو تەریقەتە خۆی بەدوورگرتبێت و بگرە هەروەکو محەممەدی مەلا کەریم لە کتێبی (نالی لە کلاوڕۆژنەی شیعرەکانیەوە) دەڵێ: (بە یەکچاو سەیری هەموو تەریقەتەکانی کردووە و هەڵوێستێکی تایبەتی بەرابەر بەهیچ کامیان نەبووە و بەشایانی ئەوەی نەزانیوە بەتایبەتی بچێتە کۆڕی خەباتەوە لە دژی هیچ کامێکیان و لەوە زیاتری پێڕەوانەبینیون کە بە رەخنەیەکی گشتی دووریی خۆی لە هەموویان دەربڕێ).

هەروەها هیچ ئاماژەیەك بەدیناکرێ کە نالی بە تەریقەتی نەقشبەندییەوە پابەندبووبێت، ئەگەرچی هەندێك وایبۆدەچن کە نالی یەکێك بووبێ لە پشتیوانەکانی مەولانا نەك وەك وشکە سۆفییەك، بەڵام بەڵگە بەدەستەوە نییە، هەرچەندە باسی ئەوەش دەکرێ کە نالی بە گەورەیی ناوی مەولانای هێنابێ لە کتێبی (مناظر الانشاء)دا.

**نالی و بەرهەم:**

نالی بەو شیعرانەی لەدیوانەکەیدا بڵاوکراەتەوە ناسراوە و لەوانەیە بەرهەمی زۆرتری هەبووبێ نەگەیشتبێتە دەستمان یان لەناوچووبن، لەگەڵ ئەوەشدا هیچ شاعیرێك ئەوەندەی نالی بەختەوەر نەبووە لەڕووی بڵاوکردنەوەی لێکۆڵینەوە و کتێب و بابەت لەسەرنووسین لەبارەیەوە، تەنانەت دیوانەکەی چەندینجار بە چاپی جیاواز بڵاوکراوەتەوە.. تائێستاش ناوەناوە لەئەنجامی گەڕان و پشکنین بەناو ئەرشیفی کتێبخانەی وڵاتاندا یان لای کەسایەتییەکان لە دەستنووس و بەیازەکاندا شیعری نالی دەدۆزرێتەوە و بڵاودەکرێتەوە.

ئەوەی جێی داخە ئەو شیعرانەی دەدۆزرێنەوە ناخرێنەناو دیوانەکەیەوە، بگرە دیوانی نالییەکەی بنەماڵەی مودەڕیس دوای ئەو هەموو ساڵەی کە بەسەر چاپی یەکەمیدا تێپەڕیوە و

چەندجارینریش بلاوکراوەتەوە وەکو هەندێك نووسەر ئاماژەیان بۆ کردووە، هیچ پارچە شیعرێکی تەنانەت ئەوانەشی کاکە حەمەی مەلا کەریم خۆی پەیدایکردوون نەخراوەتە ئەو دیوانەوە.

جگەلەمە ئەوەی تائێستا وەکو بەرهەمی شیعری نالی لەدیواندا یان لەبلاوکراوەکاندا بلاوبووەتەوە لەوە کەمترە کە شاعیرێکی گەورەی وەکو نالی ولاتان گەڕاوە و ناوەند و کۆڕە ئەدەبییەکانی دیتووە و لەگەڵ کەسایەتییە دیارەکانی بواری رووناکبیریدا پەیوەندی هەبووە هەر ئەوەندە شتی لێبەجێمابێت، بۆیە بۆچوونەکان بۆئەوە دەچێت کە نالی بەرهەمی شیعری زۆری لەناوچووبێ چ ئەو کاتانەی لە کوردستان بووە یان کە چووەتە حیجاز و شام و ئەستەمبووڵ. مامۆستا عەلادین سەجادی گومانی ئەوە دەکات نالی لەو ئاوارەییەی ئەستەمبووڵیدا دیوانێکی گەلێ بەرزتری لێبەجێمابێت و کەوتبێتە لای بەرەی ئەحمەد پاشا.

تەنانەت لەدیوانەکەیدا شیعری شاعیرانیتری تێکەڵبووە یان شیعری نالی چووەتە دیوانی شاعیرانیترەوە، ئەمانە هێشتا ساغنەبوونەتەوە و نووسەران تەنیا بە (قەرینە) ئەوە ساغدەکەنەوە کە ئەمە بەسنییە بۆ ناسینەوەی شیعری شاعیرێك بەتایبەتی نالی.

ئەوەیشی زانراوە پێش ئێستا نالی هەروەکو شاعیرێك ناسراوە و گەر باسی نووسینیتری نالی کرابێ وەکو ئەوەی خۆدزکۆ لە زمانی ئەحمەد پاشای بابانەوە لەبارەی نالییەوە دەڵێ کە نالی ئەفەندی بەهرە و توانای خۆی وەکو پسپۆڕێکی شارەزا بۆ دیراسەکردنی دیالیکتەکانی کوردستانی نیشتمانەکەی تەرخانکردووە، هەروا لەمەوبەر کتێبێکی قەواعیدی زمانی عەرەبی بۆ کوردی تەرجەمەکردووە، ئەوا تائێستا ئەو شتانەی بەردەستنەبوون، بەلام لەم دواییانەدا لە کتێبخانەکانی تورکیادا کتێبی (مناظر الانشاء)ی دۆزرایەوە کە بایەخی مێژوویی خۆی هەیە و زۆر شت لەبارەی نالی و ژیانیەوە روونده‌بێتەوە.

دەبێ کەی بێت هەوڵەکان بگاتە ئەو ئاکامەی کە پسپۆڕان تەرخانبکرێن بۆ گەڕان و کنە و پشکنین لەهەموو کون و قوژبنێکی کوردستان و هەموو کتێبخانەکانی ولاتانی عێراق و تورکیا و ئێران و سوریا و سعودییە و تەنانەت هەندێ ولاتی ئەوروپی وەکو روسیا و ئەڵمانیا و فەرەنسا و بریتانیا و هیتریش کە کاتی خۆی گەڕیدە و رۆژهەلاتناسان زۆر شتیان کۆکردووەتەوە و لەگەڵ خۆیاندا بردوویانەتەوە بۆ ولاتەکانیان.. تا گرێکوێرەکانمان لەبارەی بەرهەمەکانیی نالی و شاعیرانیتریشەوە بۆ بکرێتەوە؟!

**گۆڕی نالی:**

هەروەکو چۆن ژیانی نالی ناڕوونی زۆری تیایە، ئاواش مردنەکەی و تەنانەت گۆڕەکەشی قسە و باسی زۆری لەسەر کراوە و هەریەکە جۆرێك زانیاریدەدات: -- بنەماڵەی مودەڕیس لە کتێبی (دیوانی نالی)دا هیچ ئاماژەیەك بە شوێنی ناشتن و گۆڕی نالی ناکەن.

- د. مارف خەزنەداریش لە کتێبی (دیوانی نالی)دا دەڵێ: "شوێنی گۆڕی دیارنییە".

- ئەمین فەیزی بەگ لە کتێبی (ئەنجومەنی ئەدیبان)دا دەڵێ: "مەدفەنی موبارەکی ئەوەتا لە ئەسکودارە".

- مامۆستا عەلادین سەجادی لە کتێبی (مێژووی ئەدەبی کوردی)دا دەڵێ: "لە گۆڕستانی ئەبوئەیوبی ئەنساری دەنێژرێ".

- وەکو لە هەندێ سەرچاوەدا هاتووە، محەممەد تاهیر بورسەلی لە کتێبی (عثمانلی مؤلفلری) باسی ئەوە دەکات کە تەرمی نالی لە گۆڕستانی (قاراجا ئەحمەد) بەخاکسێردراوە.

تائێستا کەس نازانێ و هیچ زانیارییەك لەبەردەستدا نییە و هیچ شوێنەوارێك نابینرێتەوە وەکو بەڵگە بیسەلمێنێ لەکام یەکێك لەم شوێنانە نالی گەورە شاعیری ئاوارە بەخاکسپێردراوە؟ ئەوانەی سەرەوە تەنیا قسەی راگوزەرن.. ئەگینا ناکرێ یەك کەس لە چەندین شوێنی جیاجیا بنێژرێ؟

دەبێ کەی ئەم گرێکوێرەیە بکرێتەوە و گۆڕی نالی بدۆزرێتەوە و هەرهیچ نەبێ بهێنرێتەوە زید و نیشتمانی خۆی گڵکۆیەکی بەشکۆی بۆ دروستبکرێ؟!

●●●

**سەرچاوەکان**

- دیوانی نالی/ لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس و فاتیح عەبدولکەریم
- دیوانی نالی/ د. مارف خەزنەدار
- مێژووی ئەدەبی کوردی/ عەلادین سەجادی
- مێژووی ئەدەبی کوردی/ د. مارف خەزنەدار/ بەرگی سێیەم
- نالی لە کلاوڕژنەی شیعرەکانیەوە/ محەممەدی مەلا کەریم
- چەپکێك لە گولزاری نالی/ مەسعود محەممەد
- دیداری نالی/ ب.گ. رۆشنبیری و هونەر لە سلێمانی
- نالی لە دەرەوەی کوردستاندا/ د. عەبدوللا حەداد
- ئەدەب و مێژوو/ محەممەد حەمە باقی
- ئەدەبی کۆنی کوردی/ د. ئیبراهیم ئەحمەد شوان
- خەیال و رۆح/ کۆمەڵێ نووسەر
- مێژووی وێژەی کوردی/ سدیق بۆرەکەیی/ ب٢
- دیوانی مەستوورەی کوردستانی/ سدیق بۆرەکەیی
- بەدەم رێگاوە گولچنین/ نەوشیروان مستەفا ئەمین/ کتێبی یەکەم
- بیرئانینی مەستتورەی ئەردەلانی/ وتارەکانی فیستیڤالی مەستوورە.

# روانینێکی خوار و خێچ بۆ نالی

مەسعوود بینەندە

لە ڕەوتی مێژوویی پێکهاتنی شوناسی (کوردی)دا، سووژە یان ئەو چوارچێوە بۆشە کە ناوەندی دەنگەهەڵبڕین و دەرکەوتنی جیاوازییە کان لە هەمبەر پێکهاتە ڕێسامەند و تەواوگرەکاندایە، لەئاکامی بڕیاری جیابوونەوە (separation)ی سووژە لە گوتارەکانی ئەویدیی مەزن (big other) هاتووەتەئاراوە.

ئەم سووژەیە ناوەڕۆکێکی ئەرێنی و ئیجابیی نییە بەڵکو نەفی و نەلێکردنێکە کە لە هەناوی گوتاری ئەویدیی مەزنەوە ڕوودەدات و لەنێو کەلێن و ناکۆکییەکانیدا بونیادی خۆی دادەمەزرێنێ. فۆرم و پێکهاتەی ئەم سووژەیە زمان (بەواتای گشتی)ە، کەوایە ڕێگایەکی شیاو بۆ تۆپۆلۆژی و کردارناسیی ئەم سووژەیە لێکۆڵینەوە لەسەر زمان و شوێنگرتنی ڕووداوە زمانییەکان لە بەستێنی ئەدەبی و هزریدایە. یەکێ لە گرنگترین ڕووداوە زمانییەکان کە چوارچێوەیەکی بنەڕەتیی بۆ پێکهاتنی سووژەی کوردی ڕەخساندووە، بەرهەمی ئەدەبیی "مەم و زین"ی خانییە (١٦٥٠-١٧٠٦) کە وەکو یەکێ لە سەرچاوە مەزنەکانی ئەدەبی کوردی و ڕۆژهەڵاتی ناوین ناودێردەکرێت. لەم بەرهەمەدا پرۆبلماتیکی گوتاری زاڵی سەردەم کە گوتاری سونەتی و تیۆری سیاسی خەلافەتی یەکگرتووی ئیسلامی بوو، نەفیدەبێتەوە و لەوێوە ڕێگا بۆ پێکهاتنی شوناسی کوردی دەکرێتەوە. دۆخی مێژوویی پێکهاتنی ئەم پرۆبلماتیکە ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ دیاردەی ڕۆژئاوا و گوتاری سەرەکیی ئەو دیاردەیە واتە ڕۆژهەڵاتناسی بوو. لێرەدا مەبەست لە ڕۆژهەڵاتناسی تەواوی ئەو دەسەڵاتە سیاسی و فەرهەنگی و تێکنۆلۆژییانەن کە لەوێدا ڕۆژئاوا وەکو دەسەڵات/ گوتارێکی هاوبەش ڕوو بەڕووی مرۆڤی ڕۆژهەڵاتی دەبێتەوە و بەپێی پێوەرەکانی خۆی ڕوانین و پێناسەیەکی تایبەت لەسەر ئەم مرۆڤە بەرهەمدێنێت. کورد لە ئیماژی بەرهەمهاتووی ئاوێنەی گوتاری ڕۆژهەڵاتناسیدا، ناکۆکی و دژوازییەکانی شوناسی خۆی دەبینێتەوە و لەوێوە تووشی شڵەژانی ئیپیستمۆلۆژیك و ناکۆکیی زەینی و سوبژکتیو دەبێت.

رۆژئاوا له رواڵەتی باوکدا دێتەناو بازنەی داخراوی دوولایەنەی ئابووری مەیل و سوبژێکتیویتەی مرۆڤی کورد و به هەڕەشەی خەساندن و لەهەمانکاتدا بەڵێنی هێزپێبەخشین، سووژەی کورد له منداڵدان و ئامێزی دایك (سونەت) دادەبڕێ و بەرەو وەرگرتنی ناوی باوك (نەزمی نومادین/ قانوون) بەڕێیدەکات. سووژەی کورد لەهەمانکاتدا که لەگەڵ ئەویدیی مەزنی رۆژئاوا هاوشوناسی دەکات (دەسەڵات/ دەوڵەت)، له فانتازیای خۆیدا جیهانی هاوگرتوو و بێکێشەی لەکیسچووی وێنادەکات و لەوێوە یەکێك لەڕێگا ناسەرکەوتووەکانی پڕکردنەوەی بۆشاییەکانی بەستێنی ئەویدیی مەزن ئەزموونده‌کات.

سووژەی کورد لەو ئیماژەدا جەستەی خۆی پچڕپچڕ و پەرتەوازە دەبینێتەوە، واته گێڕانەوەی حیکایەتی مێژوویی و سیاسیی خۆی جیاواز لەوەی هەستیپێکردبوو و بەبێکێشه شوناسی خۆی بەپێی ئەو سەرچاوەیه وێناکردبوو، دەبینێتەوە. لێرەدایه که گوتاری سونەتی ئایینی ناتوانێ دابڕان و تێکچوونی ئەم ئیماژ و چیرۆکه رێکبخاتەوە و کەلێن و بۆشاییی گوتاری ئەویدیی مەزنی مێژوویی پڕبکاتەوە. لێرەدایه که گوتارێکی نوێ واته گوتاری دەوڵەت/ نەتەوە بۆ لێکدانەوە و پێکهێناوەی ئەو ئیماژە بەشێوەیەکی نوێ بەرهەمدێت و پرۆبلماتیکی جیاواز له شێوازی باوی مێژوویی بۆ سووژەی کورد دەستەبەردەکات. دەستهاوێشتن بۆ فۆرمێکی نوێی (زمانی کوردی) جیاواز له فۆرمە باوەکانی پێشوو (عەرەبی، تورکی، عەجەمی) له دەربڕینی ئەدەبیدا، یەکێ له دەرکەوتە گرنگەکانی ئەم پرۆبلماتیکه تازەیه بوو که بێگومان نەوەك بەرهەم و بەرهۆ بەڵکو دەبێ له چەشنی هاوپێوەست و هاوتەریب لەگەڵ ئەو سوبژەیەدا رەچاوبکرێت.

خانی دۆخی داسەپیو و باوی ئەدەبی و سیاسی نەفیدەکاتەوە و ئەمەش بەگشتی له داهێنان و تۆمارکردنی شێعرەکانیدا به زمانی کوردی بەرچاودەکەوێت. هەرچەنده ناوئاخنی ئەم شێعرانەش پێوەندییەکی ئەوتۆی به هەڵبژاردنی فۆرمی زمانی دەربڕینی ئەم شێعرانەوه (زمانی کوردی) هەیه بەڵام بنەڕەتیترین توخمی نەلێکردنی خانی، هەڵبژاردنی زمانی کوردی وەکو فۆرمی دەربڕین و خۆدەرخستنه. موختەساتی گوتاری شۆڕشگێڕانەی خانی لەم شێعرەدا که دەربڕینی خوازه و حەزێکی بنەڕەتییە بەتەواوی دەردەکەوێ، ئاخۆ دەبێ:

| | |
|---|---|
| **ئەم بەختە رەشـــــــەی مە راکا** | **کوردیش له جیهان بڕەو پەیا کا** |
| **بۆ مەش که هـــــەبایه پادشایێ** | **خـــــوا تـــــاجێکی پێببەخشیایێ** |

**تركان نەدەبوون بەسەر مەدا زالْ بۆ كوند نەدەبووينە لانــە و مالْ**
**چون بۆ عەجەمان دەبووينە ژێردەست ژێردەستی شتی وەها نەوی و پەست**
**كورد چۆن دەبێ ديل و چـارەڕەش بن كەی راستە لە خۆشی دوورەبــەش بن**
**كورديش كە ببايە يەك دڵ و دەست دەستياندەكەوت ژيانی سەربەســت**

گوتاری نوێی خانی ئاماژەدەداتە تیۆریی سیاسیی مۆدێرنی دەوڵەت/ نەتەوە و کێشەکانی کۆمەڵگای کوردی نە بەشێوەیەکی تیۆلۆژیکاڵ و ئاکاری بەڵکو بە میتۆدێکی ئەزموونخوازانە و ریالیستی دەخوێنێتەوە. لەناوچوونی کێشەی چارەڕەشی و ژێردەستی واتە دوورەبەشبوون لە خۆشییەکانی ژیان بەپێی پرۆبلێماتیکی خانی لە دامەزراندنی پێکهاتە و قەبارەیەکی سیاسیی سەربەستدا دێتەکایەوە کە لەوێدا کورد سەروەری و دەسەڵاتی خۆی وەدەسبێنی و لەلایەن نەتەوەکانیدیکەوە هەروەها لە ئاستی جیهانیدا بە خاوەنی دەسەڵات (تاج) و پێگەی نەتەوەبوون بناسرێ و برەوپەیابکا. سەد ساڵ پاش خانی شاعیرێکی شارەزووری، سەربە شاری سلێمانی پرۆسەی نەلێکردنی دۆخی سەپاو دەباتەپێشەوە کە خانی یەکەم قۆناغی بەنەفیکردنی گوتاری سونەتی و دامەرزاندنی پرۆبلماتیکی شوناسخوازانە دەستپێکرد. نالی لە قۆناغی دووهەمدا بە رادیکاڵکردن و قووڵکردنی نەفی واتە دەستدانە قۆناغی گرنگی "نەفیی نەفی"(negation of negation)، بزاڤێکی زمانی و ئەدەبیی نوێی پێکهێنا. نالی ئانتیتێزی خانی، بهوشێوە تێگەیشتنە باوە لە پرۆسەی نەفیی دیالکتیکی نەبوو کە پرۆبلماتیکی خانی نەفیبکاتەوە و پاشتر لە ئاستێکی سەرتردا سەنتزێکی جیاواز لە هەردوو لایەن بخوڵقێنێ. کاری نالی قووڵترکردنەوە و پەرەپێدانی ئەو دابڕان و نەفیکردنە بوو کە خانی دەستیپێکرد: واتە کەڵکوەرگرتن لە فۆرمێکی جیاواز و سەرەڕای ئەوەش گەڕانەوە بۆ خودی فۆرمی زمانی لەشێعردا. لە نەفیی خانیدا، کەڵکوەرگرتن لە فۆرمی زمانی کوردی دەبینین کە لەئاکامدا فۆرمەکانیتر دەنێتە لاوە و هەروەها بە تیۆرێکی سیاسیی نوێ لەهەمبەر "کاسمۆس"ێکی یەکانگیر و وێنایەکی نامێژوویی لە کۆمەڵگای مەدەنیی بێکێشە، دەوەستێتەوە، بەڵام خانی لە چوارچێوەی زمانی کوردیدا ناتوانێ بگەڕێتەوە بۆ فۆرم و تەواوی ناوەڕۆك و واتا لەژێر سێبەری فۆرمی شێعریدا بەرهەمبێنێت. نالی هەنگاوێك لە خانی ئەولاتر دەنێت و ئەستاتیکایەکی زمانیی سەربەخۆ بۆ دەربڕینی شێعری دەخولقێنێ و هاوکات دابڕان لە پرۆبلماتیکی سونەتی، قووڵتر و بەرینتردەکاتەوە. دوو رەوایەتی سەرەکی لە نالی پێکهێنراوە کە تەنگەبەری و

کورتەئاستیی هەردوویان دەخەینەڕوو:

**یەکەم:** ڕەوایەتێك کە بەپێچەوانەی بانگەشەکەی، بنەما و ئاوەزێکی پاشڤەڕۆخوازانەی پێوەدیارە. ئەم ڕەوایەتە فیگۆرێکی پارێزگارخوازانە لە نالی پێکدەهێنێ کە گوایە نالی کەسایەتییەکی مەنگ و وەستاوی هەبووە و بەردەوام لەژێر سێبەری دەسەڵاتی عەشیرەتیدا ژیاوە و تیشکی بیر و فانتازیای نەیتوانیوە لۆژیکی خێڵایەتی و دەستوپێوەندیی دەسەڵاتی میرایەتی ببڕێ. بەمپێیە نالی تەنیا توانیویە دەربڕینی خۆشەویستی بۆ چاوی بەڵەك و کوڵمی گەش هەبێت و هەروەها لە وەسفی دامودەزگای خێڵایەتی میرنشیندا هۆگرانە هۆنراوە دابڕێژێ. ڕەوایەتێکیتر: کە لەهەمبەر ڕەوایەتی یەکەمدا دەوەستێتەوە فیگۆرێکی پۆزەتیڤ لە نالی دەنوێنێ و بەپێی هەلومەرج، شێعرەکانی لەپێناو خاك (نیشتمان)و ئەوینداری (هەستێکی مروڤانە)و دامودەزگای دەسەڵاتی کوردی (میرنشینی بابان)دا دەخوێنێتەوە و بەمچەشنە نالی بە شاعیرێکی نیشتمانپەروەر و داهێنەری شێعری کوردیی سۆرانی دادەنێت کە هاوشانی شاعیرانیتر وەکو سالم و کوردی، سێکۆچکەی ئەدەبی بابان پێکدەهێنن. بەڕای من هەردووی ئەم ڕەوایەتانە نەیانتوانیوە حەرەکەتی ڕادیکاڵیی نالی و کاریگەریی بنەڕەتیی ئەو لەسەر زمانی کوردی دیاریبکەن. ڕەوایەتی یەکەم شۆڕشی جوانیناسانەی نالی نابینێ و بە ئاوەزێکی واتاخوازەوە، فڕوفێڵی ناوەڕۆك و نەرمونیانیی ناوئاخن لە ژێستی فۆرم و هەڕەشەی پێکهاتە بەگرنگتر دادەنێ و هیچکات ناتوانێ سنوورەکانی ئاژاوەی پۆیەتیك لە تۆتالیتاریزمی واتا جیابکاتەوە. ڕەوایەتی دووهەم خۆی لە پشت دەمامکی پیاهەڵدانەوە دەشارێتەوە و بۆ پاراستنی نالی لە هەژمەتی کەڕوکوێرەکان دەست بۆ ئارگۆمێنتی لاواز و نزار دەهاوێژێ و بەردەوام بە ئاکاری شەرمەوە، بۆ هەڵسوکەوتەکانی نالی پاساودەهێنێتەوە. ئەگەر ڕوانینی یەکەم ناتوانێ شۆڕشی داهێنەرانەی نالی ببینێت، سایتی دووهەم تەواوی ئەو شتانەی دەیبینێت ناتوانێ شرۆڤەیانبکات و بە هۆی فەقیری لە بواری تێرم و دەستەواژەوە، هەمان پێناسەی کۆنباو و پارێزگارخواز دووپاتەدەکاتەوە.

نالی لەکاتێکدا زمانی کوردی/ سۆرانی وەکو فۆرمی داهێنانی ئەدەبی هەڵدەبژێرێ کە زمانی زاڵی میرنشینە کوردییەکان و هەروەها زمانی حوجرە و خوێندنگاکان عەرەبی و عەجەمی و تورکی بووە، کەوایە بەرەنگاربوونەوەی زمانی ڕەسمیی ئەم ناوەندانە کە وەکو سەنتەری دەسەڵات و زانست دەوریان گێڕاوە جگە لە کردەوەیەکی ئانارشیستی و دژە دەسەڵاتخوازانە ناتوانێ مۆرکێکیتری هەبێت. شێعر و هەڵبەستی نەخوازراو و ناباو و تەنانەت کورتەئاست لە چاوی

فەرهەنگی پاپیۆلاری ئەو سەردەمەدا هیچ پێگە و شانێکی کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی بۆ نالی دەستەبەرنەدەکرد. کەوایە ئەم پرۆژە سیاسییەی نالی پرۆژەیەکی ئانارشیستی و هەڵتەکێنەر بوو و نالیش بە بێ هیچ ئامانجێکی ئاکامخوازانە و گەشبینییەکی پارێزگارخوازانە ئەم پراتیکە ئەدەبییەی بەڕێوەدەبرد.

بێگومان نالی سەودای سەرکەوتن و هەمبوارکردنی هەورازەکانی لە پێشی، لەمێشکیدا پەروەراندووە، بەڵام بێئەملاولا بیریشی لە دوورەپەرێزی و سەرنەکەوتنی پرۆژەکەی کردووەتەوە، بەوچەشنەی کە بەرهەمەکانی تاکوتەریك بکەوێتەوە و نەتوانێ کارێگەریی لەسەر ڕەوتی باوی داهێنانی ئەدەبی و فەرهەنگیی گشتی دابنێت. کرداری رادیکاڵی نالی ئاکامی هەڵبژاردنێکی کیەرکێگاردی واتە هەڵبژاردنێکی شێتانە و جنوونئاسا بوو کە شەوی جیهان و داڕووخانی سووژەی لەگەڵدا بوو، بەوچەشنەی کە بە خۆکوژییەکی نومادین، پێوەندیی خۆی لەگەڵ نەزم و ڕێکاریی باو و سەپاو، دابڕی و تەواوی چراکانی ڕێبینیی کوژاندەوە. نالی لە کردەوەیەکی "ئافانسیس"[1]یدا تەواوی نووسراوەکانی سڕییەوە و لەوحێکی سپی بۆ نووسینی دالی ئەعزەمی نوێ هێنایەئاراوە.

«مەرگی نومادین، سڕینەوەی تۆڕی دەلالی، تێکدانی دەقێك کە سووژەی تێداجێگیربووە و بەرهەمدێتەوە، دەقێك کە لەوێوە واقیع مێژوومەند دەبێتەوە.. » (ژیژك،٨٤، ل ٢٧٧)

**نالی کە ویقاری نییە، بێباکە لە خەڵکی**

**سۆفی کە سلووکێکی هەیە، عوجب و ریایە**

بڕیاری نالی ژێستێکی نەرێنی بوو و ڕووداوێکی بنەڕەتیی خولقاند، ئەم ڕووداوە بەرهەمی هۆکارانە و تەکامولیی دۆخی پێش خۆی نەبوو، بەڵکو ئاکامی کردەوەیەکی خۆکوژانە بوو کە دەستووری ئەویدییە مەزنەکانی هەڵپەسارد و کەوانێکی لە ڕەوتی مێژووی ئەدەبی کوردیدا هێنایەکایەوە. پاشتر بەستێنی نومادین بەپێی ئەم ڕووداوە کە نالی بەرهەمیهێنا پێکەربەندییەکی نوێی بەخۆوە بینی و بەپێی دالی ئەعزەمی زمانی کوردی و فۆرمی جوانیناسانەی شێعری، سووژەمەندی و سووژەی ئەمەگداری ئەم ڕووداوەی بەرهەمهێنا. سووژە/ شاعیرانی کورد پاش نالی، هەموو لە بەستێنی ئەو نەزمە نومادینە نوێیەدا بوو کە توانییان

شێعر بڵێن و هەروەها ئەزمونی ئەدەبیی خۆیان پەرەپێبدەن.

**میتۆدی نالی:** روانینی ئاتامۆرفۆتیك (خێڵو خێچ / چەوتبینانە)

**پێمدەڵێن مەحبووبە خێل و خێچە مەیلی شەڕدەکا**

**خێل و خێچە یان ترازووی نازی نەختێ سەردەکا**

نالی بەباشی مەنتیقی مەیلی ناسیوە، بەو واتایە کە مەیل تەنیا بە بارکردنی شتێکی زێدە یان گۆڕانی رواڵەت و سووچی نیگا بۆ شتەکان، دەتوانێ ئەو شتانە وەکو دیاردەی خوازراو بەرهەمبێنێت. لە هونەری نیگارکێشیدا بە روانین لە گۆشەنیگایەکی تایبەتەوە کە وێنای رۆشن و راستەقینەی ئۆبژەمان بۆ دەستەبەردەکات روانینی ئاتامۆرفۆتیك دەڵێن. ژیژك لەم چەمکە کەڵکوەردەگرێ و "مەنتیقی مەیل"ی پێئانالیزدەکات و دەڵێ: «ئۆبژەی a ئۆبژەیەکە کە تەنیا روانینێکی "خواروخێچ"ی مەیل دەتوانێ لێیتێبگات، ئۆبژەیەك کە بۆ نیگای ئۆبژکتیڤ لە بنە ماوە بوونی نییە بە واتایەکیتر ئۆبژەی a بەردەوام، بەپێی پێناسەکردنی، بەشێوەیەکی لارولوێر و دەسکاریکراو دەناسرێت .»(ژیژك، ٨٨، ل ٣٠)

نالی ئەگەر راستودروست چاو لە مەحبووبە بکات، کیژێکی لادێیی نەخوێنەوار دەبینێ کە هاوشێوەی تەواوی کچە داماو و بێدەرەتانەکانی ئاوایی "خاك و خۆڵ"ی ئەو سەردەمەیە و رەنگە تایبەتمەندییەکی جوانیناسانەی جیاوازی تێدابەدینەکرێت، سەرەڕای ئەمانە، بەپێی رێسای پاتریارکاڵی باو، ئەم کیژە لادێییە ناتەواوی و عەیبێکی گەورەی هەیە کە بێگومان لە لۆژیك و نیگای بێبەزەییانەی پیاودا نەخوازراو و نەبەخشراو دەبینرێت، ئەویش ئەوەیە کە چاوی خێلوخێچی وەکو برینێك لەسەر روومەتی هەڵکورماوە و لێینابێتەوە. نالی لە رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ ئەم دیاردەیەدا بەپێی مەنتیقی مەیل روانینێکی کەژبینانە هەڵدەبژێرێ و لەوێوە وێنەی جوان و گوڵڕەنگی چاوانی یار دەدۆزێتەوە.

**چاوی هەمرەنگی گوڵی، مەستی شەو و رۆژن مەدام**

**یەك لە نەشگۆفتەی بەنەفشە، یەك لە نەیلۆفەر دەکا**

ئەو شتەی لە خوێندنەوەی نالیدا گرنگە ئەوەیە کە پێویستە ئێمەش لە میتۆدی ئانامۆرفۆتیکیی بۆ دۆزینەوە و دیاریکردنی وێنای نوێ و باسنەکراوی نالی کەڵکوەرگرین. بێگومان ئەگەر راست و بێکێشە ئاراستەی نیگای خۆمان رێکبخەین، ئەو فیگورە ئاسایی و سانتیمانتاڵەمان دەسدەکەوێ کە روونکردنەوەیەکی ئەوتۆ لەسەر پراتیکی ئەدەبیی رادیکاڵی نالی بەدەستەوەنادەن و "نالی" لە دۆخێکی مێژوویی قەتیس و موتەعەیندا رۆدەنێن. وەك ئاماژەما نپێدا روانینی راسترەو و پۆزەتیڤ، نالی وەکو پارێزگارخوازێك دەبێنێت کە لە سەرچاوەی ئابووریی خودان و میراندا ژیانی رابواردووە و بارستاییی ئەدەبیی خۆی لەپیاهەڵدان و مەدحی ئەواندا پێگەیاندووە. رەوایەتێك کە نالی بە کەسایەتییەکی ترسەنۆك دەناسێنێ کە لەکاتی کێشە و قەیراندا خۆی شاربەدەر دەکات و هیچ هەوڵێك" چ کرداری و چ نەزەری، لەپێناوی گۆڕانی دۆخی نالەبار نانوێنێ و شێعرەکانیشی گوزارشت لە دوورە پەرێزی و کەمتەرخەمی لەئاست کێشە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانی کوردستانی ئەو سەردەمە دەکەن.

بەڵام لە گۆشەنیگایەکی خواروخێچەوە نالی، نالییە. واتە نالی لە نەفیکردنەوەی بەردەوامدا خۆی بونیاددەنێ و هیچکات بەپێی شوناس و کەسایەتییەکی لەپێش و پۆزەتیڤ ناناسرێ. نالی ئەو سووژە واتایی و فۆرماڵەیە کە لەئاکامی نەفیرکردنەوەی رادیکاڵدا دیاردەکەوێ و کاتێك بتهەوێ لە تەنکاوی نەزمی دەلالتدا ئێخسیریبکەیت، لە گێژەلووکە و تەنوورەی نەفیکردن و لار و خوارڕێکردندا لێتبزردەبێت.

**نالیم و بە رووتی لە هەموو دیدە دەپۆشم**

لەنێو کۆمەڵگەیەکدا کە هەموو لەژێر پەردەی دەمامکەوە خۆیان حەشارداوە، لەنێو جەماعەتێکی یەکسان و یەکپۆشدا نالی رێگای خۆی جیادەکاتەوە و بەرگێکی نوێ لەبەر دەکات: بەرگی بێبەرگی و رووتوقووتی. ئەم کردارە نەفیگەرانە هەمان حەرەکەتی ئافانسیسیی رادیکاڵی سووژەیە کە خۆی لە شەوی جیهان و مەرگی نومادیندا دەخنکێنێ تاوەکو رۆژێکی ئیجگار نوێ بەرزبکاتەوە. دیارە تاوەکو بێبەرگی و رووتوقووتی لەئارادا نەبێت مەیلی هەتاو و رووناکی نایەتەکایەوە:

**بێبەرگییە ئەمرۆ کە هەتیو مەیلی هەتاوە**

نالیبوون واتە رۆچوون لەناو ئەو ناوەکەیدا کە ئەمرێکی مەحاڵ و ئۆبژەیەکی دەستەبەرکراوە بەبێ پراتیکی بەرگ لەبەردادڕان و هەڵپێچانەوەی دۆخە باوەکان مەیسورنابێت. نالی لێرەدا نایەوێ دەروەستبوونی خۆی بەکردارێکی سونەتی واتە دیدەپۆشی و چاودەروێشکردن لەئاست جوانییەکان (ناشیرینییەکان) بسەلمێنێ. بە پێچەوانەوە چاوداخستنی نالی لێرە دا بەتەواوەتی دژ بەهەمووانی دەمامکپۆشە کە بە وتەی عەهدی ئەتێق :«چاویان هەیە و نابینن... »، کەوایە لە گۆشەنیگای ئانامۆرفۆتیکییەوە دیدەپۆشیی نالی لێرەدا چاونووقاندن و دیدەپاریزی نییە بەڵکو دارشتنی بینینێکی نوێیە، چاوتێبرین و ماقمانێکی مەحاڵ و نیگایەکی ژهەراوی و کوشندەیە.

**"حیکمەتی شێعر"**

گرنگایەتیی شۆڕشی کۆپرنیکیی "نالی" خۆی لەخۆیدا تەنیا هەڵبژاردنی زمانی کوردی بۆ راهێنانی ئەدەبی نەبوو (خانی لەزارێکیتردا ئەو رچەی شکاندبوو)، بەڵکو ئەو نەفیکردنەوەی دووچەندانە (موزاعەف) بوو کە لە خانی تێدەپەڕی و لەهەمانکاتدا خانی بەئەنجامدەگەیاند. دوو تەوەری سەرەکیی خانی واتە نیشتمانپەروەری لە چوارچێوەی گوتاری سیاسی سەربەخۆییدا و هەروەها پانتەئیزم لە قالبی گوتاری ئایینیدا، لەنالیدا تووشی رۆچوون (aufhebung)ی هیگلی دەبن واتە بەشێوەیەکی بنەڕەتی بەتاڵدەبنەوە و هاوکات بەردەوامدەبن (sublation). گەڕانەوەی نالی بۆ حیکمەتی شێعر، واتا و ناوەڕۆکی لە فۆرمی جوانیناسانەی شێعردا رۆبرد و دیسکۆرسی سەربەخۆیی و پانتەئیزمی مێتافیزیکی لە سەربەخۆیی زمان و گشتخوازیی فۆرمدا توانەوە.

**کەس بە ئەلفازم نەڵی خۆ کوردییە، خۆکردییە**

**هەر کەسێ نادان نەبێ، خۆی تالبی مەعنا دەکا**

وەرچەرخانی نالی لە شێعری حیکمەتەوە بۆ "حیکمەتی شێعر"، کوردییەتی خستە چوارچێوەی "خۆکردی"، واتە میدیۆمی فۆرم. ئەوانەی بەبێ میدیۆم چاوەڕوانی لایەنگری (نەتەوەخوازی) لە بەرهەمی هونەری دەکەن، بێگومان لەم شێعرەی نالی زوێر و هەراساندەبن و گومان و خەیاڵی ناڕەوایان لادروستدەبێ، بەڵام ئەوانەی کە بڕوایان بەوەیە کە بەرهەمی هونەری

بەبێ میدیۆمی فۆرم و پێکهاتەی سەربەخۆی خۆی ناتوانێ بانگەشەی هونەریبوونی هەبێت، لەپێشێتیی "خۆکردی" لەئاست "کوردیبوون"دا بە بابەتێکی زەرووری دادەنێن و لە ئەلفازی نیشتمانپەروەرانەدا ئاسۆ و رەهەندی جیاواز دەبیننەوە.

پراتیکی شێعری نالی وەکو ژێستێکی مەنفی گەڕانەوەیەك بوو بۆ واقیعی بۆش و فەزای بەتاڵ و پڕنەکراوەی زمان، بەوچەشنەی کە سیاچاڵێکی مەزنی خولقاند کە بارستاییەکەی تەواوی هەوڵە ئەدەبی و شێعرییەکانی پاش خۆی راکێشا و لە بەستێنی خۆیدا جێگیریانیکرد. شۆڕشی "خۆکردی"ی نالی تەواوی ئەو هەستە کوردانەیەی پێكهێنا کە پاشتر لەسەر زاری شاعیرانی کوردیخواز و کوردیبێژەوە وەکو حاجی قادری کۆیی دیارکەوتن:

**تا رێك نەکەون جەمیعی ئەکراد هەروا دەبنە خەرابە ئاباد**

حیکمەتی شێعریی نالی، حیکمەتی نەتەوەیی و هەروەها گوتارە جیاوازەکانیتری بەدوای خۆیدا هێنا و هەرچەندە هەموو ئەو دەنگانە لە فۆرمووڵی "خۆکردی"ی نالی شوێنکەوتوویییان نەکرد، بەڵام ئەو ئیمکانەیان بۆڕەخسا کە ئەزموونی جۆراوجۆر بخولقێنن و رێبازی ئەدەبیی خۆیان بەرهەمبێنن.

**جوانیناسی جەستە**

لە تیۆری شێعریی ریالیستیدا کە بایەخ بە فۆرم و ستاتیکای بەرهەم نادرێ، واتای ناوەڕۆك و پێوەندیی نواندنەوەیی لەگەڵ واقیع دەبێتە بنەمای راهێنانی شێعری، ئەمە بەو واتایە نییە کە واقیع و دونیای دەرەوە هەرجۆرێ بێت بەچەشنێکی ئەزموونگەرانە لەشێعردا ئامادەدەبێت بەڵکو واقیع لە بازنەی تەنگەبەرییەکان و تابۆکاندا مۆرکی واقیع بەخۆوە دەگرێت و لەئاکامدا نە وەکو جیهانی بێخهوش و بێپەردە بەڵکو جیهان لەژێر دەسەڵاتی فەرهەنگی زاڵ و داسەپاودا دەنوێنێ: واتە روانینێکی راستڕەوانە و ئۆبژکتیڤ. لەم رێبازە ئەدەبییەدا باسکردن و وەسفی جەستە لە سنووری واقیعدا (واقیعی رێسامەند و ئایدۆلۆژیك) دەمێنێتەوە و ئاقاری فانتازیای رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ جەستە لە زوڵف و کوڵم و خاڵ و ئەبرۆ تێناپەڕێ. بەپێچەوانەوە لە قەبارەی فۆرمدا جەستە لە کانتێکستی هێژمۆنیی باڵادەست رزگاردەکرێت و بەپێی

زەرووڕەتی فۆرم و دینامیسمیی زمان دیفورمەدەبێت و شوناسێکی جوانیناسانە بەخۆوەدەگرێت. مۆرفۆلۆژی جەستەی ژن (مەستوورە)و فوکووس کردنەسەر ناوەندی سێکسواڵیتە (فالۆسی ژنانە، پراتیکێکی ئەدەبیی ئاوانگاردە کە هیچ شاعیرێکی ناسراوی کورد پێش و پاش نالی خۆی لەقەرەینەداوە.

ئاخێزگەی نەفرەت لە جەستە، پارادایمێکی مێژوویی/ سونەتییە کە لەسەر ئەساسی دوئالیسم (جەستە/ رۆح)، بایەخێکی میتافیزیکی دەبەخشێ بە رۆح و پێگەی جەستە تائاستی جیهانی پەستی حەیوانی کە بە سەرچاوەی گوناح و شەهوەتپەرستی دادەنرێ، دادەشکێنێ. ئەم دوانەبینییە لە فەلسەفەی دووجەمسەریی دیکارتدا (سووژە/ ئۆبژە) کە بە بناغەی بیر و هزری نوێ دادەنرێ بەردەوامدەبێتەوە، هەر بەو بۆنەوە زۆربەی گوتار و ناوەندە مۆدێرنەکان لە پێوەندیی لەگەڵ کۆنترۆڵ و چاوەدێری جەستەکاندا لە چوارچێوەی شوناسە فەردی و کۆمەڵایەتییەکاندا پێکدەهێنرێن. لە سەدەی بیستەمدا هاوئاهەنگ لەگەڵ رێبازە فیکری و فەلسەفییەکانی (اباژری و حمیدی، ١٣٨٧، ل ١٦٨) دژی دوئالیسمی(دیکارتی/کانتی)دا رێبازی جیاوازی رەخنەگرانە بۆ بنەماشکێنیی ئەم پێوەندییە نابەرابەرە و رزگارکردنی جەستە و تایبەتمەندییەکانی هاتەئاراوە. فۆکۆ جەستەی هێنایەناو مێژووەوە و دەور و پێگەی جەستەی لە پێکهاتن و گۆڕانی گوتارەکانی دەسەڵات/ زانستدا خستەڕوو. بەپێی بۆچوونی فۆکو ئەمە سێکس نییە کە سێکسواڵیتە (سیستەم و رێسای فەرهەنگی و کۆمەڵایەتی تایبەت بە سێکس و کرداری سێکسی) دەخولقێنێ بەڵکو بەپێچەوانەوە، سێکس و کرداری سێکسیی جەستەکان بەرهەمی ئەو گوتارانەیە کە مۆرکی خۆیان لەسەر جەستە دەنێن و لەوێوە بەردەوامیی خۆیان بەرهەمدێننەوە. بەمپێیە ئەوە جەستە نییە کە زیندانی رۆحە، بەڵکو ئەوە رۆحە کە لە شێوازی گوتارە سیاسی و فەرهەنگییەکاندا جەستەی داگیرکردووە و بەردەوام زەبروزەنگ و ئۆتۆریتەی خۆی لەسەر تۆماردەکات. بێگومان لە کوردستانی سەدەی نۆزدە هێشتا ئیپیستمەی کۆنباوی دژەجەستە جڵەوی دەسەڵاتی لەدەستە کە هەرچەشنە شۆڕشێکی جەستەیی و چێژێکی سێکسواڵ سەرکوتدەکات و رێگانادا گوتارەکانی جەستە و ئەندام بێنە زمان و تەنانەت لە فۆرمی بووتیقا و جوانیناسیی هونەریدا هێمای خۆیان ئاشکرابکەن.

نالی لە شێعری مەستوورەدا بەپێچەوانەی ئیپیستمۆلۆژیای سەردەم، بە روانینێکی ئانامۆرفۆتیکی جەستە کەشفدەکات و هەوڵدەدات وەکو دەقێك دێڕ بە دێڕی بپشکنێ و

دیوەنەبینراوەکان و فۆرمەداخراوەکانی لێکبداتەوە و لەوێوە نەك وێنایەکی ئاوێنەیی و راگواستنێکی کەرستەمەند بەڵکو ریتۆریکی شێعری و فۆرمێکی جوانیناسانە لە جەستە بەرهەمبێنێت.

**کاسێکی بلوورینی نخوونی لەسەرا بیٚ**

**نەختێکی لەبەر مەوجی لەتافەت قڵەشابیٚ**

**سێکس لە ئارادا نییە(مەحاڵە)؟!**

ئەم بڕیارە رادیکاڵەی لاکان(sex does not exist) ئاماژە بە ناهاوسەنگیی پێوەندیی نێوان ژن و پیاو دەدا و پێیوایە کە جیاوازیی جینسی لە بنەڕەتدا بەرهەمی شکستی بە نومادینکردنی پیاوەتی و ژنایەتییە. کەوایە مەنفییێتی (negativity)ی بنەڕەتیی سووژە بەگشتی پێماندەڵێت کە ژن و پیاو تەنیا دوو هێمان کە ئەو "نەبوون"و "بۆشایی"و "شکست"ە لە سیمبۆلایزکردنی جیاوازیی جینسیدا کە تایبەتی ئەمری واقیعن، پەردەپۆشدەکەن و ئەشق (ئەویندارێتی) وەکو ئایدۆلۆژیای ئەم داشاردنی ناتوانی و ناکارایی سیستەمی نومادینە دەور دەگێڕێت (هومر، ٨٨، ل ١٤٨). شێعری مەستوورەی "نالی" کە بە میتافۆری پرسیار (مەستوورە)و وەڵام (نالی) ئیمکانی هاوجووتی ژن و پیاو رەوایەتدەکات لە درێژەی ئایدۆلۆژیای ئەشقدا ژن نەوەك سیمپتۆم (عارزە)، بەڵکو وەك تەواوکەر و موتەمەمی پیاو پێناسدەکات.

لێرەدا جەستەی ژن پرسیارێکی کراوە و بۆشە کە بەدوای وەڵامێکی پڕپێست و دروست و پیاوانە (حەقیقەت)دا دەگەڕێت و وەڵامی ئەو پرسیارە لە فالۆسی پیاوانەدا دەدۆزێتەوە: (بۆ توند و رەقی مەتنی مەتینی حوکەما بێت). بە بڕوای نالی ئەم پرسیارە ناکامە تەنیا بە فالۆسێك عوقدەگوشایی و رەمزگوشایی دەکرێت کە - لاکان وتەنی - تەواوی ژیاری مرۆڤایەتی لە مەداری واتای ئەودا پێکەربەندی کراوە و هێما و نیشانەی دەسەڵات و هێزێکی بنەڕەتییە.

نالی خەونی خۆی رەوایەتناکات:

خوێندنەوەیەکی ناتەواو لە فرۆید، خەون بە جوبرانی ناکامیی ژیانی واقیعی دەزانێت، بەم پێیە پانتاییی خەون و فانتازیای بێسنووری دەبێتە هەرێمێکی یوتۆپیایی کە مرۆڤە ئازارچێشتوو و بەئاکامنەگەیشتووەکان لە ئەرزی واقیعدا، پەنای پیٚ دەبەن و لەوێدا بە شێوەیەکی مەجازی و مەعنەوی(!) کامگرتوو دەبن. لاکان پێی وایە لە خەوندا مرۆڤ لەگەڵ ئەمری واقیع ( the

real)دا رووبەڕوودەبێتەوە کە بابەتێکی ترۆماتیك و تۆقێنەرە و مرۆڤ بۆ پاراستنی خۆی لە هەراس و ئازارەکانی، پەنا بۆ ژیانی ئاسایی دەباتەوە.

«لە بەرانبەرکێی خەون و واقیعدا (ژیانی ئاسایی)، خەیاڵکردن لە لایەنی ﴿هاودەستی﴾ ژیانی واقیعدایە و تەنیا لەخەودایە کە ئێمە رووبەڕووی ئەمری واقیعی ترۆماتیك دەبینەوە». (ژیژك، ل ٧٩)

بەمپێیە نالی مەستوورەی بەمچەشنە لەخەودا نەبینیوە، بەڵکو بەپێچەوانەوە ئەو شێعرەی بۆ خۆدەربازکردن لە ئەمری واقیعی جینسی کە لەخەوندا رووبەڕووی بووەتەوە داهێناوە. ئەو جەستەیەی کە نالی لەخەودا رووبەڕووی بووەتەوە ئەو ئەمرە مەحاڵە دڵهەژێنەیە کە نزیکبوونەوە و چێژبردن لێی نامومکین و مەرگهێنەرە و سیستەمی سەقامگرتوو و واتاداری زەین و زمانی مرۆڤ هەڵدەوەشێنێتەوە. نالی بۆ دوورکەوتنەوە لە پۆرترە (واقیع)ی مەستوورە کە لەخەوندا دێوەزمەئاسا دڵکوت و داچڵەکێنەر دەرکەوتووە، پەنایبردووەتەبەر فانتازیا و ژیانی واقیعی و وێنایەکی جوانیناسانە و کامهێنەری لە جەستەی مەستوورە خولْقاندووە، بەڵام شکۆ و مەزناەیی داهێنانەکەی نالی لەوەدایە کە کەلێنی نێوان فانتازیا و سیستەمی نومادینی تا بەرزترین ئاست بەرجەستە کردووەتەوە و بەتەواوەتی ئەمەگداریی خۆی بە پانتاییی خەیاڵ سەلماندووە. کەوایە دەتوانین بڵێین فۆرموولّی نالی بەپێچەوانەی فۆرموولّی دەروونشیکارانەی لاکان کە هەرەسی بونیادی و نامومکینی سێکس دەخاتەڕوو، بەمچەشنە بیچم دەگرێت:

"سێکس لەئارادایە (مومکینە)" لەم رێبازەدا جیاوازیی جینسی دیاردەیەکی ئانتالۆژیکە و دیالێکتیکی پرسیار و وەڵام (هاوجووتبوون) دەمانگەیەنێتە ئاکسیۆمێکی بنەمایی کە دابڕان و جیابوونەوەی پاژەکان (اجزاء) لە هاوگرتوویییەکی ئیستێعلاییدا یەکدەگرنەوە و مەستوورەی هەستی (لێرەدا رازی سەربەمۆری جەستە) تووشی کرانەوە و ئالیسیا (ئاشکرابوون) دەبێت. لێرەدا تایبەتمەندییەکیتری نالی دەردەکەوێت کە بەپێچەوانەی فەرهەنگی باو، حووزووری حەقیقەتی جەستە و رێزمانی لەش لە دەقی ئەدەبیدا رادەگەیەنێت و شاردنەوە و دواخستنی بەردەوامی واتا و مەیلی ئەندام بە کردەویەکی نەشیاو دەزانێ. بێگومان نالی لەناوەڕۆکدا بڕوای بە میتافیزیکی حووزووری سێکس و ئیمکانێتی کامگرتن هەیە، بەڵام لەبووتیقا و داهێنانی فۆرمێکدا هەوڵی مێژوومەندکردنی جەستە دەدات و تاڕادەیەك ئاماژەی وەرگەڕانی جەستەیی (somatic turn) پێوەدیارە. بەرانبەرکێ و دژبەریی ئانتالۆژی/

مێژوومەندی، لە شێعری مەستوورەی نالیدا بەچەشنێك دەڕواتە پێش کە فۆرمێکی نوێ لە داهێنانی ئەدەبی کوردیدا دەڕسکێنێ و دەروازەیەکی ئاوەڵا بۆ ئەزموونی زمانیی تازەدەکاتەوە.

**نالیی جەوان/ پیر؟**

لەنالیدا دوو سووژەی سەرەکی، بەردەوام لە مشتومڕ و گفتوگۆ و بەرەنگاربوونەوەدان، سووژەی "وەحدەت ئاشنا" کە لەئاست واتا میتافیزیکییەکان و باوەڕە چەقبەستووەکاندا خۆی بە فەقێ و قەلەندەر و گەردەنکەچ دادەنێ و هەوڵدەدات لەگەڵ "ئەویدیی مەزن"ی گوتاری سونەتدا هاوشوناسی بنوێنێ. سووژەی دووهەم سووژەی "رۆژپەرستی رووت"ە کە بەپێچەوانەی سووژەی یەکەم بە کوفری زوڵف و ئاوی لێو و قەدەحی گەردوونشکێن لەهەمبەر شێخ و زاهید و سۆفی و سەرومێزەریاندا شۆڕشێکی جوانیناسانە بەرپادەکات و بە یەك نەوبە دووسەد ماتەمی تەوبە دەشکێنێ. لێرەدا نالی بەپێی میتۆدی چەوتبینی (looking awry)، دیاردەکان لە شوێن/ کاتی کۆنباوی رابڕدوو رزگاردەکات و لە قاپی شوێن/ کاتی نوێدا بەرهەمیاندەهێنێتەوە. لە روانینێکی هوسێرلیەوە دەتوانین بڵێین لە پراتیکی شێعریی نالیدا وشەکان تووشی هەڵپەساردنی دیاردەناسانە واتە ئیپۆخە (epoche) دەبن و واتا جێگیر و کلاسیکییەکەیان لێدادەماڵرێ و رێگا بۆ بەرهەمهێنانەوەیان لە فۆرمی زمانی و ریتۆریکی شێعریدا ئاوەڵادەبێت:

**ساقی بە مەیی کۆنە لەسەر عادەتی نەو بە**
**بشکێنە بە یەک نەوبە دووسەد ماتەمی تەوبە**

"نالیی جەوان" واتە سووژەی شۆڕشگێڕ، بەردەوام بەرەنگاری پرۆبلماتیکی "نالیی پیر" دەبێتەوە و بە مەنتیقی دەروونیی شێعر (حیکمەتی شێعر)، بەسەر میتافیزیکی کۆنباو و سووکەسەرییەکەیدا زاڵدەبێت. "نالیی پیر" نوێنەری دۆخێکی مێژووییە کە ناتوانێ پێوەندیی ئۆرگانیکیی خۆی لەگەڵ واقیعە پووکاو و داسەپیوەکانی سەردەم بپچڕێنێ هەربۆیە دیاردەکان لە شێوەیەکی نازەمانمەند و ئانتالۆژیکدا دێنەسەر زاری شاعیر و هەوڵدەدەن دەقی کراوەی شێعر بە هێژمۆنیی واتای خۆیان دابخەن. "نالیی جوان" ئەو سووژە نیگاتیڤەیە کە ئەمەگناسی رووداو/ حەقیقەتی وەرگەڕانی زمانە و بەهۆی هاوشوناسی لەگەڵ بۆشایی و کەلێنە پڕنەکراوەکانی

"ئەویدیی مەزن" دەتوانێ بەچەشنێکی ەیستریك، پرۆسەی بانگەێشتنی ئایدۆلۆژیك هەڵپەسێرێ و کرداری رادیکاڵی خۆی کە داهێنانێکی ئەدەبیی ئاوانگاردە، بەئەنجامبگەیەنێ. "هەرزەنووسی"ی نوێخوازانەی نالی بەرەورووی "مەزننووسی"ی مەنگ و وەستاوی شاعیران و بیرمەندانی سەردەم دەبێتەوە کە زەرورەتی مەدرەسە و مەنتیق، ئەرکی گۆڕانکاری و نوێگەریی لەبیربردوونەتەوە و « بە ریا باری تەکالیفی رووسوومی بۆ خەڵق (چ) دەکێشن(ی)؟»

## "نالی" حەریفی کەس نییە، ئیلف و ئەلیفی کەس نییە

## بەیتی رەدیفی کەس نییە، هەرزەنوویسە، گەپدەکا!

"نالیی جەوان" نە کاراکتێرێکی ناسراوە و نەش بەشێکی دیاریکراو لە شێعرەکانیەتی، بەڵکو ئەو حەرەکەتە مەنفییەیە کە لەئەنجامی پراتیکی ئەدەبیی نالییەوە سەر هەڵدەدا و هیچکات لە سووژەیەکی پڕ و جێگرتوو و دەسکەوتوودا قەتیسناکرێت. "نالیی جەوان" لە شەوی جیهان و هەڵپەساردنی نەزمی هەبووندار و بەتاڵبوونەوەی رێسای قانووندا دەرەکەوێ، لەو ناوەکە مێژوویییەدا کە لە هەناوی دیاردەکاندا - جەستە، وشە- بەدوایدا دەگەڕێ و بەردەوام دەیانهێنێتە ژێر تیشك و تروسکاییی زەمەن و لە مەستوورییەوە بۆ ئالیسیا و ئاشکرابوون رایاندەکێشێ. "نالیی جەوان" ترۆمایەکە کە پاش بەسەربردنی تەمەنی پیری و گوزار لە "نالیی پیر" واتا بەخۆوەدەگرێ و زەبری دڵکوت و هەژێنەری خۆی دەوەشێنێ. لەڕاستیدا "نالیی جەوان" تەنیا بە وەرگەڕانێك بۆ دواوە (retroactive) لەئێستادا بەرهەمدەهێنرێت و ناو و ئاوەڵناوی بۆ دابیندەکرێت. کەوایە ئێمە بەردەوام لەگەڵ دوو نالیدا رووبەڕووین: یەکەم وێنایەك کە بە خوێندنەوەی نالی هەستپێدەکەین، فیگۆری "نالیی پیر"ە، ئەو پرۆتاگۆنیستە (قارەمان) " پیر و فوتادە و کەوتوو"ە کە دەستئەوسانی کەشفی حەقیقەتی "مەکتووم و مەختووم"ە و پێیوایە کە ئەم مەستوورییە زاتی و لەپێش و موتڵەقە و بە هیچ تەفسیرێك لە داپۆشین و حەشاری دەربازینابێت: "بەیان نابێ بە تەفسیری دووسەد (کەششاف)و (بەیزاوی)". دروست لە کاتی هاتنەقسەی ئەم پیرەمێردەدا، زمانی نزار و سواوی بەرپل دەکەوێ و وشە و واتای لێبزردەبێت و شەو دادێت. لەم شەوی جیهانەدا کە هەست بە سۆزی غوربەت و نامۆیی دەکەین و هیچ رزگاریدەر و مەسیحێك نابینین، "نالیی جەوان"" ئانتاگۆنیست (دژە قارەمان)ی رەوایەتی

شێعری، بە سکووت و بێدەنگیی خۆی پەردەی سیناریۆ/ خەیاڵی پێشوومان دادەڕێ و بە "مەبەستێکی بێمە بەست (purposiveeness without purpose)"[٢] بەرەو جولجوتای گیان رامانده‌کێشێ:

**نالی زوبانەکەی تەڕ و پاراوی سەوسەنت**

**حەیرانی چاوی نێرگسە، وەك لاڵە نادوێ**

کەوایە "نالیی پیر"، ئیمکانی کرانەوە و دەنگهەڵبڕینی "نالیی جوان" دەستەبەردەکات و "حیکمەتی شێعریی" نالیمان پێدەناسێنێ:

**من سەروی رەوانی چەمەنی عالەمی باڵام**

**نالی بە توفەیلی بووەتە سایە لە دووی من**

لێرەدا فیگۆری ناسراوی نالی واتە نالیی پیر، ئەو مێتافیزیستەیە کە وێنا و واتای بێزەمەن بەرهەمدێنێ و وەکو سێبەرێکی پێبەستە و پەککەوتە لە دووی رێبوارێکی تیژڕەو و تیندار کەوتووە و تووش و توانی خۆی لە دەم و نەفەسی ئەو دەگرێتەوە و خۆی بە قەد و باڵای ئەودا هەڵدەواسێتەوە. بەڵام فیگۆری نادیار و پێرسۆنای کەمترناسراوی نالی واتە نالیی جەوان ئەو ئایرۆنیستە هەرزەنووس و نەزەربازەیە کە گاڵتە بە رەوایەتە گشتی و تەواوگرەکان دەکات و ئیمکانێتی (contingency)و نازەروورببوونیان دەخاتەڕوو. نالی رەند و ئایرۆنیست بە پێکەنینی رەندانە دۆخی تۆفەیلی نالی میتافیزیست کە سێبەرئاسا لەدوویکەوتووە و خۆی لێجیاناکاتەوە، نەفیدەکاتەوە و لەوێوە شوناسی نادیار و مێژوومەندی خۆی رادەگەیەنێ. بەپێی ئیپیستمۆلۆژیای نالیی میتافیزیست، عالەمی باڵا هەمان جیهانی موسولی ئەفلاتوونییە کە تەواوی شتەکان وەکو سێبەر و دەرکەوتەی ئەو جیهانە لای ئێمە خۆدەنوێنن، بەڵام لە سووچەنیگای نالی ئایرۆنیستەوە عالەمی باڵا لەم شێعرەدا هەمان عالەمی جوانیناسانەی جەستە و لەش و بەژن و باڵایە.. واتە نالی لەدووکەوتن و ئەویندارێتیی "سەروی بوڵەندقەد و برۆتاق و مەمكجووت"دا، ناسە و هەناسەی نالیی لاوی وەدەسخستووە و باقی رەوایەتە سواو و

وشه هەناسەسوارەکان، لە بەستێنی ئەم ئانتالۆژییە گشتاڵتییەدا واتایان بەخۆوەگرتووە. کەوایە "عالەمی باڵا"ی مێتاسروشتی، دبێتە پێشبەست و کانتێکستی دەرکەوتنی "عالەمی باڵا (بەژن)"ی جوانیناسانە و بە مەنتیقێکی گشتاڵتی، ئاناتۆمیی بەژن و باڵا و پەرچەم و پێشانی، تەنیا بە جیابوونەوە و هاوکات فەرزکردنی لە پەردەی تاریکی زەوینەکەیدا دەستەبەری دێن و دەرکەوتن دەبن.

**هەر پەرچەم و پێشانییە فیکری شەو و رۆژم**

**هەر گەردەن و زوڵفە ئەمەلی دوورودرێژم**

«بوومی مینێروا لە شەوگاری جیهاندا دەفڕێت» (هیگڵ)، خەیاڵی نالیش لە شەوگاری نووتەکی جیهاندا (شەو، غوربەت، شکست و داڕووخان) باڵی هەڵفڕین دەکاتەوە و هەورازە سەخت و تاقەتکوژەکان دەبڕێ.

**شەو هات و ئەمن مەستی خەیاڵاتی کەسێکم**

**مەشغووڵی نەفەسگرتنی موشکین نەفەسێکم**

لە موتەمەمی نالیدا: "مێعراجی گیان لەشەودا روودەدات"، نەفسی بوومئاسا بە دەربازبوون لە "حیرسی وێرانە"، دەتوانێ بازانە و تیژڕەوانە، بەرزبفڕێ و رەوایەتی خۆی تۆماربکات. نالی ئەو بازنەی ونبوو (حلقەی مفقودە)و میدیۆمە خۆنادیارکارەیە کە لە شەوگاری جیهاندا رۆدەچێت، بەڵام لە "میعراجی گیان"دا راپەڕین بەرپادەکات. پراتیکی نەفیگەرانەی نالی فۆرمێکی زمانی بەرهەمدەهێنێت کە رێگای گوزاری خانی بۆ حاجی قادری کۆیی و سەرجەم شاعیرانی پاش ئەو ئامادەدەکات و هاوکات خۆی لە پشتی پەردەی رەوایەتی ئەم شانۆیەدا دەمێنێتەوە و بێدەنگی و بێسیمایی رادەگرێت.

داهێنانی نالی تەنیا داناشکێتە سەر ناوەڕۆکێکی شێعریی دیاریکراو یان ستایلێکی شێعریی تایبەت، نالی خەرمانە(هالە)ی شێعری کوردی داهێنا، واتە ئەو مۆرك و پیرۆزییە کە لە زاراوەی ئەدەبیدا فۆرمی پێدەڵێن. خەرمانەی شێعر واتە ئەو بەستێنە ناخودئاگایە کە ئاگایی

وشه و ناوەڕۆك مومكیندەكات، له پراتیكی ئەدەبیی نالیی لاودا، فەزایەكی بێڕەنگ دەخولقێنێ كه لەوێدا رەنگەكان خۆدەنوێنن و وێنەكان ئاشكرادەبن.

له نەقاشییەكانی ئێمپێرسیۆنیستی "مۆنه"دا، تیشك ئەو بەستێنه دەخولقێنێ كه زەمانمەندی و سیمای بگۆڕی شتەكانی تێدادیاردەكەوێ و وێنه له قاپی خۆیدا بیچمدەگرێت. هاوكات له نیچه و فرۆیددا، جەسته و ناخودئاگا ئەو فۆرمه كاریگەر و ئەكتیڤەن كه سەرەڕای لەسێبەرمانەوەیان، دەوری سەرەكی له ئاوەزی بەئاگا و هوشیاری مرۆڤدا دەگێڕن. (بوتبی،٨٣،ل٥٥)

هاوواتا لەگەڵ ئەم ئاماژانەدا كه بەچەشنێك بنەماكانی هونەر و هزری نوێ پێكدەهێنن، داهێنانی ئەدەبیی نالی ئەو باكگراونده نادیارەیه كه بەرهەمی شاعێرانی پاش ئەوی لەسەر دەنووسرێت و ئیمكانی خولقاندنی كرداری ئەدەبیی كوردی دێنێتەئاراوه. لێرەدا دەتوانین بەپێی میتۆدی رادیكاڵی نالی ئەم بڕیاره رادیكاڵه دەربڕین:" زمانی كوردی له پراتیكی ئەدەبیی نالییەوه دەستپێدەكات". بێگومان زمانی كوردی پێشتر له نالی، له بەرهەمەكانی خانی و جەزیری و بێسارانیدا حوزووری هەبووه، بەڵام لەوانەدا زمان نەوەك پێكهاتەیەكی سەربەخۆ و خودسەرچاوه (واته فۆرم)، بەڵكو له شێوازی ئامێری ناوەڕۆك و واتایەكدا دەوریگێڕاوه كه له درێژەی فەرهەنگی زارەكی و پرۆبلماتیكی فۆلكلۆریكدا، دەقی ئەدەبیی بەرهەمهێناوه. ئەو بەرهەمانه سەرەڕای هەموو مەزناهی و گرنگایەتییان له قۆناغی نەفیدا مابوونەوه و بەبێ بڕگەی نەفیكردنەوه و قووڵكردنەوەیان دیسانەوه بێگۆڕانكاری دووپاتەدەبوونەوه و سیستەمی مەنگی ئەدەبی زارەكییان بەرهەمدەهێنایەوه. تەنیا له پراتیكی ئەدەبیی نالیدایه كه فۆرمولاسیۆنی كۆنباوی ئەدەبی زارەكی تێكدەڕووخێت و شێوازێكی نوێی رۆنان و داڕشتن دێتەكایەوه:

**تەبعی شەككەرباری من، كوردی ئەگەر ئینشادەكا،**

**ئیمتیحانی خۆیه مەقسوودی، له عەمدەن وادەكا**

**یا له مەیدانی فەساحەتدا به میسلی شەهســـەوار**

**بێتەئەمول بەو هـــــەموو نـــەوعه زوبانی رادەكا**

له ڕەچەڵەکناسیی سووژەی کوردیدا ئەوانەی جەخت لەسەر ئاخێز و خاڵی دەسپێك دەکەن، خانی وەکو بناغەدانەری فۆنداسیۆنی گوتاری شوناسخوازانەی کوردی دادەنێن و ئەوانەش ناوەڕۆکێکی دیاریکراو و پێگەیەندراو دەکەنە پێوانە و ئاماژەی ڕاستەوخۆ بە چەمکەکانی نەتەوە و دەوڵەت و ماف لە شێوازێکی مۆدێرندا بەپێویستی گوتاری داهێنەر لەبەرچاودەگرن، حاجی قادری کۆیی بە شیاوی ئەم جێگە و پێگەیە دەزانن. نالی ئەو نێوەنجییە نادیارەیە کە بە ژێستی خۆسڕینەوە (self- effacing)ی خۆی، گوتاری "خانی"ی لە "حاجی قادری کۆیی"دا پێگەیاند و ڕەوتی پێکهاتنی سووژەی کوردی گەشاندەوە. کەوایە دەتوانین خەتەربکەین و بێهیچ گومان و ژاژاییییەك، نالی وەکو خاڵی نادیاری دەسپێکی گوتاری شوناسخوازانەی کوردی دەسنیشانبکەین. دەسپێکەرێکی ون و نادیار کە پاش داهێنان و کاریگەرێتیی خۆی، ستێرکئاسا دەدرەوشێتەوە و لەپێش چاوان داپۆش و بزردەبێت.

•••

پەراوێز:

١. لە تێرمۆنۆلۆژیی لاکاندا بە واتای داڕووخان و بۆشبوونەوەی سووژەیە، لە کرداری ئافانیسیسیدا، سووژە دەسبەرداری تەواوی شوناسە سەقامگرتووەکان و هەروەها ئەویدیەکان دەبێت و لەوێوە تووشی فوقدان و مەرگی نومادین واتە شەوگاری جیهان دەبێت.

٢. مەبەستمەندیی بێمەبەست، لە تیۆری جوانیناسانەی کانتدا بە واتای دەرکەوتنی ئۆبژە تەنیا لە مەبەستی جوانیناسانەدایە و نە بەپێی هیچ بوار و بەرژەوەندی یان ئامانج و غایەتێکی تایبەت. نواندنەوەی ئوبژە تەنیا وەکو فۆرمێکی ڕووت و بەبێ هیچ مەبەستێکی ناوەکی و دەرەکی.

سەرچاوەکان:

- ژیژك، اسلاوی (١٣٨٤) اسلاوی ژیژك، ترجمە: مراد فرهادپور و همکاران، تهران: انتشارات گام نو.
- ژیژك، اسلاوی (١٣٨٨) اسلاوی ژیژك، ترجمە: مازیار اسلامی و سالح نجفی، تهران: انتشارات رخداد نو.
- هومر، شون (١٣٨٤) ژاك لاکان، ترجمە: محمد جعفری و محمد تاهایی، تهران: انتشارات ققنوس.
- اباژری، یوسف و حمیدی، نفیسە (١٣٨٧) جامعەشناسی بدن و پارەای مناقشات، فسلنامە پژوهش زنان، شمارە٤،س ١٢٧-١٦٠
- بوتبی، ریچارد (١٣٨٦) فروید در مقام فیلسوف، ترجمە: سهیل سمی، تهران: انتشارات ققنوس.
- نالی (١٣٨٧) دیوانی نالی، لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی م.ع مودەریس و ف. عەبدولکەریم، سنە: بڵاوکردنەوەی کوردستان.
- خانی (١٣٨٩) مەم و زین، وەرگێڕانی هەژار موکریانی،سلێمانی: پەخشانگای ئازادی.

# پڕۆژەی نالی،
# پڕۆژەی بیرلێکراوەی مەولانا خالید

حەبیب محەممەد دەروێش



نالی تەنها بە شەعری دەقیقی شیعر وەك خۆی دەڵێ، داوی بۆ شاعیرەکان نەناوەتەوە و کارێکی نەکردووە شیعرەکانی چەندەها مانا هەڵبگرێ، یەك خەفی و یەك ئاشکرا، بەڵکو نالی چەندەها توێژەر و لێکۆڵەری بواری شیعر و ئەدەب و مێژوویشی واقومڕکرد لەبەردەم ئاستانەی خۆیدا و جۆرێك لە دژواری دروستکرد لە ئاراستەی لێکۆڵینەوە لە نالی و جیهانی نالیدا.

هەر لە سەرتاوە کێشە و مشتومڕەکان لەسەر ژیان و مێژووی لەدایکبوون و مردنی و خێزانداری و سەفەرکردن و حەجکردن و پەیوەندییە سیاسییەکانی لەگەڵ دەسەڵاتی ئەو سەردەمە و پەیوەندییە زانستی و ئاینییەکانی لە گەڵ ئایین و تەریقەتە باوەکانی سلێمانی و تەریقەتە تازەکەی مەولانا و جۆری پەیوەندی لەنێوان مەولانا و نالی و مانەوەی هەمیشەیی نالی لە خانەقاکەی مەولانا، بوونی شوێنی تایبەتی مەلا خدر لەناو خانەقادا، بەشێوەیەك کاتێك لەغەریبیدا بووە نۆستالیژیانە باسی ژوورەکەی دەکات بەجۆرێ کە لەقەسیدەکەیدا بۆ سالم لە کۆی (٤٢) بەیت (١٣) بەیت پرسیارکردنە لەو خانەقایەی کە ژیانی زانستی و کۆمەلایەتی و ئەدەبی تیادابەسەربردووە.

زۆر داویتر کە نالی پێدەچێ بەئەنقەستیش نەبێت، بەهۆی بەدبەختی و بێدەوڵەتی و بێقەواریی کوردبێت هیچ دامودەزگایەکی نەبووە بۆ تۆمارکردن و پارێزگاریکردن لەو کەلتور و مێژووە بەگشتی کە بواری شیعر و ئەدەبیش بەشێکە لەو مێژووە تەمومژاوییەی زۆربەی سووچ و گۆشەکانی بە تاریکی ماوەتەوە.

ئەو بەشە کەمەی مێژووی ئێمە کە ماوەتەوە بە مێژووی ئەدەب و زمانیشەوە بەشی زۆری چاکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو مەلا و پیاوە ئایینییە دڵسۆز و بەمەتڵەبانەی کە شتێکی کەمیان بۆمانپاراستووە.

وەك وتمان زۆر شتیتر لە ژیانی پڕ مەتەڵ و هەوڵە زانستییەکان بەئەنقەستیش نەبێت وەك موعەمما ماوەتەوە، هەر لە خۆشەویستی بەناو (حەبیبە)یەك تادەگاتە قەسیدەکەی مەستورە و تادەگاتە نووسینی شیعر بە زمانی شێوەزاری کرمانجی خواروو یان سلێمانی و خۆرزگارکردن لە نووسین بە فارسی و عەرەبی و کە نیشانەی لێهاتووی و شاعیرییەتی بووە لەو چەرخ و زەمانەدا. بۆیە یەکبەیەکی ئەو داوانەی نالی مایەی ئەوەیە توێژینەوەی ورد و لەسەرخۆ و هێمنانەی لەسەربکرێت، بەپێی ئەو کەرەستانەی کە لەبەردەستدایە یان ئەو دەستنووس و دۆکیومێنتانەی لێرەولەوێ لە ولاتانیتر دەدۆزرێتەوە کە دواییینیان کتیبی (مناظر الانشاء)یەکە بەهیممەتی کۆمەڵێ خەڵکی خەمخۆری مێژووی زمان و ئەدەبی کوردی دۆزرایەوە.

ئەگەر دەسەلاتی خۆماڵی بابانەکان بەردەوامبوایە و بیتوانیایە بەسەر کێشە ناوخۆییەکانی خۆیدا زاڵببوایە، پێدەچوو گۆڕانێکی گەورە لەسەر ئاستی زمان و فەرهەنگ لەکوردستاندا بهاتایەتەئاراوە لەسەر دەستی کۆمەڵێ خوێندەوار و زانای گەورە کە لەسلێمانیدا پەیدابوون بەتایبەتی لە بواری زمان و ئەدەب و ناسنامەی نەتەوەیی و لە سەروو هەموو ئەو خوێندەوارە گەورانەشدا حەزرەتی نالی دەبوو. لێرەدا دەمانەوێت تیشکێك بخەینەسەر چەند لایەنێکی گرنگ لەو داوانەی کە نالی ناویەتیەوە بەڵکو بتوانین رووناکی بخرێتەسەر بەشێك لەو موعەممایە کە نالی خولقاندوویەتی:

**نالی و زمان:**

ئەو پرۆژەیەی کە نالی دەستیپێکردبوو و بووە مایەی هێنانەئارای سەردەمێکی نوێ بەداخەوە نەیتوانی تەواویبکات بەهۆی دارمانی ئەو میرنشینەی کە نالی ئومێدی لەسەر هەڵچنیبوو و ئەوانیش ئومێدێکی فەرهەنگی گەورەیان بە نالی هەبوو، هەروەك دەزانین نالی پەیوەندییەکی تایبەتی لەگەڵ میرەکانی بابانی سەردەمی خۆی هەبووە و شیعری پیاهەڵدانی بۆ خۆیان و سوپاکەشیان وتووە و زۆر ئومێدیشی بەو سوپایە هەبوو، دوای دارمانی ئەو میرنشینە

نالی هەروەك لە نامە قەسیدەییەکەیدا بۆ سالم دەردەکەوێت نەگەڕاوەتەوە کوردستان و بەیەکجاری لە غەریبی سەریناوەتەوە، ئەڵبەتە نالی بگەڕایەتەوە بۆ سلێمانی سەرەڕای کۆتاییهاتنی ئەو میرنشینە هەر دەیتوانی شتێکی گەورەتر لەوەی لەبەردەستدایە بۆ نەوەی دوای خۆی بەجێبێڵێ و وەرچەرخانی زمانی و ئەدەبییەکە گەورەتردەبوو لەوەی کە ئێستا لەبەردەستدایە.

لە کتێبەکەی (خۆدزکۆ)دا نالی تەنها وەك شاعیرێك ناوی نەهاتووە، بەڵکو وەك زانایەکی زمانەوانی گەورە ناویدەهێنرێت، هەروەك لە کتێبەکەی (خۆدزکۆ)دا دەردەکەوێت کاتێك ویستوویەتی نووسینێك سەبارەت بە فیلۆلۆژی زمانی کوردی بنووسێ، دواتر لە ساڵی (١٨٥٧) بڵاویدەکاتەوە بەهاوکاری ئەحمەد پاشای بابان، خۆدزکۆ زۆر عەوداڵی ئەوە بووە بگاتە زانایەکی زمانی کوردی و خۆیشی کورد بێت و شارەزاییەکی باشی هەبێت لە زمان و دیالیکتیکە کوردییەکان، ئەحمەد پاشاش باسی نالی بۆ دەکات، هەروەك خۆدزکۆ لە زمانی ئەحمەد پاشاوە دەڵێت: (لە سوریا، لە شام زانایەکی بەناوبانگی کوردی لێیە، مەلا خزر کە چاکترە بەنازناوە ئەدەبییەکەیەوە نەعلی ئەفەندی ناسراوە، بەتایبەتی خۆی بۆ دیالیکتە هەمەچەشنەکانی نیشتمانەکەی (کوردستان) تەرخانکردووە و پێشتریش رێزمانی عەرەبی وەرگێڕاوە بۆ سەر زمانی کوردی، ئەحمەد خان کە بە خۆی نەعلی ئەفەندی دەناسی، وادەبێیداوم کە پەیوەندیم لەگەڵ ئەم زانا سەردەستە فیلۆلۆژیناسەی نەتەوەکەی بۆ دروستبکات). ل٦٢

هەروەها خۆدزکۆ لە پێشەکی کتێبەکەیدا دەنووسێ: (هەموو رێساکانی رێزمانی کوردی و هەموو ئەو تێکستانەی کراونەتە پاشکۆ و لەگەڵ ئەم کتێبەدا دەخوێنرێنەوە، بەشی زۆری لەلایەن ئەحمەد پاشاوە نووسراونەتوە و چاویانپێداگێڕدراوەتەوە). ل٦٢

**لێرەوە چەند باسێکی گرنگ دێتەئاراوە:**

- ئەحمەد پاشای بابان خۆی کەسێك بووە گرنگی بە زمان ئەدەب و دیالیکتیکە کوردییەکان داوە، چونکە هەر وەك خۆدزکۆ خۆی باسیدەکات بەشی زۆری تێکست و پەخشانەکانی کتێبەکەی ئەحمەد پاشا نووسیویەتیەوە و چاویشیگێڕاوەتەوە بە بەشەکەیتریدا، کەواتە لە سەردەمی کۆتایی میرنشینەکەیان بابانەکان دەستیانکردووە بەگرنگیدان بە فەرهەنگی کوردی.. وادەردەکەوێت لە هەوڵێکی جیدیدا بوون بۆ دروستکردنی زمانێکی رەسمی و ستاندار بۆ میرنشینەکەیان و هەستیان بە کەموکوڕییەکی گەورە کردووە لە نەبوونی زمانیك تایبەت

بەخۆیان لەکاتێکدا گەلانی دەوروبەریان خاوەنی زمانی شیعر و ئەدەب و زانست و نووسینی رەسمی خۆیان بوون وکوردیش هەر بەشیکی بە زمانێك دەنووسیٚ و بەپێی کاریگەری ئەو گەلانە و هەژموونیان لە ناوچە کوردییەکان، ئەو ناوچەیە زمانی نەتەوە خاوەن هەژموونەکانیان کردووە بە زمانی رەسمی خۆی، بۆیە پێدەچیٚ نالی لەلایەن بابانەکانەوە دەستنیشانکرابێت کە خۆی تەرخانبکات بۆ ئەو بوارە و سەرەتاکانی دروستکردنی زمانێکی یەکگرتووی کوردی بنیاتبنێت، نالی لە خوێندنەوی شیعرەکانیەوە هەستدەکرێت خاوەنی غروری کوردانەی خوی بووە و خۆی و زمانەکەی لە شاعیر و زمانەکانی گەلانیتر بەکەمنەزانیوە، وایبۆدەچم ئەم غرور و خۆبەکەمنەزانینە هۆکاری سەرەکی سەرکەوتوویی نالی بێت هەم لەشیعردا و هەم لەهێنانەئارای زمانێکی نویٚ بۆ میللەتێك هەمیشە خۆی و زمانەکەی لەژێر مەترسیدا بوون:

**زابیتەی تەبعم سوارە، ئیدیعای شاهیی هەیە**

**موحتەشم دێوانە، داوای تەختی خاقانی دەکا**

یان دەڵیٚ:

**نالیا ئەم غەزەلەت تازەبەتازە وتووە**

**بە دووسەد (مەسنەوی)یو (الوبی لوبابی) نادەم**

نالی کاری بۆ زمانیك کردووە ببێت بە زمانی شاهەنشایەك لە شاهەنشاهی خاقان کەمتر نەبێت، بۆیە نالی لە دەرەوەی وڵاتیش ئومێدبڕاو نەبووە لەبەجێهێنانی ئەرکەکەی ئەو پەیوەندییەی هەیبووە لەگەڵ میرانی بابان هەر بەردەوامبووە.

- لەم نووسینەی خۆدزکۆدا، باسی نالی وەك (شاعیر)ێك ناکرێت بەڵکو وەك زانایەکی زمانەوانی باسیدەکرێت کە خۆی تەرخانکردووە بۆ ئەو بوارە و پێشتریش رێزمانی زمانی عەرەبی وەرگێڕاوەتەسەر زمانی کوردی، لێرەوە دەردەکەوێت نالی لە دەرەوەی وڵاتیش هەر سەرقاڵی ئەو ئەرکە بووە کە خۆی بۆ تەرخانکردووە، بەڵام پرسیار ئەوەیە ئایا ئەو بەرهەمانەی نالی لەم بوارەدا بەرهەمیهێناوە لەکوێن؟ بێگومان ئەمە پێویستی بەکارێکی رێکخراو هەیە بەگەڕان لە دەرەوەی وڵات بەتایبەت لە شام و ئەستەمبوڵ بۆ دۆزینەوەی ئەو کەلەپوورە گرنگەی بواری زمان کە نالی بەرهەمیهێناوە.

لێرەوە دەردەکەوێت نالی هەستی بەوەکردووە ئەرکێکی نیشتمانی و ئینسانی گەورەی لەسەرە، بۆیە وازی لەهەمموو رێگاکانیتر هێناوە بڕیاریدا بە شیعر و لێکۆڵینەوەکانی ئەو ئامانجە بهێنێتەدی کە لەڕاستیدا هەر بە شیعرەکانی توانی زمانی کوردی بکاتە ناسنامەی نەتەوەیەکی بێقەوارە و نەتەوەیەك والیێبکات هەمیشە کەلکەڵەی دروستکردنی قەوارەیەك لەناخیدا بچێنی و بیخاتەسەر رێگایەك نەوە لەدوای نەوە خەباتبکەن بۆ بەدیهێنانی، ئەگەر لەناو هەندێ لەنەتەوەکاندا ئایین ناسنامەی نەتەوە بێت یان مێژووی هاوبەش یان رەنگی پێست، ئەوا بۆ کورد زمان بوو بە ناسنامە، نالیش لە بەناسنامەکردنی زماندا رۆڵی گەورەی هەبوو، نەك تەنها بۆ باشوور بە ڵکو بۆ رۆژهەڵات و باکووریش، چونکە زیندووکردنەوەی زمان لە پارچەیی کوردستان کاریگەری گەورەی هەبوو لەسەر پارچەکانیتری کوردستان با زمانی ئاخاوتنیان و شیوەزاریشیان جیاوازبیت، بەڵام نالی لەشیعرەکانیدا وشە و زاراوەی هەموو دیالیکتیکەکانی بەکارهێناوە و هەوڵیداوە یەك زمانی یەکگرتوو و ستاندار دروستبکات بۆ کورد:

**خاو و بێخاوی دوو زوڵفی خاوم ئەز**

**چاوە چاوی یەك غەزالە چاوم ئەز**

دیوان ل٢٢١

**لە کن تۆخار و خەس، گوڵزارە بیٚ من**

**لە کن من، خەرمەنی گەڵ خارە بیٚ تو**

دیوان ل٣٨٢

داگیرکەرانی کوردستان بۆ سڕینەوەی نەتەوەیەك لەسەر ئەرزدا زۆر بەدڕندانە سەرەتا پەلاماری زمانەکەیان داوە، لەچەندەها پرۆسەی جەهەنەمیدا هەوڵیانداوە لەڕێگای گۆڕینی زمانەوە کۆتایی بە نەتەوەیەك بهێنن.

لێرەدا دەردەکەوێت کە نالی هەر بە گەورەیی لەدایکبووە بۆیە توانی بەدوای خۆیدا وەرچەرخانێکی گەورە بەدیبیێنێ کە کەس دوای نالی نەیتوانی خۆی لێلابدات.. لەم هێنانە ئارای سەرەتایە نوێیەدا ئەگەر هەندێجار بەراوردی نالی بە حافزی شیرازی بکرێت لەورووەوە کە حافز غەزەلی کردە ئاوازێك هەم هەست و بیری هونەرمەندانەی خۆی پێدەردەبڕی و هەم ئەرکی کۆمەلأیەتی خۆی پێئەنجامدا یان توانی ئالگۆڕێکی بنەڕەتی لەغەزەلدا بەدیبهێنێت و غەزەلی لە

چەندین لایەنەوە دەستکاریکرد، ئەم ئاڵوگۆڕە لە مێژووی ئەدەبی فارسیدا بە (ئینقلابی حافز) لەغەزەلدا بەناوبانگە. ئەوا نالی لەڕێگەی شیعرەوە زمانی کردە ناسنامەی نەتەوەیەك بەو ناسنامەیە موقاوەمەت و بەربەرەکانیبوون و مانەوەی خۆی تیادادروستکرد و لەوپێناوەشدا چەندین شۆڕشی گەورە لە کوردستاندا هەڵگیرساوە، سەرەڕای گەورەیی حافز وکاریگەری لەسەر ئاستی جیهانیدا، بەڵام نالیش لەڕووی جورئەتەوە سەرەتایەکی نوێی هێنایەئارا زۆر لە حافزەوە نزیکە.

**– گەشەی میرنشینی بابان و گەشەی فەرهەنگی**

لە سەردەمی ئەورەحمان پاشای بابانەوە گرنگییەکی زۆر دراوە بە زانست و زانایان و پاشان لە زۆر شوێنیترەوە بەتایبەتی لە ئێرانەوە پاداشتی ئەو زانا و خوێندەوارە بەرزانەی کردووە کە لەسلێمانیدا ماونەتەوە و خوێندنگەکانیان بەڕێوەبردووە و هەر لە سەردەمی ئەودا بوو سەرەتاکانی بەهێزکردنی ئەو میرنشینە لەڕووی سەربازییەوە دەرکەوت کە دواتر سوپایەکی سەربازی پێکهێنرا لەسەر شێوەی تاکتیکی ئەوروپایی کە ئەحمەد پاشا بەهیوابووە لەڕێگەی ئەم سوپایەوە میرنشینی بابان بەهێزبکاتەوە و توانای بەرگری لەخۆکردنی هەبێت، دیارە هاوئاهەنگییەك هەبووە لەنێوان گەشەی فەرهەنگی و زمانی و بەهێزکردنی میرنشینەکە لەڕووی سەربازییەوە، بۆیە نالی لە یەکێك لەشیعرەکانیدا ستایشی ئەو سوپایە دەکات کە ئەمە سەرەتای ئەو شیعرەیە:

**ئەم تاقمە مومتازە کەوا خاسسەی شاهن**
**ئاشووبی دڵی مەملەکەت و قەلبی سوپاهن**

بەڵام بەداخەوە بەهۆی هەرا و ئاژاوەی نەبڕاوەی نێوان ئەندامانی بنەماڵەی بابان و پلان و هێرشکردنیان لەسەر یەکتری بەپشتیوانی سوپای قاجاری و عوسمانی ئەو ئامانجە گەورەیە نەهاتەدی کە لە ناخی نالیدا بوو.

**– مەولانا خالید و زمان و تەریقەت:**

مەولانا خالید تەنها رابەری رێبازی نەقشبەندی نەبوو، بەڵکو رووناکبیرێکی گەورە و خەمخۆرێکی نیشتمان و مەملەکەتی بابان بوو، هەروەك چۆن نالی لە بواری زماندا سەرەتایەکی نوێی هێنایەئاراوە، مەولانا خالیدیش سەرەتایەکی نوێی ئایینی هێنایە ئەم ناوچەیە، نەك تەنها لە کوردستان بەڵکو لەهەموو جیهانی ئیسلامیدا و بەتایبەتی لە قەڵەمڕەوی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانیدا، بەشێوەیەك مەولانا بەتازەکەرەوەی نەقشبەندی دادەنرێت و سەردەمێکی چەقبەستووی خستە جووڵە و بەشێوەیەك خەڵك زۆر بەپەرۆشەوە بەرەو رێبازەکەی دەچوون، بەتایبەتی خەڵکی نوخبەی خوێندەوار و بازرگان و خەڵکی بازاڕ مەولانایان دادەنا بە فریادرەسی سەردەمەکەی خۆی، نەك تەنها لە بواری ئایینی و رێبازی سۆفیگەریدا مەولانا سەرمەشق بوو، بەڵکو مەولانا سەرمەشقی نالی و سالم و کوردیش بووە لە تێکشکاندنی ئەم شێوازە لە نووسین و شیعر و پەخشان کە بە کوردی نەدەنووسرا و ئەو یەکەم کەس بوو بە کوردی و بە شێوەزاری سلێمانی عەقیدەکەی نووسی، کاتێکیش مەولانا لە هیندستان بووە شیعری حەسرەتی دیدار و دیتنەوەی کوردستانی نووسیوە و ئەم تێڕوانینە بۆ نیشتمان بووبە سەرمەشقی شاعیرانی دوای خۆی بەتایبەتی نالی.

سەرهەڵدانی دیالێکتی سلێمانی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی مەولانا و رۆڵی ئەو لەو بوارەدا، بەپێی دەستنووسێك کە بەڕێز کاك ئەحمەدی نەزیری بۆی باسیکردم (کە لای ئەو پارێزراوە) کە بریتییەلە شیعرێکی مەولانا خالید پێش ئەوەی بکەوێتە داوی رێبازی سۆفیگەریەوە، لەو شیعرەدا مەولانا باسلەوەدەکات کە دەیەوێت سەرەتایەکی نوێ لە شیعر و زمان و ئەدەبی کوردی بهێنێتەئاراوە چونکە پێیوایە مەزرەعەی دیوانی کوردی وشکە و ئەم دەیەوێت کارێزێك لە دیوانی کوردی دەربهێنێ، ئەمەش کاتێك کەسێکی نزیکی خۆی داوایلێدەکات قایلببێت بەوەی بڕۆنە داخوازی کچێکی خانەدان بۆ مەولانا، بەڵام مەولانا رازینابێت و وەڵامەکەی بە شیعر دەنێرێتەوە بۆ ئەو کەسە نزیکەی خۆی، لەبەیتێکیدا دەڵێ:

**قەڵەم سا ئادەی تەکاندە لە خۆت**

**تا وەســـــواری تەبع لەشیعرا ناوم کەم**

**قافيه هەڵبرێژم وەسەر نامەدا**

**تا نەزەمم هەروەك دوڕی خۆشاوكەم**

**بۆ كەوای غەزەل لە پارچەی غەزەل**

**ميقرازی زەوقی خـــۆم تازە ساوكەم**

**ئەدەبی كوردی وەناو عالەما**

**درەخشان و بەرز هەروەك هەتاوكەم**

**مەزرەعەی وشكی ديوانی كوردی**

**وەئـــاوی لێوی قەڵەم ســـــەراوكەم**

**شيعری دێر پاوی نە پۆڕ و نە گونج**

**وەك قلانشكی دەشت رەئی بلاوكەم**

ئەگەر ئەم شيعرە دەسنووسە بەتەواوی ساغبێتەوە كە شيعری مەولانا خاليدە بۆمانڕووندەبێتەوە كە نووسينی شيعر بە كوردی و هێنانەئارای سەردەمێكی نویٚ لە مێژووی زمان و ئەدەبی كورد و دروستبوونی ئەو وەرچەرخانە مێژووييە، پلانێكی بيرلێكراوە و بڕيارلێدراوبووە لەنێوان رووناكبيرانی ئەو سەردەمە و ميرەكانی بابان، بەلاّم پێدەچیٚ مەولانا درێژەينەدابیٚ بەو هەوڵەی بۆ دروستكردنی سەرەتايەكی نویٚ لە زمانی شيعر و نووسين بە كوردی بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی مەولانا دەچێتە هيند و رێبازێكی نویٚ دەهێنێتە كوردستان و مەشوڵی ئەو رێبازە بووە و پاشان نالی راسپێردرابیٚ بۆ ئەو كارە مەزنە، چونكە:

١. نالی هەر لە خانەقاكەی مەولانادا بووە و ژووری تايبەتی هەبووە، بەلاّم بەهيچ شێوەيەك دەخالەتی لە ململانێی نێوان مەولانا و شێخ مارفی نۆدێی نەكردووە بەشێوەيەك لەشيعرەكانيدا رەنگبداتەوە، تەنها چەند ئاماژەيەكی كەمنەبێت كە باسی ئەوە دەكات خانەقاكەی مەولانا شەووڕۆژ مەڵبەندێكی قەرەباڵغی زانست و عيرفان بووە و بە شەويش چراكانی هەر نەكوژاونەتەوە و بێپسانەوە جمەيهاتووە لە زانستخواز و خواناس، هەروەك نالی دەڵیٚ:

**(نالی) سەرت لە گونبەدەكەی خانەقا دەكا**

**لایٚ پڕە لە مەشعەلە، لایٚ لە مەشغەلە**

ديوان ل ٤٦٩

هەروەها لەنامەیەکیشیدا بۆ سالم بە دڵێکی پڕلەسۆزەوە هەواڵی خانەقا دەپرسێ ئایا رەبیعی ئاهووە یان چایری ستوور.

لە کتێبی (مناظر الآنشاء) عیمادەدین مەحمود گەیلانی نووسیویەتی و نالی پێشەکی بۆ نووسیوە و بەیتە عەرەبییەکانی شەرحکردووە، نالی کاتێك بەیتی شاعیرێك دەهێنێ دەڵێ فلان شاعیر لەم بەیتەدا دەڵێ، بەلاّم کاتێك نموونە بە قەسیدەیەکی مەولانا دەهێنێتەوە دەڵێ (مەولانا خالیدی نەقشبەندی سلێمانی لەم غەزەلەدا دەفەرموێ: مولانا خالید نقشبندی سلیمانی در این غزل فرمودند):

وام بگرفتم بصد جان گرد نعلین ترا

بی رخت چندان مطول شد شب تاریك هجر

مناظر الانشاء ل١٨٩

ئەڵبەتە بەکارهێنانی دەستەواژەی (فەرموویەتی) جیاوازی زۆری هەیە لەگەڵ وشەی (دەڵێ) ئەم ناوهێنانە بەمشێوازە دەرخستنی پلەوپایەی فەرهەنگی و ئایینی ئەو کەسە پیشاندەدات. پاشان نیسبەتدانی مەولانا بە (سلێمانی) دروستکردنی هێمایەك بۆ هاوشاری و هاونیشتمانیبوونی نێوان نالی خۆی و مەولانا خالید، ئەگینا مەولانا لە هیچ شوێنێك لە کتێب و شیعر و نامەکانیدا ناوی خۆی بە (خالید سلێمانی) نەهێناوە، بەڵکو زۆربەیجار بە (خالد الشهرزوری الجافی، خالید الکردی الشهرزوری، خالد النقشبندی). نالی

لە سەرەتای کتیبەکەشدا ناوی خویشی هاوئاهەنگ کردووە بەوشێوازەی کە ناوی مەولانای پێهێناوە واتە نیسبەتی ناوی خوبشی داوەتەپاڵ سلێمانی، هەروەك چۆن نیسبەتی ناوی مەولاناشی داوەتەپاڵ سلیمانی و بەمشیوەیە نوسیویەتی (خضر السلیمانی المعروف بنالی)، دیارە نالی زۆر وابەستەی سلیمانی بووە، بۆیە نیسبەتی مەولانا و خۆشی داوەتەپاڵ سلێمانی، لەکاتێکدا نە خۆی بە نالی سلێمانی ناسراوە و نە مەولاناش خۆی بە سلێمانی ناساندووە، لەکاتێکدا دەزانین مەولا نا زۆر هەولیدا کیشە و ئاریشەی کورانی( بەبە) لەگەڵ یەکتری چارەسەربکات بۆئەوەی ئاییندەیەکی گرنگ بۆ کورد لە م شارەوە دروستبکات، بەلاّم بەداخەوە هیچیان بە قسەیان نەکرد و مەولاناشیان لە مەملەکەتەکەیان دەرپەراند و مەولاناش ناچار بەتەواوی خۆی یەکلاکردەوە بۆ رێبازە عیرفانییەکەی و بە سلوکی سالیکاندا عروجیکرد بۆ جیهانی مەلەکوتی عیرفانی.

کەواتە ئێمە دەتوانین ئەوە بڵێین پەیوەندییەکی تایبەت هەبووە لەنێوان مەولانا و نالیدا، چونکە سەرەڕای ئەو کێشە و و ململانییە سەختەی لەسلێمانیدا هەبوو لەنێوان هەردوو ڕێبازی نەقشبەندی و قادری و سەرەڕای لە بێلایەنی کەوتنی بابانییەکان و پشتگیریان لە یەکێك لەو ڕێبازانە کە ڕکەبەرەکەی مەولانا بوو و سەرەڕای دۆستایەتییە تایبەتەکەی نێوان نالی و میرەکانی بابان، سەرەڕای گەورەبونی ڕووداوەکان لە ساتەوەختە مێژوییدا، کەچی نالی لە ناوەندی ڕێبازەکەی مەولانادا کە خانەقاکەیەتی ژووری تایبەتی خۆی هەڵبژاردووە خۆی تیایداجێگیرکردووە، لەکاتێکدا نالی موریدی ڕێبازی نەقشبەندی نەبووە، ئەمە ئاماژەیەکی گرنگە بۆ بوونی پەیوەندییەکی تایبەت لەنێوان مەولانا و نالیدا کە پێدەچی لە ئەنجامی راگوڕینەوە گفتوگۆی نێوانیان هاوئاهەنگییەگی فیکری و فەرهەنگی و جیهانبینی ئاییی و تادەگاتە تیڕوانینیان بۆ روداوەکانی ئەو سەردەمە لەنێوانیان هەبووبی، بۆیە نالی نەیتوانی دابڕێ لە مەولانا خالید و خانەقاکەی، ئەمە دەمانگەیەنێتە ئەو قەناعەتەی نالی دەبێ خویندنەویتری بۆبکرێت.. هەوڵەکانیشی بەدوای کەلەپووری نالی فروانتربکرێت و ئەم هەوڵانەش پێویستە لە ستادێکی نالیناسیدا ڕێکبخرێت و ئەو کەلەپوورەش لەهەموو گۆشە نیگاکانەوە بخوێنرێتەوە.

•••

**سوود لەم سەرچاوانە وەرگیراوە:**


١. دیوانی نالی - لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی مەلا عەبدولکەریمکی مودەڕیس و فاتیح عەبدولکەریم، ئێران، سنە، ئینتیشارات کوردستان، چاپی سێهەم، سنە ١٣٨٣.

٢. مناظر الأنشاء، تأليف محمود بن محمد الگيلانی، تقديم و شرح الأبيات العربية بالفارسية، الملا خضر النالي الشهرزوري، من منشورات ملتقى نالي، مؤسسة ژين، سلێمانی ٢٠١١.

٣. چەند لێکۆڵینەوەیەکی فیلۆلۆژی دەربارەی زمانی کوردی - دیالیکتی سلێمانی- وەرگێڕانی لە فرانسییەوە بۆ کوردی: نەجاتی عەبدوڵڵا، پێداچوونەوەی زمانەوانی و پێشەکی: فەرهاد شاکەلی، چاپەمەنی بنکەی ژین، سلێمانی ٢٠٠٥.

٤. نالی هەر لەلوتکەدایە: ئامادەکردنی م. عەلی، لە زنجیرە کتێبی گۆڤاری کۆچ ژمارە (٦)، دەزگای چاپ و پەخشی حەمدی، چاپی یەکەم، سلێمانی ٢٠٠٩.

٥. دەسنووسێك لەلای کاك ئەحمەدی نەزیری لە سنە کە شیعرێکی مەولانا خالیدە و خۆی بۆی خوێندمەوە و دوایش نووسیمەوە.

# نالی،
# لە نیشتمانی مەعریفەوە تا غوربەتی زمان

## هەڤپەیڤینێك لەگەڵ رەخنەکار و مامۆستای زانکۆ

## عەبدولخالق یەعقووبی

سازدانی: هەرێم عوسمان

ئاماژەیەک:

تکایە وا هەست مەکە بڵاڤۆکێك یان ئامێرێك لە لاتە، ئەوە ئێمەی مرۆڤین کە دەتوانین پێکەوە بێپۆشینی دەمامك دیالۆگبکەین و لە سنوورەکانی راستیی بوون نزیکببینەوە. وتوێژی زیندوو بەهای خۆی هەیە، چونکە بوونی خۆمان بۆ یەکدی ئاوەڵادەکەین، گەربێتو بواریش بکەینەوە، راستی خۆی دەردەخات. واتە خۆدەرخستنمان بۆ یەکدی دەرکەوتنی راستیبوونمانە. لەبەرئەمە بۆ سازکردنی وتوێژێك لەمەر شیعرەکانی نالی لەگەڵ عەبدولخالق یەعقووبی، رەخنەکار و مامۆستای زانکۆ و خەڵکی دەڤەری بۆکانی رۆژهەڵاتی کوردستان و دانیشتووی هەولێر کەوتمە گفتوگۆیەکی چڕوپڕەوە وەك سازکەری ئەو وتوێژە، خۆشحاڵم کە ئەو رێگا دوورە بۆ هەولێر گرتمەبەر و ئەوکاتە زۆرەی بۆ ئەم دیدارەم


عەبدولخالق یەعقووبی

تەخانکرد لێیپەشیماننیم، چونکە بەڕاستی خوێنەر بۆی دەردەکەوێت، لەم دیدارەدا عەبدولخالق یەعقووبی هەوڵیداوە هەندێ لایەنی شیعری نالی روونبکاتەوە کە هەردەبوو بکرایە. منیش خۆشحاڵم کە پشکێکی ئەم کارەم بەرکەوێت.

پێش دیدارەکە، بەهۆی خوێندنەوەی هەندێك بابەتی نووسەر چەندین پرسیارم ئامادەکردبوو، وەلی دیدارە زیندووەکە زۆرێك لەو پرسیارانەی پەراوێزخست، ئەمەش هەستدەکەم سرووشتی هەموو وتوێژێکی زیندوو و ئازاد بێت. شتێکیتر کە دەمەوێت ئاماژەی بۆبکەم، نیگەرانی و ئاخکێشانە بۆ خوێنەری ئەم دیدارە کە رەنگە نەتوانم لایەنێکی دیدارەکەمیان بۆ بگوێزمەوە، ئەویش بەهۆی شارەزایی زۆری نووسەر لەسەر شیعری نالی و بواری نالیناسی، وایکردووە نووسەر بەشێوازێکی زۆر عالی و جوان ئەدای شیعرەکانی ئەم شاعیرە بکات، بەداخەوە خوێنەر ناتوانێت ئەو ئەدایە ببیستێت کە رەنگە ئەمە لەهەندێ باردا کاریگەری لەسەر باسکردنی ئاوازی شیعری نالی هەبێت. ئاوازی ئەدا ی عەبدولخالق یەعقووبی لە خوێندنەوەی شیعرەکانی نالیدا بێگومان خوێنەری سەوداسەردەکرد، کارێکیدەکرد جارێکیدی نالی بخوێنینەوە و بزانین بەڕاستی نالی بەمجۆرە ئاوازە شیعری نووسیوە؟ من هیچ لەسەر گرنگیی نالی ناڵێم لەبەرئەوەی ئەوە لەدیدارەکەدا باسکراوە، بەڵام دەڵێم ئەوەی ئەم گفتوگۆیە لەچاو گفتوگۆیدیکە جیادەکاتەوە بوونی بەڵگەیە، واتە لە هەربۆچوونێکی نووسەردا بۆ شیعرەکانی نالی بەڵگەهێنراوەتەوە بە مەبەستی پشتڕاستکردنەوەی بۆچوونەکە کە ئەمەش چێژی تایبەت بە خوێنەر دەبەخشێ کە دیدارەکە دیدارێکی تیۆری وشك نەبێت. با ئیدی خوێنەر لەم دیدارە بە رووخسار دوورودرێژ و بە ناوەڕۆك چڕوپڕ و چێژبەخشە دوورنەخەمەوە. فەرمون ئێوە و ئەم هەڤپەیڤینە نالیناسانەیە.

**هەرێم عوسمان**

**کۆچ:** یەکەم هەنگاو، وەك دەروازەیەك بۆ چوونەناو باسەکەمان دەپرسین شیعری نالی بۆ جوانە؟

**عەبدولخالق یەعقووبی:** بەبڕوای من ئەمە پرسیارێکی زۆر زۆر گرنگە. لەوانەیە هۆکارێك کە پاڵی بە بەڕێزتەوە و پاڵی بە زۆر خوێنەرەوەیتری شیعری نالیدابێت کە لەوە بکۆڵینەوە شیعری نالی بۆچی جوانە، رەنگە ئەو توانایی و هێز و بڕستە لە شیعری شاعیرێکی سەدەی نۆزدەی کۆمەڵگەی کوردیدا بووە کە وایلێکردووە تائێستاش ئێمە کە لەسەدەی بیستویەکەمداین، شیعری نالی بخوێنینەوە و بەڕاستی نەك هەر چێژ لەو شیعرە وەبگرین و چێژ لەو جیهانە ببینین کە نالی بۆ ئێمەی خولقاندووە، بەڵکو دەیان رەخنەکار و توێژەریش هانبدات بۆئەوەی لە لایەنەکانی ئەو شیعرە بکۆڵنەوە.

لەڕاستیدا وەڵامدانەوەی پرسیاری بۆچی شیعری نالی جوانە، راستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ دەمانباتەسەر دوو بابەتیتر کە پێموایە وەکو دوو کۆڵەکە وان کە بانی شیعری نالی لەسەریان دادەمەزرێت. ئەو دوو کۆڵەکە سەرەکییە یەکیان زمانە و ئەویتریشیان مانایە. با لە ماناوە دەستپێبکەین، بەبێ ئەوەی ئەو دەستپێکردنە نیشانەی گرنگیدان بە مانا و پەراوێزخستنی لایەنی زمان بێت. من پێموایە نالی لە جیهانی شیعری خۆیدا جۆرێك لە رچەشکێنی سەبارەت بە گوتاری ئەدەبی کوردی دروستکردووە، بەو مانایەی کە نالی یەکەمجار لە جیهانی شیعری کوردیدا گوتارێکی دروستکرد کە ئەو گوتارە پشتی بە مەعریفە و تێگەیشتنی مرۆڤی کورد بەست، بەڵام ئەمە کە دواتر دەگەڕێینەوە سەری و دەبێت زۆرتر لێیبکۆڵینەوە، نابێت وایدانێین و هەستبکەین نالی لەبۆشاییەکدا ئەو کارەیکردووە. نالی هیچکات و هیچ شاعیرێکیتریش لە بۆشایی و بێزەمینەییدا ناتوانێت لەسەر جیهانی شیعری خۆی کاربکات و جیهانێکی شیعریی بێمێژینە و پێشینە رووبەڕوی خوێنەری خۆی بکاتەوە.

جیهانی شیعری نالی سەرڕێژە لەو زەمینە و زمان و مەعریفە و مانایانەی کە نالی پێشتر خوێندبوونیەوە و لەسەر بنەمای ئەوان شیعری خۆی بەرهەمهێنابوو. بۆ نموونە، یەکێك لەگوتارە دیارەکان کە زەمینەی شیعری نالییان پێکهێناوە، گوتاری تێفکرینی ئایینپەروەرانەیە، ئەویش بە حوکمی ئەوەی نالی بۆ خۆی مرۆڤێکی ئایینپەروەر بووە، مرۆڤێکی مەلا و دینناس بووە. بۆیە تۆ دەبینی رەگەزی ئایین و ئاماژەکردن بەو چەمك و ئیماژانەی کە دواجار

ئاخێزگەکەیان ئاییینە لە شیعری نالیدا گەلێ بەرچاو و دیارە. تەنانەت ئەگەر نالیدەیەوێت باسی هەستی نیشتیمانپەروەریی خۆی بکات، بۆ وێنە، چامە بەناوبانگەکەی (قوربانی تۆزی رێگەتم..) کە دەیخوێنیتەوە، راستەوخۆ بۆ پرسی غوربەت و دوورکەوتنەوە لەنیشتیمانیش پشتئەستوورە بە کۆمەڵێ چەمکی ئایینی. ئەوە ئەو پانتایی و زەمینە هزری و کولتووری و کۆمەڵایەتییەیە کە نالی تێیداگەورەبووە و گۆشکراوە، تێیداپەروەردەبووە. نالی ناتوانێت لە بازنەی ئەم زەمینە مەعریفییە بێتەدەرەوە. لایەنێکیتر لەو لایەنە مەعریفیانەی کە گرێچن و زەمینەی شیعری نالییان پێکهێناوە و جوانیناسی شیعری نالی بێگومان بێگەڕانەوە بۆئەو زەمینەیە نەشیاوە، گوتاری شیعری کلاسیکی فارسی و عەرەبییە، بەتایبەت گوتاری شیعری کلاسیکی فارسی و لەنێو ئەو گوتارەش شیعری حافیز وەك شاعیر و شێوازی هیندی وەك رەوتی شیعری. ئەوەمان لەبیرنەچێت و پێموایە کەمتر خوێنەرەوەیەکی کورد ئاگاداری ئەم خاڵەیە کە نالی حافیزناسێکی زۆر گەورەبووە" تەنانەت دەستنووسێکی بڵاونەکراوە و چاپنەکراوەی تائەم ساتەوەختە هەیە لەسەر شیکاریی شیعرەکانی حافیز. ئەمە تائیستا بڵاونەبووەتەوە و من بەشێوەی سافتکۆپی هەمە. نالی بێگومان لە شیعرەکانی خۆیدا کە من دواتر بە نموونە نیشانتی دەدەم، بەردەوام گەڕاوەتەوەسەر ئەو چەمك و دەستەواژە و ئیماژ و بیرۆکانەی کە لە شیعری فارسییەوە وەریگرتوون، بەڵام دواجار توانیویەتی لە پرۆسەیەکی بە زمانی کوردیکردن و بە فیکری کوردیکردندا ئەو چەمکانە تارادەیەکی زۆر لە سروشتی فارسی و عەرەبیبوونیان دابماڵێت و بیکاتە شێوە گوتاری کوردی.

نالی زانیویەتی ناچارە بگەڕێتەوە سەر ئەو تێفکرینەی کە تێیداپەروەردەبووە و ئەویش لە زۆر بار و بواردا تێفکرینی ئاییینبووە. ناچارە پشت بەو سەرچاوانە ببەستێت کە سەرچاوەی گەورەی خوێندنەوەیبوون، بەڵام لەهەمانکاتدا زانیویەتی کە شاعیرێکی کوردە و بە زمانی کوردی دەنووسێت و رووی لە مرۆڤی کوردە. بۆیە زانیویەتی ئەگەر دواجار نەتوانێت تەواوی ئەو چەمك و گوتار و بیرۆکانەی کە لەو دوو ئاخێزگە گەورەیەی زانایی و شاعیریی خۆی وەریدەگرێت نەکوردێنێت و مۆرکی کوردییان پێوەنەلکێنێت، ئەوە ناتوانێت لەشیعرەکانیدا شتێکی شاز و جوانییەکی تایبەت بخوڵقێنێت یان بەوجۆرەی خۆی لە دێڕە شیعرێکیدا بەئاشکرایی دەڵێت، بە قووەتی حیکمەت و بە لەفزی کەم و بچووك مەعنایی زۆر و گەورە ئەدابکات. بۆیە من پێموایە باسکردن لە جوانیی شیعری نالی بەبێ گەڕانەوە بۆ ئەو دوو سەرچاوە گرنگە مەعریفی و

جوانیناسانەیە ، واتە پەروەردەی ئایینپەروەرانە و شیعری کلاسیکی فارسی و عەرەبی کە لەڕاستیدا زمانی نالییان لێوەپاراوبووە و بیچمیان بە جیهانبینیی شیعریی نالی بەخشیوە، کارێکی ئەستەم و هەوڵێکی نەزۆك دەبێت.

بۆ نموونە هەندێك چەمك لە شیعری نالیدا هەن کە نالی بە تێڕوانینێکی ڕەخنەگرانە و پێکهاتەهەڵوەشێنانە بۆ ئەو چەمکانە دەڕوانێت، واتە کۆمەڵێك چەمکی باو باسدەکات کە ئەو چەمکە باوانە لە شیعری نالیدا بەپێچەوانەی باوبوونی خۆیانەوە خۆیان دەردەخەن و نالی لەو ڕێگایەوە جۆرێ لەپرۆسەی بەرهەمهێنانی مانای نوی دەخاتەگەڕەوە کە لەگەڵ ئەو فەزا ئاسایی و باوەڕە باوەی سەردەمی خۆی و تێفکرینی نۆرماڵی ئەوکاتی کۆمەڵگەی خوێندەوارانی خۆی یەکناگرێتەوە. هەربۆیە بەجۆرێك زەقکردنەوەیەکی مانایی یان وردتر بڵێم لادانێکی مانایی دێتەئاراوە کە ئەو زەقکردنەوە و لادانە دەبێتە هۆی ئەوەی مانای شیعری نالی لای خوێنەرەوەی شیعری کوردی تازە و ناباو بێت. هاوکات لە تێکەڵاویی تازەبوون و چێژبەخشبوون شیعرێکی جوان دێتەبەرهەم کە هەم لە بواری هزریدا وردبینانە و سەرنجڕاکێشە، هەمیش لە پڕۆسەی خوێندنەوەدا چێژبەخش و خۆشیهێنە.

ئەگەر زۆر لە بازنەی تیۆریدا نەخولێینەوە و بێینەنێو پانتایی پراکتیکەوە، نالی کۆمەڵێك دێڕە شیعری هەیە کە تۆ کاتێك دەیانخوێنیتەوە، دەبینی یەکەمجار باس لە چەمکێکی باو دەکات و ئەنجا لەبەرامبەر ئەم چەمکە باوەدا جۆرێك هەڵوێست وەردەگرێت" وەك بڵێی چەشنێك پەرچەکرداری ڕەخنەگرانە و لەم ڕێگەیەوە پێکهاتەی ئەو چەمکە باوە ئاماژەپێکراوەی خۆی هەڵدەوەشێنێتەوە. بڕوانە ئەم نموونەیە:

**لە سایەی زوڵفی تۆوە شەو درێژە**

**لە سوبح و نووری خورشیدی نەماوە**

ئەگەر تۆ ورد سەرنجبدەیت، دەبینی لەم شیعرەدا ئەو شتەی کە چەمکی باوی ڕۆژگاری خۆی بووە و هەروەتر چەمکی باوی جیهانی ئایینپەروەرانە بووە ئەوەیە کە خورشید و نووری خورشیدی شتێکە کە دەبێت بایەخی پێبدرێت" شتێکە سەرچاوەی مەعریفەیە و سەرچاوەی ئیلاهییات وخواناسییە، بەڵام نالی لەگەمەیەکی زۆر زیرەکانەدا دێت زوڵفی یاری خۆی لەگەڵ

ئەو نووری خورشیدە دەکاتە دووانە و بەشێوەی پەیوەندییەکی دووانە لێکدژ ( opposition bianary) لەبەرامبەر یەکدا دایاندەنێ. نالی دێت ئەو پەیوەندییە دوو لایەنەیە بەشێوە باوەکەی هەڵدەوەشێنێتەوە و سەرەتی دان بە نووری خورشیدی وەردەگرێتەوە و لە دید و تێڕوانینی خۆیەوە گرنگی بە زوڵفی یار دەدات. نالی ئەم هەڵوەشانەوەیە لەڕێگەی ئاماژەدان بەشەوی درێژ کە دەستکەوتێکە لە سایەسەری زوڵفی رەشی یارەوە دەستەبەربووە، دەخاتە بەرچاوان کە بێگومان تێیدا دەرفەت و دەرەتانی دڵداری پتر و دڵنیاییبەخشترە.

**کۆچ:** پێتوا نییە دیدێکی ئایینی هەڵگرتبێت، واتە یار بۆ خۆی بەشێکبێت لەپێکهاتە ئایینیەکە، بەجۆرێ ئاماژەبێت، بە خوا، ئەوەی لای سۆفی و عارفەکان باسدەکرێت؟

**عەبدولخالق یەعقووبی:** هەتائەگەر ئەوەش بێت، دیسان وەکو ئەوە وایە تۆ لەنێو گوتارێکی باودا گوتارێکی نوێ بێنیتەئاراوە. ئەو قسەیەی بەڕێزت رەنگە بەپێی ئەو سەرنجەی یەکەمی من بێت کە تێیداباسی ئاخێزگەی ئایینیی شیعری نالیم کرد، چونکە نالی دەبێ بەجۆرێك خۆ قوتاربکات لەو سەرچاوەی پشتیپێبەستووە بۆئەوەی دواجار شتێکی نوێیکردبێت. واتە ئەگەر لێرە خودی نووری خورشیدیش بەجۆرێك وەك جەنابت دەتەوێت خوێندنەوەیەکی ئیلاهی و عارفانەی بۆبکەیت کە ئاماژەیە بەخودا" یا بابڵێین زوڵفی یارەکە، یارەکە خوداییبێت، ئیلاهی و عارفانەبێت، دیسان لە خودی ئەو گەمە زمانییەدا بەجۆرێك پێکهاتەهەڵوەشێنی ( deconstruction) دەبینرێت. واتە لەنێو خودی گوتاری ئایینیدا نالی دەیەوێت جۆرێك لەپێکهاتەهەڵوەشێنی بێنێتەئاراوە، بەڵام گرنگی نالی لەوەدایە ویستویەتی دەقی شاعیرانەی خۆی لەگەڵ ئەو دەقە ئایینیانەی کە پشتیپی دەبەستێت جیاوازبکات. نالی ویستویەتی لێرەوە ئەو بابەت و باوەڕەی خۆی لە بەرچاوی خوێنەرەوەکەی زەقبکاتەوە و لەهەمانکاتیشدا، بەبڕوای من، جۆرێك لە دەسەڵاتی شاعیرانەی خۆی بخاتە بەرچاوی خوێنەرەوەکەی. پێموایە ئەگەر سایەی زوڵف زوڵفی ئەڤین بێت، ئەوا درێژی شەو دەرەتانێکە بۆ عیشقبازی و هەلێکە بۆ دڵداریکردنی عاشقان کەواتە، سوبح و نووری خورشیدی، وەك گوتم، لە چەمکی ئەرێنیبوونیان و زاڵبوونیان لەنێو پێکهاتەی دووانە لێکدژی نوور/ تاریکی دادەماڵدرێن و بەمشیوەیە نالی سەرەتیی شەوی تاریك لە شیعری کلاسیکیدا بەسەر سوبح دادەسەپێنێت. ئەمە هەڵبەت لە مێژووی شیعری

کلاسیکی فارسیدا شتێکی کەموێنە و بێپێشینە نییە، بەڵام گرینگ ئەوەیە نالی ئەم هەوڵەی لەنێو گوتاری شیعری کوردیدا و لەنێو پانتایی زمان و کولتوور و کۆمەڵگەی کوردیدا هێناوەتەئاراوە کە بەمپێیە شتێکی ئەگەر دەستپێشخەرانەی شازیش نەبێت، لانیکەم چاونەترسی و ئازایەتییەکی شیعریی دەگمەن و کەمهاوتایە.

لە شوێنێکیتری دیوانی نالیدا هەمان ئەو شتەی باسی دەکەم بەشێوەیەکیتر هاتووە.

**لە سایەی کوفری زوڵفت دڵ (فنا فی النوری) ئیمانە**

**مەڵێن زوڵمەت خراپە وەسفی پەروانە لەشەودایە**

ئەگەر تۆ سەرنجی ئەو شیعری بدەی، لەلایەکەوە سەرنجەکەی بەرێزت وەدیدێ کاتێك نالی دەڵێ، دڵ فەنا فینوری ئیمانە، واتە لە گوزارەیەکی وەك "فنا فی نور" کەڵکوەردەگرێ بۆئەوەی سایەی کوفری زوڵف بەشێوەیەکی باش لەقەڵەمبدات. دواتر دەڵێ زوڵمەت ئەگەر تائێستا چەمکێکی باوبووە و وتووتانە خراپە، چیتر وا مەڵێن، چونکە پەروانە لەشەودایە بە وەسڵی ڕووناکایی دەگات. واتە لێرەدا ئەگەر سەرنجی خۆمان لە خوێندنەوەیەکی ئاستی دەقی (text) بێنینە سەرەوەتر و بیکەینە خوێندنەوەیەك لەئاستی گوتار (discourse)دا، نالی لێرەوە خەریکە بەرامبەر گوتارێکی باو ڕادەوەستێ و گوتارێکی نوی دێنێتەئاراوە.

ڕەنگە ئەو گوتارە نوێیە بە حوکمی ئەوەی، وەك وتم، خۆی دواجار لەتاو زەمینەی گوتارێکی بەربڵاو و بەرفراوانی ئایینیدایە نەتوانێت ڕاستەوخۆ دژی ئەو گوتارە باڵایە ڕاوەستێ و دژبە ئەو وەکاربکەوێت، بەڵام لانیکەم لەنێو پانتایی گوتاری ئایینیدا تازەخوازی و نوێگەرایی و چاکسازی دەکات، بەجۆرێك کە دەتوانین بڵێین دواجار خۆی چەمکێکی نوی دێنێتەئاراوە. لەڕاستیدا نموونە زۆرە لەوبارەوە و من پێموایە ئەوە دەتوانێت شاهیدی ئەوەبێت بۆچی لە دیدی خولقاندنی گوتار و پێکهاتەی نوێوە دەتوانین بڵێین شیعری نالی جوانە و شیعری نالی شیعرێکە قابیلی لەنگەرگرتنی جوانیناسانەیە.

**کۆچ:** ئیمه دەتوانین بڵێین نالی شاعیرێکی ئایینییه یان ئەم حوکمبەسەردانە غەدرێکە؟

**عەبدولخالق یەعقووبی:** با کەمێك بەوردبینی و سەرنجەوە لە دەستەواژەکە بڕوانین کە تۆ دەفەرمووی شاعیرێکی ئایینی، مەبەستمان لەمە چییە؟ ئایا مەبەستمان ئەوەیە کە، بۆ نموونە، نالی شاعیرێکە تەواوی شیعرەکانی لە خزمەت ئاییندایە یان شاعیرێکە سەرلەبەری ئاخێزگە و سەرچاوەی مەعریفەی شاعیرانەی ئایینە یا نالی شاعیرێکە کە لە بنەماوە ویستویەتی ئایین ببێت بە تەوەری سەرەکی هەموو هەڵوێست و تێڕوانین و بیرۆکە شیعرییەکانی.

**کۆچ:** ئایا نالی لەناو ئەم سەرچاوە مەعریفییەدا توانیویەتی بڕواتەدەرەوە؟

**عەبدولخالق یەعقووبی:** ئەمە زۆر پرسیارێکی ورد و کوردگوتەنی مشتومڕهەڵگرە. گەر بمەوێت زۆر بەڕاشکاوی قسەبکەم، دەڵێم نا" نالی بە هیچ شێوەیەك ناتوانی لەنێو گوتاری بەربڵاوی ئایینی بێنێتەدەرێ" بە مەعنای ئەوەی بڵێی نالی شاعیرێك بووە، بۆ نموونە، سیکۆلار بووە یان لانیکەم بۆچوون و تێڕوانین و جیهانبینییەکی سیکۆلاری بووە. نا، نالی هەم بەپێی کەسایەتیی خۆی وەکو شاعیر، وەکو تاکەکەس، هەم بەپێی ئەو مەعریفانەی کە بۆم باسکردی، پشتیپێیانبەستووە، هەمیش بەپێی ئەو گوتارە باوەی سەردەمی خۆی کە لە شیعری کوردی و تەنانەت لە شیعری کلاسیکی فارسی و عەرەبیدا بوونی هەبوویێت، نەیتوانیوە شاعیرێکی سیکۆلار بێت. هەر ئەم قسەیەش بۆ نالی ڕاستدەبێت کە بڵێین نالی نەیتوانیوە شاعیرێکی ناسیۆنالیست بێت، چونکە لەڕاستیدا ناسیۆنالیزم بۆئەو سەردەمەی نالی لە وڵات و لەپانتایی جوگرافیای کوردستاندا هێشتا سەریهەڵنەدابوو" هێشتائیرادەیەك نەبوو لەناو کۆمەڵانی خەڵك تابیانەوێت حکومەتێکی نەتەوەیی کوردی دابمەزرێت. ئەوە هەرهیچ کە بەبڕوای من ئەم بۆچوونە بۆ خانی هەر لەبنەڕەتەوە هەڵەیە کە گۆیا خانی یەکەم ناسیۆنالیستی کورد بووە. پێموایە ئەمە تێزێکی لە رەگوڕیشەوە هەڵەیە، بەڵام ئەوەی کە بەڕێزت دەپرسیت ئایا نالی شاعیرێکی ئایینیبووە، من دەڵێم بەڵێ، نالی شاعیرێك بووە لەناو ئەو پانتاییە بەربڵاوەی گوتاری ئاییندا کاریکردووە. بۆ؟ چونکە ئەگەر سەرنجبدەی جیهانی شیعری نالی پڕاوپڕە لەو ئیماژ و ئاماژانەی کە لە ئایینەوە وەرگیراون و لە هزری ئایینییەوە هەڵدەقوڵێن. تۆ بڕوانە ئەم نموونەیە:

**ئەی جیلوەدەری حوسن و جڵەوکێشی تەماشا**

**سەرڕشتەیی دین بێمەدەدی تۆ نییە حاشا**

ئەم شیعرە کە دەزانی دەسپێکی دیوانە شیعرەکەی نالییە، نیشاندەدات کە نالی شاعیرێکە لە چوارچێوەی گوتاری ئاییندا کاردەکات، بەڵام بابێینەوە سەر خەت و بگەڕێینەوە سەر پرسیارەکەی یەکەمت و بڵێین، ئەی باشە نالی شاعیرێك بووە کە لە چوارچێوەی گوتاری ئاییندا کاریکردووە و ئاگاداربە هەر ئەمەش بۆ حافیز و زۆر شاعیری کلاسیکی گەورەیتری رۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەشێوەیەك زۆر راستە، بەڵام پرسیارە جیدییەکە لێرەدا لێمانقوتدەبێتەوە کەچی لە شیعری نالیدا هەیە یان کراوە کە دواجار وایلێدەکەن شیعرەکەی جوان و چێژبەخش و بەرهەمهێنی مەعریفە و روانینی نوێی شاعیرانە بن؟ باشە نوێ و ناوازەبوونی جیهانی شیعریی نالی بۆ من کە لە سەدەی بیست و یەکەمدا دەژیم و تاسەر ئێسك لەسەر باوەڕی ناسیۆنالیستی و سیکۆلاریستیی خۆم سوورم لەچیدایە؟ بە باوەڕی من، وەڵامی ئەم پرسیارانە بەجۆرێك لە جۆرەکان دەگەڕێتەوەسەر ئەو تازەگەری و نوێگەراییانەی کە نالی لە چوارچێوەی ئەو گوتارە باو و بەربڵاوەدا کە ناوی ئایینپەروەرییە کردوویەتی.

بۆ نموونە، بائاوڕێك بدەینەوە لەوشێوە تازەخوازییەی کە نالی بە نیسبەتی مانا و چەمکە باوەکانی سەردەمی خۆی لە جیهانی شیعریی خۆیدا بەدیهێناوە. ئەو مەعریفە باوەی کە بەسەر سەردەمەکەی نالیدا زاڵبووە و زۆربەی شاعیرەکانی دەوروبەری نالی و هاوسەردەمی نالی رەچاویانکردووە ئەوەیە کە توانایی خۆیان لە بواری شیعری فارسی و عەرەبیدا بنوێنن. واتە وەك چۆن ئێستا کەسێکی ئەکادیمی دەسەڵاتی لەوەدایە کە پشت بەسەرچاوەگەلی ئینگلیزیی نوێ ببەستێت بۆئەوەی کاری ئەکادیمیی جیدی و جێیمتمانە و لەهەمانکاتدا شایانی رێزبکات. لەڕاستیدا ئەمە مەعریفەیەکی باوە و سەردەمەکە ئەوە دەخوازێت، تائەوەی کەسی ئەکادیمی بێت و پشتی بە سەرچاوەی عەرەبی یا فارسی یا تورکی ئەستووربێت. سەردەمی نالیش شتێکی لەو بابەتە بووە" واتە شاعیران دەسەڵاتی خۆیان لە تاقیکردنەوەی شیعری عەرەبی و فارسی و تورکیدا بەڕاستی بەباو و بەباشزانیوە، بەڵام نالی هاتووە لەزۆر جێگادا خەریکە بەپێچەوانەوەی ئەم رەوتە قسەدەکات، بەبڕوای من، هەتائەگەر ئەمە بەشێوەیەکی ناخودئاگاش لە هەناو و

نەستی نالیدا بێت، خەریکە بناغەی مەعریفەیەکی نوێ سەبارەت بە زمانی کوردی و گوتاری شیعری کوردی سازدەکا. ئەویش ئەوەیە شیعری کوردی نووسین و شاعیری کورد بوون بە زمانی کوردی نەك هەر عەیب نییە، بەڵکو بەپێچەوانەوە دەبێتە مایەی شانازی. نالی لەشیعرێکیدا دەڵێ:

**تەبعی شەککەرباری من کوردی ئەگەر ئینشادەکا**

**ئیمتیحانی خۆیە مەقسوودی لەعەمدا وادەکا**

تۆ لەم دێڕە شیعرەدا سەرنجدەدەی، یەکەم باسی شەککەرباربوونی تەبعی خۆی دەکا کە دیارە مەبەستی ئەو شەککەرباربوونەیە بە زمانی کوردی و بەتایبەتی پێداگری لەسەر کوردیبوونی ئەوجۆرە ئینشا و دارشتنەی خۆی دەکا و خەریکە باس لەوەدەکا کە خۆی تاقیدەکاتەوە لەو مەیدانەدا. واتە جۆرێك لە بەرەنگاربوونەوەیە لەنێو مەیدانەکە. دواجار خەریکە ئەم کارە بەپێی پلان و بەرنامە دەباتبەرێوە" پرۆژەیەك لەمێشکیدایە" ئەمە، بە بڕوای من، بەس ئەوە نییە کە نالی خەریکە نییەتی خۆی و پەیامی خۆی بۆ خوێنەرەوەی خۆی ڕووندەکاتەوە، بەڵکو بەشێوەیەکی ناخودئاگا خەریکە بەردی بناغەی پرۆژەیەك دادەنێ بۆئەوەی کە کورد شانازی بە هزر و زمان و زێد و نیشتمانی خۆی بکات. دواتر دەڵێ:

**یا لە مەیدانی فەساحەتدا بە میسلی شەهسوار**

**بێتەئەموول بەو هەموو نەوعە زوبانی رادەکا**

کاتێ نالی باس لە شەهسەواربوون دەکا، بەجۆرێك لە فەخر و شانازیکردندایە" کاتێك کە باس لە مەیدانی فەساحەت دەکا، واتە لەو مەیدانەدا رکابەر هەیە کەسانێك هەن باس لەوەدەکەن کە شیعری کوردی نووسین لەوانەیە زۆر هونەر نەبێ، وەلێ نالی باس لەوەدەکا لەو مەیدانەدا شەهسوارە کەسێکی باڵابەرزە و دواتر باس لەڕاکردنی زمانی دەکا، واتە ئەوەی کە زمانی ئەو لە حاڵەتێکی راوەستاوی و مەندی و مردوویی زۆر بەدوورە. لەهەمانکاتدا کە زیندووە و جووڵەدەکا، لە رکابەرەکانی خۆشی پێشدەکەوێ. جابۆیە بە بڕوای من نالی لێرەدا

دیسان ئەو مەعریفە باوەی سەردەمی خۆی هەڵدەوەشێنێتەوە کە پێیوابوو زانایی لەوەدایە کە بە زمانی نەتەوەی باڵادەست یان دینی باڵادەست بنووسرێت. تکایە با ئاگاداری ئەوە بیت کە من باس لە بارودۆخی کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری و کولتووری سەردەمی نالی دەکەم، واتە جەرگەی سەدەی نۆزدە لە کوردستان. ئەوەت بۆیە وەبیردەهێنمەوە، بۆئەوەی خوێنەرەوە لە زەمینەی کۆمەڵایەتیی ئەو دابڕانەی لەمەڕ نالی باسیدەکەم دانەبڕێت و بزانێت لادان لە مەعریفەی باوی ئەو سەردەم بەڕاستی کارێکی هەر وا سانا و سەرەپێیی نەبووە و بوێری و زانایییەکی فراوان و بێسنووری پێویستبووە.

نالی دواتر بەردەوامدەبێ و دەڵێ:

**کەس بە ئەلفازم نەڵێ خۆ کوردییە خۆکردییە**

**هەرکەسێ نادانئەبێ خۆی تاڵبی مەعنادەکا**

لێرەدا نالی، بە بڕوای من، جارێکیدیکە دەگەڕێتەوەسەر ئەو ناوەندەی کە پێداگرتنەکەی لەسەر کوردیبوونە، واتە راستە کە دەڵێن من بەرامبەر ئێوە راوەستاوم و شیعر بە زمانی کوردی دەنووسم، بەڵام پێتانوانەبێ کە تەنها شانازیی من ئەوەیە کە بە زمانی کوردی دەمەوێ بنووسم و بۆ نموونە گرنگی نەدەم بە زمانی عەرەبی یان فارسی یان تورکی، بەڵکو ئەم کوردیبوونە هاوشانە بە خۆکردیبوون، واتا شیعرەکەم خۆماڵی و جوانە" دەستکرد نییە و لەسەرچاوەی کوردییەوە پاراوە.

**کۆچ:** یان هەر ئەوەش نییە کە خۆکردییە بە مانای زۆرکردنی تیانییە لەزماندا، زمانی کوردی دەسەڵاتی ئەوەی هەیە شیعری بەمجۆرەی پێبنووسرێت؟

**عەبدولخالق یەعقووبی:** بەدڵنیاییەوە و بەتایبەت ئەوەی کە دواجار تانەیەکیش لە رکابەرەکانی دەدا و دەڵێ ، ئەگەر ئێوە زانابن، دێن لەهەموو ئەو شتانەی من دەیڵێم ماناوەردەگرن، نەك هەر لە شیعری من وەکو دەقی شیعری مەعنا وەردەگرن، بەڵکو لە هەڵوێستی منیش سەبارەت بە مانا دەبێ تێبگەن کە من، واتە نالی، مەبەستم چییە. دیارە ئەم شیعرە بەردەوامدەبێ تادەگاتە ئەو شوێنەی کە دەڵێ:

**شیعری خەڵقی کەی دەگاتە شیعری من بۆ نازکی**

**کەی لەدیققەتدا پەتک دەعوا لەگەڵ هەودا دەکا؟**

واتە باس لەوە دەکات کە نووسین بە زمانی کوردی و خولقاندنی شیعری کوردی بە زەریفی و ناسکی و لەتافەتی هەودایە" نالی نەك هەر گرنگییەکەی سەبارەت بە هەڵوێستی بۆ نووسینی شیعری کوردی، بەڵکو سەبارەت بە ئەو بۆچوونەشێتی لەئاست سەنگینی و زەنگینیی زمانی کوردی. کەوا، لەئەوەشدا دیسان دەتوانی زۆر سەرچاوەی جوانیناسی لە شیعری نالیدا بدۆزینەوە.

**کۆچ:** دوو پرسیارم لا دروستبووە، ئەگەر بگونجێ تێکەڵبکرێ، ئەگەرنا بەجیا. ئایا ئەم بۆچوونەی ئێوە کە بەرامبەر وەستانەوەی نالی بەرامبەر بە شیعری عەرەبی و فارسی و ئەو دەسەڵاتە باوەی کە ئەم دوو کایە رۆشنبیرییە لەو دەمەدا زاڵ و باوبوون، لێرەدا تێبینی ئەوەمکرد ئایا ئەمە پێچەوانە ناوەستێتەوە کە نالی بۆ خۆی لەناو شیعرەکانیدا باسی ئەوەتکرد، یەکێك لە کانگا مەعریفییەکانی ئەم دوو سەرچاوەیەیە، بەتایبەت ئایا ئەمە دژ ناوەستێتەوە؟ دواتریش من ویستم پرسیاری ئەوە بکەم کە ئەم خۆ باڵاکردنە، ئەم پیاهەڵدانە زۆرە ئایا تەنها بۆ نالی خۆی دەگەڕێتەوە یان بەجۆرێك باڵاکردنی کورد و زمانی کوردییە کە لێرەدا دەڵێت: فارس و کورد و عەرەب هەرسێم بەدەفتەرگرتووە.. ئەمە مەبەستی چییە؟

**عەبدولخالق یەعقووبی:** هەردوو پرسیارەکە زۆر جوان و جیدین. لەبابەت پرسیاری یەکەمت، من وەك باسمکرد هەموو شاعیرێك و هەموو داهێنەرێك ناتوانێ لەو گوتارە مەعریفە زاڵ و باوانەی کە لەسەردەمی خۆیدا هەن یا لە سەردەمی پێش خۆیدا هەبوون رزگاربکات، چونکە هەموو داهێنەرێك بۆ پڕوپاراوترکردنی جیهانی بەرهەمەکانی خۆی پێویستە پشت بە کۆمەڵێك سەرچاوە ببەستێت. نالیش وەك هەموو شاعیرێکی زیرەك و زانا لەسەردەمی خۆیدا ئەوەیکردووە، واتە بەڕاستی شیعری کلاسیکی فارسی ناسیوە و لەو دەستنووسەی کە بۆمباسکردیت، هەندێ سەرنج لەسەر شیعری خافز دەردەبڕێت کە پێموایە زۆربەی فارسەکانیش

ئاوا حافزیان نەناسیوە، بەڵام ئەوەمان لەبیرنەچێت تۆ کاتێك کە خەریکی پشت بە مەعریفەیەك دەبەستی، ئەگەر مرۆڤێك بیت کە خاوەنی تێڕوانینێکی رەخنەگرانە نەبیت، لەو مەعریفەیەدا دەتوێیتەوە و دەبیتە بەشێك لەو مەعریفەیە و خاوەنی ئەو ناسنامەیەی کە ئەو مەعریفەیە دواجار بەرهەمیدەهێنێت ، بەڵام ئەگەر خاوەنی هەڵوێست بیت، خاوەنی سەرنج و تێبینیی رەخنەگرانە بیت، ئەوکات تۆ هەم پشت بەو مەعریفەیە دەبەستیت، هەمیش بۆ رزگاربوون لە هەیمەنە و دەسەڵاتی ئەو مەعریفەیە رێگایەکان دەپشکنی و دەدۆزیتەوە. ئەوەدەم فێردەبیت چۆن خۆت بیت و چۆن ناسنامەی نوێی خۆت، بە مەعریفەی نوێوە، لەسەر بنەمایەکی تازە و بە ئاوڕدانەوەیەك لە ئەو ناسنامە و مەعریفە پشتپێبەستووەت چێبکەیت.

نالی بۆ دروستکردنی کیانێك لەنێو جیهانی شیعری کوردیدا لە مەعریفەی باوی سەردەمی خۆی تێپەڕاندووە، بەڵام لەهەمانکاتدا ئاوڕیشی لەو مەعریفە داوەتەوە کە مەعریفەی باوی زەمانی خۆی بووە، ئاگاشی لەو مەعریفەیە بووە کە تێیدابارهاتووە و راهاتووە. نالی بەبەردەوامی لەشیعریدا موفرەداتیواژەیی، ئیماژی شیعری، بیرۆکە، تەنانەت زۆرجار بابەت لە شیعری کلاسیکی فارسی وەردەگرێ" هەتا هەندی دێڕی وەك خۆی لە عەرەبی و فارسییەوە وەردەگرێ، بەڵام دەبینی لە سەرتاپای دیوانە شیعرییەکەیدا یەك رستە نابینی کە لەڕێزمانی زمانی کوردی وسروشتی رستەی کوردی و چێشکەی مرۆڤی کورد دەربچێت. واتە بەپێچەوانەی زۆر شاعیر و نووسەری سەردەمی ئێستامان کە ئەو خەزێنە گەورەیەمان لە ئەدەبیاتی کوردی و دنیا لەبەردەستە کەچی دەبینی زۆرجار لە دروستکردنی رستەیەکی کوردیدا دۆشدادەمێنین. دەی باشە نالی لێرەدا بە من دەسەلمێنێ کە ئەو لە مەعریفەیەکی زمانی عەرەبی، مەعریفەی تێفکرینی ئایینی کەڵکیوەرگرتووە، بەڵام لەکۆتاییدا بەرهەمێکی کوردی خستۆتە بەردەستی خوێنەری خۆی. پێموایە ئەو دژوازییەی کە بەرێزت باسی دەکەیت بوونی نییە، واتا نالی نەتواوەتەوە لەنێو ئەو مەعریفانەدا، بەڵکو بەپێچەوانە، هەڵوێستی لەبەرامبەریاندا بووە. هەرچەند قسەی بەرێزت رەنگە لەورووەوە تارادەیەك وەراستبگەرێت کە لە هەندێك جێگادا، وەکو دنیای شیعریی هەموو شاعیرێك کە هەوراز و نشێوی تێدایە، نالیش تووشی کۆمەڵێك کەمایەسی هاتووە کە هیوادارم پاشان وەك رەخنەیەك لەسەر شیعری نالی ئاوڕێکیان لێبدەمەوە و ئاماژەیەکیانپێبکەم.

سەبارەت بە پرسیاری دووەمت دەربارەی بەردەوام ئاماژەکردنی نالی بەناوی خۆی و هەڵکەوتە نیشاندانی خۆی، وەك لەم نموونەیەی خوارەوەدا دیسان هەستیپیدەکرێ، چەند تێبینییەکم هەنە:

**بێتە حوجرەم، پارچەپارچەی موسودەم بکرێ بەرۆح**

**هەر کەسێ کوتاڵ و پارچەی بێبەدەڵ سەودادەکا**

ئەگەر ئەم پرسیارە بەجۆرێك لێکبدەینەوە کە لەئاستی هەڵسەنگاندنی دەرونناسیی نالی بێینەدەرێ، چونکە ئێمە نالیمان لەبەردەست نییە بمانەوێ وەکو کەس شیکاریی دەروونناسیی بۆبکەین، بەڵام بچینەسەر دەروونناسیی دەقی شیعری نالی، واتە شرۆڤەیەکی دەروونناسی بۆ دەقی شیعری نالی بکەین و بزانین بەڕاستی نالیدەتوانێ چ و چەند مەبەستی هەبێ لەوەی کەوا بە ژمارەیەکی زۆر و بەرچاو، زۆریش بە شێوەیەکی جوان باس لە تاوی خۆی و نیشانی خۆی دەکات و بەردەوام دووپاتی دەکاتەوە. یەکیان ئەو شتەی لە خوێندنەوەکەی خۆتان باستانکرد" نالی لەوەی کە بەردەوام ئاماژە بەناوی خۆی دەکات، ڕاستە لەوانەیە بەپێی سەردەمی خۆی تۆ وایبخوێنیتەوە خەریکە باسی شەخسییەتی خۆی دەکات، بەڵام ئێمە لەبیرماننەچێت شاعیری گەورە باشدەزانێت ڕۆژگارێك خۆی وەك تاکەکەس نامێنێتەوە و ئەوەی دەمێنێتەوە شیعرەکەیەتی. بۆیە کە تۆ دەبینی نالی لەهەر شوێنێك باسی خۆی دەکات، بێگومان لەپەنای ئەوە باسی زمانی خۆشی کردووە، واتە خۆی وەکو شەخس لە زمانی خۆی وەکو کورد جیانەکردووەتەوە. بۆیە من ڕام ئەوەیە و لێرەدا لەگەڵ ئەو بۆچوونەی تۆ یەکدەگرمەوە کە نالی مەبەستی تەنها خۆی وەکو شەخس نەبووە، هەتائەگەر ئەوەش تەنها مەبەستی بووبێ، بە بڕوای من مافی خۆی بووە، چونکە کەسێکی داهێنەر ئاسودەدەبێت و هەست بەخۆشی دەکات، کاتێك کە شانازی بە ئەو شتە بکات کە دەیخوڵقێنێ، بەڵام نالی وەکو لەو نموونە شیعرییەی هێنامەوە، خودی خۆی لە زمانی کوردی و لە داهاتووی زمانی کوردی و داهاتووی شیعری کوردی و گوتار دروستکردن بۆ شیعری کوردی جیاناکاتەوە. هاوکات نالی ئەوەی باشزانیوە ئەو شتانەی کە دەیڵێ و دەیکات لەسەردەمەکەی دا، لەو سەردەمە کورتەی کە ژیانی خۆی تی دابەسەربردوە، جێینابێتەوە و لەوانەیە تەنانەت ببێتە مایەی چەرمەسەی و سەئێشەش بۆی، وەك چۆن

لەڕاستیشدا بوو. ئەوە داهاتووە کە نالی زیندوو رادەگرێ و ئامێزی رێزی بۆدەکاتەوە و بە قەدر و قیمەتی نوێخوازی و جەسارەتەکانی دەزانێ. بۆیە من پێموایە ئەگەر تۆ بەشێك لە شیعرەکانی نالی بۆ غروروی شەخسیی خودی نالیدەگەڕێنیتەوە، لەو ئاستەدا کە نالی شانازی بەوەکردووە کە خۆی وەکو شاعیرێکی باڵادەست و توانا نیشانبدات، بە بڕوای من ئەوە ئاساییە، بەڵام دەبێ بەشێکی زۆری ئەو بابەتە والێکبدەینەوە کە نالی زیرەکانە نەخشە رێگایەك بۆ شیعری کوردی و گوتاری شیعری کوردی دروستدەکات و باسی ئەوە دەهێنێتەئاراوە تائێستا، واتە تاسەردەمی نالی، ئێمە نەمانتوانیوە بە کوردی بنووسین و نەمانتوانیوە نووسین بە کوردی بە شانازیی خۆمان بزانین، ئەوە من، واتە نالی، دەیکەم و لەوانەیە لە داهاتوشدا هەربەوشێوەیە بێت.

**کۆچ:** دوو سەرنجیتر، یەك لەوانە تایبەت بەم پرسە، وەکو کورد لەبەرامبەر دەسەڵاتی ئەوودەمی فارس و عەرەب و تورکەکاندا دەرکەوتووە، لێرە ئەم بەرزکردنەوەیە، لەڕێگەی بەرزکردنەوەی زمان و شیعرو.. نەبووەتە خزمەتکردنی سیاسەت. دووەمیان، شەرمنەکردن، بۆ نموونە ئێستا رەنگە لە لای زۆر شاعیری دی ئەم حەزە هەبێ کە خۆی دەربخا، بەڵام شەرمدەکا، وەك چۆن دەڵێی ئێستا باونییە، بەڵام ئایا ئەمە جۆرێك لەباوبوونییە، بۆیە نالیش نەیتوانیوە لەم باوبوونە بێتەدەرەوە، هاوکات شەرمیشینەکردووە لەوەی کە بە لایەوە ئاساییبێت ناوی خۆی بە شانازییەوە بێنێت؟

**عەبدولخالق یەعقووبی:** لە بابەت سەرنجی یەکەمت بەڕاستی من پێموایە راستیتیدایە، واتە پێموایە لە مێژووی مۆدێرنی کوردیشدا ئەمە بەڕاستیوایە، شاعیران و داهێنەرانی کورد ئەوەی کە دەیخوڵقێنن بەشێکی زۆری خەریکە پەرچەکردارێك دەنوێنن، سەبارەت بەوەی لە ژیانی رۆژانە و لەو جیهانەی کە بەسەریاندا زالە، لە بواری سیاسەتدا، ئەوەی کە تۆ باستکرد، بوونی هەیە. واتە نالی لەڕێگای شیعری

**قوربانی تۆزی رێگەتم ئەی بادی خۆشمروور**

**وەی پەیکی شارەزا بەهەموو شاری شارەزوور**

لێرەدا ئەوەی کە نالی خەریکە نەخشەی شارێکمان جارێکیدی بۆ سازدەکاتەوە، لەڕاستیدا بۆ پاراستنی ئەو هاوسەنگییەیە کە شاری سلێمانی لە ئاستی دەسەڵاتی سیاسیدا نەیماوە. نالی خەریکە لەنێو شیعری خۆیدا و لەڕێگای گوتارێکی شیعرییەوە دەسەڵاتێکی سەربەخۆ بە کوردایەتی و بە نیشتمانپەروەری دەدات کە ئەو دەسەڵاتە سەربەخۆ سیاسییە لەئاستی واقیعدا چیترنەماوە و ئیتر تێکڕووخاوە. نالی بۆچی ئەو هەڵوێستە گەورەیە دەگرێت سەبارەت بە نیشتمانپەروەریی خۆی کاتێك کە رێگای غوربەت دەگرێتەبەر؟ چونکە میرنشینی بابان شیرازەکەی هەڵوەشاوەتەوە و بڕبڕەی پشتی دەسەڵاتی خۆجێی کورد تێکشکاوە. بۆیە نالی خەریکە ئەوەی کە لە جیهانی واقیعدا تێکڕماوە، لە جیهانی زمانی خۆیدا بنیادیدەنێــتەوە" ئەو خەونەی کە دەیویست لەئاستی سیاسیدا بۆ دەسەڵاتێکی کوردیی میرنشینێکی کورد بێتەدی و نەك هەرنەهاتەدی، بەڵکو بوو بە مۆتەکەی داگیرکرانی زێد و شارەکەشی، خەریکە لەنێو دەسەڵاتی جیهانی شیعریی خۆیدا چێدەکاتەوە. بۆیە من پێموایە ئەو سەرنجەی تۆ جوانە و دەتوانێ بەشێك لە شیکردنەوەی بابەتەکە بپێکێت، بەڵام لە مەسەلەی شەرمکردن و شەرمنەکردنەکەدا من پێموایە ئەو مەسەلەیە نەهێنینەوەسەر ئاستی دەروونناسیی شەخسیەتی شاعیرەکە" هەرچەندە بێگومان ئەوەش کاریگەریی خۆی هەیە. ئێمە ئێستا وەکو خوێنەرەوەیەکی سەدەی بیست و یەکەم، ئەو شتەی لە بەردەستماندایە دەقی شیعری نالییە، بەڕاستی نە لە میزاجی نالیدەزانین کە وەکو شەخس خاوەنی چ چێشکە و میزاجێك بووە، نە لەو پاڵنەرە دەرونییانەی ئاگادارین کە پاڵیان بەوەوە ناوە بۆ هەڵسوکەوتەکانیان لە چەشنی ئاماژەی بەردەوام بەناوی خۆکردنی، بەڵام ئەوەی کە لە دەقی نالیدا بە بڕوای من جێگەی خوێندنەوەیە، ئەوەیە کە نالی ویستویەتی ئەو شتەی کە شاعیرانی سەردەمی خۆی نەیاندەتوانی شانازی پێبکەن یا زانایی، زیرەکی و ئازایەتیی ئەوەیان نەبوو کە بڵێین ئێمە بە زمانی زگماکی خۆ، واتە کوردی، دەنوسین، پێچەوانەبکاتەوە و زمانی کوردی بەشایانی شانازیپێکردن بێنێتەئەژمار. نالی ئەو بیرۆکەیە بڵاودەکاتەوە کە نەك هەر شیعرنووسین، بەڵکو نووسینی بە زمانی کوردی جێگەی ئەوەیە بکرێتەمایە و هەوێنی شانازی.

**کۆچ:** باسی جۆرێك لە هەڵوەشاندنەوەی ئەو پێکهاتەیەمان کرد، بابڵێین ئێوە ئاماژەتانپێکرد لەڕووی مانابییەوە، دیارە ئەم هەڵوەشاندنەوەیە پێویستی بە زمانە، لێرەوە

ئەمەوێ پرسیار لەسەر زمان لە شیعری نالیدا بکەم. رۆڵی نالی لە چێکردنی زمانی کوردی دا چۆن هەڵدەسەنگێنن؟

**عەبدولخالق یەعقووبی:** یەکەم ئێمە کە دەڵێین زمانی نالی و چێکردنی زمان لای نالی، دیارە مەبەستمان زمانی شیعرییە، چونکە نالی شاعیربووە و ئەگەر بەرهەمهێنی گوتارێك بووبێت یان خەریکی پێکهاتەهەڵوەشێنییە لەنێو ئەو گوتارە باو و ئەو چەمك و مەعریفە باوانەی باسمکرد، دیارە ئەمە لەرێگای زمانەوە بووە. لەبەرئەوە ئەمە پرسیارێکی گرنگە، بەڵام ئەگەر لە شێوازی ئەو پێکهاتە هەڵوەشێنییە لەنێو زمانی دا پرسیاربکەین، پێموایە باشتروایە لەرێگەی نموونەوە بچینەپێشێ. بۆ نموونە، دوو قەسی دەی نالی هەن کە بە بڕوای من، زۆر دژبە مەعریفەی باوی ئەو سەردەمەن و تەنانەت دژبە مەعریفەی باوی ئێستەیە کە یەکیان ئەو شیعرەیە کە لە خەونەکەی خۆی لەمەڕ مەستوورە دەدوێت کە من خۆم ناسنامەی ئەو قەسی دەیەم لەم دێڕەدا کورتکردووەتەوە: "تەحریری خەوی مەستوورە لە خەیاڵی نالیدا":

**مەستوورە کە حەسناو و ئەدیبە بە حیسابێ**

**هاتەخەوم ئیـشەو بە چ نازێك و عیتابێ**

ئەویتریان ئەو قەسی دە شازەیە کە لەسەر "کەر"ەکەی نووسیویەتی. کاتی خۆی و لە کتێبی "لە کولتوورەوە بۆ ئەدەبیات"دا لەسەر قەسی دەکەی نالی لەسەر مەستورە بابەتێکم بە تێروتەسەلی هێنایەبەرباس. بیرۆکەکەم ئەوەبوو کە نووسین لەسەر شتی ناحەز یان لانیکەم ئەو شتەی کە رای گشتی پێیناحەزە، بەمانای ئەوەنییە خودی دەقەکە شتێکی ناحەزبێ. لەم وتارەدا باسی ئەوە دەکەم نالی لەم قەسی دە بوێرانەیەیدا نەك هەر دژی مەعریفەی باوی سەردەم وەستاوە، بەڵکو خەریکە لەسەر ئەو شتانەی لای کۆمەڵگا ناحەزن و تابوون و حەرامن و نابی دەستیان بۆبردرێن، خەریکە شیعر دەخولقێنێ و بەرهەمێکی جوانیناسانە بەرهەمدێنێت، با ئەو بەرهەمە لە باری مانا و ناوەڕۆکەوە بە دڵی هەندێ لایەن نەبێت و چەند ئای دیالۆژییەکیش ئەم وەسف و وێناکردنانە بە تێپەڕینی هێڵی سوور لەقەڵەمبدەن.

لەسەر نموونەی قەسی دەی کەرەکەی، من پێموایە نالی ئەو پێکهاتەهەڵوەشێنییە کە لە مانای باوی سەردەمی خۆی کردووە، واتە رێزێکی مەعریفەناسانە سەبارەت بە حەیوان لەنێو کۆمەڵگای کوردی دەهێنێتەگۆڕێ کە بەهیچ کلۆجێك باونەبووە و ئەگەر کفریش نەبووبێت لانیکەم باوی دینداری نەبووە، بەتایبەتی کە کەر ئاژەڵێکە کە لە کتێبە ئاسمانییەکاندا، بەپێچەوانەی فیل و وشتر و قۆچ و چێل، نەك هەر خاوەنی کەسایەتی نییە، بەڵکو بە دەنگناخۆش و ناقۆڵاش ناویزراوە. نالی لەم شیعرەدا هەولێداوە بەپێچەوانەی رەوتی باوی گوتاری باڵادەست هەنگاوبنێت و لە جیهانی شیعریی خۆیدا پێگەیەکی جیاواز و شازی بە کەر داوە. دیارە ئەم ئەرکەی لەرێگەی زمانەوە راپەڕاندووە. بۆ نموونە، سەرنجبگرە مۆسیقای ئەو شیعرە کە مۆسیقایەکی هێندە نەرم و رەوان و ئارامیبەخش و خۆشیهێنی هەیە کە تۆ هەستناکەی لەگەڵ ئەو تێبینییەی کە مرۆڤی کورد، بەعام، سەبارەت بە کەر هەیەتی یەکبگرێتەوە. واتە نالی زیرەکانە لە مۆسیقای زمانی خۆی دا جۆرێك بەرزێتی و زەرافەتی بە جەسلە و بە بوونی کەر بەخشیوە وەك بڵێی خەریکە ناسنامەیەکی نوێ بۆ بوونی کەر چیدەکات.

**هەی کەرێکم بوو، چ پەیکەر؟ تەیکەری هەوراز و لێژ**

**سینەپان و مووچەکورت و شانەبەرز و گوی درێژ**

هەستدەکەیت لێرەدا مۆسیقایەکی دڵنشین وەکو نەرمەشەپۆلێك هەڵدەستێ و دەنیشێتەوە" هەستدەکەیت نالی خەریکە باسی شتێکی زۆر رۆمانسییانە و عاشقانە دەکات، واتە مۆسیقای شیعرەکە مۆسیقایەکی زۆر سۆزدارانەیە و لێوڕێژە لە دڵنەوایی و لاواندنەوە، زۆر نەرمونیانە. لەکاتێکدا بابەتی ئەو شیعرە کەرە، ئەو کەرەی کە لە چاوی عەقڵی گشتیدا تەنیا بابەتی بارکردن و سواربوونە. لەهەمانکاتدا تۆ سەرنجبدە ئەو لەفز و مۆسیقایەی لە هەڵبژاردنی سەروای شیعرەکەدایە، لێژ، درێژ، گێژ.. دەبینی چەند سەروایەکی رەزاسووکە. ئەو ێژه لە زمانی کوردیدا زۆر نەرم و لەسەر زمان خۆش و لەسەرخۆ و ئاسودەییبەخشە و لەگوێچکەی بیسەر گرنناییێ. شتێکیتر تۆ سەرنجبدە..

**کۆچ:** مامەڵەکردنێکی بوونەوەرانەشە..

**عەبدولخالق یەعقووبی:** بەدڵنیاییەوە. نالی لەم شیعرەیدا دەڵێ کەر، بەڵام وەکو ئەوە وایە لەگەڵ ئینساندا قسەبکات، بەتایبەت لە دێڕی کۆتاییدا راستەوخۆ باسی ئەوەدەکات و دەڵێت:

**چەندە پێمخۆشبوو زمانی حاڵی دەیوت نالیا**

**هەردوو حەیوانین دەتۆ گوێکورت و ئەمنیش گوی درێژ**

نالی ناڵێت هەردوو ئینسانین، نایەت کەرەکەی بێنێـتە ئاستی ئینسان، بەڵکو خۆی دەباتە ئاستی حەیوانەکەی. واتە ئەوە ئینسانە کە دەبێ لە پێگەی ئینسان بوونی خۆیوازبێنێت و بگات بە پلەی حەیوانبوون.. با شتێکیتریش بڵێم. نالی کاتێ باسی ئەوەدەکات دەڵێ 'هەی کەرێکم بوو' مەبەستی ئەوەیە ئێستائەو کەرە نەماوە یان لانیکەم لای ئەو نەماوە، بەو وەسفە زۆر شیرین و ناسك و مۆسیقا دڵنشینەی کە لەشیعرەکەیدا هێناویەتی، پێموایە نالی خەریکە جۆرێك شینگێڕی بۆ کەرەکەی دەکات، ئەو کەرەی زۆر جوان و چاك و شیاوبووە و ئێستا نەماوە. ئەمە سەرنجێکە پێموایە تائێستا کەس باسینەکردووە، بەڵام من بۆچوونم ئەوەیە کە نالی لێرەدا خەریکە شینگێڕی دەکات، نەك بەس بە شیوەن و لالانەوە و پاڕانەوە، بەپێچەوانەوە، بەشێوەیەکیتر، بە دروستکردنی فەزایەکی جوان و هەوایەکی دڵکەش، واتە جۆرێك لە شینگێڕی بۆئەو کەرەی لە یادی نالیدایە، شینگێڕییەکە بۆ یادکردنەوەی کەسایەتییەکی زۆر شیرین و شاز. ئەوەی نالی لەرێگای زمانی داهێنەرانەی خۆی لەو شیعرەدا کردوویەتی پێشەکییەیەکە بۆ ئەوەی بەرەنگاری مەعریفەی باوی سەردەمی خۆی بێتەوە. واتە نالی لێرەدا زمانی لەتیف و زەریف و ناسکی خۆی بۆ وەسفی کەرێك بەکاربردووە کە ئەگەر دیسان لە ئاستی تێکستەکەوە (دەق) بێینە ئاستی دیسکۆرس (گوتار)، دەتوانین بڵێین خەریکە پێکهاتە و گرێچنی مانا و مەعریفەیەکی باوی سەردەمەکەی خۆی هەڵدەوەشێنێتەوە.

**کۆچ:** لەنووسینێکتدا لە کتێبی "لە کولتوورەوە بۆ ئەدەبیات" باسی گۆڕینیواژە بە واژەیەکیدی دەکەن کە ئەمە بە نەکردە دادەنێن بۆ شیعرەکانی نالی، واتە گەر دوو وشەی

هاومانامان هەبێ ناتوانین لەبرییەکدی داینێین، چونکە بە قیمەتی تیاچوونی سەرتاپای شیعرەکە تەواودەبێ، ئەمەوێ زیاتر باس لەمە بکەن، بەس ئەمە جۆرێك لە پەپوولەی شیعری نییە، واتە زۆر هەستیاربین و نەوێرین دەستی بۆ بەرین لەبەرئەوەی کە هەڵدەوەرێ؟

**عەبدولخالق یەعقووبی:** من هەڵبەت ئەو قسەیەم سەبارەت بە شاعیرێك کردووە کە پێمواية شاعیرێکی زۆر داهێنەر و گەورەیە. واتە ئەو قسەیە بۆت نییە سەبارەت بە شاعیرێك بیکەیت کە کەمئەزموون و کاڵفامبێت. بڕوانە، شاعیری داهێنەر ئەوەندەی پشت بە ئەندازیاری و چەشنێك لە موهەندیسی لە داهێنان دەبەستێ، پشت بە سرووش و وەحی و ناخودئاگا و ئەو شتەی کە پێی دەڵێن ئیلهامی شاعیرانە نابەستێ. ئەگەر ئیلهامێك لەشاعیردا بێ یا نەبێ، لانیکەم پەیوەندی بە منی خوێنەرەوەوە نییە. ئەو شتەی من لە دەقی شیعریدا دەیبینم ئەو ئەندازیارییەیە کە لە وشە و دەستەوشە و لەپێکهاتەی شیعردا دەبینرێت. شاعیر دواجار ئەو شتەی دەیخاتە بەردەستی تۆ، واتە دەقیشیعریی خۆی، دەکاتە سەنگی مەحەك بۆ تۆی خوێنەرەوەی وردبین و بۆ منی رەخنەکار، نەك ئەو شتەی کە لەزەینیدا بووە، جا نییەت و ئیلهامی بووبێ یان خەون و خولیای بووبێ. لەبەرئەوە ئەوەی باسمکردووە و جەنابت ئیشارەتت پێدا ئاماژەیەکە بۆ خوێندنەوەی شیعر" واتە شیعری سەرکەوتوو ئەو شیعرەیە کە ئەگەر تۆ دەستی بۆ ببەی و بتهەوێ جێگۆڕکێ بە رەگەزەکانی بکەی، ئەوە سەرلەبەری پێکهاتەکەی تێکدەڕووخێت و دەبێتە شتێکیتری غەیرەز شیعر. بۆ نموونە، هەندێ تۆژەر و ساغکەرەوەی شیعری کلاسیکی کوردی هاتوون لەپێناوی کورداندنی زمانی شاعیرانی کلاسیك دەستیان لە پێکهاتەی زمانیی شیعری ئەو شاعیرانە وەرداوە و بۆ نموونە "هذا طریق العاشقین"ی وەفاییان گۆڕیوە بۆ "ئاوایە ڕێگای عاشقان".. ئەو دی دە پێیوایە شیعر بوونێکی میکانیکی هەیە و نەك ئۆرگانیکی و قابیلی ئەوەیە دێڕێك لابەیت و دێڕێکیتری هاوشێوەی لەبری دانێیت و هیچ شتێکیش لە شیعرەکە کەمنەبێتەوە یان نەفەوتێت. ئەو شارەزایی و لێهاتوویی‌ەی کە نالی لە دروستکردنی دەستەواژە و رستەی شیعری و ئیماژی شیعری و وێنەی شیعری نالیدا هەیەتیوایلێکردووە کە من بڵێم بەڕاستی گۆڕانیواژە لە شیعری نالیدا بە مانای تێکڕووخاندنی بنەمای ئەو شیعرەیە. با نموونەبکەین بە بەڵگە و پشتڕاستکەرەوەی ئەو بیرۆکەیەمان:

**لە شیرینی ئەتۆ، ئەی خوسرەوی تەختی زەمین، رەنگە**

**بگاتە ئاسمانی بێستوون فەرهادی هاوارم**

لەم بەیتەدا، وەك پێشتر گوتمان، مەعریفەکە مەعریفەیەکە پێشتر لە شیعری کلاسیکی فارسیدا هەبووە. ئەو لێکدژییەی کە لەنێوان شیرین و فەرهاد لە زەمینە و پانتایی شیعری کلاسیکی فارسیدا هەبووە نالی لێرەدا جارێکیتر بە کاریهێناوەتەوە. کە واتە، نالی لێرەدا هونەرێکی گەورەی نەنواندووە کە ئەم لێکدژییەی دووپاتکردووەتەوە. بۆچی؟ چونکە پێشتر شاعیرانی کلاسیکی فارس و لەسەرووی هەموویانەوە حافیزیش کەموزۆر بەهەمانشێوە ئەم قسەیەیانکردووە:

**دل به امید صدایی که مگر در تو رسد**

**نالەها کرد در این کوه که فرهاد نکرد**

لێرەدا حافیز باس لە کێو و فەرهاد و نالە دەکات. پرسیارەی من ئەوەیە نالی چیکردووە کە حافز نەیکردووە؟ نالی، بۆ نموونە، لەم دێڕە شیعرەدا چ نوێکارییەکی هێناوەتەئاراوە بۆئەوەی نەبێتە لاساییکەرەوەی رووتی ئەو گوتارە شیعرییەی کە سەدان ساڵ پێشتر حافیز هێنابوویەگۆڕێ؟ یەکەم خاڵ، نالی موتیفی شیرین و فەرهادی کە بەشێکن لە حیکاتێکی کۆن و هاوبەشی نێوان کورد و فارس، لەنێو گوتاری شیعرێکدا کە بە زمانی کوردی نووسراوە تواندووەتەوە. دووەم، نالی هەندێ جوانکاری و شیرینکاری لە زمانی کوردی دا کردووە کە ئەوە لە شیعرە فارسییەکەی حافیزدا نەکراوە. بۆ نموونە، کاتێ نالیدەڵێ: "بگاتە ئاسمانی بێستوون" کە ئەم ئاسمانی بێستوونە هەم دەتوانێ ئاماژەبێ بەو شوێنەی کە فەرهاد کێوەکەی هەڵکەندووە، کە وەك دەڵێن بێستوونی کرماشانە، هەمیش ئاماژەیە بە ئاسمان کە بێکۆڵەکەیە. ئەگەر ئەمانە بێیتو دەستیانتێوەردەیت، من دەڵێم بنەمای شیعرەکە تێکدەچێ و ژێرخانی جوانیناسیی ئەو شیعرە تێکدەڕمێ. لە دێڕە شیعرەکەی حافیزدا، زۆر بەسادەیی و بەسانایی باسلەوەدەکرێ کە فەرهاد زۆر لەو کێوانەدا هاوار و لالانەوە و فوغانیکرد. واتە حافیز لێرەدا فەرهاد وەکو فەرهاد

باسدەکا، وەکو تاکەکەس، وەکو خۆی باسدەکا، بەڵام نالیدەڵێ، بگاتە ئاسمانی بێستوون فەرهادی هاوارم، واتە هاوارەکەی خۆی دەکا بە فەرهاد. فەرهاد لەم شیعرەی نالیدا لە فەرهادی تاکەکەس زۆر ترازاوە و لایداوە. ئەمە شتێکە کە لە شیعرەکەی حافیزدا نەکراوە، هەڵبەت بێئەوەی بمەوێ لەڕێگەی ئەم بەراوردە راگوزەرانەوە ساویلکانە بیسەلمێنم کە نالی لێرەدا پێش حافیز کەوتووە، بەڵام لەوە بێگومانم کە بەهیچ کلۆجێکیش لێیدوانەکەوتووە. قسەی من ئەوەیە کە نالی ئەندازیارێکی زانا و زیرەك بووە و تۆ ئەگەر لە بینای ئەندازیارێکی ئەوتۆ خشتێك دەربێنی، لەوانەیە سەرتاپای ساختومانەکەی تێکبڕووخێنی. ئەوەیە کە پێموایە ناکرێت لە شیعری شاعیرێکی گەورەی وەکو نالی بە ئاسانی بڵێی بابێین ئەم وشەیە لابەین و وشەیەکیتر دابنێین.. نموونەیەکیترت بۆ بێنمەوە:

**نالی بەئومیدی زەفەری تەوقی تەلیسمت**

**ماری سرِی زوڵفت لە سەر و گەردنی ئاڵا**

هەڵبەت دەکرێت ئەو سرِە بە سەریش بخوێندرێتەوە و بگوترێ ماری سەری زوڵفت لە سەر و گەردنی ئاڵا. پرسیاری من ئەوەیە ئێستا وەرە لە تاکدێڕی یەکەمدا "نالی بە ئومیدی زەفەری تەوقی تەلیسمت" بۆ نموونە تەوق بگۆڕە بە کۆت، لەو سۆنگەیەوە کە بڵێی کۆت کوردیترە. ئەم کارە راستەوخۆ کاریگەریی لەسەر مۆسیقای شیعرەکە دەبێت، دیارە لە وەزن و کێشەکەیدا جیاوازی دروستناکات، بەڵام هاوسەنگی و خۆشئاهەنگیی ریتم و مۆسیقاکەی تەواو تێکدەدات. تۆ بەمشێوەیە بیخوێنەوە: "نالی بەئومیدی زەفەری کۆتی تەلیسمت.." بەم گۆڕینە تۆ بزانە چ زیانێك لە مۆسیقای ئەو شیعرە دەدرێ. کاتی دەڵێی تەوقی تەلیسم، ئەوە لەم دوابەدوای یەکهاتنەی ئەم دوو وشەیە جۆرێك هاودەنگیی سەرەتای وشەکان (aliteration) بەدیدێت" واتە کۆمەڵێ وشە بەدواییەکدادێن کە یەکەم دەنگیان یەکبێ، وەك دەنگی "ت" لە دوو وشەی تەوق و تەلیسم-دا. لێرەدایە بەڕاستی دەستوەردان لەو شیعرە بە مانای ئەوەیە کە وا رۆحی شیعرەکە بکێشیت. من لەم دیدەوە پێموایە نالی لەو شاعیرانەیە کە لەپێناوی خوڵقاندنی ئەوپەڕی جوانیی زمانی شاعیرانەی خۆی زۆر زیرەکانە و ئاگادارانە هەڵسوکەوتدەکا و وەکو خۆی دەڵێ، لەعەمدا وادەکا.

**کۆچ:** لێرەوە بۆ نالی ئەم دەستکاریکردنە زەحمەتە، بەڵام بە ئاستی بیرۆکەدا رەنگە بەوجۆرە نەبێت؟

**عەبدولخالق یەعقووبی:** بێگومان لە ئاستی بیرۆکەشدا هەروایە کە دەڵێین نالی جێپەنجەی خۆی بەسەر شیعرەکانییەوە دیارە، مەبەستمان ئەوەیە کە نالی خاوەنی جیهانبینی و گوتاری شیعریی خۆیەتی. وەکو ئاگاداریشی لەدیوانەکەیدا هەندێ شیعر هەن کە دەڵێن شیعری نالی نین، چونکە نالی لە بنەڕەتەوە جیهانی شیعریی خۆی بەشێوازی تایبەتی خۆی خولقاندووە. بۆ نموونە، لە ئاستی ڕێزمانیدا من دەتوانم بڵێم یەك رستە لە شیعری نالیدا نادۆزمەوە کە لەگەڵ ڕێزمانی زمانی کوردی یەکنەگرێتەوە یان دژبە سروشتی زمانی کوردی داڕێژرابێت. ئەگەر لەشیعرێکیشیدا دایبنێین پەنجا وشەی عەرەبی و فارسی هەبووبێ، لەکۆتاییدا رستەکەی رستەیەکی کوردییە.

**کۆچ:** ئەم پرسیارە رەنگە دەروازەیەکی نوێمان لێبکاتەوە بۆ باسکردنی نالی، پرسیارەکەشم ئەوەیە خوێندنەوەی نالی و نالیناسی تاچەند پێویستدەکات بە میتۆدی نوێبێت؟ ئایا نالیناسی لەڕێگەی ئەم میتۆدە نوێیانەوە باشتر خۆی دەردەخات یان بەپێچەوانەوە، هونەرەکان لە میتۆدە کۆنەکاندان؟

**عەبدولخالق یەعقووبی:** من لەوتارێکمدا کە چەند مانگێك لەمەوبەر لە گۆڤاری رامان-دا بڵاومکردەوە، هەوڵی خۆم تەرخانکردبوو بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە. لەوێدا باسی ئەوە دەکەم کە مێژووی لێکۆڵینەوەی کوردی لە شیعری کلاسیك تائیستا دوو ڕێبازی سەرەکیی گرتووەتەبەر. ڕێبازی یەکەم ڕێبازی باو و باڵادەست بووە بەدرێژایی ئەو مێژووە. ڕێبازی دووەمیان ئەو ڕێبازەیە کە ئیستا من خۆم هەوڵی بۆدەدەم و کاریپێدەکەم. ڕێبازی یەکەم، ئەو دیدە مێژووگەرا باوەیە کە بەردەوام هەوڵدەدات دەقی شاعیرێکی کلاسیك لە روانگەی ئەو ئەزموونانەی شاعیرەکە پێیداتێپەڕیوە یان ئەو رووداوانەی بەسەر شاعیرەکەدا هاتووە هەڵبسەنگێنێت و لێکبداتەوە. واتە ژیانی شاعیر دەبێتە پاڵپشتی گرینگی لێکۆڵینەوە لە شیعرەکەی. بۆ نموونە، گەر سەرنجی ئەو شیکارییانەی مامۆستای نەمر مەلا عەبدولکەریم

مودەڕیس و کوڕەکانی بدەیت، راستە ئەوان  بە لێکدانەوەی خۆیان مانایواژەکانیان روونکردووەتەوە و لە هەر جێگایەکدا رووناکاییەکی بچووکیان دەستکەوتبێ بۆئەوەی بزانن نالی چۆن بووە و چۆن ژیاوە، چی خواردووە و چی نەپۆشیوە، لەگەڵ حەبیبە ژیاوە یان نەژیاوە کەی سلێمانی جێهێشتووە و بۆ جێیهێشتووە.. زۆر سەرنجی ئەم خاڵ و بابەتانەیانداوە و بەپێی ئەم چەشنە هەڵسوکەوتە شیکارییە لێکدانەوەیان بۆ شیعرەکانی نالی کردووە. ئەم دیدە یان ئەم رێبازە لە بۆ زۆرینەی شاعیرانی کلاسیکی کورد بەکاربراوە" مەحوی، وەفایی، کوردی.. کە ئەمە دیدێکی هەر چەند تاڕادەیەك پێویستە بەڵام کەموکووڕی خۆشی لەهەمانکاتدا، لەو سەرەوە کە ئەوەندەی گرنگی بە روونکردنەوەی دەرەوەی دەق دەدات، ئەوەندە خۆی سەرقاڵی خوێندنەوەی رەهەندە جۆوراوجۆرەکانی دەق ناکات و هەربۆیە دواجار  تۆژینەوەی ئەم رێبازە تۆژینەوەیەکی داهێنەر- تەوەرە تا دەق- تەوەر.

میتۆدی دووەم یان دیدی دووەم کە من زۆر بەگرنگی دەزانم بێتەناو دنیای راڤەی شیعری کلاسیك و لەسەر ئاستی دەقیدا جێبەجێبکرێت دیدێکە کە من ناوی دەنێم دیدی جوانیناسانە بۆ شیعر. ئەوەندەی من ئاگاداربم کەسانێکی لە چەشنی رەهبەر مەحموودزادە، موراد ئەعزەمی، نەجات حەمید، رێبوار سیوەیلی، حەمەسالەی سووزەنی، عەبدولموتەلیب عەبدوللا، هاشم ئەحمەدزادە و عەبدولخالق یەعقووبی لەم بوارەدا هەندێك کاری تاڕادەیەك سەرکەوتوویان بووە. ئەم رێبازە باوەڕی بە خوێندنەوەیەکی جوانیناسانەی دەقە" واتە پێدراو و کۆدەکانی دەق دەکاتە تەوەرەی سەرەکیی شیکاریی خودی دەقەکە. بۆ وێنە، لە پێوەندی دەگەڵ شیکردنەوەی جیهانی نالی، ژیان و کەسایەتیی نالی تەنیا لەو ئاستەدا و تائەو رادەیە گرنگە کە چەندە خزمەتدەکات بە رێبازی جوانیناسانە و شیکاریی جوانیناسانەی دەقەکە. واتە سەنتەر لێرەدا نالی نییە، بەڵکو ئەو دەقەیە کە نالی خوڵقاندوویەتی. بۆئەم کارەش پێویستیمان بەو میتۆدە نوێیانە دەبێت کە بەڕێزتان باستانکرد. بۆ نموونە، لە  میتۆدی رەخنەی مارکسیستی دا ( Marxist criticism) زۆر پێویستت بە کۆکردنەوەی زانیاری لەسەر پێگەی کۆمەڵایەتیی شاعیرە (هەڵبەت لە شیکردنەوەی شیعری مۆدێرندا ئەوە دەنگی شیعرییە کە جێی دەنگی شاعیر، وەك تاقەدەنگی شیعری زۆرینەی شیعری کلاسیکی، دەگرێتەوە)" ئەوەیکە شاعیر سەربە چ چینێکی کۆمەڵگە بووە و لایەنگری لە ئای دیالۆژیی کام چین کردووە و بەرژەوەندەکانی کام پێگەیەکی کۆمەڵایەتیی پاراستووە. بۆئەم مەبەستە پێویستە لە دیدی جوانیناسانەدا بگەڕێیتەوەسەر

جیهانی دەق و لە کلاّورۆژنەی دەقەوە ئەو زانیارییانە هەڵێنجیت.. بۆ نموونە، نالی شیعرێکی هەیە بەسەر خولاّمانی بارەگای میرنشینی باباندا هەڵدەڵێت:

**ئەم تاقمە مومتازە کە وا خاسەیی شاهن**

**ئاشووبی دڵی مەملەکەت و قەلبی سوپاهن**

لەم شیعرەدا دەردەکەوێت کە نالی شاعیرێکە نیزیك لە بارەگای میری و سەربە دەربار و دەسەڵاتی میرنشینی بابانە. واتە سەربە چینی مامناوەند بۆ سەرێیە و خەریکە پشتگیریی ئەم میرنشینە دەکات، با ئەو میرنشینە بۆ نالیدەسەڵاتیکی خۆماڵییش بیت و ئەوە مافی هەموو کەسە کە شانازی بە کیان و کەرامەتی نەتەوەیی خۆی بکات. قسەی من لێرەدا پارێزگاریکردن لە ئای دیالۆژییەکی تایبەتە، جا ئەو ئایدیالۆژییە نەتەوەیی بێت یان شتیتر. تۆ لێرەوە دەتوانیت لێکدانەوەت بۆ دەقەکە هەبێت. واتە ئەو بیرۆکە و ئایدیایەی لەدەقەکەدا هەیە دەستنیشانیبکەیت و پاشان بتوانیت خوێندنەوەیەکی ماناناسانە و جوانیناسانە بۆ دەقەکە بهێنیتەئاراوە یان بۆ نموونە رەخنەی پۆستکۆلۆنیالی (postcolonial criticism) میتۆدێکە هەوڵدەدات قۆناغی پاش داگیرکاری لە بەرچاوبگرێت و بزانێت داگیرکراو پاش داگیرکردنی و لە قۆناغی داگیرکاریدا چۆن دەژیت و جیهانبینییەکەی چۆن دەکەوێتە کارلێك لەگەڵ جیهانبینیی داگیرکەردا. لە رەخنەی پۆستکۆلۆنیالیدا بەریەککەوتنی نێوان ناسنامەی داگیرکراو و ناسنامەی داگیرکەر و ئەنجامەکانی ئەو لێکئالاّنە دەبێتە میتۆدی روانین بۆ مانا و فۆرمی دەقێکی ئەدەبی. لەمەوە دەتوانیت خوێندنەوە بۆ دەقی شیعریی "قوربانی تۆزی رێگەتم.. " بکەیت. میرنشینی بابان رووخاوە و شێوە کلۆنیالیزمێك هاتووەتەگۆڕێ. تورکی عوسمانی سلێمانی داگیرکردووە و خەریکە دەسەڵاتی داگیرکەرانەی خۆی لەوێ جێبەجێدەکات. نالی ئەو شیعرەی وەك پەرچەکردارێك لەو دۆخەدا و بۆئەو دۆخە نووسیوە. دەتوانیت لەوێوە و لەرێگەی ئەم میتۆدە نوێیەوە خوێندەنەوەت بۆ ئەم دەقە شیعرییە کلاسیکە هەبێت. واتە، دەمەوێت ئەوە بڵێم، میتۆدە نوێیەکان(کە لەوانەیە هەندێکیان هەر بۆ ئێمەی کورد نوێبن، دەنا رێبازی رەخنەییوا هەن کە لەباری مێژووییەوە زۆریش نوێنین)، لەراستیدا توانای ئەوەیان هەیە هەمووجۆرە دەقێك بخوێننەوە، جا دەقە کلاسیك بێت یان نوێ. لەئاستی خوێندنەوەی ژانری

جۆراوجۆریشدا، جا چ رۆمان بێت چ شیعر، ئەم قوتابخانە رەخنەییانە شیاوی دابەزاندنن. لێرەدا خاڵی سەرەکی ئەوەیە کە ئەو میتۆدانە پاڵپشی مەعریفی و جوانیناسانەت بۆ دروستدەکەن" کە تۆ دەتوانیت لەسەر بنەمای ئەو پاڵپشتە دەقەکان بخوێنیتەوە.

شتێك کە لە رەخنەی کوردیدا پێویستە جێبکەوێت و تائێستا نەکەوتووە ئەوەیە کە نابێ بەپێی نییەت، جا چ ئی نووسەر بێت، چ ئی رەخنەکار، دەق بخوێنرێتەوە. واتە ناشێ نییەتی نووسەر یان خواستی رەخنەکار ببێتە تەوەری بابەتی رەخنەیی" ئەو شتەی لە تێرمینۆلۆژی رەخنەییدا پێیدەڵێن intentional fallacyواتە هەڵەکاریی نییەت" رەخنەکار یان خوێنەرەوە مەبەست و خواست و نییەتی خۆی دەکاتە سەنگی مەحەکی لێکدانەوەی دەق" میزاجی خۆی دەکاتە بڕیاردان لەسەر ئاستی جوانیناسیی دەقەکە. بۆ نموونە، من وەك رەخنەکارێك کە هەستی نیشتیمانپەروەریم هەیە، بێم لەسەر شیعری نالی بۆچوونی رەخنەیی دەرببڕم و لەسەر بنەمای خواست و نییەتی خۆم بڵێم بۆچی نالی شیعری نیشتیمانپەروەری کەمە؟ یان بۆچی نالی لە زۆر شیعریدا ئاینپەروەرانە بیریکردووەتەوە و نیشتیمانپەروەرانە بیرینەکردووەتەوە؟ یەك لەو کەسانەی کە وایلێکداوەتەوە و نییەتی ئایدیالۆژیکی خۆی بۆ تەحلیلی شیعری نالی بەکارهێناوە شاعیری نەمر و ناسراوی رۆژهەڵاتی کوردستان سوارەی ئیلخانیزادەیە. من لەکۆڕێکدا کە بۆ خوێندنەوەی شیعری "خەوەبەردینە"م تەرخانکردبوو ئاماژەم بۆئەوەکرد کە سوارە بە تێفکرینی چەپ خەریکە دەلیلەکانی شیعری کلاسیکی عەرووزدار نووسینی نالی دەخاتەبەر پلاری رەخنە و دەیکات بە پارێزەری چینی فیۆداڵی خاوەن دەسەڵات و مالیکی زێڕ و زۆر، بەڵام زەمینە و کۆنتێکستی داهێنانی نالی لەبەرچاونەگرتووە و بە رای من کەوتووەتە داوی هەڵەکاریی نییەتەوە.

بەڵام رێگایەکیتر ئەوەیە کە من فیکری خۆم بخەمە نێو چوارچێوەی میتۆدێکەوە و ئەوکات لەسەر ئەساسی ئەو میتۆدە و لەرێگای لێکاڵاکردنەوەی کۆد و نیشانەکانی دەق دەقەکە بخوێنمەوە. ئیتر لێرەدا نییەتی رووت و رەهات رەخنەکار گرینگی و دەورێکی ئەوتۆی نامێنێت. لەبەرئەوە ئەوە رێبازی جوانیناسانەیە کە دەتوانێت ببێتە بەردی بناغەی راڤەگەلی دروستی دەقە کلاسیکەکان. دیارە من لێرەدا دەڵێم راڤەگەل و مەبەستم ئەوەیە کە باوەڕم بە دروستیی تاقە یەك راڤە نییە. ئەم رێبازە بۆی هەیە لەرێژەی ئەو دیدە مێژووگەرایانەیە کەمبکاتەوە و چیتر سەنگی مەحەکی شرۆڤەی دەق نیزیکیی ئەو شرۆڤەیە نەبێت لە دید و نییەتی خودی داهێنەری

دەقەکە. دیارە من بۆخۆم تەواو دژی ئەو دیدە مێژووگەرایانەیە نیم، چونکە ئێمە، وەك کورد، جگەلە جیهانی دەقی نالی حەزیشمان لەوەیە بزانین لە جیهانی ئاسایی و دەرەوەی دەقیدا نالی کێ بووە و چۆن بووە، پێگەی کۆمەڵایەتی و ژیانی تاکەکەسیی چیبووە و چۆنبووە.

**کۆچ:** بەڵام من سەرنجی هەندێك لەو نووسینانەمداوە کە بە میتۆدی نوێ راڤەی دەقی کلاسیك دەکەن. بینیومە ئەو کەسانە شارەزاییەکیوایاننەبووە لە هونەری شیعری کلاسیك، واتە فۆرم و شێوەی دەق، لایەنی رەوانبێژی و کێش و عەرووز.. دیارە خۆشبەختانە ئەمە بەرێزتان ناگرێتەوە، بۆ خۆی ئەمە گرفتساز نییە؟

**عەبدولخالق یەعقووبی:** ئەم پرسیارەی بەرێزت پەنجەدەنێتەسەر ئەو خەسارەی کە بەداخەوە ئیستا لە پانتایی رەخنەی ئەدەبیی کوردیدا دەبینرێت. گەر چاوێ لە رەخنەی ئەدەبیی کوردی بکەین و بڵێین بۆچی نەیتوانیوە میراتی ئەدەبیی خۆی بخوێنێتەوە و هەڵیسەنگێنێت، دەبێت بەدوای سەرچاوەکانی ئەم خەسارەدا بگەڕێین. ئەو نەشارەزایی و گرفتەی ئێوە باستانکرد بەراستی خوێندنەوەیەکی بەرهەمهێناوە کە زیاتر میزاج و زەوقی رەخنەکارەکە یان خوێنەرەوەکەیە. هەر ئەمەشە کە خوێندنەوەکان قووڵ و هەمەلایەن و وەك فارسەکان دەڵێن "کاشفانە" نین. بیریشت نەچێت رەخنەگرانی ئێمە نەیانتوانیوە لە سایەی دەقی کلاسیکی شتێکی نوێ بهێننەئاراوە. ئەوان نەك نەیانتوانیوە بە میتۆد ئەو دەقانە شیبکەنەوە و دۆخی ئەمرۆی پێبخوێننەوە و هەڵیسەنگێنن، بەڵکو بەجۆرێك لەجۆرەکان دۆخەکەیان ئاڵۆزتریشکردووە. منی رەخنەکار، مەبەستم منی گشتییە، دەمەوێ لەسەر بنەمای شیعرەکانی نالی ئیستایەکیدی بۆ خۆم چێبکەم. واتە، دەبێت دیالۆگێك لەنێوان رابردوویەك کە نالی تێی داژیاوە و ئێستایەك کە من تێی دادەژیم سازبکەم. پێموایە بەشێك لەو سەرگەردانییەی کە نەوەی نوێی ئەدیبانی کورد تێیدادەژین و خەریکە وادەنوێنن کە رابردوو بسووتێنن و تەنیا مۆدێرنانە بژین، ئاگایان لەوەنییە کە ناشێ مۆدێرن بیت و ئاگات لە رابردووی خۆت نەبێت. لەبەرئەوە ئەو مۆدێرنیتەیەی رەگێکی لە سونەتدا نەبێت، مۆدێرنەیەکی شەل و ئیفلیج و کوێرە، وەك چۆن ئەم مۆدێرنیتەیەی کوردستانی ئێمەش، بەتایبەتی لێرە لە باشوور کە نیمچە سەربەخۆییەکی سیاسیش هاتووەتەئاراوە، زۆرتر لە سەیارە و بینا و مۆدەدا کورتبووەتەوە و لەو

لاوە زانکۆکان و ناوەندە هزری و رۆشنیرییەکان لە میتۆد و فیکر و فەلسەفە و کاری ئەکادیمیکی نویٚ زۆر بەدوور و بێبەرین. تۆ چاو لەو شەپۆلە شیعرییە بکە ئێستا لەئارادایە، بە ڕاستی دەتوانیت رۆژانە بەئاماژەی قامکێك چەندین نووسین لەو بەناو شیعرانە وەلانێین، بێئەوەی خەمی لەکیسچوونی جوانییەك یان تێداچوونی مەعریفەیەك بخۆین.

بە بڕوای من بەشێکی ئەم گرفتە ریشەکەی دەگەڕێتەوە بۆ نەناسینی رابردووی خۆت. من دڵنیام ئەو لاوە بەناو شاعیرانەی ئێستا رۆژانە شیعر بڵاودەکەنەوە، بەڵام نە نالیدەناسن، نە بۆشیان گرینگە کە بیناسن، چۆن دەتوانن سەرکەوتووبن، گەر چاو لە ئەزموونە سەرکەوتووەکان نەکەن و بە رازی ئەو سەرکەوتوویيە نەزانن. پێویستە شاعیری ئێستای ئێمە هەوڵبدات بزانێت نالی بۆچی سەرکەوتووبووە. من بۆئەوەی لێرەدا لە قوڕی تیۆری رووتدا نەچەقین واباشترە دیسان پشت بە چەند نموونەیەك ببەستم و باس لەوە بکەم کە نالی چۆن لەسەر زاوزێی مانایی یان، بابڵێین، دروستکردنی فرەمانایی لەشیعرەکانیدا کاریکردووە. واتە، بە قەولی ئینگلیزەکان مانا لای خوێنەرەوەش (reproduce) بێت، واتە بەرهەمبێت و بەرهەمبێتەوە. نموونەیەکت بۆ دەهێنمەوە کە لەو نموونەیەدا تائیستا ئەو کەسانەی سەرقاڵی لێکدانەوەی نالی بوونە یەك مانایان لەو شیعرە دەرهێناوە، بەڵام من بەپشتبەستن بە میتۆدی (textual analysis) لێکدانەوەی دەقی و بەپێی کۆد و نیشانەکانی دەق مانایەکیتریشم لێوەرگرتوە. هەتائەگەر ئەم مانایە لەنییەت و زیەنی نالیشدا نەبووبێت کە سەیریش نییە ئەگەر نەبووبێت، بەڵام من وەك خوێنەرەوەیەك دەرکم بەمەکردووە. شاعیری گەورە ئەو شاعیرەیە راستە لە بنەڕەتەوە نییەتی خۆی پاڵنەر و هۆکارە بۆ داهێنان، بەڵام دواتر پێویستە قووڵاییەك بە دەقەکەی بدات کە گەربێتو خۆی و نییەتەکەی نەمان، شیعرەکەی و جیهانە شیعرییەکی بەزیندوویی هەربمێنن. نموونەکە ئەمەیە:

**نەوعە ئینسانیٚ هەیە غـــەم قوتییە**

**من غەمی خۆم و غەمی عالەم دەخۆم**

**غەم دەڵیٚ نالی کە غەمخواریم نەکا**

**نـــــاعیلاجم من بەنی ئادەم دەخــــۆم**

لێکدانەوەی مووددەڕەسییەکان بۆئەم شیعرە وردە، بەڵام رێیتیدەچێت کاملتر و زێتریشبکرێت. ئەوان لە لێکدانەوەی ئەم دێڕانەدا دەڵێن "کەسانیوا هەن ژیانیان لەسەر خەم و خەفەت بەندە و بە خەمخواردن دەژین، من یەکێکم لەوانە" واتە لێکدانەوەی ئەوان ئەوەیە کە جۆرە مرۆڤێ هەیە کە خەم قوتی دەدات، منیش یەکێکم لەو جۆرە ئینسانانە، بەڵام من تەنیا بە خواردنی خەمی خۆم داناسەکنێم، بەڵکو خەمی خەڵکیدیش دەخۆم. دواتر خەم خۆی دێتەدەنگ و دەڵێت، ئەگەر نالی خەممنەخوات و نەیەتبەدەنگمەوە، ئەوا ناچارم ئەم خەڵکە هەمووی بخۆم و گشتیان لەناوبەرم. لەبەرئەوە نالی خۆی دەکاتە قوربانی ئەو خەڵکە تا خەم ئەو خەڵکە قووتنەدات. ئەمە لێکدانەوەی ئەوانە، و بەبڕوای من تاڕادەیەك ئاستی رووبەری دەقەکەیان لێکداوەتەوە، بەڵام من هەستدەکەم نالیدوورتر لەمەی روانیوە و وردتر مەبەستی خۆی، با لەپەردەشدا بێت، گەیاندووە. لەنێوان سنوور بۆ خەم و ئەو دیالۆگەی لەگەڵ خەمدا سازیدەدا، هەستناکەم بەو ساکارییەی لە لێکدانەوەی مووددەڕەسییەکاندا هاتووە روانیبێتی. تێگەیشتن من بۆئەم شیعرە بەمچەشنەیە کە باسیدەکەم: کاتێك نالیدەڵێت "نەوعە ئینسانێ هەیە خەم قوتییە، دوایی "بەڵام"ێکی شاراوەی نەگوتراو هەیە کە نالی زیرەکانە لە پەردەی حەریری کەلامی خۆی دا شاردوویەتییەوە. ١٢ ساڵ پێش ئێستا لە کۆنگرەیەکی نالیناسیدا کە لە سەقزی رۆژهەڵاتی کوردستان بەڕێوەچوو، وتم نالی شەیتانی شیعری کوردییە. هەڵبەت لەسەر ئەم قسەیە لەلایەن هەندێ کەسەوە خەریکبوو بەردبارانبکرێم. شەیتان بەو مانایەی لە ئاخافتنی رۆژانەی خەڵکدا بەکاردێت، پتر ئاماژە بۆ کەسی زیرەك، زۆرزان، پڕجووڵە و هەڵخەڵەتێنەردەکات. لەم شیعرەدا بەتایبەتی نالی شەیتانی کردووە، بەوەی بەڵامێکی لە ئێمە شاردووەتەوە" بۆئەوەی بڵێت، جۆرە مرۆڤێك هەیە کە خەمی رۆژانەی قووتی رۆژانەیەتی" پەرۆشی رۆژانەی قووتەکەیەتی. ئەمەش خاڵی لاوازی خەڵکە، چونکە ژیانیان سەرتاپا پیشخواردنەوە وخەمخواردنە بۆ بەدەستهێنانی قووت و خواردنی ژیان. نالی لێرەدا خۆی لەو خەڵکە جیادەکاتەوە و دەڵێ، بەڵام من خەمی نانم نییە. خەمی من خەمی عالەمە، واتە هەر ئەو خەڵکەی خەمی رۆژانە خواردوونی نالی خەمی ئەوانیش دەخوات. نالی خەمی خۆی و خەمی مرۆڤەکانیترێتی" خەمەکەی خەمێکی ئینسانییە. پێموایە ئەم لێکدانەوەیە ئاستێکی قووڵتر بە شیعرەکەی نالیدەدات.

**کۆچ:** رەنگە مۆڵەتبدەن منیش زیادکراوێکم هەبێت.. لەم شیعرەدا چەند شتێکی گرنگ هەیە، قسەکردنی نالی لەگەڵ خەم بەو راستگۆیی و بێپەردەییە کە خەم داواکاری هەیە، دەرخەری دۆستایەتی و پەیوەندی نالییە لەگەڵ خەم. هاوکات خەم وەك بوونەوەر سەیرکراوە. ئەمەش بە بڕوای من بۆئەوە دەگەڕێتەوە نالی لێرەدا لە مرۆڤەکانی دی ناچێت، خۆپەرست نییە، لاواز نییە، مامەڵەیەکی مرۆیی دەکات، بەخشندەیی خۆی نیشاندەدات، مامەڵەکردنەکەی ئاستێکی بەرز نیشاندەدات، بەوەی ئەو "بەڵام"ەی کە باستانکرد نیشانیدەدات خەم بۆ نالی مانایەکیدی هەیە، خەمی قووتپەیداکردن نییە، بەڵکو خەمی ئەو خەمی ئەو مرۆڤانەیە کە تواونەتەوە لە ژیانی رۆژانەیاندا و ناتوانن مرۆییانە مامەڵە لەگەڵ خەم بکەن. نالی بەجۆرێ خەمی رامکردووە (رامکردن رەنگە شیاونەبێت، لەجۆری مامەڵەکە) چونکە بەجۆرێ هەست بە ئارامی خەم دەکەیت، بەوەی خەم بە خەمی خەڵکی ئاسوودەنییە، بۆیە پێیخۆشە کە نالی بەوجۆرە خەمدەخوات، چونکە خەمەکەی نالی بەرزیی خەمیش نیشاندەدات. ئەوەی نالی خەمە نەك ئەوەی خەڵکی، ئەوەی خەڵکی مشورخواردنە، بەڵام ئەوەی نالی بەڕاستی خەمە، چونکە خەڵکێك وا بژین و بیربکەنەوە شوێنی خەمخواردنە کە ئەمەش دواجار هەستکردنە بە بەرپرسیارێتییەکی قووڵ لەلایەن نالییەوە. واتە لەلایەکیدییەوە دەتوانم بڵێم نالی خۆ باڵادەکات، یەکەم بەوەی رێگە لە خەم دەگرێت مرۆڤەکانی دی بخوات. دووەم، لە مرۆڤەکانیدی خۆی جیادەکاتەوە. سێیەم، تەنانەت جۆری خەمەکەشی جیایە. ئینجا، نالی خەمدەخوات نەك خەمبیخوات. لێرەدا بەراوردکاری خەم بۆ نالی بەرامبەر هەموو مرۆڤەکان دادەنێت، واتە نالیدەتوانێت کۆی مرۆڤەکان رزگاربکات.. نالی مەرج دانانێت بۆ ئەمە.. خەم خۆی پێویستی بە کەسێکە کە ئەو کەسە نالییە. لاوازی ئەوان و ئازایی نالی، چونکە خەم دەڵێت فریاڕەسی ئێوە نالییە. خەم دەڵێت، نالی تۆ باشدەکەیت، گەر ئەوە نەکەیت من ناچاری خواردنی ئەوانم، تۆی رێگە لە من دەگری ئەو کارەنەکەم کە دیارە خەمیش پێیخۆشنییە ئەو کارەبکات، چونکە دەڵێت ناچارم (واتە گەر وردبینەوە هەست بە پەیوەندییەکی دیالێکتیکی دەکەین). هاوکات نالی هۆکاری هەڵگرتنی باری خەمی خەڵك دەخاتە کۆتا بەیت وەك بڵێیت، وەڵامێك بێت بۆ ئەوانەی کە دەڵێن بۆ نالی ئەو ئەرکە گرانە دەخاتەئەستۆی خۆی، هاوکات وەڵامی ئەو بۆیە لە زاری خەم خۆیەوە دەداتەوە. لەم دەقەدا نالی جیاوازی نێوان بەش و گشتی نەهێشتووە، نالی خۆی وەك گشتێك بینیوە (خەمی گشت مرۆڤایەتی)، واتە ئێمە شایەدی ئەوەین بەشێك دەتوانێت رۆڵی

گشت ببینێت. بۆیە بەڕاستی دەتوانین لەم شیعرەوە زۆر ورد دەستنیشانی رادەی هۆشیاری نالی بکەین، ئازاری نالی و هێزی نالی بکەین، باسی ئەوەبکەین چۆن وەك مرۆڤێکی رەسەن مامەڵەی کردووە، لەبەرامبەردا باسی ئەو خەڵکە و ژیانیان بکەین و بەختیار عەلی وتەنی ئەو خەڵکە هێندەی رۆژەکان بەرێدەکەن هێندە ناژین. واتە دەتوانین وەك زەنگی ئاگادارکردنەوە لە شیعرەکەش بڕوانین. ببوورن ئەمانە کۆببوونەوە لام، نازانم گەر بە هەڵە لێکدانەوەکەم نەکردبێت.

**عەبدولخالق یەعقووبی:** کاك هەرێم، ئیستا ئەوەی کە بەڕێزتان باستانکرد و ئەو هەوڵەی ئێوە بۆ زیادکردنی مانای دیکە بەم شیعرە هەمان شتە کە من ناومناوە زاوزێی مانایی لە شیعری نالیدا. ئەمەیە کە من والێدەکات دان بە گەورەیی و شاعیرییەتی نالیدا بنێم، بەپێی لێکدانەوەکەی من، نالی خۆی ئاوارتەدەکات لە خەڵکی ئاسایی، نەك بە مانای ئەوەی خۆی لە خەڵك پێگەورەتربێت، بەڵکو، وەك ئێوەش وتتان، ئەو لە سەرچاوەیەکی مەعریفیی قووڵترەوە لە شتەکان دەڕوانێت. پاشان خودی خەم کە دەزانێت لە تاو هەموو خەڵکدا تەنیا نالییە کە ئاوارتە و نائاساییە، روو لە نالی دەکات، روو لە کەسیدی ناکات و دەڵێ، نالی مادام ئاوایت، دەبێت چارەی منیش بکەیت، مادام خەمی هەموو خەڵك دەخۆیت، خەمی هەموو بوونەوەرێك دەخۆیت، من کە بۆخۆم خەمم، ئەگەربێت خەمی من نەخۆیت کە هەر بریتییەلە خۆم، ئەوا من ناچارم خەڵکیتر بخۆم، بە خواردنی من، من لەبەیندەبەیت کە واتە من ناتوانم خەڵکیتر بخۆم. ئیدی ئاواتەکەی نالیش بەدیدێت کە بڕیارە پشتیوانی لە خەڵك بکات و خەمێکیان لێبخوات. ئەم دیدەی ئێمە بۆ ئەم شیعرە دیدێکی جوانیناسانەیە و روانگەیەکی لەم چەشنە لەچاو دیدی مێژووگەرایانە پتر خۆی بە تەقاندنەوەی زەرفییەتە دیار و شاراوەکانی دەق لە بواری فۆرم و مانادا ماندوو و سەرقاڵدەکات.

**کۆچ:** ئێستا دەمەوێ لەبارەی نەمریی شیعرەکانی نالییەوە وتوێژبکەین، نالی چۆن توانیویەتی لەڕێگەی شیعرەکانییەوە خۆی نەمرکات؟ چۆن دەقێکی نەمر لە دەقێکی بمر جیابکەینەوە؟

**عەبدولخالق یەعقووبی:** پێمواپە شاعیر وەك مرۆڤێك، وەك کەساپەتییەك، بۆ سەردەمانێکی کورت، کورت بە قەت تەمەنی مرۆڤێکی ئاسایی، لەمێژوودا بوونیدەبێت و پاشان وەك جەستە دەروات. مانەوەی شاعیر پەیوەستە بەمانەوەی بەرهەمەکەیەوە. نالی لە مێژووی ئەدەبیاتی کوردی و پانتایی لێکۆڵینەوەی ئەدەبیاتی کلاسیکی کوردیدا ماوەتەوە و بەردەوام باسیکراوە و پێشمواپە ئەو باسانە بڕانەوەیان بۆ نییە. نالی کەسێکە بەردەوام بەسەریدەکەینەوە و لەسەریدەکەینەوە" باسوخاسی شیعری نالی زیندووە، چونکی خۆی زیندووە. شیعری نالی زۆرجار کێشە بۆ لێکۆڵەران سازدەکات. هۆکارەکەی ئاشکراپە. نالی جیهانێکی دەقیی بۆ ئێمە جێهێشتووە کە مشتومڕهەڵگر و قابیلی لێدوانێکی فراوان و بێسنوورە کە ئێمە ناچاردەکات هەڵوەستە لەسەر ئەو جیهانە بکەین. دڵنیاین چوونەنێو ئەو جیهانەوە نائومێدماننناکات و بەدەستبەتاڵی ناپەینەدەرەوە. دنیابینییەکمان دەداتێ بۆ جیهان و ژیانمان.

بۆ لێکۆڵینەوە لە نەمریی شاعیرێك، پێویستمان بە ئاوڕدانەوە و لەنگەرگرتنێکی درێژە لەسەر نەمریی دەقە شیعرییەکانی. ئێستا دەپرسین بۆچی دەقی شیعری نالی بە نەمری ماوەتەوە؟ و بە بڕوای من و مەزەندەی من بە نەمریش دەمێنێتەوە. لەڕاستیدا پرسیارەکە ئەوەیە کە چۆنە شیعرەکانی بە نەمری ماونەوە؟ چیوا لە ئێمە دەکات تائیستاش بەتامەزرۆییەوە باسی نالی بهێنینەگۆڕێ و وتوێژی لەبارەوە بکەین؟ بۆچی خوێنەرەوەی ئەم سەردەمە مۆدێڕنەش بە حەزەوە نالی دەخوێنێتەوە و چێژیلی دەبینێت؟ بەڵگەکان چین کە دەقەکانی نالی نەمردەکەن؟ لێرەدا دەتوانین ئاماژە بە چەند خاڵێ بکەین، هەر چەند لەپێشتریشدا باسی زۆر شتمان کرد کە رەنگە ئەو شتانەش بەڵگەی ئەو نەمرییە بن، بەڵام ئاماژە بە خاڵێکیتریش دەکەین. نالی لەقۆناغێکدا زمانی کوردیی بەسەرکردووەتەوە و بووژاندۆتەوە کە ئەگەر ئەو و هاوقەڵەمەکانی لە چەشنی سالم و کوردی نەبوایەن، رەنگە زمانی کوردی بکەوتباپەتەبەر هەڕەشەی تێداچوون، بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی میرنشینەکانی کورد لەژێر سێبەری دەسەڵاتە ئیمپڕاتۆرییەکانی ئێران و عوسمانیدا بوون، لەو سەردەمەدا مەترسی توانەوەی زمانی کوردی هەبووە لەنێو زمانە باڵادەستەکانی وەکو فارسی و عەرەبی و تورکیدا، بەڵام نالی بەش بەحاڵی خۆی کارێکیکردووە زمانی کوردی لەو مەترسییە تاڕادەپەکی زۆر دووربکەوێتەوە. نالی لەگەڵ ئەوەش کە شارەزای ئەو زمانانە بووە و مەعریفەی خۆی لەو سەرچاوانەوە دەوڵەمەندکردووە، توانیویەتی هۆشیارانە بە پلان و خودئاگایی زمانی کوردیی خۆی بپارێزێت لە هەژموونیی ئەو زمانانە. واتە نالی

سوودی لەو مەعریفانە وەرگرتووە، بەڵام نەتواوەتەوە لەناویاندا. نەبووە بە بەشێك لە ماڵی ئەو زمانانە، بەڵکو ئەو زمانانەی کردووەتە بەشێك لە ماڵیٚ خۆی. کورت و کرمانجی، نالی توانیویەتی جیهانێکی شیعری بە زمانی کوردی بنیادبنێت. نالی نەك زمانی کوردی لە فەوتان و فەنابوون رزگارکردووە، بەڵکو شانازیشی بەوەکردووە کە پارێزەری سەروماڵی ئەو زمانەیە، وەك پێشتر ئاماژەمانپێکرد.

لایەنێکیدی کە دەتوانین وەك نەمریی نالی باسیبکەین ئەوەیە کە نالی گەورەیی داوە بە مرۆڤی کورد و نیشتیمانی کورد و هەستی سەربەرزی و شانازی بەخۆکردنی لای مرۆڤی کورد درووژاندووە. بۆ نموونە گەر ئاوڕ لەو شیعرانە بدەینەوە کە تێیاندا نالی رووی لە حەبیبەیە، دەبینین نالی وەسفێکی بۆ عیشق و خۆشەویستیی کچێکی کورد کردووە کە وەسفێکە وەك بلێی بۆ هەتاهەتاییکردنی جوانیی کچە کوردێك کردبێتی. یەکیٚ لەو نموونە هەرە باش و بەرزانەی شیعری نالی لەم بوارەدا ئەو شیعرەیە کە بۆ چاوی حەبیبەکەی نووسیویەتی:

**پێمدەڵێن مەحبوبە خێل و قیچە مەیلی شەڕدەکا**

**خێل و قیچە یان تەرازووی نازی نەختیٚ سەردەکا**

با لەڕێگەی ئەم نموونەیەوە هەندیٚ لە گەورەیی شیعری نالی رابمێنین، بە بڕیاری پێشوەخلە و گشتی نا، بەڵکو بە بەڵگەی بەرهەست و ورد. لەم نموونەیەدا کە نالی وەك پاساوێك بۆ خێلی و قیچی چاوی حەبیبەکەی هێناویەتەوە، دنیایەك لە جوانی وجوودی هەیە، چ لە ئاستی مەعریفە و چ لە هەڵگەڕانەوەی دیدی باوی سەردەمدا، چ لە ئاستیواژەکان و موفرەداتە کەلامییەکاندا، چ لە ئاستی خەملاندنی زمان و خولقاندنی ئیماژ و خۆشکردنی مۆسیقادا. حەزدەکەم کەمیٚ بەوردی باس لەم شیعرە بکەین. سەرەتا، نالی زۆر زیرەکانە حاشا لەوە ناکات کە مەحبوبەکەی خێل و قیچە" راستەوخۆ و ناراستەوخۆ ئەمە دەسەلمێنێت، بەڵام زیرەکییەکیتری ئەوەیە ئەمە لە زمانی خۆیەوە نادرکێنێت، بەڵکو لە زمانی خەڵکانیترەوە دێتەنێو نانەتەکەوە. بۆیە شیعرەکە بە "پێمدەڵێن" دەستپی دەکات. نالی لێرەدا بە تیرێك چەند نیشانێك دەپێکێت. یەکیان گومانکردنە لە قسەی خەڵکی، چونکە دەڵیٚ "پێمدەڵێن"، وەك ئەوەی بلێی گۆیا مەحبووبە خێلە، وەك چۆن خەڵك وادەڵێن، بەڵام دواتر دەشڵێت قسەکەتان راستە لەوەی ئێوە چاوی محبووبە

به خێل و قیچ دەبینن، چونکی ئەو خێل و قیچییە لەڕاستیدا سەرکردنی تەرازووی نازی چاوی ئەوە، لەبەرئەوەی مەحبووبە خۆشەیستی منە و نازدەکات و چاوێکی بەرز و ئەویدی نزمدەکاتەوە و ئەم حاڵەتە بۆ ئێوە وەك خێلی چاوی ئەو دەردەکەوێت. واتە ئەمە وەڵامدانەوە و بەرهەڵستکارییەکی جوانیناسانەیە بۆ قسەی ئەو کەسانەی پێیدەڵێن مەحبووبەکەی خێلە. لەم شیعرەدا دەبینی نالی بە ئەنقسەت پاساوێکی جوانیناسانە دەداتەوە گەر سەرنج بەبەردەوامی پاساوەکانی بدەین بە زمانی شیعری خۆی دەڵێت:

**خێل و قیچە، یان بە غەمزە بۆ نیشانەی دڵ بە چاو**

**مەیلی راستهاوێتنی موژگانی دڵپەیکەر دەکات**

دڵپەیکەر واتە دڵلەتلەتکەر. دەتوانین بە دڵپێکەر-یش بیخوێنینەوە کە ئەوکات بە مانای ئەو موژگانێکە کە وەك تیر نیشانەی دڵ دەپێکێت. واتە، هەر دوو ماناکە گونجاون. بڕوانە نالی چۆن ئەو شتەی کە بە تەعبیری عام ناشیرینە یان ناحەزە جواندەکات، بگرە بەرزیشیدەکاتەوە. ئەم شیعرە عاشقانەیەی نالی لێوانلێوە لە جوانی" زمانێکی گەلیٚ نەرمی هەیە، تەنانەت نالی لە هەڵبژاردنی ئاهەنگی واژەکانیشدا لە لێهاتووییی ئەندازیارانەی خۆی دریٚغینەکردووە. جوانی لەم شیعرەدا لەو ئاستەدایە کە نەمری بداتە شیعرەکە و ئەبەدی مانەوەی بۆ دەستەبەربکات.

**کۆچ:** لەگەڵ ئەوەشدا نالی باسی عەشق دەکات، تا مرۆڤ هەبیٚ عەشق هەر دەبێت، واتە باسی شیعرەکە باسێکی رۆژانەیی و تێپەڕنییە.

**عەبدولخالق یەعقووبی:** بێگومان ئەمە سەرنجێکی بەجێیە، بەڕاستی وەك رەخنەکارێك نامەویٚ نییەتی خۆم زۆر تێکەڵی خوێندنەوەکەم بکەم، بەڵام سەریشم لەوە سووڕماوە نالی لەپێناوی پاراستن و نرخاندنی عیشقی خۆی بۆ مەحبووبەکەی، بۆچی دێت لە پاژێکی بچووکی جەستەی مرۆڤ، واتە چاوی مەحبووبەکەیەوە، دەستپیدەکات. نالیدێت ئەو بەشە لە وجوودی مەحبووبەکەی زەقدەکاتەوە کە سەرچاوەی دیتنە، مەکۆی نازە، ئاخێزگەی ئاماژەیە، هاوکات ئەگەر کێشەیەك هەبیٚ لەخۆشەویستەکەیدا، بەوەی خەڵك باسیدەکەن، هەر لەو چاوەدایە کە گۆیا خێلە. نالی لەدنیایەکدا ژیاوە کە گوتارە زاڵە باوە گەورەکان هەیبەت و هەیمەنەیان هەبووە،

گوتاری لە چەشنی پیاوسالاری، عەشیرەتخوازی، شەرع- تەوەری هێژمۆنیی کۆمەڵایەتییان بووە. نالی دێت لە جیهانی شیعری خۆیدا لەم گوتارانە یاخی دەبێت. نالی لە چاوی چاوەوە باسی عیشق دەکات، لە عەیبی خۆشەویستەکەیەوە دێتەنێو جوانییەکانی عیشقەوە.

**کۆچ:** شتێکیتر گەر بکرێت بە زمانی سارتەر بیلێم، چاو یان تەماشاکردن هەمیشە ئاماژەکردنە، ئاراستەکردنە، دۆخپێدانە. دەشێ چاوی مەحبووبە نالی سەرمەستکردبێ، وەلی دیتنی یان ئاماژەی چاوی مەحبووبە بۆ خەڵکانیدی جودایە، چونکە خەڵکانیدی نالی نین، عاشقی نین، لەبەرئەوە ئەوان بە عەیب دەیبینن، بەڵام نالی بەپێچەوانەوە، ئەم عەیبە جوان دەبینێت، دەبیوابێت، بە واتا چاو حوکمدەکات. هەتا هێمنی شاعیر لە یەکێ لەشیعرەکانیدا بە دەقیقی باسی حوکمی چاودەکات.. واتە بەکورتی دەمەوێ بڵێم خۆدەرخستنی مەحبووبە لەڕێگەی چاوەوە بۆ نالی و خەڵکانیدی دوو شتی جیاوازە..

**عەبدولخالق یەعقووبی:** زۆر راستە. نالی هەر لەم شیعرەدا دەڵێت، ئەوانەی کە جیاوازی خێر و شەڕ ناکەن کەچنەزەرن. ئەوەی بەڕێزتان لەدیدی سارترەوە باستانکرد، خێل و قیچی بۆ نالی سەرچاوەی خێرە، چونکی ئەوەی لە چاوی مەحبووبەکەیدایە، تەنانەت بە خێلی و قیچییەکەشیەوە، دەبێتە مایەی ناز کە هەمان خێری مەحبووبەیە بۆ نالی" دەبێتە مایەی هاویشتنی موژگانی دڵپێکەر و دڵپەیکەر بۆ نالی" دەبێتە ئەوەی چاوێکی مەحبووبە بەنفشە و چاوێکی نیلۆفەر بێت. نالی روخساری مەحبووکەی دەکات بە گوڵزاری هەمەڕەنگ. نەمری نالی لەم شیعرەدا لەوەدایە نایەت لە گوتاری گەورەوە دەستپێبکات، بەڵکو لە چاوەوە دەستپێدەکات. ئەم غەزەلە غەزەلی چاوە، نەك تەنیا بەو مانایەی کە تێیدا باسی جوانیی چاوی مەحبووکەی دەکات، بەڵکو هەروەتر لەو روانگەیەشەوە کە چاو، ئەویش چاوێکی خێل و قیچ، دەبێتە پاساوێکی جوانیناسانە بۆ عیشقی نالی بەنیسبەت مەحبووبە. ئەمەیە سەرچاوەی چێژ لە دەقی نالیدا" چێژ بە واتای لەزەت کەیف، خۆشی، یان ئەوەی لە زمانی ئینگلیزیدا بە taste باسیدەکەن. ئەگەر بگەڕێینەوەسەر باسی گوڵزارەکەی روخساری مەحبووبە و باسی بەنەفشە (هەمان وەنەوشەی خۆمان)و پێشینەی بەکارهێنانی ئەو گوڵە بکەین لە شیعری کلاسیکی فارسیدا، دەبینین بەنەفشە پتر مشبە بە (پێشوبهێنراوی) زولفی یار بووە. بۆ نموونە، لەم دوو

شیعرەی حافیزدا بەنەفشە بەو مەبەستە بەکارهێنراوە:

**چنين كه در دل من داغ زلف سركش توست**

**بنفشەزار شود تربتم چو درگذرم**

واتە: داغی زوڵفی سەرکێشی تۆ وەها لەنێو دڵی مندایە کە ئەگەر رۆژێ بمرم، خاکی گۆڕەکەم دەبێتە گوڵزارێك لە بەنەفشە یان لەم شیعرەدا دەڵێت:

**بی زولف سرکشش سر سودایی از ملال**

**همچون بنفشه بر سر زانو نهادەایم**

واتە، بەبێ زوڵفی یاخیبووی یار سەری سەودایەك لە غەم و نیگەرانی و پەرۆشیم وەك بەنەفشە لەسەر ئەژنۆ داناوە. لێرەشدا دیسان، بەنەفشە پێوەندی بە زوڵفەوە هەیە، بەڵام نالی بەنیسبەت دیدی بۆ وەنەوشە و شێوەی بەکارهێنانی لە شیعری خۆیدا جۆرێك لە لادان دەهێنێتەئاراوە، واتە راستە ئەو دەستەواژە باوە کلاسیکییانەی شیعری فارسیی بەکارهێناوە، بەڵام توانیویەتی مۆرکی تایبەتی خۆی بەسەردا فەرزبکات. واتە، گەر تۆ دەبینی چاوێکی مەحبووبە لە چاو چاوەکەیتری بە هۆی خێل و قیچ بوون تۆزێك ناهاوسەنگن، ئەوە وەك ئەوە وایە کە تۆ سەیری دوو گوڵ بکەیت، بە دوو رەنگ و بۆنی جیاوازەوە. ئەوەی گرینگە ئەوەیە کە هەر دووك گوڵن و لە جوانیی گوڵیش کەس ناتوانێت بەهۆی ئەوەی ئەم گولەتییە و ئەو گوڵەیە رەخنەبگرێت و بەعەیبەی بزانێت. نالی لێرەدا پێوەندییەکی نوێی لەنێوان دوو چاوی مرۆڤدا خوڵقاندووە و هەر ئەمەش بە بڕوای من دەتوانێت سەرچاوەیەك بێت بۆ خوڵقاندنی جوانی و نەمری.

**کۆچ**: دەمەوێ لە پەیوەندیی نێوان ئاستەکانی بنیادی شیعری نالی بدوێین. نالی چ جۆرە پەیوەندییەکی لە ئاستی وشە و دەستەواژە و تائاستی بەیتەکان هێناوەتەئاراوە، بۆئەوەی بتوانین باشتر لە نالی تێبگەین؟

**عەبدولخالق یەعقووبی:** بەڕاستی من خوێنەرەوەیەکی بەردەوامی شیعری نالیم و هەوڵمداوە خوێنەرەوەیەکی وردبینی شیعرەکانی بم. چون وردەکارییەکانی نالی پێویستی بە خوێندنەوەی وردە. سەبارەت بە پەیوەندیی کەلامی و جۆری ئاوێتەکردنیواژەکان و ڕێژەی داهێنانی شیعری، هێندەی من لێمکۆڵیبێتەوە هەست بە سێ جۆر پەیوەندی دەکەم لەنێوان دوو میسراعی هەر تاك بەیتی نالیدا. واتە، نالی لەسەر بنەمای ئەو سێ جۆر پەیوەندییەی بۆ من دەرکەوتووە جیهانی شیعری خۆی لەسەر ئاستی بەیت کە دەزانین یەکەی پێکهاتەییی ( structural unit) شیعری کلاسیکی عەرووزدارە، ڕۆناوە. ئەگەر کەسێك بیەوێت شیعرەکانی نالی لەباری مانایی و فۆرمییەوە شیبکاتەوە، ئەوا پێویستە ئاگاداری ئەم سێ جۆر پەیوەندییە بێت، چونکە ئەودەم باشتر دەتوانێت ڕەهەندەکانی جیهانی شیعریی نالی شەنوکەوبکات و ئەوکات ڕاڤەکاریی خۆی لەوێوە دەستپێبکات.

پەیوەندی یەکەم: پەیوەندی هاوتەریب (موازی)، واتە لەنێوان تاکدێڕی (میسراع) یەکەم و تاکدێڕی دووەم لە یەك بەیتدا پەیوەندییەکی هاوتەریب و هاوشان هەیە. بۆ نموونە:

**ڕۆژ سەری کوڵمتە ڕووناکیی نووری بەسەرم**

**شەو خەمی زوڵفتە تاریکیی توولی ئەمەلم**

ئەگەر سەرنجبدەین، لەم بەیتەدا، تاکدێڕی یەکەم تاکبەتاکی واژەکان و پێکهاتەکەی وادارێژراوە کە هەمانپێکهاتە لە تاکدێڕی دووەمدا بەشێوەیەکی هاوشان دووپاتببێتەوە و بەیتەکە بە کۆتا بگات: ڕۆژ/ شەو، سەری/ خەمی، کوڵمتە/ زوڵفتە، ڕووناکی/ تاریکی، نووری/ توولی)، بەسەرم/ ئەمەلم. لێرەدا نالی بەشێوەیەکی ئەندازیارانە، پێداگری دەکاتەسەر ئەو شتەی کە دەیەوێت پەسنیبکات و زەقیبکاتەوە کە لە تاکدێڕی یەکەمدا "سەری کوڵم"و لە تاکدێڕی دووەمدا "خەمی زوڵف"ە. هاوکات زنجیرەیەك دوانە لێکدژیشی سازکردووە کە بریتینلە ڕۆژ/ شەو، ڕوناکی/ تاریکی و.. هتد. با نموونەیەکیتریش بۆ ئەمجۆرە پەیوەندییە بهێنینەوە:

**بۆچی نەگریم سەد کەڕەتم دڵ دەشکێنی**

**بۆ مەی نەڕژێ شیشە لەسەد لاوە شکاوە**

لەم بەیتەدا نالی بە دوو شێوەی هاوتەریب، جارێك گریانی خۆی لە سۆنگەی دڵ شکانی و جارێك رژانی مەی لەبەر شکانی شووشە، لە یەك بابەت، با بڵێین بۆ وێنە بێوەفایی، دەدوێت. نالی لە تاکدێڕی یەکەمدا دەڵێ، گەر من دەگریم تۆی دڵم دەشکێنی، پاشان بۆ ئەوەی گریانی خۆی لە قاڵبی شوبهاندنێکیشدا زەقبکاتەوە لە تاکدێڕی دووەمدا باسی ناچارەکیبوونی رژانی مەی دەکات ئەوکاتەی کە شووشە لەسەد جێوە شکابێت.

پەیوەندی دووەم: پەیوەندیی ناوەند- پەراوێز. مەبەستم لەم پێوەندییە ئەوەیە هەندێکجار لەبەیتێکدا یەك وشە دەبێتە ناوەند و چەقی کۆی بەیتەکە. واتە وشەکانیدیکە دەکەونە پەراوێزی وشە ناوەندییەکەوە، یان وشە سەرەکییەکە یان شاوشەکە، ئیدی هەر ناوێکی لێدەنێین. ئەو ناوەندە دەبێتە کانگای مانا، دەبێتە شوێنی سەرنجڕاکێشانی خوێنەرەوە. پێکهاتەی ئەو بەیتانەی کە خاوەنی پەیوەندیی ناوەند- پەڕاویزن خوێنەرەوە ناچاردەکات سەرنجی تایبەت بگرێتە وشەی ناوەندی. وشەکانیدی بە دەوری ئەم وشەیەدا دەخولێنەوە و دەبنە یاری دەدەر و روونکەرەوەی ئەو تاکە وشەیە. بڕوانە ئەم نموونەیە:

**توڕڕەت وەکو تۆماری شکستە و سەری کوڵمت**

**بۆ نووری سەوادم بووەتە شەمعی موتاڵا**

لەم بەیتەدا "سەری کوڵمت" ئەو دەستەواژەیەیە کە دەبێتە ناوەندی پێکهاتەی مانایی و فۆرمیی بەیتەکە. نالی مەبەستی ئەوەیە سەرنجی خوێنەرەوەی خۆی بۆ "سەری کوڵم" راکێشێت و بیکاتە ناوەند بۆ وشەکانیتر. واتە وشەکانیدی لە خزمەت گرنگی و پێگە و واتای "سەری کوڵم" دان.. گەر "سەری کوڵم" لەو شیعرە دەربهێنیت، ئیدی سەرتاپای پێکهاتەی شیعرەکە تێکدەڕمێت، چونکە "سەری کوڵم" لەم شیعرەدا بۆ نووری سەواد دەبێتە شەمعی موتاڵا" هاوکات توڕڕە و زوڵفی یاریش تۆمارێکی شکستەیە بە دەوری "سەری کوڵم"دا و لە سایەی رووناکایی "سەری کوڵم"وە قابیلی موتاڵا و خوێندنەوەیە. واتە ئەم وشەیە، ئەگەر بە زمانی خوازە بدوێین، دەبێتە چرا بۆ روونکردنەوەی کۆی پێکهاتەی شیعرەکە.. با ئاوڕ لە نموونەیەکیتریش بدەینەوە:

**زوڵفت بە قەدتدا کە پەرێشان و بڵاوە**

**ئەمڕۆ لە منی شیفتە ئاڵۆز و بەداوە**

گەر سەرنجبدەن "زوڵف" دەبێتە ناوەندی بەیتەکە.. منی شیفتە دەبێتە پەراوێزی زوڵف، هەم لەبەرئەوەی یەك لە دەلیلەکانی شیفتەبوونی "من" پەرێشان و بڵاوبوونی ئەو زوڵفەیە، هەمیش لەو سۆنگەیەوە کە ئەو زوڵفە داوی بۆ "من" ناوەتەوە و دەخوازێت منی شیفتە بخاتەنێو کەمەندی خۆیەوە. "زوڵف" ناوەندە و وشەکانیتر، یەك لەوان "من" بە دەوری ئەو ناوەندەدا دەخولێنەوە و دەوری خۆدەگێڕن.

پەیوەندی سێیەم: پەیوەندی تەواوکەرانە. من ئەم پەیوەندییەم بەجۆرە ناوناوە، چونکە تاکدێڕی دووەم تەواوکەری تاکدێڕی یەکەمە. واتە نە پەیوەندییەکە هاوتەریبە، نە وشەیەك تێی دادەبێتە سەنتەر، بەڵکو دوو تاکدێڕەکە پەیوەندییەکی تەواوکەرانەیان بە نیسبەت یەکدی هەیە.. با لەم نموونەیە خوردبینەوە:

**بنوێنە برۆ، یەعنی هیلالی سەری ماهت**

**چون وەعدیی ماچی سەری کوڵمت سەری ماهە**

گەر سەرنجبدەین، دەبینین تاکدێڕی یەکەم ناتەواو دەمێنێتەوە گەر تاکدێڕی دووەم نەبێت، واتە تاکدێڕەکان لە چاوەڕوانیی یەکدیدان بۆئەوەی دواجار مانای بەیتەکە کامڵ و تەواوبێت. لە حاڵەتی دووجۆر پەیوەندییەکانی پێشوودا تاکدێڕەکان بۆیان هەیە سەربەخۆیانە و بەتەنیاش بخوێندرێنەوە، بەڵام لەم حاڵەتی تەواوکەرانەیەدا مانای گشتیی بەیتەکە وابەستەی مانای هەردوو تاکدێڕەکەیە لەیەککاتدا. نموونەیەکیتر لەم حاڵەتە:

**بەحری غەزەلم پڕ لە دوڕ و گەوهەرە ئەمما**

**غەواسی دەویٚ یەعنی بە تەعمیقی بزانە**

خودی ئەو "ئەمما"یە نیشانی دەدات کە دەبێت تاکدێڕی دووەم بێتەئاراوە بۆ ئەوەی مانای شیعرەکە لە تاکدێری دووەمدا کامڵببێت.

من پێموایە نالی چ خودئاگایانە، چ ناخودئاگایانە، ئەو پەیوەندییانەی لە شیعری خۆیدا دروستکردووە، هەرچەند ئەم پێوەندییە کەلاسییانە رەگوڕیشەیان لە شیعری کلاسیکی فارسیدایە

و ناتوانین بڵێین نالی داهێنەریانە. ئەوەی نالی دەیکات کەڵکوەرگرتنێکی شاعیرانە و شارەزایانەیە لەم پەیوەندییانە بۆ خولقاندنی شیعرێکی سەرکەوتووی کلاسیکی کوردی.

**کۆچ**: دنیابینی شیعرەکانی نالی لەکوێدا زۆر بە زەقی خۆی دەردەخات؟

**عەبدولخالق یەعقووبی**: راستە نالی شاعیرێکی کلاسیکی بووە، بەڵام کلاسیکییەتی نالی کلاسیکییەتێکی ناداهێنەرانە و لاساییکەرەوانە نەبووە، ئەو شتەی کە تووشی زۆر شاعیری کلاسیکی هاتووە و ئیمڕۆکە لە مێژووی شیعر و ئەدەبیاتدا چ ناو و باویان نەماوە. شیعرەکانی نالی دەروەست و چاولەدەستی گوتارە باو و شێوە ئاساییەکانی شیعری کلاسیك نەبووە، بەو مانایەی کە نەیتوانیبێت جیهانی هزری و جوانیناسیی تایبەت بەخۆی بەرهەمبهێنێت. هەروەها راستە لە هەندێ شوێندا وەك دەمڕاست و قسەبێژی چینێك دەردەکەوێت کە دەستەبژێر و نوخبەی کۆمەڵگا بوون، چونکە ئەوکاتە مەلا و پیاوی ئایینی دەستەبژێری کۆمەڵگابوون، چونکە ئەوان هەلی خوێندنیان بۆ دەرەخسا و دواجار بۆیان هەبوو لە ناوەندەکانی دەسەڵاتی ئاغا و شێخ و میراندا ژیانێکی کەموزۆر جیاواز لە خەڵکی ئاسایی بژین. نالی خۆی یەکێ لە شاعیرانی میرنشینی بابان بووە و بێگومان پێگەیەکی بەرزی لای بابانەکان هەبووە. رەنگە ئەمە وایکردبێت پێگەی کۆمەڵایەتیی نالی زیاتر لە چینە باڵادەستەکان نیزیك بووبێت. ئەمە بە روخساری هەندێ شیعرییەوە دیارە، بەڵام من دژبەو بۆچوونەی سوارەی ئێلخانیزادەم کە پێیوایە شیعری کلاسیکی کوردی بەگشتی نوێنەری چینی بۆرژوا و ئەریستۆکرات بووە و هەربۆیە شاعیرانی کلاسیك نەیانتوانیوە لە ئەدەبیاتی فۆلکلۆری کوردی کە ئەدەبیاتی چینەکانی خواروو و ژێرەدەستی کۆمەڵگەی ئەوکاتی کوردستان بووە، نیزیکببنەوە و جارێکیدی لەنێو بەیت و حەیراندا کاربکەن، بەڕای سوارە، شاعیرانی کلاسیك پێویستیان بە زمانێکی دەستەبژێرانە بووە، چونکە ئەوان خۆیان خەریك و تەرخانکردبوو بە چینێکی تایبەتی کۆمەڵگا و شیعریان بۆ بەرژەوەندیی ئەو چینە دەنووسی.

من لەگەڵ ئەم بۆچوونەدا نیم، بە خاتری ئەوەی دەزانم ئەم بیرۆکەیە شتێکی لەبەرچاونەگرتووە، ئەویش ئەو زەمینە پەروەردەییەیە کە شاعیرانی کلاسیکی تێیداژیاون. نالی لە حوجرە گەورەبووە و لە دەلاقەی کتێب و مەلزەمە و باسوخواس و تاعەت و ئایینەوە لە دنیای

روانیوه. ئەو کەسەی لە گوندێك شوانبێت، رانەمەڕی هەبێت، بەدەم دروێنە و مەڵەغانگێڕانەوە گۆرانی بڵێت یان شمشاڵ بژەنێت، ئاساییە دواجار ئەدەبیاتێکی فۆلکۆلۆری بەرهەمبهێنێت، بەڵام نالی لە زەمینەیەکی جودادا پەروەردەبووە. راستە نالی شاعیری نوخبەکان بووە، و پێموایە ئێستاش هەروایە، بەڵام شیعریشی هەیە خوێنەرەرەی ئاساییش چێژی لێوەردەگرن. لەوانەیە پرسیاربکەین بۆچی نالی کە شیعرەکانی دەستەبژێرانەن، بەڵام دیسان خوێنەرەوی مامناوەندیش پێوەندی لەگەڵ دروستدەکات و هەستدەکات نیزیکایەتی لەگەڵ ئەو جیهانە هەیە، با تەواویش تێینەگات و پڕبەپێست فامینەکات. یەکێك لە سەرچاوەکانی جوانیناسیی شیعری نالی پاژبینی و ورد روانینێتی بۆ شتەکان و دیاردەکان بۆ نموونە:

**چییە گوارە گوناهی، وا بە نەستەق**

**بە گوێ هەڵتاوەسیوە سەر موعەللەق**

ئەم شیعرە گەر سەرنجبدەین رووی لە یارە، بەڵام چاوی لە گوارەکەی بڕیوە. لێرەدا نالی لەرێگای باسکردن لە دۆخی نالەبار و نەگونجاوی گوارە لەڕاستیدا وەسفی زاڵمی و زۆرداری یارەکە دەکات و بەمشێوە پاژبینانە و ناڕاستەوخۆیە مانا و مەبەستی خۆی لەپەردەدا دگەیەنێت. نالی لە زۆر جێدا لە شتە زۆر ورد و پاژەکییەکان دەروانێت و ئەو ئۆبژانە دەکاتە کەرەسەی شیعریی خۆی کە بۆ شیعر وێناکردنیان کارێکی ئاسان و ئاسایی نییە. لەشوێنێکیتردا دیسان گوارە وەسفدەکاتەوە و دەڵێت:

**سەراپای گوارە زەردی ترس و لەرزە**

**دەڵێی عاسی بووە لەو جێگە بەرزە!**

لێرەدا ئیتر مەسەلەکە تەنیا ئەوە نییە کە نالی پاژێکی لە چەشنی گوارە لەگوێی یارەکەیدا دەبینێت، بەڵکو مەسەلەی گرینگ ئەوەیە کە پەی بە زەردبوونی ئەو گوارەیە دەبات کە هەر لە ئەساسەوە رەنگی خۆیشی زەردە کە ئەمەش گەمەیەکە نالی بەو رەنگەی کردووە لەو دۆخە مەترسیدار و پێگە بەرزەدا! لەنموونەیەکیدیدا دەڵێت:

**سەری هەر مووی بەدەنم تەرزە تەمەنایەکە**

**گەردشی تووکی سەرم دووکەڵی سەودایەکە**

نالی هێندە مایکرۆسکۆپی شیعری خۆی لەسەر بابەتەکەی ناوەندگیردەکات کە مووی بەدەن بەرجەستەدەکاتەوە و دەیکاتە تەمەننایەك لە بوونی خۆی بۆ یارەکەی. هاوکات گەردشی تووکی سەری کە دیسان هەر مووی بەدەنە، دەکاتە دووکەڵێك بۆ سەودای خۆشەویستەکەی. ئەمە زۆر پاژبینانە و ورد و ناسکە لە شیعردا کە نالی شوێنی بۆ کردووەتەوە و کردوویەتە کەرەسەی جوانیی شیعرەکەی. دیسان نموونەیەك بۆ دیارکردنی خەسڵەتی پاژبینی لە شیعری نالیدا:

**وا زەن مەبە روخسارەیی تۆ غائیبە قوربان**

**بنوارە چلۆن نەخشە لەنێو دی دەیی تەرما**

نالی بۆئەوەی حزووری روخساری یار بسەلمێنێت، نەخشی ئەو روخسارە دەکاتە خاڵێك لە دیدەیدا" دیدەکەش دیدەیەکی تەرە. واتە لە یەك بەیتدا چەندین وەسف دەکات. روخساری یار نەك هەر نائامادەنییە، بەڵکو ئامادەیە، ئامادەییەکەی لە چەشنی نەقشێکە لەنێو چاویدا، ئەو چاوەی نالی باس لە گریانی ناکات، بەڵکو بە ئاماژەکردن بۆ تەربوونی رادەی تامەزرۆیی و غەریبیی خۆی بۆ یارەکەی وێنادەکات. نالی شاعیری ئیماژ و ئاماژەیە، نەك دەربڕینی راستەخۆ و ریزکردنی دەستەواژە. ئیماژی ئۆبژە وردەکان و ئاماژە بۆ هەستە شاراوەکانی رۆح و گیانی مرۆڤانە.

**کۆچ:** رۆحی شیعری نالی یان شیعرییەتی شیعری نالی چین؟ هەر ئەمانەی کە باستکردن بەشێك نین لەو رۆحییەتە؟

**عەبدولخالق یەعقووبی:** شیعرییەتی شیعر یەك شت نییە بەتەنیا، بەڵکو کۆیەکە یان گشتێکە کە لە دەربڕینی شیعریدا خوویادەبێت. ئەوەی راستیبێت، ئەوە شتانەی لەم دانوستانەدا

باسمانکرد بەشێکی زۆری شیعرییەتی شیعربوون لای نالی. ئەو سێ جۆر پەیوەندییەی کە پێکهاتەی شیعری نالی-دا هەن شیعرییەتی شیعری نالین. نالی زیرەکانە توانیویەتی سیستمێکی شیعریی جوان بسازێنێت. دەی شیعرییەت جۆرێکە لەمە" کە تییدا جوانسازی بکرێت" لەدەقێکدا، وشەکان خاوەن ئاهەنگی خۆیان بن کە دەبنە بەیت ئاهەنگێکی نوێ سازکەن، یەکێتییەکی جوان چێبکەن. وەك چۆن دەڵێیت ئینسانییەت واتە جۆرێکە لە جەوهەر و رۆحی ئینسانی، شیعرییەتیش رۆحی شیعرە، گەوهەر و گەورەیی شیعرە. شیعرییەت خەسڵەتێکە دەبێتە تایبەتمەندی. بۆ نموونە باسی تێکشکاندنی گوتارە باوەکانمان کرد، ئەوە خەسڵەتێکە، جوانی و کارکردن لە ئاست وشە و گەمەی زمانیدا بەشێکە لە شیعرییەتی شیعری نالی، بەشیعرکردنی کەرەسە پەراوێزخراوەکان بەشێکە لە شیعرییەت.. کەواتە شیعرییەت لەبۆشاییدا نییە و نابێت، چونکە ئێمە دەتوانین ئاماژە بۆ دەرکەوتەکانی شیعرییەت بکەین. شیعرییەت شتێکی نادیارنییە، لەوسەرەوە کە نامەوجوود نییە، بەڵام دەشێ لەرێگای جیلوە و دەرکەوتەکانییەوە هەستیپێبکرێت.

**کۆچ:** بۆچی نالی شیعری نووسیوە؟ بەوەی کە هەولێداوە زمانی کوردی لە فەوتان رزگاربکات، یان هۆکاری ئایینی رۆڵی هەبووە.. هەستناکەن پێویستی نالی بووە بۆ شیعر کە هەردەبوو شیعری بنووسیایە، چونکە پێویستی پێبووە؟

**عەبدولخالق یەعقووبی:** ئەم پرسیارەتان بەپێچەوانەی هەموو پرسیارەکانی دیکەتان، لەو پرسیارانەیە دەبێ رووبەرووی خودی شاعیری بکەیەوە. گەر ناچاربم وەڵامی ئەو پرسیارە بدەمەوە، ئەوا من دەبێ باوەڕم بە نییەت و مەبەستی شاعیر هەبێت، واتە دەبێ کەشفی نییەتی شاعیر بکەم" دەبێ لایەنی دەروونیی شاعیر دەربخەم" دەبێ بزانم هەڵوێستی شەخسیی شاعیر بەرامبەر بە شیعر چیبووە. ئەستەمە بڵێم بۆچی نالی، وەك تاکەکەس، شیعر دەنووسێت، بەڵام هەستدەکەم شاعیرێك بەڕاستی شاعیر بێت، ناچارە لە شیعرنووسین، چونکە شیعر دەبێتە ناسنامە بۆی. شیعر دەبێتە ناسنامەیەکی ناشەخسی بۆی، کەواتە دەتوانم پێتبڵێم، وەك لە بەشێکی قسەکانمدا باسمکرد، نالیی شاعیر کە ئیتر تازە ئەو نالییەیە کە کەوتووەتە بەردەستی ئێمە، بۆچی شیعری نووسیوە، بەڵان ناتوانم بە تێڕادیوی پێتبڵێم نالیی تاك، نالی وەك مەلا خدری شاوەیسیی سەدەی نۆزدە، بۆچی شیعری نووسیوە.

**کۆچ:** مەبەستم ئەوەیە بڵێم نالی نەهاتووە شیعر وەك ئامێرێ ببینێت. نالی خۆی شاعیر بووە بۆیە شیعری نووسیوە؟

**عەبدولخالق یەعقووبی:** من دەڵێم کەسێ کە شاعیر بێت کە داهێنەربێت، یەکەم شت کە هانی دەدات شیعر بنووسێت خودی شیعرەکەیە" ئەو چێژەی لە زمان و مۆسیقا و داهێنان و مانای شیعرەکەیدایە پاڵی پێوەدەنێت شیعر بنووسێت. شیعر نووسین بۆ شاعیری رەسەن و داهێنەر بڕیارێك نییە خۆی دەریبکات، بەڵکو تەنیا کردەیەکە کە دەیکات. هەڵبەت هاوکات خواستێکی دەروونیی خۆیشی بەدیدێنێت. بارێك کە دەروونی قورسکردووە، بە نووسینی شیعر لە کۆڵیدەبێتەوە، بەڵام خۆ ناکرێت بڵێین مادام شاعیر ناتوانێت لە جەبری نەنووسینی شیعر بحەلەسێنێت کە واتە بەو مانایەیە کە وا شاعیر بۆ شیعرییەتی رووت شیعری نووسیوە. لەبیرماننەچێت شاعیر دواجار مرۆڤێکە پێش خۆبەتاڵکردنەوەی لە قورساییی شیعرەکەی، وەك مرۆڤێك لەناو کۆمەڵدا ژیاوە، پەروەردەی ژینگەیەکی مرۆییە، ئەزموونگەلێکی ئینسانیی بینیوە، ئاشقبووە، تێکشکاوە، غوربەتی ئەزموونکردووە، لە ژیانی کۆمەڵایەتیی خۆیدا هەندێك جار سەرکەوتووە و جاری وابووە دۆڕاوە، کەواتە لەکۆتاییدا دەقە شیعرییەکەی هەڵگری تەواوی ئەو ئەگەر و ئەزموونانەیە کە دواجار سەرلەبەری هزر و هەست و جیهانبینیی ئەو پێکدێنن، کەواتە بەرهەمی شاعیر بەرهەمێکی ئینسانییە. ئەوە دواتر و لەپاش بە دەقکردنی هزر و هەستی شاعیرە کە خوێندنەوەی مەعریفی یان جوانیناسانەی دەق دێتەئاراوە، بەبڕوای من، شیعرەکە دەبێت وەك شیعر بخولقێت و لەدایکببێت، بەڵام دواجار کە خۆی خستەبەر دیدەی خوێنەرەوە، مانای تێدایە، هەڵوێستی تێدایە سەبارەت بە مەعریفەی سەردەم و مەعریفە باوەکان، جوانیتێدایە، دەبێتە ناسنامەی نەتەوەیی، پاراستنی زمانێکی لەخۆداهەڵگرتووە.. ئەم شتانە شاعیر بۆی دانەنیشتووە و بڵێت با من ئەوە بکەم و ئەوە نەکەم. بێگومان ئێوە وتەنی شیعر ئامێرنییە. شاعیر دانانیشێت بڵێت من ئەمڕۆ لەم شیعرەمدا کار بۆ پاراستنی زمانی کوردی دەکەم، بۆ شیعرەکەیترم ناسنامەی نەتەوەکەم دەپارێزم. شیعر ئەوەنییە، بەڵکو جوانییەکە دەخولقێت، بەڵام ئەو جوانییە هەموو ئەو شتانەشی تێدایە کە شاعیر ناتوانێت پێشوەخت بڕیاریان لەسەربدات. لەبەرئەوەی شیعر هەڵقوڵاوی هەست و سۆز و خودئاگایی و نائاگایی و خەون و خولیای شاعیرە، چونکە شاعیر مرۆڤێکە بارگاوییە بەهەموو ئەو شتانە. شیعر، وەك

گوتم، لەبۆشاییدا ناخوڵقێت، بوونی مرۆڤیش لەبۆشاییدا نییە، لەبەرئەوە لەگەڵ ئەوەدانیم بڵێم من هونەر دەنووسم بۆ هونەر، چونکە خودی ئەم دروشمە خەریکە بڕیارێکدەدات بۆ نووسین. هەرچەند من دەڵێم نالی ئەندازیارە، بەڵام ئەمە مانای ئەوەنییە بڵێم نالی بەپێی پلانێکی پێشوەخت بینای شیعری خۆی چێکردووە. نالی شیعری پێئامێرنەبووە، بەڵام شیعر دوای خوڵقانی، ترشیمان بێت و خۆشیمان بێت، دەبێتە بابەتی هزرڤانی، بابەتی جوانیناسی، بابەتی کۆمەڵناسی، تەنانەت بابەتی سیاسی. سەرباری ئەوە، شیعری داهێنەرانە بۆ ئەم مەبەستانە نانووسرێت کە ئەگەر بنووسرێت لە شیعرییەتی خۆی دادەماڵدرێت و تائاستی ئامێرێتی دادەبەزێت.

**کۆچ:** نالی تاچەند گەمەبازێکی بەتوانابووە، واتا تاچەند گەمەی زمانی ئەنجامداوە؟ دیارە ئەم گەمەیەش لادان دروستدەکات کە پێویستییەکی شیعرە، چونکە لادانە لە باو، ئەمەش وەك لەنووسینێکتاندا لەسەر نالی باسی ئەوەتانکردووە کە ئەمە فریودانی خوێنەرە و پێویستی بە خوێنەرێکی چالاکە تا فریونەخوات. دەکرێت زیاتر لەمبارەیەوە بدوێن و باسی گەمە زمانییەکانی نالی بکەن؟

**عەبدولخالق یەعقووبی:** ئەوەی راستیبێت، لەو نووسینەمدا بەناوی "زەقکردنەوەی زمانیی لە زمانی شیعری نالیدا"، چەندین نموونەم هێناوەتەوە و شیمکردوونەتەوە. لەو نووسینەدا زیاتر لەسەر ئاستی دێڕە شیعرییەکان باسی لادانی زمانی دەکەم. نامەوێت بابەتەکانی ئەو وتارە دووبارەبکەمەوە، بەڵام ئەوەی دەمەوێت لێرەدا وەك زیادکراوێك باسیبکەم جۆرێکیتری لادان یان زەقکردنەوەیەکیدیکەیە کە نالی لە شیعری خۆیدا رەچاویکردووە بۆئەوەی جۆرێك لەپێکەوەگونجان و لێکوەشانەوە لەنێوان بابەتی شیعری و زمانی دەربڕینی ئەو بابەتە سازبکات. واتە، گەر چاولێبکەیت، دەبینی لە ئەزموونی شیعری کلاسیکدا، زمان زۆربەیجار حاڵەتێکی یەکدەست و یەکریتم و یەك ئاهەنگی هەبووە بۆئەوەی زۆر زوو و زۆر سادە مەبەستی شاعیری پێبگەیەنێت، بێئەوەی شاعیر ئەو دەرەتانە بۆ خوێنەرەوەکەی برەخسێنیت کە زیاتر لە دنیای شیعرییەکەی وردبێتەوە و بێئەوەی شێوەی دەربڕین بەلەبەرچاوگرتنی جۆری بابەتی شیعرەکە بێت، بەڵام نالی زیرەکانە توانیویەتی لە زۆرینەی شیعرەکانیدا چەشنێك هارمۆنی و

هاوئاهەنگی کە پێویستی بە هەوراز و نشێوی مۆسیقاییە، لەنێوان زمان و بابەتی شیعرەکەیدا سازبکات. بۆ نموونە، شیعرێکی بەناوبانگی نالی هەیە کە جۆرێك لە تەوسلێدان و پلارگرتنە لە چینێکی کۆمەڵگە، واتە چینی سۆفی ئایین و شێخ مەزهەب. زمانی نالی لەم شیعرەدا تێکەڵەیەکە لە زمانی زبر و لە تەعبیری تەنزاوی و دەربڕینێکی توانجئامێز و تەشەرئاسا. بابڕوانینە بەشێك لەم شیعرە و پاشان بەکورتی لێیبدوێین:

**بنوارە وشکەســـــۆفی و رەقســــــی بە هەلهەلە**

**دیســــــان لە بەحری وشـــکی هەوا کەوتە پێمەلە**

**ئەم ئەرزە مەزرەعەی عەمەلە و کوڵخەنی ئەمەل**

**هەندی بووە بە مەسجی د و هەندی بە مەزبەلە**

**شێخم، چ گەرمە حەلقەیی زیکرت بە رەشبەڵەك**

**حاڵی ئەمــــانە خـــۆ بە جـەنابت مووحەوەلە!**

**دایم لەدووتە مێگەلی ژن، نێرگـــــــــــــەلی پیاو**

**بەم رێشەوە لەپێشەوە بووگی بە سەرگەلە!**

گەر سەرنجی ئەم شیعرە بدەین، دەبینین نالی لەو فەزا یەکدەستەی کە لە شیعری کلاسیکیی ئەو دەمەدا باوبووە، ئەو زمانە پاوانخواز و تۆتالیتارەی کە شاعیران ویستوویانە نییەتی خۆیانی تێدازاڵبکەن بەسەر شیعردا لایداوە. ئەم لادانە لە ئاستی وشە و دەستەواژە ترازاوە و گەیشتووەتە ئاستی پێکهاتەییی شیعرەکە. نالی لەم شیعرەدا بۆئەوەی سەری رمی رەخنەی خۆی لە شێخ و وشەکەسۆفی.. تیژبکات، زمانێکی هەڵبژاردووە کە زمانێکی زۆر تەوساوییە و کاریگەرە لەسەر لەهەرادانی کەشف و کەراماتی شیخ و سۆفی. سەرنجبگرنە دەستەواژەی لە چەشنی "وشکەسۆفی" کە دەشێ لەبەرامبەر مرۆڤی دڵتەڕ داینێین. بڕوانە "رەقسی بەهەلەهلە" کە مەبەستی رەقسێکی نەزانانە و نەشارەزایانە و عەوامانەیە" "بەحری وشکی هەوا" لەبری ئەوەی بەحرەکە پڕی ئاو بێت، پڕی هەوایە کە ئاماژەیە بۆ بۆشایی و هەوەسئامێزبوونی ژیانی چینی باسکراو یان شوبهاندنی موریدەکان بە مێگەل و نێرگەل کە ئاماژەیەکە هەم بە موریدانی ژن و پیاو، هەمیش بە مەڕ و بزن.

**کۆچ:** زۆر باسی گرنگی و جوانیناسیی نالیمان کرد، زۆر لایەنی بەرزی شیعرەکانیمان باسکرد، ئێستا دەمەوێت کۆتا پرسیارم لەسەر لاوازیی شیعرەکانی نالی بدوێین، لاوازی دەقی نالی لەکوێدا دەردەکەوێت؟ ئایا چۆن دەکرێت یان دەکرێت لاوازییەکە پاساوبدرێت؟

**عەبدولخالق یەعقووبی:** نالی وەك هەموو شاعیرێك چ لەئاستی مەعریفە و گوتاریدا، چ لەئاستی جوانیناسی و زمانیدا قابیلی رەخنەلێگرتنە، بەڵام گرنگە بتوانین رەخنەکە ببەستینەوە بەو زەمینە و کۆنتێکستەوە کە شاعیر شیعری تێدابەرهەمهێناوە، نەك خواست و نییەتی خۆمان بکەینە رۆچنەی رەخنەکان" نالی دەبوا وایبنووسیایە، وایبگوتبایە، وایبکردایە!.. ئەمانە رەخنەی زانستینین، چونکە شاعیر دنیای خۆی هەیە" شاعیر لە لانکەی بارودۆخی خۆیدا گۆشدەکرێت و باڵادەکات. رەخنەکار ئەو کەسەیە کە رەخنەکەی لەسەر بنەمای خودی دەقەکەیە، نەك لەسەر ئەو ئامانج و ئایدیالەی لە زەینی خۆیدایە، بەداخەوە تائیستا زۆر رەخنەکاری کورد رەخنە بەمجۆرە تیدەگەن. سەیری ئەم گوزارانە بکەن کە بەلیشاو وەك رەخنە ئاراستەی کەسی وەك نالی دەکرێن: نالی دەبوایە زیاتر ئاوڕی لەلایەنی ناسیونالیستی کورد بدایەتەوە، نالی دەبوایە وەك حاجی قادری نەخشەڕێی کوردایەتیی بکێشابایەتەوە، نالی دەبوا کەمتر رووی لە شیعری ئایینی کردبا و.. هتد. ئەم رەخنانە سەپاندنی خواستی رەخنەگرە بەسەر واقیعی دەقدا و بەسەر ئەو دۆخەی ئەو واقیعەی تێدالەدایکبووە.

بەبڕوای من نالی لە دوو لایەنەوە شایەنی رەخنەلێگرتنە. یەکەم، ئەوەی کاتێ نالی دەیەوێت شیعرێکی ئایینپەروەرانە، ئەویش لە قالبی قەسیدەدا نەك غەزەل، بنووسێت، دەڵێی هەندێکجار فەرامۆشیکردووە کە بە زمانی کوردی دەنووسێت. هەندێك لە شیعرە ئایینپەروەرانە درێژەکانی نالی شیعری دەستەبژێرانەی رووتن و زۆر وشەی عەرەبییان تێدایە. لەم نموونە شیعرانەدا گەڕانەوەیەکی فراوان و لەڕادەبەدەر دەبینرێت بۆ کەلەپوور و سەرچاوەگەلی مەعریفە دینی و فیقهی و شەرعی. بڕوانە ئەم نموونەیەی خوارەوە:

**ئەی ســـــاکینی ریازی مەدینەی مـــــونەووەرە**

**لوتفیٚ بکە، بفەرمـــــوو: مـــــەدینەی منە و وەرە**

**عەرشی بەرین کە دائیرەیە، رەوزە مـــەرکەزە**

**فەرشی زەمین بە عەرسەیی تەیبە موجەوهەرە**

**تەیبە کە یەعنی عەکسی بەقیعی هەموو عەبیر**

**تەیبە کە یەعنی مـــایەیی ئەو میشـکی ئەزفەرە**

ئەم شیعرە لەڕاستیدا لانیکەم بۆ منی خوێنەرەوەی کورد ڕەزاسووك و لەبەردڵان نییە. لەئاستی وشەدا، زۆرینەی وشەکان عارەبیی رووتن و هەولێشنەدراوە لە دووتوێی تەعبیرێکی کوردانەدا خەستوخۆڵیی عارەبیبوونیان تراوبکرێتەوە. لەو سۆنگەیەوە کە ئەم قەسیدەیە شەست و هەشت بەیتە، نالی ناچاربووە بۆ زۆربەی سەرواکانی پشت بە وشەی رەقوتەقی عارەبی ببەستێت کە دیسان فەزای گشتیی شیعرەکەی موعەرڕەباویکردووە. نالی لەم شیعرەدا زیاتر خەریکی زمانبازیی رووت و کایەیەکی رەهای بەلاغییە" ئەم زمانبازی و کایە بەلاغییەش پتر لە خزمەتی گەیاندنی پەیامێکی دیاریکراون تا خوڵقاندنی جوانییەکی شاعیرانە. هەڵبەت ئەم بۆچوونەم بە مانای ئەوە نییە کە نالی لەهەموو شیعرە ئایینپەروەرانەکانیدا تائەو رێژە و رادەیە لە ناسنامەی رەسەنی شیعریی خۆی دوورکەوتووەتەوە. بۆ نموونە، لە شیعری دەستپێکی دیوانەکەیدا کە شیعرێکە لەسەر بابەتی خواپەرەستی، ئەوپەڕی جوانکاریی شاعیرانەی خۆی بەکارهێناوە:

**ئەی جیلوەدەری حوسن و جڵەوکێشی تەماشا**

**ســــــەررِشتەیی دین بێمەدەدی تۆ نییە حاشا**

**زەرڕاتی عوکوســــی کەشتی میهری جەلالن**

**وادێن و دەچن سەرزەدە سوڵتان و شەهەنشا**

لایەنی دووەمی رەخنەی من سەبارەت بە شیعرەکانی نالی رووی لەو دەستەواژانەیە کە پێشتر لە شیعری کلاسیکیدا، بەتایبەت شیعری کلاسیکی فارسی، بەکارهاتوون و نالی هاتووە وەك خۆی و بەبێ ئەوەی لە بێژینگی زمان و چێشکەی مرۆڤی کوردی بدات بەکاریهێناونەتەوە. بۆیە خوێنەری ورد لەو شیعرانەدا بۆیدەردەکەوێت کە شوێنی ئەو وشانە لە پێکهاتەی شیعرەکاندا سروشتی نییە، بەڵام شارەزایی و زیرەکییەکەی نالی لەوەدایە کە زۆرکات دەستبەجێ لەگەڵ ئەوجۆرە گوزارە ناکوردییانە تەعبیری کوردی بەکاردێنێت یان ئەم دەستەواژە بەقەرزوەرگیراوانە دەخاتەنێو زەمینەی گوزارەیەکی رەسەنی کوردییەوە و هاوسەنگیی زمانی و گوتاریی شیعرەکەی دەپارێزێت. بۆ نموونە:

**بڵێ نالی بە ئەربابی وەفا بێن**

**هەموو موحتاجی خاك و بێڵ و پاچین**

لەم شیعرەدا، دەستەوشەی "ئەربابی وەفا" بەڕاستی گەلێجار لە شیعری کلاسیکی فارسیدا بەکارهاتووە" لەلایەکیترەوە، نالی بەهەمانواتا بەکاریهێناوە و چ ناسنامەیەکی خۆماڵی پێنەبەخشیوە، بەڵام دواتر و لە دێڕی دووەمدا (هەموو موحتاجی..) کەمێك فەزا شیعرییەکەی کوردانەدەکات و هاوسەنگیی زمانی و گوتاری شیعرەکە رادەگرێت. نموونەیەکیدیکە:

**لەسەر بەردی گوڵێکی باغی حوسنت**

**هەزار گوڵچینی بێبەرگ و نەوا چین**

"باغی حوسن" یەکێکە لەو دەستەواژانەی نالی بێگۆڕانکاری لە شیعری کلاسیکی فارسیی وەرگرتووە:

**نالی وەرە لادە لە خەدەنگی موژەیی یار**

**ئەو کافرە مەستانە کە غارەتگەری دینن**

لەم شیعرەدا تەنانەت هاوسەنگییەکەش نەماوە، چونکە چ "خەدەنگی موژە"، چ "کافرە مەستانە"، چ "غارەرتگەری دین"، دەستەواژەگەلێکن لە ئەدەبیاتی کلاسیکی فارسیدا بە فراوانی بەکارهاتوون و نالیش وەك خۆی بەکاریهێناونەتەوە.

دەمەوێ لە کۆتایی ئەم دیدارە درێژەدا بڵێم، وتووێژ لەسەر نالی ماندوومناکات، بگرە گوڕ و تینم دەداتێ، بەڵام بەڕاستی دەرەتان بۆ باسکردن و قسەکردن لەسەر شاعیرێکی وەك نالی، دەبێ دەرەتان بێت بۆ باسکردن لەسەر ئیستای خۆمان، لەسەر دۆخی ئیستامان. هاوکات چێکردنەوەی ئەو ناسنامە کولتووری و ئەدەبییە بێت کە تائیستا ئێمە ویستوومانە بۆ مرۆڤی کوردی بسازێنین. پێموایە ناتوانیت ئەدەبیاتێکی نوێ و مۆدێرنی کوردی بەرهەمبهێنی ئەگەربێتو سوننەتی خۆت بە باشی نەناسیت. من هەرگیز نالیم ناخوێنمەوە بۆئەوەی تەنیا بزانم

دوو سەدە بەرلەئێستا چیگوتووە. بۆئەوە دەیخوێنمەوە بزانم لە نالی دەتوانم چیوەربگرم بۆ دروستکردنی ناسنامەی ئیستای خۆم، خۆم وەکو تاکی کورد و خۆم وەکو نەتەوەی کورد. جوانی نالی لەوەدایە کە راستە چێژبەخشە لەرووی جوانیناسییەکەیەوە، بەڵام دنیایەك مەعریفەشی تێدایە، مەعریفەیەك کە دەتوانین بیکەین بە نیشتمانی خۆمان. دەتوانین لەنێو غوربەتی زمانی نالیدا جیهانێکی ئاشنا و ئاسوودە بینابکەین و پتر لەخۆمان بگەین و زێتر بەخۆمان بگەین. کورت و کورمانجی، ئەگەر ئەم وتوێژەی ئەمرۆمان تەنانەت تاقە بستێکی بەپانتایی جوگرافیای خۆشەویستیی نالی و مەعریفە و زمانی نالی و شیعری کوردی زیادکردبێت، ئەوا من خۆشحاڵ و خەنیدەبم.

•••

**هەولێر، زانکۆی جیهان**

**شەممە، ٢٠١٣/٤/٢٧**

# نالی ...

# کەلێنی زمانی بۆ میرایەتی بابان پڕ کردەوە

## چاوپێکەوتن لەگەڵ

## د. حەمە نوری عومەر کاکی

**سازدانی: هەرێم عوسمان**

**کۆچ:** دکتۆر گیان وەك ئەوەی مامۆستای خۆم بوون، ئاگادارم هەندێك بۆچوونتان لەسەر نالی و شیعرەکانی هەیە، لەبەرئەوە بەگرنگی دەزانم ئەو بۆچوونانەت خوێنەریشی لێئاگاداربێت، سەرەتا لە بۆچوونتان لەسەر ئەو بزووتنەوەیە دەپرسم کە بە (قوتابخانەی بابانییەکان) ناسراوە؟ هەروەها پێتانوایە نالی لەناو ئەو بزووتنەوەیەدا چۆن ناسراوە و رۆڵی چۆن هەڵدەسنگێنن؟

**د. حەمە نوری عومەر کاکی:** سەرەتا با لەناوی ئەو بزووتنەوە شیعرییەوە دەستپێبکەین کە نالی و هاوڕێکانی پێکیانهێنا و لە ساڵانی چلەکانی سەدەی بیستەمەوە بەهەڵە ناوی (بابانیان) بەسەردا دابڕیوە.

لێرەدا نامەوێ راستیی دەستەواژەی (قوتابخانەی نالی)و هەڵە و نادروستیی (قوتابخانەی بابان و سێ کوچکەی بابان) دووبارەبکەمەوە، بەڵام ئەوەی پێویستە لێرەدا بۆ گەڕاندنەوەی مافی نالی بگوترێت ئەوەیە: لە واتا و چەمکی ئەو وشە و رستە و دەستەواژە هەڵانەدا، نالی تێدانابینرێت، بەڵکو نالی وردەوردە وندەبێت و پەراوێزدەخرێت کە ئەمەش ناهەقییەکە بەرامبەر هەوڵ و داهێنانەکەی نالی دەکرێت.

لە سەرچاوە باوەڕپێکراوەکاندا، بەتەنیا ئەمین فەیزی بەگ (شیعری کوردی بابان و موڵکی بابان)ی بەکارهێناوە کە ئەویش زۆر بەراست و دروستی واتای مەبەستی ئەو شاعیرانە بووە کە لە ناوچەی سلێمانی و دەوروبەری هاتوونەتەدونیاوە، هەرگیز مەبەستی (قوتابخانەی بابان)و سێ کوچکەی بابان نەبووە، بە بەڵگەی ئەوەی شیعری ئەو شاعیرانەی لە ئەنجومەنی

ئەدیبانەکەیدا کۆکردووەتەوە کە لە ناوچەی هەورامانەوە تا رۆژئاوا و سەرووی کەرکوك ژیاون، نەك بەتەنیا نالی و سالم و کوردی.

هیچ بەڵگە و دۆکۆمێنتێك تائێستا لەبەردەستدا نییە ئەوە بسەلمێنێت، یەکێك لە میرە بابانییەکان بڕیار و فەرمانێکی میرانەی دەرکردبێت کە داوا لە خوێندەوارانی ناوچەکەی بکات بە زمانی کوردی شیعر و بەرهەمەکانیان بنووسن.

میرە بابانییەکان، لەنێوان یەکتریدا بە زمانەکانی تورکی و فارسی و عەرەبی نامەیان گۆڕیوەتەوە، زۆربەی ئەو نامانە لە کتێبخانەی ئەوقافی سولێمانی پارێزراون. ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە میرانی بابان هەستی نەتەوایەتییان نەبووە یان دۆستی ئەدەب و زانست نەبوون، بەڵکو هەوڵی دڵسۆزانەی ئەوان بەڵگەنەویستە کە چەند کۆمەك و یاریدەدەری مامۆستایان و فەقێ و خوێنکاران بوون و هەردەم لە هەوڵی پەیداکردنی کتێب و سەرچاوەی زانستی دەگمەن و بەنرخدا بوون، بەڵام داهێنان و دەستپێکردنەکە، وەك باسکرا لەلایەن نالی و هاوڕێکانییەوە بووە، ئەوە دیاردەیەکی بەڵگەنەویستە کە هەمیشە لەنێو کۆمەڵدا گۆڕانکاری و داهێنانەکان لەسەر دەستی هەڵبژاردە و نوخبەی وەك نالیدا بووە.

بابان میرایەتییەك بوو، میرەکانی خاوەن دەسەڵات و سوپا و لەشکر و سەرمایەی دارایی بوون، بەڵام زمانیان نەبوو کە یەکێکە لە گرنگترین پایە و رەگەزەکانی نەتەوە و دەوڵەتی نەتەوەیی، نالی ئەو کەلێنەی بۆ میرایەتی بابان پڕکردەوە، ئەویش زمانی باڵا بوو، نالی لەسەر بنەمای زمانی ناوچەی سلێمانی زمانی فەرمی بۆ میرایەتی بابان دروستکرد.

**کۆچ:** دەمەوێت لەسەر شێوازی نالی بدوێین، بەوپێیەی ماستەرەکەتان لەسەر شێوازی شیعری کلاسیکە؟

**د. حەمە نوری عومەر کاکی:** نالی خۆبەخۆ دەستیدایە ئەو شێوازە نوێیە، تائێستا توێژەران و رەخنەگران، بەتەنیا باسیان لەوەکردووە، کە نالی لە زمانەکانی عەرەبی و فارسی و تورکیدا شارەزا و بلیمەت بووە، ئەوە راستە، بەڵام هێشتا مەبەستی بەکوردی نووسینەکەی نالییان دیارینەکردووە.

زمان لای شاعیرێکی داهێنەر و خاوەن ڕێباز و شێوازێکی نوێ، پێوەندی بە بیرەکانییەوە هەیە، لای نالی شیعرگوتن بە زمانە دراوسێکان کارێکی ئاسانە، بۆیە شاعیرانی ئەو سەردەمە هەر ئەوەندەیان لەتوانادا بووە، نالیش پێشتر بەو ئەزموونەدا ڕۆیشتووە و بۆخۆی لەو تاقیکردنەوەیەدا سەرکەوتووبووە، بۆیە خۆی بۆ تاقیکردنەوەیەکی گرانتر و پڕ بەهادیکە ئامادەدەکات، ئەویش بە زمانی کوردی نووسینە، لەو دێرە شیعرانەدا کە باس لە هەڵبژاردنی زمانێکی تایبەت دەکات، بیرەکانی تێداڕووندەکاتەوە، دەڵێت زۆرن ئەوانەی بە زمانی بێگانە شیعردەنووسن و بیری وردیان وەك پەتك وایە، بە بەراورد لەگەڵ داوەهەودا و تاڵەئاوریشمییەکانی مندا، بۆیە شیعرنووسین بەو سێ زمانە کارێکی ئاسانە و هیچ هونەرێکی تێدانابینم و من پێش هەمووان کەوتووم و بەزاندوومن، لە تاقیکردنەوەی پێشوودا سەرکەوتووبووم و بەڵگەنامە و پسپۆڕیم تێداهێناوە، ئێستا بەدەستی ئەنقەست من لەو ڕێباز و شێواز و نۆرمە لادەدەم، خۆم بۆ تاقیکردنەوەیەك ئامادەدەکەم کە زۆر لەم شێوازە گرانگتر و قورسترە و کەس خۆی لێنەداوە!.
لای نالی کارکردن لەسەر زمانی کوردی وەك مەلەکردنە لە دەریای عوماندا و غەواسی باشی گەرەکە، گەوهەری زمانی کوردی لێدەربهێنێت.

**(نالی) عەجەب بە قوەتی حیکمەت ئەدادەکا**

**<u>مەعنایی زۆر و گەورە بە لەفزی کەم و بچووك</u>**

شێوازی نالی لە هونەری شیعردا، بەتایبەت لە تەکنیکی دارشتنی دانەکانی زمان لە دێرە شیعرەکاندا، بەشێوەیەکن بەوردی هەست بە زماننناسی نالی دەکرێت، ئەوە نالی نییە بۆ مەبەستی کورتودرێژی کێشی شیعرەکانی دەستکاری کەرەستەکانی زمانی کوردی کردبێت، بەڵکو وەك فیلۆلۆگێکی کارامە دەستکاری مۆرفۆلۆجی زمانی کردووە و لەئاستی سینتاکسدا، لادانێکی دروستی لە سیستێمی زمانی کوردیدا کردووە.

**دەورانییە، وەك هێڵەکی سەودا، سەری گێژم**

**بۆیە بە دەقیقیی مەسەلە هەرچی دەبێژم**

**بێ فائیدەیە مەنعی من ئێستاکە لە گریان**

**بۆ عاشقی بێچارە زووەم ئاوە رژاوە!**

ئەو شێوازەی نالی و لادانەکەی بوو بەشێوازێکی نوێ و ڕێبازێکی ئەدەبی نوێ، چونکە شاعیرانی دوای ئەو، ئەوانەی توانای شوێنکەوتنی ڕێبازەکەی نالی و هاوڕێکانی بوون، بەردەوامییان دا بە بزووتنەوەکەی نالی.

**نالی بە داوە شەعری دەقیقی خەیاڵی شیعر**

**بۆ ئەو کەسەی کە شاعیرە سەد داوی نایەوە**

یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی شیعری نالی، شێوازی یەکگرتوویییە، لەهەموو مەبەستە شیعرییەکان و بۆ هەر بابەتێك شیعری نووسیبێت، ئاستی بەرزی زمان و وێنەی شیعری و هەڵبژاردنی وشە و هونەری جوانکاری لەو شیعرە ناسك وتەڕانەدا دیارن کە بۆ کچ و ژن نووسیونی.

**کۆچ:** سەبارەت بە نووسینی ئەو بابەتانەی تابوون، بە نمونە سێکس بۆچوونتان چییە؟

**د. حەمە نوری عومەر کاکی:** بابەتی سێکس لای نالی هیچی لە بوار و مەبەستە شیعرییەکانیدیکەی کەمترنییە، نالی بە قەدەر فراوانی پانتایی بوونی سێکس لەگەڵ بوونی مرۆڤدا گرنگیی بە دەربڕینی ئەو لایەنە گەورەیە داوە. شیعرەکانی لەم بابەتەدا ئەوەندە بەوردی و ناسکی نووسیون نرخ و بەهای ئەو شیعرانەی لەئاستی جگەرگۆشەکانیدیکەی تێپەڕاندووە. جگەلە چامە گەورە و پڕهونەرییەکەی کە بۆ مەستوورە خانمی نووسیوە، لە زۆربەی زۆری غەزەل و پارچە شیعرییەکانیدا، بەشێوەیەکی جوان و ڕاستەقینە باس لە حەز و چێژ و لەزەت و خرۆشان و هەژانی جەستەیی و موچوڕکی تێربوونی کاتی گەیشتن بەئاسوودەیی و خۆشی وەرگرتن لە ئەندامە سێکسییەکانی کچ و ژن دەکات، زۆرجار ناوی ئەو ئەندامانەی بەڕوون و ئاشکرا هێناوە، جارجاریش بە هونەرە ڕەواننبێژییەکان و بەشێوازە تایبەتەکەی خۆی باسی لەو حاڵەتانە کردووە.

له دیوانی نالیدا ئاوڕدانەوەیەکی زۆر و لەبەرچاو بۆ ئەندامــی ژن هــەیــە، ئــەوەی خــۆشــی دەگەیەنێتە ژن و پیاو.

نالی لەغەزەلەکانیدا ئەم باسانەی بەوردی و قوڵییەوە باسکردووە، ئەگــەر زۆر بــەوردی نەخوێنرێنەوە ئەو واتایە و فرە واتاییەکانیان دەرناکەون، لە پارچە شیعرێکی پــێــنــج دێــڕیــدا (ئیلتیقایی پۆڵاد و ئاسن) کۆمەڵێك مانا و وێنەی داهێنانی شیعری کۆکردووەتەوە یەکێك لــەو مانایانە، باس لە ئەندامی مێینەی ژن و نێرینەیی پیاو دەکات، کۆکردنەوەی ســارد و گــەرم، بزوێن و وەستاو، ئاو و ئاگر لە پۆڵا و ئاسندا کە بەپێی لۆژیکی باسێکی دژبەیەکترین، بەڵام کــە پێکەوە بڕیاری بزووتنەوە دەدەن، هەریەکەیان ئەویدیکە تەواودەکــات. ئــەو شــیــعــرە لــەڕووی داهینانەوە یەکێکە لە شیعرە بەرزەکانی نالی.

**گوڵبنی قەددت لە قوببەی سینە غونچەی کردووە**

**غونچە بـــەم شـــیرینییە قەت نەیشـــەکەر نەیکردووە**

**بۆ مــــــەمك (نالی) چ مندالآنە وەیوەی کردووە**

**خۆش بەهەر دوودەست و دەم گرتوویە ئۆخەی کردووە**

کەواتە نالی لەو بوارەدا دەکرێت، بابەتەکانی بە ئیرۆتیکی راستەقینە دابــنــرێــت. ئــەم شێوازەش پێشتر لە ئەدەبی کوردیدا نابینرێت، هەندێك لە قوتابییە زیرەکەکــانــی نــالــی وەك (ئەدەب و وەفایی) توانیوانە هەندێك لە تایبەتمەندییەکانی شیعری نالی لە بــابــەتــی شــیــعــری ئیرۆتیك و سێکسیدا بنووسن.

تەنانەت لە هەندێك دێڕە شیعری وەسفی جوانی سروشتدا، وشەگەلێکی هــەڵــبــژاردووە، لەجێگایدیکەدا بە واتای سێکسی بەکاردێن.

**کانیی دەزێن بە ئاو و درەخت ئاوسن بە با**

**شایی بەهارە، بولبولە داماد و غونچە بووك**

ماچ لە شیعری نالیدا لەو وشە جوانانەیە کە بە راستەوخۆ و بە چەند دەربڕینێکی جیاواز و بەزۆری لە دێڕە شیعرەکانی نالیدا بە پیرۆزی و بە پڕاوپڕی واتای لەزەت و خۆشی سێکسی بارگاوی کراوە.

**وەفای عەهدە لە من رۆح و لە تۆ ماچ**

**چییە چارەی ئامانەت غیری تەسلیم**

**شەرابی لەعلی روممانیی لە نالی**

**حەرامە بێ مەزەی ماچێکی لێوان**

دەکرێت وەك شێوازگەریی ئاماری ئەژماربکرێت و بەشێوازێکی تایبەتی شیعرەکانی نالی دابنرێت. لە دیوانی نالیدا دوانزە جار وشەی ماچ بەڕوونی و ئاشکرا، بەواتای ماچی سێکسی و دەیانجار بە وێنەی شیعری بە مەبەستی ماچ هاتووە، ئەمە جگەلەوەی (لێو و گولم و لامل و گەردن.. هتد، دیسان کۆمەڵێك وشە و ناوی ئەندامی لەشی مێینەن لە شیعرەکانیدا دەبینرێن.

**لێو و سینەت هەردوویان بۆ من بەدەرخە دابڵێم**

**لەعلی روممانی هەیە، یا لەعل و روممانی هەیە**

ئەو وردەکارییەی نالی لەو دێڕە شیعرەدا کردوویەتی، بەتەنیا لەڕووی دەرخستنی ئیستاتیکی ئەندەمە جوانەکانی لەشی ژنەوە نییە، بەڵکو لەگەڵ ئەوەشدا جوانییەکی بە زمانی دەربڕینەکەشی بەخشیوە، ئەویش بەوەی، لەڕووی پێکهاتەی زمان و داڕشتنی سینتاکسیی زمانی کوردییەوە لادانی کردووە یان بەهێنانەناوەوە و بەکارهێنانی ئارتیکەڵ و ئامرازی شێوەزارەکانیدیکەی زمانی کوردی.

هەردوویان، لەجیاتی هەردووکیان، جگەلە کێشی شیعرەکە واتاکەشی فراوانتردەکات، چونکە لە (هەردووکیان)دا بەتەنیا واتای لێو و مەمك دەبەخشێت، بەڵام لە (هەردوویان) دا، واتای هەردوو لێو و هەردوو مەمك دەبەخشێت کە پێکەوە دووجووت دەکەن. هەروەها

بەکارهێنانی (بەدەرخە)و (دابلێم) لەبرێتی (وەدەرخە)و (تابلێم) ئەم جوانییانە سەرباری جوانی واتاکان جوانییەك بە ڕێکخستنی وشەکان و ڕستە شیعرییەکەش دەدات.. کەواتە دەتوانرێت ئەو ڕاستییە بگوترێت کە نالی بەلانسی جوانییەکانی بە شێوەیەکی وردو و ئەندازیارییانە ڕاگرتووە و هیچ کامیانی فەرامۆشنەکردووە.

**کۆچ**: وەك کۆتا پرسیار دەمەوێت لەبارەی گرنگی نالی بۆ ئێستا بدوێن؟

**د. حەمە نوری عومەر کاکی:** لە فەرهەنگی ئەدەبیدا و لە مێژووی ئەدەبی جیهانیدا زۆر جار وشەی (نەمری) یان (زیندوویی دەق)و ناوی نووسەرێکی داهێنەر دەبینرێت، نالی لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەیەمدا ڕێنیسانسێکی لە زمان و ئەدەبی دیالێکتی کرمانجی ناوەراستدا بەرپاکرد، بەرهەمی ئەو ڕێنیسانسە بۆ ئەمڕۆ و بەدڵنیاییەوە لەداهاتووشدا بەسوود و بەکەڵك دەبن، ئەو تێکستانە هاوشانی پەندی پێشینان و وتەی کاریگەر، لەگەڵ ناوی نووسەرەکانیاندا بەبەردەوامی دەژین و لەکاردادەبن، هەندێك تێکست هەیە خۆی خۆی ئەبدەیتدەکات، تێکستەکانی نالی ئەو زیندوویی و تەڕی و توانایەیان هەیە، هەندێ لە شیعرەکانی نالی دەکرێت لەئێستادا ببنە کەرەستەی فیکری و ئەدەبی بۆ شاعیر و هونەرمەندانی ئەمڕۆ. تەنانەت کەرەستەیەکی خاوی بەپێزن بۆ توێژینەوەی زانستی زمان.

زۆر هەن لەو هونەرمەندە جیهانیانەی ئەمڕۆ، لەداهێنانەکانیاندا تابلۆکانی ڤانکوخ و میکایل ئەنگیلۆ و دافنشی وسلفادۆر دالی دەکەن بە ڕوانگە و ڕەهەندی کارە نوێکانی ئەمڕۆیان.

لە ئەدەبی هاوچەرخی کوردیشدا، زۆرن ئەو شاعیر و نووسەرە سەرکەوتووانەی کاریگەری تێکستەکانی نالی و هاوڕێکانی، لە قوولایی بیر و لەدووتوێی میمۆرییەکانیاندا سەقامگیربووە و سەرلەنوێ بیرەکانی نالی بەشێوازێکی هونەری نوێ دادەڕێژنەوە.

•••

# نالی

**ساکار ئەکرەم حەمە ساڵح**

حەزرەتی نالی دەفەرمویٓت:

**نالی نیەتی سحری بەیان، حیکمەتی شیعرە**

**ئەمما نیەتی قووەتی دلْ، قودرەتی ئینشا**

واتا نالی نیازی وتنی شیعری پڕ لە حیکمەت و بەیان و وتاری سیحراوی هەیە، بەلاٌم هێزی دلْ و توانای داهێنانی نییە تەنها خودا ئەم هێزەی دەداتیٚ ئەمەش ئەوە دەسلمێنێت کە هیچ زانست و زانیاری و بەهرە و عیلمێك لە دەستی ئێمەدا نییە هەمووی نیشانەی بەخشندەیی خودای میهرەبانە بۆیە منیش بەناوی خودای بە خشندە ئەم خزمەتە بچووکە لە کانگای زانیارییە بچووکەکەی خۆم پیشکەش بە رۆحی حەزرەتی نالی دەکەم، ئەو هۆنەرە مەزنەی کە دنیاییەك واتایی ورد و گەورەی لەنێو کۆمەڵیٚ وشەی بیگانە بەیەکی دیل و زنجیرکرد، تا ئەو هەست و نەست و ئەوینە پەنگبەستوەی کە بە هەزاران زمان نەدەوێژرا لە سارای بەربلاٌوی بیر و ئەندێشەی چینێکی ئەوینونکردووی دوای خۆی دەربازبکات، نالی ئاوێنەی رۆشنبیری ئەو سەردەمەیە کە تییٚداژیاوە کە رووداو و بابەت و بارودۆخی رۆشنبیری خەلکەکە و کلتوری ئەو سەردەمە و کۆنتریشی لە هەگبەی بیریدا خەست و چڕ پاراستووە و لە کاتی شیعروتندا بە قەلٌەمی بیر و بابەتی جۆراوجۆری لەو هەگبە هەلٌگۆستووە و کردونی بە هەوێنی شیعرەکانی، سەرلەبەری دیوانەکەی نیشانەیەکی بەلٌگەنەویستە بۆ رادەی توانا و بلیمەتی ئەو مرۆڤە لە بوارەکانی زانست و زانیاریدا، ئەنجا چ زانیاری ئاینی بووبیت، زانستەکانی هاوچەرخ یا لە مەیدانی زانستەکانی شیعر و ئەدەبییات بووبێت، یا لەڕووی نیشتمانپەروەری بوبیت، چونکە ئەو مرۆڤێکی داهینەرە بووە و ناوەڕۆکی بیر و بارستایی دیوان و هۆنراوە و بەرهەمەکانی پیٚماندەڵیٚ، وەك پیرەمێردی هۆنەر دەڵیٚ: تا (مەولەوی)م نەناسیبوو (نالی)م لەلا پەیامبەری شیعری کوردی

بوو، هەروەها دەفەرمووێت: (ئەدەبیات و ئەدیبانی کورد کە بە دووباڵی سیحری حەلاڵ لە ئاسمانی جەلالدا دەوردەکەن یەکەمیان مەولەوییە و دووەمیان نالییە، بە رۆح و سەنعەت و زەوق و شەوق دەخەنە دڵەوە).. نالی لە عالەمی سەنعەت و جناسدا زۆر بالاّیە، ئەگەر بەر ئەم زەمانە بکەوتایە و بمایە کە ئیستا شیعر هاتووەتەسەر ئوسلوبی سەلیسی و رۆح و مەعنا، وێنەی نەدەبوو.

هەندێ شاعیری ناودار شیعری ناوداریان وتووە، بەلاّم ئەوانە تەنها لە قەریحە و تەبیعەتەوە پێگەییون، نالی لە عیلمەوەیە ئەگەربێتو نموونەی جوان و بە تەبیعەتی بنووسین دەبێ هەموو دیوانەکەی بخەینە ئەم لاپەڕەوە، نالی لە سەرجەم شیعرەکانیدا چەندین نموونەی بەرزی شیعری پیشکەشکردووە و ئاواتەخوازبووە رەخنەگرانێك هەبوایە یا خوێندەوارێکی باش هەبوایە تا بەجوانی لە شیعرەکانی ئەو گەیشتایە بۆیە بە دڵێکی پڕ غەمبارییەوە دەڵێت:

**عومرێکە بە میزانی ئەدەب توحفەفرۆشم**

**زۆرم گوت و کەس تێینەگەیی ئێستە خامۆشم**

ئەو گولاڵە سوورەی لەبەهاراندا بەسەر پێدەشت و هەرد و هەڵەت و دۆڵ و دەرەوە و قەدپاڵەکاندا نازدەکات، ئەوەندەی پێناچێ دەژاکێت وسیسدەبێت دەبێتە پووش و پەلاّش، بەلاّم لە شیعری شاعیرەکاندا هەر گولاڵەیە و نازی خۆی دەکات و دەشنێتەوە ئەوکاتانەی شیعرەکانیان دەخوێنینەوە گولاڵە سوورەکە کتومت وەك سروشتی جوانی خۆی دێتەبەرچاوت وادەزانی هەڕەتی بەهارە و سەرنج لە خەرمانی گولاڵە دەدەیت، ئەم سەرزەمینەی کە ئێمە و باوباپیرانمان تێیداژیاوە و چووە گەلێك لە پیاوانی گەورە و ناودار و زانا و قارەمانی پەروەردەکردووە کە تاهەتایە ناویان وەکو ئەستێرەگەشەی بەرەبەیان لە ئاسمانی عیلم و زانست و هونەر و شیعر و ئەدەبیاتدا دەدرەوشێتەوە.

شاعیری بەناوبانگی کورد نالی یەکێکە لەم شاعیرە بەناوبانگەی کورد کە شیعرەکانی وەکو ئاواز و بانگی بولبولی بەرەبەیان لە باخچەی شیعر و ئەدەبیاتدا دەنگدەداتەوە، خاوەن ئەندێشەیەکی فراوانبووە وەك مامۆستا (نامی) بەڕەحمەتبێ لە سەرەتای دیوانی مەولەویدا فەرموویەتی: ((لە کۆشی ئەم کوردەوارییەی ئیمەدا گەلێ ئەدیبی پایەبەرز پەروەردەبوون کە

بەگوێرەی سەردەم و ڕێوشوێنی خۆیان هیچیان لە ئەدیبانی بەناوبانگی ولآتانیتر کەمترنەبوو، بەلاّم کەمیان بۆیان هەلّکەوتووە لەگەلّ مردنیایانا ناویان کوێرنەبیتەوە و نیشانەیەکیان لەپاش بەجێبمێنی و هەوالێکی کەموکورتیان بزانرێ)).

هەروەك باسمانکرد ئەو بارودۆخە ئەدەبییەی نالی تێداژیاوە، کاریتێکردووە و زیرەکی و بلیمەتییەکەشی پالپێوەناوە هەرچی جوانکاری و وشەئارایی هەیە بەکاریبینی، لەبەرئەوە شیعرەکانی بێجگەلە قوولّی مەعنا و ناسکیی هێما، پڕیشن لە (موحەسناتی بەدیعی) جا لەبەرئەوەیە نالی بۆدەرخستنی ئەو جوانییانەی شیعرەکانی ڕێبازی عیلمی ((بدیع))ی گرتووە، شوێنپێی ڕەوانبێژی بەلاغەی عەرەبی هەلّگرتووە، نالی لە سەدەی نۆزدەهەم ژیاوە لەگەلّ ئەوەدا ژیانیکی سەختی گوزەراندووە، بەلاّم مرۆڤێکی بەهرەوەر و بەهرەمەندبووە، جگەلە زمانی کوردی هەرسێ زمانە ڕۆژهەلاّتییە ناسراوەکانی (عەرەبی و تورکی و فارسی) زانیوە و شارەزایی و ئاشنایەتی لەگەلّ زانست و زمان و ئەدەبیاتی ئەو سەردەمەی ئەواندا هەبووە، چونکە کوردستان یا سەربە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی یا ئێرانی بووە و زمانی ڕەسمی یان فارسی یا تورکی بووە، بێجگە لەوەش کە زمانی عەرەبی زمانی ئاینی پیرۆزی ئیسلام بووە و کوردستانیش تێکڕا یەکێك بووە لەو ولاّتە ئیسلامییانە، سەرەڕایی ئەوەی کە نالی خۆیشی خوێندەوارێکی ئایینی و مەلایەکی موسولمان بووە، جابۆیە نالی ئەگەرچی شیعری بە کوردی هۆنیوەتەوە لە بەشێکی زۆری شیعرەکانیدا وشەی عەربی و فارسی بەکارهێناوە و وشەی زۆری عەرەبی و زاراوەی زانیارییە ئایینیەکانی بەکارهێناوە ئەمەش هەمووی ئەو کاریگەرییەن کە ئایینی ئیسلام لە ناخی دەروونیدا کردوویەتی و لەغەزلێکدا کە بەبۆنەی سەفەری حەجی (نووری رووبادی) وتوویەتی دەردەکەوێ کە نالی خاوەنی ڕێبازی نەقشبەندی و یەکێك بووە لە موریدە ناودارەکانی مەولانا خالید وەك چۆن لە سەرەتای دیوانەکەیدا دەفەرموێ:

**ئەی جیلوەدەری حوسن و جلّەوکێشی تەماشـــا!**

**سەرڕشتەیی دین بێ مەدەدی تـــۆی نییە حاشا**

**بەو ڕەحمەتە عامەت کە دەکا سەنگی سییەهـ زەڕ**

**لەم قولبە کە وەك بەردە، ڕەشە، (رش رشاشا)**

ئەگەر سەیرێکی وشەکانی (دین، مەدەد، ڕەحمەت) بکەین لە زاراوەکانی عیلمی (کەلامن)، هەروەها دەڵێ:

**حەڵاڵی بێ نیکاحی حووری عینم**

**بە جووتێ نازیری شەرع و فەتاوا**

یان دەڵێ:

**هەرچەندە گوناهی دەمەکەت بارە لەسەر لێو**

**حەددی چییە (نالی) کە بڵێ ماچە کەفارەت؟!**

ئەگەر سەرنجی وشەکانی (حەڵاڵ و نیکاح و شەرع و فەتاوە و حەددو کە فارەت) بدەین لە زاراوەکانی عیلمی فیقهن.

بێگومان نالی زۆر بە ناسکیی و وشەئاراییەوە وەسفی خۆشەویستەکەی خۆی دەکا، نالی وەك چەندین نووسەر و ئەوانەی دەربارەی نالی نووسیویانە باسیان لێوەکردووە وەك خوالێخۆشبوو (ئەمین زەکی بەگ و عەلائەددین سەججادی) کە دەڵێن نالی لە تەکیەی قەرەداغ دۆستێکی هەبووە بەناوی (ئایشە) ئەم ئایشەیە تا ئاخروئۆخری سەدەی نۆزدەهەم مابوو مامۆستا (شێخ نووری بابە عەلی) دیویەتی، بەلاَم بەداخەوە لەدیوانەکەیا کەم و زۆر هیچ جۆرە هێمایەك بۆ ئەم ئایشەیە نییە، بەلاَم نالی لە چەند لایەکی دیوانەکەیدا ناوی (حبیبە)ی هێناوە بۆیە بوونی دوو ئافرەت یا زیاتر لە ژیانی هۆنەرێکدا بەتایبەتی لە هەرەتی لاوێدا شتێکی دوورنییە دڵی لاوێك تاسەر بە پەتەوە دەکرێ و لەنێو قەفەزی پۆلاَییندا یا هێلانەی زێرِیندا توندەکرێ و سەر بە دەیان لاوە دەنێ، نالیش یەکێك بووە لە هەموو خەڵکی خودا، هەندێجار نالی (حەبیبە)ی یا (مەحبووبە)ی بەکارهێناوە هیچ کامیان ناوی ڕاستەقینەی یارەکەی نین، چونکە لە کۆمەڵگایەکی وەك ئەو کۆمەڵگایەی ئەو ڕۆژەی کوردەواریدا ئاسانەبووە بۆ مەلایەك دڵی بە ئافرەتێکەوە بووبێ، ناوی ئەو ئافرەتە بزرێنێ بیخاتە هۆنراوەی خۆیەوە، نەخوازەلا ئەگەر بەتەمای خواستنیشی بووبێ بۆیە لەچەند دیریکدا نالی دەفەرمووی:

**پێمدەڵێن (محبووبە ) خێل و قیچە، مەیلی شەڕدەکا**

**خێل و قیچە، یا تەرازووی نازی نەختێ سەردەکا**

هەروەها لەدێڕێکیتردا دەڵێ:

**دەستم لە گەردنی خۆت هەڵمەگرە ئەی (حەبیبە)**

**وابزانە خـــوێنی خۆمە، یا میننەتی رەقیبە**

هەروەها ەڵی:

**خاڵی نییە رەشماری دوو زوڵفت لە بەلایێ**

**حەڵقەی شەڕییان بەستووە هەرییێکە لەلایێ**

**عاشق دڵی نــــایێ لە دلارامی جـــــودابێ**

**ئـــەڵبەت کە دلارامیی لـــــەوێ، دڵی نایێ**

**نالی و شیعری لە رۆژئاوا:**

ئەدەبی کوردی بەگشتی، ئەدەبی تازە و ئەدەبی کورستانی خواروو بەتایبەتی لەلای رۆژهەلاتناسانی ئەوروپادا جێگەیەکی دیاریان نییە، لەلایەن نالی و شاعیرەکانی دەوروبەری ئەوەوە وێنەیەکی تایبەتی دەبینن، لەوانەیە نالی لەم لایەنەشەوە بەختەوەرترین شاعیر بێت کە هیچ نەبێ بە پیتی لاتینی لەپێش هەموویاندا ناوینوسراوە، نالی هێشتا لەژیانا مابوو کە ناوی گەیشتووەتە ئەوروپا، کە دەڵێن ناوی مەبەست ئەوەیە کە لەئەوروپادا باسی ئەویان کردوە کە شاعیرێك لەکورستانا بووە و ناوی نالی بووە، ئەو کەسایەتییانەی کە نالییان ناسیوە لێرەدا باسیاندەکەین: نالی پەیوەندییەکی تایبەتی لەگەڵ سلێمان پاشای بابان و ئەحمەد پاشای کوڕیدا هەبووە، هەر لەبەرئەمەش بووە ئەحمەد پاشای بابان لە ساڵی ١٨٥٣دا لە پاریس باسی نالی بۆ (خۆدزکۆ) شابەندەری رووسیاکردووە وادەگەیەنێ نالی لەم سەردەمەدا لە شام ژیاوە، چونکە قەسیدە درێژەکەی کە بۆ سالمی هاوڕێی گیانی بە گیانی خۆی ناردووە تێکڕا پرسیارە لە وەزعی سولەیمانی و پاش نەمانی دەوری بابانەکانە، لەپاش زیاتر لە نیوسەدە، کوردناسی ئینگلیزی

(ئی. بی. سۆن) له ساڵی ١٩١٣دا نالی به شاعیری بەناوبانگی نیوەی یەکەمی سەەی نۆزدەم لەقەڵەمدا و له باسی کێش و قافیەی شیعری کلاسیکی کوردی، هەندێ بەڵگە له شیعری نالی دێنیتەوە کە ئەمانەن:

**بۆ هەرکەسی مەبزووله تەریقێکی ئەمـانەت**
**هەر عاشقی بێچاره لەڕێی خەوف و خەتەر ما**
**دیدەم هەموو شۆڕاوە به شۆڕاوی سریشکم**
**لەم لەوحە نیگارینە نە عـەین و نه ئەسەر ما**

هەروەها له ساڵی ١٩٥٥ (تۆمابووا) به مانی فەرەنسی لەوتارێکدا ناوی نالی دەبات.
هەروەها له ساڵی ١٩٥٦ (ڤاسیلی نیکیتین) هۆشیارانه لەبارەی نالی دەڵێ بەبەهرەترین شاعیرانی کوردی سەردەمی تازه لەڕێزی پێشەوە دەبێ ناوی شاعیرانی سەدەی نۆزدەیەم ببەین، ئەمانیش نالی و کوردی و سالم و حاجی قادری کۆیه.
له ساڵی ١٩٦٣دا (جۆیس بلوو) لەبارەی نالییەوە دەدوێ و دەڵێ نالی دەرگای تازەی له رووی ئەدەبی کوردیدا کردەوە .

**نالی و مەبەستی شیعری:**

ئەو مەبەستانەی له شیعری نالیدا رەچاوکراون ئەمانەن:

١. دڵداری کە بەشی هەرە زۆری شیعرەکانی لەم جۆرەیە
٢. وەسف، بەتایبەتی وەسفی بەهار و دیمەنی سروشت و وەسفی حوجرە شەقوشڕەکەی و لێهاتوویی و بوردەباری (کەر)ەکەی
٣. نزا و پاڕانەوە له خوا
٤. بیری ولاتکردن: لەقسیدەکەیدا کە بۆ سالمی ناردووە
٥. لاواندنەوە و پیاهەڵدانی پاش مردن
٦. مدح و پیاهەڵدان

لەکۆتاییدا دەڵێین بە بیبلۆگرافیای ئەو ئوتروحە و لێکۆڵینەوانەی کە دەربارەی هاملێت نوسراون بچۆرەوە دەبینی دوو ئەوەندەی قەبارەی رابەری تەلەفونی هەر پایتەختێکی گەورەیە، هیچ دانیمارکییەکی لە خوێن و گۆشت نییە کە ئەوەندەی هاملێتی لەسەر نووسرابی، لەسەر ئەم وتەیە هەر تاکێکی رۆشنبیر و خوێندەواری کورد قەرزارباری نالین بەم هەموو جوانیئارایی و داهێنانەی لە ئەدەبیاتی کوردا شەوقیداوەتەوە تیشکی چاوەکانمان رۆشندەکاتە کەچی دەست و قەڵەمەکانمان ئەوەندە سست و بیر و هزرمان دۆشداماوە.

•••

سەرچاوەکان


١. دیوانی نالی، لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی، مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس و فاتیح عەبدولکەریم، چاپی دووەم، چاپخانەی میللی ئێران، ١٩٨٠.

٢. بەرکوتیك لە خەرمانی شیعری سالم چەپکێك شیعری بلاۆنەکراوەی سالم پاشکۆیەکی دیوانی نالی، محەممەد عەلی قەرەداغی، بلاۆکراوەی ئاراز، بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەی گشتییەکان لە هەولێر ژمارە ٣٢ی ساڵی ٢٠١٠ی دراوەتێ.

٣. دەستەودامانی نالی، مەسعود محەممەد، دەزگای چاپ و بلاۆکردنەوەی ئاراز، هەولێر، چاپی سێیەم، ٢٠١٠

٤. پیرەمێرد و پێداچوونەوەیەکی نوێی ژیان و بەرهەمەکانی، کۆکردنەوە و لێکۆڵینەوەی: ئومێدئاشنا، بەرگی یەکەم، بلاۆکردنەوەکانی ئاراز، چاپی دووەم، ٢٠٠٩

٥. لە محازەرەکانی د. عادل گەرمیانی، زانکۆی کۆیە، ١٦/١٢/٢٠٠٨ کات ١٠:٣٠ هۆلی (٧)

٦. دیوانی نالی و فەرهەنگی نالی لێکۆڵینەوە و ساغکردنەوە، د. مارف خەزنەدار، بە غدا، دار الحریە، ١٩٧٧، ل١٥

# فایلێکی تایبەت بە



## د. سروش دەباغ

## فایلێکی تایبەت بە ( د. سروش دەباغ )

# ئەخلاق و مەعنەوییەت

گفتوگۆیەکی تایبەت بە گۆڤاری کۆچ

لەگەڵ

# د. سروش دەباغ

سازدانی: موسعەب ئەدهەم

ئەخلاق و عیرفان زۆرترین پانتایی نووسین و قسەکردنی داگیرکردووە، خاکی و جوانبین. لەدوای ئاڵوگۆڕی چەندین نامە بۆ یەکتر و ئاگاداربوون لە دونیای فیکر و فەلسەفە و ئەخلاق و مەعنەوییەت و عیرفان و گەلێك بابەت و پرسیدیکە، داوامليێکرد گفتوگۆیەکی لەگەڵدا سازبکەم. زۆر بەخۆشحاڵی و خاکەڕاییەوە وەڵامیدامەوە لە خزمەتتام، ئیدی پاش سێجار دانانی کات و رۆژی گفتوگۆ، دواجار خۆشبەختانە توانیمان گفتوگۆیەکی تایبەت، هەرچەندە "کورت" لەگەڵ رۆشنبیر و مامۆستای زانکۆی "تۆرنتۆ" لە "کەنەدا" جەنابی "دکتۆر سروش دەباغ" کوڕی رۆشنبیر و فەیلەسوفی ناودار "دکتۆر عبدوالکەریم سروش" سازبکەین. هەرچەندە ئەمە یەکەم گفتوگۆی تایبەت بوو، بەڵام بەیارمەتی خودا دوایین گفتوگۆ و پەیوەندی نابێت، هەروەها گفتوگۆمان کرد لەبارەی کارەکانی باوکی و ئەو کتێبانەی بەندە وەرمگێڕاون. گفتوگۆکە لەبارەی کۆمەڵێك پرس و بابەتی "ئەخلاق و فەلسەفەی ئەخلاق"ە، ئەمەش لەبەرئەوەی ناوبراو هەڵگری دکتۆرایە لەوبارەوە و هەروەها خاوەنی (٤) کتێبی نوسراوە لەوڕووەوە و لە دەرگای کۆمەڵێك بابەتی داوە کە گەر یەکەمجار نەبێت ئەوا بەلایەنی کەمەوە کەمتر لەوڕووەوە قسەکراوە و نووسراوە.

**کۆچ:** دەمەوێت لێرەوە دەستپێبکەم ئەخلاق بۆ چییە؟ بۆچی ئێمە پێویستمان بە ئەخلاق و نیازمەندی ئەخلاقین؟

**سروش دەباغ:** ئەخلاق پەیوەندی بە بابەتی دەبێت "باید"و نابێت "نباید"ەکانەوە هەیە، هەروەها لە کارە رێنوێنیکار "هەنجاری"یەکانە. ئێمەی مرۆڤ کە لەدونیادا دەژین، هەڵبەتە رووبەڕووی کۆمەڵێك شت دەبینەوە. ئێمەی مرۆڤ هەندێ کارو کردارمان هەیە، وەکو خواردن و خواردنەوە و نوستن و قسەکردن.. هتد، ئەمانە کاری ئاسایی و رۆژانەیین، بەلاّم کاتێك کردارەکانمان دەچنەناو بابەتی ئەخلاقەوە و لەژێر ئەخلاق و تایبەتمەندییەکانی ئەخلاقدا خۆیان دەبیننەوە و وەکو"چاکی"و "خراپی"، "دەبێت"و "نابێت"، لێرەدا پێدەخەنەناو بابەت و قەڵەمڕەوی ئەخلاقەوە. بە بۆچوونم ئێمە لەئەخلاقدا لەگەڵ دەبێت "باید"و نابێت "نباید"ەکان رووبەڕووین، زۆرێك لە فەیلەسوفەکان وتویانە مرۆڤ (ئاژەڵێکی ئەخلاقی)یە، بەلاّم لە بابەتەکانیتردا مرۆڤ لەگەڵ ئاژەڵەکاندا بەهەرحاڵ جیاوازی نییە، بۆ نموونە خاڵی هاوبەشی نێوان ئێمە و ئاژەڵەکان، خواردن و خەوتن و خواردنەوە و.. هتد. ئەمانە خاڵی هاوبەشی ئێمە و ئەژەڵەکانە، بەلاّم خاڵی جیاوازی یان ئەوەی بابەتی جیاوازی نێوان ئێمە و ئاژەڵەکانە هەروەك وتم "دەبێت "باید"و نابێت "نابد"ەکان و "ئەخلاقی ژیان"و "ژیانی ئەخلاقییانە"یە، واتە مرۆڤ بوونەوەرێکی "ئەخلاق"ییە، یان "ئەخلاقییانە ژیان" جیاوازی مرۆڤ و ئاژەڵەکان یان بوونەوەرانیترە. ئەخلاقیش واتە لێرەدایە ئەو خاڵە جیاوازەیە، واتە: دەبێت "باید"و نابێت "ناید"ەکان و ئێمەی مرۆڤیش بەپێی ئەو "دەبێت"و "نابێت"انە کار و ژیانی خۆمان رێکدەخەین، ئەمە پێیدەوترێت "ئەخلاق". واتە: بە دەستەواژەی "لیوناس"، "پەروای ئەوانیتر"بوون، هەڵبەتە داخوازی مرۆڤبوونە و داخوازی ژیانی مرۆییە و ئەخلاق لێرەدا دێتە ناوەوە و گرنگی و بابەتی ئەخلاق لێرەدا رۆڵ و پێگەی دەست پێدەکات. و ئەخلاق لێرەدا دێتەناوەوە و گرنگی پەیدادەکات، هەروەها رەفتار و رەوشت و خوو، ئەمەش مانای زاراوەیی ئەخلاقە و ئەخلاقی باش و چاکیش فەزیلەتە باشەکان و رەوشتە چاکەکانن و مرۆڤ بە خوو و رەفتارە چاکەکان و فەزیلەتەکانی وەکو، خێر و چاکە، ئارامگری، راستگۆیی.. تاد، مرۆڤێکی بەئەخلاق دەبێت. بەمە پێشوو عەرزمکرد و روونده‌بێتەوە مەبەست لە ئەخلاق و پێویستی چییە.

**کۆچ:** چۆن دەتوانین لە دونیای نوێ و مۆدێرنەدا ژیانی ئەخلاقی و مەعنەویمان هەبێت؟ (هەڵبەتە لە ئاستی تاك و کۆمەڵگە)دا چۆن دەتونین ئەم ژیانەمان هەبێت؟

**سروش دەباغ:** وابیردەکەمەوە دەتوانین ژیانی ئەخلاقییانەمان هەبێت، بەو مانایەی پەیوەندی تاکەکان لەڕووی ئەخلاقییەوە ڕێکبخەین و ڕەچاوی مافی کەمینە و ئەوانیتریش بکەین ئەمەش بەدەر لە نەژاد و ڕەگەز و پێست و.. هتد، بە بۆچوونم گەر بتوانین کار لەسەر ئەمە بکەین، ژیانی ئەخلاقی دێتەدی و هەمووان دەتوانن بە ژیانێکی ئەخلاقییانە بژین، ڕەنگە جیاوازی ژیانی ئەخلاقییانە لە دونیای نوێدا و ژیانی ئەخلاقی لە دونیای سونەتیدا هەرئەمەبێت. واوێنادەکەم ڕەنگە لە دونیای سوننەتیدا ڕێگە و فەزایەك بۆ کەمینە نەتەوەییەکان نەبووبێت، واتە گەر ئەم پەیوەندییە ئەخلاقییە کە ژیانی ئەوانیتر و مافی ئەوانیترە و حیسابکردن بۆ ئەوانیتر بهێنینەناوەوە ئیدی ئەخلاقییانە ژیان دروستدەبێت. هەڵبەتە فەزا و ژینگەیەك بۆ مەعنەوییانە ژیانیش فەراهەمدەبێت. واتە، ئەخلاقی زیاتر، مەعنەوییانە ژیانیشی بەدوادادێت.

**کۆچ:** گرنگترین پەیوەندی نێوان ئەخلاق و مەعنەوییەت کامەیە؟ یان کامانەن؟ بە مانایەکیتر ئەخلاق و مەعنەوییەت چ پەیوەندییەکیان پێکەوە هەیە؟

**سروش دەباغ:** پارێزگاریکردن و کارلەسەرکردن بنەما و بابەتە ئەخلاقییەکان گرنگترین خاڵی دروستبوون و فەراهەمکردنی بابەتەمەعنەوییەکان و مەعنەوییەتن. ئەو کەسەی ئەخلاقییانە دەژی و پەیوەند و بۆنەکانی لەسەر بنەمای ئەخلاق دادەڕێژێت و ئەمە دروستبوون و پابەندبوونە بە فەزای مەعنەوی و هەوڵدەدات بێسنووری بهێنێتەناوەوە و بچێتە ناو بێسنوور"ی "بیکرانگی" بە دەستەواژەی "سوهرابی سپهەری"و "مەولەوی"و (به سر وقت امر بیکرانگی برود)، واتە: بڕوات بۆ سەروەختی ئەمر بێسنووربوون و (دچار اب دریای بیکران شود)، واتە: دووچاری ئاوی دەریای بێسنوور بێت. ئەمانە پێشەکی ئەمری مەعنەوی و ناوەکی "باطنی"یە لەجیهاندا، بەڵام بەراوردی بە ئەخلاق بریتییەلەوەی "ئەخلاق" مەرجی پەیوەندی و بۆنە "مەعنەوی"یەکانە، بە دەستەواژەیەکیتر ئەو کەسەی ئەزموونە ئەخلاقییەکانی نییە و ناتوانێت لەمڕووەوە تێپەڕبێت، ناتوانێت بچێتەناو ئەم فەزایە و پێبەپێی مەعنەوییەت بڕوات و ناتوانێت بچێتە ئاسمان و لە مەعنەوییەت بەشێك بەرێت.

بۆیە "ژیانی ئەخلاقی"یانە، دەستەبەرکەری "ژیانی مەعنەوی"یانەیە و کەسێك پەروای ژیانی ئەخلاقی هەبێت و بۆنە و پەیوەندییەکانی بەپێی ئەخلاق ڕێکبخات، ئامادەگی ئەوەی تێدابێتە ناو فەزای مەعنەوی و پێبخستە ناو جیهانی "مەعنەویەت"و بابەتە ئاسمانییەکان، بەڵام

ناکرێت کەسێك بانگەشەی "مەعنەوییەت"بوون بکات، بەڵام پەروای "ئەخلاق" و "ئەخلاقیبوون"ی نەبێت.

**کۆچ:** بە بۆچوونی ئێوە دکتۆر ئایا ئەخلاق رێژەیی "نسبی"یە، یان رەها"مطلق"ە؟ بە چ بەڵگەیەك گەر رێژەیی "نسبی"یە، یان رەها"مطلق"ە؟

**سروش دەباغ:** من لە نووسینەکانمدا ئەم بابەتەم هێناوە.

**کۆچ:** دەمەوێت هەر بەکورتی شتێك عەرزبکەیت؟

**سروش دەباغ:** بەڵێ، بەڵام هەر ئێستا بەکورتی عەرزتاندەکەم. من وابیردەکەمەوە بنەمای ئەخلاقی رەها، بەو مانایەی کە دەدرێتەپاڵ "کانت"، بوونیان نییە، بیردەکەمەوە کە دەکرێت بنەمای ئەخلاقیمان هەبێت کە بەهەرحاڵ لە بابەت و بنەمای ئەخلاقییەکانیتردا قەراردەگرن و خۆیان دەبیننەوە، بەڵام بنەمای ئەخلاقی هەڵوەشاندنەوە قبوڵدەکەن "تفکك پذیر"ن، بەو مانایەی لە سیاقێکی ئەخلاقیدا جۆرێکیتر بن. بەمجۆرە برەو بە بابەتی ئەخلاقی بدات بەو مانایەی ئەخلاق نە رێژەیی "نسبی"یە، نە رەها"مطلق"ە. رێژەیی "نسبی" بەو مانایەی کە دەشێ لەرووی بەڵگەی ئەخلاقی "دلایل ئەخلاقی" گفتوگۆیان لەبارەوە بکرێت و رێژەیی بەو مانایەی گفتوگۆی عەقلانی لەبارەوە ناکرێت. واوێنادەکەم کە دەبێت لەنێوان رێژەگەرایی "نسبیە"و رەهاگەرایی "مطلقیت"و "اطلاق گرایی" جۆرێکیدیکە لە روانین و بەڵگەگەرایی ئەخلاقیمان هەبێت.

**کۆچ:** سەرچاوەکانی ئەخلاق بەشێوەیەکی گشتی کامانەن؟ ئایا لەناو "ئایین" یان "دەرەوەی ئایین"دان؟ هەڵبەتە عەرزم گرنگترین سەرچاوەکانی ئەخلاقە؟

**سروش دەباغ:** زۆرباشە، بەڵام پەیوەندی بەوەوە هەیە، پرسیار لەکامە جۆر ئەخلاق دەکەیت؟ ئەخلاقی سیکۆلار، بۆ نموونە عەقڵی کرداری "عقل عملی". لە ئەخلاق سیکۆلاردا یەك لە سێ بەشی ئەخلاق سەربەخۆیە و لە ئەخلاقی دینیدا یەك لە سێ بەشی ئەخلاق نائایینی و لە دەرەوەی ئایینە. من وەکو خودی خۆم وابیردەکەمەوە لەرووی "بەڵگەناسی – دلالت شناسانە"

ئەخلاق سەربەخۆیە، بەلاّم بەشێوەیەکی سەربەخۆ قسەدەکەین. من لەو وتار "مقالات"انەی لەبارەی "حیجاب"ەوە نووسیومن و لە وتاری " تێگەیشتنی شێوازی قورئاندا روونمکردووەتەوە، لەڕووی "بەڵگەناسی"و "بوونناسی" ئەخلاق سەربەخۆیە، بەلاّم لەڕووی "مەعریفەتناسی"یەوە نەخێر سەربەخۆ نییە و لەئاییندایە، ئێمە لەنێوان ئەخلاق و بابەتە ئەخلاقییەکانمان و تێگەیشتنمان لە شێوازی مەتنی پیرۆز "متن مقدس" هەیە.

**کۆچ:** جەنابی دکتۆر ئەخلاقی عاریفانە چۆن دێت بە پیری ئازار و رەنجە دەروونی و مەعنەوییەکانمان و یارمەتیماندەدات؟

**سروش دەباغ:** مانای بە ژیانمان دەبەخشێت، وابیردەکەمەوە ئەو ئەخلاقی عاریفانەیە، مەبەست لە روانینی عاریفانەیە، ئەو روانینەیە کە نەهێڵێێت خۆڵ و خاشاك دەریا پڕبکاتەوە زرمەیەك بەچاواندا بهێنێـ و دابینیانبکات و بە جوانی و روانینی جوانبینییەوە سەیری ژیان و جیهان بکەن، وەك ئەوەی "مەولانا" ئاماژەی بۆدەکات.

"سوهرابی سوپهەری"یش، دەیوت: (ئێمە هیچ، ئێمە نیگا)

یان دەیوت: (بهترین چیزی رسیدن به نگاه است كه از حادپه عشق تر است)، واتە: باشترین شتێك گەیشتنە بەو نیگا و روانینەی کە لە رووداوی "عیشق" تەڕە. ژیانی عاریفانە سورمەیەك بەچاوەکاندا دادەدات و لە جیهانی نەمانی راز و نهێنیدا مانا بە ژیانی خود و جیهان دەدات.

"ئەخلاقی عاریفان"ە یان "نیگای عاریفان"ە یان بەو دەستەواژەی بەندە "ابتهاج عاریفانە"، بەو مانایەیە. تاك مانا بە ژیانی خۆی دەدات و ژیانی مانادارەدەکات.

**کۆچ:** بەڕێز دکتۆر لەنێوان تیۆریا و قوتابخانە فەلسەفییەکان لە فەلسەفەی ئەخلاقدا ئێمە نیازمەندی کامیانین؟ هەڵبەتە مەبەستم ئەو پێداویستی و پێویستی و نیازەیە هەم لە پلەی کردار "عمل"و هەم لە پلەی تیۆریا "نظر"دا کامیان بەدەم چارەسەرکردنی کێشەکانمانەوە دێن؟

**سروش دەباغ:** وەڵلاً پرسیارەکەتان زۆر گشتگیرە و هەمە لایەنە، بەلآم هەر بەکورتی شتێك باسبکەین، وابیردەکەمەوە ئەخلاقی"سوودگەرایی بنەما سەنتەر"، "فائدەگرایی قاعدە محور" بۆ مرۆڤ باشبێت و بۆ رێکخستنی بۆنە و پەیوەندییەکانمان بەدەمانەوە بێت، هەروەها ئەخلاقی "فەزیلەتگەرا"یانە مومکینە ئەو ئەخلاق بێت کەمتر دەستگیریبکات هەم لە حەوزەی سیاسەت و هەم لە حەوزەی بۆنە و بابەتە کۆمەلآیەتییەکاندا، بەلآم بەشێوەیەکی گشتی من وابیردەکەمەوە قوتابخانەی "سوودگەرایی بنەما سەنتەر"، "فائدەگرایی قاعدە محور" زیاتر یارمەتیمانبدات، جێگا جیاوازەکانی ئەخلاق زۆر پیرۆزە، بەلآم بۆ ژیانی رۆژانە و سیاسەت و کۆمەڵگە و بەرێوەبردنی تیۆریای "سوودگەرایی بنەما سەنتەر"، "فائدەگرایی قاعدە محور" زیاتر کۆمەك و هاوکاریماندەکات. من هەم لە وتنەوەی وانەی "ئەخلاق و فەلسەفەی ئەخلاق"دا زیاتر هاودڵیم لەگەڵ ئەودا هەیە و بۆ گەیشتن بە داوەری ئەخلاقی راست و دروست ئەوەش بە لەپێشتر دەزانم.

**کۆچ:** ببورە جەنابی خودی خۆتان چ تیۆریا و قوتابخانەیەکی ئەخلاقی پەسەنددەکەن لە پلەی سیاسەت، هەم لە پلەی مەعیشەت و ژیان و هەم لە پلەی مەعنەوییەت و تاکەکەسیدا؟

**سروش دەباغ:** عەرزمکرد من لە سیاسەتدا لەگەڵ قوتابخانەی"سوودگەرایی بنەما سەنتەر"، "فائدەگرایی قاعدە محور" هاودڵی زیاترم هەیە، هەروەها لە مەیدان و بواری مەعنەوییەتدا لەگەڵ کەسانی وەکو "سپهەری" و "مەولانا" زۆر هاودڵم و بیردەکەمەوە لە عیرفانی مۆدێرن قسەبکەین و لە چەند وتارێکدا بەناوی "پرۆژەیەك بۆ عیرفانی مۆدێرن" کە سێ وتاری لێبلآوبۆتەوە (وتاری یەکەمی لە گۆڤاری "هەژان" ژمارە (٢٥) ساڵی (٢٠١٢) لە لایەن "م. یاسین حەمە سەعید"ەوە هەر بەو ناونیشانە وەرگێڕدراوە و بلآوبووەتەوە. و. کوردی) هەوڵمداوە ئەمە روونبکەمەوە، هەر بەوجۆرەی لە سیستەمی رەفتار "سلوك"یدا "مەعریفەتناسانە"و "مرۆڤناسانە" بەدەستەوەبدەم. من خودی خۆم لەو رێڕەوە دەجووڵێم و وابیردەکەمەوە کە دەبێت پارێزگاری لێبکرێت، هەروەها لە دوو توێدا ئەزموونەکانی رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ ئەمری بالاً "امر متعالی"و ئەزموونی عیرفانی بە دەستەواژەی جەنابی "موستەفا مەلەکیان" ئەزموونی شتەکان و ئەزموونی عیرفانی بزانم و ئەم رێگەیە دەگرمەبەر و "انشاالله" لەوتارێکیتردا لەداهاتوودا بلآویدەکەمەوە، هەروەها واتێدەگەم کە دەبێت لە مەیدان و بواری ژیان و مەعنەوییەتشدا هەم بەش و رۆڵی عەقڵ لەبەرچاوبگیرێت و هەمیش رۆڵ و پێگەی دڵ لەپێشچاوان بێت و عیرفانی مۆدێرنیش هەوڵدەدا وەلآمی ئەم پرسیارانە بداتەوە.

**کۆچ:** به ئەرك نەبێت دکتۆر پرۆژەی نوێتان لەهەر بوارێکدا نووسین یان هەر بوارێکیدیدا بەکورتی چییە؟

**سروش دەباغ:** من ئێستا چەند کارێکم هەیە، هەڵبەتە تاکو ئێستا (٨) کتێبم بە زمانی فارسی بلاّوبوونەتەوە، ئەوانیش:

١. ئایین لە ئاوێنەدا (آئین در آئینه) لەبارەی بیروڕا ئاییناسی عەبدولکەریم سروش.
٢. سکوت و مانا (سکوت و معنا)، چەند لێکۆڵینەوەیەك لە فەلسەفەی ڤیتگنشتاین.
٣. ئەمری ئەخلاقی، ئەمری متعالی، (امر اخلاقی، امر متعالی).
٤. گشت و تایبەت لەئەخلاقدا، (عام و خاص در اخلاق).
٥. چەند دەرس گوتارێك لە فەلسەفەی ئەخلاق، (درسگفتارهایی در فلسفه اخلاق).
٦. لە بارەی رۆشنبیری ئایینی و ئەخلاق.
٧. زمان و وێنەی جیهان، (زبان و تصویر جهان).
٨. تەرنیمی هاوسەنگی غەم، (ترنم موزون حزن).

ئەم کتێبانە لەناو پێگەی ئەنتەرنێتدا بوونیان هەیە و بێجگە بلاّوبوونەوەیان لەناو ولاّتدا.
ئەو کتێبانەش کە لەژێر چاپدان و چاوەڕوانی مۆڵەتن، ئەوانیش:
١. چەند وانە گوتارێك لە فەلسەفەی شیکاریدا، (درسگفتار در فلسفەی تحلیلی).
٢. فیکری ناسکی غەمناك، (فکر نازك غمناك)،.
٣. لە قەڵغانی سوپهەریدا، (در سپهر سپهری)، لەبارەی "سوهرابی سوپهەری".
٤. راڤە و وەرگێڕانی ریسالەی (لۆژیکی - فەلسەفی)، "ڤیتگنشتاین"، بە ناوی"تراکتۆس".

هەروەها بێجگەلەمانە ئێستا خەریکی پرۆژەیەکم لەبارەی "حیجاب"ەوە کە تاکو ئێستا سێ وتارم لەبارەوە نووسیوە و "انشاالله" زیاتر لەسەری دەڕۆم. بەهەرحاڵ لەبارەی خاڵ و هەڵسەنگاندی نێوان "حوکمە فیقهییەکان"و "مەرجە ئەخلاقییەکان"ە و ئێستا خەریکی ئەوەم، لەگەڵ ئەوەشدا پێشتر لە وەلاّمی پرسیارێکتاندا وتم، روونکردنەوەی عیرفانی مۆدێرن لە بوار و مەیدانی مەعنەوییەتدا، ئێستا خەریکی نووسینی وتاری چوارەمی ئەو پرۆژەیەم.

هەوڵدەدەم هەم لە دەستهات و بەرهەمەکانی سوننەت و هەمیش لە بەرهەم و دەستهاتەکانی مۆدێرنە سوودوەربگرم و ئەمەش سالیکان و رێبوارانی وەکو "سپهەری" دەتوانن لەمڕووەوە پیشاندەر و رێنمونیکەر بن و وەکو نموونەیەك کاریان لەسەربکەین هەروەها "مەولانا"و "حافیز".

**کۆچ:** ببوورن هەڵبەت کاتمان زۆر کەمە و پێشتر وتتان کە ئێوەش کاتتان کەمە، "انشاالله" بۆ کاتیتر و دەرفەتیدیکە گفتوگۆ و وتووێژی زیاتر و گشتگیرتر ئەنجامبدەین، بەلاّم لەکۆتاییدا حەزدەکەم کۆتا قسەتان بۆ ئێمەی نیشتەجێبوانی کوردستان و هەموو کوردەکانیتر بفەرموون؟

**سروش دەباغ:** نەمر و سەرکەتووبن، منیش سوپاسی ئێوە دەکەم و سوپاسگوزارم و سلاّوی گەرمم بە هەموو دۆستانی کوردی عێراق بگەیەنن "انشاالله"و هەروەها ئومێدەوارم دۆستانی کورد زمانی خۆشەویستمان بەدوای رۆشنبیری ئاییننییەوە و بتوانین بەدوای ئەو باس و بابەتانە بچین و زانیاری زیاترمان دەستبکەوێت و لە خۆشەویستانی کورد ئومێدگەلێك دەدۆزمەوە کە هەم ئێمەتان لەبەرچاوە و بەدوای کارەکانمانەوەن و هەمیش دەغدەغەی ئەو جۆرە روانینەتان هەیە. من لێرەدا جارێکی سلاّوم هەیە و لەئێوەش سوپاسگوزارم و ئومێدەوارم ئەم چاوپێکەوتنەش بۆ کورد زمانانی خۆشەویست بەرهەمدار و پڕ بەرهەم بێت.

**کۆچ:** ئێمەش لەکۆتاییدا زۆر سوپاستدەکەین بۆئەو دەرفەتەی کە پێتبەخشین و دەڵێین:
خدایا این وصل را هجران مکن.

خواتان لەگەڵ.

●●●

**تێبینی:**

ئەم گفتوگۆیە لە رۆژی (٧ - ٣ - ٢٠١٣) بە تەلەفۆن ئەنجامدراوە. بەداخەوە لەگەڵ داوای لێبوردن لە خوێنەری ئازیز لەبەرئەوە لە کاتی تۆمارکردندا هەندێجار پچڕان لە هێڵدا دروستدەبوو، بۆیە گەر ئالۆزی یان گرێیەك هەبێت لە چاوپێکەوتنەکەدا بۆ ئەو کێشەیە دەگەڕێتەوە، گەرنا هەوڵمانداوە تەنانەت یەك وشەش رەشنەکەینەوە یان نەینووسینەوە.

# کاردانەوەی فەرمانڕوایان لە تەرازووی ئەخلاقدا

## گفتوگۆ لەگەڵ

## سروش دەباغ

و. موسعەب ئەدهەم

**هەندێکجار وا پێویستدەکات لەبارەی کاردانەوەکان و ئەو سیاسەتەی باوانەی کە لەلایەن سیاسەتمەدارانەوە دەیبینین بۆ فەلسەفە و ئەخلاق بگەڕێینەوە و لەبارەی سیاسەتەوە بە حەوزەیەکی لەمجۆرە بسپێرین. لەگەڵ "سروش دەباغ" نووسەر و ئەندامی ئەنجوومەنی حیکمەت و فەلسەفە گفتوگۆمان کرد لەباەری هەڵسەنگاندنی ئەخلاقی فەرمانڕەوایان و سیاسەت پیشەوەران. ئەو لەبارەی پەیوەندی ئەخلاق و سیاسەت، ئەخلاق و ئابووری و بابەتە پەیوەستەکان لەگەڵ یەکتر چەندین وتار و ژمارەیەك کتێبی بلاٰوکردووەتەوە.**

**پرسیار:** دەمانەوێت قسە لەسەر پەیوەندی سیاسەت و ئەخلاق بکەین. ئایا سیاسەت بەپێویست دەبێت لەگەڵ ئەخلاقدا بێت؟ واتە بۆ ڕێکخستنی سیاسەتەکان لەلایەن سیاسەتمەدارەوە، لەبەرچاوگرتنی بنەما ئەخلاقییەکان پێویستییەکە؟

**سروش دەباغ:** هەر بەوجۆرەی کە " ئەرستۆ" دەیگوت، مرۆڤ بوونەوەرێکی مەدەنییە و بۆنەکان و پەیوەندییە کۆمەلاٰیەتییەکان بەشێکی ژیانی مرۆیین. مرۆڤ لە بەشێك لەمامەڵەیدا لەگەڵ دەورووبەر، چەند گوزارەیەك ڕووندەکاتەوە و دەردەبڕێت کە شوێن و پێگەی دیاریان هەیە. بۆ نموونە: لوتکەی "دەماوەند" بەرزترین لوتکەی ئێرانە، ئاو لە پلەی (١٠٠) سلیلیزیدا دەکوڵێت، "سوکرات" مامۆستای ئەفلاتۆنە و.. هتد. بەمجۆرە بەهۆی ئەوەی بوونیان لەدەرەوەیە لە جیهانی دەرەوەدا کەشفدەبن و بوونێکی دەرەکیان هەیە، بەلاٰم هەندێك گوزارە هەن کە دەتوانرێت ناوی بەهایی یان ڕێنوێنیکار"هەنجاری"یان لێبنرێت. گوزارە ئەخلاقییەکان بەتەواوی

بەهایی "هەنجاری"ین. بۆ نموونە: ئەم گوزارەیە کە دەبێت راستگۆیی بکەینە پیشە، لە دووتوێی چەکی بەهایی "هەنجاری"یە. هەرئەمە پەردە لەسەر بابەتی ئەخلاق و سیاسەت لادەدات. بەو مانایەی کە ئێمە لە زانستی سیاسەت و بابەتە تیۆری و فەلسەفییەکان لەگەڵ پرسیارە بەهایی و هەنجارییەکانی لەمجۆرە و لەمرووەوە رووبەڕووین کە چ کەسێك دەبێت حکومەت بکات؟ چۆن دەبێت حکومەت بکرێت؟ ئەو بۆنە و پەیوەندییانەی کە دەبێت سیاسی بن کامانەن؟

لێرەدایە کە دەبینین ئەو پرسیارانەی کە رەنگی بەهاییان هەیە و لە مەیدان و بواری ئەخلاقدا دەخرێنەڕوو، (ئەوەی کە ئەنجامدان یان تەرکی چ کارێك شیاوە) دەچێتە بواری سیاسەتیشەوە، وەکو شیاوی و نەشیاوی تاکێك یان کەسێك کە حکومەت دەکات یان چ سیاسەتێك ئەنجامبدات و چ سیاسەتێك ئەنجامنەدات.

ئەگەر "ئەرستۆ" مرۆڤی ناودەنا ئاژەڵی سیاسی، مەبەستی ئەوەبوو کە سیاسەتکاری لە کاروبارە مرۆییەکانە و لە ریزی ئەو کارانەیە کە پەیوەندییان بە بۆنە کۆمەلآیەتییەکانەوە هەیە و جیاوازی هەیە لەگەڵ ئەو کاروبارانەی کە پەیوەندییان بە بۆنە کۆمەلآیەتییەکانەوە نییە. زانستگەراییش لە حەوزەی چالاکییە مرۆییەکاندا دەگونجێت، بەلآم ناچێتە ناو گوزارە بەهایی "هەنجاریی"کانەوە. کەواتە بە قبوڵکردنی بەشی هاوبەشی ئەخلاق و سیاسەت دەتوانین کاردانەوە سیاسییەکان لە تەرازووی ئەخلاقدا بپێوین. هەر بەوجۆرەی کە رەفتاری کەسێك لەڕووی ئەخلاقییەوە هەڵدەسەنگێنین، دەبێت رەفتاری سیاسەتمەدارانیش لە تەرازووی کاروبارە هەنجارییەکان و ئەخلاقییەکاندا هەڵسەنگێنین. پەیوەندی ئەخلاق و سیاسەت لە رەگەزی پەیوەندی شیر و شەکرە و لە داخوازییەکانی پەیوەندی مرۆییە کە ناتوانرێت لەیەکتری جیابکرێنەوە. هەر بەوجۆرەی کە ناتوانرێ رەفتاری کۆمەلآیەتی مرۆڤەکان لە تەرازووی ئەخلاقدا هەڵنەسەنگێنین، رەفتاری سیاسی مرۆڤەکانیش کە پەیوەستە بە رێکخستنی پەیوەندی لەگەڵ ئەوانیتردا، دەبێت لە تەرازووی ئەخلاقدا هەڵسەنگێنرێن. ئەوەی چ کەسێك دەبێت حکومەتداری بکات و چ سیستەمێکی سیاسی شیاوە، مەشروعییەتی سیاسی لەکوێوە دێت و دەبێت چۆن حکومەتداری بکرێت.

**پرسیار:** دەبێت بۆچوونمان لە ئەخلاق لە مەیدانی سیاسەتدا چۆن بێت؟ ئایا دەبێت ئەخلاقێك تایبەت بە سیاسەت پێناسەبکەین؟

**سروش دەباغ:** لە ئەدەبیاتی کۆنی فارسیدا چەندینجار لەگەڵ چەمکی ئەخلاقدا رووبەڕوودەبینەوە، ئەخلاق کۆی خوو و رەفتار و پەیوەستە بە رەزیلەت و فەزیلەتە ئەخلاقییەکانەوە، ئەخلاق لە تێڕوانینی ئەدەبیاتی کۆندا لە ریزی کاروبارە ناوەکی"دەروونی"یەکان دەژمێردرێت، بەلاّم لە جیهانی نوێدا و لەگەڵ پێناسە نوێکاندا پەیوەستە بە رەفتاری مرۆڤەوە. بە دەستەواژەیەکیتر کاتێك پێشەنگەکانمان لە بەرهەمەکانی وەك سیاسەتنامەی " خواجە نیزام الملك"و کۆمەڵێك پەندنامەکان باسیان لەبارەی شێوە و خووی سوڵتان بوو. واتە، داوایان لە پاشا دەکرد کە مرۆڤێکی میهرەبان بێت، دڵڕەق نەبێت، میهرەبانی بکاتە پیشە، لەسەر بنەمای فەزیلەتە ئەخلاقییەکان کاربکات و هەوڵبدات ئەگەر خۆی بە سێبەری خوا لەسەرزەویدا دادەنێت، فەزیلەتەکان لەخۆیدا بونیادبنێت و بچێنێت و رەزیلەتە ئەخلاقییەکانیش لە خۆی دووربخاتەوە. کەواتە لە جیهانی رابردووشدا پەیوەندی نێوان ئەخلاق و حوکمڕانی بوونی هەبووە و هەوڵدراوە کاردانەوە تاکە کەسییەکان یان کاردانەوە کۆییەکان پاشایان و حوکمڕانان لە تەرازووی ئەخلاقدا بکێشرێن و بپێورێن. هەڵبەتە بەوشێوەیەی کە سەنتەری باسیان رەفتار و خوو و رەوشتە تاکە کەسییەکان بووە، بەلاّم لە جیهانی نوێدا و بەلایەنیکەمەوە لە سێ چوار سەدەدا کە تیۆریاکان و قوتابخانە ئەخلاقییەکان سەریاندەرهێناوە، ئەخلاق تەنها لەسەر بنەمای رەزیلەت و فەزیلەتەکان پۆلبەندی نابێت و زیاتر لایەنی دەرەکی یان "رووکەشی"یان هەیە. ئێمە ئیدی لە جیاتی " رەوشت و خوو" قسە لەبارەی هەڵسەنگاندنی "رەفتار"ەوە دەکەین. لەسەر ئەم بنەمایە ئەگەر دوو قوتابخانەی سوودگەرایی "منفعت"و وەزیفەگەرایی "ئەرکگەرایی" لەبەرچاوبگرین، دەبینین بەها بە بنەما و پۆلبەندییەکان دەدەن کە دەتوانرێ پێوەر و هەڵسەنگێنەری رەفتارەکانی سیاسەتمەداران بێت بەشێوەیەکی دیار و لەبەرچاو.

لەبەرئەوە حەزدەکەم بڵێم کە لە سیاسەتکردن و سیاسەتداری نوێدا، ناچاری و هەڵبژاردنمان لە کێشان و پێوانی کاردانەوە سیاسییەکان نییە. ئیدی فەزیلەت و رەزیلەتی تاکەکەسی هێندە گرنگ نییە. ئەوەی گرنگە ئەوەیە کە کاردانەوەی سیاسەتمەدارێك بە دیاریکردن بەچاو هەبوونی چەند پێوەرێك هەڵسەنگێنین. ئەگەر قوتابخانەی سوودگەرایی لەبەرچاوبگرین، دەتوانین بە جۆرێك هەڵسەنگاندنی بۆبکەین کە ئایا بۆ نموونە: دەستپێشخەری " تۆنی بلێر" لە شەڕی لەگەڵ عێراقدا بەسوودی وڵاتەکەی و سوودە میللی و نەتەوەییەکانی وڵاتەکەی بوو یان نا؟ ئایا کاردانەوەی سیاسی ئەو باشترین سوودی بۆ زۆرترینی مرۆڤەکان

گەیاندووە؟ ئەمە واتای پێدانی یاسا و ڕێسایەکی دیارە بۆ هەڵسەنگاندن و پێوانی ڕەفتاری لەڕووی ئەخلاقییەوە، بەڵام ئەگەر بۆ نموونە لەڕووی وەزیفەگەراییەوە سەیربکەین و بڕوانین، دەبێت ببینین و بزانین سیاسەتەکانی سیاسەتمەدارێك یان دەوڵەتێك، مافی کەمینەکان دەگرێتەخۆ و مافیان دەپارێزێت یان نا؟ ئایا پێشێلکارییەکان کە هەمیشە بە زیانی ژێردەستەکانە، لادەبات یان لانابات؟ ئەم نیگا و ڕوانینە دەبێت و نابێت "باید و نباید"ەکان لەخۆدەگرێت کە دەبێت سیاسەتمەدار لەبەرچاویانبگرێت و بزانێت چۆن سیاسەتمەداری بکات. لەبەرئەوە بەم پێوەرانە هەوڵدەدرێت پێوەری بەڵگەی ئەخلاقی ڕەفتاری سیاسی سیاسەتمەدار لە تەرازووی ئەخلاقدا بپێورێت. واپێدەچێ لە هەڵسەنگاندنی ئەخلاقی سیاسەتدا زیاد لەوەی دامێنی سوود و بەرژەوەندی نەتەوەیی و سیاسەتە گشتییەکان، پارێزگاریکردنی مافی کەمینەکانەکانە کە قورستردەبێت.

کەواتە: یەکەم ئەوەیە کە ناتوانرێت ئەخلاق لە سیاسەت جیابکرێتەوە و پەیوەندی ئەخلاق و سیاسەت هاوشێوەی پەیوەندی شیر و شەکرە. دووەم، ئەوەیە کە لە جیهانی ڕابردووشدا سیاسەت لەلایەن پێوەرە ئەخلاقییەکانەوە هەڵدەسەنگێنرا و دەپێورا. (زیاتر لەڕووی ڕەزیلەت و فەزیلەت)، ( بەڵام لە سەردەمی هۆبز و پێش ئەویش میکیاڤیللی) - کە تیۆریای نوێی سیاسەتکردنیان داهێنا- کێشان و پێوانی ڕەفتارە ئەخلاقییەکانی سیاسەتمەداران بینا لەسەر لایەنە نێوان هزرییەکان و دیاردە دەرەکییەکانی گرتووە.

**پرسیار:** ئایا سەرنجدان لەم بەند و بابەتە هاوبەشە بۆ ئەوەی بڵێین سیاسەتەکان ئەخلاقین، ئیدی بەسە؟

**سروش دەباغ:** بۆ ئەوەی تێبگەین کردارە ئەنجامدراوەکان لەلایەن سیاسییەکەوە تاکو چ رادیەك سوود و بەرژوەندی گشتی دابینده‌کات، دەبێت سەرنج لەم خاڵە بدەین کە ئەگەر کرداری ئەوە بەتەنها سوود و قازانجی گروپێك بێت، ئەوە لەگەڵ گروپگەرایی و خودسەنتەری ڕووبەڕووین نەك سەرنجدان لەگشت و بە گشت یان سوود و بەرژەوەندی گشتی. بەرژەوەندی نەتەوەیی بابەتێکە کە هەمووان تیایداهاوبەشن. لەبەرئەوە لەڕووی سوودگەراییەوە ئەگەر کرداری سیاسەتمەدار تەنها سوود و بەرژەوەندی گروپێکی تایبەت لەبەرچاوبگرێت، ئەوە ئەوکارەی

ئەخلاقی نەبووە. ئەنجامدان یان تەرککردن و فەرامۆشکردنی کارێکە بەهۆی سیاسەتمەدارەوە بە ئەخلاقی دادەنرێت کە زۆرترین سوود بۆ زۆرینەی تاکەکانی کۆمەڵگە بگرێتەخۆ. بۆ نموونە: ئەگەر ئەوانەی دژی "تۆنی بلێر" لە حیزبەکانی ئۆپۆزسیۆن و رۆژنامەنووسان بەشێوەیەکی رەخنەگرانە ئەوە دیاریبکەن کە ئەو کارەی "بلێر" ئەنجامیدا سوودی گشتی تێدانەبوو و بێسوودبوو، ئەوا ئەو بڕیارەی نائەخلاقی بووە. بەم بنەمایە دەتوانرێت کاردانەوی "بلێر" هەڵسەنگێنین و پێوانەی بکەین و لەبارەی ئەو دەستپێشخەرییەی کردی بڕیاری ئەخلاقی بدەین و لەڕووی زۆرترین سوودەکان و کەمترین زیانەکان هەڵیسەنگێنین. زۆربەی سیاسەتمەداران وێنای ئەوەدەکەن کاتێك باس لە ئەخلاق دەکەین، مەبەستمان تەنها رەوشت و خووە، بەلاّم رەوشت و خوو تەنها پێوەرێکە بۆ رێکخستن و دیاریکردنی پەیوەندییەکانمان. ئێمە پێوەریدیکەشمان لە دونیای ئەخلاق و لە جیهانی نوێدا هەیە. ناتوانین تەنها پشت بە ئامۆژە کۆنەکان ببەستین و سنوور و بۆشایی سیاسەتکردنی ئەخلاقی بەتەواوی لەسەر بنەمای خوو و رەوشتی تاکەکەسی سیاسەتمەدار هەڵسەنگێنین و بەتەواوی لە ئەخلاقی فەزیلەتگەرایانە بەهرەوەربگرین. لەو جێگەیەی کە جیهان ناوەنجییەکان و کەسانی مامناوەند پێکیدەهێنن، بۆنە و سیاسەتکردنی سیاسەتمەدارانیش دەبێت ناوەنجی و ناوەندییەکان لەخۆبگرێت و بە لەبەرچاوگرتنیان دەتوانرێت بەشێوەیەکی دیار و بەرچاو بڕیار لەسەر رەفتاری سیاسی سیاسەتمەداران لەڕووی ئەخلاقییەوە بکرێت.

بۆ نموونە هێرشی ئەمریکا و بەریتانیا بۆسەر عێراق لەبەرچاوبگرن، راستە بەم هێرشە دیکتاتۆرێکی وەکو سەددام دەکەوێت، بەلاّم دەبێت بزانین و ببینین پاش ئەو هێرشە چ رووداوێك روویداوە؟ ئایا ئازار و دەردی خەڵکی عێراق کەمتربووەتەوە وەك لە سەردەمی سەدامدا؟ کەواتە بەئاسانی ناتوانرێت بڕیارێکی تەواو و گەورە بدرێت. رووداوەکە زۆر ئاڵۆزە. دەبێت بزانین کە سازگاری و کارکردن دیموکراسی دەم و کات و چەند شتێکی دەوێت کە لە رۆژگاری ئێستای عێراقدا پەیدانابێت. بەلایەنیکەمەوە دەزانین کە بەشێکی گەورەی کۆمەڵگەی عێراقدا لەوکاتەدا ئارامییەکی زۆرتری هەبوو، بەلاّم لەو خێرەی کە ئێستا بەدەستهاتووە و دیکتاتۆرێك رۆیشتووە، ناتوانرێت بەئاسانی خەڵك دابنیشێت. مەبەستم ئەوەیە کە بەوەرگرتنی هەموو پێوەرەکانی سوودگەرایانە، قسە و لێپرسینەوەکانمان بڕیاری بە ئەخلاقیبوونی هێرش بۆسەر عێراق نادەن، لەبەرئەوەی کە رووننییە زۆربوونی سوود و کەمبوونەوەی ئازار و رەنجی لەگەڵدا بووە.

لەڕووی سوودگەرایی ڕێسا سەنتەرەوە، ئەگەر بڕیاربێت سیاسەتی لەمجۆرە " هێرشی نێودەوڵەتی" بگۆڕێت بە ڕێسا و کۆمەڵێك وڵات هێرشیانبکرێتەسەر، مومکینە ئەم کارە بەرفراوانبێت و بگۆڕێت بە ڕێسا و یاسایەکی جیهانی و زۆرێك لە وڵاتەکان وێنای ئەوەبکەن کە دەتوانن هێرش بۆ سەر یەکتربکەن. کەواتە بەمجۆرە و لەم شێوەیەدا پێوەر و هاوسەنگی ئەو دەرد و ئازارەی کە بەدستدێت زیاترە لە سوود و قازانجی. کەواتە بەهەبوونی چاوی ئامۆژەکانی سوودگەرایان دەتوانرێت رەخنە لە رەفتاری سیاسەتمەداران بگیرێت و ئەنجامببینرێ یان تەرککردن و فەرامۆشکردنی کاردانەوەکان چ ئەنجامگەلێك بەباردەهێنێت و ئایا سوود لەخۆدەگرێت یان نا.

ئەوەی دەبێت وەربگیرێت ئەوەیە کە دەبێت سیاسەتمەداران خۆیان لەگەڵ پێوەرە ئەخلاقییەکاندا هاوئاهەنگ بکەن و ئەگەر بەمجۆرە نەبێت، سیاسەت بەرەو هەڵە و تێکچوون دەڕوات. سیاسەتکردن سەرووکاری لەگەڵ مرۆڤەکاندا هەیە و سیاسەتمەدار دەبێت وەڵامدەرەوە بێت. بە دڵنیاییەوە سیاسەتکردن بە کۆتوبەندی ئەخلاقی کۆتوبەندە و سیاسەتمەدارێك کە قسەی خاوەن بەزەییان و رەخنەگران بە واقیعی نازانێت بێگومان بەهەڵەداچووە. هەر بەوجۆرەی کە دەتوانرێت کاردانەوەکانی تاکێکی ناسیاسی لە تەرازووی ئەخلاقدا بکێشرێت و پێوانەبکرێت، دەبێت کاردانەوەی سیاسەتمەدارانیش لە تەرازووی ئەخلاقدا پێوانەبکرێن و بپیوڕێن.

•••

**سەرچاوە:**

سایتی فەرمی دکتۆر سروش دەباغ.

هەروەها لە سایت دیلماسی ایران، ١٠ اسفند سالی (١٣٨٩)شدا بلاوبووەتەوە.

**تێبینی: ئەم بابەتە پێشتر بلاوکراوەتەوە، بەلام بۆ دەوڵەمەندبوونی "مەلەفەکە" پێمانباشبوو جارێکیدی بلاوبێتەوە.**

# ئازاری درۆ و ئەزموونی ژیانی راستگۆیانە

## د. سروش دەباغ

لەبارەی و راستی و راستگۆیی و پەیوەندی بە دەروون و ناخی مرۆڤە و ژیانی ئەخلاقی مرۆڤە دەبێت چەند خاڵێك لەبەرچاوبگیرێن، لە وەرگێڕانی وشەییدا (قسەکردن هاوڕا و یەکسان لەگەڵ واقیع) بە "راستگۆیی" ناودەبرێت. ئەگەر بنەمای راستی یەکسانبوون لەگەڵ واقیع لێکبدەینەوە و بەو مانایە وەریبگرین، سنووری راستی و درۆ دەبێت بەچەند پێوەرێکی جیاواز هەڵسەنگێنین. هەڵەکردن جیاوازە لەگەڵ درۆکردن. بۆ نموونە من پرسیار لە ئێوە دەکەم و دەڵێم: ئەمڕۆ چەند شەممەیە؟ ئێوە دەڵێن دووشەممەیە، لەکاتێکدا ئەمڕۆ سێ شەممەیە. ئێوە هەڵەیەکتانکردووە کە مومکینە لەنائاگاییەوە بێت یان مومکینە بەهۆی باشنەوتنی زمانەوە هەڵەیەك روویدابێت، هەر بەوجۆرەی کە منداڵ توانا و لێهاتنی زمانی نییە و هەموو دۆستەکانی خوشکەکەی بە دادە بانگبکات، بێئەوەی بزانی دادەیەك زیاتری نییە، چونکە دادە کە لێرەدا مەبەستمان خوشکە، ئەو کەسەیە کە پەیوەندی خوێنی لەگەڵدا دایکیدا هەیە و ئەوانیتر هەموویان دۆست یان هاوڕێی ئەون.

ئەگەر ئەم هەڵانە بەئەنقەست و لەڕووی زانینەوە رووبدەن، ئیدی لەگەڵ کرداری درۆکردندا رووبەڕووین. شتێکی بەڵگەنەویستە کاتێك هەڵەکردن بەئەنقەست هاتەناوەوە، ئیدی ئەوە رەزیلەتی ئەخلاقی پێدەڵێن.

له قەڵەمڕەوی تیۆریا ئەخلاقییەکاندا، وەزیفەگەرایەکی وەکو "کانت" له ڕوونکردنەوەی ئەوەی بۆچی نارەوایی درۆکردنه، ڕاستگۆیی دەخاته ڕیزی وەزیفه ئەخلاقییه عەقڵانییەکانی مرۆڤەوە، بەپێی ئەم دیدگایه ڕاستگۆیی له ڕیزی وەزیفه ئەخلاقییه نەگۆڕەکانه له بۆنه و مامەڵەکانی ڕۆژانەدا. لەسەرووی ئەمەشەوە سوودگەراکان باوەڕیانوایه سنووری زۆری و لایەنی زۆری سوود و لایەنی کەمینه و کەمترینی ئازار و دەرد بەهێزکەری بۆنه و پەیوەندییه ئەخلاقییەکانه له کۆمەڵگەیەکی مرۆییدا. لەم ڕوانینەدا، درۆکردن دەرد و ئازاری مرۆڤەکان لەکۆمەڵگەدا دەگەیێنێته لایەنی زۆرینه "حد اکثری"و لەمڕووەوە نائەخلاقییه و دەبێت وەلابنرێت.

بۆ فەزیلەتگەرایانیش ڕاستی هەروەك فەزیلەتەکانیتری وەك، ئازایەتی، ئارامگرتن، میهرەبانی و.. هتد، قبوڵکراون، هەروەك چۆن درۆکردن له ڕیزی ڕەزیلەته ئەخلاقییەکانی وەك: حەسوودی، ڕق و کینه، تۆمەت، و.. هتد، دایه و شتێکی نائەخلاقییه و دەبێت بخرێته کەنارەوە. کەسی خاوەن فەزیلەت درۆناکات و ئەم شته نائەخلاقییه له خۆی دووردەخاتەوە.

تاکو ئێره ڕەوایی ڕاستگۆیی و نارەوایی درۆکردن له ڕوانگەی تیۆریا ئەخلاقییەکان بەدەستهاتووە، بەڵام چیرۆکەکه لێرەدا کۆتاییینایەت. ڕوانینی کۆمەڵناسانه پێماندەڵێت که جیهان نەك مرۆڤه خراپەکان و نه مرۆڤه قەدیس و پاکەکان، بەڵکو مرۆڤه مامناوەندەکان و ئاساییەکان پڕیانکردووەتەوە.

ئەو خاڵەی جێگەی سەرنج بەرهەمهێنانی پێکهاته کۆمەڵایەتییەکان و جۆر و شێوازێکی ژیانه که ئەندامانی ئەم کۆمەڵگەیه بۆ مانەوە و درێژەدان به ژیانی خۆیان نیازمەندی ئەوەن درۆی تێدانەبێت. لێرەدا ئیدی بابەتەکه تەنها خەڵکی هەژار و خوارەوە نییه، بەڵکو کاتێك قسه لەبارەی پێکهاتەوە دەکرێت، ڕۆڵی تایبەتمەندی

سیاسی و فەرهەنگی پڕڕەنگ دەبێت، چونکە بیرکردنەوە لە چارەسەر لەمڕووەوە دەبێتە ئەرکی ئەمان و لە ریزی ئەرکەکانیاندایە. کاتێك بۆ دابینکردن و بەڕێوەبردنی ژیانی ئاسایی بەبێ درۆکردن و تەزویرکردن و رەشوەدان، کاروبارەکان بەڕێوەنابرێن و بەرەوپێشەوە ناچن، ناتوانرێت خەڵکی ئاسایی هێندە سەرزەنشتبکرێت، چونکە زۆربەی مرۆڤەکان بە دەستەواژەی "حافیز": (خرقه تر دامن و سجاده شراب الوده) یان هەیە، واتە: (خەرقەی داوێنتەڕ و بەرماڵی پیسبوویان بە شەراب هەیە)، کاتێك بۆ قەرزکردن، کڕین و فرۆشتنی موڵك و سامان، بەکرێگرتنی خانوویەك، بەکارهێنان لە فلاڵن شوێنی دامودەزگای حکومیدا و.. هتد، راستگۆیی دەبێـە بەربەستی رێگە و رێگری دروستدەکات دەبێت زیاتر و بەشێوەیەکیتر بیری لێبکرێتەوە و لەسەرەتاوە بیربکەینەوە. فەراهەمکردنی پێداویستی و نیازە سەرەتاییەکان لەکۆمەڵگەدا وەزیفە و ئەرکی سەرەکی حکومەتەکانە. ئەو شوێنانەی دابینکردن و دامەزراندن و دابینکردنی پێداویستییە سەرەکییەکان پێویستی بە درۆکردن و تەزویرکردنە، نابێت تەنها تاکەکان ئاگاداربکرێنەوە و پێیانبوترێت، بەڵکو دەبێت بیر لە پێکهاتەی ناتەواوی کۆمەڵگە بکرێتەوە.

خەڵێکیدیکە کە دەبێت لە کۆتاییی ئەم بابەتەدا سەرنجی بخرێتەسەر و جەختی لەسەربکرێتەوە، ئەوەیە کە "راستگۆیی" سەرووتر و لە سەرووی ئەو قسەکردنەیە کە هاوڕا و یەکسانە لەگەڵ واقیعییەت، لەسەرووی راستگۆییەوە، گرتنەبەری ژیانی راستگۆیانە و یەکڕەنگ لێرەدا شتێکی گرنگ و بابەتییە، یەکسانی دەرەوە"ڤاهر"و ناوەوە "باگن"، یەکسانی "خەڵوەت"و "جیلوە"ی مرۆڤ لێرەدا جێگەی قسە و بابەتەکەیە.

ئەزموونی پاك و زولاڵی ژیانی راستگۆیانە بەهادارە. ئەو کەسانەی ئەزموونی ژیانێکی لەمجۆرەیان هەیە لەهەر تاقم و کۆمەڵێکدا بن، (کارمەند و کرێکار و رۆشنبیر و پارێزەر و پزیشك و مامۆستای زانکۆ و.. هتد) دەتوانن بۆ ئەوانیتر نموونە بن، نموونەیەك کە پیشانیدەدات ژیانی راستگۆیانە ئەگەرچی تێچوونی هەیە و وا پێویستدەکات تێچوونی هەبێت و هەندێجار مەحرومبوونی لەگەڵدایە لەهەندێك لە توانا و ئەو شتانەی لەبەردەستدان، بەلاّم هاورێ و هاودەمی سوکباری و سووکبوون و پشتگوێخستن و لەپشتسەرنانی تەزویر و دووڕوویی و هەمەرەنگییە، ژیانی لەمجۆرە و لەمجۆرە ژیان لەگەڵ جۆرێك پاکداوێنی و رەهایی و رزگاری و کردنەوەی دەروازە و والاّیی و فراوانی دەگات و رەزامەندی ناوەکی و ناخ قووڵ بۆ تاك بە دیاری و خەلاّت دەهێنێت.

عبور باید کرد/ و هم نورد افقهای دوور باید شد / و گاه در رگ یك حرفه خیمه باید زد.. / صدای باد می اید، عبور باید کرد / و من مسافرم، ای بادهای همواره /! مرا به وسعت تشکیل برگ ها ببرید / مرا به کودکی شور اب ها برسانید / و کفش های مرا تا تکامل تن انگور / پر از تحرك زیبایی خچوع کنید.

•••

**سەرچاوە:**

سایتی فەرمی سروش دەباغ.

# فەیلەسوف و رۆشنبیر

## سروش دەباغ

هەرچەندە چەندین ساڵە هاودەمی فەلسەفەی "لودویك ڤیتگنشتاین"م، لە بەسیرت و ئاگایی داهێنەرانە و شێوازی فەلسەفەکاری ئەم بلیمەتەی سەدەی بیستەم گەلێك فێربووم و ماوەیەکی زۆرە لە هەوای ئەودا ژیانم کردووە و لەگەڵیدا ژیاوم، بەڵام زیاتر شێوازی ژیانی "راسڵ"م لاپەسەندە، "ڤیتگنشتاین" کە ماوەیەك خوێندکاری "راسڵ" بووە فەیلەسوفی (تراز اول است) کە تزیکەی (٤٠) ساڵ خەریکی بیرکردنەوە بووە و بەرهەم و بەرەنجامی تێڕامانە فەلسەفییەکانی خۆی لەبارەی چەمك گەل و گوتەزای وەك: مانا‌داری، ئایین، هونەر، ئەخلاق، لۆژیك، ئیمان.. هتد، خستووەتە بەردەم ئەوانیتر. نیگا و روانینی نافذی کە لەو وێنانەی لێیبەجێماون ئەوە پیشاندەدەن تاکو چ ئەندازەیەك زیهن و مێشکی خەریکی بابەت و کێشە مەعریفییە و بوونییەکان "ئیگزیستانیسیال"ە ورد و گەورەکان بووە. فەیلەسوفێك کە (بەشێوەی خەڵوەتی خۆی بووە)و لە دونیای زیهنی خۆیدا کەم تا زۆر خاڵی لە دەرەوە ئەوەی لەدەوروبەریدا روویدەدا، نوقمدەبوو و وەکو غەواسێك کە لە قووڵایی زەریادا مەلەدەکات، جارجار سەریدەردەهێنا و دووبارە لە خۆیدا نوقمدەبوویەوە و وندەبوو.

بەڵام "راسڵ" لەقۆناغێکدا کە وەکو فەیلەسوفێکی پیشەگەر کاری فەلسەفی گرنگ ئەنجامدەدات، بەهاوڕێیەتی "جۆرج ئەدوارد مۆر" دەستدەکات بە رەخنەگرتن لە ئایدیالیزمی "هیگڵی" کە لەوکاتەدا لە فەزای "کامبرێج"و کۆتایی سەدەی نۆزدە دەنگ و سەدای هەبوو. بەهاوڕێیەتی "وایتهد" لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا کتێبی بەناوبانگی "بنەماکای ماتماتیك"ی نووسی. بەهاوڕێیەتی "فرگە" لە ئەندێشەی فراوانکردن و دامەزراندنی پرۆژەی "لۆژیکگەرایی"یە و لەم نێوەندەدا لەهیچ هەوڵێك خۆی لانادات. وتاری کلاسیك (لەبارەی بەڵگە)وە لە ساڵی (١٩٠٥) لە بلاوکراوەی "زیهن" بلاودەکاتەوە کە لە کارە نەمر و گرنگەکانی فەلسەفەی شیکاری ئەوە. بە هەڵوەشاندنەوەی نێوان "وێنەی لۆژیکی"و "وێنەی رێزمانی"، "ئایدیای ئەتۆمیزمی لۆژیکی" لە شیکردنەوەی گوزارەکاندا تەرحدەکاتن هەمان ئەوەی کە "ڤیتگنشتاین" دواتر بەتەرحکردنی "تیۆریای وێنەیی مانا" لە "ریسالەی لۆژیکی – فەلسەفی " گەیاندیە کۆتایی خۆی، هەروەها "مێژووی فەلسەفەی رۆژئاوا" دەنووسێت، بەڵام وردەوردە قەبارەی بەرهەمهێنانی فەلسەفی رووتی کەمدەبنەوە و ئیدی "راسڵ" لە قەڵەمڕەویدیکەدا شتەکانیتر ئەزموونەدەکات. جێگەی سەرسووڕمانە ئەم جیاوازییە

رۆیشتنێکی ئاگایانەیە و"راسڵ" بەتەواوی ئاگای لەوەیە لە چ ڕێڕەوێکدا هەنگاوی هەڵگرتووە. ئەو لەشوێنێکدا وتوویەتی کە پاش ماوەیەك لە ئەنجامدانی کاری فەلسەفی سەیری دەوروبەی خۆمم کرد و بۆم دەرکەوت کەسانێك لەم مەیدانەدا هاتوونەتە ناو مەیدانەکە کە هەم لاوتر و هەمیش لە من بەئاگاتر و زاناترە هەم بەهۆش و خوێندەوارتر، لەبەرئەوە سەرنج لە کاریدیکەدا و کەوتمە چالاکی لە حەوزەیدیکەی فەرهەنگیدا. هەندێك باوەڕیانوایە، مەبەستی "راسڵ"، "ڤیتگنشتاین" بووە، هەرچەندە ناوی کەسی نەبردووە. ئەم گومانە کاتێك بەهێزتردەبێت کە بیرمان بێت ئەو بەهاوڕێیەتی "مۆر"و "ڤیتگنشتاین" لە ساڵی (١٩٢٩)دا تاقیکردنەوەیان ئەنجامدا و لەگەڵ ئەوەی "لودویگ ڤیتگنشتاین"ی لاو دکتۆرای لەفەلسەفەدا نەبوو، بەهۆی کتێبی "ریسالەی لۆژیکی - فەلسەفی "یەکەوە کە ناوبانگ و ناوی زۆری بۆ نووسەر بەدوای خۆیدا هێنا، بۆ مامۆستای فەلسەفەی زانکۆی "کامبرێج" یان هەڵبژارد. جیا لەوەی چ کەسێك یان چە کەسانێك جێگەی مەبەستی "راسڵ" بووبن، دیاریکردن و بڕیارێکی لەمجۆرە هۆی گەشە و پێگەیشتنی دەروونی و ئازایەتی و گەورەیی و پشتبەستن بە خودی "راسڵ"ن، بەپێچەوانەی "ڤیتگنشتاین"ەوە کە تاکو رادیەکی زۆر شیفتە و خۆبەگەورەزان و توڕە و توندخوو بوو و بەهۆی هەندێك ئامۆژگاری ناڕەوا ژیانی هەندێك لە فێرخوازەکانی رەشکرد.

بوون بە خاوەنی خودی راستگۆیانە و رووتبوونەوە لەبەرامبەر خود و بستبەبست خۆوالاکردن و ددانپێدانان بە خاڵی بەهێز و لاوازی خود هەڵبەتە کارێکی سادە و ساکار نییە و زۆرێك لە ئەستۆی ئەم کارەدا دەرناچن، چونکە جورئەتی رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ خۆیان نییە و بە بیانووی جۆراوجۆر لە خۆیان رادەکەن. "راسڵ" ئەمکارەی کرد و بەو وێنایەی بۆ تواناکان و ئامادەگییەکان و توانین و نەتوانینەکانی هەیبوو، عەزمی خۆی جەزمکرد و لەسەرووی فەلسەفەکارییەوە، چووەناو مەیدانەکانیتریشەوە. "راسڵ" لەنووسیندا خاوەنی شێواز بوو و پەخشانی سەرنجڕاکێش و پاکی هەبوو و وتارنووسێکی زاڵ و بەتوانا بوو، لەهەمانکاتدا خەریکی ئەو گۆڕانە سیاسی و کۆمەلایەتییانە بوو کە لەدەوروبەریدا دەگوزەران. یەکەمین فەیلەسوفێك بوو کە چووە ناو (بی.بی.سی)یەوە و لەبارەی جەنگی ڤێتنامەوە سەنجی خۆی خستەڕوو، براوەی خەلاتی نۆبڵ بوو، پێداگری بابەتی مافی ژنان بوو، ئایدیا و تێڕامانەکانی لەبارەی ئایین و ئەخلاقەوە نووسی.

•••

**تێبینی:**

ئەم بابەتە جگەلە ماڵپەڕی فەرمی "دکتۆر سروش دەباغ" لە گۆڤاری "مهرنامە"شدا، ژمارە(١٩) ساڵی (١٣٩٠) بلاوبووەتەوە.

# عیشق و فەلسەفە
# گفتوگۆ لەگەڵ
# د. سروش دەباغ

## فەیلەسوف، هەم یاریکەری عیشق و هەم تەماشاچی عیشقە

**دەڵێی عیشق بیانوویەکە بۆ ژیان، شادی و شەوق و وەسوەسە و.. ئاگرپرژێنی، وەکو هەر رووداوێکیتری مرۆیی سەرنجڕاکێش و لەهەمانکاتدا دەتوانێت ترسناکبێت. ئێستا پەیوەندی نێوان عیشق و فەلسەفە دەتوانێت چی بێت؟ فەلسەفە چۆن پێناسەی دەرد و ئازاری بالآبوون "متعالی"ی مرۆڤ دەکات؟ ئایا فەیلەسوفێك دەتوانێت عاشیق بێت؟ بۆ گەیشتن بەم وەلآمی ئەم پرسیارانە رۆیشتن بەدوی "سروش دباغ"دا، "سروش دباغ" دەمانسازە و دکتۆرای خۆی لە زانستی پزیشکی تاران لە ساڵی (١٣٧٧) وەرگرتووە، دەچێت بۆ زانکۆی "وارویك" بەریتانیا دکتۆرا لە "فەلسەفەی ئەخلاق"دا بە روانگەی شیکاری "تحلیلی" لە ساڵی (١٣٨٥) وەردەگرێت. ناونیشانی دکتۆراکەی (دلایل اخلاقی: خاص گرایی، الگوها و ورزیدن)، لە ساڵەکانی (١٣٧٩، ١٣٨١، ١٣٨٥)، "بەڕێوەبەری دامەزراوەی مەعریفەت و توێژینەوە" بووە، ئێستاش وەکو مامۆستا لە "زانکۆی تۆرنتۆ" لە "کەنەدا" خەریکی وانە وتنەوەیە.**

**پرسیار:** بۆچی عاشیقان ئامۆژگاری نابیستن؟ (چون سخت تر شد بند من از پند تو - عشق را نشناخت دانشمند تو)، "شەریعەتی" دەنووسێت: (دەردی مرۆڤ، دەردی بالآبوون، تەنیایی و عیشقە.)، بە بۆچوونی ئێوە "عیشق" چییە؟

**سروش دەباغ:** لەبارەی عیشقەوە دەتوانرێت چەند جۆرێك قسەبكرێت. ئەوەی لێرەدا مەبەستی "شەریعەتی"یە قسەیەکە و ئەوەی کە چەمکی "عیشق" چییە، قسەیەکیترە. ئەگەر مەبەست پرسیاری یەکەم بێت، واوێنادەکەم "شەریعەتی" لەمجۆرە نووسینانەی خۆیدا کە بە "کویریات" بەناوبانگ و ناوداره، زاراوەی "عیشق" بە دوو جۆر و دوو مانا بەکاردەهێنێت. لەشوێنێکدا و لە کتێبی "کویر" و لە وتاری (خۆشویستن لە عیشق بالاتره)، قسە لە خۆشویستنێك دەکات کە سەرنج و روانینی لە دۆزینەوەی نزیکێکی رۆحییە و هەموو ئەو سیفەتە چاکانەی کە عاریفانمان بۆ عیشق باسیانکردوون و ژماردوویانن، دەیانداتەپاڵ خۆشویستن. چەمکی عیشق لەو نووسینەدا مانای نەرێنی "مثبت" نییە، بەلاّم لە نووسینەکانیتری شەریعەتیدا، مەبەستی لە "عیشق" حاڵ و دۆخی سالیك و رێبوارێکە کە دچێنەناو دۆڵی سالیکبوونەوە و کەڵکەڵەی بوونگەرایی "ئەگزیستانیسالیستی" قووڵی هەیە. "عیشق" لە مانای دووەمدا، مەبەستی عیشقی رۆمانتیکی نییە، بەڵکو عیشقێکە زیاتر تێکەڵە بەتەنیایی و زیاتر لەهەر شتێکیتر بە دەستەواژەی "سوهرابی سپهەری"، (ترنم موزون حزن)ە. ئەو عیشقەی کە لێرەدا شەریعەتی بەکاریدەهێنێت من وایلێتێدەگەم جۆرێك هەستکردنە بە فیراق و دوورکەوتنەوە و ئەو شتانەی بۆ سالیك و رێبواری رێ دەستدەدەن. بەهەرحاڵ ئەم عیشقە نە عیشقی رۆمانتیکییە و نە عیشقی ئەفلاتۆنی، بەو مانایەی پەیوەستبێت بە خۆشەویستێکەوە یان ئەو مانایەی کە عاریفانمان لە عیشقی ئاسمانییە و باسی ئەمجۆرە عیشقە دەکەن، بەڵکو مەبەست لەو عیشقەیە کە پەیوەندی بە سروشتی تازیەباری بوون "وجود"ەوە هەیە و لەرەگەزی ئەو شتانەیە کە عاریف و سالیك لە دوودڵیە بوونگەراییەکانی خۆی و لە ئەزموونی خۆی بۆ ئەوانیتر باسدەکات، لەمڕووەوە ئەو دەنگ و سەدایەی لە نووسینەکانی شەریعەتییەوە سەرهەڵدەدات، ئەو عیشقەیە کە بەپێچەوانەی عاریفێکی وەکو "مەولانا" هێندە بە شادی و شادومانی ناگات، بەڵکو جۆرێك خووگرتن و ئولفەتە لەگەڵ غەمگین بوون و تەنیایی.

**پرسیار:** ئایا دەتوانرێت عیشق پۆلبەندی بکرێت؟ ئێمە عیشقی جۆراوجۆرمان هەیە یان یەك عیشق؟

**سروش دەباغ:** بەپێی ئەو دابەشکارییە گشتییەی کە کەسانیتریش کردوویانە، دەتوانرێت عیشق بۆ عیشقی زەمینی یان رۆمانتیکی و عیشقی ئەفلاتۆنی یان نازەمینی دابەشبکرێت. بەپشتبەستن بە سوننەتی و عیرفانی و لەبەرچاوگرتنی ئەوەی عاریفان وتویانە، دەتوانرێت لە چەند روویەکەوە قسە لەبارەی عیشقەوە بکرێت. یەکێکیان هەمان عیشقی رۆمانتیك و زەمینییە، عیشقێك کە زۆرجار و بەگشتی لە قالّبی دەرخستنی پەیوەندی لەگەڵ رەگەزی بەرامبەردا دەردەکەوێت و هەمیشە یان زۆرجار هاوڕایە لەگەڵ پەیوەندی جەستەیی. ئەمە جۆرێك عیشقە کە لە ئەدەبیاتی رابردووماندا قسەی لەبارەوە کراوە و هەروەها لە سەردەمی نوێدا لەگەڵ دەرکەوتنی راگەیاندنەکان، لە ژانرەکانی شانۆ، رۆمان، فیلم، مۆسیقا وێنایدەکرێت. جۆرێکیدیکە لە عیشق، عیشقی نارۆمانتیکی یان "ئەفلاتۆن"یە کە دەتوانرێت لە چەند روویەکەوە قسەی لەبارەوە بکرێت. کاتێك هەیە تاکێك، خۆشەویست و مەعشوقێکی هەیە و کاریگەرییەکی قووڵی لەسەری هەبووە و نزیکی رۆحی لەنێوانیاندا بوونی هەیە و گۆڕینی حاڵ و دۆخی دەروونی و گۆڕانی کەسایەتی تێدادروستکردووە، بۆ نموونە، پەیوەندی "مەولانا" لەگەڵ "شەمس"، یان پەیوەندی "شەریعەتی" لەگەڵ "ئەبوزەر" و ئەو دڵەی کە خۆشەویست لەناو مەعشوقدا هەیە و بەمجۆرە مەفتون و شەیدای کەسایەتی ئەو کەسەیە، هەروەها "ئیقباڵی لاهوری"و ئەو وێنا و روانینەی بۆ "مەولانا" هەیەتی. ئەمجۆرە عاشیقبوونە لەگەڵ عیشقی رۆمانتیکیدا جیاوازی هەیە، چونکە لە ناسینی رۆژانە و ناسراو زیاتر دەڕوات و کەسێك کە کاریگەرییەکی سەرسوڕهێنەری لەمجۆرە و هەمەلایەنەی لەسەر ژیانی تاك دابنێت و ڕێڕەوی ژیانی بگۆڕێت و لەبنەڕەتدا جیهانێکیدیکە دەخاتەبەردەم چاوەکانیەوە، مەعشوقێکی جیاوازە. لەسەرووی ئەوەشەوە، لەژێر عشیشقی نارۆمانتیکیدا دەتوانرێت بەدوای عیشقێکیدیکەوە بچین کە تیایدا هەربەو جۆرەی عاریفەکان وتوویانە، رێبوار و سالیك خودا دەکاتە مەعشوق و مەحبووبی خۆی. لەمجۆرە روانین و مامەڵەیەدا، ئەو خۆشەویست و مەحبوبە، خۆشەویستێکی ئەزەلییە و دەرکەوتن و شتانی دیار و دیاریکراوی لە تاکێکی دیاریکراودا نییە و خودی خودای گەورەیە کە بە مەعشوقی سالیك دەگۆڕێت:

**عشق ان زنده گزین کو باقی است**

**کز شراب و جان فزایت ساقی است**

مەحبووبی ئەزەلی، کاتی و شوێنی نییە، دیاریکردن و سنوورداری نییە و کارێکی بێسنوورە، لەبنەڕەتدا عاریفان عاشیقانە بینا لەسەر ئەم روانین و مامەڵەیە و مەحبووب تیایدا بەمجۆرە تەجەللادەکات.

حەزدەکەم جۆری چوارەمیش بۆ ئەمجۆرە عاشیقیانە زیادبکەین و ئەویش عیشقی دۆستانە (altruistic)یە. ئەمجۆرە عاشیقییە خۆشەویستی بۆ هۆکار و بە بێچاوپۆشین و لەبەرچاوگرتن و بێبەڵگەی دەگرێتەوە لەبەرامبەر ئەوانیتردا. بە دەستەواژەیەك کە "دیستۆفیسکی" لە رۆمانی "برایانی کارامازۆرف"دا لە زمانی باوکی "زوسیما" لەبەرامبەر کەسێك کە هەواڵی چۆنیەتی باشتربوونی حاڵی دەپرسێت، دەڵێت: بێهۆکار و بێبەڵگە عیشق و خۆشەویستیت هەبێت و ئەم خۆشەویستییەش لە دراوسێکەتەوە دەستپێبکە و ئەوکاتەی کە ئەو تاکە دەڵێت: بۆ من سەخت و قورسە کە بەبێ لێبرسینەوە و چاوپۆشین ئەمکارە ئەنجامبدەم، باوکی "زوسیما" پێیدەڵێت: جگەلەمە رێگەیەکیتر بوونی نییە. هەموو هەوڵی خۆت بدە بۆئەوەی بەسەر ئەم هەستی چاوەڕێیبوونە لەوانیتردا زاڵبیت. ئەگەر مرۆڤ بیەوێت سنگی فراوانتربکات و توناکانی بوونی زۆر و فراوانبکات، دەبێت ئەمجۆرەی عیشقەی لەبەرچاوان بێت. عیشقێك کە بەهێزکەری بازنەی سلوکە، بەلاّم ئەو عیشقەی پەیوەندی بە مرۆڤەکانەوە هەیە نەك لە ئاسمان بەڵکو لە زەمینەوە دەستپێدەکات، بۆ نموونە: کەسێی وەکو "دایکە ترێزا" هێما و نموونەی ئەم جۆرە عاشیقییەیە و لە دەستگرۆیی ئەوانی لێقەوماو و چینە ژێردەستەکانی کۆمەڵگە دەستپێدەکات. لە وتاری "پرۆژەیەك بۆ عیرفانی مۆدێرن" چەند خاڵێکم لەبارەی ئەمجۆرە عاسشیقییە و رۆڵی بێجێگرەوەی لە بازنەی سلوکی مەعنەوی رۆژگاری ئێستاماندا باسکردووە.

**پرسیار:** چ پەیوەندییەك لە نێوان عیشق و فەلسەفەدا هەیە؟

**سروش دەباغ:** کاتێك بوونی هەیە مرۆڤ دەتوانێت لەبارەی عیشقەوە تێڕامانی فەلسەفی ئەنجامبدات، هەر بەوجۆرەی کە "ئەفلاتۆن" و ئەوانیتر لەبارەی "عیشقی ئەفلاتۆنی"یەوە قسەیانکردووە و هەروەها لەبارەی عیشقی رۆمانتیکی و پەیوەندی نێوانیان بە قەرزکردنی چەمکی "ئاروس"و "ئاگاپ" قسەو باسیانکردووە. تێڕامانی فەلسەفی لەبارەی عیشق و تایبەتمەندییە جیاوازەکانی و جیاکردنەوەیان لە شتەکانیتر لە یۆنانی کۆنەوە

دەستیپێکردووە و تاکو ئەمڕۆش درێژەی هەیە. لەم مانایەی یەکەمدا کە پەیوەندی نێوان عیشق و فەلسەفە بە هزر و زەیندا دێت، بەلاّم ئەگەر حالّ و دۆخی "بوونگەرا – ئەگزیستانسیل" بخەینەناو ریزی تێڕامانە فەلسەفییەکانەوە، هەر بەوجۆرە فەیلەسوفە بوونگەراکان ئەژماریاندەکردن یان لە سوننەتی خۆمانەدا هەر بەوجۆرەی ئاماژەم بە "شەریعەتی"و "سپهەری" کردووە. رووبەڕووبوونەوەی فەلسەفی لەگەلّ عیشقیشدا دەتوانێت بچێتەناو پەراوێزی دوودلّی و کەلّکەلّە فەلسەفییەکانەوە. هەلّبەتە ئەگەر وێنا و روانینی ئێوە بۆ فەلسەفە، سوننەتی فەلسەفەی شیکاری بێت، لە سوننەتی فەلسەفەی شیکاریدا خەریکبوون و قسەکردن بە کەلّکەلّە بوونگەراییەکانەوە گرنگییەکی لەوجۆرەی نییە و جێگای گرنگیپێدان نییە، بەلاّم کەلّکەلّە بوونگەراییەکان و نموونەی نووسینەکانی کەسانی وەکو: دیستۆفیسکی، مارسل، یان سارتەر لە ریزی تێڕامانە فەلسەفییەکاندا بهێنین، دەتوانرێت بوترێت ئەمجۆرە لە تێڕامان بەشێکن لە فەلسەفەکاری و کەسێك کە پەردە لەسەر ئەمجۆرە حالّ و دۆخەی خۆی لادەبات، هەم یاریچییە و هەم تەماشاچی. بەلاّم ئەگەر مەبەست لە باشی تیۆری و بەلّگەیەك بێت لەبارەی عیشقەوە، لەمکاتەدا "عیشق" دەبێتە بابەتی دەرەکی "ئۆبجێکتی" فەلسەفی و تاك لەم نێوەندەدا تەنها تەماشاچییە، ئەمە جۆرێك پۆلبەندییە لەنێوان عیشق و فەلسەفەدا. کاتێکیش هەیە کە قسە لەبارەی خودی فەیلەسوفێك و ئەزموونە عاشیقانەکانیەوە دەکەین، مومکینە کەسێك کە کاری تایبەتی فەلسەفی دەکات، لە ژیانی تایبەتی خۆیدا "عیشق" بە مانای یەکەم ، دووەم، سێیەم یان چوارەم بەوجۆرەی لەسەرەوە هاتووە، ئەزموونبکات و لە نووسین و وتەکانیدا پەردە لەسەر ئەم ئەزموونە تاکەکەسیانەی خۆی لابەرێت.

•••

**تێبینی: ئەم گفتوگۆیە "حەمید جەعفەری" سازیداوە و لە رۆژنامەی بەهار مێژووی ٢٧-٩-١٣٩١ دا بلاّوبووەتەوە.**

# ژیانی ئەخلاقی بینا لەسەر "فەزیلەت"

د. سروش دەباغ

فەلەسەفەی ئەخلاق بەپێی دابەشکارییەکی گشتی بۆ سێ لقی سەرەکی دابەشدەبێت:

١. سەروو ئەخلاق "میتا ئەخلاق".

٢. ئەخلاقی ڕێنوێنیکار "هنجاری".

٣. ئەخلاقی وەسفی.

بابەت قسەهەڵگرەکان"ئینتیزاعییەکان" بەتەواوی سەربە "بان ئەخلاق"یان "میتا ئەخلاق"ن، ئەوەی کە چ کارێك لەڕووی ئەخلاقییەوە ڕەوایە و چ کارێك لە ڕوانینی ئەخلاقیدا ناڕەوایە لە "ئەخلاقی ڕێنوێنیکار"دا "هنجاری"یدا دەخرێنەڕوو و لەم حەوزەیەدا باس و بابەتەکان ڕەنگێکی ڕێکخراوتریان هەیە. ئەوەی کە من و تۆ دەبێت چ شتانێك ئەنجامبدەین و ڕێکخستنی بۆنە و پەیوەندییە ئەخلاقییەکانی ڕۆژانەمان لەسەر بنەما و بنەڕەتێك بن، باسی پەیوەستن بە ئەخلاقی ڕێنوێنیکارەوە و هەروەها لە حەوزەی ئەخلاقی "کاربردی"یشدا ئەو تیۆریایانەی کە لە ئەخلاقی تیۆریدا قبوڵدەکرێن، بەکاردەهێنرێن.

ئەخلاقی هەنجاری یان ڕێنوێنیکار لە شهودە ئەخلاقییە دیارەکان و ناسراوەکانمان وەردەگیرێن. بەو ئەخلاقیاتەی کە باوەڕمانپێیەتی یان ئەوەی لە منداڵییەوە لە دایك و باوکەوە فێربووین و لە پلە بالاّتر لە قوتابخانە و خوێندنگە، زانکۆ، شوێنی کارکردن و دامەزراوەکانیدیکە کۆمەڵگە وەرمانگرتوون، پێیاندەڵێن ئەخلاقی گشتی. ئەخلاقی گشتی ئەو ئەخلاقەیە بینایە لەسەر ئەوەی من و تۆ لە ئەوانیترەوە یان سەرچاوە باوەڕپێکراوە ددانپێدانراوەکان و متمانە لەسەرەکراوەکان وەرمانگرتوون.

بۆ چوونە ناو بابەتەکەوە سەرەتا بەکورتی باسی ڕێڕەوی مێژوویی فەلسەفەی ئەخلاق لە ڕۆژئاوادا باسدەکەم. تاکو ئێستا لە حەوزەی فەلسەفەی ئەخلاق سێ قوتابخانەی گرنگ دەرکەوتوون. ئەگەر ئێوە سەیری قۆناغی سوکرات و ئەو فەیلەسوفانەی لەو سەردەمەدا ژیاون، بکەن، بۆتاندەردەکەوێت کە چەمکی "فەزیلەت" لەنێوان فەیلەسوفان و خەڵکە ئاساییەکە گرنگی زۆری هەبووە. "ئەرستۆ"ش کاتێك قسەی لەبارەی ڕێکخستن و پەیوەندییە ئەخلاقییەکانی نێوان مرۆڤەکانەوە دەکرد، چەمکی "فەزیلەت" و "مرۆڤی فەزیلەتمەندی" بەکاردەهێنا. هەڵبەتە ئەم فەیلەتە ڕەنگێکی نادینی هەبوو و لەسەر فێرکارییە ئایینییەکان بینانەکرابوو. چونکە ئەو لەسەردەمی پێشزایین ژیاوە و پاش ئەوەش بەدەرکەوتنی مەسیحییەت ڕێکخستنی بۆنە و پەیوەندییەکان لەسەر بنەمای بنەما ئەخلاقییەکان گرنگیەکی زۆر پەیدادەکات. ئەگەر ئامۆژە و فێرکارییەکانی مەسیحییەت بهێنینە پێشچاو بۆ نموونە: ئەو دە فەرمانە پیرۆزەی لە "کتێبی پیرۆز"دا هاتوون و مەسیحییەکان بۆ داوەریکردنی ئەخلاقی بەکاریاندەهێنن، دەبینین ئەم حوکم و فەرمانانە لەسەر بنەمای ئەخلاقی بونیادنراون. واتە تاك بۆ گەیشت بە داوەری ئەخلاقی پەسەنددەبێت چەند بنەمایەك بەکاربهێنێت. ئەو ئەخلاقەی لەسەر فێرکاری ئایینی دامەزراوە و مەشروعییەتی خۆی لە ئایینەوە وەردەگرێت، جۆرێك ئەخلاقە کە بینایە لەسەر کۆمەڵە بنەمایەك کە لەڕۆژئاوادا بەدەرکەوتنی ئایینی مەسیحییەت دێتەسەر تەخت. پاشان بە سەدەکانی ناوەڕاست دەگەین و پاشا ئەوەش قۆناغی ڕێنیسانس و سەردەمی ڕۆشنگەری دەردەکەون. لەو قۆناغانەشدا بنەما ئەخلاقییەکان جێگەی سەرنجی فەیلەسوفان و خەڵکی بوون. لەگەڵ ئەو جیاوازییەی کە ئەم بنەمایانە ئیدی لەسەر مەشروعییەت بینانەبوون. بۆ نموونە: لە سەدەکانی (١٦،١٧، ١٨) لەو سەردەمەی فەیلەسوفانی وەکو "دیکارت" دەرکەوتن، وردەوردە باسکردن لە حەوزەی ئەخلاقدا لەسەر ئەو بنەمایانە بونیادنران کە بنەڕەت و بنەمای ئایینیان نەبوو و لە فێرکارییە ئایینییەکانەوە وەرنەگیراوبوون. لە حەوزەی فەلسەفەی ئەڵمانیدا بە دیاریکراو "کانت" قارەمانی ئەم مەیدانەیە و لە حەوزەی فەلسەفەی فەرەنسیدا ڕۆشنبیران و فەیلەسوفانی

وەکو: (رۆسۆ، ڤۆلتێر و ئەوانتیر)، ئەمانە کاتێك قەسەیان لەبارەی ئەخلاقەوە دەکرد، بینا لەسەر کۆمەڵێك بنەمایان دەزانین، بەلاّم ئەم بنەمایانە، بنەڕەتی ئایینییان نەبوو. هەڵبەتە بەمجۆرە نییە کە بەدەستهاتوو و بەرهەمەکانی تیۆرداریێژەران و فەیلەسوفانی ئەخلاق، دژە ئایینی بێت، بەڵکو مەشروعییەتی خۆیان لە ئایینەوە وەرناگرن. بۆ نموونە: کاتێك کتێبی "ئەودیو سروشتی ئەخلاق" یان "رەخنەی عەقڵی کرداری"، "کانت" دەخوێنینەوە، ئەو ئەخلاقەی جێگە مەبەستی ئەوە بەتەواوی رەنگ و سەدایەکی مەسیحییانەی هەیە، واتە فێرکارییەکانی بە مامەڵە لەگەڵ سوننەتی مەسیحیدا رووندەکاتەوە یان کەسێکی وەکو "هیگڵ" ئەو خالانەی لەبارەی ئەخلاقەوە قسەی لەسەر کردوون و باسیکردوون، فێرکارییەکانی "مەتنی پیرۆز" لەباسەکانیدا بوونیان هەیە، بەلاّم مەشروعییەتی ئەخلاقی لای ئەو لە ئایینەوە وەرنەگیراوە. ئەمجۆرە بیرکردنەوە و قۆناغەی دووەمی ئەخلاقیش تاکو سەدەی بیستەم درێژە دەکێشێت. لە سەدەی بیستەمدا دوو جەنگی جیهانی تێدەپەڕێنین و رووداوێك روودەدات کە کاریگەری لەسەر ویژدانی مرۆڤایەتی دروستدەکات. کوشتاری ترسناك روودەدات و پرسیارگەلێکی بنەڕەتی بۆ هەموو ئەو کەسانەی دڵ وابەستەبوونی تیۆری و مرۆییان هەیە، دەخرێنەڕوو. ئێستاش هەندێك لە شاهێدانی ئەو رووداوانە لەژیاندا ماون و ئێمەش هەندێك لە نووسین و یاداوەرییەکانیان دەخوێنینەوە.

بۆ زۆرێك لەوانەی ئەهلی بۆچوون کە وابەستەبوونیان بە کاروباری مەعنەوی یان بە کاروباری مرۆیی هەیە، پاش تەواوبوونی جەنگی جیهانی دووەم ئەم برسیارە خرایەڕوو کە چ رووداوێك روویدا کە لەم خاڵەوە سەرماندەرهێنا؟ ئێمە کە پشتگیری و پشتیوانییەکی گەورەمان لە پشتەوە بوو چ بوو بەم شوێنە گەیشتین؟ بۆچی مرۆڤ دلڕەقی لەمجۆرەی لێدەرکەوت؟ بۆچی کوشتاری دەستەجەمعی، بەکارهێنانی ئەوانیتر و سووککردنی مرۆڤبوونی مرۆڤ کەوتەناو دەستوور و یاسامانەوە؟ راستە بە دەستەواژەی یەکێك لە نووسەران، جەنگی جیهانی یەکەم و بەتایبەت دووەم دیاردەیەکی ئەوروپایی بوو، بەلاّم ویژدانی هەموو مرۆڤایەتیان جوولاند. هەڵبەتە خودی ئەوروپییەکانیش لەبارەی ئەم بابەتانەوە زیاد لە هەر کەسێکیدیکە تێڕامانیانکردووە و بیریانکردووەتەوە و

هەوڵدایانداوە ناتەواوییەکانی کارەکە هەڵەسەنگێنن. ئەگەرچی ئەم بابەتە چەند لایەنە و چەندین رووی جیاوازی دەروونناسی و کۆمەڵناسی و ئابووری و مێژوویی فراوانی هەیە، بەڵام ئەوەی پەیوەستە بەباتەکەی ئێمەوە لەڕاستیدا زیندووکردنەوەی "ئەخلاقی فەزیلەت سەنتەر"ە کە پەیوەندی بە روودانی هەمان ئەو رووداوانەوە هەیە و لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم بوویە جێگەی روانین و سەرنجی فەیلەسوفان. پاش رێنیسانس و لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمەوە جارێکیدی گەڕانەوە بۆئەوەی کە فەیلەسوفانی پێش سوکرات تەرحیانکردبوو، دەستیپێکرد و فەیلەسوفان هەوڵ و کۆششیان خستەگەڕ بۆ زیندووکردنەوەی چەمکی "فەزیلەت".

خانم "ئەلزابێس ئانسکۆم" لە ساڵی (١٩٥٨)دا وتارێك بە ناونیشانی (فەلسەفەی ئەخلاقی نوێ) یان (فەلسەفەی ئەخلاقی مۆدێرن)، دەنووسێت و لەوێدا هەوڵدەدات ئەم خاڵە بخاتەڕوو کە کێشەی بنەڕەتی ئێمەی ئەوروپی هەمانبوو، جەختکردنەوەی زیاد لەڕادەبوو لەسەر رووی ئەخلاق بینا لەسەر بنەماکان، لەکاتێکدا کە بکەری ئەخلاقیمان کە کردارەکان یان داوەرییە ئەخلاقییەکانی لێڕوودەدەن، فەرامۆشکردبوو. لەڕاستیدا هێندە قسەمان لەسەر باس و بابەتی تیۆری و خۆمان خەریککرد لەبارەی ئەوەی کە مەشروعییەتی ئەخلاق لەکوێدایە و لە بۆنە و کارەکان و پەیوەندییە ئەخلاقییەکاندا چ ژمارەی بنەمای ئەخلاقی و چەند بنەڕەتی ئەخلاقیمان هەیە، ئیدی لە خودی بکەری ئەخلاقی بێئاگابووین. پاش نووسینی ئەم وتارە کتێبگەلێك و ژمارەیەکی زۆر وتار لە فەزای رۆشنبیری رۆژئاوا و فەلسەفەدا دەرکەوتن. باسی سەرەکی ئەوە بوو کە لەجیاتی جەختکردنەوە زیاد لەڕادە لەسەر بنەما ئەخلاقییەکان، دەبێت بکەری ئەخلاقی لەبەرچاوبگیرێت. بکەرێکی ئەخلاقی کە فەزیلەتمەند نەبێت، ئەوا بەئاسانی ئەم بنەمایانە ناکاتە دەستور و رێسای ئەخلاقی خۆی. جگەلە "ئانسکۆم"، کەسانێکی وەکو "فیلیپا فوت"و "مایکڵ ئەسلات"و هەندێك فەیلەسوفی ئەمریکی هاوچەرخ وەکو "مەك داول" لەمبارەوە قسەیانکرد و هەولیاندا ئەوە روونبکەنەوە کە لەبنەڕەتدا ئەخلاقێك بینابێت لەسەر "فەزیلەت" چ تایبەتمەندی و سیفەتێکی هەیە و بۆچی کێشەکان لێرەوە

سەرچاوەدەگرن. "لویناس"، فەیلەسوفی پۆستمۆدێرن و دیاردەناسی فەرەنسی هاوچەرخ، باوەڕیوایە کە رەنگە چەمکی "ئەویتر"و سەرنجدان " لە ئەویتر" کە لەبەرچاو نەگیراوە و ئێمە هێندە قسەمان لەسەر ئەخلاقی بیناکراو لەسەر عەقڵ کردووە کە بابەتی سەرەکی کە دەبێت سەرنجی لێبدەین، نەزانراو و نادیار ماوەتەوە.

ئێستا بەو روونکردنەوانەی باسکران دەبێت لەو خاڵە بکۆڵرێتەوە کە چۆن مرۆڤ پاش (٢٠٠٠) ساڵ وەفاداربوون بە ئەخلاقی فەزیلەت سەنتەرە و ئەخلاقی ئایینی بینا لەسەر بنەما، بە ئەخلاقی سیکۆلار گەیشت؟ لە حەورزەی ئەخلاقدا سێ چەمکی گرنگمان هەیە کە دەتوانرێت کار و بۆنە و مامەڵە و پەیوەندییە ئەخلاقییەکان بینا لەسەر ئەمانە روونبکەینەوە.

**یەکەم: ئەرک یان وەزیفە.**

**دووەم: ئەنجام.**

**سێیەم: فەزیلەت.**

ئەم سێ چەمکە لە گرنگترین ئەو چەمکانەن کە لە ئەخلاقی رێنوێنیکار "هەنجاری" هاوچەرخدا دەخرێنەڕوو، هەڵبەتە چەمکی مافی یان ئەخلاقی فیمینیستی یان ئەخلاقی روانینی ژنانەش بەجۆرەن، بەلاّم جێگەی باسی ئێمە نین.

سەرەتا دوو چەکی وەزیفە و ئەنجام رووندەکەمەوە تاکو بۆماندەربکەوێت "ئەخلاقی فەزیلەت سەنتەر" کە لەڕاستیدا لەبەرامبەر ئەم چەمکانەدا دەوەستێت، چ ماناگەلێك لەخۆدەگرێت. گریمانەی ئەوە بکەن من پێتاندەڵێم: نابێت لەو شوێنەدا درۆبکەن. لەڕاستیدا زاراوەی "دەبێت"و "نابێت" بەکاردەهێنم و بنەمایەکی ئەخلاقی دادەمەزرێنم کە لەپلەی کرداردا بەکاریدەهێنن. بەلاّم کاتێك ئێوە پرسیاردەکەن: بۆچی نابێت درۆبکەم؟ وەلاّمدەبیستن کە: (درۆنەکردن وەزیفەیەکی ئەخلاقییە.) لێرەدایە چەمکی وەزیفە "Duty"و پابەندبوون "Obligation" دێنەناوەوە. "کانت" قارەمانی سوننەتی

وەزیفەگەراییە لەئەخلاقدا و هەوڵدەدات ئەخلاقێك روونبكاتەوە كە پەیوەندی بە جیهانی دەرەوە نەبێت، ئەو ئەخلاقەی كە لە بۆنە و پەیوەندییە ئەزموونییەكانەوە وەرنەگیرابێت و بنەڕەتی مرۆڤ دروستبكات. لە دیدی "كانت"دا مرۆڤی ئەخلاقی ئەوەیە كە بەپێی ئەو ئەخلاقە رەفتاربكات بینا لەسەر وەزیفەی ئەخلاقی عەقڵانی خۆی. ئەم چەمكە هەم دەنگدانەوەی فەلسەفی هەیە و هەم لە فێركارییە ئایینییەكاندا بەكارهاتووە. لە گفتوگۆی رۆژانەشدا زۆر شوێن مومكینە تاكەكان زاراوە و وشەی وەزیفە تەنانەت لە پەلی هەڕەشەلێكردن و ئاگاداركردنەوەشدا بەكاربهێنن. بەدڵنیاییەوە دەستەواژەی بنەڕەتی زێڕینتان بیستووە كە دەڵێت: لەگەڵ ئەوانیتردا بەجۆرێك رەفتاربكە كە حەزدەكەی و پێتخۆشە لەگەڵ تۆدا رەفتاربكەن. زۆرێك لەسەر ئەو باوەڕەن یەكێك لەو شتانەی هاوڕابوون دروستدەكات لەگەڵ وەزیفەگەراییدا لە حەوزە و بوای ئەخلاقدا بنەڕەتبوون و بوونی بنەڕەتێكە لەسەر ئەم بنەمایە. بنەمایەك كە دەتوانن بەلەبەرچاوگرتنی بنەمای ئەخلاقی زۆر و فرە بەدەستبهێنن. ئەمە رووگەیەكی ئەخلاقی بینا لەسەر وەزیفە و لەهەمانكاتدا بینایە لەسەر بنەمایەك. لە فەزای سەرزەمینی رۆژئاوادا سەرەتا "كانت" وەزیفەگەرایی لەگەڵ ئەمەدا خستەڕوو و پاش ئەویش لە سەدەی بیستەمدا كەسانی وەكو "راس" درێژەیانپێدا.

چەمكێكیتر یارمەتی دەرككردنی باشتر چەمكی "فەزیلەت" دەكات، چەمكی "ئەنجام"ە. یەكێك لەو بنەمایانەی كە جێگەی سەرنجی زۆربەی مرۆڤەكان و تەنانەت دەوڵەتەكانە، بۆ رێكخستنی بۆنە و پەیوەندی ئەخلاقییان لەگەڵ ئەوانیتر یان لەگەڵ نەتەوەكانیتر، بنەمای چێژ یان سوود و ئەو ئەخلاقەیە بینایە لەسەر ئەمە. ئەم بنەمایە جەخت لەسەر ئەو كردارە دەكاتەوە كە زۆرترین سوود و قازانج بۆ زۆرینەی خەڵك دەگرێتەوە. لەمڕووەوە ئەو شوێنەی كە دژیەكی سوود بهێنێنەدی، بۆگەیشتن بە داوەری ئەخلاقی پەسەند، زۆرێك لە رۆشنبیران و فەیلەسوفان و كۆمەڵناسان بنەمای چێژ یان سوود دەكەنە دەستووری خۆیان. سوودگەرایی لقێكی گەورەی ئەخلاقییە و گەلێك لە فەیلەسوفان لەرۆژئاوادا كاریانلەسەركردووە. هەڵبەتە ئەم قوتابخانە ئەخلاقییە دابەشكاری

جۆراوجۆری هەیە کە باسیانناکەم. بەلایەنیکەمەوە سێ دەربڕین و روانینی جیاواز لەم قوتابخانەیە بوونیان هەیە و هەرکام لەمانەش بەشیدیکەی هەیە.

ئەگەر لەم دوو چەمکەی ئاماژەمانپێکردن تێپەڕین، بە ئەخلاقی "فەزیلەت سەنتەر" دەگەین کە لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم بوویە جێگەی باس لێکۆڵینەوە. لەڕاستیدا قسە لەسەر ئەوە بووە دەبێت ئێمە ئەم بنەمایە بخەینە کەنارەوە، چونکە کێشە و گرفتی بنەڕەتیمان ئەوەیە کە زیاد لەوەی پێویستبووە، جەختمان لەسەر بنەماکان کردووەتەوە، بەلاٌم ئەم پرسیارە تەرحدەکرێت ئەویش ئەوەیە گەر بڕیارە ئێمە بە ژیانی ئەخلاقییانە بیناکراو لەسەر فەزیلەت، بنەما ئەخلاقییەکان بخەینەلاوە، ئەوا بۆنە و داب و کار و کردەوە و پەیوەندییە ئەخلاقییەکانمان چۆن رێکبخەین؟ لە پلەی وەلاٌمدا، ئەو فەیلەسوفە ئەخلاقیانەی ناومانهێنان ئەم بیرۆکەیان گەشەپێداوە و گەورەکردووە کە کاری ئەخلاقی ئەو کارەیە کە لە بکەری ئەخلاقی فەزیلەتگەرادا روودەدات، بەلاٌم فەزیلەتە ئەخلاقییەکان کامانەن و چ شتانێکن؟ فەزیلەتگەلی وەکو: ئازایەتی، خوشەویستی، عەدالەت، حیکمەت، سەخاوەت، میهرەبانی، راستگۆیی، ئەو فەزیلەتانەن کە تاکی فەزیلەتگەرا و خاوەن فەزلیەت کە بڕیارە لە حەوزەی ئەخلاقدا، پەیوەندییە ئەخلاقییەکانی رێکبخات، دەبێت پابەندبێت بەم فەزیلەتانەوە. بۆئەوەی چەمکی فەزیلەت روونتربێتەوە، سوود لەو جیاکارییە وەردەگرم کە فەیلەسوفانی قایل بە ئەخلاقی فەزیلەت سەنتەر سوودیانلێوەرگرتووە. ئەم فەیلەسوفانە باوەڕیانوایە کاتێك ئێمە لەگەڵ مرۆڤدا سەرووکاریمان هەیە دەبێت لەنێوان دوو جۆر تایبەتمەندی ئەو کەسە قایلبین، ئەوانیش جیاکاری نێوان تایبەتمەندی ژینگەیی و تایبەتمەندی تاکەکەسی و کەسایەتی ئەو. تایبەتمەندی ژینگەیی وەکو: رەنگی پێست، کۆمەڵەی خوێن، قەد و بالاٌ و رەنگی چاو.. هتد. ئەمانە هەموویان تایبەتمەندی بایۆلۆژین و لە ژێر هیچ هەلومەرجێکدا ناگۆڕێن، بەلاٌم هەندێك لە تایبەتمەندی هەن کە بە ناونیشانی تایبەتمەندی کەسی و تاکەکەسی ناودەبرێن و بەشێوەیەکی گشتی دەکرێت گۆڕانکارییان بەسەردابێت. بەو مانایەی مرۆڤ دەتوانێت پێوانی و بڕی خۆشەویستی، عەدالەت، حیکمەت، سەخاوەت و.. هتد، خۆی

بگۆڕێت، هەڵبەتە گەر قایل بەوەبین کە تایبەتمەندی مرۆڤ پێشتر دیاریکراون. کۆمەڵێك پرسیار بۆئەو کەسانەی بەئەخلاقی فەزیلەت سەنتەر قایلن هەن لەوانە، ئایا پەیوەندییەکی پتەو لەنێوان فەزیلەتە ئەخلاقییەکان و هەبوونی داوەری ئەخلاقی راست و دروست بوونی هەیە یان نییە؟ ئایا رێکخستنی بۆنە و پەیوەندییە ئەخلاقییەکان بینا لەسەر فەزیلەتە ئەخلاقییەکان ئیدی بەسە بۆگەیشتن بە داوەری ئەخلاقی دروست؟ یەکێك لەو تیۆریایانەی کە ئەخلاقییە فەزیلەت سەنتەرەکان پێیقایلن ئەوەی کە کردارێکی ئەخلاقی کاتێك راست و دروست کە بکەری فەزیلەتمەند و فەزیلەتگەرا ئەنجامیبدات. واتە ئەوان لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا کە کرداری چاك چ کردارێکە، ئەوە ئەو کردارەیە کە بەهۆی بکەری فەزیلەتمەند و فەزیلەتگەراوە ئەنجامبدرێت و بکەری فەزیلەتگەراش بەوکەسە دەزانن کە کرداری چاك و باشی لێبوەشێتەوە و ئەنجامبدات. لەبەرئەوە لەلایەکەوە چاکی لەڕووی فەزیلەتەوە پێناسەدەکرێت و لەلایەکیتریشەوە فەزیلەتیش بەپێی چاکی پێناسەدەکەن.

خاڵێکیدیکە بۆ هەبوونی وێنایەکی راست و دروست لە فەزای ئەخلاقی فەزیلەت سەنتەردا دەبێت سەرنجی لێبدرێت ئەوەیە کە چۆن تاك دەگاتە ئەو جێگەیەی کە داوەری ئەخلاقی دروست و راستی لێبوەشێتەوە؟ گریمانەی ئەوەبکەین کە فەزیلەت ئەوەیە لە مرۆڤی فەزیلەتمەند بوەشێتەوە و مرۆڤی فەزیلەتمەندیش بەو مرۆڤەی بزانین کە کرداری باشی لێدەوەشێتەوە، بەڵام بەدرێژایی ئەمە و سەرەنجام ئەم پرسیارەش دەخرێتەڕوو کە چۆن مرۆڤێك دەبێتە کەسێکی فەزیلەتگەرا و خاوەن فەزیلەت؟ لێرەدا چەمکی راهێنان و مومارەسە و ئەو جەختکردنەوەیەی کە فەزیلەت سەنتەرەکان و فەزیلەتخوازەکان لەسەر حیکمەتی کرداری "عملی" دەیکەنەوە، دەبێتە شتێکی سەنتەری و گرنگ. بەو مانایەی کە ئەگەر تاك بۆگەیشتن و دەرکەوتن و دامەزراندنی فەزیلەتە ئەخلاقییەکان لەخۆیدا و بەکارهێنان لە سیاقە جیاوازەکاندا هەوڵبدات، دەگاتە ئەو جێگەیەی کە داوەرییە ئەخلاقییە راست و دروستەکانی لێدەوەشێتەوە. لەبەرئەوە لەمڕووەوە چەمکی حیکمەتی کراری کە لە ئەخلاقی فەزیلەت سەنتەردا دەبێتە جێگەی سەرنج و جەختی لەسەر دەکرێتەوە بۆگەیشتن بە داوەری ئەخلاقی راست و دروست پێویستە.

مەبەستی کۆتایی و ئەوپەڕی ئامانج لای ئەوانەی بە فەزیلەت سەنتەر قایلن ئەوەیە کە کرداری ئەخلاقی لەڕووی سروشت "طبع"ەوە نەك لەڕووی ئەرك "تكليف"ەوە لەلایەن بکەری ئەخلاقییەوە بوەشێتەوە و ئەنجامبدرێت. بەدەستەواژەیەکیتر، هەندێك لە کاروبارەکان ببنە "مەلەکە" تیایدا، (مەبەست ئەوەیە هەرشتێك لەمرۆڤدا بوویە "مەلەکە"، ئیدی دەبێت بەشێك لەو کەسە و ناتوانێت لێجیاببێتەوە، بۆ نموونە: خوێندەواربوون، مرۆڤ کاتێك دەبێتە کەسێکی خوێندەوار، ئیتر خوێندەواری دەبێتە "مەلەکە" تیایدا و هەرگیز ناتوانێت رۆژێك لە رۆژان ببێتە کەسێکە نەخوێندەوار و خوێندنەوەی بیربچێتەوە. و. کوردی) سوننەتی عیرفانیمان دەتوانێت لەمڕووەوە ئەم بابەتە بەرەوپێشەوەبەرێت، راستە لە سوننەتی عیرفانیماندا دەستەواژەگەلی لەمجۆرە لەمەڕ ئەم فێرکارییانە بەکارنەهاتوون، بەلآم ئەو خالآنەی فەزیلەت سەنتەرەکان دەیلێن و ئەمرۆ لە دەروونناسی ئەخلاقیشدا بەکاردەهێنرێت، گونجاوە لەگەڵ ئامۆژە و فێرکارییە عیرفانییەکانمان و دەتوانێت بۆ دامەزراندنی فەزیلەتە ئەخلاقییەکانمان یارمەتیدەربێت. من لێرەدا داستانی دەفتەری دووەمی "مەسنەوی"، "مەولانا" باسدەکەم کە باس لە بنەدڕکێك و پیاوێك دڕکچێنەر دەکات: داستانەکە بەمجۆرە دەستپێدەکات: کەسێك هەبووە لەسەر رێگای تێپەڕبوونی خەڵکی دڕکی داناوە و ئەمەش بوو بوویە هۆی ئەوەی کەسەکان نەتوانن بەئاسانی لەو شوێنە و رێگایەوە تێپەڕبن و پێیەکانیان بەهۆی دڕکەکانەوە بریندار و خوێناویدەبوون. زۆرێك لەو کەسانەش لەم رێگوزەرەوە تێدەپەڕین رەخنە و گلەییان هەبوو و دەیانوت ئەمکارەت دەبێتە هۆی ئازاری ئێمە. گلەییەکانی خەڵکی گەیشتنەوە لای فەرمانڕەوای ولآت و فەرمانڕەواش بڕیاریدا بە پیاوە دڕکدانەرەکە کە دڕکەکان لابەرێت و هەڵیانبکێشێت، بەلآم ئەم پیاوە ئەنجامدانی ئەمکارەی دەخستە رۆژەکانی دواتر، دڕکەکە بەردەوام و رۆژانە سەوزتر و گەورەتردەبوو و پیاوە دڕکچێنەرەکەش پیرتر و لاوازتردەبوو:

**خار بن در قوت و بر خاستن**

**خار کن در پیری و در کاشتن**

"مەولەوی" خووە ناشیرین و خراپەکانمان بە دڕك دەچوێنێت و لەم داستانەوە ئەو دەرەنجامە دەگرێت کە لەگەڵ باسەکەماندا پەیوەستە:

**خار بن دان هر یکـــی خوی بدت**

**بارهـــــا در پای خـــار اخر زدت**

**یا تیر بر گیر و مردانـــــه بـزن**

**تـــو علی وار ایـــن در خیبر بکـن**

**یا به گلبن وصل کـــن این خار را**

**وصل کـــــن با نار نـــور یـــار را**

**تا که نـــور او کشد نار تـــو را**

**وصل او گلشن کند خـــار تـــو را**

**تو مپال دوزخی، او مؤمـــن است**

**کشتن اتش به مؤمـن ممکن است**

واتە: (هەر یەکێك لە خووە خراپەکان بە دڕکێك بزانە، چەندینجار پێوەیان بریندارەدەبیت و بەپێیەکانتدا دەچن یان تەورێك هەڵبگرە و مەردانە لێیانبدە و لایانبەرە، تۆ وەکو حەزرەتی "عەلی"ئاسا لە "خەیبەر"دا ئەمکارە ئەنجامبدە یان ئەم دڕکانە بەگوڵەوە پەیوەستبکە، وسڵبکە نووری یار لەگەڵ ئاگردا، تاکو نوور و رووناکی ئەو ئاگری تۆ بکوژێت، ئەم وەسڵکردن و پەیوەستکردنە دڕکی تۆ بکاتە گوڵشەن، تۆ وەکو دۆزەخیت، ئەو ئیمانداره، کوژاندنەوەی ئاگر بە ئیماندار مومکینە و دەکرێت. و. کوردی)

دەڵێت: لێرەدا دەتوانیت دوو کار ئەنجامبدەیت یان تەورێك هەڵگرە و مەردانە ئەو خەسڵەت و سیفەتە لە خۆت لابەرە، واتە، ئیرادە بەکردارێك لەخۆتدا دروستبکە یان هاونشین و هاودەمێك هەڵبژێرە و لەگەڵێدابە.

ئەوەی کە زۆرێك لە ئەخلاقییە فەزیلەت سەنتەرەکان جەختی لەسەر دەکەنەوە بریتییەلەوەی کە کێشەی ئێمە نەزانین یان ئاشنانەبوونمان بە بنەما ئەخلاقییەکان نییە،

بەڵکو بریتییەلەوەی کە بۆچی کرداری ئەخلاقی تاکو ئەم رادەیە لەناوماندا کەمڕوودەدات و دەوەشێتەوە؟ هەر لێرەوە دەتوانین سەیری قەیرانەکانی کۆمەڵگەکەشمان بکەین. هەربۆیە سەرەتا و دەستپێکی کاری ئەخلاقی فەزیلەت سەنتەر هەر لێرەدا و دامەزراندنی حیکمەتی کرداری ئامانج و مەبەستی کۆتاییەتی. چەمکی تایبەتمەندی ئەخلاق زیاد لەهەر شتێك ئەم مانایە لەخۆدەگرێت کە دەبێت حیکمەتی کرداری لەتاکدا دروستببێت و دابمەزرێت.

**لەکۆتاییدا بەکورتی ئاماژە بە تایبەتمەندییەکانی ئەخلاقی فەزیلەت سەنتەر دەکەین کە ئەمانەن:**

**یەکەم:** بریتییەلەوەی دەتوانێت روونکردنەوەی چاکی و باشی لە ئەنگێزەی ئەخلاقی بەدەستەوەبدات و خودی ئەمەش خاڵێکی گەلێك گرنگە، چونکە بۆ نموونە لە سوننەتی وەزیفەرگەرایی "ئەرکگەرایی" چەمکی "ئەنگێزە" بەتەواوی خراوەتەکەنارەوە یات دووچاری کەمکردنەوە دەبێت و لە سوننەتی "ئەنجامگەرایی"شدا لەبنەڕەتدا "ئەنگێزە" گرنگییەکی بەوجۆرەی نییە و زۆر جێگای گرنگیپێدان نییە، بەڵکو گرنگ ئەوەیە کردارێك ئەنجامبدرێت و لەگەڵ بنەڕەتی سوود و چێژ گونجاوبێت، بەڵام لە ئەخلاقی "فەزیلەت سەنتەر"دا روونکردنەوەی چاکی و باشی بۆ چەمکی ئەنگێزەی ئەخلاقی بەدەستەوەدەدرێت، بۆ نموونە: ئەگەر ئێوە سەردانی دۆستێکی نەخۆشتان بکەن و ئەویش سوپاستانبکات، ئەگەر ئێوە بەتەواوی ئەنجامی ئەمکارەتان بە وەزیفەیەکی ئەخلاقی روونبکەنەوە، لەمکاتەدا دەبێتە هۆی دڵتەنگی و ناڕەحەتی بیر و زیهنی هاوڕێی نەخۆشەکەتان، بەڵام چەمکی "ئەنگێزەی ئەخلاقی" لە ئەخلاقی "فەزیلەت سەنتەر"دا ئەم ناتەواوییە ناهێڵێت.

**دووەم:** بێلایەنی ئەخلاقییە لە ئەخلاقی فەزیلەت سەنتەردا. لە قوتابخانە ئەخلاقییەکاندا یەکێك لەو خاڵانەی سەرنجی لێنادرێت بریتییەلەوەی دەڵێی پەیوەندی هەر تاکێك لەگەڵ تاکەکانیتری کۆمەڵگەدا وەکو یەك و یەکسانە. لەکاتێکدا کاتێك سەیری

بابەتە ئەخلاقییە ناسراو دیارەکان دەکەین، بۆماندەردەکەوێت ئەو پەیوەندییەی هەرکەسێك لەگەڵ منداڵ، هاوسەر، باوك و دایك و دۆستانی نزیکی خۆیدا هەیەتی لەگەڵ تاکەکانیتردا نیەتی و ئەمکارەش دەبێت لە پەیوەندییە ئەخلاقییەکاندا سەرنجیلێبدرێت. دەبێت تاك بتوانێت بێلایەنی ئەخلاقی بە مانایەك رەچاوبکات، واتە لەگەڵ ئەوانیتردا هەر بەوجۆرە رەفتاربکات کە لەگەڵ خۆشەویستان و کەسە نزیکەکانی خۆیدا رەفتاردەکات. پەرستارێك مومکینە کاتێك خوشکەکەی خۆی لەسەر جێگە کەتووە و نەخۆشە، بەچاکی رەفتاری لەگەڵدا بکات، بەلاّم ئەمە نیشانەی فەزیلەتمەندبوونی ئەخلاقی نییە، پێوەری فەزیلەتمەندبوونی ئەخلاقی ئەوەیە کە لەهەمان ئەوکاتەی لەگەڵ خوشکەکەی خۆیدا بەچاکی رەفتاردەکات، لەگەڵ ئەوانیتریشدا بەهەمانشێوە رەفتاربکات و وەکو یەك سەیریانبکات. راستە پەیوەندی نێوان ئەو پەرستارە و خوشکەکەی لەگەڵ پەیوەندی پەرستارەکە و نەناسراوەکەیتر وەکو یەك نییە، بەلاّم ئەو پەرستارە ئەوکاتە دەتوانێت فەزیلەتمەندی خۆی بەتەواوی دەربخات و بیگەێنێتە پلەی بەرز کە لەمەڕ ئەو کەسەی پەیوەندی لەگەڵیدا هەیە و لێوەی نزیکە، بێلایەنی ئەخلاقی هەڵبژێرێت و بتوانێت بەسەر ئەو پەیوەندییەدا زاڵبێت و لەگەڵ ئەوانیتریشدا بەوجۆرە مامەڵەبکات، بەلاّم ئەخلاقی فەزیلەت سەنتەر دوو سنووری هەیە و بە کورتی ئاماژەیان بۆدەکەین:

**یەکەم:** یەکێك لە سنوورداریيەکانی ئەخلاقی فەزیلەت سەنتەر کە دەبێت زیاتر تێڕامانی لەبارەوە بکرێت، ئەوەیە کە ئەو داوەریکردنەی تاکی فەزیلەتگەرا تێپەڕیدەکات، زۆر وابەستەن بەخودی تاکەوە و لە روانگەی ئەوانیترەوە بەئاسانی رەخنەیان لێناگیرێت. دەڵێی هەرچی لە مرۆڤی فەزیلەتمەندەوە دەردەچێت و دەوەشێتەوە، کردارێکی دروست و راستە و ناتوانرێت هەڵسەنگاندنی رەخنەیی بۆبکرێت.

**دووەم:** خاڵێکیدی ئەوەیە گەر ئێمە کرداری چاك و دروست بەو کردارە بزانین کە بکەری فەزیلەتمەند و فەزیلەتگەرا ئەنجامیدەدات، ئایا ناتوانین گریمانەی مرۆڤی

فەزیلەتمەندی لەوجۆرە وێنابکەین کە هەندێجار کات کاری هەڵەیان لێدەوەشێتەوە؟ واپێدەچێت تیۆریای ئەخلاقی فەزیلەت سەنتەر بۆ ئەم لێڵییە روونکردنەوەیەکی نییە، چونکە باوەڕیوایە هەرشتێك بکەری فەزیلەتمەند ئەنجامیبدات و لێبوەشێتەوە، لەڕووی ئەخلاقییەوە راست و دروستە، چونکە دەیەوێت پەیوەندییەك لەنێوان فەزیلەت و چاکی یان فەزیلەت و دروستی بەرقەراربکات.

**سێیەم:** ئایا ئەخلاقی فەزیلەت سەنتەر دەتوانێت ئەوە روونبکاتەوە کە چۆن لە هەندێك لە جێگا و شوێندا کاری دروست و راست لەو مرۆڤانە دەوەشێتەوە کە کەم تا زۆر بە رەزیلەتی ئەخلاقی پیسبوون؟

ئەگەر بتوانرێت ئەم سێ رەخنەیە وەکو سنوورداربوونی ئەم تیۆریایە بزانرێن، لەکۆی گشتیدا دەتوانرێت بوترێت ئەخلاقی فەزیلەت سەنتەر چەندین دەروازەی هەیە و لە سەردەمی نوێشدا جێگەی بایەخی بۆچوونی زۆرێك لە فەیلەسوفانی ئەخلاقییە، بەڵام واپێدەچێت بۆگەیشتن بە سەری مەنزڵی مەبەستی ئەم رووگەیە، بەبەراورد لەگەڵ تیۆریاکانیتر، رۆڵێکی تەواوکەر دەگێڕێت و بۆئەمەش دەتوانین لە فێرکارییەکانی ئەخلاقی فەزیلەت سەنتەر یارمەتیوەربگرین تاکو دەستمان بە کۆمەڵگەیەکی ئەخلاقیتر بگات، کۆمەڵگەیەك تیایدا لەڕووی سروشت و لە ناخەوە و بەبێ ئەرك کرداری ئەخلاقی لێبوەشێتەوە.

•••

**سەرچاوە:**

پێگەی فەرمی دکتۆر سروش دەباغ.

# لای خەیاڵی دۆست

# لە بارەی "سوهرابی سپهەری"یەوە

د. سروش دەباغ
و. فاتیمە ئەدهەم

خۆشحاڵم لە زانکۆی "ئەستەنفۆرد" لەبارەی "سوهرابی سپهەری"یەوە قسەدەکەین، لەراستیدا ئەم وتارە دوو بەشە:

١. لەبارەی "سوهراب"و دەزگای ئەندێشەیی و عرفانییەوە.
٢. چەمکی "با"و بەکارهێنانەکانی.

سپهەری شیعرەکانی لەنێوان ساڵەکانی ١٣٣٠تا١٣٥٧ دا وتووە، واتە لەکتێبی "مرگی رەنگ" تا کتێبی "ما هیچ، ما نگاە" لە سەرەتای دەفتەری "هەشت کتاب"دا مانا و مەفهومێکی کۆمەڵایەتی سیاسی هەیە، وادێتەپێشچاو کە ئەو لەم قۆناغەدا لەژێر کاریگەری "نیما"و "توللی" دابوبێت.

فەزای شیعرەکانی ئەو فەزایەکی نائومێد و ئالوودە، بێمیهر، خەمۆك، تاریك و غەمناکە و زۆر کەم پڕ لەتەنیاییەك، تەنیاییەك کەوەکو تەنیای مەعنەوی نییە کە دواتر سوهراب بەمە دەگات بەتایبەتی لە (شرق اندوه) بەدواوە، بەڵکو تەنیاییە کە لەگەڵ بێمیهر و خەمۆکیدایە و بەو لێکدانەوەیەی کە هەندێك هێناویانە، نموونەیەك لە هەردوو شیعری (رو بە غروب) و (غم غمناك) لە کتێبی "مرگ رنگ"دا لەبەرچاوبگرن:

شاخەها پژمردە است
سنگها افسردە است
رود می نالد
جغد می نالد

غم بیاویخته با رنگ غروب
می تراود ز لب قصه سرد
دلم افسرده در این تنگ غروب
شب سرد است
و من افسرده
راه دوری است و پای خسته..
هردم این بانگ بر ارم از دل
وای این شب چقدر تاریك است
خنده‌ای کو بەدل انگیزەم؟ قطرەي کو که به دریا ریزم؟ صخرەای کو که بدان اویزەم؟ مثل
این است که شب نمناك است
دیگران راهم غم هست بەدل
غم من، لیك، غمی غمناك است.

هەروەها لە ناونیشانی کتێبەکەدا دەردەکەوێت سوهراب لە تاریکی و تاڵی دەدوێت کە هاوشێوە و گونجا و لەگەڵ تێڕوانینی ئەو لەو قۆناغەدا ببووە فەزای فیکری ئەم شیعرانە و ئەمەش تایبەت بووە بە کۆتاییەکانی دەیەی هەتاویەوە.

سپهەری ئالەم قۆناغەدا چ لە وتن و چ لە مانادا لەژێر کاریگەری (نیما و توللی)دا بووە و نایەتەپێشچاو ئەو لەم قۆناغەدا بە زمانی خۆی گەشتبێت. هەر لەبەرئەم هۆیەشە کەم کتێبە بۆنی تەقلید دەدات لە ساڵی ١٣٣٢ کتێبی "زندگی خواب ها" بڵاودەبێتەوە کە ئالەو فەزا دەرەکی و کۆمەڵایەتییەدا دەفتەری یەکەمی دەگۆڕدرێت بۆ فەزایەکی دەرەکی و دەروونی لەم کتێبەدا شیعرەکانی بەرلەوەی کە گۆڕانی سیاسی و کۆمەڵایەتی پێوەدیاربێت، زیاتر پەیوەندییان بە گۆڕانی دەروونی و بوونگەراییی "سوهراب"ن. ئەمەش بەسەرنجدان لە ئایینەکانی "رۆژهەلاّت و هیند و ژاپۆن" پڕ رەنگترە و زیاتر دیارە و دەتوانرێت ئایینی "بووا"یی تێدابدۆزرێتەوە:
در تابوت پنجرەام پیکر مشرق می لولد.
مغرب جان می کند،
می میرد... (زندگی خواب ها، شعر"خواب تلخ"

به سه‌رنجدان به رۆژ هه‌ڵات و ئایینه‌کانی رۆژ هه‌ڵات هندستان و ژاپۆن له‌وێدا زۆر ده‌نگیداوه‌ته‌وه، ده‌توانین ئه‌م ده‌فته‌ری شیعر و به‌دوای ئه‌ویشدا ئه‌و ده‌فته‌ری "اوار افتاب" له فه‌رزای گفتوگۆدا له‌به‌رامبه‌ر رۆژهه‌ڵات و رۆژئاوادا بڵاوبووه‌ته‌وه که له‌و رۆژگاره‌دا زۆروکه‌م ره‌ونه‌قی هه‌بووه له‌نێوان رۆشنبیران و که‌سانی بیرمه‌ندا ده‌خوێنرانه‌وه.

هه‌ڵبه‌ته ئه‌و سه‌ره‌تای ئه‌م گفتوگۆیه نییه، به‌ڵکو که‌سانی وه‌ك: (ئه‌حمد فه‌ردید و داریوش شایگان) له فه‌زای رۆشنبیری و بیرمه‌ندانی ئێران له‌م بواره‌دا کۆمه‌ڵێکی چالاك بوون، ئاله‌م رۆژگاره‌دا به‌تایبه‌تی" فه‌ردید" له گفتوگۆ له‌گه‌ڵ رۆژهه‌ڵات و رۆژئاوادا .

هه‌روه‌ها "غرب زدگی"ده‌خولقێنێت وادێته‌پێشچاو که "سپهه‌ری" تاڕاده‌یه‌ك کاریگه‌ری ئه‌م فه‌زایه‌ی پێقبوڵبووه به‌تایبه‌تی ئه‌و پێشه‌کییه‌ی که زندگی خراب ها نووسیوه، ئه‌وه ده‌ره‌خات که له‌گه‌ڵ ئه‌م گوتاره‌دا ئاشنابووه و له‌هه‌مانکاتیشدا له‌گه‌ڵ ئایینه‌کانی رۆژهه‌ڵات له‌و قۆناغه‌دا جۆرێك په‌نابردن بۆ رۆژهه‌ڵات، هه‌ڵبه‌ته بیروباوه‌ڕی رۆژهه‌ڵاتی نه‌وه‌ك زه‌روره‌تی رۆژهه‌ڵات و جوگرافیایی – له شیعره‌کانی سپهه‌ریدا به‌رچاوده‌که‌وێت. دوو مه‌فهومی گرنگ که له "زندگی خواب ها"دا ده‌توانین په‌ییانپێبه‌رین: یه‌کێکیان مه‌فهومی ئازار (رنج)، ئه‌ویتریان مه‌فهومی خاڵیبوونه‌وه (تهی شدگی)، ئه‌م دوو مه‌فهومه نه‌ژاد و ناسنامه‌ی بودیستییان هه‌یه:

مرا تنها گزار
ای قشم تب دار سرگران!
مرا با رنج بودن تنهاگزار
مگزار خواب وجودم را پر پر کنم
مگزار از بالش تاریك تنهایی سر بردارم
و به‌دامن بی تاروپود روياها بیاویزم...همان شعر"جهنم سرگردان"
پنجره‌ام به‌تهی بازشد
ومن ویران شدم
پرده نفسی می کشیم
درهم شکن بی جنبشی ات را
و از مرز هستی من بگزار

سیاه سردبی تپش گنگ. همان شعر"پرده"

تصویرم را کشیده‌م

چیزی گم شده بود

روی خودم خم شدم: حفره ای درهستی من دهان گشود.. همان شر"یاد بود".

تەعبیر شیعری "یادبود" کرانەوە و گەڕان لە بوونی مندا (گشوده شدن حفرەای درهستی من )، واتە: فراوانبوون و کرانەوەی چاڵێك لبووندا.

مەبەستی بانگکردنە و مەفهومی خاڵیبوون لە بودیسمدایە هەروەها مەفهومی ئازار لە گرنگترین وانەکانی بودایە. بودییەکان روونیدەکەنەوە کە ویستن و داخوازی، بناغەی هەموو دەرد و ئازارەکانە ئەگەر کەسێك ئاگربنێتەنێو داخوازیەکانییەوە رەنج و ئازاری کەمتری تووشدەبێت لەم جیهانەدا:

تمام انچه ندارم خواهم رفت

پیاده امده بودم پیاده خواهم رفت

منم تمام افق را به رنج گردیده

منم که هر که مرا دیده در سفر دیده

ئازار وسەفەر لە تێگەیشتنی دەوروبەر لە چەمکی سەنتەرییەکانی "ئایینی بودیزم"ن لە ئایینی بودیسم بۆ هەنگاونان لەلایەن رێبوارەوە، دەبێت رێبوار بزانێت دەردو ئازار لەکوێوە سەرچاوەدەگرێت و چۆن دەبێت ئەو بتوانێت رووبەڕوویبێتەوە، بەهەمانشێوە "سپهەری" لە "اوار افتاب" دەفتەری سێیەم لەگەڕاندایە بەدوای حەقیقەتدا و حەیرانبوون لەشیعرەکانیدا دەبینرێت بانگکردن و ئەندێشەی رۆژهەڵاتی و بودیەتی لە بارودۆخی شیعرەکانی ئەودا بەهەمانشێوە دەکەوێتەپێشچاو هەرچەندە رێبواری خۆی لەجوولەدایە و سەروخواردەکات تاوێ بێهیوا و تاوێ ئومێدەوار دەڵێی لە فەزای لێڵ و تەماوی بەسەردەبات، هەروەك رێبوارێك کە نازانێت لەکام رێگاوە بڕوات و نازانێت ئەو رێگایەی کە پێیداڕۆشتوە راستە یان نا ؟

هەر لەبەرئەمەشە لەبارودۆخێکی دەروونی جیاوازدا دەڕوات تاوێك دووچاری غەمگینی و خەمۆکی دەبێت و تاوێکیش ئارامی و ئاسوودەیی و بارودۆخێکی دەروونی بەهرەمەند دەبێت. دوو شیعری "ای همه سیماها"و "محراب" لە دەفتەری "اوار افتاب" لەبەرچاوبگرین:

در سرای ما زمزمەای،
در کوچه ما اوازی نیست
شب، گلدان پنجرەای ما را ربوده است
پرده ما در وحشت نووسان خشکیده است
اینجا، ای همه لبها! لبخندی ابهام جهان را پهنا می دهد
پرتو فانووس ما، در نیمه را میان ما و شب هشتی مرده است...

هەروەها:

تهی بودی نسیمی
سیاهی بود و ستارەی
هستی زمزمەای
لب بود نیایشی
"من" بود و "تو"یی: نماز و محرابی.

سوهراب لە سەرەتای شیعردا لە تاریکی و ساردی و دەروونی شەو و ترسناکی و چۆنیەتی ئەوەی کە لە "محراب "دا لە نەغمە و نیایش و نوێژ و میحراب دێنێتەناو باسەوە، شیعر "محراب" لەگەڵ بیرهێنانەوەی عیبارەتێك لە کتێبی "ابی" باشتر هەستپێدەکرێت. "عیبادەتم هەمیشە لە خەڵوەتا ویستوە" هیچکات لەبەرامبەر خەڵکدا نوێژمنەکردووە "ئەم قسەیە بەو مانایە دێت کە "سپهەری" بەلایەنیکەمەوە گرنگیداوە بە شتێك لە مەزهەبە ئایینییەکان، خەڵوەت و تەنیایی کردووەتە پیشە و لەهەمانکاتیشدا لە رووکەشی ئاییننداری خۆی پاراستووە و لەبەرچاوی خەڵکییەوە عیبادەتی ئەنجامنەداوە.

بەگشتی رابردووی "سپهەری" وادێتەپێشچاو و لە قۆناغی وتنی کتێبی "اوار افتاب"دا لە "اوار افتاب" بگوزەرێین و بچیتەسەر "شرق اندوه" کە بانکردنێکی عیرفانی بەڕوونی پێوەدیارە و لەژێر کاریگەری و فەزای شێوازی دیوانی "شمس"دایە. بیرکردنەوەی سپێهری لە بارەی مەفهومی وەکو فنا، مرگ هیچستان و پلودالیسم لەو کتێبەدا زۆر رەنگیداوەتەوە.

لەم کتێبەدا بەرەبەرە سپهەری زمانی شیعری خۆی پەیدادەکات و لە دونیای ژیانی خۆی نزیکدەبێتەوە.. لەم رۆژگارەدا سوهراب لە کۆتایی تێپەڕاندنی قۆناغی خۆیدا تێدەپەڕێت و قۆناغی پێگەیشتن و کامڵبوونی ئەو لە دەنگی پێی ئاودا دەستپێدەکات.

فروغ فروخزاد لەچاوپێکەوتنێکیدا لەگەڵ سیرو گاهباز لەبارەی "شرق اندوه" دەڵێت: سپهەری لەم بەرهەمەدا بە کێشی شیعری خۆی گەیشتووە هەروەها فروغ لە درێژەی چاوپێکەوتنەکەدا زیاتر دەڵێت دونیای سپهەری بۆئەو لە سەرنجڕاکێشترین دونیادا بووە ئەم چاوپێکەوتنە هاوزەمان بووە لەگەڵ بڵاوبوونەوەو لەچاپدانی "شرق اندوه" و ئیمە هێشتا نەگەیشتووینتە دەنگی پێی ئاو و سێ شیعرم لەم دەفتەرە هەڵبژاردووە کە لەو سێ شعرەدا بارودۆخ و بوونی سپهەری بەباشی راڤەکراوە، لە شیعری یەکەمدا نیگای پلورالیستیکی ئەوی بۆ لای خۆی راکیشاوە:

قران بالای سرم
بالش من انجیل، بستر من تورات، و زبر پوشم "اوستا" می بینم خواب
"بودا"ی در نیلوفر اب
هرجا گلهای نیایش رست، من چیدم دستەگلی دارم
محراب تو دور از دست: او بالا
من در پست... "شعر"و "شورم"را.

هەروەها "تا گلی هیچ" لەگەڵ چەمکی "هیچ" کە لە چەمکە سەنتەرییەکان و سیستەمی سلوکی سپهەرییە، رووبەڕوودەبینەوە:

می رفتیم و درختانچی بلندن و تماشا چە سیاه،
راهی بود از ما تا گل هیچ
مرگی در دامنەها، ابری سر کوه، مرغان لب زیست

دەخوێنینەوە: "بی تۆ دری بودم بە برون، و نگاهی بە کران و صدای بە کویر"..

می رفتیم، خاك از ما می ترسیدن و زمان بر سر ما می بارید..
ما خاموش و بیابان نگران، و افق یك رشته نگاه..

مەفهوم هیچستان لەم شیعرەدا بەبێدانی ئاماژە رۆشتووە بەئاسانی وەرگرتن و وەبیرهێنانەوەی مەفهوم فنابوون لە عیرفان سونەتی ئیمەدایە، لێرەدا هیچستان بەمانای پوچی نییە، بەڵکو بەمانای نائامادەبوون نادژایەتییە و رۆیشتنە بەرەو سەروتربوون و لە جیهانی دەوروبەرەوە کە زۆر و فرەیە "متعدد"و "متکثر"ە، ئەم شیعرەی "مەولانا" لەبارچاوبگرن کە دەڵێت:

اه چه بی رنگ و بی نشان که منم؟!
کی ببینم مرا چنان که منم
گفتی: "اسرار در میان اور"
کو میان اندرین میان که منم؟
کی شود این روان من ساکن
اینچنین ساکن روان که منم
بحر من غرقه گشت هم در خویش
بوالعجب بحر بی کران که منم!
گفتم" "انی" بگفت: "های"! خموش
در زبان نامدست ان که منم!"
گفتم: "اندر زبان چو در نامد
اینت گویای بی زبان که منم!"
فارغ از سودم و زیان، چو عدم
گرفه بی سود و بی زیان که منم!"

بەدیاریکراوی مەبەست و ئاماژەم بۆ بەیتی کۆتاییەکە لەئەودا فنابوون نەك بە مانای پووچی، بەڵکو بە مانای نادژی نییە و رۆشتن بەدوای دونیایەکدا کە زۆربوون و زیادبوون ئەرزش و بەهێزی نووسینەکانی ئەو دێتەئەژمار. وادەردەکەوێت هیچستان لە هەشت کتێبدا زۆروکەم – هەمان مانی هەبێت و ئاماژە بەم فەزاییبوونە دەکات کۆتا شیعری لە شیعرەکانی ئەم دەفتەرە هەڵمبژاردوە شیعری "BODHI"یە، شیعرێك کە لە ئەزموونی هۆشیارانە و ئاگایانە و رۆژهەلاتییانەی دەگمەن پەردەلادەدات:

انی بود، درها واشده بود
برگی نه، شاخی نه، باغ فنا پیدا شد بود
مرغ مکان خاموش، این خاموش، ان خاموشن، خاموشی گویا شده بود
ان پهنه چه بود:
بامیشی، گرگی همتا شده‌بود
نقش صدا کم رنگ، نقش ندا کم رنگ، پرده مگر تا شده بود؟
من رفته، او رفته، ما بی ما شده بود
زیبایی تنها شده بود
هر رودی، دریا
هر بودی، بودا شده بود.

ئەم شیعرە وادەبینرێت کە ئەزمونی دەروونی و باتینی هەیە و لەجۆری تەنیابینینییەوە هەواڵدەدات و لە بینینی تەنیاییەوە بەفراوانی تێپەڕین لە ناسازگاری و زیادبوونەکانی (هر رودی، دریا هر بودی بودا شده بود) ئالەم ئەزمونە رۆحی و کۆترانەدا، دیاریکردن و سنووردانانی تاك لەنێودەچێت هەروەك و رووبارێك کە تێکەڵ بە دەریا ببێت ئیتر دیاریکردن و سنووداربوون نامێنێتەوە لەجێگایەکدا و لەگەڵ ئەودا ئەزموونی تێکەڵبوون و توانەوەدەکات و دەژی.

لەدوای ئەم چوار دەفتەرە کە سێ دەفتەری کۆتاییان پەیوەستن بە رۆژگاری رابردوویەوە. بە "دەنگی پێی ئاو"و "موسافیر"و "حەجمی سەوز" دەگەین کە لە لوتەکەی تێروانینی شاعیرانە و عاریفانەی سپهەری بەدونیای دەرەوەدا دەکرێتەوە و لەو قۆناغەدا زمانی "سوهراب"

پوختەدەبێت. ئەو بە تێڕوانین و زمانی تایبەتی خۆی، ئەزموونەکانی عاریفانە و ڕۆحی خۆی لەگەڵ ئیمەدا درمیانمی گزارد .

بەشی دووەمی قسەکانی من لەگەڵ بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی تا وەکو ئێستا وتومە جەختکردنەوە و لێکدانەوەی مەفهوم (باد) "با"یە لە هەشت کتێبدا لەگەڵ بەڵگەهێنانەوەی زیاتر لە دەنگی پێی ئاودا کە لە ساڵی (١٤٤٣)ی هەتاوی بڵاوبووەتەوە "مسافر" کە دوو ساڵ دوای ئەو لە ساڵی (١٣٤٥)ی هەتاوی "حجم سبز"، پێنج ساڵی دواتر لە (١٣٤٨)ی هەتاوی بلاۆبوونەتەوە زانینی ساڵی بڵاوبوونەوەی ئەم دەفتەرانە لەو لایەنەوە گرنگی هەیە کە بزانین "سپهەری" ئەم شیعرانەی لە نزیکەی تەمەنی (٤٠) خۆیەوەیە نووسیوە تەمەنێك بەگشتی لەگەڵ جۆر و پەروازی گۆڕانی ڕۆحی لە تێڕوانینی بۆ ڕێبواری ڕێگە هاوڕێیە.

لەنێوان دیاردە سروشتییەکاندا "سپهەری" دڵوابەستەی "با"و "باران"ە. کاتێك دەیەوێت بەسەر کات و فەرمانی بێسنوور و بەرزدا بڕوات بەر لە هەر فەرمانێکیتری دونیای دەرەوە لەم بێهاوتایانە دەگەڕێت وایدەبینێت گەورەیی و جێگیریی فەرمانی گەورەتر و بەرزتر لە دونیای دەرەوەدا بەر لەهەر شتێکیتری لە "با"و "باران" بۆئەو بەهێزترە هەرچەندە لەگەڵ هەتاودا هاونشین و دۆستە و لە شیعری مسافیردا دەڵێت (من از مصاحبت افتاب می ایم)، بەلاَم زۆری وشەکانی "با"و "باران" لە هەشت کتێبدا لە هەتاو زیاترن.

وادێتەپێشچاو ئەو زۆر عاشق و شەیدای ئەم دوو ناوازە بووە، لەدرێژەدا هەوڵدەدەم مەفهوم "سپهەری"وەرگرم لەباری باوە لە هەشت کتێبدا لەسەری بڕۆم پێمباشە پێش ئەوەی راڤە و مانای (با) بکەین. لە تێڕوانینی سپهەرییەوە خاڵێك وەبیردینمەوە بەسەرنجدان لە دونیایەك کە مرۆڤە مەعنەوییەکان وێنەیدەکێشن و لەوێدا هەناسەدەدەن دەتوانین ئاوا پێشبینیبکەین کەر هەریەك لەوانە شەیدای یەکێك یان چەند ناوازەیەکی سروشتین بێهاوتا و ناوازەکان کە یەکتر خوێندنەوە و بیرهێنانەوەی فەرمانی بێپایان لە دونیای دەرەوەدان. "مەولەوی" زیاتر شەیدای ڕۆژ و مانگ و دەریایە، (با) ئەوەندە لە شیعرەکانی ئەودا نییە، "پاولۆکۆیلۆ"، نووسەری بەرازیلی کە بەگشتی کتێبەکانی لەئێراندا چاپ و وەرگێڕدراون شەیدای سەحراییە، سەحرا و بیابان لە دونیای دەرەوەدا بۆ ئەو سومبولی فەرمانی بێکۆتایە.

کۆچکردوو شەریعەتی شەیدای بیابان "کویر" بووە و ئەمەش تاکو (کۆتایی ئامادەگی هەیە)و بێپایانە و "کویریات"ی ئەویش لەبەرچاوگرتنی ئەمجۆرە روانینەی ئەون، کاتێك

"مەولانا" دەڵێت:

چو غلام افتابم، هم از افتاب گویم
نەشبم نەشب پرستم، که حدیپ خواب گویم
چو رسول افتابم بم، بەگریق ترجمانی
بنهان ا ز او بپرسم، به شماجواب گویم
بەقدم چوافتابم، بەخرابەها بتابم
بگریزم ازعمارت، سخن خراب گویم
چودلم زخاك کویش بکشیدەاست بویش
خجلم زخاك کویش کەحدیپ اب گویم

(پێشوو، غەزەلی ٢٦٣)

رۆیشتن بەدەم ئەمری بێسنوور پێش هەر شتێکیترە و لەبیریدایە. هەروەها "خۆر"و "مانگ"یش بەمجۆرەن:

من غلام قمرم، غیر قمر هیچ مگو
پیش من جزسخن شمع و شکر هیچ مگو
سخن رنج مگو، جز سخن گنج مگو
ور از این بی خبری رنج مبر، هیچ مگو
دوش دیوانه شدم، عشق مرادید و بگفت :
"امدم، نعره مزن، پرده مدر، هیچ مگو
ای نشستەای تودراین خانەای پرنقش وخیال
خیز از این خانه برو، رخت ببر، هیچ مگو
گفتم ای جان، پدری کن نەکه این وصف خداست
گفت:"این هست، ولی جان پدر، هیچ مگو"

خۆر و مانگ لێرەدا بیرهێنەرەوەی فەرمانی بێپایانن، هەروەها بیان یان بۆ پاولۆ کۆیلۆ ئاوایە  ئەو لە رۆمانی کیمیاگردا بەڕوونی باسیدەکات کە بەردەکان دەجوولێندرێن هەمیشە، بەلاّم بیابان لەجێی خۆی دەمێنێتەوە ئەم کۆتایینەهاتنە و بێبەرامبەری دەشت و بیابانە ئەوی شەیدای خۆی کردووە، هەروەها سپهەری شەیدای (با)یە لە هەشت کتێبدا بە دوو واتا دەتوانین چەمکی (با) لێکجیابکەینەوە مانای یەکەمی "با" مانا دیار و ناسراوەکەیەتی. ئالەم دەربڕینەدا کەم تا زۆر ئەم دیاردەیە هاوشێوەی دیاردەکانیترە. بۆ نموونە شیعری (رۆشنی، من، گولّ، ئاو) لە کتێبی "حجم سبز" لەبەرچاوبگرن:

ابری نیست
بادی نیست
می نیشینم لب حوص:
گردش ماهی ها، روشنی، من، گل، اب
پاکی خوشەی زیست..
من پراز نورم وشن
وپر از دارو درخت
پرم از راه، ازپل، از رود، از موج
پرم از سایەی برگی در اب:
چەدرونم تنهاست:
یان لە شیعری "پیامی در راه " هەر لەم کتێبەدا:
روزی خواهم امد و پیایی خواهم اورد
در رگها نور خواهم ریخت
و صدا در خواهم داد:
ای سبدهاتان پرخواب !
سیب اوردم، سیب سرخ خورشید..
ابر را پاره خواهم کرد
من گره خواهم زد

چشمان را باخورشید، دل هارا باعیشق
سایەهارا با اب، شاخەهارا با باد
و بەهم پیوست خواب کودك را با زمزمەی زنجرەها
باد بادك ها به هوا خواهند برد..
هەروەها لە "دەنگی پێی ئاو"دا:
وصدای متلاشی شدن شیشەی شادی در شب
پاره پاره شدن کاغز زیبا
پروخالی شدن کاسەی غربت ازباد..
ونخواهیم کتابی کەدر ان باد نمی اید
وکتاب در ان پوست شبنم تر نیست..
پشت سر نیست فصایی زنده
پشت سر مرغ نمی خواند
پشت سر باد نمی ا ید..

لە شیعر "دریا و مرد" لە کتێبی مرگ رنگ :

تنها، وروی ساحل
مردبەراه می گزرد
نزدیك پای اودریاهمه صدا
شب، گیج در تلاگم امواج
باد هراس پیکر
رومی کندبەساحل ودر چشم های مرد
نقش خگرراپر رنگ می کند
انگار
هی می زندکه:

مرد !كجا مى رود كجا ؟
و مرد مى رود به ره خويش
و باد سرگردان
وبادهمچنان..

له "نقش" لەهەمان كتێبدا:
امشب
بادو باران هردو مى كوبند
بادخواهند بركند از جاى سنگى را
و باران هم
خواهند از ان سنگ نقشى را فرو شويد
هردو مى كوشند
مى خوروشند
ليك سنگ بى محبا درستيغ كوه
مانده برجا استوار، انگار بازنجير پولادين..

كۆتا بەڵگە وەك نموونە لە دەنگى پێى ئاو دەهێنمەوە:
من مسلمانم
قبلەام يك گل سرخ
جا نمازم چشه، مهرم نور
دشت سجاده من
من وصو باتپش پنجرەهامى گيرم
درنماز جريان داردماه، جريان دارد گيف
سنگ ازپشت نماز پيداست
همه زرات نماز متلبور شده است
من نمازم را وقتى مى خوانم

که اژانش را باد گفته باشد سر گلدسته سرو
من نماز را پی تکبیره الا حرام علف می خوانم
پی قد قامت موج..
وصدای متلاشی شدن شیشه‌ی شادی درشب
پاره پاره شدن
کاغذ زیبایی
پروخالی شدنغربه‌ت از باد..
ونخواهیم کتابی که‌در ان باد نمی اید
کتابی که‌در ان پوست شبنم تر نیست..
پشت سر نیست فصای زنده
پشت سر مرغ نمی خواند
پشت سر باد نمی اید..

بەوجۆرەی تێبینیدەکرێت لەم نموونانە (با) هەروەکو ئەم دیاردە سروشتییانەیتر وەکو بەفر، بارانی بەخوڕ، هەرەسی بەفر، خۆر... هتد، لەو دیاردەیانەن کە جێگای گرنگی شاعیرن کە "با" دەکەوێت لە حاڵەتی ترسناکیدا دەگۆڕدرێت بۆ رەشەبا و ماڵ و دارودرەخت لەڕیشەدەردەهێنێت، بەلاّم دیاردەیەکی سروشتییە و شاعیر و لەو لایەنەوە شەیدای سروشتە و بە دیاردەکانی سروشتی سەرسامە لەم دیاردە سروشتییە، بەلاّم سەرنجی زۆرتری لە هەشت کتێبدا وادەردەکەوێت لەسەر رووی ئەم واتا ناسراوەشەوە مانایتر لەبارەی (با)وە لەلای "سپهەری"یەوە بەرچاودەکەوێت و ئەوەدەردەخات کە رێنمای مەعنەوی و عیرفانی ئالەم دیاردانەدا هێمای بۆکردوون لەبەرامبەر ئەم مانای دووەمەدا "با" نیشانەیەکە لەزاڵبوون، لەهەموو جێگەبوون و لەهەمانکاتدا لەهیچ جێگەنەبوون، رووەو هەموو جێگەکان و هەبوونی جێگە و لەجێگەیەکەوە بۆ جێگەیەکیتر هەڵکردن و بە مانای سووتانی سنوور، نادیاری و بێسنووری، وێرانی، سووکباڵی، تەنیایی، حیرەت، تێپەڕبوون، سەفەرکردن و تەرککردنی شتە پەیوەستەکان، دەڵێی هەموو ئەمانە لە دڵی "با"دا جێگەیان هەیە و "با"ش هەڵگری هەموو ئەمانەیە و بانگەشەیان بۆدەکات. ئەم شیعرەی خوارەوە لەبەرچاوبگرن:

رفته بودم سر حوچ
تا ببینم شاید، عکس تنهایی خودرا در اب
اب در حوچ نبود...
تو اگر در تپش باغ خدا را دیدی، همت کن
و بگو ماهی ها حوچشان بی اب است
باد می رفت به سر وقت چنار
من به سر وقت خدا می رفتم (حجم سبز، "پیغام ماهی ها")
هەروەها لە کتێبی "موسافیر"دا:
عبور باید کرد تاکو .... مرا به خلوت ابعاد زندگی ببرید ...
صدای همهمه می اید... تاکو که من دچار گرمی گفتارم.
هەروەها شیعری "تا انتهای حچور" لە دەفتەری "ما هیچ، ما نگاه":
امشب
در یك خواب عجیب
رو به سمت کلمات تاکو قسمت خرم تنهایی را
تجربه خواهد کرد.
هەروەها چاوانی تێپەڕبوونێك لەهەمان دەفتەر:
اسمان پر شد از خال پروانەهای تماشا... تاکو باد می امد از سمت زنبیل سبز کرامت...

دەتوانین نموونەکانیتر لە "هەشت کتێب"دا بە نموونە بهێنینەوە، بەلاّم بۆ ناسین و روونکردنەوەی ئەم مەفهومە هەمان ئەندازە بەسبێت (با) لەم نموونانە لەگەڵ ئاسوودەیی و سەفەرکردن دەڕوات و هاوسەفەرە لێرەدا دەڵێن کاتێك شاعیر لەبارەی باوە دەدوێت بەبێ جێوشوێن ئەو تێڕامانی هەیە.. ئێمە هیچکات با نابینین، بەلاّم هەستیپێدەکەین با هەرگیز لە رۆژهەلاّتەوە بۆ رۆژئاوا ناکەوێت لەلایەکەوە بەرەو لایەکیتر دەکەوێت و بۆ شاعیرێك عاریفێك چ دیاردەیەك لەمە ناسکتر دەتوانیت لە یادی فەمانی بێسنووری و بێپایاندا بێت. سەیری ئەو بەیتە جوانانەی "مەسنەوی" بکەن:

هر کسی رویی بسویی برده‌اند
وان عزیزان رو ببی سو کرده‌اند
هر کبوتر می پرد در مژهبی
وین کبوتر جانب بی جانبی
ما نه مرغان هوا، نه خانگی
دانه‌ای ما دانه‌ی بی دانگی

(جلال الدین رومی، مثنوی معنوی، تصحیح و پیشگفتار عبدالکریم سروش، مجلد پنجم، ابیات "٣٥٠-٣٥٢").

"جێگەی بێجێگە"و "بێ لایەن" ئەو جێگایەیە کە سنوورە جوگرافیاییەکان نامێنن و سەرەوخوار دەبن و دەسووتێن. بەیادهێنانەوەی ئەم لایەنەی "بوون"، "سپهەری" لەگەڵ تێڕوانین لەئەودا زیاتر لەهەرشتێك بەچاونەبینینی دونیای بێسنوری بەبیردێنێتەوە لەگەڵ سەرنجدان بە تەعبیری "سپهەری" چەمکی کۆلارە خاڵێکیتر ڕووندەبێتەوە خەڵوەت و گەڕان ژیان لەگەڵ تەنهاییدا، مەعنەویدا هاوپەیوەندە و لەهەمانکاتیشدا ئەوەی تێدایە کە ئەم خاڵەشی هەیە ئەویش ئەوەیە ئیمە "با" نابینین، بەلاّم هەست بە "با" دەکەین، بەلاّم کۆلارەکان دەبینین. کۆلارە بەچاودەبینرێت و شێوەیەکی دیاریکراوی هەیە، بەلاّم بەر لەهەر فەرمانێکیتر نەبینین و کەوتنەجوولەی لەفەزادا بۆ ئێمە ئاشکرادەکات. کۆلارە بە باڵی "با"وە دەنیشێت و بەبێهیچ سەرنجێك خۆی دەسپێرێت بە "با"و هاوڕێی لەگەڵ ئەودا بەملاوئەولادا دەڕوات لەگەڵ سەرنجدان لە جووڵەی کۆلارە لەئاسماندا بێقەراری و ڕەهایی "با" باشتر بۆمانئاشکرادەبێت. لە ڕۆمانی "کۆلارە"دا دووبارە نووسینەوەی "خالد حوسێنی" نووسەر بەباشی لە گەڕانەوەی "با"و کۆلارە بۆ ئەم مەبەستە سوودیوەرگرتووە، هەوەها "مستەفا مەستور" لە ڕۆمانی "ڕووی مانگی خودا ماچبکە" لە کۆتایی داستانەکەدا لە کۆلارەوە فڕین لەئاسماندا هاوشێوەی ئەو سوودیوەرگرتووە. لەم دڵگیرتر سوودوەرگرتنی دەرهێنەری ناوداری ئێرانی "اصغر فرهادی"یە لە فلیمی لەبارەی "الی"وەیە کە لەو بابەتەدا ونبوونی "الی" لەکۆتاییدا بە غەرقبوونی ئەو دەگوترێت، لەگەڵ دەستپێکردن و بەرزبوونەوەی کۆلارەکە لە کەناری دەریادا و ڕەهایی و

وابەستەیی ئەو بە سەفەرێکی نادیارەوە گرێدراوە، لەگەڵ ئەم تێبینییەدا کە تا کۆتایی فلیمەکە دیارنییە "الی" خۆی کوشتووە یان نووقمبووە "الی" لەفلیمەکەدا بە نادیاری دەمێنێتەوە بەوشێوەیە روونییە کە ئایا خانەوادەی "الی" لەو سەفەرەی ئەو ئاگادارن یان نا؟ بەوجۆرەی کە ناوی "الی" نەزانراوە و دیارنییە "الناز"ە یان "المیرا" یان شتێکیتر، بەلاّم بەهەرحاڵ ئەوەی کە ئەو بەپیری مەرگەوە رۆیشتووە و بەشێوەیەکیتر خۆی کوشتووە یان لەدەریادا نووقمبووە و نمایشی کۆلارەبازی رۆڵی ئەوە لە ساتەکانی کۆتایی تەمەنیدا لە کەناری دەریادا دیمەنەکە کۆتاییدێت کە بەر لەهەر شتێك تەرككردنی پەیوەستییەكان و سەفەرکردن بە زیهن دەسپێرێت.

بەلاّم چیرۆکی سەفەرکردن و تێپەڕین هەروا کۆتایینایەت با کە لەهەموو شوێنێکدا هەیە و لەهەمان حاڵیشدا لەهیچ شوێنێکدا جێگیرنییە وەك و رێبوار وایە کە ئارام و قەراری نییە و سەفەرکردن کار و پیشەی هەمیشەیی ئەوە لەسەرووی ئەمەشەوە لە زمانی "سپهەری"یش و لە عیرفانی سوننەتیشدا لەبەرگرتنی رێگای بیابان لایەنێکیتر لەلایەنەکانی کە جێگای تێرامانی عارف و سافیرە و ئەو عیبارەتە لە تێڕوانینی نەفس بۆ دیاردەکانی دونیای "با" رووداوێکە لە دونیای دەرەوەدا روودەدات ئێمە جووڵانەوە و نزیکبوونەوەی با هەستپێدەکەین هەبوونی و سەفەرکردنی و تێپەڕینی رێبوار بە چاوی خۆمان دەبینین بەلاّم قسە، تەنها قسەی دونیایی و دەرەوە نییە و دونیای دەروونیش گرنگی هەیە. لە شێوازی عیرفانیدا بابەتی جووڵەکردن و وێنا و جەختکردنەوەی ئیمە لە فەرمانی سنووری هەیە، کاتێك "سپهەری" چەمکی "با" بەکاردەهێنێت وە لەبەرامبەری نەمان و تێپەڕینەوە قسەدەکات دەتوانین لایەنی دەروونی ئەم فەرمانە لەبەرچاوبگرین. تێپەڕێن و لەجێگایەکدا نەمانەوە و وێرانکردنی لایەنێکی دونیایی هەیە کە هاوشێوەیە لەگەڵ ئاوازە سروشتییەکانی وەك و وێرانبوونی ماڵ و ئاوارەبوونە، بەلاّم عاریف تەنها لە وێرانی و ئاوارەبوونی دونیای دەرەوەدا ناڵێت، بەڵکو دەچێتەسەر وەختی ئاوارەیی دەروونیش. واتە شێوە و روانینی هەمیشە لە ئەمری بالاّ هەمیشە وێراندەکات، دەسووتێنێت، جارێکیدی دروستیدەکاتەوە، دووبارە دەیسووتێنێتەوە، دووبارە و سەرلەنوێ دروستیدەکاتەوە و بە گوتەی "مەولەوی":

بنمای رخ که باغ ز گلستانم ارزوست
بگشای لب که قند فراوانم ارزوست

ای افتاب حسن برون ادمی ز ابر
کان چهره‌ی مشعشع تابانم ارزوست
والله که شهر بی تو مرا حبس می شود
اوارگی و کوه و بیابانم ارزوست

(هه‌مان غه‌زه‌لی پێشوو).

ئه‌م ئاواره‌بوونه، ئاواره‌بوونی ده‌ره‌کییه، ده‌ریا و کێوه‌کان به‌تایبه‌تی بیابان شێوه‌یه‌کن له فه‌رمان، بێله‌به‌رچاوگرتنی له جیهانی ده‌وروبه‌رماندا، له‌هه‌مانکاتدا ئاواره‌بوونی زیهنی و ده‌روونیش له بابی موسافیری رێگاوه‌یه، له‌م به‌یتانه‌ی خواره‌وه‌دا موسافیر به وه‌رگێڕان و گۆڕانکاری ده‌روونی ئه‌م مه‌فهومه و گوفتاره له‌به‌رچاوده‌گرێت:

صورتگر نقاشم هر لحظه بتی سازم
وانگه همه بت ها را در پیش تو بگدازم
صد نقش بر انگیزم، با روح در اویزم
چون نقش تورا بینم، در اتشش اندازم
تو ساقی خماری، یا دشمن هشیاری
یا انکه کنی ویران هر خانه که می سازم
جان ریخته شد بر تو، امیخته شد با تو
چون بوی تو دارد جان، دان را، هله بنوازم

(هه‌مان غه‌زه‌لی پێشوو، ٢٢٤).

وێنه‌گه‌ری و وێنه‌کێشان و سوتاندنی پیشه‌ی هه‌میشه‌یی و به‌رده‌وامی مسافیری رێگایه عاریف هه‌ر وێنا و وێنه‌یه‌ك که له فه‌رمانی ره‌وانی باڵاده‌ستی دروستیده‌کات، ده‌یسووتێنێت ئه‌م کاره‌ی تێڕوانینی وێرانی ده‌ره‌کی نییه که مسافیره تاك و ته‌نهای له دیارده سروشتییه‌کانی دونیای به‌ئاشکرابببینێت به‌ڵکو به په‌یوه‌ندی به وێرانی و شێوازی سووتانی ده‌روونی مسافیره‌وه هه‌یه و له‌جێگای خۆیدا پێویست و پیرۆزه.. لێره‌دا شیعر ((bodbi)) که له ده‌فته‌ری "شرق

اندوه" مانای روونتردەدات بەدەستەوە دەرکەوتنی باغی فەنا و شۆڕشی تاریکی و گۆرانی هەر ڕووبارێك بە دەریا و تێڕوانینی ئەزموونی بێسنوور سووتانە کە لە ناخی موسافیردا ڕوودەدات و لە ئەزموونەکانی پاکی ناخی "موسافیر" پەروەردە لادەدات:

انی بود، درها وا شده بود ... تاکو هر بودی، بودا شده بود.

بەوشێوەیە کە پێشتر هاتووە (با) بەپێچەوانەی بارانەوە کە تەنها لەسەرەوە دێتەخوارەوە دەبارێت لەملاولەولاوە دەکەوێت و ڕەنگە باشترین دەرکەوتنی فەرمانی بێسنوور بێت لە دونیای دەوروبەرماندا لەنێوان شاعیر و کلاسیکییەکاندا، ئەگەر بمانەوێت کەسێك ببینین کە لەبارەی "با"وە کەم تا زۆر هاوتای "سپهەر"ی قسەیکردبێت ئەوە ئەو کەسە "حافیز"ە کە لەبارەی "با"وە قسەی زۆری کردووە، هەڵبەتە نەك بەوجۆرەی کە "سوهراب" قسەیکردووە. نموونەی سوودوەرگرتنی "حافیز" لە "با" وەك:

بوی خوش تو هر که ز باد صبا شنید
از یار اشنا سخن اشنا شنید

هەروەها:

گر به نزهتگه ارواح برد بوی تو باد
عقل و جان گوهر هستی به نپار افشانید

وەکو ئالەم بەیتانەدا "بای سەبا"بۆ "حافیز" نامەبەر و پەیامبەرە و پەیامی خۆشی و شادی لە جێگایەکەوە بۆ جێگایەکیتر دەبات و دەهێنێت، هەروەها ئەم بەیتە خوارەوە لەبەرچاودەگرێت:

من باد صبا مسکین دو سرگردان بی حاصل
من افسون چشمت مست و او از بوی گیسویت

واتە: (مـن و بای سەبای هەژار و دوو سەرلێشێواوی بێبەرهەم، من لە ئەفسونی چاوی مەست و ئەو لە بۆنی پرچت).

لەم بەیتەدا سەرلێشێوای بای سەبا لەگەڵ بۆنی پرچدا هاوپەیوەندن لەهەمانکاتیشدا فەراهەمهێنان و سەرلێشێواوی لەبارا و جووڵەی ئەو جێگرتنە، بەلاّم با بۆ سپهەری پەیامێك لە جێگیایەوەکەوە بۆ جێگایەکیتر نابات و ناگەیەنێت بەڵکو لەگەڵ سیرەت و نەجووڵانیدا شکۆ و جوودا هاوپەیوەندن بەر لەهەر شتێك بیرهێنانەوە و بێسنووری و جودییە.

لەسەرووی ئەمەشەوە تێپەڕین و سەفەرکردنە پیشە و جێنەگۆڕین و خووگرتن و بەئاگربەردان لە پەشیمانی و پەریشانی پشتگوێخستنی رابردوو لەئاییندەدا ژیان لێرە و لەئیستادا. کاتێك "سپهەری" دەڵێت قسەکانی ئەو باسی چەمکی "ئیبن الوقت" دەکەن:

صوفی ابن الوقت باشد ای رفیق
نیست فردا گفتن از سرگ گریق
تو مگر خود مرد صوفی نیستی
هست را از نسیه خیزد نیستی

"مپنوی معنوی، دفتر اول، ابیات ١٣٥-١٣٤).

لە سیستەمی عیرفانی ئیسلامیدا یەکێك لە دژواری و بەربەستەکان لە بیابان و سەحرا بریتییەلە بەسەرچوون و هیلاکی کە بە پەشیمان و پەرێشانی دەگەن سووتان پەرێشانی و پەشیمانی عادەتکردنە بە تازەگەری و ئەزموونکردنی کۆنی و مەلامەت کە بە پەشیمانی و پەرێشانی دەگات، سەرنج لەم بەیتە ناسکەی "مەلاونا" بدەین کە دەڵێت:

همه را بیازمودم ز تو خوشترم نیامد
چو فروشدم به دریا چو تو گوهرم نیامد
سر خمرەها گشودم ز هزار خم چشیدم
چو شراب سرکش تو به لب و سرم نیامد
نه عجب که در رخ من گل یاسمن بخندد
که سمن بری لگیفی چو تو در برم نیامد

ز پیت مراد خود را دو، سه روز ترگ گفتم
چه مراد ماند از ان پس که میسرم نیامد
پروای تن پریشان تو و ان دل پشیمان
که ز هر دو تا نرستم دل دیگرم نیامد

"سەرچاوەی پێشوو، بەیتی ١٣٠).

"سپهەری" کاتێك با و ئاو و باران لەدەرەوە دەبینێت ئەم نوێگەرییە تازەبوونەوەیە لە ناخ و دەروونیدا دەردەکەوێت و بەدڵیەوە دەنووسێت بەگرتنەبەری ئەم شێوازە، مسافیر لەڕێگای بەیەکگەیشتن راستگۆیانە بڕیاردەدات و غەمەکان و دڵتەنگییەکانی ناو ناخی دەشوات مسافیری رێی بەبنبەستگەشتن و لەنێوچوونەوە رێگایەکی تەنگ و تاریکە کە داهاتووی نەبێت کۆنی و بەسەرچوون لە سونەتی عیرفانی ئێمەدا هەمان مانای تێدایە بۆ لەناوبردنی خراپ لێکحاڵیبوون ئاماژە بەوەدەکەن کە لە فەزای دوای شۆڕش حکومەت و لە نووسینەکانی "جلال ال احمد" رۆشنبیرانیتریش لە گەڵ مانای دڵتەنگی لە وشەی "ابن وقت" رووبەڕووبووینەتەوە کە بە مانای زاڵبوون دێت و ئەندامی حیزبی "با"بوون و بە زاراوەیتر مانای نەبوونی هەیە و مەبەست لە و بێڕەچەڵەکییە، بەلاّم مەبەست لە کوڕی کاتبوون"ابن وقت" لێرەدا بە مانای کۆنی دێت و ئەو لە ئەدەبیاتی عیرفانیدا کە قسەمان لەسەرکرد.

لەم وتارەدا هەوڵمدا کەلەگەڵ ڕوونکردنەوەی وشەکانی هەریەکە لە دەفتەرەکانی هەشت کتێبدا نیگەرانی وجودییەکانی سپهیری بناسێنم لێرەوە روونیدەکەمەوە کە هەر عارفیێك مسافیرێك شەیدای هەندێك لە دیاردە سروشتییەکان لە دونیای دەوروبەرماندا بە فەرمانی بێسنوور لەوێدا و بەدیهێنراوانە بۆیدەردەکەوێت بۆ دوای روونکردنەوە و مێژوی نووسینی شیعرەکانی لە "هەشت کتێب"دا هەڵبژاردنی چەمکی بەها و شێوەی یەکێك لە مانا گرنگەکانی عیرفانی لە هەشت کتێبدا لەبارەی جەختکردنەوە لەسەر دوو دیاردەی جیاواز لەم دیاردانە لە "هەشت کتێب"دا قسەمانکردووە. مانای یەکەم: "با" تێڕوانین و بەرخورد لە ناسینی ئەم دیاردانەیە، دیادەیەك لە کۆی ژمارەی دیاردەکانیتر. مانای دوەم: بریتییەلەوەی لەگەڵ سەفەرکردن و رەهابوون و ئاسوودەیی و وازهێنان و هەڵهاتن و تازەبوونەوە و ئاگربەردان لە رابردوو و پەشیمانبوونەوە لە "هەشت کتێب"دا و کتێبە عیرفانییەکانی ئەو زیاتر لەمەیە کە لەم وتارەدا باسکراوە، "سپهەری" لە باسی بابەتیترەوە وەکو مەرگ، هیچستان، خودا، غەم، عەشق،

خەون و تێڕوانینیتری هەبووە.

هیوادارم بە چاپکردن و بلاۆکرنەوەی بابەتەکان لەسەر"سپهەری"و کۆکرنەوەی دە بابەتیدیکە کە لەم دواییانەدا گەیشتوونە چاپ، بەدەستی خوێنەران بگات و لەگەڵ ئەندێشەو بیری نووسەردا دەربارەی "سپهەری" زیاتر ئاشنابن.

•••

**سەرچاوە:**

سایتی فەرمی دکتۆر سروش دەباغ.



# لەبارەی لیبرالیزمەوە

## گفتوگۆ لەگەڵ

## د. سروش دەباغ

و. ڕێبوار کوردستانی




"د. سروش دەباغ" تەمەن (٣٨) ساڵ، کوڕی ڕۆشنبیر و بیرمەندی ناوداری ئێرانی"د. عەبدولکەریم سروش"ە، لە ساڵی (١٣٧٧) هەتاوی دکتۆرای لە دەرمانسازی لە زانکۆی تاران بەدەستهێناوە، پاشان روویکردووەتە بەریتانیا و بەشێوەی ئەکادیمی خەریکی خوێندنەوەی فەلسەفە بووە و لە ساڵی (١٣٨٥)دا دکتۆرای لە فەلسەفەی تەحلیلی و لەسەر "فەلسەفەی ئەخلاق"دا وەرگرتووە، لەدوای گەڕانەوەی لە بەریتانیا بووەتە ئەندامی "دەزگای زانستی و دامەزراوەی لێکۆڵینەوەی حیکمەت و فەلسەفە" لە ئێران و هەروەها بەڕێوەبەری دامەزراوەی" پژوهش و معرفت- لێکۆڵینەوە و مەعریفەیە"، تاکو ئیستا "٨" کتێبی بەچاپگەیاندووە، لەوانە: ( ایین در ئایینه، معنا و سکوت، عام و خاص در اخلاق، امر اخلاقی- امر متعالی،.. هتد)و بێجگەلە نووسینی سەدەها وتار بە زمانەکانی "فارسی و ئینگلیزی" لەمەڕ چەمکی "ئەخلاق و فەلسەفەی ئەخلاق، عیرفان، فەلسەفەی زمان و.. هتد، نوێترین کتێبیشی لە

سەرەتای ساڵی ئەمساڵدا بلاوبوویەوە بە ناونیشانی " ترنم موزون حزن" کە لەبارەی رۆشنبیری ئایینییەوە نووسیویەتی. ئەم چاوپێکوتنەی خوارەوە دیخوێنیتەوە نوێترین گفتوگۆیە کە لەبارەی "لیبرالیزم"ەوە لەگەڵیدا ئەنجامدراوە.

**پرسیار:** لەدەسپێکدا لەمەڕ دابەشکردنێکی گشتی چەمکی"لیبرالیزم" بفەرموون؟

**سروش دەباغ:** باشتروایە لەسەرتادا باس لە خودی زاراوەی "لیبرالیزم" بـــــــکەین، (Liberation) یەکێك لە دروشمەکانی شۆرشی فەرەنساش بوو بە مانای "ئازادی"و یان بە دەستەواژەی هەندێك "رزگاری"و هەڵبەتە هەندێك لە بیرمەندانی ناوەوە و فەیلەسوفانی سیاسەت هاوواتای قوتابخانەی"ماف"یان بۆ زاراوەی "لیبرالیزم" لەبەرچاوگرتووە. ماف بە مانای (Right) لەبەرامبەر (Duty) کە ئەم مانایە دەگرێتەوە کە پێش هەرشتێك جەخت لەسەر مافی تاکەکان دەکاتەوە. ئەگەر لە روونکردنەوەی ئەم زاراوە تێپەڕین دەتوانین بڵێین لەسەر بنەمای دابەشکردنێکی گشتی لەلیبرالیزمدا دەتوانین سێ لقی لەیەکترجیابکەینەوە:

١. لیبرالیزمی سیاسی.
٢. لیبرالیزمی مەعریفی.
٣. لیبرالیزمی ئابووری.

من هەوڵدەدەم بۆ زیاتر روونکردنەوەی ئەم دابەشکردنە لە مێژووی هاوچەرخدا ئاماژە بە چەند نموونەیەك بکەم، بەجەختکردنەوە لەسەر ئەوەی لە درێژەدان خۆم دەپارێزم و ئاماژە بە چەند خاڵێك دەکەم: ئەگەر بۆ مێژووی هاوچەرخی ئێران بگەڕێنەوە، دەبینین ئەوەی لەسەرەتای مێژووی پێش شۆرشدا روویدا ئەوکاتەی مەرحوم "موهەندیس بازرگان" کە بوونە وەزیر، زۆرێك لە رەخنەگرانی مەبەستیان زۆرجار لیبرالیزمی سیاسی بوو نەك مەعریفی و ئابووری. هەڵبەتە هەمان ئەو لیبرالیزمە سیاسییەی کە کتومت و لەبەرامبەدا ئەو داخوازییانەی لە لیبرالیزمی سیاسیدا بوونیان هەیە، بوونی نەبوو. بەهەرحاڵ ئەم زاراوەیە لە وەسفکردنی ئەواندا بەکاردەهات. بۆچی بەویان دەگوت تۆ لیبراڵی؟ چونکە ئەو توندڕەونەبوو، چونکە ئەهلی هەڵکردن لەگەڵ ئەوانیدی و ئەهلی لێبوردنبوو و بەمانای ئەرێنی"پۆزەتیف"ی ئەمرۆ ئەهلی سازشبوو.

ئەو باوەڕیوابوو دەبێت سیاسەت هەنگاوبەهەنگاو لەگەڵیدا بڕۆیت و دەبێت ئەهلی هەڵکردنبین لەگەڵ ئەوانیتر و تەنانەت بە دەستەواژەی "حافیز": لەگەڵ دوژمنانیشدا دەبێت هەڵبکەین. بەپێچەوانەی ئەوەی کەسانێك باوەڕیانوابوو دەبێت بەلایەنیکەمەوە لەگەڵ دوژمناندا هەڵنەکەین و سازشنەکەین. ئەمە مانایەکی لێبوردنی لیبرالیزمە، واتە کەسێك کە ئەهلی لێبوردەیی و ئاسانکارییە و هەڵبەتە لەو قۆناغانەدا بە دروستی بەکارنەدەهات.

دەنگی ئەو زاراوەیە لەو قۆناغانەدا بەرگوێمان کەوتووە. دەیانگوت ئەو لیبراڵە، واتە ئازادیخوازە، واتە ئەهلی ئاسانکارییە. ئەگەر بمانەوێت مانای هونەریتری لیبرالیزم روونبکەینەوە دەڵێین، بریتییەلە دەرکێك لەبارەی سیاسەتەوە کە حکومەت دەبێت لەبەرامبەر ئایینە جیاوازەکاندا بێلایەنبێت. واتە ئەگەر لەکۆمەڵگەیەکدا کە ئاییندارانی زۆرن، حکومەت دەبێت لەبەرامبەر ئایینەکاندا بێلایەنبێت. واتە ئەگەر لە کۆمەڵگەیەکی وەك کۆمەڵگەی ئێمە کە مەزهەبی شیعە زۆرینەیە و مەزهەبی ئەهلی سوننە و کەمینەکانیدیکەی وەکو مەسیحییەت و یەهودییەت لە کەناری ئەودا، مەشروعییەتی حکومەت لەهیچکام لەم ئایینانە وەرناگیرێت. لەڕاستیدا حکومەت بە پشتیوانی ئایین نابێت دروستببێت و لەڕووی مافەوە پەیوەندی نێوان ئایین و حکومەت، بە زاراوە شتێکی داخراوە و پەیوەندییەکی لەمجۆرە بوونی نییە. جەختکردنەوە لەسەر ئایین و حکومەتە نەك ئایین و سیاسەت.

**پرسیار:** لە پەیوەندی لەگەڵ کۆتا خاڵێك کە ئاماژەت بۆ کرد، بنەما لەسەرئەوەی کە جەختکردنەوە لەسەر جیایی ئایین لە حکومەتە، روونکردنەوەیەکی زیاتر بفەرموون؟

**سروش دەباغ:** جیاکاری و جیاوازی لەنێوان ئەم دووانەدا بوونی هەیە، (Politics) هاوواتای سیاسەت و (Government) هاوواتای سیاسەت. لەڕاستیدا ئایین ناتوانێت لە سیاسەت جیابێت، بەلاّم دەتوانێت لە حکومەت جیابێت. لە ئایینێکی وەکو ئیسلامدا لەگەڵ تەواوی کاروبارەکانی ژیانی مرۆڤدا سەروکاری هەیە، تەنانەت کاتێك لە فێربوونی زانستیدایت، بەمانایەك دەرکێك کە لە ئایین هەتە لەژێر کاریگەری ئەو دەرکەدایت، ئەگەر ئاییندار بیت، کاتیّ کاری سیاسیش دەکەیت هەر بەهەمانشێوەیە. بەلایەنیکەمەوە بەها ئایینی و ئەخلاقییەکانی لەڕێکخستن و بۆنە ئەخلاقییەکاندا دەردەکەون. بۆ نموونە: ئەگەر کەسانێکی

لەوجۆرە لە حکومەت و سیستەمێکی دیموکراسیدا بچنە پەرلەمانەوە بۆ دامەزرانەدن و یاسادانان ئەوا ئەم بەهایانەیان لەبەرچاوە، هەڵبەتە دەبێت مافی کەمینەش لە کەناری ئەواندا لەبەرچاوبگیرێت. هەمان ئەو گوتەیەی کە "جۆن ئیستیوارت میل" دەیگوت: نابێت لیبرالیزم یان دیموکراسی بریتیبێتلە دیکتاتۆرییەتی زۆرینە، دەبێت مافی کەمینە بپارێزرێت.

نموونەی ئەمرۆشمان هەیە کە رژێمی تورکیایە، ئەم ولاّتە لەرِووی حەقیقی و بۆنەکان و پەیوەندییەکانی نێوان خەڵکی لە کۆمەڵگەی ولاّتێکی تەواو ئایینییە. نزیکەی لە سەدا(٩٠)ی خەڵکی تورکیا لە نوێژی هەینیدا بەشداریدەکەن، بەلاّم دەوڵەتی سیکۆلار یان بەدەستەواژەیەکیدی لیبراڵە. بەو مانایەی پەیوەست نییە بە پشتیوانی ئایین و لەسەر ئەوە دانەمەزراوە و مەشروعییەتی خۆی لە ئایینەوە وەرنەگرتووە. نە"رەجەب تەیب ئوردوغان"و نە "عبدولّلاّ گویل" بانگەشەی ئەوە دەکەن کە ئەم مەشروعییەتەیان لە ئایینەوە وەرگرتووە. "گویل" لە یەکەمین ئەو سەرۆك کۆمارانە بوو کە هاوسەرە حیجابەکەی خۆی بۆ کۆشکی سەرۆکایەتی کۆمار برد کە جێگەی جیاوازی و ناکۆکی بوو لەگەڵ سوپادا، بەلاّم لەسیاسەتدا سیکۆلار و بەمانایەك لیبراڵە. بەومانایەی کە دەسەلاّتی بەپشتیوانی ئایین نییە و پەرلەمان و دامەزراوەی یاسادانانی سیکۆلارە. زۆرێك لە تاکەکانیدیکە هەن لەئەنجومەندا بوونیان هەیە و ئایینداران، هەرلەبەرئەمەش کە دەڵێم پەیوەندی ئایین و سیاسەت هیچکات ناپچرِێت، چونکە سیاسەت یەکێکە لە کاروبارە کۆمەلاّیەتییەکانی رەفتاری مرۆڤ، ئێوە کە وەرزشیش دەکەن، دواجار ئاداب و کۆمەڵێك رێسای هەیە و دەبێت پەیرِویانبکەن. ئێوە ئەگەر ئایینداربن بەشێوەیەکی تایبەت کارئەنجامدەدەن و ئەم ئاداب و یاسایانە بتانەوێ یان نا لەئێوەدا بوونیاندەبێت. ئێوە کاتێك ئەوانەش دەخوێنن، خۆشویستیتان بۆ بەرامبەرەکانتان دەبێت و ئەو بەهایانەی کە پاپەندنپێیانەوە، بۆنەکان و پەیوەندییەکانتان رەنگرێژدەکات. سیاسەتیش جۆرێك رەفتاری هەڵبژێردراوی مرۆڤە کە هاورِایە لەگەڵ کۆمەڵێك (دەبێت و نا بێت)ەکان، ئەگەر مرۆڤ بە دەستەواژەی "ئەرستۆ" ئاژەڵێکی سیاسییە، بەهەرحاڵ سیاسەتکردن خاڵی نییە لە نۆرم و بەها و لەسیاسەتکردندا یەکێك لە سەرچاوەکانی نۆرم بۆ تاکێکی ئاییندار، بریتییەلە ئایین. کەواتە ئایین ناتوانێت لە سیاسەت جیابێت، بەم مانایەی کە ئەو بەهایانەی لە رەفتاری کۆمەلاّیەتی مرۆڤدا لە هەموو کاروبارەکاندا و پانتاییەکانی ژیانیدا رەنگرێژی دادەنێت و جێکەوتی دەبێت. بەلاّم ئایین دەتوانێت لە حکومەت جیابێت. ئەگەر ئێوە لیبراڵبن، لە لیبراڵیزمی

سیاسیدا دەوترێت کە نە مەشروعییەتی حکومەت لە ئایینەوە وەردەگیرێت و نە حکومەت دەتوانێت لەحکومەتداریدا لایەنگری ئایینێك بکات و پشتی ئایینێك بگرێت و دەبێت رێگەشبدات کە کەمینەکان چالاکی خۆیان ئەنجامبدەن و لێرەدا چەمکی ماف دەهێنرێتەناوەوە. بەو مانایەی کە مرۆڤەکان بوونەوەری خاوەن مافن و حکومەت جگەلە پاراستن و پارێزگاری ئەم مافانایەن و رێکخستنی پەیوەندییەکانیان کارێکیدیکەی نییە. هەرلەبەرئەمەش لیبرالیزمی سیاسی دەبێت بەراستی و دروستی دەرکبکرێت کە جیاکردنەوەی دامەزراوەی ئایینی لە حکومەت دەگرێتەخۆی، بەلاّم بەپێویست قایلنییە بەجیایی ئایین لە سیاسەت. هەڵبەتە ئەگەر تاکێکی ئاییندار نەبێت بەوشێوەیەی لە کەسی ئاییندا‌ردا لە سیاسەتکردنیدا ئایین رەنگرێژی دەبێت، لەم تاکەدا ئەو رەنگرێژیە بوونی نابێت، مادام ئایدیا ئایینیەکانی لە خۆشویستن و وانەفێربوون و کاروبارەکانیدیکەی پەیوەست بە ژیان رەنگرێژییان نابێت.

**پرسیار**: پێناسە و وەسفی لیبرالیزمی مەعریفی چۆنە و چ داخوازییەکی هەیە؟

**سروش دەباغ**: ئەمە کورتەیەك بوو لە چەمکی لیبرالیزمی سیاسی کە لەگەڵ باسەکانی ئەمرۆدا کە سیکۆلاریزمی سیاسیە پەیوەندییەکی پتەوی هەیە. بەلاّم لیبرالیزمی مەعریفی بریتییەلە درەنگ دۆزینەوەی وێنای یەقین و جەختکردنەوە لەسەر رێگەدان بە هەڵەکردنی مرۆڤ و هەڵەبوونی مرۆڤ و روونکردنەوەی ئەوەی کە ناتوانرێت بەئاسانی حەقیقەت بخەینەنێو چنگمانەوە و ئەوەی کە مرۆڤ بەشێوەیەکی سیستماتیکی هەڵەدەکات. بەپێچەوانەی ئەوەی کەسانی رابردوو بیریاندەکردەوە کە لەبنەرەتدا مرۆڤ بەشێوەیەکی سیستماتیك هەڵەناکات، لەبەرئەوە بەچنگخستنی یەقین بە کارێکی زۆر سەخت دەرنەدەکەوت، بەلاّم لە کۆمەڵگە نوێیەکاندا لە داخوازییەکان لیبرالیزمی مەعریفی هەرئەوەیە کەهەر بەوجۆرەی کە دیکارت جەختی لەسەر گومانی دەستوری دەکردەوە، لەبنەرەتدا بەئاسانی ناتوانرێت بە یەقین بگەین و بە دەستەواژەی "شاملو" ئاە، ئەی یەقینی ونبوو، ئەی ماسی راکردوو...

بەلاّم ئەگەر بمانەوێت روونکردنەوەیەك لەبارەی لیبرالیزمی ئابوریەوە بدەم، لیبراڵیزمی ئابووری بەلایەنیکەمەوە دەبڕین و گوزارشتە کلاسیکییەکانی بریتینلەوەی کە جەختکردنەوە لەسەر یاسا و رێساکانی فەرمانڕەواکان لەسەر بازاڕی ئازاد و ئەوەی کە دەوڵەت تاکو جێگەیەك دەتوانێت دەستوەربداتە بۆنەکان و پەیوەندییە ئابوورییەکان و ئابووری بە سەنتەرنەکات و جەختی لەسەرنەکاتەوە

و قورسایی خۆی نەخاتەسەری و ڕێگەبدرێت کە یاسای فەرمانڕەوا بەسەر بازاڕدا بەشێوەیەك کە خودی خۆی و بەشێوەیەکی سروشتی لەنێو خۆیدا بە دەستەواژەی "فۆن هایك" کاروبارەکانی بەرەوپێشەوەببات و ئەم جێکەوت کاریگەرییە و داکشانی کاروبارەکان و دیاردەکان و زاراوەی کار بەرەوپێشەوەیبەرن و گەشەیپێبدەن. ئەوەی کە ئێستا لە زۆرێك لە ولاتە ئەوروپیەکاندا بوونی هەیە. هەڵبەتە ئەم روانینە لە جۆری کلاسیکییەکەی دەژمێردرێت، چونکە ئەمڕۆ لیبرالیزمی نوێ لە حەوزەی ئابووریدا نزیکییەکی لەگەڵ دەوڵەتی خۆشگوزەرانی و چەمکگەلی لەمجۆرە پەیدابووە و ئەمڕۆ کەمتر باوەڕیان بەوەهەیە کە دەوڵەت بەتەواوی دەستبخاتەناو بەکارهێنان و بەرهەمهێنان و باوەڕیانوایە دەوڵەت دەبێت چاودێری بواری ئابووری بکات. بەلاّم ئەمەش بەشێوەیکی گشتی دەبێت نەك لە هەموو بەش و شتە بچووکەکاندا.

**پرسیار:** ئایا دەکرێت حکومەت لەڕووی سیاسییەوە لیبراڵ نەبێت، بەلاّم لەڕووی ئابوورییەوە لیبراڵبێت.

**سروش دەباغ:** تاکو رادەیەك ئەمکارە بوونی هەیە، لە حاڵی حازردا واپێدەچێت"چین" پێیخستبێتەناو ئەم رێڕەو و رێگەیەوە، سیاسەت بەتەواوی سەنتەرگەرا و نادیموکراتە، بەلاّم چەندین ساڵە کە هەوڵدەدات کە لە سیاسەتە "کاسترۆ"ییەکانی دووربکەوێتەوە. چین هاتووەتەناو بازاڕی ئازادەوە و کالاکانی بەتوندی و بەهێزی لەگەڵ کالا ئەمریکییەکان و ئەوروپییەکان پێشبڕکێدەکەن و بەشێك لە بازاڕی گرتووەتەدەست. چین پێیخستووەتە ئەم رێڕەوەوە و هەڵبەتە پێویستی بە چەند پێداویستییەکە وەکو: پەیوەندییەکان و ئەنتەرنێتی ئازاد و هەڵبەتەش قەیرانێك لەمڕووەوە بوونی هەیە، وادیارە ئەم چیرۆکە شتێکە دەکرێت بوونیببێت و دەوڵەتی چینیش ئاسانکاری و لێبوردەیی ئەنجامداوە تاکو بتوانێت لە بازاڕی جیهانیدا پێشبڕکێبکات.

•••

**سەرچاوە:**

گفتوگۆ با سروش دباغ در باب لیبرالیزم.

www.drsoroush.com هەروەها پێگەی د.سروش دباغ .

# مەرگ کۆتایی کۆتر نییە

## لەبارەی "مـــەرگ"ەوە

د. سروش دەباغ
و. هەڵکەوت هەورامی

**بەناوی خودا**

سلاّو خانمان و ئاغایان لەم دانیشتنە، ئەم دانیشتنە بە یادی (مەرحوم عادلی ئیرەوانی) ئەو لاوەی (٤٠) رۆژ لەمەوبەر و لە رووداوێکی لەناکاودا وەفاتیکرد و کە رۆیشت و بە ئەبەدییەتەوە پەیوەستبوو. هەوڵدەدەم لە ماوەیەکی کەمدا بە تەفسیل لە سوننەتی عاریفان و ئەوەی لە ئایەت و فەرموودەکاندا هاتووە لەبارەی مەرگەوە روونبکەمەوە و گرنگی مەرگ هەروەك چۆن گەورەکانمان باسیانکردووە، عەرزبکەم.

رەنگە خراپ نەبێت پێش ئەمە وەکو پێشەکییەك ئەمە باسبکەم ئەویش ئەوەیە پێش ئەوەی ئەم مەجلیسە دەستپێبکات کەوتمە یادی دوو هاورێی خۆشەویستم کە هەر لەم تەمەنەدا وەفاتیانکرد. یەکەمیان ئەو هاورێیەم بوو کە پێش (١٥) ساڵ لەمەوبەر لەگەڵ هاورێیەکی خۆیدا لەناو دەریای "خەزەر"دا نوقمبوون، ئەم رووداوەش بۆ خێزانەکەیان زۆر زۆر تاڵ و گیانسووتێنەر و گیانکوژ بوو.

رووداوی دووەم نزیکەی (٤-٥) ساڵ لەمەوبەر لە رۆژانی "نەورۆز"دا، جارێکیتر هاورێیەکی زۆر خۆشەویستم کە زۆر پەیوەندی لەگەڵ خێزانەکەماندا هەبوو لە رووداوێکی هاتوچۆدا و لەرێگای "قەزوین و تاران" کۆچیدواییکرد.

ئەم دوو رووداوەم بۆیە باسکرد تاکو لەیادماندا بێت کە بەداخەوە ئەم جیهانە پڕ لە رووداوی تاڵە و مەرگیش هیچکات ئاگادارماننناکاتەوە و لە حاڵێکی لەمجۆرەشدا بە هەرحاڵ هەر بەوجۆرەی گەورەکانمان وتویانە پێش هەرشتێك مەرگ بریتییە کە ئێمەی مرۆڤ لەدونیادا هەمانە و لەگەڵیدا رووبەڕووین کە بەهیچ جۆرێك راکردن و دەربازبوون لێی بوونی نییە.

فکر سبو کن که پر از باده کنی
بیا که قصر عمل سخت سست بنیاد است
بیا که بنیاد عمر بر باد است

به دەستەواژەی "حافیز" کۆتای کاری هەموومان، (گلی کوزگران شدن است)، واتە: بوون بە گڵ و خاکی گۆزەکەرانە.

مومکینە بوونی هەبێت و کۆشکی کردارەکانمان و بینای ئارەزووەکانمان رۆژێك دەڕوخێت و دەچینەناو گڵەوە و بە گوتەی فەیلەسوفێکی بەریتانی: رۆژێك دێت ئەو وەستایانەی کە وەستاییانکردووە و بینایان دروستکردووە ئەوانیش دەمرن و لەناودەچن. ئەو رۆژەی بۆ کەسێك و لە کۆچی کەسێك دادەنیشین و ئێمەش هەمووان دەڕۆین و کەسێك نامێنێتەوە.

بۆچی ئێمە بیر لە دیاردەی "مەرگ" دەکەینەوە؟و بۆچی ئەم چیرۆکە کاتێك بەتایبەت رووداوێك روودەدات تەکانمانپێدەدات و دەمانهەژێنێت؟ هەروەها چەندین رۆژ و مانگ و ساڵ ئەو دڵ مەشغوڵبوونەی بەم رووداوانەوە واز لە زەین و مێشکمان ناهێنێت و بەجێمانناهێڵێت. نەفسی مرۆڤ سەرکەشە و لە ژیانی گشتی مرۆڤەکاندا نەفسیان سەرکەشییان لەگەڵدا دەکات. ئەو سەرکەشییانەی کە هاوڕان لەگەڵ توڕەیی، دەرچوون لە خود، پەرێشانبوونی خود، ئازاردانی ئەوانیتر، بینیی خود لەژیاندا بە نەمربوون. هەر لەبەرئەمەش زۆربەی گەورەکانمان کاتێك لەم جیهانەدا بیریان لەگەڵ خۆیان کردووەتەوە و لەگەڵ خۆیان دواون، بیریان لە سەرکەشییەکان و لێلییەکان و پیسییەکان کە هەندێجار دەڕژێنە ناو دەروون و ویژدانی مرۆڤەوە بە دیدەی رمانەوە لێیانڕاماون."مەولانا" بە زمانیحاڵ ئەم قسانەمان لەگەڵدا دەکات:

یارب این بخشش نه حد کار ماست
لگف تو لگف خفیرا خود سزاست

ئەگەر ئێمە نەفسی سەرکەشمان کە لەم دونیایەدا هەمانە و چەندین هۆ و هۆکار هەن تاکو مرۆڤ لە خودی خۆی بێئاگابێت، بۆ رووبەڕووبوونەوەی لەگەڵ ئەو سەرکەشییانەی نەفس لەگەڵماندا دەیکات و ئەو شتانەی لەژیاندا لەگەڵیاندا رووبەڕووین و لە شوێن و پلەی خۆمان و لە چارەنووس و بازنەی کارمان دووردەخەنەوە. پیاوە مەزنەکانی زانستی ئەخلاق و بونیاتنەری

مەزهەبەكان دوو ڕێگەیان بۆ پێشنیاركردووین كە لە ئەنجامی بەكارهێنانیانەوە كە لە بیر و ئەندێشەی ئەواندا بوون، مرۆڤ دەتوانێت بەسەر ئەو سەركەشییانەی نەفس و دەرووندا زاڵبێت. یەكێكیان بریتییەلە: یادی "خوای گەورە" و دووەمیان، بریتییەلە یادكردنەوەی "مەرگ". لەیادماندا بێت كاتێك باسی "مەرگ" دەكەین، مەبەست لەبارەی یادی گۆڕ و سزای ناوگۆڕ و ئەمانە نییە كە بەدرێژی لە كتێبە ئاسمانی و ئایینییەكاندا باسكراون، ئەمانەی لە جێگەی خۆیدا گەلێك باشن، پیرۆزن و دەبێت لە جێگەی خۆیدا باش بیریان لێبكەینەوە، بەڵكو من باس لە دەرەنجام و ئەنجامەكانی یادی مەرگ و لەڕووی بوونناسی "ئەگزیستانیسالیسم" قسەدەكەم و مەبەستم ئەمەیە. كەسێك كە بیر لە كەسایەتی خۆی دەكاتەوە و بەوردی و ورياییەوە دەژی و ژیان دەگوزەرێنێت، نابێت و ناشێت لەم كارە دیاریكراو و گرنگەی چارەنووسی بێئاگابێت، ناكرێت بیر لەوەنەكاتەوە كە ڕۆژێك لەسەر خاك دەكشێت و دەمرێت و بە تەعبیری "حافیز": دلی كوزگران خواهد شد) واتە: ببێتە دڵی كۆزەكەران. مرۆڤ دەبێت بەهەرحاڵ لەجێیەكدا بشكێت، دەبێت لەجێیەكدا وێنەی خۆی بە بینی چاوەكانی "رای العین" ببینێت، جێگەیەك كە ناتوانێت بەهیچ جۆرێك زاڵبێت و سەربكەوێت. دوو شوێن و جێگە هەن مرۆڤ بیەوێت و نەیەوێت لەبەرامبەریاندا دەشكێت یان دەیشكێنن. یەكێكیان یادی خودایە و ئەویتریان یادی مەرگە. ئەم دوو دیاردەیە، دوو كاری ترسناك"مهیب" كە لەگەڵیاندا ڕووبەڕوودەبینەوە، هیچ جۆرە زاڵبوونێكی تاكەكەسی و ڕووبەڕووبوونەوەی هیچكەس لەبەرامبەریاندا بوونی نابێت، بەناوبانگترین مرۆڤبێت یان بەناوبانگترین و خوێندەوار و ڕۆشنبیر بێت، سەرۆكی وڵات، هەر سوونەتێك و پلەوپایە و پێستێك و یان توانیی و جوانی و عاقڵی و خۆش كەلامی و.. هەرشتێك كە لە بەخششەكانی دونیایە و مرۆڤەكان هەیانە كە دەگاتە ئەم شوێنە دەبێت سەردابخات و سەردانەوێنێت یان بیشكێنێت یان بشكێت، یەكەم، لەبەرامبەر "خودای گەورە"و دووەمیان لەبەرامبەر "مەرگ"، ئەم چارەنووسێكی دیاریكراوە كە بە شوێن هەموو كەسێكدا دێت. چەند باشە مرۆڤ لەبەرئەوەی لەم دونیایەدایە و لەبەردەم ئەم دیاردانەدا نەشكاوە، خۆی بیر لەم دیاردانە رابمێنێت و بیریلێبكاتەوە. ﴿موتوا قبل ان تموتوا﴾، بمرن پێش ئەوەی بمرن. مانای مردنی یەكەم شكاندنی "نەفس"ە و تێڕامانە لەبارەی سروشتی تازیەباری بوون و چارەنووسی دیاریكراوی مرۆڤ لەسەر ڕووی ئەم زەوییەدا، مردنی دووەمیش بریتییەلە ڕاكشان و داپۆشینی ڕووخساری هەریەكەمان لەناو خاكدا كە چارەنووسی دیاریكراوی هەریەكێكمانە.

یادکردنەوەی مەرگ هێما و نیشانەی گەشەی کەسایەتییە، نەڵێن کەسێك کە بیر لەم دیاردانە و دوو شتە ناکاتەوە ئیدی دەتوانێت باشتر بژی و ژیان بگوزەرێنێت، نەخێر گەورەکانمان پێیانوتوین کە زیرەکی داخوازی ئەوەیە کە مرۆڤ لەم دونیایەدا یادی مەرگ بکات، چونکە بەوجۆرەی عەرزمکردن یادی مەرگ و یادی خودای گەورە داخوازی وێنا و خودی خۆمانن ئیدی بمانەوێت یان نا، لەگەڵیاندا رووبەڕووین و بەداخوازی هەبوونی جەستە و بوونی کات و شوێن لە بەند و سنوورێکدا، بەلاّم ئەو سستی و بێئاگایە لەخۆمان ماوەیەك کە لێمانڕووددەن و باوەشمان پێدادەکەن بۆ چەند کاتژمێرێك و رۆژێك و مانگێك و ماوەیەکی دیاریکراو لە کارە گرنگانە بێئاگامانبکەن.

لە پێغەمبەر ئیسلامەوە "ص" گێڕدراوەتەوە کە فەرموویەتی: (زیرەکترین مرۆڤ ئەو کەسەیە کە زۆر لەوانیتر یاد و بیری مەرگ دەکات. هەروەها لە ریوایەتێکیتردا کە سەیرمکرد کە لە پێغەمبەرەوە گوازراوەتەوە کە لەبارەی کەسێکەوە قسەیاندەکرد و ستایشیاندەکرد و لەبارەی ئەخلاق و خوویەوە قسەیاندەکرد، کاتێك قسە و ستایش و پیاهەڵدانەکانیان تەواوبوو، پێغەمبەر فەرمووی: ئەم دۆستەی ئێوە چەند یادی مەرگ و بیری مردن دەکات، وەلاّم ئەوەبوو کە نەخێر بەوجۆرە نییە و هێندە بیریلێناکاتەوە. قسەی پێغەمبەر ئەوەبوو فەرمووی: (دەی ئەمە نیشانە و گەورەیی و مەزنی ئەم پیاوە نییە و بەلایەنیکەمەوە ئەگەر چاکەگەلی زۆر و شتانی باشیدیکەی هەبێت، ئەم گەورەیەی نییە کە یادی مەرگ ناکات.

بیرکردنەوە و یادی مەرگ و مردن لە نیشانەکانی گەشەی کەسایەتی مرۆڤە، ئێمە لە قورئانی پیرۆزدا ئایەتمان لەمڕووەوە هەیە کە لەبارەی ئەم چارەنووسە دیاریکراو و دیارەی مرۆڤەوەن کە مەرگە. پێش من یەکێك لەو ئایەتانە خوێنرایەوە کە دەفەرموێت: (کل من علیها فان، ویبقی وجه ربك ذو الجلال و الاکرام)، لەئایەتێکیتردا خودای گەورە دەفەرموێت: (کل نفس ذائقة الموت)، ئەم ئایەتانە و ئەو وانانەی پێماندەڵێت کۆمەڵێك ئامۆژگاری گرنگن بەوجۆرەی کە من تێدەگەم ئەویش ئەوەیە یەکێك لەو ئاوێنانەی مرۆڤ دەتوانێت باشتر خۆی بناسێت، بریتییەلە ئاوێنەی "مەرگ"، ئەو پەیوەندییەی تاك لەگەڵ ئەم چارەنووس و دیاردە دیاریکراوە بەرقەراردەکات، پێش هەرشتێك خۆی بە خۆی دەنوێنێت و خۆی دەبینێتەوە. ئێمە ئەگەر لەبارەی ئەم دیاردە و ئەو پەیوەندییەی لەگەڵیدا هەمانە و لە خەڵوەت و تەنهاییدا بیری لێبکەینەوە، دەتوانین لەمڕووەوە خۆمان بناسین و خودناسی بکەینەپیشە:

مرگ هــر یــك ای پسر همرنـــــــگ اوست
پیش دشمـــن، دشمن و بر دوست دوست
انـــــکـــه می ترسی ز مـــرگ انـــدر فرار
از خــــــود ترســانی ای جان هوشـــــدار
روی زشت توست، نـــه رخســـــار مـرگ
جان تـــو همچون درخـــت و مــــرگ برگ
"مەسنەوی مەعنەوی، دەفتەری سێیەم، بەیتەکانی ٣٤٤٢-٣٤٣٩"

واتە: (مەرگی هەر کەسێك ئەی کوڕم، هاوڕەنگی خۆیەتی، لەبەردەم دوژمن، دوژمن و لەبەردەم دۆستدا، دۆست، ئەوەی کە لە مەرگ دەترسی و لێیرادەکەیت، لە خۆت دەترسی ئەی گیانی هۆشیار، روو و روخساری ناشیرینی تۆیە، نەك روخساری مەرگ، گیانی تۆ هەروەك درەخت و مەرگ گەڵاکانییەتی.)

دەڵێت: هەرکەسێك بەپێی ئەو وێنەیەی لە "مەرگ" و خۆی هەیەتی و جۆری ئەو ژیانەی دەیکات و رووبەڕووبوونەوەی لەگەڵ ژیاندا دەتوانێت لەو ئاوێنەیەدا بناسێتەوە، گەر کەسێك لەگەڵ خۆیدا سازگارە، ئەگەر کەسێك خۆی خۆشدەوێت، ئەگەر کەسێك لەگەڵ خودی خۆیدا هیچ قسە و بابەتێکی نییە، مەرگیشی نییە:

مرگ هــر یــك ای پسر همرنـــــــگ اوست
پیش دشمـــن، دشمن و بر دوست دوست

کەسێك دوژمنی مەرگ، لەگەڵ خۆیشیدا دوژمنە، بەو مانایەی لە رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ خۆیدا دەترسێت، هێندە ویژدانی پاکوخاوێن نییە و مەنزڵ و زەمینە و دیمەنە جوانەکان لەبەرچاوناگرێت، هێندە ئامادەگی نییە و تایبەتمەندییەکانی دونیا دڵیان وابەستەیکردووە بە دونیاوە، ناتوانێت کەمترین کات و سا لەبارەی ئەم چارەنووسە گرنگەی خۆیەوە بیربکاتەوە:

پیش دشمـــن، دشمن و بر دوست دوست
انـــــکـــه می ترسی ز مـــرگ انـــدر فرار
از خــــــود ترســانی ای جان هوشـــــدار

تۆ وادەزانی لە مەرگ دەترسیت، بەلام گەر ووردتر و فراوانتر و ئاگایانەتر بیربکەیتەوە، لە خۆت دەترسی نەك لە مەرگ. مانای لەخۆترسان چییە، واتە جورئەت و ئازایەتی رووبەڕووبوونەوەت لەگەڵ خۆت نییە:

می گریزم تا رگم جنبـــان بود
کی فرار از خویشتن اسان بود

واتە: (رادەکەم تاکو رەگم بجوولێت، کەی راکردن لە خود ئاسانبووە).

هەڵبەتە راکردن لە خود بە مانایەك ئاسانە، بەلاّم هۆکار و سیفەت و تایبەتمەندی دونیا تاك سەرگەمدەکات، بەلاّم کاتێك ناچاردەبێ لەم رووداوانە و لەو شوێنانەدا و بەئاگایانە بیردەکاتەوە، بە رووتی و بەبێ هیچ پەردەیەك خۆی دەبینێتەوە، ئەوکاتە لەبەردەم ئاوێنەی خۆیدا باشتر خۆی دەناسێت و دەبینێت و دەزانێت، بۆچی لەبارەی ئەم دیاردەوە تێڕامانناکات و وردنابێتەوە و حەزناکات بیر لەم چیرۆك و داستانە بکاتەوە. (مرگ هـر یـك ای پسر همرنـگ اوست)، من لە بەشی دووەمی وتارەکەمدا هەوڵدەدەم بە بەڵگەهێناوەی کتێبی "ذکر الموت"ی بەرهەمی "ئیمام غەزالی" لەبارەی سێ جۆر مەرگ هەروەك ئەو پیاوە مەزنە باسیکردووە و روونیکردووەتەوە، بخەمەڕوو و پاش ئەوە دامێنی قسەی لەسەربچنم و زیاتر لەوە ماندووتاننەکەم.

"غەزالی" لە پیاوە گەورەکانی جیهانی "تەسەوف"ە. هەر بەوجۆرەی دەزانن کتێبی شانازی دونیای ئیسلام"کیمیای سەعادەت"ی بە فارسی نووسیوە و هەروەها "احیاء علوم الدین" کە بە زمانی عەرەبییە و کتێبێکی کلاسیکی شارستانییەتی ئیسلامییە. (فەقیه، موتەکەلیم، زانای ئەخلاقی مەزنی سەدەی پێنجەم).

یەکێك لەو خالاّنەی کە "غەزالی" جەختیان لەسەردەکاتەوە، بریتیبوولەوەی "زانستی ئەخلاق" لەناو ئێمەدا کەوتووە و نەماوە و ئێمە وەکو پێویست و بەوجۆرەی کە دەبێت خەریکی ئەم زانستە بین، خەریکنابین. لەبەرئەوە دەستیکرد بە نووسینی کتێبی"احیاء علوم الدین"و لەبارەی گرنگترین زانستی ئایینی کە زانستی ئەخلاق بوو نووسی و ئەخلاقی کردە دەستور و کاری خۆی. یەکێك لەو بابەتانەی کە "غەزالی" لەکتێبەکەیدا باسیکردووە بریتییەلە زاراوە و

بابەتی "مەرگ"و دەرەنجام و کاریگەری بیرکردنەوە لە مەرگ. ئەو هەوڵدەدات سێ شێوە لەبارەی رووبەڕووبوونەوە لە مەرگ و دیاردەی مەرگ دابەشکاریبکات. بەپێی ئەو دابەشکارییەی "غەزالی" باسیاندەکات، هەندێك لە مرۆڤەکان و دەستەیەی یەکەم لەبەرئەوە لەدونیادا شیرین دەژین و تایبەتمەندی و سیفەتەکانی دونیا و کات و شوێن بەجۆرێك پەیوەستیکردوون و بەستراونەتەوەن هیچجۆرە ئامادەگیان بۆ مردن نییە، ژیانی خۆشگوزەرانییان هەیە، ئەهلی بێئاگایین و بەتەواوی رەزامەندییان بۆ ژیانی ئەم جیهانە پیشانداوە و گوێچکەکانیان گرتووە و هەرجۆرە قسەیەك کە یاداوەری مەرگ و ئەو چارەنووسەی کە پێشتر باسمانکرد نابیستن و رازین بە ژیانی دونیا. بە دەستەواژەی قورئان ﴿رضوا بالحیاة الدنیا و اطمانوا بها﴾، کەسانێك رەزامەندییان بۆ دونیا و بەرامبەر دونیا پیشانداوە و بەئاسوودەیی دەژین و دڵیان ئاسوودەیە پێی. "مەولانا"ش دەڵێت:

هر چ شیرین می گوید او تلخ مرد
هرچی او تن را پرستد جان نبود

کەسێك کە شیرین دەژی، چیرۆکی مردنی جەستە بۆی تاڵ و ناسۆرە، رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ مەرگ و قسەکردن لەمەڕ ئەم دیاردەیە بۆی تاڵە. ئەمانە دەستە و گروپی یەکەمن.

گروپی دووەم: بریتییەلەو کەسانەی هەڵبەتە ئەهلی "تەوبە"و پەشیمانین، بەو مانایەی کاتێك کارە خراپەکان ئەنجامدەدەن، کەم تا زۆر پەشیمانن. حەزدەکەن ژیانی باشتریان هەبێت، بەلآم توانایی ئەو ژیانە باشەیان نییە، حەسرەتدەخۆن کاتێك هەڵە و تاوانەکان بوونیان دەهێنێتەلەرزە و دیاردەی لەمجۆرە لەژیانیاندا دەبینن، مەرگی دۆست و هاوڕێیانیان، مەرگی خۆشەویستانیان، مەرگی دایك و باوك و مومکینە ئەم رووداوانە بۆ چەند ساتێك لەگەڵ خۆیان بەرێت، بەلآم لەڕاستیدا توانای رووبەڕووبوونەوەیان لەگەڵیدا نییە، توانای رووبەڕووبوونەوەی لەگەڵ سەرکەشیەکانی خۆیان نییە، بەهەرحاڵ نیگەرانن رۆژێك لە رۆژان ئەم رۆژانە نەمێنن و هەمووی بەسەریەکدابکەون و ژیان کۆتاییپێبێت و فرسەتی قەرەبووکردنەوەی ئەوەی لەدەستیانچووە، لێیانوەربگرێتەوە، ئەمانە گروپی دووەمن. هەڵبەتە نابێت لەم قسانەوە ئەوە وەربگیرێت کە مەبەست لەوە بێت ژیان بەکەمبزانین و سووك سەیریبکەین، هەڵبەتە هەندێك لە



ئیمامی غەزالی

عاریفانمان ژیانی دونیایان بێنرخ و کەم سەیرکردووە. بۆیەش نابێت ژیان بە هەند وەرنەگیرێت و خودی "مەولانا"و "غەزالی" بەوجۆرە نەبوو و ژیانیان بەهەند وەرگرتووە و کەسێکی وەکو "غەزالی" خۆی مامۆستای "نیزامییە"ی بەغداد بووە و وانەی وتووەتەوە کە یەکێك بووە لە گەورەترین شوێنەکانی فێرکردن و خوێندەواری لە شارستانییەتی ئیسلامیدا، هەڵبەتە لەکۆتاییدا قوتابخانە و خوێندنی بەجێهێشت بەهۆی ئەو حاڵ و بارە دەروونی و رۆحییەی دەستی بەسەردا کێشابوو و بێناونیشان ژیانی بەسەردەبرد و پاش ئەوەش کە گەڕایەوە و تەنیایی هەڵبژارد، بەڵام بەهەرحاڵ ئەو زانستی بەجیدی و بەهەند وەرگرتبوو.

کۆمەڵی سێەم: ئەو کەسانەی لای "غەزالی" لەگەڵ رووبەڕووبوونەوەی مەرگ قسەی لەبارەوە کردوون، عاریفان، ئەگەر گروپی دووەم تەوبەکاران "تائبان" بووبن، گروپی سێیەم عاریفانن. عاریفان بەپێی وێنای "غەزالی" هەڵبەتە حەز و تاسەیەکی لەوجۆرەیان بۆئەم دونیایە نییە، بیانووی ئەوە دەگرن رۆژێك بێت و زووتر ئەم دونیایە تەرکبکەن و بڕۆن. هەڵبەتە ئەم بیرکردنەوەیەش بەشێوەکی زۆر و بەربلاو لەناو مرۆڤەکاندا بوونی نییە، ئەوانیتر حەزیان لە ژیانی دونیایە و پێیڕازین، بەڵام لەبەرئەوە بزانین کە مرۆڤانی لەمجۆرەش بوونیان هەیە و بۆئەوەی وێنامان بەرامبەر جۆرەکانی رووبەڕووبوونەوەی مرۆڤەکان لەگەڵ مەرگ بۆ روونببێتەوە و دەربکەوێت، دەبێت باسی ئەمجۆرە مرۆڤانەش بکەین کە عاریفانن. خودی ئیمامی "عەلی" لەبارەی ئەم جۆرە لە مرۆڤەکان دەفەرموێت: (افضل تحفة للمومینن الموت)، باشترین خەڵاتێك بۆ ئەمجۆرە ئیماندارانە، بریتییەلە مەرگ. ئەم پیاوە مەزنە هەروەها لە بارەی "نەفس" وتویەتی: (ذکر اللة بذکر الموت)، بە یادی مردن و مەرگ زەلیلیبکەن، ئەمەش بەهۆی ئەو دەرەنجام قووڵ و گەورانەی کە لەمبارەوە و بەهۆی یادی مەرگەوە بوونیان هەیە، "خشوع"و "خضوع" بۆ تاك دەهێنێت. ئەمە بۆ هەموو موسوڵمانانە، بەڵام کاتێك دەگەینەسەر باسی عاریفان، بە

دەستەواژەی "ئیمامی عەلی"و هەروەها "غەزالی"یش جیاوازی هەیە، (افضل تحفة للمومينن الموت). "مەولانا"ش دەیوت:

این جهان زندان و مـــــــا زندانیان
حفره کن زندان و خودا را وارهان

واتە: (ئەم جیهانە زیندان و ئێمەش زیندانی، چاڵ هەڵبکەنە و خۆت رزگاربکە).

ئەم جیهانە وەکو زیندانە بۆ کەسی عاریف و نزادەکات کە رۆژێك بێت کۆت و بەندەکان بشکێنێت و لە زیندان رابکات. لەمجۆرە دەربڕین و حاڵەتەدا کەسی عاریف بەدوای پێشوازی مەرگدا دەڕوات، بەو مانایەی بە بینینی چاوەکانی "رای العین" دەبینێت و زمان و کاتی خۆی و ژیانی دەبینێ. ئێوە سەیربکەن و وردببنەوە یەکێك لەو شتانەی لە ژیانی ئەم دونیا و جیهان بۆمان دەکاتە شتێکی جیدی و گرنگ ئەو پەیوەستی و پەیوەستبوونانەن کە بە دونیاوە هەمانن، هەڵبەتە لەجێگەیەکدا ئەم پەیوەستبوونانە باشن، چونکە وادەکەن بازاڕی دونیا گەرم بێت، بەڵام بۆ هەندێك کە دونیا بۆیان ساردوسڕدەبێت و دڵیان پێوەینابەسترێتەوە، ئیدی ئەم هەیاهو و پەیوەستبوون و دڵ وابەستبوونانە رەنگ و روویەکیان نامێنێت. لە بۆچوونی "غەزالی"یدا عاریفان بەمجۆرە دەڕوانن و بەمجۆرە بیردەکەنەوە و بەوجۆرەی کە "مەولانا" دەڵێت: دونیا بۆیان وەکو زیندانێك وایە، چونکی هیچ پەیوەستییەك "تعلق"یان نییە. لە بۆچوونی "غەزالی"یدا ئەمجۆرە مرۆڤانە کە جۆری سێیەمن، ئامادەی مەرگ و مردنن و ئامادەی فڕینن بەرەو ناکۆتایی و رزگاربوون، چونکە پەیوەستەگیان نییە یان کەمە. ئەو کەسەش باری سووك و پەیوەستبوونی کەمترە، سووکتر و ئامادەی رۆیشتنی زیاترە. عاریف بەمجۆرە و بەم وێنایە و لەگەڵ ئەم چەمکەدا باشتر دێتەوە و بەرەوپیرییەوە دەچێت. لەبەرئەوە بەپێی بۆچوونی "غەزالی" و کۆمەڵی جۆری سێیەم کە باسیاندەکات، "مەرگی عاریفانە" مەرگێکی لەمجۆریە و هەڵبەتە لەگەڵ سەختی و نارەحەتی کەمتری لەگەڵدایە و ئەو تاکەش کە لەم رێگوزەرەوە رێگە تەیدەکات قورسی و نارەحەتی کەمتریش تێپەڕێنێت و تەیدەکات.

ڕێگەبدەن روانین و وێنای "سوهرابی سپهەری"یش لەبارەی "مەرگ"ەوە بخەمەڕوو کە زۆر نزیکی روانین و وێنای لە "غەزالی"یەوە نزیکە، وتمان جۆری سێەم یان رووبەڕووبوونەوەی سێیەمی مرۆڤەکان یان عاریفان لەگەڵ "مەرگ"دا لای ئیمامی "غەزالی" ئەوەیە کە بەرەوپیرییەوە دەچن و پێشوازیلێدەکەن و بە پەیوەستبوونێکی کەمترەوە بەرەو ئەم چارەنووسە دیاریکراوە دەڕۆن. "سپەهەری" شاعیر و وێنەکێشی هاوچەرخیش لەبارەی "مەرگ"ەوە قسەی کەمی نەکردووە، لە یەکێك لەو گەشتانەی بۆ "یابان"و لەگەڕانەوەیدا بۆ ولآتی "ئێران" لەشوێنێکدا وەستاوە و کەمێك لەگەڵ ئەوانەی دەورووبەریدا وتووێژیکردووە بەوجۆرەی کە لە حاڵ و ژیانیدا نووسیویانە. ڕێبوارێك پێیوتبوو ئەگەر دەتەوێت مەرگی کەسێك ببینیت، مەبەستی "مەرگی ئیختیاری"یە، ئەوا چەند رۆژێك بمێنەرەوە، من شەش تا حەوت رۆژیدیکە لێرە دەڕۆم و دەمرم، ئەویش پاش ئەو ماوەیە ئەو ڕێبوارە دەبینێت، سەیردەکات لە بنی درەختێکدا دادەنیشتێت و پاش ماوەیەك دەمرێت، ئەم رووداوەی کە مەرگی پیاوێکی پێگەیشتوو و کەسێك پێشبینی یان مەرگی خۆی زانیوە و بە چاوەکانی خۆی جیابوونەوەی لق یان گەڵایەك بە درەختەوە دەبینێت. ئەم رووداوە کاریگەری زۆری لەسەر "سپهەری" داناوە. ئەو پێماندەڵێت نابێت لە "مەرگ" بترسین و نامانترسێنێت، چونکە مەرگ بەشێکی ژیانە، هەڵبەتە ئەو ئامۆژگاری ئەوەماننناکات کە وەکو "مەولانا" یان هەندێك لە عاریفانیدیکە بەرەو "مەرگ" بڕۆن و پێشوازیلێبکەین، بەلآم پێمان دەڵێت نەترسان و هاوڕا لەگەڵ پەیوەستبوونی کەمترمان هەبێت. لەبەرئەوە ئامۆژگاری ئەو ئەوەیە کە بەمجۆرە سەیری جیهان و بوون بکەین، (بهترین چیزی نگاه است که از حادثة عشق تر است.)، واتە: (باشترین شتێك ئەو روانینەیە کە لە رووداوی عیشق تەڕ و پاراوە)، کەسێکیش بەمجۆرە سەیری بوون بکات، هەڵبەتە لە چارەنووسی دیاریکراو ناترسێت، هەروەها نەشترسین لە "مەرگ"، (نترسیم از مرگ، پایانی کبوتر نیست.)، واتە: لە مەرگ نەترسین، مەرگ کۆتایی کۆتر نییە. (مرگ در اوای اندیشه نیمن دارد.)، واتە: "مەرگ" لە ئاوەدانی و ئاوایی ئەندێشەدا نیشتەجێیە. (مرگ مسئول قشنگی پر شاپرك است و گاه در سایە نشستە است و بە ماه می نگرد.)، مەرگ بەرپرسیاری جوانی و قەشەنگی پەڕی شاپەڕە، و هەندێکار لە سێبەردا دانیشتووە و سەیرماندەکات. (همه می دانیم ریەهای لذت پر ئوکسجین مرگ است.) واتە: هەموومان دەزانین سیەکانی چێژ، پڕ ئۆکسجینی مەرگن.

قسه لەبارەی چارەنووسەوەیە و ئەوەی کە بەسەر هەمواندا تێدەپەڕێت، بەڵام بەپێی ئەم بۆچوونە، مەرگ بەشێکە لە ژیان و مرۆڤ گەر پەیوەستبوونی کەمتری بێت و بە دەستەواژەی ئەو "رێبوار"و "موسافیر"ێك بێت لەم ژیان و جیهانەدا، هەڵبەتە ئەم رێگوزەرە پڕنارەحەتییە ئاسانتر تێدەپەڕێنێت و ئاسانتر بە مەنزڵی مەبەست دەگات، بۆچوون و روانینێکی لەمجۆرەیە کە هەمووامان هەمان ئەم رێگوزەرەی بڕیارە هەمووان تەیبکەین و بیبڕین، ئەم جۆرەکەسانە ئاسانتر دەتوانن تەیبکەن

"نیزامی" لەبارەی دیاردەی "مەرگ"ەوە دەیگوت:

او نیست گژشت از این گژرگاه
وان کیست که نگژرد از این راه

دانیشتن و کۆبوونەوەی لەمجۆرە سوود و کەڵکیان هەیە بەوجۆرەی بۆیدەڕوانم. یەکەم، دەبێتە دڵدانەوەی ئەوانەی خۆشەویستانیان لەدەستداوە، دووەم: ئێمە لەمجۆرە بۆنە و دانیشتنانەندا یاداوەری خۆمان دەهێنینەوە و ئەو شتەی چارەنووسی هەموومانە دەیهێنینەوە بیری خۆمان، ئەوەی لە فێرکاریی ئایینیدا ئامۆژگاری ئەوەکراوین کە "ناشتنی مردوو"دا گەنج بێت یان بەتەمەن و بەساڵاچوو، بەشداریبکەین ئەمەش بۆئەوەی مرۆڤ بیر لە حاڵ و بارودۆخی دەروونی و ناوەکی خودی خۆی بکاتەوە و ئەو پاداشت و سزایەی کە دواتر پێماندەدرێتەوە، هەروەها لە فێرکارییە ئایینییەکاندا هاتووە مرۆڤ بۆ گۆڕستانەکان بڕوات، مرۆڤ گەر دڵی تەنگبوو بۆ گۆڕستان بڕوات و گەر دڵیشی خۆشبوو جارێکیدی روو لە گۆڕستان بکات، نهێنی ئەمەش ئەوەیە کە بۆماندەربکەوێت لە هەردوو حاڵەتەکەدا مرۆڤ ئەو حاڵەتانەی نامێنن، چ ناخۆش، چ خۆشی. چ خۆشحاڵبیت یان ناشاد و ناخۆشحاڵ، ئەوا ئەم رۆژانە تێدەپەڕن و بینینی ئەو حاڵەت و رۆیشتن بۆ شوێن و جێگەی ئەبەدی بدەین و بە دەستەواژەی "دیستۆفیسکی"، ئەو درێژەپێدانە درێژەپێبدەین. هەڵبەتە لای مرۆڤ ئاسانتر دەبێت، دواجار و لەکۆتاییدا ئەوەی کە "حافیز" دەیوت:

دلی کوزەگران خواهی شد
حالیا فکر سبو کن که پر از باده کنی

بۆیە بیرکردنەوە لە مەرگ و مردن بەوجۆرەی پێشتر عەرزمکرد و لەمجۆرە دانیشتانەدا بیرماندەکەوێتەوە و لە ئایینەکان و دەقی ئایینییەکاندا گەلێك ئاماژەپێکراوە، ئەمەش نیشانە و هێمای گەشەی کەسایەتی مرۆڤە، "بیرکردنەوە لە مەرگ" یەکێکە لەو شتانەی لەگەڵ ژیاندا تێکەڵە، گەر ئێمە بوونەوەر گەلێکین کە غەمگیندەبین و شاددەبین و ئارەزووی جۆراوجۆرمان هەیە و ئەو بوونەوەرانەی بە دەستەواژەی فەیلەسوفان "بیرکەرەوەین لە مەرگ" و "لە مەرگ بە ئاگا"یین، و بیرکردنەوە و یادکردنەوەی ئەم دیاردە و چارەنووسە لە نیشان هەرە دیار و گەورەکانی ژیرییە..

لە گوێگرتنتان گەلێك سوپاسگوزرام.
والسلام علیکم و رحمە اللە و برکاتە

●●●

**تێبینی:**

ئەم بابەتە لەبنەڕەتدا وتارێکە و "دکتۆر سروش دەباغ" بە بۆنەی کۆچیدوایی کەسێك بە ناوی "عادل ئیرەوانی" لە کتێبخانەی ناوەندی "تورنتو- کەنەدا" لە (٦-١٠-٢٠١٢) پێشکەشیکردووە، بە هەندێك دەستکاری بچووکەوە وەرگێڕدراوە.

**سەرچاوە:**

سایت فەرمی دکتۆر سروش دەباغ، بەشی فایلی "دەنگەکان"، بە ناوی "مرگ پایان کبوتر نیست".

# مرۆڤ وەكو "ئەویتر"

## ئایا یارمەتی ئەو كەسە بدەین كە سواڵدەكات؟

د. سروش دەباغ

هەر بەوجۆرەی "ئیمانوئیل لویناس" جەختی لەسەر دەكاتەوە، ئەخلاق بە حیسابكردنی "ئەویتر" دەستپێدەكات، "ئەویتر" كە لە رەگەزی ئێمەیە، مرۆڤێك كە لەسەر ئەم گۆی زەویەدا دەژی لەگەڵ جۆرەها كێشە و ناخۆشی و دەرد و ئازار و رەنج و كارەساتە رۆحی و جەستەییەكان دەست و پەنجە نەرمدەكات. "ئەویتر" دەتوانێت، دایك و باوك و منداڵ و هاوسەر و برا و خوشكی "من" بێت، دۆست و دراوسێ و هاوكار و هاونیشتمانی "من" بێت، "ئەویتر" دەكرێت مرۆڤێكی هەژار و نیازمەند بێت كە لە سەرمای ئێسك سووتێنەری زستاندا لەشەقامدا دەستی نیازی بۆ من درێژكردووە و یارمەتیدەوێت، "ئەویتر" دەكرێت رێبوارێك بێت كە هەموو رۆژێك لە كۆلاٰن ببینم، مادام من "ئەویتر"م لەژێر ناونیشانی "ئەویتر"دا ئەزموون نەكردووە، خۆم بە چاكی و راستی نەناسیوە و نەچوومەتە ناو دۆڵی "ئەخلاق"ەوە. بە دەستەواژەیەكیتر لە ئامادەگی و حوزوری "ئەویتر"دا كە من بە "من" دەگۆڕێت و خۆم قووڵتر و باشتر دەناسم. هاتنەدەرەوە لە خود و والاٰبوون لەمەڕ "ئەویتر" و هەبوونی پەروای ئەویتر و بوونی هەموو جەستە بە چاو و بینینی ئەو لە پایە و بنەماكانی پێگەیشتن و گەشەی ئەخلاقی منە. ئەو كەسەی لە سنووری خۆی و خودگەریدا دەمێنێتەوە و قسەكردن لەبارەی ئەوانیترەوە تەنها قسەی سەر زمانە و پەیوەندی بوونی قوڵی لەگەڵ ئێرە و ئێستای خود و "ئەویتر" دروستنەكردووە و لە خۆی نەهاتووەتە دەرەوە، دەركی راست و دوستی لە كاری ئەخلاقی نییە. لەمڕووەوە چەمكی "رووخسار" لە فەلسەفەی "لویناس"دا گرنگی هەیە، چاوتێبڕین لە رووخساری "ئەویتر" و بینینی ئەو و حیساب بۆكردن و هەستكردن و

دەستلێدان لە کێشە و دوودڵییەکانی دەروازەیەکی تەواوی لە ژیانی ئەخلاقی "من"دا هەیە. "لویناس" هەوڵدەدات بە کارکردن و دروستکردنی چەمکی "ئەویتر"، دەرکی خۆی لە گوتەزای ئەخلاق بەدەستەوەبدات و لە روانگەی خۆیەوە، ناتەواوی ئەخلاقی "کانت"ی کە لە دەوری چەمکی "خود دۆستی و خودی" دروستبووە، لابەرێت. "ئەویتردۆستی" ئەو خاڵە گرنگە دەگرێتەوە کە بەپێچەوانەی تێگەیشتنی گشتی و ئاسایی "ئەخلاق لە "من"ەوە دەستپێناکات، بەڵکو لەگەڵ "ئەویتر" و بە والاّبوون و کرانەوە بەرامبەر بە ئەو و خەریکبوون بە ئەوەوە، دروستدەبێت و دەستپێدەکات. بنەمای کارکردنی کاردانەوە و کرداری ئەخلاقی لە پەیوەندییە مرۆییەکاندا، "ئەویتر"ە نەك "من".

بۆچی دەبێت یارمەتی ئەو مرۆڤە بدەم کە لە کۆلاّن و شەقامدا بەهۆی نەبوونییەوە سواڵدەکات و دەستی نیازی بەرەو لای من درێژدەکات؟ ئەگەر ئەو "ئەویتر"ێکە، مرۆڤێکی خاوەن پێست و گۆشت وخوێن کە لەنزیکە منەوە ژیان بەسەردەبات، ئەویترێك کە حاڵ و دۆخی ژیانی خۆیدا ئازار و رەنجدەکێشێت و ئێستا پەنای بۆ من هێناوە، ژیانی ئەخلاقی داخوازی ئەوە دەکات کە "ئەویتر" ببینم و وەلاّمی خواستە مرۆییەکانی بدەمەوە و لە سنووری توانامدا هەوڵی نەهێشتنی کێشەکەی بدەم. روونە من توانای سنووردام هەیە و ناتوانم هەموو کێشەکان ئەو نەهێڵم، بەلاّم بەو پێوەرەی لەم کارە گرنگە دەچمەپێشەوە، لە دووتوێی ئاگاداربوون لە " ئەویتر" خۆم زیاتر بەرەوپێشەوە بردووە و ژیانی ئەخلاقیم کردووەتە پیشە. لەڕاستیدا کاتێك سەرنج لە "ئەویتر" دەدەم و رووبەڕوویدەبمەوە و رووخسار بە رووخسار لەگەڵیدا دەبم، پەیوەندی "من" و "ئەو" کە دەتوانێت بەشێوەیەکی گشتی و بەتەواوی لە سنووری پەیوەندی نێوان دوو "بوونەوەر" بمێنێتەوە، بۆ پەیوەندییەکی مرۆیی رەسەنی (من - تۆ) دەگۆڕێت، ئەو پەیوەندییە (من - تۆ)یەی کە بەهێزکەری بۆنە و بابەتە ئەخلاقییەکانە: لە پەیوەندی (من - تۆ)ییدا، هەردوو لە حوزوری یەکتردان و هەر یەکەیان لەمەڕ ئەویتر و لەبەرامبەر ئەویتردا حاڵەتی کرانەوە و لەخۆتێپەڕبوون و بواردنی هەیە. بوون لەگەڵ کەسێکیتردا، بەو مانایەیەکە من و

تۆ ئیدی دوو بوونەوەری جیابوەوە و بە جێماو نەبن کە بەسوودوەرگرتن لە هێماکان، لەبیابانێکدا کە شوێنی نیشتەجێبوون نییە و شوێن و هێمایەکی بوونی نییە تیایدا کە مرۆڤی تێدابێت، لەگەڵ یەکتردا پەیوەندییان دروستکردووە. پەیوەندییەکانی (من – تۆ)یی لە باس و گفتوگۆکردنەوە و لەیەکتر خەڵەتاندن و فریودانەوە بە هاوبەشی لە سۆز و هەستەکان دەگەن. کاتێك کە تاك ئیدی بۆ من دەبێتە "تۆ"، ئەو پەیوەندییە لەناوخۆیدا دەبێتە ئامانجێك و هەروەها جگەلە عیشق و هاوبەشی شتێکیدیکە لەئارادانییە تاکو ئەو پەیوەندییە بەتەواوی بۆ بەدەستهێنانی ئەوە بێت. (سم کین، گابریل مارسل، ترجمە، مصطفی ملکیان، نشر نگاه معاصر، تهران، ص٥٦.)

ئەگەر دەرۆزەکەر بۆ من بگۆڕدرێت بە "ئەویتر"و ئەو لە حوزوری خۆمدا بدۆزمەوە و لەبەرامبەریدا کراوە و لەخۆم تێپەڕبووبم، ئەو پەیوەندییەی لەگەڵیدا هەمە، بەرەو پەیوەندی (من – تۆ) بەرزدەبێتەوە، پەیوەندییەکی لەمجۆرە ئەوە دەخوازێت کە من غمخۆری ئەو بم و هەوڵبدەم لەڕووی بەدەستهێنان و پڕکردنەوەی نیاز و پێداویستییەکانی بەو رادەیەی لەتوانامدا هەیە،کۆشش بکەم. بەدەستەواژەیەکیتر من "دەبێت" بەوجۆرە بکەم و تەرککردنی کارێکی لەمجۆرە هەڵەیە، چونکە داخواز و دادپەروەری پەیوەندی نێوان (من – تۆ)یی ئەوە دەگرێتەوە و لەڕووی ئەخلاقیشەوە نارەوایە.

باوکی "زوسیما" لە رۆمانی "برایانی کارامازۆف"دا بەو کەسەی کە هاتووەتەلای و قسە لەبارەی نیگەرانی خۆی لەمەڕ ژیانی پاش مەرگ دەکات و گۆمانی هەیە لەوەی کە ئایا پاش ئەمرۆ سبەینێیەك بوونی هەیە، ئەویش ئامۆژگاری بەوەدەکات کە ئیتر مرۆڤەکانی خۆشبوێت و بەدوای ئیماندا بگەڕێ لە جۆری دۆستی و عاشیقبوونی بێدرێغی و بێهۆ، عاشیقبوون و عیشقنواندن کە بەبێ چاوپۆشین و بێلێپرسینەوە و چاوەڕوانی دروستدەبێت و دەتوانێت لە خێزان و دراوسێ و دۆست و هاوڕێ دەستپێبکات و وردەوردە مرۆڤەکانیتریش بگرێتەوە.

ئەو عیشقنواندنەی لە پەیوەندی (من – تۆ) وە دەردەکەوێت و جیلوەدەکات هەڵبەتە بەرهەم و بەرەکەتی رۆحی و مەعنەوی زۆر دەگرێتەوە. ئەو کەسەی مرۆڤی دەرۆزەکەر وەکو "ئەویتر" دەبینێت و یارمەتیدەدات، لە بینینی ئازار و دەردەکانی، ئازار و دەردی پێدەگات و بەبەشداریکردن لە ئازار و دەردەکانی و هەوڵدان بۆ کەمکردنەوەیان، رۆح و دەروونێکی فراوانتر دەدۆزێتەوە و دەستیدەکەوێت و ئامادەی تێپەڕاندنی ئەزموونیە ئیمانی و ئەخلاقییە دڵهەژێنەر و رەسەنەکان دەبێت. دەتوانین بەمجۆرە سەیری ئەو دەرۆزەکەرە بکەین لەسەر شەقامێکدا کە لەسەر رێگەکەماندایە، بە "ئەویتر" هەژماریبکەین و لە هەستەکان و سۆزەکانیدا بەشداریبکەین و بەیارمەتیدانی لەبەرەوپێشبردن و گەشەی ئەخلاقی خۆماندا بین. چەترەکان ببەستین و (لەسەر رووی پێی تەڕی باران بەرەو بڵندی و بەرزی خۆشەویستی و موحیببەت بڕۆین)، رەنگە داوێنمان تەڕبێت).

•••

**سەرچاوە:**

سایتی فەرمی دکتۆر سروش دەباغ.

# روانینێك بۆ "نەینامە"ی (مەولانا جەلالەدینی بەڵخی) جیایی لە زیهن و زمانی مەولانا

د. سروش دەباغ

"نەینامە"، بەشی یەکەمی "مەسنەوی"و پێشەکی دەفتەری یەکەمیەتی. هەندێك لە راڤەکاران بە گواستنەوە لە "حیسامەدینی چەلەبی"و ئەوانیتر ووتویانە لەنێوان وتنی "نەینامە"و دەفتەری یەکەمی "مەسنەوی" ماوەیەك هەبووە و کرۆك و کاکڵەی "مەسنەوی" لە "نەینامە"دا دەربڕاوە و روونکراوەتەوە. جیا لە دروستی و نادروستی ئەم بانگەشەیە دەبێت ئەوە بوترێت خاڵی گرنگ لە "نەینامە"دا خراونەتەڕوو، بەلآم بەداخەوە زۆر بە خوێندنەوەی هەڵە و نادروستی دوو بەیتی سەرەتا رووبەڕووبووین، بەلآم ئەگەر بینا لەسەر ئامۆژگاری چەند بارەی "دکتۆر عەبدولکەریم سروش" دوو بەیتی سەرەتای "مەسنەوی" هاوڕا بە راستکردنەوەی ئەوان بخوێنینەوە، بابەتی بوونگەرایی (ئەگزیستنانسی – ناوەکی ) مەسنەوی پڕ رەنگتر دەبێت کە بەدرێژایی دوای جیاوازی لەگەڵ بۆچوونی فەیلەسوفانی بوونگەرا "ئەگزیستانیسالیست" جیاوازی نێوان ئەم دوو جیهانە ئاشکرادەبێت، خوێندنەوەی راستکراوە لە بەیتەکانی سەرەتای "نەینامە" بەپێی راستکردنەوەی "دکتۆر سروش" بریتییەلە:

بشنو این نی چون شکایت می کند
از جدایها حکایت می کند
کز نیستان مرا ببریده‌اند
در نفیرم مرد و زن نالیده‌اند

خوێندنەوەی دووەم کە هاوڕایە لەگەڵ "نیکلسون" بەمجۆرەیە:

بشنو ز نی چون حکایت می کند
از جداییها شکایت می کند
کز نیستان تا مرا ببریده‌اند
از نفیرم مرد و زن نالیده‌اند

١. خوێندنەوەی جیاوازی ئەمانە لەدوو بەیتی یەکەمدا.
٢. خوێندنەوەی جیاوازی "حکایت"و شکایت" لە هەر بەیتێکی سەرەتادا.
٣. خوێندنەوەی جیاوازی "از نفیرم"و "در نفیرم" لە بەیتی بڕگەی دووەمی "دوو بەیتی دووەم".

ئەگەر بەیتی سەرەتا و یەکەمی "نەینامە" بە بەراورد بخوێنینەوە دەتوانرێت بوترێت کە "نەی" لەواقعیدا خودی "مەولانا" یان بێژەر و دانەری "مەسنەوی" کە بە دەستەواژەیەك لە لێوەکانی خودا دانیشتووە و لێوی کردووەتەوە. هەموو "مەسنەوی" باس و راڤەی حاڵە خودی خۆیەتی، بەلاّم پەیوەندی"شکات" چییە؟ هەر بەوجۆرەی کە "مەسنەوی" بەمجۆرەبێت کە دەڵێت:

من نیم راوی شکایت می کنم
من ز جان جان حکایت می کنم

بۆمان دەردەکەوێت ئەو شکاتەی لەگەڵ حیکایەتەکەدا هاتووە باس و سەرنجی لەو شکاتانە نییە کە لە ژیان و کاروباری رۆژانەدا بوونیان هەیە، بەڵکو ئەو شکاتەی هاتووە لەگەڵ وشەی حیکایەتی بەیتەکە، حیکایەتێکی بوونگەرا "ئەگزیستانیستە" کە باس و سەرنجی لە کەس و گوتەزای تایبەت نییە، بەڵکو باس و سەرنجی لە خوددبوونە لەم جیهانەدا، هەر بەوجۆرەی دەبینین لەو بەیتانەی باسکران. "شکات"و "حیکایەت"و "ریوایەت" لەگەڵ یەکدا

هاتوون. ئەو شکاتەی لەگەڵ ریوایەتەکەدا هاتووە، باس لە حاڵ و دۆخێکی بوونەوەرێکی بەربلاو و فڕێدراوە کە لەم ژیانەدا ژیانێکی کردووە و گلەییەکی تایبەت کە تیایدا ژیری بەڕاستی مات و مەلوول بێت، نییە، بەڵکو گلەیی لە دوورکەوتنەوەیە، شکاتێکە کە هاوڕایە لەگەڵ ریوایەتدا و تەواوی "مەسنەوی" راڤەی ئەمەیە. "نەفیر" لە بەیتی دووەمدا بە مانای هاواری بەرزە. مەبەستی "مەولانا" لەم بەتەدا ئەوەیە کە لەوکاتەی لە قامیشەلاْن "نەیستان" یان ئەو سەرزەمینە "مالوف" – بە لایەنیکەمەوە لەو وێنا و روانینەی ئەودا– جیابووەتەوە، دوورکەوتنەوە و دووری بەجۆرێك توندبووە کە دەڵێی هەموو ژنان و پیاوان لەو رووداوەدا ناڵە و زارییان بووە، لەکاتێکدا کە هاوڕا لەگەڵ خوێندنەوەی دووەم، واتە (از نفیرم نالیدەاند)، بەیتەکە مانایدیکەی دەبێت، هەر بەوجۆرەی دەڵێی تاکەکان لەتەنیاییدا تاکسیفەت و چەمکی "بەخود سپاردن" ئەزموونەکات، ئەگەرچی لە "مەسنەوی"یشدا لە زۆر شتدا لەگەڵ دەغدەغە بوونگەراییەکان رووبەڕوودەبینەوە، بەلاْم جیاوازی دیاری دوو جیهانبینی دەبێت هەر لەسەرەتای وتنی "مەسنەوی" جێگەی سەرنجبێت. بەجۆرێك دەتوانرێت بوترێت عاریفێکی ناخبین "باطن بین" وەکو "مەولانا" هەرگیز دەرکێکی لەمجۆرەی نەبووە. لەلای کەسێك هەست بە جیابوونەوە و دوورکەوتنەوە دەکات، هەم رێڕەو و رێگوزەر روونە و هەم مەبەست و ئامانج و هەمیش ژیان بۆئەو کەسە مانای هەیە. حاڵ و دۆخی کەسێکی لەمجۆرە لەگەڵ کەسێك کە هەست بەفڕێدان دەکات لەم جیهانەدا، گەلێك جیاوازە. لە حاڵ و دۆخی ئەودا باس لە جیایی و فیراقە، نە ساردی و خەمۆکی، هەرلەبەرئەوەش کاتێك کە دەڵێت:

سینه خواهم شرحه از فراق
تا بگویم شرح درد اشتیاق

واتە:

گوتەزای "اشتیاق" راڤەدەکات و حەزدەکات کە لە فیراق و جیابوونەوە خاڵیببێتەوە و بەگەیشتن و ویساڵ بگات. دەرککردنی ئەمکارە بۆ کەسێك کە رۆمانی "هێڵنج"ی "سارتەر" یان "بێگانە"و "کەوتن"ی "ئەلبێر کامۆ"و هەروەها "هابیل"ی "ئۆنامۆنۆ"ی خوێندبێتەوە، ئاسانترە. دۆخی ئەو کەسەی کە ئەزموونی تەنیایی دەکات گەلێك نزیك و هاوشێوەی کەسایەتی "قەدیس مانۆئیل"ە لە چیرۆکی "قەدیس مانۆئیل" کە دەرکی لەجیایی و جیابوونەوە نییە،

بەلاَم لەهەمانکاتدا ناتوانێت لەگەڵ تەنیاییدا بێتەوەکەنار. کەسایەتی "لوس" لە رۆمانی "دژان باروا"شدا نموونەی کەسێکە کە تەنیایی و بەخۆسپاردن ئەزموونەدەکات و هەستی خاڵیبوون و پوچیبوون و بێماناییبوون "وجود"ی دەگرێتەوە.

بەهەرحاڵ جیا لەوەی بۆچوون و داوەریکردنمان لەبارەی چەمکی جیایی و فیراق چی بێت، دەبێت بزانین ئەم دوو چەمکە لەگەڵ یەکتردا جیاوازن. چەمکی "فیراق" لە مامەڵەکردن لەگەڵ چەمکی "ویساڵ"دا مانای دەبێت و بەمانای هەستکردن بەو داخرانەیە کە بەدرێژایی رێگە بۆ عاریفان دێتەپێشەوە و دەڵێی کارێك روویلێوەرگێڕاون. ئەم حاڵە لەگەڵ حاڵ و دۆخی کەسێکدا کە هەست بەپەرتبوون و وازلێهێنان و بەخۆسپاردن دەکات، جیاوازییەکی زۆری هەیە و لەم حاڵەتەدا دەڵێی کەسێك نییە بەلایەنی کەمەوە هەرەشە لە تاك بکات و قسەی پێبڵێت، بۆ نموونە: ئەم بەیتە بەناوبانگەی "مەولەوی" لە داستانی "توتی و بازرگان"دا لەبەرچاوبگرن.

گر فراق بنده از بند بندگی است
چو تو با بد، بد کنی پس فرق چیست؟
عاشقم بر قهر و بر لگفش به جد
بوالعجب من عاشق این هر دو چد

واتە:

وادەردەکەوێت کە پیاو هەم عاشیقی قەهر مەعشوق و هەم ئاگری ئەوە و بەشێوەیەکی گشتی هەست بەوەدەکات کە کەسێك هەیە لەگەڵیدا قسەبکات یان لەگەڵیدا رووبەڕووببێتەوە. ئەم بەیتانەش لە دیوانی "شەمس"دا دەڵێی ئەزموونی فیراق و ویساڵ پێکەوە وێنادەکات:

یك لحظة داغم می کشی، یك دم به باغم می کشی
پیش چراغم می کشی تا وا شود چشمن من
هفت اسمان را بر درم و ز هفت دریا بگذرم
چون دلبرانه بنگری در جان سرگردان من

"نزیکی"و "دووری"و "فیراق"و "ویسال" پێکەوە ئەزموونکردنیان لە چەمکە بونیادیەکانی عیرفانی ئیسلامی و بەلایەنیکەمەوە لە عیرفانی خۆراسانی دەژمێردرێن. جیایی، مەرجی یەکەمی گوزەرکردنی رێگەی سلوکە کە بەهۆیەوە تاك هەست بەداخران "قبض"دەکات، بەلاّم ئەو کەسەی هەست بەتەنیایی دەکات، دووچاری ئەم حاڵەتە نابێت. لە بەشەکانی دواتردا لەبارەی ئەم بابەتەوە کە لە سلوکی مۆدێرندا تاك پڕبوون و خاڵیبوونەوەی جیهان دەبینێت، بەلاّم کەسێك دووچاری حاڵ و بارودۆخی تەنیایی بوویێت، تەنانەت تووشی ئەمەش نابێت.

ئەوەی کە "سپهەری" دەیگوت: (دچار یعنی عاشق، و فکر کن کە چە تنهاست اگر ماهی کوچك دچار ابی دریای بیکران باشد..)، واتە: (دووچار، واتە عاشیق، بیربکەرەوە کە چ تەنیایە ئەگەر ماسییەکی بچووك دووچاری ئاوی دەریای بێسنوور بێت..) ئەمجۆرە تووشبوونە لەگەڵ ئاوی بێسنوردا، یان چوونەناو دۆڵێکی ناکۆتا و کەوتن لەم دۆڵەدا، پاشان لە زمانی عاریفێکی وەکو "مەولانا" کە "ویسال"و فیراق"ی پێکەوە ئەزموونکردووە، هەم لەڕووی تیۆری و هەم لەڕووی کردارییەوە لە پایە و بنەماکانی عیرفانی ئیسلامین. بەو مانایەی تاك لە بواری تیۆری بەجۆرە سەیری جیهان دەکات و هەم کرداری خۆی بەپێی ئەوە رێکدەخات. دەبێت سەرنج لەوەبدرێت کە لە سوننەتی عیرفانیدا دەبێت لەڕووی چەمك و لۆژیکەوە دوو بوار و مەیدانی عیرفانی کردای و عیرفانی تیۆری لەیەکتری جیابکەینەوە. هەرچەندە لە پلەی کرداردا ئەم دووانە لەگەڵ یەکترا هاوتایی و هاوبەشیان هەیە. عیرفانی تیۆری ئانۆژە تیۆرییەکات لەخۆدەگرێت کە عاریفان لەژێر ئەوان و لەپشت ئەمانەوە سەیری جیهان دەکەن و لێیورددەبنەوە کە دەرکیاندەگرێتەوە لەمەڕ بوون، مرۆڤ، ئەخلاق و ئەو کاروبارانە دەگرێتەوە کە جیهانبینییان پێکدەهێنێت، بەلاّم عیرفانی کرداری، سلوك، تێکۆشانی نەفس و دەروون، ئەنجامدانی پیشەی پاککردنەوەی نەفس و دەروون و بڕینی رێگەیە. لە مەنزوومەی عاریفاندا داستانی جیایی هەم لەڕووی تیۆرییەوە گرنگی هەیە و هەم لەڕووی کرداریشەوە. بەو مانایەی تاك دەبێت لەڕووی تیۆریەوە باوەڕی بەجیابوونەوە و دووربوون هەبێت تاکو لەناو بازنە و دۆڵی کرداری رێگە ببڕێت. لەمڕووەوەیە دەبینین عاریفان لە نووسینەکانیاندا گەلێك قسەیان لەبارەی داخران "قبض"و کرانەوە"بسط"کانی خۆیانەوە گوتووە. بۆ نموونە دەتوانرێت ئاماژە بۆ ئەم غەزەلە بەناوبانگەی دیوانی"شەمس" بکرێت:

بی همگان به سر شود، بی تو بسر نمی شود
داغ تو دارد این دلم جای دگر نمی شود
گاه سوی وفا روی گاه سوی جفا روی
ان منی کجا روی؟ بی تو بسر نمی شود
بی تو نه زندگی خوشم بی تو مردگی خوشم
سر زغم تو چون کشم بی تو به سر نمی شود
خواب مرا ببستەای نقش مرا ببستەای
و از همه گستەای بی تو به سر نمی شود

ئەم شێواز و جۆر و تێپەڕاندنی ئەمجۆرە ئەزموونە جیاوازانە، بەهێزکەری نیگا و روانینی عاریفانە و میتافیزیکی عیرفانی جێگەی مەبەستی عاریفانە. بەهەرحاڵ دەبێت سەرنج لە جێگە و پلەی بەرزی فیراق لە مەنزوومەی عاریفاندا بدرێت، هەر بەوجۆرەی "مەولانا" دەیگوت:

تو اگر یار نداری چـــرا گلب نکنی؟
وگر به یار رسیدی چرا گرب نکنی؟

واتە:

تۆ ئەگەر یارت نییە، بۆچی داوات نەکرد؟
وە گەر بە یار گەیشتی، بۆچی خۆشیت دەرنەبڕی؟

چیرۆکی داواکردن و داخوازی "طلب"و خۆشی "طرب"و فیراق و ویساڵ و جەفا و وەفا و دوالیزمەکانی لەمجۆرە، لە فێرکارییە بوونناسیەکانی عاریفانە کە هەمان چیرۆکی بڕین و دوورکەوتنەوەیە لە قامیشەڵانی مانا کە بەتەواو بینا و گونجاوە لەگەڵ میتافیزیکی ئەفلاتۆنی کە هاوڕایە لەگەڵ ئەو مەیدان و بوارەی بووندا کە ئەم جیهانەی تێیداین لەناودەچێت و روەو تەواوبوون و لەناوچوونە و سێبەری ئەویترە و دەبێ لەکۆتاییدا بۆیبگەڕێینەوە. هەمان ئەوەی کە "حافیز" دەیوت: (روم به روضة رضوان که مرغ ان چمنم)... واتە: (دەڕۆم بۆئەو باخی رەزوانە کە باڵندەی ئەو لالەزار و چەمەنەین.)

به هەرحاڵ مەبەست ئەوەیە دەبێت دەستەواژەی "فیراق" بە هەند وەربگرین و چیرۆکی شکات و ریوایەت و پەیوەندی لەگەڵ فیراق و ویساڵ باشتێبگەین، تاکو بتوانرێت ئەوە دەربکەوێت کتێبێکی وەکو "مەسنەوی" کە بە چەند بەیتێکی وەکو ئەمانە دەستیپێکردووە، چ مانایەك لەخۆدەگرێت؟ لە سەرووی ئەمەشەوە دەبێت ئەم خاڵە لەبەرچاوبگیرێت کە مەبەست لەم باسە روونکردنەوەی جیاوازی فیراق لەگەڵ تەنیاییدا، بە گوتەی (تعرف الاشیاء باضدادها) بوو و گەرنا بە سەرنجدان لە فرەیی و زۆری لە جیهان و جۆرەکانی روانینەکان بۆ بوون، قسە لەبارەی مەبەستی راستی و دروستی ئەم روانینە یان ئەو روانینە نەبوو، چونکە ئەم بابەتە خۆی باسێکی سەربەخۆیە.

لەکۆتاییدا غەزەلێك لە غەزەلە تاڕادەیەك بەناوبانگەکانی دیوانی "شەمس" دەهێنین کە پەیوەندی بە باسەکەوە هەیە:

پرده برداری حیات جان و جان افزای من
غمگسار و همنشین و مونس شب های من
ای شنیده وقت و بی وقت از وجودم نالەها
ای فکنده اتشی در جمله اجزای من
در صدای کوه افتد بانگ من چون بشنوی

•••

**سەرچاوە:**

سایتی فەرمی دکتۆر سروش دەباغ.

– ئەم بابەتە لە گۆڤاری "سیاووشان" ژمارە (١٣)ی بەهاری ساڵی (١٣٩٠)دا بڵاوبووەتەوە.

# پەرۆشبوون بۆ ئەوانیتر

د. سروش دەباغ

"ئەرستۆ" دەیوت: (مرۆڤ، ئاژەڵێكی گۆیایە)، مرۆڤبوون و ئاژەڵبوون چەند تایبەتمەندییەكی هاوبەش لەخۆ دەگرێت: خواردن و خواردنەوە، خەوتن، توڕەبوون و.. هتد، بەڵام هەر بەوجۆرەی "ئەرستۆ" دەیوت، جیاكاری و شتی جیاوازی مرۆڤ و تایبەتمەندی مرۆڤ، قسەكردن و بەهرەمەندبوونە لە هێزی قسە و ئاخاوتن. مرۆڤ بوونەوەرێكی خاوەن زمانە، بەو مانایەی لەڕێگەی ئەم ئامرازەوە بۆنە و پەیوەندییەكانی لەگەڵ هاورەگەزەكانی خۆیدا جێبەجێدەكات و بوونەوەرانیتر ئەم تایبەتمەندی و ئامرازەیان نییە و ناتوانن ئەمكارە ئەنجامبدەن. ئەگەر ئەندێشەی بەهێز و بەشی گرنگی ئەندێشە مرۆڤبوونی مرۆڤە، خاوەنبوونی زمان و هەبوونی زمان رێڕەوێكە بۆ دەرخستن و دەركەوتنی ئەندێشە، با لە فەیلەسوفێكی وەكو "ڤیتگنشتاین" تێپەڕین كە لە كتێبی "ریسالەی لۆژیكی - فەلسەفی" خۆی ئاشكرا ئەندێشە بە زمان دەگۆڕێت و جەخت لەسەر ئەوە دەكاتەوە ئەو ئەندێشەیەی تێتەسەر زمان و وێنەی زمانی پەیدانەكات، لەبنەڕەتدا ئەندێشە نییە و پەیوەست و تێڕامانی فەلسەفی نییە و نابێت.

لە لایەكیدیكەوە "كانت" جەختی لەسەرئەوە دەكردەوە مرۆڤ ئاژەڵێكی ئەخلاقییە. بەپێی بۆچوونی ئەو ئەوەی بەهێزكەر و هێزی مرۆڤبوونی مرۆڤە، ئەخلاقیبوون و ژیانی ئەخلاقییانەیە. هەموومان كەم تا زۆر دەركێكمان لە ئەخلاق هەیە. شهودە دابونەریتیەكانمان فتوادەدەن كە ئاژەڵەكان ئەخلاقییانە ژیان ناكەن. بۆ نموونە ناتوانرێت بوترێت (گورگ بوونەوەرێكی ئەخلاقییە)و یان (مەڕ بوونەوەرێكی نائەخلاقییە) لە كاتی باسكردن لەبارەی ئاژەڵەكان و شیكردنەوەی رەفتار و كردارییان حەزدەكەین سوود لە چەمك گەلی وەكو، غەریزە، سروشت، كاردانەوەی بەرگری و.. هتد، وەربگرین، تاكو بیانخەینەژێر گوتەزای وەكو "دەبێت"و "نابێت" یان "چاكبوون"و "خراپبوون". دیمەنی فیلمێكی بەڵگەنامەیی بهێننە

پێشچاوتان کە تیایدا شێرێك دەیەوێت ئاسکێك راوبکات و بەشوێنیەوەیەتی و لەکۆتاییدا دەیخاتەژێر چنگیەوە و دەیخاتە بەردەستی خۆی. ئایا دەتوانرێت بوترێت شێر بە کوشتنی ئاسك لەڕووی ئەخلاقییەوە کارێکی خراپیکردوو؟ بەپێی رووکەش و روانینی سەرپێیانە دەرکی ئێمە لەڕووی دابونەریتەوە پێماندەڵێت، نەخێر. لەهەمانکاتدا دیمەنی فیلمی "فهرست شیندلر" لەبەرچاوبگرن کە تیایدا ئەفسەرێکی نازی لە باڵەکۆنی شوێنی نیشتەجێبوونییەوە بە دەمانچەکەی خۆی نیشانەی لە منداڵێکی سەرشەقام گرتووە کە تێدەپەڕێت و بە تەقاندنی فیشەکێك دەیکوژێت. لێرەدا دەرکی عورفی و نەریتیمان لە ئەخلاق پێماندەڵێت، ئەو ئەفسەرە نازییە کەوتووەتە هەڵەوە و هەڵەیکردووە و شایەنی سەرکۆنە و سزایە. کەواتە جۆرێك پەیوەندی لەنێوان مرۆڤەکاندا بوونی هەیە کە لەنێوان بوونەوەرەکانیتردا بوونی نییە، لەسەرووی ئەمەشەوە بەشێوەیەکی رووکەشی و دەرەکی هەموو جۆرە بۆنە و کردار و دیاردەکانی نێوان مرۆڤەکانیش ناچێتەناو چەتری ئەخلاقەوە. بۆ نموونە: من پاش ماندووبوونێکی زۆری جەستەیی پشوودەدەم، لە دەرەوەی حەوزەی ئەخلاقەوەیە. لەسەرووی ئەوەشەوە ئەوەی کە لە دەمەوعەسرێکی بەهاریدا کورسییەکەم لەناو حەوشەی ماڵەکەمدا دادەنێم و لەسەری دادەنیشم و دەستەکەم بە خوێندنەوە، ئەم کردارەم ناچێتەناو بڕیار و داوەری ئەخلاقییەوە، بەلاّم ئەگەر کورسییەکەم بخەمەناو خانووی دراوسێکەم و دەستبکەم بە خوێندنەوەی کتێب، ئەوە بابەتێکی پەیوەندیدار و پەیوەندی ئەخلاقی دروستدەبێت. دەڵێی بە دەستەواژەی "لویناس" ئەخلاق سەرەتا و پێش هەموو شتێك و بەتایبەت پەیوەست و پەیوەندیدارە بە "ئەویتر"ەوە، پەرۆشبوون و هەبوونی پەروای ئەوانیتر و هەروەها بە شوێن رێکخستنی بۆنەکان و پەیوەندی لەگەڵیاندا دەرکەوتن و هەبوونی بەهێزکەر و بەشێك سلوکی ئەخلاقییە. بۆیە بەپێچەوانەی ئەو کاروبارانەی کە بەتەواوی لە سروشتی مرۆڤەوە دەردەکەون و دێنەدەرەوە، (وەکو خواردنەوە و پشوودان و.. هتد)و دەتوانرێت ئەمانە بە شتی هاوبەشی نێوان ئاژەڵ و مرۆڤ دابنرێن، ژیانی ئەخلاقی سنووردارکردنی خود و کۆتوبەنددانان لەسەر خود دەگرێتەوە. ئەخلاق، لەڕێنوێنی و "دەبێت"و "نەبێت"ەکان پێکدێت: (دەبێت ئەمکارە ئەنجامبدەیت)، (نابێت ئەمکارە ئەنجامبدەیت)، لەڕاستیدا بەپێچەوانەی گوزارە جۆراوجۆرەکانی لقە جیاوازەکانی زانستە ئەزموونییەکانەوە (بەتایبەت زانستە ئەزموونییە

نامرۆییەکان، وەکو ژینگەناسی، کیمیا، فیزیا.. هتد،و زانستە مرۆییەکانی وەکو، کۆمەڵناسی، دەروونناسی.. هتد) کە گوزارەی وەسفین و بەشێوەیەکی گشتی پەیوەندییان بە جیهانی دەرەوە هەیە و قسە لەبارەی چۆنییەتی دیاریکردنی کاروبارەکان و پۆل و لقی بۆنەکان و پەیوەندی نێوانیان، گوزارە ئەخلاقییەکان رێنوێنیکارن و دەبێت سەنتەر لەئەخلاقدا لەجیاتی ئەوەی قسە لەبارەی چۆنیەتی کاروبارەکان و بۆنەکان لە جیهانی دەرەکیدا بکەن، جەخت لەسەر ئەم گرنگییە دەکەنەوە کە دەبێت بۆنە و پەیوەندی نێوان مرۆڤەکان چۆن بێت. بۆ نموونە: لە فیزیای "نیوتن"یدا دەوترێت گۆشەکانی رووناکی لەگەڵ گۆشەکانی دانەوەی رووناکی یەکسانن. ئەگەر رووناکی بە گۆشەی (٢٣) پلە بکەوێتەسەر ئاوێنەیەکی تەخت، ئەم رووناکییە بە پلەی (٢٣) دەدرێتەوە و پەرچدەبێتەوە. لە دەروونناسی "فرۆید"یشدا باوەڕوایە ئەو نەخۆشەی تووشی نەخۆشییەکی دەروونی بووە بە یارمەتی گفتوگۆیەکی رێکوپێك لەگەڵ نەخۆشدا، ریشەی زیان و نەخۆشییە دەروونییەکە دەردەکەوێت و دیاریدەکرێت و پاشان دەرمانی بۆ بەکاردەهێنرێت. بە گریمانەی راستی و دروستی ئەو تیۆریایانەی باسکران پەردە لەسەر پەیوەندی و ئەو رێسا و یاسایانەی فەرمانڕەوان بەسەر سروشت و دەروونی مرۆڤەکاندا لادەبرێن.

لە لایەکیدیکەوە کاتێك دەوترێت: (وەفا بە بەڵێنەوە ئەرك و وەزیفەیە)، (نابێت ئازاری مرۆڤی بێتاوان بدرێت)و.. هتد، پێش هەرشتێك مەبەست و سەرنجە لە شیاوە و نەشیاوی ئەنجامدان یان ئەنجامنەدانی کردارێك بەهۆی بکەری ئەخلاقییەوە.

لەبەرئەوە ئەوەی باسکرا، دەتوانرێت بەجۆرە بوترێت کە لە بۆنە و پەیوەندییە مرۆییەکان راکردن و هەڵهاتن لە بکەری ئەخلاقی و کاری ئەخلاقی و بڕیاری ئەخلاقی بوونیان نییە. ئەخلاق بەشێکی دانەبڕاوی ژیانی مرۆیی ئێمەیە لەم جیهانەدا.

●●●

**سەرچاوە:**

سایتی فەرمی دکتۆر سروش دەباغ. بەشی وتارەکان.

# ناساندنی کتێب و بەرهەمەکانی دکتۆر سروش دەباغ

هەڵکەوت هەورامی




**١. ئایین لە ئاوێنەدا**

- ناوی کتێب: ئایین لە ئاوێنەدا (آئین در آئینه)، (لەبارەی بیروڕا ئایینناسییەکانی عەبدولەکریم سروش).
- شوێنی چاپ: تاران، دەزگای صراط.
- نۆبەت و ساڵی چاپ: چاپی سێیەم، ١٣٨٧.
- قەبارە: (٧٢٠) لاپەڕەی قەبارە گەورە.

ئەم کتێبە گەورەترین کتێبی "د. سروش"و نزیکەی (٧٠٠) لاپەڕەی قەبارە گەورەیە و تیایدا لەسەر (٧) تەوەرەی سەرەکی گرنگترین و بەرچاوترین تێز و بابەتە تیۆریاکانی "دکتۆر عەبدولکەریم سروش"ی باسکردووە و خستونیەتەڕوو، دەشێ بڵێین بۆ ناسینی "عەبدولکەریم سروش" گەلێك پێویستە خوێنەر بگەڕێتەوەسەر ئەم کتێبە، چونکە نەخشەی هزری و جوگرافیای فیکر و نووسینی "عەبدولکەریم سروش"ی باوك هێناوە. شایەنی باسە ئەم کتێبە یەکەمین کتێبی "د. سروش"ە.




**٢. سکوت و مانا**

- ناوی کتێب: سکوت و مانا (سکوت و معنا)، چەند لێکۆڵینەوەیەك لە فەلسەفەی ڤیتگنشتاین.
- شوێنی چاپ: تاران، دەزگای صراط.
- نۆبەت و ساڵی چاپ: چاپی دووەم. ١٣٨٧.
- قەبارە: (٢٥٢) قەبارە مام ناوەند.

ئەم کتێبە یەکێکە لە کتێبە باشەکان کە لەبارەی چەمکی "مانا"و "سکوت" لای فەیلەسوفی ناوداری نەمسایی "لودڤیك ڤیتگنشتاین" نووسراوە، ئەمەش لەبەرئەوەی نامەی دکتۆرای نووسەر لەمەڕ ئەم فەیلەسوفەیە و زۆر هاودڵە لەگەڵیدا و هەروەها یەکێك لە نوێترین کتێبەکانی کە هێشتا بلاۆنەبووەتەوە راڤە و لێکدانەوە و وەرگێڕانی بەرهەمە بەناوبانگەکەی ئەم فەیلەسەفەیە بەناوی (ریسالەی "لۆژیکی - فەلسەفی")، هەربۆیە گەلێك خاڵی وردی لە کتێبەدا وروژاندووە و کتێبێکی تەواو ئەکادیمییە و بۆ ئاستی فێرخوازانی زانکۆ نووسراوە.

### ٣. ئەمری ئەخلاقی، ئەمری بالآ

- ناوی کتێب: ئەمری ئەخلاقی، ئەمری بالآ، (امر اخلاقی، امر متعالی)، (چەند لێکۆڵینەوەیەکی فەلسەفی).
- شوێنی چاپ: تاران، دەزگای پارسە.
- نۆبەت و ساڵی چاپ: چاپی یەکەم، ١٣٨٨.
- قەبارە: (٢٩٠) قەبارە مام ناوەند.

"سروش دەباغ" تاکو ئێستا (٤) کتێبی لەبارەی "ئەخلاق و فەلسەفەی ئەخلاق"ەوە نووسیوە و ئەم کتێبەش یەکێکە لەوانە، بەلآم جیاوازی ئەم کتێبەیان لەگەڵ (٣) کتێبەکەیتردا دەشێ بڵێین بریتییەلەوەی کە "ئەکادیمی بوون"و "زانستیبوون" لە سیما دیار و تایبەتییەکانی ئەم کتێبەیانە، هەربۆیە پێویست بە خوێندنەوەی قووڵ دەکات و فەلسەفیترین بابەت و لقی فەلسەفەی ئەخلاقی هەڵبژاردووە و قسەی لەبارەوە کردووە، ئەویش بریتییەلە "بان ئەخلاق" یان "میتا ئەخلاق".




لەم کتێبەدا گەڕانەوەی تێدایە بۆ کارەکانی "ڤیتگنشتاین" لەمەڕ ئەخلاق و ئەمری بالآ "امر متعالی" و ناونیشانی کتێبەکەش لەم چەمکە سەرەکییانەوە سەرچاوەیگرتووە.

**٤. گشت و تایبەت لە ئەخلاقدا**




- ناوی کتێب: گشت و تایبەت لە ئەخلاقدا، (عام و خاص در اخلاق).
- شوێنی چاپ: تاران، دەزگای هرمس.
- نۆبەت و ساڵی چاپ: چاپی یەکەم. ١٣٨٨.
- قەبارە: (١٧١) قەبارە مام ناوەند.

ئەم کتێبەش بە زمانێکی تارادەیەك قورس نووسراوە و وتارەکانی چەند بابەتێکی ئەخلاقی و کێشەی فەلسەفی ئەخلاقی دەخاتەڕوو و بەپشتبەستن بە سەرچاوەی کتێب و نووسراوەکانی سەردەمی لە فەلسەفەی ئەخلاقدا و هەروەها بۆچوونی فەیلەسوفان نووسراوە.

**٥. چەند دەرس گوتارێك لە فەلسەفەی ئەخلاق**

- ناوی کتێب: چەند دەرس گوتارێك لە فەلسەفەی ئەخلاق، (درسگفتارهایی در فلسفه اخلاق).
- شوێنی چاپ: تاران، دەزگای صراط.
- نۆبەت و ساڵی چاپ: چاپی یەکەم. ١٣٨٨.
- قەبارە: (٢٥٧) قەبارە مام ناوەند.

دەکرێت بڵێین جیاوازی سەرەکی ئەم کتێبە لەگەڵ دوو کتێبەکەیدیکەی لەمەڕ "ئەخلاق"، سادەیی زمان و وروژاندنی کۆمەڵێك بابەت و لقی فەلسەفەی ئەخلاقە کە لەوانیتردا بوونی نییە، بەو مانایەی خوێنەری ئاسایی "سروش" بە ئاسانی لەم کتێبە تێدەگات و لە لایەکیترەوە زیاتر جەختکردنەوەیە لە ئەخلاقی کرداری و ئەخلاقی ڕێنوێنیکار "هەنجاری" و پێوانی چەند چەمك و بابەتیدیکە بە ئەخلاق و دانانیان لە تای تەرازووی ئەخلاقدا و پاشان بڕیاردان لەسەر ئەخلاقیبوون یان نائەخلاقیبوونی هەندێك کایە و بابەت.




هەربۆیە ئەم کتێبە سەرچاوەیەکی باشە بۆئەو کەسانەی دەچنە ناو فەلسەفەی ئەخلاق و لەم کایە مەزنەدا کاردەکەن و لێرەوە خوێنەر تێڕوانینی نووسەری بۆ دەردەکەوێت کە دەیەوێت خوێندنەوەی ئەخلاقی بۆ شتەکان بکات، دواجار کۆمەڵێ: قوتابخانە و تیۆریای فەلسەفی نوێ گرنگی هێناوە و روانینی فەیلەسوفانی ئەخلاق و تیۆریاکانیانی خستووەتەڕوو.

**٦. لە بارەی رۆشنبیری ئایینی و ئەخلاق**

- ناوی کتێب: لە بارەی رۆشنبیری ئایینی و ئەخلاق، (درباب روشنفکری دینی و اخلاق).
- شوێنی چاپ: تاران. دەزگای صراط.
- نۆبەت و ساڵی چاپ: چاپی یەکەم، ١٣٨٩.
- قەبارە: (٣٤٢) قەبارە مام ناوەند.

لەئێستادا "دکتۆر سروش دەباغ" بە یەکێك لە رۆشنبیرە ئایینییە دیارەکانی ئێران دادەنرێت لە نەوەی نوێدا، رۆشنبیرێك جیا لە هەندێك بیرمەند و رۆشنبیریدیکە کە باوەڕیان بە کۆکردنەوەی "رۆشنبیری"و "ئایین" پێکەوەنییە، نموونەی ئەوانەش مەعنەوییەتگەرای ناودار "موستەفا مەلەکیان"، بەلاّم "دکتۆر سروش" لەم کتێبەدا دەیەوێت پێمانبلێت دەکرێت مرۆڤ "رۆشنبیر"و "ئاییندار"یش بێت و ئەمەش دەکاتە ئەوەی کە ئەو رۆشنبیرییە بە روانینی ئایینی و ئایینییانە سەیری شتەکان دەکات و تەنانەت هەرچەندە دووکایەی جیاوازیش بن، بەلاّم کۆدەکرێنەوە و پێکەوەهەڵدەکەن و شوناسێکی نوێ دەبەخشن کە ئەویش "رۆشنبیری ئایینی"یە. بەشێکیدیکەی کتێبەکە تەرخانە بۆ نیگای ئەخلاقییانە بۆ کۆمەڵێك بابەت و هەڵسەنگاندنی

ئەخلاقییانەیان بۆ دەكات و رۆڵی ئەخلاق باسدەكات تیایاندا. لێرەشەوە توانیویەتی كۆمەڵێك كاری جوان ئەنجامبدات و پانتیایی ئەم چەمكە فراوانتربكات و لایەنە تاریك و لێڵەكانی روونبكاتەوە و خزمەتێك بە رۆشنبیران و چەمكی ئەخلاقیش بكات.




### ٧. زمان و وێنەی جیهان

- ناوی كتێب: زمان و وێنەی جیهان، (زبان و تصوير جهان)، "چەند وتارێك لە فەلسەفەی ڤیتگنشتاین".
- شوێنی چاپ: تاران. دەزگای نەی.
- نۆبەت و ساڵی چاپ: چاپی یەكەم، ١٣٨٩.
- قەبارە: (١٦٣) قەبارە مام ناوەند.

بەو پێیەی "دكتۆر سروش" نامەی دكتۆرای لەسەر فەلسەفەی ئەخلاق و ئەخلاقە لای "ڤیتگنشتاین"، بۆیە هەم لە كتێبەكان و نووسینەكانیدا لەمڕووەوە جێپەنجەی دیارە و هەمیش وەكو كەسێكی ئەكادیمی لەزانكۆكاندا وانەی لەمەڕ "ڤیتگنشتاین"و فەلسەفەكەی وتووەتەوە. "زمان"و "وێنە"و پەیوەندییان و هەروەها رۆڵی "مانا" لەمڕووەوە بە یەكەمین و لەهەمانكاتدا گرنگترین داهێنانی یەكەمی "ڤیتگنشتاین"ی فەیلەسوف دادەنرێت بەجۆرێك ئەم داهێنانەی كردیان بە یەكێك لەناودارترین داهێنەرەكانی نەك هەر سەدەی بیستەم، بەڵكو "مێژوو"ش،




"د.سروش دەباغ" بەهۆی شارەزایی و پسپۆڕییەکەی توانیویەتی چەمکی "وێنە"و "مانا" لەم کتێبەدا روونبکاتەوە. هەرچەندە ئەك کتێبەش دەچێتە خانەی نووسینە ئەکادیمییکانەوە، بەلاّم دەروازەیەکی گرنگ و جوانە لە فەلسەفەی "ڤیتگنشتاین" بە گشتی و داهێنانە بەناوبانگەکەی. بۆیەش خوێندنەوەی ئەم کتێبە ئاشنامانەکات بەو داهێنانە گەورەیەی ئەم فەیلەسوفە و مەزنی بیر و روانیی.

**٨. تەرنیمی هاوسەنگی غەم**

- ناوی کتێب: تەرنیمی هاوسەنگی غەم، (ترنم موزون حزن)
- شوێنی چاپ: تاران، دەزگای کویر.
- نۆبەت و ساڵی چاپ: چاپی یەکەم، ١٣٩٠.
- قەبارە: (٢٤٠) قەبارە مام ناوەند.

ئەم کتێبە هەروەك لە ناونیشانەکەیەوە دەردەکەوێت باسی ئەو "غەم"ە قووڵە دەکات نووسەر لەبارەی دیارەی رۆشنبیری و رۆشنبیران و نووسەرانی دیارەوە دەربڕیوە و ناونیشانی لاوەکیشی بریتییەلە (چەند تێڕامانێك لە رۆشنبیری هاوچەرخ) لەم کتێبەدا "د. دەباغ" خوێندنەوەی بۆ هزری کۆمەڵێك فەیلەسوف و رۆشنبیر و بیرمەندی ناسراوی ئێران کردووە و رەخنەی لە کارەکانی هەندێکیان گرتووە و داهێنان و کارەکانی لە چەند تەوەر و خاڵێکدا کورتکردوونەتەوە، لەو رۆشبیر و فەیلەسوفانەی قسەی لەبارەوە کردوون: (داریوش شایگان،




موستەفا مەلەکیان، مورتەزا موتەههرری.. هتد). هەرچەندە بەکورتی کاری لەمەڕ بۆچوونی ئەم بیرمەندانە ئەنجامداوە، بەلاْم یەکێکە لە کارە هەرە باشەکان و توانیویەتی خاڵە بەهێز و کەموڕییەکانی بیر و فەلسەفەکەیان بەتایبەت لە چەند بابەتێکدا بخاتەڕوو.

"دکتۆر سروش دەباغ" هەروەك لە چاوپێکەوتنە تایبەتەکەماندا پرسیاری بەرهەم و پرۆژەی نوێمان لێکرد ئەو وتی کە ئەم (٤) کتێبەم تەواوبوون و چاوەڕێی چاپن و بکەونەبەر دیدەی خوێنەران، ئەوانیش:

١. وەرگێڕان و راڤە و لێکدانەوەی ریسالەی (لۆژیکی - فەلسەفی) لودویك ڤیتگنشتاین.
٢. فیکری ناسکی غەمناك، (فکر نازك غمناك)، کۆمەڵە وتار.
٣. لە قەڵغانی سوپهەریدا، (در سپهر سپهری)، لەبارەی "سوهرابی سوپهەری".
٤. لەبارەی "حیجاب"ەوە، کۆمەڵە وتار.

...

●●●